# فیدرالیەت و دەرفەتی پیادە کردنی لە عێراقدا

د. محەمەد عومەر مەولوود



وەرگێڕانی:
د. محەمەد عومەر مەولوود
د. عومەر ئیبراهیم عەزیز

# فیدراڵییەت و دەرفەتی پیادەکردنی لە عێراقدا

د. محەمەد عومەر مەولوود

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:

د. محەمەد عومەر مەولوود
د. عومەر ئیبراهیم عەزیز

کتێب: فیدراڵییەت و دەرفەتی پیادەکردنی لە عێراقدا
دانانی: د. محەمەد عومەر مەولوود
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: د. محەمەد عومەر مەولوود - د. عومەر ئیبراهیم عەزیز
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٤٦٩
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: کارزان ئاوڕەحمان
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٦
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٣٥٤)ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ

# وتەیەک

ئەو کتێبە لە بنەڕەتدا دکتۆرانامەکەمە کە لە ساڵی ١٩٩٨ و لە ژێر ناونیشانی (الفدرالیة وامکانیة تطبیقها في العراق) پێشکەش بەکۆلێجی ماف و زانستە سیاسی و کارگێڕییەکان لە زانکۆی فەرمی لوبنانم کرد بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا (Phd) لە یاسای گشتی و، لەگەڵ ئەوەی ڕەوتی شۆڤینزمی عەرەبی زۆر زاڵە بەسەر ڕای گشتی ئەو وڵاتە و زۆربەی زۆری ئەو مامۆستایانەی کە گفتوگۆیان لەگەڵ کردم زۆر دەمارگیریان پێوە دیار بوو لەبەرئەوەی بڕوایان بەپرنسیپی فیدراڵیزم لە عێراق وەکو ڕێگاچارەیێک بۆ کێشەی ڕەوای میللەتی کورد نەبوو، بەڵام سوپاس بۆ یەزدانی پاک و بەپشت بەستن بەکێشە ڕەواکەی میللەتەکەم توانیم کە بڕوانامەی ناوبراو بەپلەی باشە بەدەست بێنم و، لەبەر پێویستی هەر کەسێک لە عێراق بەگشتی و لە کوردستان بەتایبەتی بەزانیاری سەبارەت بەو لە کوردستان بەتایبەتی بەزانیاریی سەبارەت بەپرنسیپی فیدراڵیزم بۆیە بەپێویستم زانی کە ئەو دکتۆرانامەیە وەرگێرام بۆ زمانی شیرینی کوردی بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی لەم بوارەدا و ئومێدەوارم کە توانیبێتم کەلێنێک لەم بۆشاییە پڕ کەمەوە.

دانەر

# پێشەکی

دەتوانین بڵێین ئەو لێتوژەرەی کە مەبەستی قوولبوونەوەیە لە سیستەمی دەستووری لە عێراقدا لە سەرەتادا تووشی دڵەڕاوکێیەک دێت، چونکە کارێکی گرینگی دێتە پێش لەبەرئەوەی ڕێکخستنی دەستووری وڵاتەکەمان ئاڵۆزییەکی گەورەی تێدا بەدی دەکرێت وە لە زۆر لایەنەوە کەموکوڕی ترسناکی پێوە دەبینرێت، ئەم کارە نێگەتیڤانە دەبنە گرینگترین هۆ بۆ کۆسپ خستنە بەردەم پێشکەوتنی ئەم وڵاتە و لە ئارامگرتن و لە جێگیربوون و هێمنی و خۆشی و پێشکەوتن بێ بەشی دەکات، بەڵکو دەبێتە نێچیرێکی بێ دەسەڵات بەرامبەر کێشە جیاجیاکان چ ناوەکی بێ یان دەرەکی یان هەر ئەوانەشن کە نایەڵن وڵاتەکەمان لەگەڵ ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و شارستانییەتی سەردەم بەرەو پێشەوە بڕوات، هەرچەندە کە بەهەرە گەورەترین دەوڵەتانی جیهان لە بواری ئەو گەنجینە نەوتەی کە هەیەتی و لە ماددەیەکی نەوتی بەبایەخ و گرانبەها دەژمێردرێت؛ سەرەڕای پێکهاتنی ئەم وڵاتە لە دۆڵی ڕافیدەینی بەپیت (میزۆپۆتامیا Mesopotamia) و کوردستانی عێراق کەوا چەندان دەشتایی کشتوکاڵی بەپیتی تێدایە بەڵام پێداگرتن و سووربوون لەسەر عێراق و دوارۆژیدا هەموو جۆرە دوودڵییەک لەم بوارەدا بەلاوە دەنێت و نایهێڵێت، بەڵکو هانی لێتوژەر دەدات کە بچێتە ناخی ئەم بابەتە تێکەڵاو و ئاڵۆزەو، دانانی خاڵ لەسەر پیتەکان بەدەستنیشانکردنی لایەنە لاوازەکانی کە هەن لەگەڵ لایەنەکانی کەموکورتی جیاوازیان ، کە پێشتر و ئێستاش تووشی سیستەمی دەستووری ئەم وڵاتەدا بەنۆرە بوونەتەوە و، لە دواییدا هەوڵدانێک بۆ ڕێگا چارەیەک بۆ ئەم دۆخە نائاساییەدا لە میانەی دەربڕینی شتێکی باشتر کە بۆی هەیە لەگەڵ ڕۆژگاری سەردەم بگونجێ و؛ ویست و ئارەزووی هەموو عێراقییان بهێنێتەدی و بەرەو هێنانەدی و یەکتریگرتنی هەمەلایەن لە نێوان نەتەوەکان و مەزهەبە هەمەچەشنەکان لە عێراقدا ببات، ئەویش بەشداری لە پێشکەوتنی وڵاتدا دەکات و، لە ئەنجامی ئەوەی کەوا هێمنی و ئاسایش بەدی دێنێت کە هەردووکیان دەبنە هۆی پێشکەوتنی عێراق لە شوێنی سروشتی خۆیدا. لە نێوان دەوڵەتانی جیهاندا، ئەویش ئەو جێگایەیە کە پێویستە شایستەی

بەهێزی ئابووری و ئەو شوێنە ستراتیژی و مێژووی کۆنی ئەم وڵاتە بێت.

ئەگەر بێتو لە دوای هەر لێتوێژینەوەیەکی یان هەر نامەیەکی خوێندنی باڵا چەند هۆیەکی دیاریکراو هەبێ و، کە پاڵ بەلێتوژەر بنێت کە بچێتە ناخی باسەکە و ناوەڕۆکی، دەتوانین بڵێین لێرەشدا زۆر لەم هۆیانە وای لێ کردم لەم دەرگەی ئەم بابەتە ئاڵۆزەدا بدەم و هەموو ماندووبوون و کۆسپێکی زۆر لە ئەستۆمدا بگرم، تا لە پێناوی تەواوکردنیدا و، بەشدارییەکی بێ خۆهەڵکێشان لەم بوارەدا پێشکەش بکەم.

وە لە هەرە پێشەوەی ئەم هۆیانەدا ویست و ئارەزووی خۆم بوو بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکی دەستووری و شارستانی بۆ دۆزی کورد لە عێراقدا منیش هەر وەکو زۆربەی ئەو عێراقییانەی لە کورد و عەرەبدا باسی ئەم کێشەیان کردووە و، هەوڵیان داوە بۆ دەوڵەمەندکردنی هەردوو کتێبخانەی عێراقی و عەرەبی لەم بوارەدا و؛ بەتایبەتی لەبەرئەوەی کە لەسەر ئاستی وڵاتانی عەرەبیدا خۆ لێ گێلکردن و ئاگا لێ نەبوون لەم کێشەدا زۆرە، لەگەڵ ئەوەی لەم سەردەمەشدا بەیەک لە هەرە کێشەکانی گەرمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەژمێردرێت.

هەروەها ئەم کێشەیە تووشی زۆر کێشمەکێش و دەست تێوەردان و شێواندن بووە، ئەویش لە ڕێگای ئەم زانیاریە نادروستانەی کە سەبارەت بەم کێشەیە لە لایەن ڕژێمە یەک لە دوایەکەکانی عێراقدا ڕادەگەیەنرا ئەوەی جێگای داخە ئەم ڕژێمانە لەجیاتی ئەوەی کە بەشێوازیی ئاشتی خوازانە و شارستانییانە وەکو دایەلۆگ و بیروڕا ئاڵوگۆڕکردن ئەم کێشەیە چارەسەر بکەن کە پەیوەندی بەبەشێکی زۆری دانیشتوانیان هەیە، زۆرجار وابووە ئەو ڕژێمانە شێوازی عەسکەرتاری و زەبروزەنگ و داپلۆسین و کاولکردنیان بەکارهێناوە و، لە هەمان کاتیشدا دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان پڕوپاگەندەی نادروستی وایان سەبارەت بەشۆڕشەکانی کورد و ئامانجەکانی بڵاوکردۆتەوە؛ بەمەبەستی دروستکردنی ڕایەکی گشتی عێراقی و عەرەبی دژ بەم کێشەیەدا، بەڵکو تا گەیشتە ڕادەیەک کە هەندێ لەم ڕژێم و لایەنانە تۆمەتی جیابوونەوەیان دەخستە پاڵ ئەو دەنگەی کە داوای دانپیانان و چەسپاندنی مافە ڕەواکانی کوردیان دەکرد.

لەگەڵ ئەمەش کە هەموو سەرکردەکانی کورد و لێپرسراوانی بەهیچ شێوەیەک بیریان لە جیابوونەوە لە عێراقدا نەکردۆتەوە و ئارەزوویان نەبووە و ئامانجەکانیان لە بەدیهێنانی مافی ڕەوای کورد لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکگرتوودا پتر نەبووە؛ بەواتایەکی تر سەرکردایەتی کورد هەمیشە دابەشکردنی عێراقی ڕەت کردۆتەوە.

هەروەها ئەوەی هانی دام بۆ لێتوێژینەوە لەم بابەتە گرینگەدا هەستکردنم بەپێویستی پاراستنی عێراقێکی یەکگرتوو لە خاک و لە گەلەوە بووە لە ڕێگای هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی باشترین شێواز کە بتوانێت پێکەوە ژیانی چەندایەتییە جیاجیاکانی عێراق بەتایبەتی کورد و عەرەب لە چوارچێوەی وڵاتێکی یەک پارچەی دوور لە توندوتیژی و کاردانەوەی دژ بەیەکتری دابین بکات.

لەم بوارەشدا دەتوانین بڵێین کە هۆکارەکانی لە یەکتر نزیک بوونەوە و لە یەکتر گەیشتن لە نێوان کورد و عەرەب لە عێراقدا زۆرتر و بەهێزترن لە فاکتەرەکانی لە یەکتر دووربوونەوە و جیابوونەوە.

چونکە ئەم دوو گەلە هاوبەشن لە پەیوەندی بەئاینی ئیسلامی پیرۆزدا و، کوردەکان کەمتر نین لە برا عەرەبەکان لە پەیڕەوکردنی ئەم ئاینەدا هەروەها زۆر پەیوەندی و بواری تر هەیە کە کورد و عەرەب پێکەوە کۆدەکاتەوە؛ وەکو یەکبوونی کەلەپوور و مێژوو و تێکۆشانی هاوبەش دژی کۆلۆنیالیزم و ستەمکاری ئا بەم شێوەیە کاتی ئەوە هاتووە بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی شیاو و گونجاو بۆ ئەم کێشەیە چونکە بەسیەتی بۆ عێراق بەکورد و عەرەب و کەمە نەتەوایەتییەکانی برا لە دەست ئەم هەموو دەردە سەریەی چێشتیان سەربارەت بەم کێشەیەداو، ئەویش ئەوەبوو کە هەزارەها کەس گیانیان لە دەست دا و، ئەو قوربانییانەی کە دایان و سەر و ماڵیان لە پێناو دانا بەبێ ئەوەی سنوورێک بۆ ئەم کێشە دابنرێت و بەڵکو پتر ئاڵۆزی کرد.

بۆیە پێویستە شێوازی داهاتوو بریتی بێ لە هەڵبژاردنی شێواز و ڕێچکەیەکی تر دوور لە شێوازی عەسکەرتاری، چارەسەرکردنی ئاشتییانەی ناتەواویانە (نیوەچڵی) بەتایبەتی ئێستا جیهان پێی لە سەدەی (٢١) و هەزارەی سێیەمی لە دایک بوون داناوە، بۆیە ئەم فرت و فێڵ و نیمچە چارەسەرکردن و پینە و پەڕۆیانە لەکەس ناشاردرێتەوە بێجگە لەوەی کە ناتوانێت ئەو برینە سارێژکاتەوە کە پتر لە (٧٠) ساڵە لە جەستەی عێراقدا خوێنی لێ دەتکێتەوە.

هەروەها بەپێی شارەزایی بوونم لە یاساو ئاگا لێبوونم لە ئەزموونە بەراوردکارەکانی زۆر لە دەوڵەتانی تر، بۆم دەرکەوت کە زۆر لەم وڵاتانەی کە خاوەن چەندایەتی نەتەوە و زمان و ئایینین پەنایان بردۆتە بەر فیدراڵیزم وەکو شێوازێکی حکومڕانی گونجاو لەگەڵ ئەو چەندایەتییانەی سەرەوە چونکە لەو کاتەی کەوا فیدراڵیەت دەبێتە هۆی دروستبوونی چەند قەوارەیەکی هەرێمی تایبەت بەم چەندایەتییانە کە دەبنە خاوەن سەربەخۆی ناوەکی

خۆیان و، وه بەشێکی زۆر له دەسەلاتەکان بەپێی دەستووری فیدرالّی دەکەوێتە دەستیان بێجگە له بەشداری بوونیان له دەزگاکانی حکوومەتی یەکگرتوو، ئەمەیان له لایەک و، له لایەکی ترەوە فیدرالّیەت دەبێتە هۆی دروستبوونی حکوومەتێکی یەکگرتوو که لەسەرووی حکوومەتە هەرێمییەکان دەبێت و، ئەو کاروبارە گرینگانەی که مۆرکی نیشتمانیان پێوەیە بەئەستۆوە دەگرێت.

لەگەلّ ئەوەی که ئەم جۆرە سیستەمە جۆرە هاوسەنگی و گونجان بوونێکی له نێوان دەولّەتی یەکگرتوو وە دەولّەتە ئەندامەکان لێ دەکەوێتەوە و، له ئەنجامدا دەبێتە هۆی شادبوونی چەندایەتییە جیاجیاکانی ولات بەتایبەتمەندییەکانیان بۆیە دەبینین کەوا فیدرالّیزم له زۆر لەو ولاتانەی که تیایدا پیادە کرا هەر لەوکاتەی که بۆ یەکەمجار له ئەمریکا له سالّی ١٧٨٧ داهێنرا دوایی له سالّی ١٨٤٨ له سویسرادا پیادە کرا و سەرکەوتنێکی بێ وێنەی بەدەست هێناو هەندێک هەن لەم بارەیەدا دەلّێن: (ئەگەر سویسرییەکان و ئەمریکییەکان ئەمرۆ له خۆیان بپرسن هۆی بوونتان بەیەک گەل له چوارچێوەی یەک دەولّەتدا کە پێشتر پەرت و بلاوبوون و لەیەکتر دووربوون و زۆر ناکۆکیتان له نێواندا هەبوو، وە هەروەها رکابەری و ململانێی ئابووری لەبەر چەند هۆیەکی پروپووچ و کەم بایەخ له نێواندا هەبوو یەکسەر بۆیان دەردەکەوێت که یەکتری گرتنیان له چەند سەدەیەکەوە هەتاکو ئەمرۆ بۆتە هۆی یەکبوونی گەلەکەیان و پاراستنی قەوارەکەیان و پێشکەوتن و بەختیاری و خۆش گوزەرانییان که ئیمرۆ تێدا هەن)[1] هەروەها ئەم جۆە سیستەمەش له ئەلّمانیا و کەنەداو ئوسترالیا و یەکێتی سۆڤێتی جاراندا و یۆگسلافیا و هیند و پاکستان و مالیزیا و مەکسیک و بەرازیل و ئەرجەنتین و فەنزویلا و کۆلۆمبیا و نایجیریا و ئۆگەندا و تانزانیا و میرنشینە عەرەبییەکانی یەکگرتوو پیادە کرا.

سەرەرای ئەو هۆیانەی که لەوەو پێشدا باسکران لەم دواییە چەند پێشنیازێک وە له چەند لایەنێکی جیاجیای دەرەوە و ناوەوە بەرزکرایەوە که بریتی بوو له پێرەوکردنی فیدرالّیزم له عێراقدا، چونکە لەگەلّ باری فرەلایەنی دەگونجێ و نابێتە هۆی دابەشکردن و پچرپچربوونی دەولّەتی عێراق و، وە بەهێزترین پێشنیاز لەم بوارەدا له لایەن کۆنگرەی

(١) دکتۆر شافعی محەمەد بەشیر- نظرية الاتحاد بين الدول وتطبيقاتها بين الدول العربية- منشأة المعارف بالأسكندرية - الطيعة الأولى، ١٩٦٣، ص٨.

نیشتمانی عێراقی یەکبوو بەرزکرایەوە، چونکە کۆنگرەی ناوبراو لەو کۆبوونەوەی کە لەهاوینە هەواری سەلاحەدین لە کوردستانی عێراق لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٢ بەسترا، بڕیاری لەسەر پێویستی پەیڕەوکردنی فیدراڵیەت لە عێراقدا وەکو شێوازێک بۆ چارەسەرکردنی کێشەی دا.

وە لێرەشدا پێویستە بزانین کە کۆنگرەی ناوبراو هەموو لایەنە بەرهەڵستکارەکانی عێراقی بەخۆوە گرتبوو هەروەها ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان واتە پەرلەمانی هەڵبژێردراو لە لایەن زۆربەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان ١٩٩٢ بڕیاری دا بەپیادەکردنی فیدراڵیزم لە کوردستانی عێراقدا بەپێی ئەو بڕیارەی کە لە (٤)ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٢ پەرلەمانی کوردستان دەری کرد.

ئەو هەموو هۆیانەی کە لە سەرەوە باسمان لێ کردن بڕوایەکی بەهێزیان لام پەیدا کرد پێویستی بەلێتوێژینەوەیە لەم بوارەدا وە هەوڵدان بۆ زانینی لایەنە جیاجیاکانی فیدراڵیزم و لێکۆڵینەوە لە ڕادەی بوونی هەلومەرجی ڕەخساو بۆ توانای پیادەکردنی ئەو سیستەمە لە عێراقدا:

هەروەها دەتوانین بڵێین ئەم نامەیە چەند نوێخوازییەک لە شێوازەکانی لاساکەرەوەیی لە لێتوێژینەوەی یاسایی بەخۆیەوە دەگرێت، چونکە بەتەنها جەخت ناکاتە سەر لایەنەکانی یاسایی، بەڵکو هەوڵ دەدا بۆ لە یەکبەستنی و لێک گرێدانی لە نێوان یاساو مێژوو لە لایەکەوە و لە نێوان یاساو سیاسەت لە لایەکی ترەوە و، هەروەها دانانی مێژوو و سیاسەت بۆ خزمەتکردنی یاسادا و بەپێچەوانەش ڕاستە، بەتایبەتی کە ئێمە لێتوێژینەوە لە بابەتی یاسایی دەستووری دەکەین. وە ئەم جۆرە شێوازەشمان پێ بەسوودە، چونکە ئەم هەموو لقانە لە زانستەکانی مرۆڤایەتی لێک بەستراون و پەیوەند بەیەکن و ناتوانرێ لەیەکتری جیا بکرێنەوە.

– بۆ بابەتی لێتوێژینەوەکە ئەم پلانەی خوارەوەم هەڵبژاردووە:

**دەروازەی یەکەم:** ناونیشانەکەی: عێراق و دۆزی کورد، ئەویش دابەشی سێ بەش دەکرێت، لە بەشی یەکەمیدا باسی دەرهاوێشتەکانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی لە عێراقدا دەکات کەچی لە بەشی دووەمدا باسی کێشەی کورد لە عێراقدا دەکات، لە کاتێکدا کە بەشی سێیەمیان تەرخان دەکرێت بۆ ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی لە کوردستانی عێراقدا لە نێوان تیۆری و پراکتیکدا.

**دەروازەی دووەم:** ناوونیشانەکەی: تیۆری گشتی فیدرالّیزم، ئەویش دەکرێتە سێ بەش: یەکەمیان تەرخان دەکرێت بۆ سەرەتاکانی پەیدابوونی فیدرالّیزم و نیشانە سەرەکییەکانی، بەلاّم بەشی دووەم دەبێتە تەوەری سیستەمی یاسایی فیدرالّیزم دوای ئەوەش لە بەشی سێیەمیدا باسی فیدرالّیزم و سیستەمە لەیەکچوونەکانی دەکرێت.

**دەروازەی سێیەم:** ناونیشانەکەی گونجان و شیاوبوونی فیدرالّیزم بۆ ئەو کۆمەڵگای فرەیەکان و عێراق لەم کۆمەڵگایانەیە کە ئەویش بەسەر سێ بەش دابەش دەکرێت:

کە یەکەمیان بۆ فیدرالّیزم وەکو رێگا چارەیەک بۆ کێشەی کۆمەڵگا چەندایەتییەکان تەرخان کراوە بەلاّم بەشی دووەمیان باسی هەندێ ئەزموونی فیدرالّیزمی بەراورد کراو دەکات، ئەوانیش بریتین لە ئەزموونی ئەمریکا و سویسرا، کەچی لە بەشی سێیەم و دواییدا باسی شیاو و گونجاوبوونی فیدرالّیزم بۆ عێراقدا دەکرێت.

لە دوایی ئەمانەشدا کۆتایی بەلێتوێژینەوەکە دێت کە پوختەی دەرئەنجامەکانی پەیوەند بەم بابەتە دەگرێتە خۆ.

لەبەرئەوەی ناونیشانی ئەم نامەیە فیدرالّیزم و توانای پیادەکردنی لە عێراقدایە، بۆیێ پێش باسکردنی تیۆری گشتی فیدرالّیزم و لایەنە تێکهەلّکێشە جیاوازەکانی و، بۆ ئەوەی لێتوێژینەوەکەمان رێک و پوختە بێت بۆیێ پێویستە لە پێشەوەی هەمووآندا باسی عێراق و کێشەی کورد بکەینە دەروازەی یەکەمدا، وە بەمەبەستی پێشکەشکردنی وێنەیەکی دیارو ئاشکرا لەم لایەنەدا وا بەباشی دەزانین کە لە بەشی یەکەم و لەم دەروازەیەدا گفتوگۆ لەسەر دەرهاوێشتەکانی مێژوویی و کۆمەلّایەتی عێراقی هاوچەرخ بکەین، هەروەها بەمەبەستی چۆنێتی دروستبوون و پێکهێنانی دەولّەتی عێراقی نوێ و، بۆ زانینی ئەو ململانێیەی بەهۆی لکاندنی ویلایەتی موسلّ بەم ولاتەدا رووی دا، هەروەها بۆ ئاگاداربوون لە لایەنی مێژوویی عێراقی نوێ لەسەردەمەکانی جیاوازدا تاوەکو ئەمڕۆ، لە دواییدا دەچینە سەر دەرهاوێشتنەکانی کۆمەلّایەتی و ئەو تایبەتمەندە جیاوازانەی لە عێراقدا دەبینرێت بەلّام لە بەشی دووەمدا باسی مەسەلەی کورد لە عێراقدا و ڕەسەنایەتی ئەم گەلە و ولاتەکەی دەکەین، هەروەها باسی ڕاپەڕین و چەرمەسەرییەکانی و شۆڕشەکانی کورد لەسەردەمی داگیرکردنی ئینگلیز بۆ عێراق تا ئیمڕۆمان دەکەین.

هەروەها باسی داوا کاریەکانی کورد و پلەی وەلّامدانەوە و بایەخ پێدانی حکوومەتە یەک لە دوایەکەکانی عێراق دەکەین. لە پاشانیش دەچینە سەر بەشی سێیەم کە باسی سیستەمی ئۆتۆنۆمیی کە پێشتر پیادە کرابوو لە کوردستانی عێراقدا دەکەین و، لەسەر لایەنەکانی یاسایی ئەم سیستەمە و، لایەنە جیاوازە تێک هەلّکێشراوەکانی دەدوێین، لە رێگای بەراوردکردنیدا لەگەلّ چەند دەولّەتێکی ترداو، لە ئەنجامدا ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی هەلّدەسەنگێنین بەرامبەر سیستەمەکانی دیکە و تا بزانین بەتایبەتی رادەی سەرکەوتنی ئەم ئەزموونە لە ژیانی رۆژانەدا لە عێراقدا لە چ ئاستێکە؟

## بەشی یەکەم

# دەرهاوێشتە مێژووییەکان و کۆمەڵایەتییەکانی عێراقی نوێ

ئەوەی لە کەس ناشاردرێتەوە ئەوەیە کە لێکۆڵینەوە دەربارەی بارودۆخی ئێستا بۆ هەر وڵاتێک و کۆمەڵگایەک تەواو نابێت تاوەکو نەگەڕێینەوە بۆ ڕابردووی کۆن و بەرەو پێشەوەچوونی مێژوویی و پێکهاتنی کۆمەڵایەتی بۆ هەردووکیان، بۆیێ وادەبینین و بەپێویستیشی دەزانین کە تۆزێ بەکورتی بەو ڕادەیەی کە ئەم لێتوێژینەوەیە دەرفەتمان پێ دەدات کە زۆر بەکورتی باسی دەرهاوێشتە مێژووییەکانی عێراقی نوێ بکەین و، هەروەها باسی چۆنێتی پەیدابوونی ئەم وڵاتە و ئەو لایەنە ئاڵۆزانەی کە لەگەڵ ئەم لە دایکبوونەدا بوو، هەروەها دروستبوونی کۆمەڵگای عێراق و سروشتی فرە نەتەوایەتی و ڕادەی تەبایی ئەو فرە نەتەوانەو، هەوڵ دەدەین وێنەیەک بخەینە بەرچاو بۆ لێدوان لە بەشی یەکەمدا سەبارەت بەعێراقی ڕابردوو و ململانێ لەسەر ویلایەتی موسڵ کە تێیدا مەبەست لە وشەی عێراقی کۆن ڕوون دەکەینەوە لە دواییدا لایەنەکانی ململانێی دبلۆماسی کە ڕووی دا بۆ بەلکاندنی ویلایەتی مووسڵ بەعێراقدا لە نێوان بەریتانیا و عێراق لە لایەک و، تورکیاش لە لایەکەی ترەوە شی دەکەینەوە، لە پاشان دەچینە سەر ئاخاوتنی دووەم کە تێیدا باسی بارودۆخی عێراق دەکەین لە ژێر سایەی داگیرکردندا؛ دوایی لە ژێر چاودێری بەریتانیدا و، لەپاش ئەویشدا لە ئاخاوتنی سێیەمدا باسی عێراق لە سایەی ڕزگاربوون و سەربەخۆییدا لەسەردەمی پاشایەتی و کۆماریدا دەکەین وە لە ئاخاوتنی چوارەم کە دوانیەکەیەتی دەرهاویشتە کۆمەڵایەتییەکانی عێراقی نوێ بەدیار دەخەین لە باسکردنی فرە نەتەوایەتی و ئایینی لە عێراقدا و، هەروەها ڕادەی گونجاندن و سەرکەوتنی پێکەوە ژیانی ئەو فرە نەتەوە و زمان و ئایینانە.

# ئاخافتنی یەکەم

## عێراقی کۆن و ململانێ لەسەر ویلایەتی مووسڵ(١)

### یەکەم: عێراقی کۆن:

سروشتی ئەم لێتوێژینەوەیە وا پێویست دەکات کە کەمێک بگەڕێینەوە دواوە بۆ لێکۆڵینەوە سەبارەت بەوەی ولاتی عێراق کە لە لایەنی مێژووییەوە بەنیشتیمانی بەهەشتەکانی عەدەن ناودەبەن(٢)

ئایا بەدرێژایی مێژوو سەردەمە جیاجیاکان هەمان هەرێم و پانتایی جوگرافی ئێستای گرتۆتەوە؟ بەواتایەکی تر ئایا وشەی عێراق هەر بۆ هەمان شوێن و جێگا لە ڕابوردوو و ئێستادا بەکاردێت؟ ئەوەی زانراوە ئەو ولاتەی کە ناوی عێراقی لە دوای جەنگی جیهانی لێ نراوە لە ڕووی مێژووەوە نوێترین ڕێککەوتنە لە نێوان هێزەکانی جیهانیدا(٣) یەکتری ناگرێتەوە لەگەڵ ئەو عێراقەی کە لە پێشترو ڕابووردوودا و بەڵکو تا کاتە دواییەکانی سەردەمی عوسمانییەکان هەبووە و دەناسرا، وە عێراقی ڕابووردوو لە باری جوگرافییەوە مانای ولاتەکانی دۆڵی ڕافیدەینی دەگرتەوە کە مەبەست دۆڵی دیجلەو فورات بوو.

بەلام ئەغریقییەکان ناویان نابوو (Mesopotamia) میزوپوتامیا واتا خاکی نێوان هەردوو ڕووبارەکە و هەروەها پانتاییەکی زۆر کەمتری هەبوو لەوەی کە ئێستا کە هەیەتی. هنری فۆستر «Henry A. Foster» دەڵێ بەلام سەبارەت بەوشەی عێراق ئەوە وشەیێکی عەرەبییە لە دوای ڕزگارکردنی ولاتە عەرەبییەکان لە سەدەی حەوتەمی لە دایکبووندا بەکارهێنرا، ئەو وشەیە لەوکاتدا بەبەشێک لەو دۆڵە دەگوترا کە لە لایەن کۆنەکانەوە ناوی ولاتی بابل یان کلدیانا وەنرابوو، وە ناوی ولاتی کلدیای کۆن بە(عێراقی عەرەبەکان) یان (عەرەبەکانی ڕۆخ ئاوی قوڕاوی) ناونرابوو، عێراقیش وا پێدەچوو کە لە شوورەی میدییەکان پێک بێت ئەو شوورەیەی کە درێژاییەکەی لە شاری أوفیسی کە لەسەر ڕووباری دیجلە و لەو شوێنەی کە تێکەڵ بەزێی (عظیم) دەبوو وە لەتەک (الردوادیة) (الرمادي) ئێستای لەسەر ڕووباری فورات کە دەکەوێتە سەر نزیکی هێڵی پانی (٣٥) پلە هەتا دەگاتە کەنداوی فارسی، وە لە لایەن بیابانی سووریاوە تاوەکو چیایەکانی فارس(٤) هەندێک لەمانە(٥) بەمسۆگەری دەڵێن شاعیرانی عەرەب لە

پێش ئیسلامدا لە بەشەکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراقی ئێستا بە(عێراقیان) ناونابوو.

ئەو لێژنەی لێکۆڵینەوەی کە لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ لێکۆڵینەوەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ پێکهاتبوو دەڵێن: ناوی «عێراق» بەو وڵاتە دەگوترێت کە لە ڕابووردوودا پێیان دەگوت: میزوپوتامیا چونکە زۆر بەوە لە لایەن خەڵکی ناسرابوو، بەڵام ئەم ناوە نوێیەی عێراق لە «عێراقی عەجەمی» و «عێراقی عەرەبی» وەرگیراوە کە لە سەدەی یازدەمین بەکارهێنرابوون، وە عێراقی عەجەمی بەشێکی لە ئێرانی نوێ و بەشێکیش لەویلایەتی مووسڵی گرتبووە خۆی[٦]

هەروەها بەشەکەی کوردی لە ویلایەتی مووسڵدا پێی دەگوترا ویلایەتی شارەزوور، وەسەرەڕای ناوچەی شارەزوور (پارێزگای ئێستای سلێمانی) کەرکووک و چەمچەماڵ و کفری و هەولێر و ڕواندوز و ڕانیە و کۆیێ کە هەموویان لە ویلایەتی مووسڵ بوون[٧] دەگرێتەوە. لێژنەی لێکۆڵینەوەی نێو نەتەوەیی لە ڕاپۆرتی ناوبراودا لەسەری دەڕواو دەڵێ: سەبارەت بەویلایەتی مووسڵ لێژنەکە گەیشتە ئەوەی کەسێ ناوچەی دیار و ئاشکرا هەیە؛ ئەویش عێراقی عەرەبی و دوورگە و کوردستان وە عێراق لەلای باکوورەوە لە (هیتەوە) بۆ (تکریت) یا ناوچەی چیای حەمرین زیاتر ناڕوات. وە هەموو ئەدەبیاتی جوگرافی لەسەردەمی ڕزگارکردنی عەرەبی تا وەکو مێژووی لێکۆڵینەوەی لێژنە لە ساڵی (١٩٢٥)دا، ئەو زەوییانەی کە ناکۆکی و مشتومڕیان لەسەر بوو ڕۆژێک لە ڕۆژان بەشێک نەبوو لە عێراق[٨]

ئا بەم جۆرە بەهیچ شێوەیێک سنووری عێراقی ئێستا یەک ناگرێتەوە، بەڵکو تەنها ئەو پارچە زەوییە جوگرافیەی دەگرێتەوە کە دەکەوێتە باشووری ئەو هێڵەی نێوان (ئەنبار) یا (حەدیثە)ی ئێستا بەپێی ڕایەکی تر لەسەر زێی فورات و تکریت لەسەر زێی دیجلەدا.[٩]

ئینگلیزەکان لەوکاتەی کە مەبەستیان لکاندنی ویلایەتی مووسڵ بوو بەعێراقدا زۆر خۆیان ماندوو کرد تاکو بیسەلمێنن کەوا وشەی عێراق ئەو هەرێمە دەگرێتەوە کە ڕووباری دیجلە و فورات پێیدا دەڕوات، بەڵام ئەم هەوڵدانانە بەفیڕۆ چوو و، وەلێژنەی لێکۆڵینەوەی نێو نەتەوەییش[١٠] بەمەرازی نەبوو بەڵام لە دوای ئەوەی جەنگی جیهانی یەکەم کۆتایی پێ هات بەسەرکەوتنی هاوپەیمانەکان بەسەر دەوڵەتی عوسمانی کە پەرت و بڵاوبوو لەم سنوورەی ئێستای عێراقی نوێ دروست بوو، کەوایان پێ باش بوو ئەوە لە

چوارچێوەی سنووری پێشوویدا نەمێنێت؛ بەڵکو بڕیار درا کە بەرەو باکور هەڵبکشێ و بۆ ئەوەی ئەو هەرێمە بگرێتەوە کە لە کۆتایی سەردەمی عوسمانییەکاندا بەویلایەتی مووسڵ ناودەبرا، کە کوردستانی باشووری دەگرتەوە، کە لەوەو پێشیش بەویلایەتی شارەزوور ناسرابوو، هنری فوستر Henry .A. Foster دەڵێت: (هەندەی نەمابوو کەوا شەڕی جیهانی یەکەم کۆتایی پێ بێت، کە ئاواتی عەرەب بەرەو پێشەوە چوو بۆ دەسەڵات گرتنە دەست و دامەزراندنی حوکمڕانییێک کە مەرجەکانی دەوڵەتی تیابێت. هەروەها عەرەبەکانیش بەخۆیانەوە مەبەستیان فراوانکردنی عێراق بوو تاوەکو ویلایەتی مووسڵیش بگرێتەوە[١١]

ئا بەم شێوەیە بۆمان بەدیار دەکەوێت کە ڕادەی جیاوازی یەکجار زۆرە لە نێوان عێراقی ڕابردوو و ئەوەی کە ئەمڕۆ بەوڵاتی عێراق دەناسرێت.

## دووەم: ململانێ لەسەر ویلایەتی موسڵ

ویلایەتی موسڵ کەوتۆتە باکوری ڕۆژهەلاتی عێراق و ڕووبەرەکەی دەگاتە ٨٧٨٩٠ کیلۆمەتری دووجا، بەڵام ژمارەی دانیشتوانی لە نێوان ساڵی ١٩٢٢- ١٩٢٤ ل. ب دەگەیشتە ٨٠٠٠٠٠ هەشت سەد هەزار کەس[١٢] بەشێکی زۆربەی کوردن و بەکوردی بەزیدیشەوە.[١٣]

لە دوای ئەوان عەرەب و دیان و تورک و جوولەکە دێن، ویلایەتی مووسڵ شارەکانی مووسڵ و هەولێر و کەرکووک و سلێمانی دەگرێتەوە، مەغۆلەکان بەسەرکردایەتی تەیموری لەنگ لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەهەمدا دەستیان بەسەر مووسڵ داگرت، هەروەها سوڵتانی عوسمانی (سولەیمان قانونی) لە ساڵی (١٥٣٤) ل. ب دەستی بەسەر هەمان شار داگرت و خستیە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و، لە ساڵی (١٦٣٨)دا سوڵتان مرادی چوارەم ویلایەتی بەغداو مووسڵ و شارەزوور و پاشانیش بەسرەشی هاوێشتە سەر وەکو ویلایەتی چوارەم؛ وە ئەمانە هەموویان دەگەڕانەوە بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە دواییدا مووسڵ پلەی هێنرایە خوارەوە بۆ سنجق واتە (لواء)وە بەویلایەتی بەغداوە بەسترایەوە و لە ساڵی (١٨٣٥) ل. ب دا، لە پاشاندا جارێکی تر لە ساڵی ١٨٧٩ ل. ب گەڕایەوە بۆ ئەوەی ببێتەوە ویلایەت و، وای لێ بێت کە هەردوو سنجق کەرکووک و سلێمانی بگرێتە خۆ.[١٤]

ویلایەتی مووسڵ بەپێی ڕێکەوتنامەی نهێنی سایکس بیکۆ کە لە نێوانی ١٥- ١٧/ مایسی ساڵی ١٩١٦ مۆر کرا، ویلایەتی مووسڵ درایە فەڕەنسا و سوپای بەریتانیا بەشەکانی دیکەی (ویلایەتی مووسڵ)ی داگیرکرد، لە پاش ئاگر بەستی مدروس -Mu dros لە (٣٠) مانگی ت١/ ١٩١٨ ل. ب دا. چونکە جێبەجێکردنی مەرجەکانی ئەم ئاگر بەستە کە مافی داگیرکردنی جێگا ستراتیژییەکانی دایە هاوپەیمانەکان و کەچی لە لایەکی ترەوە سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لوید جورج توانی سەرۆک وەزیرانی فەڕەنسا جورج کلیمنصو ڕازی بکات بەدەست هەڵگرتنی لەم ویلایەتە بۆ بەریتانیا.

عێراق کە لە ژێر ئینتدابی بەریتانیا دابوو ڕکابەری لەگەڵ تورکیادا کرد بۆ دەست بەسەراگرتنی ویلایەتی مووسڵ و لکاندی بەولاتەکەی، زیادەڕۆییش نییە ئەگەر بڵێین بەریتانیا لە تێڕوانینی ئەوەی کەوا دەوڵەتێکی مونتەدیب (چاودێر) بوو لەسەر عێراق ڕۆڵێکی سەرەکی گێڕا لە پاڵپشتیکردنی هەڵوێستی عێراق ئەم ڕکابەری و ململانێیە دیبلۆماسییە لە ساڵی ١٩٢١ هەتا ١٩٢٦ زۆر توند بوو هێندەی نەمابوو کە پەرەبسێنێ لە هەندێ جار بۆ پێکدادانی سەربازی لە نێوان هەردوو لایاندا.

هەروەکو پێشتر ڕوونمان کردەوە هیچ جیاوازییەک نییە لەسەر ئەوەی کەوا کوردەکان بەشی زۆرتری دانیشتوانی ویلایەتی مووسڵیان پێک دەهێناو، ماددەکانی ٦٢، ٦٣، ٦٤.[(١٥)]

پەیمانی سیڤەر کە لە ١٠/مانگی ئابی/ ١٩٢٠بەسترابوو مافی کوردی ئەو ویلایەتەی دابوو بۆ چوونە ناو ئەو دەوڵەتە کوردییەی کە بەتەمابوو دابمەزرێ لە کوردستانی تورکیادا. ئەگەر خۆیان پێیان خۆشبوو. بەڵام پەیمانی سیڤەر هیچ ڕۆشناییەکی نەدیت و، کاری پێ نەکرا چونکە تورکیای عوسمانی ڕووخێنرا و جارێکی تر هەستایەوە سەرپێ و ڕاپەڕی لەسەر دەستی مستەفا کەمال ئەو کەسەی کە بەرەو سەرکەوتنی برد لە شەڕی تورکیا و یۆناندا، بۆیێ ئەم پەیمانەیەی ڕەت کردەوە.

**١- پەیمانی لۆزان و شێوەی چارەسەرکردنی کێشەی ویلایەتی مووسڵ:**

ئەو کەمالیستەکانی تورکیا کە پەیمانی سیڤەریان ڕەت کردەوە و مۆریان نەکرد هەوڵیان دا لە جیاتی ئەوە لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا لە ساڵی ١٩٢٢- ١٩٢٣دا پەیمانێکی نوێ ببەستن و مۆری بکەن، لە ڕاستیدا گەیشتنە بەستانی پەیمانی لۆزان ٢٤/ مانگی گەلاوێژی ١٩٢٣. ئەوەی شیاوی باسە ئەم پەیمانەی دوایی بەتەواوی ئاماژەکردنی بۆ کورد

مافەکانی[١٦] بەلاوە نا، ئەوانەی کەوا بوونە یەکەم و گەورەترین ئەو قوربانییانەی کە بۆ بەرژەوەندی داگیرکەران پێشکەش کران و، لە دواییدا بەدیارکەوت کە ئەو بەڵێنانەی هاوپەیمانان دابوویانە کورد، هەروەها دەقەکانی پەیمانی سیڤەری پەیوەند بەمافەکانیان بەدیار کەوت کە لە فرتوفێلێکی گەورە زیاتر نەبوو و، هەر نەشی دەکردە نرخی ئەو مەرەکەبەی کە پێی نووسرا بوو[١٧].

وەهەندە کەسیش هەن کە دەڵێن بەریتانیا ترسا لەوە کە ئەگەر هات دەوڵەتێکی کوردی لە باشووری کوردستاندا دامەزرا تەنها ڕووسەکان بۆ خۆیان سوودی لێ وەردەگرن، بۆیە بەریتانیا چاوی نووقاند لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە پەیمانی لۆزان،[١٨] وە هەرچۆنێک بێت کوردەکان خۆیان بینی لەسەر چوار دەوڵەتدا دابەش کراون، ئەوانیش تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا بەبێ ئەوەی خۆیان دەستیان لە دابەشکردنەکەدا هەبێت.

بەڵام پەیمانی لۆزان ئەو شتانەی بەخۆیەوە گرت کە پێویستە بکرێن سەبارەت بەکێشەی ویلایەتی مووسڵ کە لە نێوان عێراق و بەریتانیا لە لایەک و تورکیا بەتەنها لە لایەکی ترەوە ململانێی لەسەر بوو، بڕگەی دووەم لە ماددەی سێیەم لە پەیمانەکەدا هاتبوو کە پێویستە دەسنیشانکردنی هێڵی سنووری نێوان تورکیا و عێراق بەجۆرێک ڕێک بخرێت کە بەدڵی هەردوو لایان بێت و ئەو ڕێکخستنە بەشێوەیێکی ئاشتییانە لە نێوان تورکیا و بەریتانیای گەورە لە میانی نۆ مانگ لە بەرواری مۆرکردنی ئەم پەیمانەدا جێبەجێ بکرێ، بەڵام لەو کاتەی کە نەگەیشتن بەو ڕێکخستنەی ناوبراو ناکۆکییەکەیان ئەوکات بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرز دەکرێتەوە[١٩].

وە لە دوای خۆ گنخاندن و خۆ لێ دزینەوەیەکی زۆری، دەست بەگفتوگۆ کرا لە نێوان هەردوو لادا لە ١٩/مایسی/ ١٩٢٤دا کە ناوی لێندرا کۆنگرەی قوسطەنطنیە کە هەتا ٥/حوزەیرانی/ هەمان ساڵ بەردەوام بوو بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێک بەدەست بهێنێت، بەڵکو سەرنەکەوت و نشوستی هێنا بەهۆی ئەو بۆشاییە و ئەو لێک دورییە گەورەیەی کە لە نێوان هەڵوێستەکانی هەردوو لادا هەبوو[٢٠].

### ٢- بەرزکردنەوەی ناکۆکییەکە بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان و پێکهێنانی لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێو نەتەوەیی (نێودەوڵەتی):

لە ئابی ١٩٢٤دا بەریتانیا بەوەی کەوا دەوڵەتی مونتەدیبی عێراق بوو ناکۆکییەکەی سەبارەت بەدواڕۆژی ویلایەتی مووسڵ بۆ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرز کردەوە،

لەبەرئەوەی کاتی دیاریکراوی گفتوگۆکردن کۆتایی پێ هاتبوو بێ ئەوەی بگەنە هیچ ئەنجامێک.[٢١] وە لە پاش ئەوەی هەردوو لا گەلێ نامەو یاداشتیان تایبەت بەداواکردنەکانیان و ئەو بیانوانەو بەڵگەنامانەی کە هەردوو لا پشتیان پێ دەبەست ئاڵوگۆڕکرد، یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان سەبارەت بەویلایەتی ناوبراو لە ٢٠/ مانگی ئەیلوولی ١٩٢٤ بەستراو، بەئامادەبوونی نوێنەری هەردوو لایەنە ناکۆکەکە[٢٢].

لە دوای چەند کۆبوونەوەیەکی کەوا لە نێوان بڕیاردەری کۆبوونەوەکان (هالمیار برانتنک) و هەردوو لای ناکۆکی بەسترا ناوبراو پێشنیازی کرد لە ٣٠/ مانگی ئەیلوولی هەمان ساڵدا لیژنەیەک پێک بێت لە سێ ئەندام بۆ لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی لە بارەی ئەم ناکۆکییەو، هەموو زانیاری و پێشنیازە داواکراوەکانی پەیوەندیدار پێشکەشی ئەم ئەنجوومەنە بکرێت[٢٣]، ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان ڕەزامەندی خۆی بۆ ئەم ڕاسپاردەیە دەربڕی و بڕیاری دا لە ٣١/ت١/١٩٢٤ لیژنەیەکی سێ قۆڵی پێک بێت لە (أم. دی. فیرسن Mde Wirsen) کە وەزیری سویدی دەسەڵات پێدراو کە بچێتە ڕۆمانیا کە لە دوایی هەڵبژێردراو بوو بەسەرۆکی لیژنەکەو، (کونت تیلکی Caunt Teleki) ئەویش یەک لە جوگرافیازانە بەناوبانگەکانی مەجەر (هەنگاریا) بوو، وە سەرهەنگی (عەقید) خانەنشین کراو (باولس Paulis) لە بەلجیکا بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی ویلایەتی مووسڵ بەئەندام دانرابوو.[٢٤] ئەم لیژنەیە دەستی بەکارەکانی خۆی کرد لە ١٧/مانگی ت٢/ هەمان ساڵداو، لە دوای ئەوەی کە ئەم لیژنەیە هەڵسا بەلێکۆڵینەوەی کۆنووسەکانی دانیشتنەکانی کۆنگرەی لۆزان و ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان و یاداشتەکانی هەردوو حکوومەتی بەریتانیا و تورکیا کە ئەندامانی لیژنەی ناوبراو سەردانی لەندەن و ئەنقەرەیان کرد لە کۆتایی ئەوساڵەدا، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری هەڵویستەکانی هەردوو لابن، دوایی ئەوە ئەندامانی لیژنەکە چوونە بەغدا لە ١٦/ مانگی ک٢/ ١٩٢٥و، چەند ڕۆژێک تیایدا مانەوە بۆ ئەوەی لەم ماوەیەدا بەلێکۆڵینەوەی پەیوەندییەکانی ئابووری نێوان بەغدا و مووسڵ خەریک بن، شێوازەکانی بەکارهێنانی چۆنێتی کاری هەڵسووڕاندن لە عێراقدا بزانن.[٢٥] هەروەها لیژنەکە بەڕا وەرگرتنی هەموو ئەو کەسانەی کە ناودار و بەناوبانگ بوون لە بەغدا هەڵسان.[٢٦] لە دواییدا چوونە مووسڵ بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسان بەچەند سەردانی مەیدانی بۆ چەند ناوچەیەکی جیاواز کە ناکۆکی لەسەردا هەبوو لەویلایەتەکەدا و، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لە دانیشتوان و

خەڵکی ئەم شوێنە بگەن و بزانن ئارەزوویان لە چی دایە[٢٧]، لە دوای ئەوەی لیژنەکە لە شاری مووسڵدا بۆ چەند ڕۆژێک مانەوە و، دەستیان کردە سەردانی شارەکان و شارۆچکەکان ئەم ویلایەتە و، لە پاشاندا چوونە هەولێر و سلێمانی و کەرکووک و کفری و ئاڵتون کۆپری و زاخۆ بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری زۆرترین بیروڕای دانیشتوانی ئەم ویلایەتە بن[٢٨]، لە دواییدا هەستان بەپشکنین و چاوپێدا خشاندنی هێڵی بڕۆکسلی سنووری[٢٩] لە پاشان لیژنەکە لێکۆڵینەوەی مەیدانی خۆی تەواوکرد و ناوچەکەی بەجێ هێشتو گەڕایەوە جنێف لە١٩/ ئاداری/ ١٩٢٥دا[٣٠].

٣- ڕاسپاردەکانی لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێو نەتەوەیی (نیو دەوڵەتی):

لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێو نەتەوەیی دەستی بەنووسینی ڕاپۆرتی خۆی کرد لە جنێفدا لە ٢٠/ نیسانی/ ١٩٢٥دا و بەکورتی ئەو ئەنجامانەی کە لیژنەکە پێی گەیشت بەم شێوەی خوارەوە بوو:

١- دانانی هێڵی بڕۆکسل بەهێڵێکی باش بۆ سنووری نێوان عێراق و تورکیا.

٢- هاووڵاتییانی ئەم ویلایەتە لە کورد و عەرەب و دیان و تورک و یەزیدی و[٣١] جوولەکە پێک دێت و، ئەو سەرژمێرییانەی کەوا هەردوو لایەن بۆ دانیشتوانی ئەم ویلایەتە پێشکەشیان کردووە لە ڕاستی و وردی زۆر دوورە، بەڵام لیژنەکە پشتی بەو سەرژمێرییەی کەوا حکوومەتی عێراق لە نێو هەردوو سالآنی ١٩٢٢- ١٩٢٤ کردبووی بەستا و چونکە لە هەموو سەرژمێرییەکانی تر باشتربوو وە ڕەزامەندی و بڕوایی لیژنەکەی هێنا.[٣٢] کەوا بەڕاشکاوی گوتیان کورد لە هەموو ڕەگەزەکانی دیکە زۆرترن لەم زەوییانەی کە ناکۆکی لەسەر دایە و، کورد و عەرەب بەتەنها ئەوان لە کۆمەڵ کۆمەڵی بەژمارە زۆر پترن و، بەڵام دیانەکان لەم ویلایەتەدا پەرت و بڵاون، کەچی کۆمەڵێکی زۆر لە دیانەکان لە باکووری ئەو ناوچەیەی کە ناکۆکی لەسەرە دەژین و[٣٣]، بۆ پتر سوود لێ وەرگرتن وا لە خوارەوە خشتەی ئەو سەرژمێرییەی کە حکوومەتی عێراق لەسەری دەڕۆیشت و کاری پێ کردبوو لیژنەکەش پشتی پێ بەستا هەرچەندە کە زۆریش وردنەبوو دەخەینە بەرچاوتان:

| | |
|---|---|
| کورد | ٤٩٤٠٠٧ |
| عەرەب | ١٦٦٩٤١ |
| تورک | ٣٨٦٥٢ |

دیان ٦١٣٣٦

جوو ١١٨٧٩

یەزیدی ٢٦٢٥٧

کۆی دەکاتە: ٧٩٩٠٩٠ حەفسەدو نۆهەدو نۆ هەزار و نۆهەت کەس[٣٤].

٣- لە بارەی مێژووییەوە ئەم ناوچەیەی ناکۆکی لەسەر دەکرا بۆ چەند سەدەیەک لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دەسەڵاتدارییە پیادە دەکرا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە ڕێگای پاشاکانی بەغدا.[٣٥]

٤- سەبارەت بەوەی کە پەیوەندی بەباری ئابوورییەوە هەیە لێژنەکە تێبینی کرد کەوا بەباش دەزانرێ ئەو ناوچەیەی کە ناکۆکی لەسەرە لەگەڵ عێراقدا یەکتری بگرن و، هەروەها وای پێ باش بوو لە باری ئابوورییەوە بۆ سوودی ویلایەتی مووسڵ کە بخرێتە سەر عێراق.[٣٦]

٥- ئەو ناوچەیەی ناکۆکی لەسەر بوو لە ڕووی ڕامیارییەوە سەر بەتورکیا بوو، تا وەکو تورکیا بەخۆی وازی لە مافەکانی خۆی هێنا و دەستی لێ هەڵگرت، هەروەکو چۆن عێراقیش مافی تیادا نییە بەپێی بنەمای ڕزگارکردن یا یاسا (مبدأ الفتح أو القانون) بەڵام عێراق دەتوانێت داواکاری مەعنەوی خۆی بکات، ئەویش ئەوەیە کەچی تازە دەوڵەتی عێراق دامەزراوە و پێکهاتووە بۆیە سروشتی خاکەکەی وا پێویست دەکات کە لەم شێوەیەی ئێستا لەسەریەتی بمێنێتەوە بۆ پەرە پێدانی بواری هێمنی و ئاسایشی وڵاتەکەی.

بەڵام لێژنەکە لە کۆتاییدا بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشت: ئەگەر هاتوو بەرژەوەندی دانیشتوانی ئەم ویلایەتە ڕەچاوکرا ئەوکات پێویستە دابەش نەکرێت، و لەسەر ئەو بنەڕەتەدا لێژنەکە لە دوای ئەوەی هەموو ئەو ڕاستییانەی کە لەبەر دەستدان نرخاند بەتایبەتی لە لایەنی ئابووری و جوگرافی بۆ ئەوە چوو لەبەرژەوەندی هەموو ئەو ناوچەیەی کەوا ناکۆکی لەسەرە و، دەکەوێتە باشووری هێڵی برۆکسل باشتر وایە لەگەڵ عێراق یەکتری بگرن و ببنەیەک. بەمەرجێک کە عێراق لە ژێر چاودێری بەریتانیا بمێنێتەوە بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ و، بایەخ بەئارەزووی کوردەکان بدرێت کە فەرمانبەری کورد بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتەکەیان دابمەزرێ و بۆ دابینکردنی دادپەروەری و فێرکردن لە قوتابخانەکان و، زمانی کوردی ببێتە زمانی ڕەسمی بۆ هەموو کارگوزارییەکان و، بەپێچەوانەی

ئەوەشەوە چاکتر وایە بۆ ئەم ناوچەیە، کە لە ژێر دەسەلاتی تورکیادا بمێنێتەوە کەوا باری ناوەخۆیی و ڕامیاری دەرەوەی لە عێراق لە بارتر و جێگیرترە.[٣٧]

**٤- بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ لکاندنی ویلایەتی مووسڵ بەعێراقەوە:**

ڕاسپاردەکانی لێژنەی ناوبراو پێشکەشی بەکۆمەڵەی نەتەوەکان کرا لە تەمموزی ساڵی ١٩٢٥ و، ئەنجوومەنی ناوبراو داوای لە دادگای دادی نێو دەوڵەتی کرد کە هەندێ خاڵی بۆ ڕوون بکاتەوە و دوای ئەوە لە ٨/ کـانوونی یەکـەمی ١٩٢٥دا چاوێکی تری بەم ناکۆکییەدا خشاندەوە لە کۆتایی ئەو کۆبوونەوەی کە لە ١٦/ک١/ هەمان ساڵدا بەسترا، کە تیایدا نوێنەری تورکیا نەهاتبوو ئەوکات پرۆژەی بڕیارێک کە نیازبوو بۆ دەنگدان پێشکەش بکرێت سەبارەت بەکێشەی ویلایەتی مووسڵ ئامادەکرابوو، وە ئەم بڕیارەش سەرچاوەکەی بەشێوەیەکی بنچینەیی لەسەر هێڵەکانی سەرەکی کە لە ڕاپۆرتی لێژنەی لێکۆڵینەوە هاتبوو وەرگرتبوو، ئەنجوومەنی ناوبراو ئەو ڕاپۆرتەی بەوردی و دەستپاکی ناوبردبوو پێش پێشکەشکردنی ئەم بڕیارەش بۆ دەنگدان سەرۆکی ئەنجوومەن بەبیر ئەندامەکانی هێناوە کەوا ئەگەر هاتوو وا بەتەمابوون کە بڕیارەکەیان ئەو کارەی مەبەستیانە بیکات ئەوکاتە پێویستە هەر هەموویان دەنگی لەسەر بدەن، لەگەڵ ئەوەش کە دەنگەکانی هەردوو لای ناکۆک ناژمێردرێت و لەگەڵ دانابێت بۆ مەبەستی ژماردنی دەنگەکان و لە پاشان بڕیارەکە پێشکەش کرا بۆ دەنگ لەسەردان وە بەکۆی هەموو دەنگەکان دەرچوو و، ئەم خالانەی خوارەوەی گرتە خۆی.[٣٨]

١- پێویستە هێڵی برۆکسل وەکو هێڵێک لە نێوان سنووری تورکیا و عێراقدا کاری پێ بکرێت.

٢- پێویستە حکوومەتی بەریتانیا بانگ بکرێت بۆ ئەوەی کە پەیمانێکی نوێ لەگەڵ عێراق پێشکەش بەئەنجوومەنی بکات کە تیایدا بەردەوامبوونی چاودێری بەریتانیا بۆ عێراق بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ بەردەوام بێت هەروەکو پێشتر لە پەیمانی ئەو هاوپەیمانێتییەی کە لە نێوان عێراق و بەریتانیا گیرابوو لەو بەڵێنەدا هاتبوو کە حکوومەتی بەریتانیا دابووی بەئەنجوومەن و، ئەویش لە ٢٧/ ئەیلولی/ ١٩٢٤دا ڕەزامەندی لەسەر پیشان دابوو، ئەگەر هاتوو عێراق بەئەندام وەرنەگیرا لە نەتەوە یەکگرتووەکان پێش کۆتایی ئەم ماوەیە.

٣- پێویستە داوا لە حکوومەتی بەریتانیا بکرێت بۆ ئەوەی چەند بیروڕایەکی کارگێری بۆ

ئەنجوومەن پێشکەش بکات بۆ زامنکردن و دابینکردنی مافەکانی کورد کە لەمەوپێش کورتەی کۆتایی ڕاپۆرتی لیژنەی لێکۆڵینەوە باسی لێوەکرا بوو.

٤- پێویستە داوا لە حکوومەتی بەریتانیا بکرێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو ڕاسپاردە و پێشنیازانەی کە لیژنەی لێکۆڵینەوە دابووی کە پەیوەندی بەهێورکردنەوەی بارودۆخەکە بوو و، پاراستنی تەواوی دانیشتووەکان بەهەموو ڕەگەزەکانیان زامن بکات و، هەروەها جێبەجێکردنی ئەم کاروبارانەی کە پەیوەندی بەکاری بازرگانی هەیە کە پێشتر لیژنەکە لە ڕاپۆرتی خۆیدا[٣٩] ئاماژەی بۆ کردبوو و زۆر بەزێدەڕۆیی نازانین ئەگەر بڵێین شتێکی زۆر سەیرو دەگمەنە کە بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزمی بەریتانیا[٤٠] لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی زۆربەی دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ ڕێک بکەوێت کە لیژنەی نێو دەوڵەتی بەڕاشکاوی دەڵێ ئەمەش دێتە دی لە ئەنجامی لکاندنی ویلایەتی مووسڵ بەعێراقەوە، بەمەرجێ سەرپەرشتی بەریتانیا لەسەر ویلایەتەکە بەردەوام بێت.

بەڵام ئەو هەوڵدانە گەرموگوڕانەی تورکیا کە بەمەبەستی هێشتنەوەی دەسەڵاتی خۆی بوو لەسەر ویلایەتی مووسڵ ئەویش سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو، هەر خۆی لەخۆیدا بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکان و خۆشگوزەرانی دانیشتوانی ئەم ویلایەتە نەبوو بەتایبەتی بۆ کوردەکان، کە تورکیا وای پیشان دەدا کە زۆر موکوڕە لەسەر پاراستنیان بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستی خزمەتکردنی ئامانجە ئابووری و ستراتیژییەکانی تورکیا بوو، ئەوەی شایانی باسە تورکیا لەکاتی هەوڵدانە دبلۆماسییەکانی بۆ مانەوەی ویلایەتی مووسڵ لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدا هەوڵی دەدا کەوا لەسەر بنەڕەتی یەکبوونی هەردوو گەلی کورد و تورک یاری بکات.[٤١] لەگەڵ ئەمەشدا تا دوێنێ تورکەکان خۆیان کەسی تر نا سووربوون لەسەر ڕەتکردنەوەی مۆرکردن لەسەر پەیمانی سیڤەر، چونکە باسی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆی تێدابوو. هەرچۆنێک بێت عێراقی نوێ لە ئەنجامی ئێش و ئازار و ژانێکی زۆر و گران و درێژ خایەن دروست بوو و، بەم سنوورەی ئێستای بووە دەوڵەتێکی خاوەن جێگەیەکی ستراتیژی زۆر گرینگ و، گەلێ داهاتی ئابووری تێدا هەیە، ڕووبەرەکەی دەگاتە (٤٤٦٧١٣)کم٢ واتە: (١٤٣٢٥٠)میلی چوارگۆشەییە.[٤٢] دەکەوێتە شوێنی یەکتر گرتنەوەی هەرسێ کیشوەرەکەی (ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقیا) وە بەنزیکترین ڕێگەی سەر زەوی دەژمێردرێت بۆ کەنداو دوایی بۆ هیندستان.

هەروەها پسپۆڕان وا پێشبینی دەکەن و بەتەمان کە گرینگی عێراق و بایەخی سەربازی بەرەو زیادبوون بچێت هەر کاتێک فرۆکەی تێدا بەکاربێت و، پشت بەهێزی ئاسمانی ببەستێت وەکو چەکێکی کاریگەر و یەکلاکەرەوە لە جەنگدا.(٤٣)

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی یەکەم

(١) سەبارەت بەبنەچەی وشەی (عێراق) و واتاکەی بیروڕای جیاجیا هەیە، ئەوەی کە لەم ڕاو بۆچوونانەی دەگوترێت لە سێ بۆچوون تێ ناپەڕێت. بۆچوونی یەکەم دەڵێت: کە ناولێنانی وشەی (عێراق) لە ڕەچەڵەکێکی عەرەبی هاتووە کە لە فەرهەنگی البلدان- الیاقوت الحموي الرومي ١٣٣/٦ بەم شێوەیەی خوارەوە هاتووە: قطرب دەڵێت:

(عێراق ناوی لێندراوە عێراق چونکە لە دەریا نزیک بووەتەوە و داری وەسباغی لێیە (تێدایە).

خەلیلیش دەڵێت: «عێراق ڕۆخی دەریایە و بۆیە ناوی لێنراوە عێراق چونکە لەسەر ڕۆخی ڕووباری دیجلە و فوراتە درێژ دەبێتەوە و دەڕوات تا دەگاتە دەریا... هەروەها دەڵێت: دانیشتوانی حیجاز ئەو شوێنەی کە نزیکی دەریایە بەعێراقی ناودەبەن». بەڵام بۆچوونی دووەم بریتییە لەوەی کە بنەچەی وشەی عێراق بۆ کەلەپووری زمانی سۆمەرییەکان یان نەتەوەکانی تر دەگەڕێتەوە.

هەروەها دەڵێن: وشەی عێراق بۆ یەکەم جار لەسەردەمی سەدەی دوازدەمی پێش لەدایکبوون دەگەڕێتەوە. کە تیایدا ناوی ئەو هەرێمە لەسەر شێوەی (ئەریقا) هاتووە کە لە دواییدا وەکو (ئولمستد) دەڵێت: بووە بەبنەچەی ئەو ناوە عەرەبییە کە لە وڵاتی بابل نراوە. هەروەها بۆچوونی سێیەم دەڵێ: وشەی عێراق لە ڕەچەڵەکەوە فارسییەو، لە فەرهەنگی وڵاتانی (یاقوت الحموي الرومي) ١٣٣/٦ هاتووە و دەڵێ: (هەمزە دەڵێت: دەم ئاو بەفارسی ناوی (ایراه الملک)ە بۆیێ (کوره أزدشیر) لە خاکی فارس بەئیرهستان ناو لێنا لەبەرئەوەی ئیراه بەلکاندنی قاف ئینجا گوتیان ئیراق».

لە (مفاتیح العلوم)ی خوارزمی و مێژووی ئەسفەهانی هاتووە کە هەردوو ناو لێنانەکان «ئیران» و «عێراق» هەردووکیان هەڵەن، بەڵکو ڕاستەکەیان (ئیراک)ە بەکافی فارسی و، ئەویش بنەچەی هەردوو ناولێنانی (ئیران) و (عێراقە). وە بەهەمان بۆچوون ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی ئەڵەمانی (هرتسفیلد) دەڵێ: عێراق لە وشەی ئیراکی فارسی بەعەرەبی کراوە، وە واتاکەی وڵاتی خوارەوە یان باشوور دەگەیەنێت. وە دەوروبەری (واسط) تاوەکو کەنداوی (بەسرە) سەربەم بەشە بوو لە دەوڵەتی ساسانی وە ئیراکستان هەر خۆی عێراقە و، وە هەروەها زاراوەی «العراق» لە هەردوو سەدەی پێنجەم و شەشەمی لە دایکبووندا بووە وشەیەکی سەرزار و باو، وە هەروەها بەکارهێنانی لە هۆنراوەکانی پێش ئیسلام دەستی پێ کرد کە زاراوەی «عێراق» لەلای شاعیرانی بادیە بەوڵاتی بەپیت و فەڕ ناسرابوو.

لەم بارەیەوە بڕوانە:

- دکتۆر (تقي الدباغ)- حضارة العراق- تأليف نخبة من الباحثين العراقيين- الجزء الاول. دار الحرية للباعة بغداد، ۱۹۸۵ص۱۳- ۱٤.
- عبدالرزاق الحسني- العراق قديماً وحديثاً - مطبعة العرفان. صيدا- لبنان- الطبعة الثالثة ۱۳۷۷هـ- ۱۹٥۸م ص ٦-۷.
- خالد عبدالمنعم العاني- موسوعة العراق الحديث- الدار العربية للموسوعات ، بغداد- المجلد الأول ص٦۱.

(2) Henry A. Foster. The Making of modern Iroq a Product of World Forces, Normon, Universitg of .Klahomapress 1933 Page I.

(3) Op. Cit. Page I.

(4) Op. Cit Page 3.

(٥) خالد عبدالمنعم العاني- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦۱.

(٦) نقلاً عن الدكتور فاضل حسين- مشكلة الموصل- دراسة في الدبلوماسية العراقية- الانگليزية- التركية وفي الرأيي العام- مطبعة الرابطة- بغداد- ۱۹٥٥ بدون رقم طبعة، ص۷۷.

(۷) لەسەرچاوەی پێشوو وەرگیراوە، ل ۷۷.

(۸) لەسەرچاوەی پێشوو وەرگیراوە. ل ۷۸.

(۹) حنا بطاطو- العراق الطبقات الاجتماعية والحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام الجمهورية- الكتاب الأول- ترجمة: عفيف الرزاز مؤسس الأبحاث العربية- الطبعة الأولى- بيروت- ۱۹۹۰، ص٥۹.

(10) Henry A. Foster, Op. Cit Page 3.

(11) Henry A. Foster, Op. Cit Page 3.

(۱۲) دکتۆر فاضل حسين- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ۷۹- ۸۲.

(۱۳) لیژنەی نێو دەوڵەتی ژمارەی دانیشتوانی یەزیدییەکانی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە دانیشتوانی کوردەکان باس کردووە، ئەمەش شتێکی ناڕاستە، لەبەرئەوەی زۆربەی مێژوونووسان و پسپۆڕان بڕیار لەسەر ئەوە دەدەن کە یەزیدییەکان کوردن و هەرچەندە لە ئاییندا جیاوازییان لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا هەیە، ئەوەی «ئیسلام» کە بەشی هەرە زۆری کوردەکان دەگرێتەوە، دکتۆر شاکر خصباک لەم بارەیەوە دەڵێت: «ئایینی یەزیدی زۆر لە گەریدەکان و نووسەرانی وروژاند بۆ زانینی ئایینەکەیان هەر بۆیەشە زۆری لەسەر نووسرا. لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانین بڵێین کە ئەم نووسینانە گەیشتبێتە ناوەڕۆک و ڕاستی ڕەچەڵەک و بنەچەی ئایینی یەزیدییەکان و بنچینەکانی بڕوا پێکردنیان و، مشتومڕێکی زۆر دەربارەی ڕەچەڵەکی ئەم ناوە (یەزیدی) وروژاندرا، هەر چۆنێک بێت و لەگەڵ هەبوونی جیاوازییەکی زۆر دەربارەی ناولێنانیان، بەڵام نووسەران هەموویان لەسەر ئەوە ڕێکن کە دەگەڕێتەوە بۆ کورد، واتە (کورد)».

الدكتور شاكر خصباك- العراق الشمالي- دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية- مطبعة شفق- بغداد- ط/١ ١٩٧٣-ص١٨١- ١٨٣.

(١٤) الدكتور فاضل حسين، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٥

(١٥) مادده ٦٢ لیژنەیەک ئامادده دەبێت کە مەڵبەندی لە ئەستانەیە و، لە سێ ئەندام پێکهاتووە و، هەر ئەندامێک لەمانە لە لایەن یەکێک لە حکوومەتەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی، لە میانی شەش مانگدا لە بەرواری جێبەجێکردنی پەیمانی ئۆتۆنۆمیی دادەمەزرێت، سەبارەت بەو ناوچانەی کە رەچەڵەکی کوردی تێدا هەن و کەوتوونەتە رۆژهەڵاتی رووباری فورات و پێش گەیشتن بەسنووری باشووری ئەرمینیا، هەروەها کە سنوورەکانی لە دواییدا دەتوانرێ دیاری بکرێت و، سنووری تورکیای ئەو ناوچانە لەگەڵ سنوورەکانی سوریا و عێراقدا بەپێی ئەو باسکردنەی لە هەردوو دەقدا دووەم و سێیەم لە برگەی دووەم لە ماددەی (٢٧)دا هاتووە دەروات، بەڵام ئەگەر رێکەوتن لەسەر هەر بابەتێک نەکراو ناکۆکی پەیدا بوو هەر یەکێک لە ئەندامانی لیژنە ئەو ناکۆکییە بۆ حکوومەتەکەی خۆی بەرزدەکاتەوە، ئەم پرۆژەیەیش پێویستە مسۆگەرکردنێکی تەواوی تێدابێت بۆ پاراستنی کلدانی و ئاشوورییەکان و کەمە نەتەوایەتییەکانی تر لە رەگەز و لە ئایین کە لەو ناوچانەدان و، بۆ ئەم مەبەستە لیژنەیەک دەستنیشان دەکرێت لە نوێنەرانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و ئێران و کورد بۆ لێکۆڵینەوە و بریاردانی راستکردنەوەی سنوورەکان، ئەگەر هاتوو وە بەپێویستیان زانی لەسەر سنووری تورکیادا ئەنجام بدرێت، چونکە بەپێی دەقەکانی ئەم پەیمانە ئەم سنوورەی نابراو لەگەڵ سنووری ئێران یەکتر دەگرنەوە.

ماددەی ٦٣: حکوومەتی عوسمانی لە ئیمرۆوە بەڵێن دەدا بۆ پەسەندکردن و جێبەجێکردنی بریارەکانی هەردوو لیژنەی قومسیۆنی باسلێکراو لە مادده (٦٢) لە ماوەی (٣) مانگدا لە بەرواری ئاگاداربوونەوەی بەم بریارانە.

مادده(٦٤): ئەگەر هاتوو لە ماوەی ساڵێک گەلی کورد دانیشتوانی ئەم ناوچە دیاریکراوانەی لە مادده (٦٢) باسکران داواکارییەکیان لە ماوەی ساڵێکدا پێشکەش کرد لە دەستپێکردنی رۆژی ئەنجامدانی ئەم پەیمانە بۆ کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان تێیدا روون بکەنەوە کە زۆربەی دانیشتوانی ئەم ناوچانە ئارەزوو دەکەن بۆ ئەوەی لە تورکیا جیابنەوە، وە ئەگەر کۆمەڵەی ناوبراو رایسپارد کە ئەم گەلە دەتوانێ بەسەربەخۆیی بژی ئەو کاتە تورکیا لە ئێستاوەرا بەپێی ئەم راسپاردەیە رەفتار دەکات و، لە هەموو مافەکانی خۆی جیاوکییەکانی لەم ناوچانەدا دەست هەڵدەگرێ و، واز دەهێنێت و، دریژە پێدانی ئەم دەست هەڵگرتنە کە بابەتی ئەم رێکەوتنە تایبەتییەیە دەبەسترێ لە نێوان گرنگترین دەوڵەتانی هاوپەیمان و تورکیا. لە کاتی ئەم دەست هەڵگرتن و واز لێ هێنانەدا و ئەوکاتی هیچ بەرەنگارییەک لە لایەن دەوڵەتانی هاوپەیمانی ناوبراو بەرامبەر بەیەکگرتنی ئەو کوردانەی کە لە بەشێکی خاکی کوردستانی ناوەوەدا نیشتەجێ بووینە و تاکو ئیمرۆ لە ویلایەتی مووسڵدا بەیەکگرتنێک و بەیەکبوونێک دادەنرێت بەویست و ئارەزووی خۆیان لەگەڵ حکوومەتە کوردەکانی سەربەخۆ.

(١٦) لەگەڵ ئەوەش باسکردنی کورد پشت گوێ خرا لە دەقەکانی پەیمانی لۆزان؛ بەڵام لە دانیشتنەکانی کۆنگرەی لۆزان گفتوگۆی درێژخایەن کرا دەربارەی کوردی ویلایەتی مووسڵ لە نێوان شاندی بەریتانی و تورکی بیانوو هێنانەوەی تورکیا بۆ خستنە سەر ویلایەتی مووسڵ ئەوەبوو ئەو خەمخۆری کوردەکانە کە لە ڕەگەز و خوێن لەگەڵ تورکەکان یەکن؛ کەچی بەریتانیا پێچەوانەی تورکەکان بوو لەو ڕووەوەو؛ دەیگوت: کوردەکان جیاوازن لەگەڵ تورکەکان.

(١٧) بۆ هەمان واتا بڕوانە: علاءالدین سجادی- شۆڕشەکانی کورد و کۆماری عێراق- چاپخانەی مەعارف- بەغدا- ١٩٥٩ لا٩٣.

(١٨) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية- الجزء الاول- مطابع دار الشؤون الثقافية العامة- بغداد- الطبعة السابعة- ١٩٨٨ ص٢٨١

(19) Henry A. FOSTER, Op. Cit Pages 152- 153

(٢٠) الدكتور فاضل حسين- سەرچاوەی پێشوو ص٤٠- ٤٥.

(٢١)سەرچاوەی پێشوو ص٥٠.

(٢٢) سەرچاوەی پێشوو ل ٥٢.

(٢٣) سەرچاوەی پێشوو ل ٥٣- ٥٤.

(24) Henry A. Foster, Op. Cit Pages 159 .

(٢٥) الدكتور فاضل حسين- سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩- ٦٠.

(٢٦) الدكتور فاضل حسين- سەرچاوەی پێشوو ل ٦١- ٦٢.

(٢٧) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية- الجزء الأول- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٤- ٢٧٥

(28) Henry A. Foster, Op. Cit Pages 157 .

(٢٩) الدكتور فاضل حسين- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٧.

(٣٠) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية- الجزء الأول- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٦.

(٣١) ئەو لێژنەیە بەبێ هەق جیاوازی کرد لە نێوان کوردەکان و یەزیدییەکان لەگەڵ ئەوەش کە لەیەک ڕەگەزبوون.

(32) Henry A. Foster, Op. Cit Pages 161.

(٣٣) Henry A. Foster, Op. Cit Pages 162 الدكتور فاضل حسين- سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٢.

(٣٤) لەمەوە وەرگیراوە Henry A. Foster, Op. Cit Pages 161 هەرچەندە دکتۆر فازل حسێن لەم کۆکردنەوەیەدا هەڵەی کردووە کە گوتوویەتی کۆی گشتی دانیشتوان حەوت سەد و نۆهەد و نۆهەزار و نۆسەد و نۆهەد کەسن. بڕوانە دکتۆر فازل حسێن- سەرچاوەی پێشوو ل ٨٢.

(35) Henry A. Foster, Op. Cit Pages 165 .

(٣٦) الدكتور فاضل حسين- سەرچاوەی پێشوو ل ١١٥.

Henry A. Foster, Op. Cit Pages 166

(37) Henry A. Foster, Op. Cit Pages 166- 167 .

(38) Henry A. Foster, Op. Cit Pages 172- 173.

(39) Henry A. Foster, Op. Cit Pages 173.

(٤٠) بەرژەوەندییە ستراتیژو ئابوورییەکانی ئیمپریالیزم- نەک بەرژەوەندی گەلی عێراق و، چاوە ڕەشەکانی مافی عێراقییەکان لە دوای هەڵوێستی بەریتانی بەدی دەکرێت، بۆیە هەر ئەوبوو بەمسۆگەری پاڵی بە بەریتانیا وەنا کە زۆر هەوڵ و کۆششێکی بەگەرم و گوڕی بدات بۆ ئەوەی ویلایەتی مووسڵ بخاتە سەر عێراق و، ئەو بەرژەوەندییانەش لەوەوە هەڵدەقوڵا کە ئەم ویلایەتە وەک بلێیی لەسەر دەریاچەیەکی لە نەوت مەلە دەکات و، پێویست بوونی بەریتانیای ئیمپریالیزم بۆ ئەم ماددە گرینگە و کاریگەرە، لەمەش ڕوون و ئاشکراتر نییە کە وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (لۆرد کرزن) کە دانی بەوە داناوەو دەڵێ: «هاوپەیمانان وەک بلێیی لەناو شەپۆلی دەریایەک لە نەوتدا مەلەوانی دەکەن و بەرەو سەرکەوتن دەچن هەروەها گرنگی ئەم ماددەیە بوو لە دوای ئەو سیاسەتی نەخشە کێشراوە ڕاوەستابوو کە (سرآرنست کاسل Sir- Ernest Cassel) بۆ دامەزراندنی کۆمپانیایەکی نوێی نەوتی تورکی و پاڵی بەحکوومەتی بەریتانیا نا بۆ ئەوەی لە ڕێگای فەرماندەی دەریای خۆی کە سیر ونستون تشرشل Sir- Winston Chuchil بوو بۆ دەست بەسەراگرتنی کۆمپانیای ئینگلیزی فارسی و لقەکەشی کە کۆمپانیای نەوتی تورکی بوو هەروەها (اسکویت) سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا ڕوون و ئاشکرای کرد کە هۆی هەبوونی پاپۆڕەکانی بەریتانی لە کەنداودا لە کاتی دەست پێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٤دا بۆ پاراستنی کێڵگەکانی نەوت بوو، هەروەها ئەو ئامۆژگارییانەی کە بۆ سەرکردەی هەڵمەتی بەریتانی کە ناوی لێنرابوو (هەڵمەتی D) ڕەوانەکراو، لە دواییدا بۆ (فاو) شۆڕبووەوە لە ٣/ت٢/١٩١٤دا تیایدا هاتبوو و دەڵێت: پێویستە دەست بەسەر دوورگەی عەباداندا بگرێت بۆ پاراستنی بیرەکانی نەوت و هێڵەکانی بۆری کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی فارسی. سەرەڕای گرینگی نەوت و، پێویستی بەریتانیا بۆی لەم لاوە هەندێ بەرژەوەندی ستراتیژی تریش بۆ ئەم دەوڵەتە ئیمپریالیستە هەبوو بۆ خستنە ژێر باڵی ویلایەتی مووسڵ بۆ عێراق کە دەکەوێتە سەر خاڵی بەیەکگەیشتنی هەرسێ کیشوەرەکە (ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقیا) وە لە ڕێگای ئەم پێ لکاندنەوە کورتترین ڕێگای دەرەوە لە کەنداو بەدەست دەهێنێت لە پاشاندا بۆ هیندستان کە بەگەوهەری کڵاوی شاهانەی بەریتانیا بەبەکارهێنانی خاکی عێراق لەمەشدا ویلایەتی مووسڵ بۆ مەبەستی لەشکر ڕاکێشی و سەربازی بەکار بهێنێت، هەروەها بۆ زانینیش کە عێراق بەبێ ویلایەتی مووسڵ زۆر بێ هێز و لاواز دەبێت و، ناتوانێت بەخزمەتکردن و هێنانەدی ئاوات و ئامانجە ستراتیژییەکانی بەریتانیا بکات. کە (لورد کێرزن) وەزیری دەرەوەی بەریتانیای ئەوکات بوو باسی کردبوو، کە ئینگلیزەکان وا دەبینن کە سنووری ڕۆژئاوای هیندستان بەتەنیشت فوراتدا تێپەڕ دەبێت و ناتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت تەنها لە ڕێگای مووسڵدا نەبێت.

بۆمەش بڕوانە: دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد (کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى) وەرگێڕانی: محەمەدی مەلا کەریم- کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا ١٩٧٧ ل ١٩٤- ١٩٥.

(٤١) هەوڵەکانی تورکیا بۆ بانگهێشتەی یەکبوونی هەردوو گەلی کورد و تورک گەیشتە پلەیەکی زۆر بەرز و تا ئەو ڕادەیەی کەوا نوێنەری تورکی لە کۆنگرەی لۆزان (عصمەت پاشا) بڵێت- ئەو کەسانەی کە شارەزای ئەنادۆڵن دەزانن بەتەماشاکردنێک بۆ ڕەفتار و بەکارهێنان کە کوردەکان هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ تورکەکان و، ئەوانیش هەرچەندە بەدوو زمانی جیاواز قسە دەکەن، بەڵام ئەوان یەک توخمن بەگوێرەی ڕەگەز و ئایین و ڕەفتار. بەڵام بەپێچەوانە هەموو سەرچاوە مێژووییەکان لەسەر ئەوە کۆدەبنەوە و دەڵێن ئەم دوو گەلە بۆ دوو ڕەچەڵەکی جیاواز دەگەڕێنەوە و، لە ڕاستیدا ئەم هەوڵدانانە وانەبێ بۆ خاتری کورد بووبێت، چونکە ئەگەر هاتو تورکیاش بەم پلەیە دڵسۆز بایە بۆ کوردەکانی ویلایەتی مووسڵ، ئایا بۆچی هەولی بەتورککردنی کوردەکانی ئەنادۆڵ و جێگاکانی دیکەی دەکرد و، ئەگەر هاتوو تورکیا ئارەزووی وابوایە کە بەویستی دانیشتوانی ویلایەتەکە جێبەجێ بکرێت، ئەی بۆچی داوای ڕاپرسی ئازادی نەدەکرد هەتا دەگاتە سەربەخۆ بوون؟ نەوەک تەنها داوای ڕاوەرگرتن و پرس پێکردنی دانیشتوانی ئەم ویلایەتە سەبارەت بەخستنە سەر تورکیا و یان نەخستنە سەریدا. بەوردبوونەوەیەکی کەم لە ڕێڕەوی ئەم کارانەدا بۆمان بەدیار دەکەوێ کە ڕاستی هەڵوێستی تورکیا بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونە دیارانەی بوو کە دەڵێ هێشتنەوەی دانیشتوانی ویلایەتی مووسڵ و لەمانیش کوردەکان لە ژێر دەسەڵاتی تورکیا باشترە چونکە بەلکاندنی ئەم ویلایەتە بەعێراقەوە دەبێتە هۆی زیانبەخشینێکی دووهەندە بەتورکیا.
کە ئەم ویلایەتە پڕ لە ئابووری و ستراتیژییە گرینگییەکە لە دەست دەدا، ئەمەیان لە لایەک و لەلایەکی تریشەوە لکاندنی کوردەکانی ویلایەتی ناوبراو بەعێراقەوە دەبێتە هۆی وەدەستهێنانی هەندێ مافی ڕۆشنبیری و نەتەوایەتی، ئەمەشیان وا لە ڕۆڵەکانی کوردەکانی کوردستانی باکوور دەکات و دەیان وروژێنێ کە دەبێتە هۆی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی تورک بکەوێتە مەترسییەوە، چونکە ئەمەش لە ڕەگ و ڕیشەوە پرۆژەی کەمالی هەڵدەتەکێنێ کە بەتەمابوو کوردەکانی ئەنادۆڵ و ناوچەکانی کەوتۆتە باکوورەوە بکرێن بە تورک. بۆ ئەمەش بڕوانە:

Henry A. Foster, Op. Cit Pages 174- 175

(٤٢) عبدالرزاق الحسني- العراق قديما- وحديثا- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧.

(٤٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٧.

ئاخافتنی دووەم

# عێراق لە سایەی داگیرکردن و ئینتیدابی بەریتانیادا

## یەکەم: عێراق لە سەردەمی داگیرکردنی بەریتانیادا

پەیوەندی نێوان ئینگلیز و عێراق بۆ کاتێکی پێشتر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، بەڵکو ئەم پەیوەندییە بۆ سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم دەگەڕێتەوە[1]. هەر ئەم پەیوەندییەش لە سەرەتادا پەیوەندییەکی بازرگانی تەواوبوو، بەڵام لەگەڵ ڕۆژگاردا بۆ پەیوەندییەکی ڕامیاری تەواو گۆڕا.[2]

لەبەر چەند هۆیەک لەمانە هۆیەکانی ستراتیژی کە عێراق کەوتۆتە سەر دووڕیانی سێ کیشوەر (ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپا)،[3] هەروەها بەئاسانترین ڕێگا دەژمێردرێ بۆ کەنداو هیندستان کە بەگەوهەری پرشنگدار بۆ پادشایەتی بەریتانیا دەژمێردرێت و؛ لەبەر گرینگی ئابووری عێراق کە دۆڵی ڕافیدەینی بەپیت و بەرەکەت و زۆر بیری نەوت و کانزاکان دەگرێتە خۆی، هیچ بەڵگەیەکی بەهێزتر نابینین لە بایەخدانی بەریتانیا بەعێراق وەکو ئەوەی کە لە دووپاتکردنەوەی (لورد کیرزن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیای ئەوکات کە لە پێش ئەنجوومەنی لۆردەکانی بەریتانیا لە ساڵی (١٨٩٢)دا گوتووبووی «بەغدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەچێتە ناو کۆمەڵەی بەندەرەکانی کەنداو، بۆیە پێویستە بخرێتە ژێر چاودێری بەریتانیا بەتەواوەتی»[4] لە دواییدا (لۆرد کیرزن) بەخۆی دووبارەی کردەوە لە (١٩١١) لە پێش ئەنجوومەنی لۆردەکانی بەریتانیا ئاشکرای کرد کە (ئێمە بەهەڵە دادەچین کەوا دابنێین بەرژەوەندییەکانی ڕامیاریمان تەنها لە کەنداو دایە. بەڵکو تەنها لە کەنداودا نییەو، ئەم بەرژەوەندییە وانەبێ لە نێوان (بەسرە و بەغدا دابێت)، بەڵکو لەمە پتر دەڕوات و تا دەگاتە بەغدا خۆی».[5]

لەشکری بەریتانیا کە ناوی لێنرابوو لەشکری (هەڵمەتی D)[6] گەیشتە ئاوی کەنداوی عەرەب لە ڕۆژی سێیەمی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩١٤)دا شاری فاوی گرت لە شەشەمین ڕۆژی هەمان مانگداو، لە دواییدا هێزەکانی ناوبراو شاری بەسرەیان گرت لە ڕۆژی (٢٢)ی هەمان مانگداو، هێزەکانی بەریتانیا بۆ چوونە پێشەوەی قووڵایی وڵات هەنگاویان ناو، لە ڕێگەی خۆیاندا شار و شارۆچکە و زەوی و زاری پتریان کەوتە

بەردەست، ئەوەی ڕاستی بێت کاری ئەم هێزانە سووک و ئاسان نەبوو، لەبەرئەوەی تووشی شکستییەکی گەورە هاتن لە شاری (کووت)دا.[٧] بەڵام ئەمە وای لێ نەکردن کە پاشگەزببنەوە لە تەواوکردنی ئەو ئەرکەی سەرشانیان. ئەو لەشکرە بەسەرکردایەتی ژەنەڕاڵ (مۆد) لە یانزەی مانگی ئاداری ١٩١٧ بەغدای داگیرکرد، لە پاشان بەرەو ویلایەتی مووسڵ بەڕێکەوت و، ئەوکاتی کە پەیمانی (مدروس)[٨] Mudros لە ٣٠ مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا مۆر کرا، ئەم لەشکرە گەیشتە دەوروبەری نزیک شاری مووسڵ و، دەستی بەسەرداگرت و، ئەو شارۆچکانەشی کە سەر بەویلایەتی مووسڵ بوون داگیرکرد بەپێی مەرجەکانی ئاگر بەست[٩](ایرلاند)یش Irland دەڵێ «لە ماوەی چوار ساڵدا ١٩١٤- ١٩١٨ سوپای بەریتانیا ئەو کارەی تەواوکرد کە بازرگانی و دیبلۆماسی لە پێش سی سەدە دەستی پێ کردبوو»[١٠]. هەروەکو پێشتر ڕوونمان کردەوە بەریتانیا لەگەڵ فەڕەنسا لە ١٥- ١٧/ مایسی ١٩١٦ ڕێکەوتنامەی سایکس- بیکۆی بەنهێنی مۆرکرد بوو کە بەپێی ئەم ڕێکەوتنامەیە بەریتانیا عێراق و فەلەستینی پێ درابوو، بەڵام سوریا و لوبنان و ویلایەتی مووسڵ بەبەر فەڕەنسا کەوتبوون، بەڵام لە دوای داگیرکردنی تەواوی ویلایەتی مووسڵ لە لایەن بەریتانیاوە لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨دا (لوید جورج) سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا توانی کە (جورج کلیمنصو) سەرۆک وەزیرانی فەڕەنسا ڕازی بکات بەوەی کەوا دەست لەم ویلایەتە هەڵبگرێت بۆ بەریتانیا.

داگیرکردنی بەریتانیا بۆ ئەم وڵاتە بەردەوام بوو و، هێزەکانی داگیرکەر هەندێ لە یاساکانی خۆیان پیادەکرد، وەکو یاسای سزاکانی بەغدایی کە پێک هاتبوو لە تێکەڵاوکردنی هەردوو یاسای ئینگلیزی و هیندی و، هەروەها هەڵسا بەدامەزراندنی ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرەکانی ئینگلیز بەناوی دەسەڵاتداری ڕامیاری لەم ویلایەتانە و شارەکان و شارۆچکە گرینگەکاندا دامەزراند و، هەموو کارەکان بەتەواوی بەم ئەفسەرانە سپێردران. بەغدا و مووسڵ و شارو ناوچەکانی تر بەردەوام لە ژێر ئەشکەنجە و ئازاری داگیرکردنی بەریتانیا دابوون، تاکو ٢٥/ نیسانی/ ١٩٢٠، ئەو ڕۆژەی کەوا ئەنجوومەنی باڵای هاوپەیمانەکان لە (سان ڕیمو) بڕیاری دا بەپیادەکردنی سیستەمی ژێر چاودێری (إنتداب) لەسەر عێراقدا و، ئەوەش دەبێتە بابەتی باسەکەمان لە بڕگەی داهاتوودا.

## دووەم: عێراق لە سایەی ئینتدابی بەریتانیادا:

لای کەس شاراوە نییە چاو چنۆکی و تەماعکاری ئیمپریالیزمی بەریتانیا لە عێراقدا، هەر لەبەر ئەوەش بەریتانیا ئەم هەموو قوربانی و زیانەی[١١] لە پێناوی داگیرکردنی ئەو وڵاتانەدا بۆ ئەوەنەبوو کە بەخێرایی و ئاسانی وازی لێ بهێنێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەبوو کە بەچەندەها بەرامبەر ئەو زەرەر و زیانە قەرەبوو بکات، لەبەر ئەوە بیری لە گۆڕینی شێوەی مانەوەی لەم وڵاتەدا لە داگیرکردن بگۆڕێ بۆ شێوەیەکی پتر گونجاو پەسندکراو لە لایەن دانیشتوانیدا، وە هەر لەم بارەیەوە کۆنگرەی هاوپەیمانەکانی بەستراو لە (سان ریمو) لە (٢٥)ی نیسانی ١٩٢٠ بڕیاری دا کە دەسەڵاتی چاودێریکردن (ئینتداب)[١٢] بۆ سەر عێراق بدرێت بەبەریتانیا، بەڵام ئەم جۆرە سیستەمە نارەزایی لەسەر نیشاندرا لە لایەن هەموو چینەکانی گەلی عێراق، کە هەستیان بەبێ هیواییەکی گەورەکرد لە ئەنجامی بێ وەفایی هاوپەیمانەکان بەرامبەر بەڵێنەکانی پێشوویان لە دانپیانانی سەربەخۆییەکی تەواو و بێ مەرج بۆ ئەو وڵاتانەی کە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا پچڕابوون. هەروەها ئەم سیستەمە بەسەر هەموو وڵاتدا بەبێ پرس پێکردنی گەلەکەی سەپێنراو، بەپێچەوانەی ناوەڕۆکی ماددەی (٢٢) لە بەڵێنی کۆمەڵی نەتەوەکان، جگە لەمەش ئەم سیستەمە لە عەباییێک زیاتر نییە کە کۆلۆنیالزمی بەریتانیای تەماع کار لە خێر و بێر و سەرچاوەکانی ئەم وڵاتانە خۆی لە پشتیدا شاردبووەوە.[١٣] سەرەڕای ئەوەش چاودێریکردن (ئینتیداب) سیستەمێکی دواکەوتووە و لە ناوەڕۆکیدا وەکو هینری فوستر (Henry Foster) دەڵێت: لە ڕێکەوتنامەی سایکس بیکو دەچێت و ناوبراو بۆ ئەم مەبەستە دەڵێت: «لەسان ریمو لە ڕۆژی ٢٥/ی نیسانی/١٩٢٠ ئەنجوومەنی باڵا مەسەلەی چاودێریکردنی (ئینتیداب) ئەو وڵاتانەی کە لە تورکیادا پچڕابوون هەروایان لە بەریتانیا و فەرەنسا کرد و، لەبەر ئەوەش گیانی پەیمانی سایکس بیکو جارێکی دیکە دووبارە بووەوە و هیچ بایەخێکی ئەوتۆ بەویستی میللەتان نەدرا». وە هەندێک لە شارەزایان پەلاریان لێداو ڕەخنەیان لێ گرت و گوتیان: لە ژێر چاودێری بوون (ئینتیداب) مونافیقترین ڕێگەیە کە سیاسەتی جەنگی گەورە هێنایتە کایەوە ئەمەش تەنها بریتییە لە دەست بەسەرداگرتنێکی شاردراوە.[١٤]

هەستکردن بەسەرنەکەوتن و ئەو تاڵییەی کە پەیدا بوو لە ئەنجامی پیادەکردنی ئەم سیستەمەو، توندوتیژی و ناشارەزایی (کولونیل ئی. تی. ولسون E. T. Wilson

نوێنەری بەرزی دەسەڵاتداریەتی پادشای بەریتانیا لە عێراقدا و، بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتدارانی ڕامیاری بەریتانیایی لە وڵاتەکەدا، کە زۆربەیان لەو ئەفسەرانە بوون کە شارەزایی پێشوویان لە هەڵسووڕاندنی کاروباری وڵاتدا نەبوو، وە تێنوێتی خەڵکەکە بۆ سەربەخۆیی و، سەرەڕای چەند هۆیەکی دیکەی تر لێرەدا بواری باسکردنیان نییە، ئەمانە هەموویان بوونە هۆی داگیرساندنی کڵپەی شۆڕش لە عێراقدا دژ بەداگیرکەرانی ئینگلیز لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٠دا، ئەوەش هەروەکو گڕ داگرتنی ئاگر لە پووش و پەلاشدا، لە سەرتاپای وڵاتدا (لە باکوورەوە تاکو باشووری) گرتەوە و، کوردیش شان بەشانی برا عەرەبەکانی بەشداری لەم شۆڕشەدا کرد و، خوێنی کورد تێکەڵ بەخوێنی عەرەب بوو لە پێناوی سەروەری و بەرزی وڵاتدا و ڕەتکردنەوەی داگیرکردن و دەست بەسەراگرتنی کۆلۆنیالزمی بەریتانیایی.(١٥)

ئەم شۆڕشە شەش مانگ بەردەوام بوو و، ڕۆڵە نەبەردەکانی عێراق زۆر لاپەڕەی سەروەری و فیداکارییان لە پێناو نیشتمان و سەربەرزیدا تۆمار کرد و، هەردوو لایەن زیانێکی زۆریان لە گیانی و ماڵیدا لێ کەوت، بەڵام توندوتیژی دەسەڵاتدارانی-بەریتانیا و بەکارهێنانی چەکی هەمە چەشن، لەمانەشدا فڕۆکە بەکارهێنان لە لایەک و، کەم شارەزای شۆڕشگێڕان لە ڕێکخستنی باش و نوێ و، کەمی چەک و تفاقیان لە لایەکی دیکەوە بووە هۆی کۆتایی هێنان بەشۆڕشەکە، بەرلەوەی ئامانجەکانی بێتە دی(١٦)، بەڵام دەسەڵاتدارەکانی بەریتانیا دەرسێکی وایان لەم شۆڕشەدا پێدرا لە لایەن شۆڕشگێڕان وای لێ کردن کە (کولونیل ئی. تی. ولسون) E. T. Wilson نوێنەری بەرزی پادشایەتی گشتی بەریتانی گۆڕدرا بە(سیر برسی کوکس Percyg cox)(١٧)، کە دامەزرا بەپۆستی نوێنەری بەرزی پادشایەتی لە عێراقدا، کە گەیشتە بەغدا لە ڕۆژی ١١/ت١/ ١٩٢٠ گەڕانەوەی ناوبراو بەوپلەو پایەیە بۆ وڵات بەکەمێک لە ڕەزامەندی پێشوازی لێ کرا چونکە پێشتر ناسرابوو بەوەی کە شارەزا و لێهاتووە و توانای لەگەڵ ڕۆیشتن و نەرماتی هەیە و،(١٨) یەکەم ئیشی سێر پرسی کوس Percy cox دامەزراندنی حکوومەتی عێراقی بەسەرۆکایەتی ناودارانی بەغدا عبدالرحمن النقیب لە ٢٥/ ١٠/ ١٩٢٠بوو.

شایانی باسە ئەم حکوومەتە لە ڕواڵەتدا عێراقی و بەڵام لە ناوەڕۆکدا بەریتانی بوو بۆ لیستی ڕێنماییەکانی ئەنجوومەنی وەزیران کە سیر برسی کوکس Percy cox دەری کردبوو، وە لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی بەستراو لە ١٠/ت٢/ هەمان ساڵدا خوێندرایەوە

و، کرایە چوارچیوە و پرۆگرامی کاری ئەنجوومەن، ڕاستی بۆ چوونەکەمان بۆ بەدیاردەخات کە وەزیری عێراق و ڕاوێژکارە بەریتانیاکەی لە هەمان پلەو پایەدا بوون، ئەم ئەنجوومەنەی لە ژێر چاودێری نوێنەری باڵا کە لە هەمان کاتدا بەتاکە لێپرسراو دەژمێردرێت بۆ کاری هەڵسووڕانی وڵات.[١٩] وە ئەم دێڕە شیعرەی خوارەوەی شاعیری گەورەی بەناوبانگی عێراق مەعروف ئەلرەصافی باشترین بەڵگەیە بۆ ئەم بۆچوونە:

علم و دستور و مجلس أمةٍ　　　كل عن المعنى الصحيح محرف[٢٠]

بەڵام قۆناغی داهاتوو لە ئەرکی سیر پرسی کۆکس Percy cox ئەوەبوو کە پادشایەک بۆ وڵات بهێنێتەوە تاوەکو حکومڕانی عێراق بکات بەپێی بەرژەوەندی بەریتانیا بۆ ئەم مەبەستەش لە ١٢/ی ئاداری ١٩٢١ کۆنگرەی قاهیرە بەسترا بەسەرۆکایەتی وەزیری نوێی موستەعمەرات سرونستون تشرتل Sirwinston Churchill وە ئەم کۆنگرەیەش زۆر مەبەستی بەخۆیەوە دەگرت، هەندێکیان لە ڕواڵەتەوە بەدی دەکرا، وەکو: لێکۆڵینەوەی کەمکردنەوەی خەرجی بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و، بەندی واشی تێدا هەبوو کە شاردراوە بوو تێدا، وەکو: لێکۆڵینەوە لە دۆزینەوەی کەسێکی شیاو بۆ دامەزراندنی وەکو پادشا بۆ عێراق و، سربرسی کۆکس ئامادەی ئەم کۆنگرەیە بوو وەک سەرۆک شاند کە هەندێ لە وەزیرە عێراقییەکان و ڕاوێژکارە بەریتانییەکانی گرتبووە خۆیەوە، لە پاش ئەوەی هەندێ ناوی پاڵێوراو بۆ پادشایەتی عێراقی داهاتوودا[٢١] دوورخرایەوە،

هەر لەسەرەتاوە وا ڕێکەوتن کە بەرنامەیەک دابنێن بۆ چۆنێتی بەجێهێنانی ئەم هەڵبژاردنە.[٢٢] ئەمەش بەتەواوی جێبەجێ کرا، هەروەکو فەیسەڵی کوڕی حوسێن لەسەر عێراق بەپادشا دانرا و، ئەم مانورە دیبلۆماسییەی بەریتانیا بەکراسێکی میللی داپۆشرا لە ڕێگای ڕاوەرگرتنێکی پرسە خەسووانە کە لەسەرتاسەری عێراق ئەنجام درا، لەگەڵ ئەوەش کە ئەنجوومەنی وەزیرانی کاتی، ئەویش بەخۆی بەڵێنی دابوو بەپادشا پێش جێبەجێکردنی ئەم ڕاوەرگرتنە کە دووپاتی ئەوە دەکاتەوە ئەم کردەوەیە تەنها بۆ چاو بەستانەوەیە.

ئەوەی شیاوی باسە لیوای سولەیمانی بەشداری ئەم ڕاوەرگرتنەی نەکرد هەروەها شاری کەرکوک دەنگی خۆی نەدا بەمەلیک فەیسەڵ و ڕاوەرگرتنەکەی ڕەت کردەوە، بەڵام هەردوو لیواکانی مووسڵ و هەولێر دەنگی خۆیان دا و، بەمەرجێ مافەکانی کەمە نەتەوەییەکان دابین بکرێت لە دامەزراندنی ئەو دامودەزگایانەی کە لە پەیمانی سیڤەر بەڵێنیان درابوو دابمەزرێنن.[٢٣]

بەڵام لیوای بەسرە شاندێکی گەورە لە دانیشتوانی بەپێی قسەی (مس بیل) سکرتێرەی ڕۆژهەڵاتی نوێنەری بەرزی بەریتانی لە بەغدادا داوای چاوپێکەوتنی نوێنەری بەرزی بەریتانی (سیربرس کۆکس)ی کرد بۆ ئەوەی داواکاری هاووڵاتیانی پێشکەش بکەن کە بریتی بوون لە پێکهێنانی ئەنجوومەنی یاسادانان و کارگێڕی و پۆلیس و سوپای تایبەت بەبەسرا،[٢٤] هەروەها دەسەڵاتدارانی خۆ جێیەتی هەڵبستن بەکۆکردنەوەی باج و خەرجکردنی و، فەیسەڵ بەپادشاییەکی هاوبەش بۆ عێراق و بەسرە دابندرێت.

ئەمەو ژمارەیەک لە پیاو ماقووڵان و دیاری بەسرە پێشتر لە ١٣/ی مانگی حوزەیرانی ١٩٢٠ . یاداشتنامەیەکیان پێشکەش نوێنەری بەرز کردبوو لە بەغدا بۆ هەمان مەبەست[٢٥] و، لەگەڵ ئەوەی کە هیچ ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ نەکرابوو بۆ جۆری سیستەمی داواکراو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نیشانەکانی سیستەمی فیدراڵیزمی بەخۆوەگرتبوو، چونکە بریتی بوو لە داواکردنی دامەزراندنی بەڕێوەبردنێکی ڕامیاری سەربەخۆ و، دامەزراندنی ئەنجوومەنی یاسادانانی هەڵبژێردراو کە دەسەڵاتی تەواوی دەبێ، لە یاسا دانان و باج وەرگرتن و خەرجکردنی هەروەها لەداواکارییەکە پێشنیاز کرابوو ناوەکە هەردوو ویلایەتی عێراق و بەسرە ئەو ویلایەتەش بەیەکگرتووی عێراق و بەسرە ناو بندرێت.

بەڵام داواکارییەکە لە فیدراڵیزم زیاتری تێدابوو بەپێشنیازکردنی دامەزراندنی سوپایەکی تایبەت بەهەرێمی بەسرە.

وە لەبەرئەوەی کە چاودێریکردن (ئینتیداب) بەسیستەمێکی ناهەموار و بەدناوە لە لایەن عێراقییەکانەوە ناسرابوو بۆیە لایەنی بەریتانیا هەوڵی دا دووبارە پەیوەندی لەگەڵ عێراق دابڕێژێتەوە بەشێوەیەک کە شێوازی چاودێری ڕاستەوخۆی تێدا بەدی نەکرێت، بەڵکو ئەم پەیوەندییە بەجۆرێک دابڕێژرێتەوە لە پەیمانێک کە لە نێوان هەردوو حکوومەتی عێراقی و بەریتانیا ببەسترێت کە بەهۆیەوە سیستەمی چاودێری لە ناویدا داپۆشرێت و، بگونجێت لەگەڵ هۆش و ئارەزووی ڕۆژهەڵاتییەکان بەمەرجێک هیچ زیان بەناوەڕۆکی مەرجەکانی چاودێریکردن نەگەیەنێت کە کۆمەڵەی نەتەوەکان دەیویست[٢٦]، لە دوای گفتوگۆکردنی لە نێوان هەردوو حکوومەتی ناوبراو سەبارەت بەم پەیمانە لە ١٠/ت١/١٩٢٢ ئەم پەیمانە مۆر کرا کە تێیدا هاتبوو بەریتانیا هەوڵی ئەوە دەدات عێراق بچێتە ناو کۆمەڵەی نەتەوەکان، وە ئەم پەیمانە لە لایەن ئەنجوومەنی دامەزرێنەری عێراقی لە دوای دامەزراندنیدا پەسەند بکرێت[٢٧] وە ئەم ئەنجوومەنە کە بەیەکەمین

ئەنجوومەن لەم جۆرە لە عێراق دادەنرێ لە ٢٥/شوباتی/ ١٩٢٤کە هەڵبژێردرا دانیشتنەکانی خۆی لە ٢٧/ئاداری/هەمانساڵدا دەست پێ کرد سەرەتای کارەکانی دیکەشی بوو لە پەسەندکردنی پەیمانی ناوبراو کە لەوەوپێش باسی لێ کرابوو لە ١٠/حوزەیرانی/١٩٢٤.[٢٨]

وە هیچ زێدەڕەویەکی تێدا نییە ئەگەر بڵێین کە لە ڕاستیدا زۆر سەرسوڕهێنەرە بەڵکو بەپێچەوانەی دەستوورو دژی لوجیک (منطقە).

کە ئەنجوومەنی دامەزرێنەر وە لە پێش ئەم پەیمانە پەسەند بکات لە پێش دانانی دەستوور بۆ وڵات ئەو یاسای کە دەسەڵاتی تایبەتمەند بەپەسەندکردنی پەیمانەکان دەستنیشان دەکات، بەڵام بەرژەوەندی بەریتانیا وای پێویست دەکرد کە بەئاشکرا یاسا پێشێل بکات. وە لەوێشدا دوو کاری تری گرینگ هەبوون چاوەڕوانی ئەنجوومەنی دامەزرێنەر بوون؛ یەکێکیان: دەرکردنی یاسای بنەڕەتی بۆ وڵات کە لە ٢٠/تەمموزی/١٩٢٤پەسەند کرا، وە لە ٢١/ئاداری/١٩٢٥ بڵاوکرایەوە، بەڵام کاری گرینگی دووەم : دانانی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەران کە ئەنجوومەنی دامەزرێنەر(٢)ی/ئابی/١٩٢٤دا پەسەندی کرد وە هەروەها ئەنجوومەنی پیران بۆ ڕۆژی دوایی پەیمانی ناوبراوی پەسەند کرد.

بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان کە لە ١٦/ک١/١٩٢٥دا دەرچوو بوو دەربارەی ویلایەتی مووسڵی کە لە پێشەوە باسمان لێوە کردبوو عێراق و بەریتانیا پەیمانێکی نوێیان بەست لە ١٣/ک٢/١٩٦٢ کە بریتی بوو لە درێژە پێدانی ماوەی پەیمانی عێراقی بەریتانی بۆ (٢٥)ساڵ و، ئەنجوومەنی نوێنەرانیش لەسەر ئەم پەیمانەی لە ٢١/ک٢/١٩٢٦ پەسەند کرد.

لە ٥/حوزەیرانی/١٩٢٦دا پەیمانی سێ قۆڵی عێراقی- ئینگلیزی- تورکی بەسترا بەمەبەستی چاکردنی پەیوەندی نێوان عێراق و بەریتانیا لە لایەک و وە تورکیا لە لایەکی دیکەوە، لە دوای ئەوەی ئەم پەیوەندییانە تووشی هەژانێکی توند و نسکۆهات لە ئەنجامی ناکۆکی لەسەر ویلایەتی مووسڵ، وە ئەوەی شایانی باسە کە ئەنجوومەنی نوێنەران ئەم پەیمانەی بەتێکڕایی دەنگ لە ١٢/حوزەیرانی/ هەمان ساڵدا پەسەند کرد وە لە دوای ئەوەشدا بەتێکڕایی دەنگ و، لە هەمان ڕۆژدا پەیمانی ناوبراوی پەسەند کرد.

وە لە دوای گفتوگۆ و وتووێژێکی زۆر کە بەغداو لەندەن لە خۆیان گرتبوو وە هەندەی

نەمابوو کە بەنشوستی بگات، پەیمانی عێراقی بەریتانی سێیەم لە لەندەن١٤/ک١/١٩٢٧دا بەسترا، بەڵام ئەم پەیمانە و ئەو بەندە ناڕەوایانەی بەرامبەر بەعێراق تیایاندا هاتبوو بووە هۆی ڕوودانی تەنگژەی وەزاری خنکێنەر لە وڵاتدا، لەبەرئەوە پەسەند نەکرا، ئینگلتەرەش وازی لێ هێناو، لەبەرئەمەش پەیمانی سێیەم جێبەجێ نەکرا.(٢٩) وە لە ئەنجامی سووربوونی حکوومەتی عێراقی لەسەر هەراسانکردنی بەریتانیای گەورە بەدروستکردنی تەنگژەی وەزارەت و پێ داگرتنی لەسەر پێویستی بەریتانیا بۆ ئاشکراکردنی هەڵوێستی ڕاستی خۆی سەبارەت بەسەربەخۆیی بوونی عێراق و، چوونە نێو کۆمەڵەی نەتەوەکان، وە لەو کاتەی بەریتانیا هەستی کرد بەوردی هەڵوێستەکەی و، دوو دڵ بوونی بەوەی کەوا کاتێکی تەواو بەدەست نەماوە بۆ فێڵکردن و خۆ لێ دزینەوە حکوومەتی بەریتانیا بەشێوەیەکی ئاشکرا کە هیچ گومانی تێدا نەبێت ڕای گەیاند کەوا ئامادەیە بەوەرگرتنی عێراق لە کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ساڵی ١٩٣٢ بەبێ هیچ کۆت و مەرجێک.(٣٠) بەڵام لەم ڕاگەیاندنەی لەسەری ڕۆیشت و پیشانی دا کە پێویستە پەیمانێکی نوێ بۆ چاکردنی پەیوەندی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە ببەسترێت، بەمەرجێک ئەو شتانەی پێویستن بۆ ئامادەکردنی ڕەشنووسی پەیمانەکە لەسەر بنەڕەتی ئازاد و لەسەر شێوەی پەیمانی میسر و بەریتانیا دابڕێژرێت.(٣١)

لە دوای ئەوەی نوری سەعید پۆستی سەرۆک وەزیرانی عێراقی وەرگرت هەڵسا بەوتووێژکردن لەگەڵ لایەنی بەریتانی کە (سیر فرنسیس همفریز) باوەڕ پێکەری بەرزی بەریتانیا لە بەغدا نوێنەرایەتی دەکرد. وە ئەم گفتوگۆیەش لە دوو تەوەری بنەڕەتیدا چەق- بەست دەبوو:

١- دانپیانان بەپاراستن و پارێزگاریکردنی ڕێگای هاتوچۆی ئاسمانی بۆ خاوەن شکۆی بەریتانیا بەشێوەیەکی هەمیشەیی، لە هەموو بارێکدا.

٢- چوونی عێراق وەکو ئەندامێک بۆ ناو کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ساڵی (١٩٣٢)دا.(٣٢)

وە لە ٣٠/ی حوزەیرانی/١٩٣٠ پەیمانی عێراقی بەریتانی چوارەم وە پاشکۆکانی سەربازی و دارایی و پاشکۆی نهێنی پەیوەندیدار بەئێشکگرانی فڕۆکەخانە بەسترا. وە ئەنجوومەنی نوێنەران پەیمانی ناوبراو و، پاشکۆکانی لە ١٦/ت٢/١٩٣٠ پەسەندکرد.

لە ٢٣/مانگی ت١/١٩٣٢ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان کۆتایی پێ هێنانی سیستەمی چاودێری (ئینتیداب) وەرگرتنی وەکو ئەندامێک لەم ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیە

ڕاگەیاند و، بەم جۆرە مێژوو نووسی عێراقی ناسراو عبدالرزاق الحسنی لەسەری دەڕوا و دەڵێت: کە ئاهەنگی دەرچوونی یەکەم قوتابی لە کۆمەڵەی نەتەوەکان کە تاکە قوتابییە لە جۆری خۆی تاکو ئێستا کۆتایی پێ هات.(٣٣)

## پەراوێزەکانی ئاخاوتنی دووەم:

(١) ئەوکاتەی بۆ ئینگلیز مسۆگەر بوو کە بازرگانی کردن لەگەڵ هیندستاندا لە ڕێگای عێراق بایەخێکی زۆری هەیە، ئینجا لە کۆتایی ساڵی (١٦٠٠)دا (کۆمپانیای هیندستانی ڕۆژهەلاتی بەریتانی) کە ئەوکاتە هەستا بەپشتگیری لێکردنی دەسەلاتدارانی ئینگلیز لە هیندستان بەشێوەیەکی وا بتوانێ جێگەی پورتوگالی و هۆڵەندییەکانی بۆ بگرێتەوە، ئەوانەی کە خاوەنی (کۆمپانیای هیندستانی ڕۆژهەلاتی هۆڵەندی) بوون، فەرەنسییەکان خاوەنی کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی فەرەنسی بوون لە پاش ئەوەی ئەو ئاواتەی بۆ هاتەدی (کۆمپانیای هیندستانی ڕۆژهەلاتی بەریتانیا) هەوڵی دا بۆ ئەوەی جێ پێی خۆی لە هیندستان و دەوروبەری بکاتەوە، ئینجا ڕێکەوتنێکی لەگەڵ شای ئێراندا لە ساڵی (١٦٢٢) مۆرکرد کە بەپێی ئەم ڕێکەوتنە بەڵێن بەکۆمپانیای ناوبراو بازرگانی کەنداو بپارێزێ و بۆ ئەم مەبەستەش تاکو بەم کارە گرنگە هەڵبستێ دەستی کرد بەدروستکردنی کارگە و دیوار و شوورە لەسەر ڕۆخی دەریاکان و، دوو پاپۆڕی گەورەی هێنا بۆ زیادکردنی هێزی خۆی و، دەستی کرد بەگفتوگۆی ڕامیاری کە پتر لە چالاکییەکانی بازرگانی بەدیار بکەوێ، دوایی وای لێهات کە کار بگاتە ئەوەی پادشای بەریتانیا (شارلی دووەم) ئەو مافە بداتە ئەو کۆمپانیایە کە دەسەلاتی ئەوەی هەبێ بۆ جاڕدانی شەڕ و پەلاماردان دژی ئەوەی کە لە ڕێگای بەرژەوەندییەکان دەوەستێت، ئەوەش بواری پێشکەوتنێکی زۆری دا لە پلەو پایەی ئەم کۆمپانیایە تاوەکو ساڵی (١٦٨٩).

ئەمەش بەیەکەم هەوڵدانەکانی ئینگلیز دەژمێردرێت کە لە میانەیدا مەبەستی بوو دەسەلاتی ڕامیاری خۆی بەسەر کەنداودا بکێشێ و دەست بەسەر فارس و وڵاتی ڕافیدەین بگرێت.

بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە- عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی- مێژووی عێراقی ڕامیاری نوێ- تاریخ العراق السیاسي الحدیث- بەشی یەکەم- چاپخانەی دار الکتب- بیروت- لبنان- چاپی چوارەم- ١٩٨٠ ل٤٠- ٤١

HENRY A. FOSTER, Op. Cit Pages 30- 31

(2) Philip Willard Irland Iraq, A sudy in Political Development, Jonathan Cape Thirty Beoford Square London, First Publishe 1973- Page 37.

(٣) عبدالرزاق الحسني- تاریخ العراق السیاسي الحدیث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩

(4) PH. W. Irland. Op. Cit Page.

(5) Philip W. Irland, Op. Cit Page 49.

(٦) ئەم هێـزانە بەلەشکری (D) ناونران سـەبارەت بەوەی کـە سـەرلەشکرەکـەی ناوی ژەنەڕاڵ (Delamain) بوو.

(٧) ئەوکاتەی سوپای بەریتانی گەیشتە دووری (٣٢) کیلۆمەتر لە باشووری بەغدا، بەوەی زانی کە یارمەتیدانێکی زۆری تورکیا هات بەنیازی ئەوەی کە ڕێگای هاتوچۆی لێ بگرێ، لەبەر ئەوە سوپای بەریتانی گەڕایەوە شاری (کوت) و، لەوێوە سوپای تورکیا ئابلۆقەی بەسەر هێزەکانی بەریتانیا داسەپاند لە (٣/ کانوونی یەکەمی ١٩١٥- ٢٩ی نیسانی ١٩١٦دا) بەریتانیا هەوڵێکی زۆری دا بۆ ڕزگارکردنی سوپاکەی کە ئابلۆقە درابوو، بەڵام ئەم هەوڵدانانە هیچ ئەنجامێکی بەدەست نەهێنا، کە ژەنەڕاڵ (طاوزەند) سەرلەشکری ئەو هێزانەی ناچارکرد کە چەکەکان و جبەخانەیان لەکار بخەن و، لەگەڵ هەموو هێزەکانیان کە ژمارەیان گەیشتبووە (١٣٥٠٠) سێزدە هەزار و پێنج سەد جەنگاوەر لە نێوان ئەفسەر و سەرباز خۆیان بەدەستەوە بدەن و تەسلیم بەهێزەکانی تورکیا ببن. بۆ ئەم مەبەستەش بڕوانە: عبدالرزاق الحسني- تاريخ العـراق السيـاسي الحديث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣.

(٨) ئەم ئاگربەستە لە نێوان هاوپەیمانەکان و تورکیادا لە دوورگەی (مدروس) Mudros کە یەکێکە لە دوورگەکانی یۆنان بەسترا، کە بەپێی ئەم ئاگربەستە تورکیا چەکی خۆی دانا.

(٩) عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧

(10) Philip W. Irland, Op. Cit Page 63.

(١١) قوربانییەکانی بەریتانیا بەتەنها لەشکر بردنی بۆ سەر ئەم وڵاتانە گەیشتە سەد هەزار کەس و، بۆ ئەم پەلامـاردانەش نزیکەی دووسـەد ملیـۆن جـونەیهی لەسـەر ئەم هەڵمـەتە خـەرج کـرد، بۆ ئەم مـەبەستـەش بڕوانە: عبدالرزاق الحسني- تاريخ العـراق السيـاسي الحديث- الجزء الاول- هەمـان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧

(١٢) بیرۆکـەی ئینتـیداب یەکێکە لە بیرۆکـەکانی ژەنەڕاڵی بوبری (سمطس) کە پێشـتـر پێشـنیـازی دامەزراندنی کۆمەڵەی نەتەوەکانی کردبوو بەمەبەستی لە جەنگ دوورکـەوێتەوە و چاودێری مـافە گشتییـەکان بێت و، سەرپەرشتی چاودێری ناوچەکانی جیاواز کە لە دەوڵەتی عوسمانی بوونەتەوە بکات، ئەم بیـرۆکـەیەش ڕەزامەندییـەکی باشی لە لایەن سەرۆکی ئەمریکای ئەوکات (ودرۆ ولسن) Wodrow Wilson کـە خـۆی ئەمـەی لێ وەرگـرتبـوو و، هەروەها داوای ئەوەی دەکـرد کـە ئەم چاودێریکردنە وا لە زۆردارەکانی ئیمپریالیزمی ئابووری و ڕامیاری دەکات کە چەکەکانیان لە دەست داماڵێنێ و بەو بڕوایەی کە ئەمە لەگەڵ (١٤) سەرەتاکانی مافی چارەی خۆنووسین دەگونجێ.

(١٣) عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٩

HENRY A. FOSTER, Op. Cit Pages 93

(١٤) مامۆستا دیبوی ئەندامی کۆڕی زانیاری لە پاریس لە عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٩ وەرگرتووە.

(١٥) بۆ زێدە زانیاری بڕوانە: دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، مطبعة الحوادث، بەغدا، ١٩٧٨ بەبێ ژمارەی چاپ لا١١٥- ١٥٤- عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٥.

(١٦) عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٦.

(١٧) سیر برسی کۆکس Percy Coxیش لەگەڵ ئەم لەشکرە دابوو کە بەهەڵمەتی (D) ناوزەد کرابوو لە کەنداوی عەرەب لە ٣/ ت٢/ ١٩١٤ لەنگەری گرت. وە لەو کاتەدا بەسەرۆک دەسەڵاتدارانی سیاسی لە عێراقدا دامەزرابوو، وە لەم پۆستەدا مایەوە تاوەکو گوێزرایەوە بۆ ئێران لە نیسانی ١٩١٨دا کە لەوێ نوێنەرایەتی وڵاتەکەی خۆی لە تەهران بکات بەناونیشانی (وەزیری ڕێگە پێدراو) (وزير المفوض).

(١٨) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤- ١٥.

(١٩) مسل یل (خاتوو بێڵ) سکرتێری ڕۆژهەڵاتی مەندوبی سامی لە بەغدا دەڵێت: ئەم حکوومەتە بەدەستی عێراق بوو بەڵام بەمێشکی بەریتانی.
بۆ زێدە زانیاری لەسەر ئەم ڕێنماییانە سەیری- عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥- ٢٨ بکە.

(٢٠) دیوانی شاعیری عێراقی مەعروف ئەلرەسافی، کە وەرگیراوە لە عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩.

(٢١) لە کۆنگرەکەدا ناوی زۆر لە کەسایەتییەکان باس کرا عەبدولڕەحمان ئەلنەقیب یەکەم سەرۆک وەزیرانی عێراق و، تالیب ئەلنەقیب یەکەم وەزیری ناوخۆی عێراق و، میر بورهانەدین عوسمانی و، کوڕی سعوود و، شێخ خەزعەل شێخی محەمەرە، غولام ڕەزاخان (ئەمیر پشت کوه)، ئاغاخانی سەرۆکی ئیسماعیلییەکان.
بۆ ئەم مەبەستە سەیری عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث- الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو لا١٧٣ بکە.

(٢٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ١٧٥.

(٢٣) عبدالرزاق الحسنی- تاريخ الوزرات العراقيه - الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٨.

(٢٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٨.

(٢٥) هەندێ لە بەندەکانی ئەم یاداشتنامەیەی کە بەرزکراوەتەوە لە لایەن هەندێ کەسایەتی و ناودارانی بەسرا بۆ نوێنەری باڵا لە بەغدا تیادا هاتبوو:

١١- ئێمە شانازی بەپێشکەش کردنی ئەم پرۆژەیەی خوارەوە بەبەڕێزتان دەکەین بۆ ئاگاداریتان و ڕاگەیاندنی ناوەڕۆکەکەی بۆ حکومەتی شاهانە. (مەبەستی خاوەن شکۆی پایەداری بەریتانیایە) ئەویش دروستکردنی پرۆژەی دەزگایەکی سیاسی سەربەخۆ بۆ ناوچەی بەسرە، هەرچەندە ئێمە ئەم پرۆژەیە بەیەکجارەکی نازانین بەواتایەکی تر توانای گۆڕانکاری تێدا هەیە.

١٢- تکامان ئەوەیە ناوچەی بەسرە ببێتە ناوچەیەکی جیاکراوە لە ژێر چاودێری میری عێراق یا هەر حکوومدار کە خەڵکی عێراق هەڵدەبژێرن، ئەم پەیوەندییەش لە نێوان بەسرەو عێراق قەوارەیەک پێک دەهێنێ کە پێی دەگوترێت هەردوو ویلایەتی بەسرەو عێراقی یەکگرتوو.

١٣- بەسرا ئەنجوومەنێکی یاسادانانی هەڵبژێردراو تایبەت بەخۆی دەبێت و ئەم ئەنجوومەنەش دەسەڵاتی تەواوی دەبێ هەبێت. بۆ یاسادانان لەم بوارانەی کە تایبەتە بەکاروباری خۆجێتی وە حوکمداری هەردوو ویلایەتی یەکگرتووە کە مافی ڕەتکردنەوەی یا داواکاری هەموارکردنی هەر یاسایەک دەبێت کە پەیوەندی بەبەرژەوەندی دانیشتوانی عێراق هەبێت.

١٤- هەر یاسایەکی هاوبەش لە نێوان هەردوو ویلایەتەکەدا وەکو یاسای بەدەستەوەدانی تاوانباری هەڵاتوو، وە پشتگیری لێکردنی فرمانە کارگێڕییەکان و، پێ ڕاگەیاندنی ئاگادارییەکان و بەجێهێنانی حوکمەکان پەیوەندی نەهێشتنی لەگەڵ دوژمنان و، کاری ڕەگەزنامە، پێویستە دابڕێژرێت یان هەموار بکرێت بەپێی بارودۆخ بەزانین و بەشداری ئەنجوومەنێکی هاوبەش کە لە ژمارەیەکی یەکسان لە نوێنەرانی هەردوو ویلایەتەکە پێک هاتبێت، وە هەرکاتێک جیاوازییەکی تەواو لە نێوان هەردوو لایەن دروست بوو پێویستە بابەتەکە پێشکەش بەنوێنەری حکوومەتی پایەداری شاهانە بکرێت بۆ ئەوەی بڕیاری لەسەر بدرێت.

١٥- بەریتانیای گەورە بەو مافانەی کە ئینتیداب هەیەتی شێوازی حکوومەتی بەسرە حکوومداریەکەی دادەمەزرێنێت. ئەو کات دادکاری ویلایەتی بەسرە سەرۆک فەرمانگاکان دادەمەزرێنێت، بەڵام حوکمداری ویلایەتی بەسرە لەلایەن حووکمداری هەردوو ویلایەتە یەکگرتووەکە لە نێوان سێ کەسی کە بەخۆی لە لایەن ئەنجوومەنی بەسرەدا دادەمەزرێت.

١٦- هەردوو ویلایەتەکان سیستەمێکی هاوبەش بۆ ڕێگاو هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەر و، هەروەها بۆ پۆستەو بروسکەو ڕێگای هاتوچۆی ئاوی ناوخۆ دادەنێن، وە هەردوو ویلایەت بەشداری دەکەن لەو پارەو خەرجییانەی کە ئەو پرۆژانە پێویستییان پێیەتی، وە لەسەر ئەنجوومەنی هاوبەشی ناوبراو پێویستە کە لە بەشی هەر ویلایەتێک لەو پارەو خەرجییانە، هەروەها بەشی هەر یەکێکیان لە داهاتووی پرۆژەکان لەم دوو ویلایەتە بگرێتە ئەستۆی خۆی.

١٧- هەردوو ویلایەت ئاڵایەکی هاوبەشیان دەبێت کە پێویستە نیشانەی یەکگرتنیان پێوە دیاربێت و، هەردوو ویلایەت بەشداری دەکەن لە دەسنیشانکردنی نوێنەرە سیاسییەکانیان لە دەرەوە و، چاودێریکردنی بەرژەوەندی هەردوو ویلایەتیان پێ دەسپێردرێ، وە پوول و دراوەکانیان و کاغەزە داراییەکان و ئامرازە حکومییەکانی مسۆگەرکردن، (الضمانات الأمرية) و، یەکەی پێوان کێشانی

پێویستە هاوبەش بێت لە نێوانیاندا، وە ئەنجوومەنی هاوبەشی ناوبراو بڕیار لەسەر نرخەکان و کێشەکانی دەدات.

١٨- ئەنجوومەنی یاسادانان دەسەلاتێکی ڕەهای هەیە لە دانانی باج لەسەر کێلگەو داهاتەکانی کشتوکاڵی خۆجێیەتی دادەنێن هەروەها لەسەر دانیشتوانی ویلایەتەکە ئەم داهاتانەی کە بەدەست دەکەوێ لەم سەرچاوانە بۆ گەنجینەی ویلایەتی دەگەڕێتەوە و، ئەم پارەوپوولەی کە بەدەست دەکەوێ ئەنجوومەنی یاسادانان بڕیاری لەسەر چۆنییەتی ئەم پارەو بەکارهێنانی دەدات.

١٩- پارەی باجی گومرگ کە لە بەنداوی بەسرا بەدەست دەکەوێ بەسەر هەردوو ویلایەتەکە بەو ڕێژەیەی کە ئەنجوومەنی هاوبەش بڕیاری لەسەر دەدات دابەش دەکرێت.

٢٠- بەسرە هێزێکی لە پیاوانی پۆلیس و سوپا تایبەت بەخۆیەوە دەبێت، سوپای بەسرە- بەشداری لەگەڵ سوپا دەکات لە هەر دەستدرێژییەکی دەرەوە بکرێتە سەریان لە هەر بەشێک لە بەشەکانی ئەم دوو ویلایەتەی یەکگرتوو، (بەسرەش) ساڵانە بڕێکی ڕێژەی دیاریکراو بۆ بژێوی سوپای حکوومەتی عێراق دەدات و ئەم سوپایەش لە ژێر فەرمانی حوکمداری هەردوو ویلایەتی یەکگرتوودا دەبێت.

لە عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢- ١٠٥.

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٠

(٢٧) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٠.

(٢٨) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء الاول- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٥- ٢٣٧.

(٢٩) عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث - الجزء الثاني- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٨- ١٧٠.

(٣٠) كتاب دائرة المطبوعات لصاحب الجلالة الامبراطورية البريطانية کە ئاراستەی وەزارەتی مستعمرات کرابوو ئەویش لە عبدالرزاق الحسني تاريخ العراق السياسي- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٧١ وەرگیراوە.

(٣١) كتاب دائرة المطبوعات لصاحب الجلالة الامبراطورية البريطانية کە ئاراستەی وەزارەتی مستعمرات کرابوو ئەویش لە عبدالرزاق الحسني تاريخ العراق السياسي- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٧١ وەرگیراوە.

(٣٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٩٢.

(٣٣) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء الثالث- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٢.

# عێراق لە سایەی سەربەخۆییدا

## یەکەم: عێراق لە سەردەمی پادشایەتیدا

لەمەوپێش باسی ئەوەمان کرد کە چاوچنۆکی بەریتانیا لە عێراقدا ئەو جۆرە چاوچنۆکییە بوو کە هیچ سنوورێکی نەبوو وە بەهیچ چاوێ پڕ نەدەبووەوە، بەڵام زیرەکایەتی و مانۆرە دبلۆماسییەکانی بەریتانیا لەو ئاستەبوون کە بتوانی ئەم بەرژەوندییانە بەبەرگێکی گونجاو دابپۆشی کە ناوە ناوە بەپێی کات و سات قابیلی گۆڕان بێت، بێ ئەوەی هیچ لە ناوەڕۆکەکەی بگۆڕێت. کە بریتییە لە بوونی بەرژەوندییەکانی بەریتانیا لە عێراق. وە لە دوای خەبات و تێکۆشانێکی بێ وچان و سالانێکی ناخۆش لە سایەی داگیرکردن و چاودێریدا دانیشتوانی عێراق زۆریان لە دەست داپلۆسینی هێزەکانی داگیرکەر لە لایەک و، مانۆرە سیاسییەکانی بەریتانیا لە لایەکی دیکەوە چەشت، ولاتی عێراق گەیشتە ئامانجی خۆی لە سەربەخۆیی بوون و، وەدەستهێنانی ئەندامێتی لە کۆمەڵەی نەتەوەکان، بەڵام ئەوکاتەی کە گەیشتە ئەم ئامانجانە بۆی مسۆگەر بوو بێ ناوەڕۆکن لەبەرئەوەی تەواو نین هەروەکو ئەوەی کە زۆری تینووەو چاوی بەتیشکی خۆر دەکەوێت لە دوورەوە و بەسەر زەویدا بەئاوی تێ دەگات، بەڵام بەداخەوە کە لێی نزیک دەبێتەوە خەیاڵە و چی تر نا. ئەو سەربەخۆییە لە تێڕوانینی عێراقییەکاندا نەگەیشتە ڕادەی پێویست چونکە ولاتەکەیان هێشتا هەموو بەسترابووەوە بەبنەماکانی پەیماننامەی عێراقی بەریتانی چوارەم و پاشکۆ ئاشکراو نهێنییەکانی، وە لە وتەکانی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتدا (نوری سەعید) بەڵگەدارتر نییە بۆ نیشاندانی وێنەی بێ ئومێدی لە لایەک و، بۆ پاساو هێنانەوەی ئەم هەموو تنازولاتەی کە عێراق دابووی بەبەریتانیا لە لایەکی دیکە، ئەوکاتەی کە ڕوو لە ئەنجوومەنی نوێنەران دەکا و دەڵێت: «ئایا بۆ چ ئێمە ڕاستگۆ نەبین لەگەڵ ئەندامانی بەڕێزی ئەنجوومەن، چونکە ڕاستی گوتن چاکترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بەڕاستی و ڕازیکردنی ویژدان.

ئەم دانپیانانەی ئێمە بەم پرەنسیپە- پرنسیپی دانپیانان بەپاراستن و پارێزگاریکردنی هاتوچۆکردنی هێڵی ئاسمانی خاوەن شکۆی ئیمپراتۆر- وە ئەو یارمەتیانەی کە لە دوای

دێ لەوانەیە بارگرانی تێدابێت، بەڵام ئێمە بەوە ڕازی نەدەبووین ئەگەر زۆرلێمان مسۆگەر نەبوایە کە پشت گوێ خستنی ئەم شتانەی لە توانای ئێمەدا نییە و، هەر هەڵوێستێکی پشت گوێ خستن پێویست دەکات کە واز لە هەموو شتێک بهێنین و، لە ئەنجامدا لە تەمومژێکی سیاسیی بەردەوام دەمێنینەوە». [(١)]

وە لە شەوی ٧-٨/ئەیلوولی/١٩٣٣دا مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە شاری (برن) لە سویسرا کۆچی دوایی کرد ڕۆژێک دوای بانگهێشتنەکە کرا بەبوونی مەلیک غازی یەکەم وەک مەلیکێکی دەستووری لەسەر عێراقدا.

**١ - کۆدەتای بەکر سدقی:**

جموجۆڵی و بێزارییەکی زۆر لە نێوان سوپا و گەلی عێراقدا دژی سیاسەتی وەزارەتی (کابینەی) وەزاری یاسین هاشمی کە لە ئاداری/١٩٣٥دا دامەزرابوو پەیدا بوو، کە ئەو کابینەیە بەبەد ڕەوشتی و گەندەڵی کارگێڕی تۆمەتبار کرابوو، کە بووە هۆی کودەتایەک، کە هێزی ڕاستکردنەوەی نیشتمانی (القوة الاصلاحیة الوطنیة) بەسەرکردایەی (فەریق بەکر سدقی) کە فەرماندەی تیپی دووەم و بەهاریکاری فەریق عەبدوللەتیف نوری فەرماندەی تیپی یەک لە ٢٩/ت١/١٩٣٦ ئەنجام دراو، وەبووە هۆی کوشتنی جەعفەر عەسکەری کە وەزیری بەرگری ئەوکات بوو کە نامەیەکی پێ بوو لە لایەن مەلیک غازییەوە بۆ کودەتاچییەکان، شایانی باسە کە کودەتاچییەکان داوایان لە مەلیک کردبوو کە کابینەی یاسین هاشمی هەڵبوەشێتەوە و داوا لە (حیکمەت سولەیمان) بکرێت کابینەیەکی نوێ پێک بهێنێ، ئەم داوایەشیان هاتەدی. لەبەرئەوەی ئەو بزووتنەوەیە بەپێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بوو لە عێراقدا و چونکە سەرکردەی کۆدەتا (فەریق بەکر سدقی) بەئاشکرا دوژمنداری خۆی بۆ ئینگلیز بەدیار دەخست، هەر لەم بوارەدا سەرهەنگ (عەقید) روکن صلاح الدین الصباغ دەربارەی کەسایەتی فەریق بەکر سدقی دەڵێ: «ئەفسەرێکی ڕوکنی زۆر بەتوانا بوو لە سوپای عێراقی و عوسمانیدا، ئاواتی زۆری هەبوو، ڕقی لە ئیمپریالیزم و هەروەها لە ئینگلیز و دارودەستەکانیشی دەبووەوە». [(٢)] سەرکردەی ئەم کۆدەتایە هەندێ هەڵەی وای کرد کە لایەنەکانی بەریتانیا لە عێراقدا و، سیخورەکان و پیاوانی و دامودەزگای هەواڵگرەکانی دەستیان بەبڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ناڕاست کرد، بەرامبەر بەوانە بەسەرکردەکانی بزووتنەوەکە جۆرەها ناوناتۆرەیان لێ دەنان وەک ئەوەی کە کودەتایەکە لایەنەکانی دوژمن دەستیان بەهێرشێکی

بەربلاو و گەورەی پڕوپاگەندە کرد بۆ لەباربردنی ئەم بزووتنەوەیە، وە بۆ ئەم مەبەستەش هەموو ڕێگایەکیان گرتە بەر لە پڕوپاگەندە و درۆودەلەسە و تاوانی جۆراوجۆر وەکو نموونە: بلاویان دەکردەوە کە سەرکردەی کودەتایەکە (بەکر سدقی) دەیەوێ دەولەتێکی کوردی دابمەزرێنێ بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی زیندوویان بەدەستەوە هەبێت، ئەوەی لێرەدا ناشاردرێتەوە ئەوەبوو کە ئەو لایەنانە مەبەستیان لەناوبردنی ئەم بزوتنەوەیە بوو، وە بزواندنی هەستی برا عەرەبەکان بەتایبەتی ئەوانەی ساویلکەن لە دژی ئەم بزووتنەوەیە و، لێدان لەسەر ژێی نەتەوایەتی بۆ خزمەتکردنی مەبەستەکانیان لە میانی یاری ڕامیاری (سیاسیی) کە لەسەر دەسەلاتدا ئەوکات لە ئارادا بوو.

بێ گومان ئەمەش پیلانێک بوو لە ئەندێشەی خۆیاندا هۆناندبوویانەوە.

وە هیچ بەڵگەیەکی زیندوو و بەهێز نییە لەسەر ئارەزووەکانی نەتەوایەتی کوردی بەکر سدقی، هەرچەندە بالوێزی ئەڵمانیا لە بەغدادا (فرتز گوبا) دەیگوت سدقی مەبەسێتی دەوڵەتێکی کوردی پێک بهێنێ. وە دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد لەم بارەیەوە دەڵێ: «لێکۆڵینەوە لە مێژووی ژیانی بەکر سدقی و کودەتاکەی ساڵی ١٩٣٦دا وە ئەو هەلومەرجانەی کە لەوکاتی هەبوو هیچ گومانێک بۆ ئەمە ناهێڵێ کە بەکر سدقی پەیوەندی بەبزووتنەوەی کوردایەتییەوە هەبوو بێت و، هەوڵدانەکانی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی تەنها پڕوپاگەندەیەک بووە دوژمنانی سیستەمی کودەتای نوێ دروستیان کردووە بەمەبەستی لێک جیاکردنەوەی بزووتنەوەکە لە هێزەکانی دیموکراسی و نەتەوایەتی بەشێوەیەکی تایبەتی لە ناو وڵاتاندا و، وە لە ڕۆژهەڵاتی عەرەبیدا، وە بۆ ئەم مەبەستەش گەورەترین هێز ئامادەکرا بۆ بەرەنگاربوونەوەی و خنکاندنی لە ناو لانکدا کەواتە هەر بەکۆرپەیی زیندە بەچاڵی بکەن، ئەوەی ڕاستیش بێت ئەم پڕوپاگەندەیە ئەنجامێکی باشی بەدەست هێنا بۆ ئەوانەی کەوا دروستیان کردبوو، وە بانگهێشتەیان بۆ دەکرد، لەگەڵ ئەوەی کە (بەکر سدقی) لە ڕاستیدا دوورترین ئەفسەری کورد بوو لە بزووتنەوەی کوردایەتی و کێشەکەی نە لە ڕۆژانی کودەتاو نەپێش کودەتا کە هیچ پەیوەندییەکی بەهیچ کۆمەڵەیەک یان ڕێکخراوێکی کوردی نەبوو. وە لە هەمان کاتیشدا (بەکر سدقی) لە هەموو بۆنەو بیرەوەریەکدا خۆی وا بەدیار دەخست کە بڕوای بەکێشەی عەرەب هەیە.....». [٣]

دوایی قسەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: (لە ڕاستیدا ڕووداو بینراوی مێژوویی

جێگیرکراو هەیە پیشان دەدات کە بەکر سدقی و براکەی عەمید برقی سدقی هەڵوێستی دژایەتییان بەرامبەر بەمەسەلەی کورد هەبووە، بەدیار کەوت لە هاوبەشی کردنیان بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد کە بەهێز سەری هەڵدا لە ساڵەکانی ماوەی ئنتیدابی بەریتانی)[٤]

هەروەها لە کۆتاییەکانی ڕۆژانی دەسەڵاتداریەتی کودەتا مۆرکردنی (پەیماننامەی سەعد ئاباد) لە (٨)ی تەمووزی ١٩٣٧ کرا لە نێوانی عێراق و ئێران و تورکیا و ئەفغانستاندا کە ئامانجی سەرەکی ئەوەبوو بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بوو.

مادەی حەوتەمی ئەوە دەگرێتەوە کە پابەندبوونی هەر یەکێک لەو وڵاتانەی ناوبراو ڕێگا نادات لەناو سنووری خۆی بۆ پێکهێنان گرووپی چەکداری و کۆمەڵەکان کە دەبنە هۆی تێکدانی سیستەم و ئاسایشی گشی بۆ وڵاتانی دیکە کە هاوپەیمانێتیان کردووە لەمەش مەبەستیان بزووتنەوەی کورد بوو.[٥]

دامودەزگای هەواڵگری بەریتانیا و دارودەستەی و خاوەن بەرژەوەندییە زەرەر لێکەوتووەکان خۆیان خستە بۆسەوە بۆ کودەتاچییەکان و، تاکو زەبری کوشندەیان لێ بدەن و، وە چاوەنواڕی کاتی گونجاویان دەکرد بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەکەو بەتایبەتیش سەرکردەکانیان، تاوەکو توانییان لە ١١/ئابی/١٩٣٧ سەرکردەی کودەتا فەریق بکر سدقی لە مووسڵ تیرۆر بکەن ئەو کاتەی کەوا بەرەو تورکیا دەڕۆیشت بۆ ئامادەبوونی لە مانۆرە سەربازییەکانی کە لە تورکیا ئەنجام دەدرا، وە هەروەها سەرکردەی هێزی ئاسمانی عێراقیشی (محەمەد عەلی جەواد) کە لەگەڵیا دابوو تیرۆر کرا.

حکوومەتی کودەتاچییەکان لە دوای لەناوبردنی سەرکردەکەی نەیتوانی لەسەر پێ بمێنێتەوە و کۆتایی پێ هات.

لە ٤/نیسانی/١٩٣٩ مەلیک غازی یەکەم لە بارودۆخێکی نادیار و تەمومژاوی مرد و، بەشێوەیەکی ڕەسمیش وا بڵاوکرایەوە کە مردنەکەی لە ئەنجامی پێکدادانی ئۆتۆمۆبێلەکەی بوو کە خۆی لێی دەخوڕی بەدارتەلەکی کارەبا لە ناو شاری بەغدا، بەڵام گەلێ پڕوپاگەندە و قسەو قسەلۆک سەبارەت بەم ڕووداوە باس کرا و، وە بەهەرحاڵ تەختی پادشایەتی بۆ کوڕە بچووکەکەی مەلیک فەیسەڵی دووەم گوێزرایەوە، بەڵام بەهۆی ناکامی مەلیک فەیسەڵی دووەم ناچار کە (میر عبدالاله) خالی مەلیک فەیسەڵ بە وەسی لەسەر تەختی پادشایەتی دابمەزرێنن.

### ٢ - بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی مایسی ساڵی ١٩٤١:

لە ئەنجامی هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی جیهانی دووەم لە نێوان هاوپەیمانان و دەوڵەتانی میحوەر، عێراق کە هاوپەیمان بوو لەگەڵ بەریتانیا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئەڵمانیادا بڕی، وە ئەو کاتەی ئیتالیا بەشداری جەنگی کرد لەتەک ئەڵمانیا، بەریتانیا داوای لە عێراق کرد پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئیتالیا دابڕێت کە بووە هۆی ئەوەی حکوومەتی ڕەشید عالی گەیلانی[٦] گوێی نەداتێ ئەمەش زیاتر بەشداری کرد لە هەڵچوون و پشێوی و گرژی پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و بەریتانیادا، لێرەدا ئەستێرەی هەر چوار سەرهەنگی عێراق کە بریتی بوون لە (سەرهەنگان صلاح الدين الصباغ، فهمي سعيد و محمود سلمان و كامل شبيب) درەوشایەوە، وە ئەوانیش هەوڵیان دا دەسەڵاتی خۆیان بەسەر سوپادا بەکاربهێنن بۆ گۆڕانی هەڵوێستی حکوومەتی عێراق بۆ خزمەتی، وە شایانی باسە ئەم سەرهەنگانە لەبەر بیروباوەڕی نەتەوایەتییان دەیانەویست عێراق ڕزگار بکەن لە سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا و لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٤١دا ئەم چوار سەرکردەیە بەهاریکاری لەگەڵ بریکاری سەرۆک ئەرکانی سوپا فەریق مەحەمەد ئەمین زەکی هەوڵیان دا پاڵەپەستۆ بخەنە سەر سەرۆک وەزیران (تەها هاشمی) بۆ ئەوەی خۆی لە حکوومەت بکشێنێتەوە، (تەها هاشمی)یش واز لێهێنانی خۆی یەکسەر پێشکەش کرد،[٧] بۆ ئەوەی هەل بڕەخسێت کابینەیەکی نوێ لە ژێر سەرۆکایەتی ڕەشید عالی گەیلانی پێک بهێنن کە ئەویش بەوە ناسرابوو لایەنگری ئینگلیز ناکات، وە هەندێ لە یەکەکانی سوپاییان بەجووڵە خست و بۆ ناوچەی کۆشکەکانی پاشایەتی بەمەبەستی خستنی پالەپەستۆ لەسەر وەسی (میر عبدالاله) بۆ جێبەجێکردنی داواکاریەکانیان. بەڵام وەسی عێراق هەر لەگەڵ هەست پێکردنی بەم جموجۆڵە نائاساییەی سوپا، دەستبەجێ هەڵات لە بەغداوە خۆی گەیاندە (حبانیە) لەوێوەشەوە بۆ بەسرە، لەوێوەش ڕا پەنای بردەبەر هێزەکانی دەریایی بەریتانی، ئەوکاتەش کە سەرکردەکانی سوپا بەم کارەیان زانی بڕیاریان دا بزووتنەوەکەی خۆیان بەتەواوی ئەنجام بدەن و بەخێرایی حکوومەتێکی سەربازی لە وڵاتدا دابمەزرێنن بەناوی حکوومەتی بەرگریکردنی نیشتمانی[٨]، (حكومة الدفاع الوطني) شایانی باسە ئەم حکوومەتە لە ٣/نیسانی/١٩٤١ بەسەرۆکایەتی ڕەشید عالی گەیلانی پێک هات و، پشتی بەسوپا دەبەستاو، بەیاننامەیەکی لە لایەن سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا و سەرۆکی حکوومەتی بەرگری نیشتمانی دەرچواند، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی کە ڕوویان داوە و دیارخستنی هۆیەکانی بزووتنەوەکە

و ئامانجەکانی بەڵام ئەوانەی کە سەرپەرشتی ئەم بزووتنەوەیان دەکرد لە پیاوانی سوپا و خەڵکی دەرەوەی سوپا لەسەر ئەوەی کۆک بوون کە پێویستە کۆتایی بەحکومڕانی سوپایی بێت و بگەڕێنەوە بۆ ژێر ڕکێفی دەستوور، بۆیەش بانگهێشەی ئەنجوومەنی نەتەوەکرا بۆ کۆبوونەوە لە (١٠)ی نیسانی/ هەمان ساڵدا و، لەم کۆبوونەوەیەدا (عبدالاله) لێ خستراو لابراو وە (شەریف شەرەف) بەوەسی تازەی تەختی پاشایەتی دانرا و بەپێی دەستوور داوای لە ڕەشید عالی گەیلانی کرد بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێ[٩] وە ئەم بزووتنەوە ڕزگاریخوازە کە مەبەستی ڕزگارکردنی وڵات بوو لە چنگ ئینگلیز پێشوازییەکی گەرم و جەماوەری فراوانی لێ کرا.[١٠] وە عبدالرزاق الحسنی جەخت لەسەر ئەم ڕەوتە دەکات و دەڵێت: «بۆ مێژوو دەڵێین کە سەردەمی حکوومەتی بەرگریکردنی نیشتمانی هیچ جۆرە چەوساندنەوەیەک و توندڕەوییەکی تێدا نەبوو، هەرچەند لە لایەن ئینگلیزەوە لە دەرەوەی عێراق لە ڕووی دارایی و ئابوورییەوە ئابڵۆقە درا بوو» وە هەموو ئەندامەکانی ئەنجوومەنی پیران و نوێنەران کە ئامادەی دانیشتنی مێژووی ئەنجوومەنی نەتەوایەتی بوون، هەموویان ئازادبوون لە ئامادەبوونیان و ئامادەنەبوونیان، وە هیچ کەسێکیان بەزۆر ئامادەی ئەم دانیشتنە نەکراو، کەسیش ڕێی لێ نەگیرا لە بەجێهێشتنی دانیشتنەکە. ئینجا چ ئامادەبوونیان لەم دانیشتنە وەک وەڵامدانەوەیەک بووبێت بۆ بانگهێشتی ویژدان یان مێچکەمێچک و خۆ تێ هەڵسووڕاندن بێت بۆ دەسەڵاتی ئەو کاتی کە هەیە[١١].

سەرکردەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە سەرەتاوە هەوڵیان دا پەیوەندیی لەگەڵ ئەڵمانیاکان پەیدا بکەن وە پەیوەندیی دیبلۆماسی تەواویان لەگەڵیاندا گرێ بدەن چونکە چاوەڕوانی بەدەستهێنانی پشتگیرکردنەکی تەواو و خێرایان لەوان دەکرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان بەرامبەر بەئینگلیز، بەڵام ئەڵمانیا کە زانیارییەکی پێشتری دەربارەی ئەم بزووتنەوەیە نەبوو، لای شتێکی کتوپڕبوو، وەتوانی تەنها ژمارەیەکی کەم لە فڕۆکە شەڕکەرەکانی بنێرێت کە لە کاتێکی درەنگ بەفریای عێراق کەوتن وە لەبەر ئەوە نەیانتوانی تەرازووی هێز بگۆڕن؛ شایانی باسە بەلای بەرژەوەندییەکانی بەریتانیادا شۆڕدەبوو، لە دوای کشانەوەی هێزەکانی عێراق لە (تەپۆلکەی حەبانییە)دا.[١٢] هەروەها بزووتنەوەی ناوبراو پەیوەندیی دبلۆماسی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا بەست[١٣].

بەڵام ئەو ئینگلیزانەی کە هەتا گوێچکیان لە خەونی هێشتنەوەی عێراق بۆ خزمەتی بەرژەوەندییەکان دابوون دەستەو ئەژنۆ ڕانەوەستان بەڵکو بەبێ ڕاوەستان دەستیان بەخۆ ئامادەکردن کرد بۆ ئەوەی سەرلەنوێ دەست بەسەر عێراقدا بگرن. بەڵکو بەبێ ڕاوەستان و

بێ هوودە، وەسی هەڵاتوو (الوصي الهارب) بگەڕێننەوە بەغدا. لە شوێن دوورخراوەکەی خۆی وەشایانی باسە کە ئینگلیزەکان بزووتنەوەی مایسیان بەهەڕەشەیەکی ترسناک بۆ بەرژەوەندییە ستراتیژییەکان خۆیان لە ناوچەکە لە قەڵەم دا، چونکە هەستیان دەکرد کە سەرکەوتنی ئەم بزووتنەوەیە بەرژەوەندییەکانیان لەبنوبۆتکە هەڵدەتەکێنن، لەبەرئەوە بڕیاریان دا بەزووترین کات هێرش بهێننە سەری و زیندە بەچاڵی بکەن.

بۆیە چەند هێزێکی گەورەیان لە بەسرە و حەبانییەدا دابەزاند، شەڕ لە نێوان هەردوو سوپای عێراق و ئینگلیزدا لە ٢/مایسی/١٩٤١ لە دەوروبەری (حەبانیە) کە کەوتۆتە دووری (٦٠) میل لە پایتەختی بەغدا دەستی پێ کرد.[١٤]

ژمارەی هێزەکانی عێراقی بە(١٠) هەندەی هێزەکانی بەریتانیا کە لە بنکەی ناوبراو خۆیان حەشاردابوو دەژمێردرا، هەروەها سوپای عێراق هیچی کەم نەبوو لە چەک و جبەخانەی بەتایبەتی لە هێزی تۆپخانە، بەڵام لەجیاتی ئەوەی ئەم هێزانەی عێراق دەست بەسەر بنکەی (حەبانیە) دابگرن و کۆنترۆڵی بکەن لە دوای چەند ڕۆژێک لە شەڕ هەستان بەکشانەوە لە دەوروبەری بنکەی ناوبراو، وە مەیدانیان بۆ هێزەکانی ئینگلیز چۆڵ کرد.

هێزەکانی عێراق بەکشانەوەیان لە تەپۆڵکەکانی حەبانییە جڵەویان لە دەست بەربوو، وە تەرازووی شەڕ زیاتر بۆ بەرژەوەندی هێزەکانی ئینگلیز شۆڕبۆوە بەهۆی بوونی هێزی ئاسمانی لێهاتووی بەریتانی کە ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی لە شەڕەکە هەبوو. وە سەرهەنگ ڕوکن (صلاح الدين الصباغ) هۆیەکانی بنکەی (حەبانیە) هەروەها نەتوانینی بردنەوەی شەڕەکە و یەکلابوونەوەی بۆ بەرژەوەندی خۆی بۆ نەبوونی بەرگێکی ئاسمانی تەواو، وە نەبوونی ورەیەکی بەرز و نادیاری بوونی ئامانجەکانی دەگەڕێنێتەوە، چونکە لە نێوان هێزەکاندا بڵاوکرایەوە کەوا بەرەو (حەبانیە) دەڕۆن بۆ مەشقکردنی سەربازی و دەست بەسەراگرتنی هەندێ لە جێگایەکان لە تەپۆڵکەکانی ناوبراودا نەک بۆ شەڕ لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز[١٥] لە نێوان هەردوو لایاندا شەڕ بەردەوام بوو هەتاکو ٢٩/ مایس ئەوکاتەی هێزەکانی بەریتانیا گەیشتبوونە دەروازەکانی بەغدا، وە لەهەمان کاتیشدا فڕۆکە شەڕکەرەکانی بەریتانیا پایتەختیان بۆردوومان دەکرد و، بەرامبەر ئەم هەڵمەتە سەربازییەی بەریتانیا سەرکردەکانی بزووتنەوەکە و، لێپرسراوەکانی حکوومەتی بەرگری نیشتمانی بەغدایان جێ هێشتبوو لە ٣٠/ی مانگی مایسدا لە نزیک شاری (خانەقین)ەوە لە سنوورەکان بەرەو ئێران ئاودیو بوون. بەڵام هەندێک لە دەسەڵاتدارانی

ناوچەیی کە لە بەغدا بەشێوەیەکی کاتی دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو هەستان بەگفتوگۆکردن لەگەڵ سەرۆک سوپای گشتی هێزەکانی داگیرکەری بەریتانیا و باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا بۆ مۆرکردنی ئەو ئاگربەستەی کە لە ٣١/ی مایسی بەسترابوو. لە ١/ی حوزەیرانی هەمان ساڵدا وەسی (عبدالإله) لە ژێر نێزەی بەریتانیا گەڕایەوە بەغدا. ئا بەم شێوەیە ئەم بزووتنەوەیان کۆتایی پێ هێناو، ئەم لاپەڕەیان بەپەلە داخست، وە سەرنەکەوتنی ئەم بزووتنەوەیە لە هێنانەدی ئارەزووی گەلی عێراق لە ڕزگاربوونیان لە ژێر دەستەو چەنگی ئیمپریالیزمی بەریتانی دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک لەمانەدا وەکو خێراییکردنی و دەست و بردکردنی هێزەکانی بەریتانیا بۆ لە گۆڕنانی ئەم بزووتنەوەیە بەکۆرپەیی و، پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت، هەروەها بەهۆی بوونی هێزی هەڵکەوتووی ئاسمانی بەریتانیایی کە بەفاکتەرێکی یەک لاکەرەوە لەم شەڕەدا لە قەڵەم دراوە، وە کۆتایی پێ هێنا بۆ بەرژەوەندی لایەنی بەریتانیا. سەرەڕای ئەوەش هۆی سەرنەکەوتنی بزووتنەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی هێزەکانی سوپای عێراق. هەرچەندە بەژمارە زۆرتربوون، وە لەسەر خاکی خۆیان شەڕیان دەکرد، لە پاڵ ئەوەش فریانەکەوتنی ئەڵمانەکان بۆ پشتگیری هێزەکانی عێراق لە ڕووی سەربازی وە هێزی ئاسمانی کە لەبەر نەبوونی کات ئەو هەلەیان بۆ نەڕەخسا. ئەو هەموو هۆیانەی سەرەوە وە چەندان هۆی دیکەش- کە جێگای باسکردنیان لێرەدا نییە[١٦]. بەشدارییان کرد بۆ لەبارچوونی ئەو بزووتنەوەیە ڕزگاریخوازە کە لە لایەن جەماوەرێکی زۆرەوە لە چین و توێژەکانی جیاجیاکانی گەلی عێراق پشتگیری لێ دەکرا.

### ٣- ڕاپەڕینی (وثبە) کانونی ١٩٤٨:

لەبڕگەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە پەیماننامەی عێراقی بەریتانی چوارەم چەند مەرجێکی ناڕەوای تێدا هاتبوو کە سەروەری عێراقی سنووردار دەکرد و ئازادی پێشێل دەکرد، سەرەڕای ئەوەی کە لەگەڵ بەڵێنی نەتەوە یەکگرتووەکان هاودژ بوو[١٧]، ئەو هۆکارانە وایان کرد لە نێوان هەموو چین و توێژەکانی گەلی عێراقی و حیزبە سیاسییەکان ئەو ڕاستییە کەوا پێویستە ئەم پەیماننامەیە لابرێ و، یان بگۆڕدرێ بەپەیماننامەیێکی نوێی بگونجێ لەگەڵ بارودۆخی نێو نەتەوەیی و هەروەها سەروەری عێراق لەدەست نەدات.

ئەمەو گفتوگۆکان بەشێوەیەکی نهێنی لە نێوان هەردوو لایەنی عێراق و بەریتانی لە سەرەتای مانگی مایسی/ ١٩٤٧دەستی پێ کرد بەمەبەستی بەستانی پەیماننامەیێکی

نویَ، لەگەڵ ئەوەش ئەم گفتوگۆیانە لەسەر بنچینەی پرۆژەیەکی ئامادەکراو کە پێشتر ئامادەکرابوو لە لایەن بەریتانیا دەکراو، وەسی عێراق (عبدالاله) بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ئەم گفتوگۆیانەی دەکرد.[18] ئەوکاتەی ئەم گفتوگۆیە نهێنییانە گەیشتە قۆناغەکانی دوایی بڕیاردرا شاندێکی ڕەسمی پێکبهێنرێت بەسەرۆکایەتی سەرۆک وەزیرانی ئەوکات (صالح جەبر) بەمەبەستی وتووێژکردن بەپێی بەیاننامەیەکی ڕەسمی، بەڵام لە ڕاستیدا پێکهێنانی بەمەبەستی مۆرکردنی ئەم پەیمانە بوو کە پێشتر ئامادەکرابوو.

وە هەروەها بەیاننامەی حکوومەت دەربارەی پێکهێنانی شاندەکە حیزبە سیاسییەکانی وروژاند و تووڕەی کردن؛ وەکو حزبی سەربەخۆ، حزبی ئازادیخوازان (الاحرار)، حزبی نیشتمانی دیموکراسی کە هەموویان ئەم پەیماننامەیان سەرکۆنەکرد، وە گوتیان بەهیچ شێوەیەک حکوومەت مافی ئەوەی نییە کە بڕیار لەسەر پەیماننامەیێک بدات کە پاڵپشتی جەماوەری بەدەست نەهێنابێت. هەروەها بەیاننامەی حکوومەت بووە هۆی ئەوەی کە قوتابیانی کۆلێژی ماف لە ٤/ک٢/١٩٤٨ خۆپیشاندانێک ئەنجام بدەن. وە خۆپیشاندەران لەگەڵ پیاوانی پۆلیس بەسەروپۆتەلاکی یەکتریان دادا کە وای لە ئەنجوومەنی وەزیران کرد خوێندن لە کۆلێژی ناوبراودا لە ٥/ک٢/١٩٤٨ ڕابگیرێت.[19] بەڵام ئەم ڕووداوانە ورەی شاندی وتووێژکەری نەهێنایە خوارەوە و ئەوەبوو کە گەشتەکەی خۆی بۆ لەندەن لە٥/ک٢/بۆ وتووێژکردن و مۆرکردنی پەیمانەکە دەست پێ کرد. بەڵام لە ناو ڕیزەکانی جەماوەردا بڕیاری حکوومەت بەداخستنی کۆلێژی ماف کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو؛ بەتایبەتی لەناو چینی قوتابیاندا کە هەمووی وروژاندن و، تا وەکو هەموو قوتابیانی قوتابخانە دواناوەندییەکان بەخۆپیشاندانێکی بەربڵاو هەڵسان کە وایان لە حکوومەت کرد لە بڕیارەکەی خۆی پاشگەزبێتەوە، وە هەروەها بڕیاری دەست پێکردنەوەی خوێندنی بدات و قوتابییە گیراوەکانیش بەرەڵا بکات[20].

لە دوای ئەمەدا هێمنی و ئاسایش باڵی خۆی بۆ ماوەیەک بەسەر پایتەخت داکێشا، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم کپی و بێ دەنگییە وەک شتێک وابێت کە بەپێش گەردەلوولە و تۆز و بایەکی توندەوە بێت، لەبەرئەوەی عێراق و بەریتانیا پەیماننەمەکەیان مۆر کرد لە ٥/ک٢/ هەمان ساڵدا لە شاری (برتسموشی بەریتانیا)[21]، شایانی باسە کە حکوومەت دەقی پەیمانەکەی بڵاوکردەوە کە ناوی لێنرا پەیماننامەی برتسموت لە دوای ڕۆژێک لەسەر مۆرکردنی و، بەبڵاوکردنەوەی پەیماننامەکە جەماوەر بەتێکڕایی هەستان و

ڕاپەڕین دژی ئەو پەیماننامە و، هەروەها حیزبە سیاسییەکانیش نارەزاییان بەرامبەری دەربڕی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە ڕێکەوتی ١٧-١٨-١٩/ک٢/١٩٤٨ جەماوەر و قوتابیان خۆپیشاندانیان ئەنجام دا، ئەم خۆپیشاندانانە بەسەلامەتی و بێ زەرەر و زیانی گیانی لە نێوان هەردوو لا بەسەرچوو، هیوای ئەوەش دەکرا کە مەسەلەکە کۆتایی پێ بێت، بەڵام بەیاننامەیەک کە لە حکوومەتەوە لە ١٩/ک٢/ هەمان ساڵدا دەرچوو بووە هۆی دووبارە وروژاندنی جەماوەر و پاڵی پێوەنان کە بۆ ڕۆژی دوایی ڕێکەوتی ٢٠/ک٢/هەمان ساڵ خۆپیشاندانێکی بەربڵاو ئەنجام بدرێت لە لایەن جەماوەر و قوتابییانی کە پێکدادان لە نێوان پیاوانی پۆلیس و خۆپیشاندەران ڕووی دا و، کە بووە هۆی شەهیدبوونی چوار کەس لە خەڵکەکە، مەسەلەکە زیاتر پەرەی سەند. لە ڕۆژی دوایی کە بووە هۆی چەند ڕووداوێکی خوێناوی دیکە، لەوکاتەی کە هێزەکانی پۆلیس چوونە ناو کۆلێژی پزیشکی و تەقەیان لە قوتابییە خۆپیشاندەرەکان کرد، ئەمەش بووە هۆی کەوتنی چەند شەهیدێکی دیکە ئەمەش زیاتر بەشداری کرد لە ئاڵۆزکردنی بارودۆخەکە و گەیاندییە قۆناغی ترسناک، ئەو کات پێویستی کرد کەوا وەسی بەغدا (میر عبدالاله)؛ بانگی سەرۆک وەزیرانی پێشوو لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی دیار بکات بۆ کۆشکی مەلیک بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵیاندا سەبارەت بەپەیماننامەکە، لەسەر ئەوە پێکهاتن کە چاوپۆشی لە پەیماننامەی ناوبراو بکەن، ئینجا بەیاننامەیەک لە لایەن (میر عبدالاله) دەرچوو کە تیایدا پەیمانی دا بەڕۆڵەکانی گەل ئەم پەیماننامەیە پەسەند نەکرێت لە لایەن حکوومەتی عێراق ئەمەش خۆشی هاویشتە ناو دڵی جەماوەری خۆپیشاندەرو قین لە دڵ دژی کۆلۆنیالیزم، وە ئەو حکوومەتەی کە شوێن پێی دەکەوێت، وە جەماوەر و حیزبە سیاسییەکان بەخۆشی پێشوازییان لەم بەیاننامەیە کرد. بەڵام جەماوەر نەیدەزانی کەوا ڕۆژگارێکی پڕ لە مەینەتی و ناخۆشی چاوەڕوانی دەکات.

چونکە سەرۆک وەزیران و سەرۆکی شاندی عێراقی (صالح جەبر) کە ئەوکات لە (لەندەن) بوو هەر لەوێوە دەستی بەهەڕەشە و گوڕەشە لە خۆپیشاندەران کرد، وە جەختی لەسەر ئەوە کرد کە موکرە لەسەر پەسەندکردن و جێبەجێکردنی پەیماننامەکە و پانکردنەوەی سەری بەرهەڵستکاران. سەرۆکی وەزیران لە ٢٦/ک٢/هەمان ساڵدا گەڕایەوە بۆ عێراق و، بەهێزێکی پارێزگاری و بەشێوەیەکی نهێنی لە (حەبانیە)وە گەیشتەوە بەغدا و، یەکسەر چووە کۆشکی مەلیک، وە بەڵێنی بە(وصی- میر عبدالاله) دا کە لە ماوەی(٢٤) کاتژمێردا کۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکات و[٢٢]، ئەوەی شایانی باسە کە

شێوازی مامەڵەکردنی سەرۆک وەزیران؛ هیچ ئەنجامێکی باشی نەبوو، وە بارودۆخەکەی هێور نەکردەوە؛ بەڵکو جەماوەر و سەرکردەکانی بڕیاریان دا بەئەنجامدانی خۆپیشاندانی بەربلاو لە ڕێکەوتی ٢٧/ک٢/١٩٤٨ وەکو وەلامدانەوەیەک بۆ هەڕەشەکانی صالح جەبری سەرۆک وەزیران، بەم شێوەیەش بەغدا چەند خۆپیشاندانێکی جەماوەری فراوان و سەرتاسەری بەخۆیەوە بینی و زۆر لە پیاوانی پۆلیس بەماشێن و چەکەوە چاودێرییان دەکرد هەتا پایتەخت وای لێ هات کە دەتگوت گۆڕەپانی جەنگە، چونکە کارەکە بووە شێوەی پێکدادانی بەچەکداران لە نێوان هەردوو لادا و، وە چەندان شەهید و بریندار کەوتنە سەر زەوی و، هەروەها ژمارەیەکی زۆریش لە بریندار، بەرە بەرە پێکدادان و ململانێ بەرەو توندوتیژتر دەچوو؛ تاوەکو گەیشتە ئەوەی وەزارەتی ناوەخۆ فرمانی تەقەکردن بۆ سینگی خۆپیشاندەران و کوشتنیان دەربکات، بەمەبەستی ورەبەردان و چاو شکاندنی خۆ پیشاندەران و گەڕانەوەی ئاسایش و هێمنی، ئەمەش بووە هۆی شەهیدبوونی ژمارەیەکی زۆر لەڕۆڵە دڵسۆزەکانی عێراق، وە ژمارەیەکی زیاتریش بریندار بێت. وە هەڵوێستەکە پتر بەرەو ئاڵۆزبوون چوو، وە گەیشتە ئەوەی کە نەتوانن پیاوانی پۆلیس کۆنترۆڵی بکەن و، داوایان لە سوپا کرد کە یارمەتیان بدات و، بەهانایانەوە بێت، بەلام کۆشکی مەلیک نەیهێشت ئەم کارە ئەنجام بدرێت، وە ئەوکاتەی کەوا لێپرسراوانی و دەسەلاتدارانی ولات لێیان مسۆگەر بوو، کە ولات بزاڤێکی جەماوەری توند و ڕێکوپێکی بەورەیەکی بەرز و پۆلایین بەخۆوە بینێ، بەئاسانی ناتوانرێ بەسەریدا زاڵبین؛ ئەوکاتە پێیان لە کەلی شەیتان هێنایە خوارەوە و هۆشیان بەکارهێنا بۆ ئەوەی ڕێگا چارەیەک بدۆزنەوە بۆ دەربازبوونی ولات لە کوورەی ئەم ململانێیە خوێناوییەدا، بەم جۆرەش کابینەی وەزاری ناچار کرا دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش بکات، یەکسەر لێی وەرگیرا[٢٣] لە دوای ئەودا وصی میر عبدالاله بەیاننامەیەکی دەرکرد کە گیانی لێبووردن و، ئاشتبوونەوە و کۆتایی پێهێنانی ئەم ڕووداوە توندوتیژانەی پێوە دیاربوو، وە ئەم بەیاننامە و ئەو دەست لە کارکێشانەوەیە پێشوازییەکی گەرمی لە لایەن جەماوەرەوە لێ کرا. چونکە جەماوەرو سەرکردەکانی و حیزبە سیاسییەکان هەستیان بەسەرکەوتن کرد، بەسەر کۆلۆنیالیزم و دارو دەستەکانی و، بەری ئارامگرتن و خەباتکردنیان بەدەست هێنا، ئەوەش ئاماژەیەک بوو بۆ کۆتایی پێهێنانی ئەو بزاڤەی کە ئامانجەکانی هاتە دی. بەلام پەیمانی ناوبراو (پەیمانی پورت سموث) پەردەی بەسەردادرایەوە و، بووە شتێکی لە بیرکراو، چونکە عێراق لە پەسەندکردنی پاشگەزبووەوە. وە وەزارەتی نوێ جاری

هەڵوەشانەوەی دا لە٣/شوباتی ١٩٤٨[٢٤] وە دکتۆر کەماڵ مەزهەر ئەحمەد دەربارەی ئەم ڕاپەڕینە دەڵێ: (مێژووی عێراقی هاوچەرخ تۆمارێکی شەرەف مەندانەی پڕ لە پاڵەوانێتی و خۆبەختکردنی کەڵە پیاوانی ئەم گەلە دێرینە. وە ڕاپەڕینی ک٢/١٩٤٨ لاپەڕەیەکی پرشنگدارە لەم دەفتەرە نەمرەدا)[٢٥] هەروەها لەسەری دەڕوا و سەبارەت بەو لایەنە باشانەی کە ئەم ڕاپەڕینەو ڕەنگدانەوەکانی دەڵێت «ڕەنگدانەوەی ئەم کارە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسیی گرینگتری لێ کەوتەوە کەوا کاریگەرییەکی پۆزەتیڤانەی هەبوو لەسەر خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی عێراق بەگشتی کە بریتی بوو لەوەرچەرخان و گۆڕانی دروشمی خەباتی هاوبەشی کورد و عەرەب دژ بەکۆلۆنیالیزم بۆ واقعێکی ڕێکوپێک بۆ یەکەم جار لە ڕۆژەکانی ڕاپەڕیندا... وە هیچ گومانی تێدانییە کە جوانترین وێنەی خەباتی هاوبەشی ڕۆژەکانی ڕاپەڕین کە ڕەنگی دایەوە، شان بەشانی ئەو خوێنەی ڕژتراو تێکەڵاوبوو لە شەقامەکانی بەغدا، هەروەها لەو شاندە کوردییانەی کە یەک لە دوای یەکتر لە شوباتی (١٩٤٨)دا لە هەموو شارەکانی کوردستان دەهاتە بەغدای پایتەخت کە بەڵێنیان دابوو بەگۆڕی شەهیدان و لە نێوان هەزارەها کەسی جەماوەری پێشوازی کەران، بەرەو پێشەوە بچن لەگەڵ برا عەرەبەکانیان بۆ بەدیهێنانی هەموو ئاواتی هاوبەشی هەردوو گەلەکە»[٢٦].

وە بەهەمان بۆچوونەوە گۆڤاری گەلاوێژی کوردی ناسراو لە ڕۆژەکانی ڕاپەڕیندا دەربارەی ئەم ڕاپەڕینەی نووسی و گوتی: «ڕووداوەکانی ئەم دواییە وایان کرد کە برایەتی و یەک ڕیزی خەباتکردنی کورد و عەرەب باڵی زێڕینی بەسەر تاسەری خاکی عێراقی گەورەدا بکێشێ»[٢٧].

### ٤- ڕاپەڕینی ١٩٥٢:

هەموو ناوچەی عەرەب لە بارودۆخێکی بێ ئومێد و شڵەژاو دەژیان لە دوای نسکۆی فەلەستین لەوکاتەی کە گەلانی وڵاتە عەرەبییەکان زۆر ڕق و کینەیان لە حکوومەتەکانیان هەبوو، کە بەهۆیەکی سەرەکییان دانابوون بۆ تووشهاتنی ئەم نسکۆیە. هەروەها بارودۆخی عێراقیش وانەبێ لەو بارودۆخە گشتییە بەدەرو جیاوازبێت، بەتایبەت زۆر کەموکوڕی لە سیستەمی دەسەڵاتدارێتیدا هەبوو. ئەو هۆکارانە بەشدارییان لە بێزاربوونی گەل دەکرد. لە ٢٨/ت١/١٩٥٢دا حیزبەکانی سەربەخۆو بەرەی گەل وەنیشتمانی دیموکراسی هەریەک لەمانە یاداشتێکی سەربەخۆی پێشکەش بەوەسی (عبدالاله) کرد، بەڵام حزبی نەتەوەی

سۆسیالیست یاداشتی خۆی پێشکەشی بەسەرۆک وەزیران کرد، ئەم هەموو یاداشتانە لەسەر ئەوە گردبوون کە نارەزاییـان بەرامبەر بارودۆخی ولات نیشان دەدا بەهۆی ئەو هەموو کەموکورتییانەی کە لە سیستەمی دەسەلاتداری هەبوو، وە تەشەنەکردنی دیاردەی گەندەلی وەبلاو بوونەوەی بەرتیل و خزم خزمانێ و ناسیاوی و برادەرایەتی... هتد؛ لەگەڵ زۆر کەموکوری تریش کە نایەتە ژمێردن. لەبەرئەوە ئەم حیزبانە داوایان لە حکوومەت کرد کە بەپێی هەلبژاردنی راستەوخۆ کاربکات وە یاسای بنەرەتی هەموار بکرێت و، سەربەستی رادەربرین و سەربەخۆیی حکومرانی و دابینکردنی سەربەخۆی دەسەلاتی دادوەری و پاکسازیکردنی دامودەزگاکانی دەولەت لە مرۆڤە ناشیاوو بێ توانا و گەندەلەکان و زۆر گۆرانکاری تریش. بەلام ئەم داواکارییانە وەسی (عبدالاله) یانی لە کەللە رەقی خۆی نەهێنایە خوارەوە هەروەکو لە وەلامدانەوەی کۆشکی پادشایی لەسەر یاداشتەکانی حیزبەکان بەدیارکەوت، وە ئەو کاتیش ئیرادەی تایبەتی دەرچوو بەهەلوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی نوێنەران وە ئەنجامدانی هەلبژاردنێکی نوێ.

بەلام ئەوکاتەی کە حیزبە سیاسییەکانی ناوبراو گەیشتنە ئەوەی کەوا داواکارییەکانیان جێبەجێ ناکرێ و رەت دەکرێتەوە و، هیچ هەلێکی تر نییە بۆ راستکردنەوەی یاسای هەلبژاردن بریاریاندا کە بەشداری ئەم هەلبژاردنە نەکەن و، وە داوایان لە هەموو ئەندامان و لایەنگیرانی خۆیان کرد بۆ بەشداری نەکردنیان لە هەلبژاردن. وە بارودۆخی سیاسیی لە ولاتدا رووی لە گرژییەکی زیاتر کرد، هەروەها بەرەو تێکچوون چوو لە دوای ئەو لێک دوورکەوتنەوەی لە نێوان کۆشکی پادشایەتی و حکوومەت لە لایەک وە گەل و حیزبە سیاسییەکان لە لایەکی ترەوە.

وا رێکەوت کە مانگرتنێکی قوتابیانی کۆلێژی دەرمانسازی و کیمیا لە ٢٦/ت١/١٩٥٢دا رووی دا بەهۆی کێشەی خوێندن و فێرکردن؛ بەردەوام بوو تاکو ١٩/ت٢/١٩٥٢ کە لەپاش ئەوەدا کێشە چارەسەرکراو وا بلاوبووەوە کە کۆتایی پێ هات؛ بەلام لەوکاتە شتێک رووی دا کەوا لە خەیالدا نەبوو کە چوار کەسی نەناسراو و نەزانراو چوونە ژووری کۆلێژی ناوبراوو دەستیان بەهەلکوتانە سەر و لێدانی هەندێک لە قوتابیان کرد، قوتابیانی تریش لە پۆلەکانیان دەرچوون و لەگەڵ هێرش بەران تێک گیران و کە لە ئەنجامدا هەندێ قوتابی بریندار بوون، ئەم رووداوە وەک بلێسەی ئاگرێکی کە نەوتت بەسەردا کردبێ بەهۆی ئەو تەنگژە و هەلاوسانی سیاسیی کە ولات تیایدا دەژیا، خۆپیشاندانەکان کۆلێژە جیاجیاکان و قوتابخانەکانی دواناوەندیشی گرتەوە هەروەکو بلێسەی

ئاگــــر کـــە لە پووش و پەلاش بەردرابێ، هەروەها بەغــــدا لە ٢٢/ت٢/١٩٥٢
خۆپیشاندانێکی گەورە و فـراوانتری بەخۆیەوە دیت، بەسەرپەرشتیکردنی قـوتابیانی
هوشیاری زانکۆکان و پەیمانگاکانی بالآ و قوتابخانەکانی دواناوەندی و، پڕ بەزاریانەوە
دروشمە نیشتمانییەکانیان دەگوتەوە و، ئەوەی لە دڵیاندا هەبوو دەریان دەبڕی لە ناو
جەماوەری ڕق هەستاو بەهەستی کپ کراو سەر نەکەوتن و هەوڵدان بۆ دوارۆژێکی باشتر،
ئەم مانگرتن و خۆپیشاندانانە بەخێرایی لە مانگرتنی زانستی دەبووە خۆپیشاندانی
سیاسیی کە ئامانجی نیشتمانی هەمە لایەنی هەیە، وە کۆمەڵی خۆپیشاندەران لە
گۆڕەپانی بەرامبەر باڵەخانەی کۆلێژی زانست کۆبوونەوە، لەوێوە پێکدادانی یەکەم لەگەڵ
پیاوانی پۆلیسی کە چەکدار بەدار و بەرد دەستی پێ کرد، هەروەها هەندێ پێکدادانی لەم
جۆرە لەزۆر جێگای تریش لە پایتەخت ڕووی دا کە بووە هۆی بریندار بوونی گەلێ لە
قوتابیان. حکومەت بڕیاری دا خوێندن لە زانکۆکان و قوتابخانە دواناوەندییەکان
ڕابگیرێ بەئومێدی شکاندنی مانگرتنەکە و کۆتایی پێهێنانی خۆپیشاندانەکان، بەڵام
سەرنەکەوت، لەبەرئەوە هێزی پۆلیس بەئۆتۆمۆبێلی (القوة السيارة) کە بەشێوەیەکی
باشتر ئامادە و مەشق درابوون بانگ کرد، بەڵام ئەم هێزانەش تێکگیران لەگەڵ
خۆپیشاندەران بەشێوەیەکی فراوان و، نارنجۆکی دەستی فرمێسک هێنەریان بەکارهێنا
ئەویش نەیتوانی دەست بەسەر ئەم هەڵوێستە خوێناوییە ئاڵۆزەدا بگرێت کە لەماوەی
نێوان ٢٠/ت٢/بۆ/٢٤/ هەمان مانگ (٢٧) بیست و حەوت شەهیدی لێ کەوتەوە
ژمارەیەکی زۆرتریش لەمە بریندار بوون[٢٨] بێ ئەوەی هیچ کۆتایی پێ بێت، ئەم
خۆپیشاندانانە هەر پایتەختی بەتەنها نەگرتەوە؛ بەڵکو کەربەلاو نەجەفیشی گرتەوە.[٢٩]
بەرامبەر بەو بارودۆخە قلێشاوەیە وەزارەتی مستەفا عومەری دەست لە کارکێشانەوەی
خۆی لە ٢٢/ی مانگی ت٢/دا پێشکەش کرد، لە ڕۆژی دواییدا پێکهێنانی
حکوومەتێکی کتوپڕی (حكومة الطوارئ) ڕاگەیاند بەسەرۆکایەتی سەرۆک ئەرکانی سوپا
فەریق نورالدین مەحموود، ئەمەش دادی هێوربوونەوەی بارودۆخەکەی نەدا، کە وای لە
حکوومەتی نوێ کرد پەنابباتە بەر سوپاو هێزەکانی سەربازی تێ بئاڵێنێ کە توانی
گۆڕەپانە گشتییەکان کۆنترۆڵ بکات و، ئەو ڕێگایانەی دێنە ناو ژوورەوەی پایتەخت و،
چوونە سەر باڵەخانە بڵندەکان، ئەمەش نەیتوانی خۆپیشاندەران سەرکوت بکات، چونکە
ئەوان (خۆپیشاندەران) سوپایان بە هی خۆیان دادەنا، ئا بەم شێوەیە کۆمەڵی
خۆپیشاندەران و ناڕازی بووان لە کەمی نەدا بەڵکو زۆرتر و بەربڵاوتربوو، وە ئەم

بارودۆخە لەسەر هەمان شێوە بەردەوام بوو کە وای لە حکوومەتی نائاسایی (حکومة الطوارئ) کردبوو بۆ بەرزکردنەوەی پلەی بەرەنگاربوونەوەی لە خۆ پیشاندەران بەڕاگەیاندنی ئەحکامی عورفی لە لیوای بەغدا کە کاری بەڕێوەبردنی بەیەکەکانی سەربازی سپێردرابوو، ئەوانیش فرمانیان دەرکرد بەقەدەغەکردنی خۆپیشاندان و گردبوونەوە و چەک هەڵگرتن و، داخستنی حیزبە سیاسییە مۆڵەت دراوەکان و، هەروەها رۆژنامەکان و رۆژنامە خۆجێییەکانیان راگرت و، سەدەها پیاوانی رامیاری و بەرهەڵستکاریان هاوێشتە بەندیخانە و، هەزارەها خۆپیشاندەرانیان خستە بەندیخانەی ئەبوغریب.[٣٠] ئەو کاتەی بۆ هێزەکانی سەربازی ئاشکرابوو، کە نەیانتوانی کۆتایی بەخۆپیشاندانەکان و نارازی بووەکان بێنن لەگەڵ ئەو هەموو توندوتیژییەی کە پێشتر باسی کرا کە بەکاریان هێنا، ئینجا بەتوندی بەخۆپیشاندەرانیان گوت کە ئەوان کە (هێزی سەربازی) ناچارە پەنا دەباتە بەرتوندترین تۆڵە و سزا ئەگەر هاتوو بەردەوام بن لە سەر ئەم کارە نارەزاییانەیان، بەڵێ بەراستی ئەم هێزانە دەستیان کرد بەتەقاندنەوەی تەقەمەنی زیندی (الذخیرة الحیة) بۆ سینگی خۆپیشاندەران تاکو بووە هۆی شەهید بوونی(١٨) هاوولاتی و بریندار بوونی(٨٤) کەس.[٣١] لە گەرەکی (باب الشیخ) بەتەنها؛ شایانی باسە سیاسەتی سەرەوەی حکوومەتی کە خۆی بەئاسن و ئاگر راگرتبوو بووە هۆی لەبەر چوواندنی ئەم راپەرینە جەماوەرییە پێش ئەوەی بگاتە ئامانجە نیشتمانییەکانی.

بەلام زاڵ بوون بەسەر ئەم راپەرینەدا زاڵ بوونێکی کاتی بوو بەبەڵگەی ئەوەی کە راپەرینێکی دیکەی نزیک رووی دا، لەوکاتەی کە بارودۆخی شیاوی بۆ هاتە کایەوە کە لە برگەی داهاتوودا باسی لێ دەکەین.

### ٥- راپەرینی ١٩٥٦:

لە راستیدا عێراق پێشتر ئەندامێکی کاریگەربوو لە پەیماننامەی هاریکاری کە لە٢٤/ شوباتی/ ١٩٥٥دا بەسترا لە نێوان عێراق و تورکیادا. لە دواییدا بەریتانیاش لە ٥/نیسانی/ هەمان ساڵدا هاتە پاڵیان، تا ناوی لێنرا پەیماننامەی بەغدا (میثاق بغداد). لە پاشان پاکستان لە ٢٣/ئەیلوولی/ ١٩٥٥و، ئێرانیش لە ٣/ت٢/ هەمان ساڵدا[٣٢] بوونە ئەندام لەم پەیماننامەیە.

حکوومەتی میسر لە ٢٦/تەمووزی/١٩٥٦دا بریاری بەخۆماڵیکردنی نۆکەندی سوێسی دا، هەردوو حکوومەتی بەریتانی و فەرەنسا نارەزاییان لەسەر ئەم کارە دەربری

و، ئەم خۆماڵیکردنەیان بەکارێکی پێشێل کار لێک دایەوە کە هەڕەشەیەکی ترسناک لە هاتوچۆکردنی دەریاوانی دەکات لە نۆکەندی سوێس.(۳۳) لە دوای ئەوەدا کاری توندڕەوی لە هەردوو لایەن بەشێوەیەکی بەردەوام ڕووی دا، تاکو گەیشتە ئەوەی ئیسرائیل هێرشێکی نارەوای خۆی لەسەر خاکی میسر لە ۲۹/ت۱/۱۹۵٦ کرد. لە دوای دوو ڕۆژ بەریتانیا و فەڕەنسا بەشداریان کرد کە ناوی لێنرا دەستدرێژی دوژمنکاری سێ قۆڵی لەسەر میسر. وە ئەم دەست درێژیکردنە وای لە جەماوەری وڵاتانی عەرەبی جیاواز کرد کە دەنگی نارەزایی بەرز بکەنەوە، وە لە نێوانیاندا دەنگی ڕۆڵەکان گەلی عێراق بوو.

وە نارەزاییيان بۆ ئەم کارە دەربڕی وە بەپێشێلکارییەکی زەق بۆ سەر سەروەری میسر لە قەڵەم دا.

شایانی باسە ئەوکات دەسەڵات لە دەستی وەزارەتی نوری سەعید دابوو، وە هەڵوێستی حکوومەتی عێراق نەگەیشتبووە ڕادەی پێویست لە دەوڵەتێکی عەرەبی لەم بارودۆخەدا کە تەنها بەنارەزایی دەربڕین قایل بوو بۆ ئەم دەست درێژیکردنە و پەیوەندی دبلۆماسی خۆی لەگەڵ بەریتانیادا نەپچڕی بەڵکو بەپێچەوانە کە لەسەر ئاستێکی فراواندا زانرابوو کە مەلیک فەیسەڵی دووەم و جێنشینەکەی «عبدالاله» وە نوری سەعید لە ناوەخۆیانەوە و بەشێوەیەکی نهێنی ئەوانیش بەدەست درێژکردنی بەریتانیا بۆ سەر میسریان پێ خۆش بوو.(۳٤) بۆیە شەقامی عەرەبی واتا (جەماوەر) زۆر ڕقیان لە هەڵوێستی حکوومەتی عێراقی ناوبراو دەبووەوە، وە ئەم ڕق لێبوونەوەیە وای کرد کە ئەو بۆرییە نەوتانەی کە بەخاکی سوریا و ئوردن دا دەڕۆن بتەقێنەوە(۳۵).

بەڵام لە عێراق ڕای گشتی گەل زیاتر ڕق و کینەی هەڵگرتبوو لە ڕژێم بەتایبەتی ئەو جەماوەرەی کە زۆر تفت و تاڵی لە سیاسەتەکانی ئەو ڕژێمە کێشابوو لەبەرئەوەی پشتگیر و لایەنگیری ئینگلیزی دەکرد وە لە هەمان کات گاڵتەو سووکایەتی بەمافەکانی گەلی عێراق دەکرد.

وانەبێ زیادەڕۆیی بێ ئەگەر بڵێین شەقامی عێراقی دەکوڵا وەکو بورکانی بەجۆش و، لە ئاسمانەوە نیشانەکانی ڕاپەڕینی گەل دیاربوو، ناوەندەکانی حکوومەتیش ئاگاداربوون بەم شتانە و، بۆ ئامادەکردنی خۆیان بۆ هەر شتێکی کتوپڕو لە ناکاو، بۆ ئەم مەبەستە ئەحکامی عورفییان لە سەرتاسەری وڵات جاڕدابوو، لە ژێر هەندێ بەهانەی لابەلاو داپۆشراو. هەروەها پلانی دوورو درێژیان ئامادەکردبوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی

هەڵوێستەکە.[٣٦] وە ئەوکاتەی بەپەلە لە بەیانی ڕۆژی یەکەمی ت٢/ساڵی ١٩٥٦ لە بەغدادا خۆپیشاندانی قوتابیان بەرپابوو، زۆر لە قوتابیانی کۆلێژەکانی پزیشکی و دەرمانسازی و کیمیا و بازرگانی و ئابووری و ئەدەبیات بەشدارییان تێدا کرد، وە بەیەک دەنگ هاواریان دەکرد بەو دروشمانەی کە لایەنگیری میسری دەکرد و دژایەتی حکوومەتی عێراقی دەکرد، وە ئەحکامی عورفی و پیاوانی پۆلیسی ڕیسوواو سەرکۆنە دەکرد.[٣٧] لە ٣/ی مانگی ت٢/ هەمان ساڵدا ئەم خۆپیشاندانانە دووبارە بوونەوە، جەماوەرێکی زۆر لە هەموو چین و توێژەکانی گەل بەشدارییان تێدا کرد و[٣٨] لەوکاتەی کە پۆلیس هەوڵی لێک جیاکردنەوەی خۆپیشاندەرانی دەکرد لە ڕێگای کوتک و بەکارهێنانی گازی فرمێسک هێنەر و پێکدادان لە نێوان هەردوو لا (پۆلیس و جەماوەر) ڕووی دا و، پۆلیس زۆر بەتوندی وەڵامی خۆپیشاندەرانیان دەداوە کە بووە هۆی شەهیدبوونی دوو هاوولاتی خۆپیشاندەر. بەڵام پۆلیس وایان بەدیار خست و گوتیان کە ئەمانە بەگوللەی خۆپیشاندەرانی هاوڕێیان کوژراون.[٣٩] حکوومەت بڕیاری دا خوێندن لە کۆلێژەکان و خانەی مامۆستایانی کوڕان و کچان و قوتابخانە دواناوەندییەکان و پیشەییەکان و ناوەندییەکان بەدوابخرێت و ڕابگیرێت.[٤٠] وە لە ١٠/ت٢/ هەمان ساڵدا (٥٥) مامۆستای زانکۆ یاداشتنامەیەکی نارەزاییان بۆ مەلیک بەرز کردەوە و، تیایدا ڕەخنەیان لە حکوومەت گرتبوو کە ولاتی گەیاندە ئەم بارودۆخە سیاسییە خەراپەو، ژیانی دیموکراسییان لە خەڵک قەدەغە کردبوو، وە ئەوەش وای لە حکوومەت کرد کە ژمارەیەک لە پێشکەشکەرانی ئەم یاداشتنامەیە بداتە ئەنجوومەنی عورفی بۆ دادگاییکردنیان، ئەنجوومەنی ناوبراو بڕیاری دا بەدانانی عبدالرحمن بەزاز ڕاگری کۆلێژی ماف و، هەندێ لە مامۆستایەکانی تری لە ژێر چاودێری پۆلیس و هەروەها دوورخستنەوەیان بۆ پێنجوێن و دواتریش بۆ تکریت[٤١].

هەروەها حیزبە سیاسییەکان و، لە پێشەوەیان حزبی کۆنگرەی نیشتمانی و پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و حزبی شیوعی عێراقی زۆر بەتوندی نارەزاییان لە هەڵوێستی حکوومەت (میری) سەبارەت بەدەست درێژی دوژمنکارانەی سێ قۆڵی بۆ سەر میسر و، بەکارهێنانی هێز لە دژی خۆپیشاندەران دەربڕی، هەروەها زۆر داواکارییان پێشکەش بەمەلیک کرد کە مەبەستیان بۆ چاککردنی بارودۆخی سیاسیی بوو.[٤٢] هەروەها پارتی دیموکراتی کوردستان پشتگیری بەحکوومەت و بەگەلی میسر کرد لە تێکۆشانیان دژ بەم دەست درێژکردنەو زۆر خۆپیشاندانی هاوکارییان بۆ ئەم مەبەستە

ڕێکخست و کە جەماوەرێکی فراوانی گەلی کورد بەشدارییان تێدا کرد. لە دواییدا ژمارەیەک لە ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی[٤٣] درانە ئەنجوومەنی عورفی کە تاوانی پشتگیریکردنی میسریان خرابووە پاڵ. هەروەها ڕۆژنامەی حیزب (خەبات) ئاشکرای کرد کە دەست درێژیکردن لەسەر میسر بەدەست درێژیکردنە لەسەر جەماوەری کورد لە قەڵەم دەدرێت چونکە سەرکەوتنی دوژمنان کارێکی نێگەتیڤانەیە بەسەر هەموو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، هەروەها (خەبات) هێرشی بردە سەر هەڵوێستی وەزارەتی نوری سەعید کە دژ بەهیواو ئاواتەکانی گەلی عێراق بەکورد و عەرەبییەوە بوو[٤٤].

لە دواییدا ژمارەیەکی زۆر لە پارێزەران و کەسایەتییە کۆمەڵایەتییە ناودارەکان وەکو هەندێ سەرۆک وەزیرانی پێشوو و ناودارەکان و نوێنەرەکان و پیاو ماقووڵانی ناو کۆمەڵ یاداشتنامەیان پێشکەش بە شا فەیسەڵی دووەم کرد کە تیایدا پشتگیرییان لە هەڵوێستی بزاڤی نیشتمانی ئەوکات کرد.[٤٥] لە ١٨/ مانگی ت٢/ هەمانساڵدا زۆر ڕووداوی خوێناوی دڵتەزێن لە شاری (حی) ڕووی دا بەهۆی دەرچوونی خۆپیشاندەران و تەقە لێککردن لە نێوان پیاوانی پۆلیس و خۆپیشاندەران کە بووە هۆی دوو قوربانی لە خۆپیشاندەران و، هەروەها یەک پۆلیسیش کوژرا، سەرەڕای بریندرابوونی ژمارەیەکی زۆر لە هەردوو لا. بەڵام ئەم خۆپیشاندانانە بەکۆنترۆڵکردنی پۆلیس لەسەر هەڵوێستەکە و گرتنی هەندێک لە خۆپیشاندەران و ناردنیان بۆ ئەنجوومەنی عورفی بەتاوانی سەرپێچیکردن و مانگرتنی چەکداری و، وە هەوڵی وەرگێڕانی سیستەمی حکوم کۆتایی هات. وە هەروەها ئەنجوومەنی ناوبراو بڕیاری دەرکرد بە لەسێدارەدانی دوو لە خۆپیشاندەران و، هەروەها بەندکردنی ژمارەیەکی تریان بۆ ماوەی جیاجیا[٤٦].

وە لە شاری نەجەف خۆپیشاندانێکی جەماوەری لە ٢٣/ت٢/ هەمان ساڵ بەرپابوو و، وە ژمارەیەک لە پیاوانی ئایینی بەشدارییان تێداکرد، لە پاش ئەو ڕۆژە لە ٢٤/ هەمان مانگ خۆپیشاندانێکی قوتابییانیش کرا، کە قوتابییەکانی هەردوو قوتابخانەی خەوەرنەق و سەدیر بەشدارییان تیادا کرد، پۆلیس توانی دەستی بەسەردا بگرێ و پەرتوبڵاویان بکات و، بیانگەڕێنێتەوە بۆ قوتابخانەکانییان.

بەڵام کارەکانی لەم سنوورە ڕانەوەستان بەڵکو پیاوانی پۆلیس بەخەنجەر و قەمچییان چەکداربوون خۆیان کوتایە ناو قوتابخانەی خەوەرنەق و دەستدرێژییان کردە سەر قوتابییان و، (٤٢)یان لێیان بریندارکردن و، برینی (١١) کەسیان زۆر ترسناک بوو و،

یەکێکیانیش تێدا مرد و، لە دواتریش قوتابییەکی تر لە قوتابخانەی سەدیر مرد، هەروەها (٥)یش لە دانیشتوانی شارەکە شەهید بوون.[٤٧] وە بۆ نارەزایی دەربڕین شاری نەجەف بەگەورە و بچووکییەوە خۆپیشاندانێکی جەماوەری تووڕە و توندیان لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا پیشان دا. وە خۆپیشاندەران تەرمی یەک لە شەهیدەکانیان لەسەر شان دانابوو کە لە خۆپیشاندانەکەی سبەینەی هەمان ڕۆژ شەهید بوو بوو، لە پاشان ناو شار تووشی دۆخێکی پڕ لە مانگرتن و نارەزایی دەربڕین سەرتاسەری گرتەوە کە هەفتەیەکی خایاند، ئەویش وەکو وەلامدانەوەیەک بوو لەسەر هەڵوێستە لەرزۆکەکەی حکوومەت. توند و زەبر و زەنگی پیاوانی پۆلیس دژ بەخۆپیشاندەرانی لە ڕۆڵەکانی شارەکە.[٤٨] هەروەها خۆپیشاندانەکان شاری (کوفە)شی گرتەوە و پیاوانی پۆلیس بەرەنگاریان بوونەوە و منداڵێکیان کوشت و یەکێکی تریش بەسەختی بریندار بوو[*].

ئەم ڕووداوە خوێناوییانەی شاری نەجەف بوونە هۆی بەرزبوونەوەی بێزاری و تووڕەبوونی جەماوەر و نارەزایی دەربڕینیان لە زۆربەی زۆری شارەکانی عێراقدا، لە ناو ئەمانەشدا بەغدای پایتەخت و دیوانیەو ناسریە و کەربەلا و شامیە و بەسرە و کوت و عەمارە و حیلە وە جەماوەری خۆپیشاندەران دەستیان بەسەر شاری (عانە) داگرت[٤٩].

هەروەها خۆپیشاندانەکان شارەکانی باکوریشی گرتووە وەکو: کەرکووک، هەولێر، سلێمانی، مووسڵ[٥٠].

وە لە میانی ئەم ڕووداوانەدا گۆڕانکارییەکی گرینگ هاتە کایەوە، وەکو پەنابردنی حکوومەت لە ٢٩/ت٢/ هەمان ساڵدا بۆ گرتنی ژمارەیەک لە سەرکردەکانی بەرهەڵستکاران وەکو مامۆستا کامل چادرچی و محمد صدیق شنشل و فایق سامەڕایی و سامی باش سالم و حوسێن جەمیل و، دادگاییکردنیان لە پێش ئەنجوومەنی عورفی کە چەند حوکمێکی جیاجیای بەسەردا سەپاندن[٥١].

حکوومەت وای زانی کۆنترۆڵی بارودۆخەکە، وە کۆتایی بەپشێوی و خۆپیشاندانەکان لە هەفتەی دوایی کانوونی یەکەمی/ ١٩٥٦دا دێنێت، بۆیە وەزارەتی پەروەردە بڕیاری دەرکرد بەدەست پێکردنەوەی خوێندن وە لە کۆلێژ و پەیمانگا و قوتابخانەکان لە ١٩٥٦/١٢/٢٩ بەڵام ئەم نارەزایی دەربڕینانەی قوتابیان هەر بەردەوام بوو و، کۆتایی پێ نەهات هەتا سەرەتای ساڵی ١٩٥٧[٥٢].

دەتوانین بڵێین ڕاپەڕینی (١٩٥٦) توانی سەرکەوتووبێت لە کۆکردنەوەی ڕای گشتی

جەماوەر لە عێراق لە دەورووپشتی ئامانجە نیشتمانییە گرینگەکان وەکو پێویستی ڕووخاندنی وەزارەتی نوری سەعید و خۆکشانەوەی عێراق لە پەیماننامەی بەغدا و بەخۆماڵیکردنی کۆمپانیاکانی داگیرکەر و دانپیانانی ئازاد بەسیاسییەکان و، پشتگیریکردنی تێکۆشانی وڵاتە عەرەبییەکان بۆ وەستان بەرامبەر هێزەکانی کۆلۆنیالیزم، بەڵام ناتوانین نکۆلی لەوە بکەین کە ئەم ڕاپەڕینە نەیتوانی وەزارەتی نوری سەعید بڕووخێنێ و عێراق بکشێنێتەوە لە پەیماننامەی بەغدا. وە دکتۆر جەعفەر عەباس حەمیدی لەم بارەیەوە دەڵێ: «ئەم ڕاپەڕینە سەرکەوتوو بوو لە پێکەوە گرێدانی خەباتی نیشتمانی و خەباتی نەتەوایەتی. سەرەڕای ئەوەی کە زۆر لە پڕۆژەکانی نوری سەعیدی تێکدا. کە دەیویست دوژمنکارییە سێ قۆڵییەکەی بۆ سەر میسر هەڵبقۆزێتەوە، وە سوریا لە ڕێگای هێز بخاتە ڕکێفی خۆی، زیندە بەچاڵ کرد. ئەم کارە سەرنجی ڕای گشتی جیهانی بۆ خۆی ڕاکێشا کە چ تێکۆشانێک ڕوو دەدا لە ناو عێراق بەمەبەستی چاکردنی بارودۆخی سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵایەتی»(٥٣).

لە کۆتاییدا سوورین لە جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە بورکان و لافاوە جەماوەرییە لەبن نەهاتووەکەی کە لە بەیانی (١٤)ی گەلاوێژی ١٩٥٨ سەری هەڵدا بۆ هەڵکوتانە سەر بنچینەکانی سەردەمی پادشایەتی بۆگەنی هەتا هەتا لادراو بەبەشێکی گەورەی قەرزارە بۆ ڕاپەڕینەکەی (١٩٥٦) و ئەو کارەساتە دڵتەزێنانەی کە لەگەڵی ڕوویان دا.

**دووەم: عێراق لە سەردەمی کۆماریدا:**

**١- شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژی ١٩٥٨ «کۆماری یەکەم»**

شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ لە عێراقدا وانەبێ ڕووداوێکی بێ پێشەکی بێت یان پچڕاوبێت لە مێژووی عێراقی نوێدا.(٥٤) بەڵکو بەبەری تێکۆشانێکی دوورودرێژی لە لایەن گەلی عێراق بەهەموو چین و توێژەکانی بەتایبەت هەژار و نەدارەکان ئەنجام دا دژی حوکمی کەمینەیەک سەپێندراو بەسەریاندا لە لایەن دەزگاکانی کۆلۆنیالیزمی بەریتانی ئەوەش لە ڕاستیدا بەدەرنییە ئەگەر بڵێین ئەم شۆڕشە بەتەواوکەری دوورودرێژی سروشتی ڕاپەڕینەکان و شۆڕشەکانی گەلی عێراق دەژمێردرێ هەر لە سەرەتای شۆڕشی (١٩٢٠)تا دەگاتە بزووتنەوەی مایسی ١٩٤١ و خۆڕاتەکاندنی کانوونی ١٩٤٨ و ڕاپەڕینەکەی تشرینی ١٩٥٢ و کە بەڕاپەڕینی تشرینی ١٩٥٦ کۆتایی دێت.

هەروەکو لەمەوپێش ڕوونمان کردەوە کە شێوە و ناوەڕۆکی سیستەمی ئەو حوکمڕانییەی کە لە پاشماوەی سەردەمی عوسمانی وە لە سیستەمەکانی سەدەی ڕابردوو لە عێراق دامەزرا، لە داهێنانی هزری دەزگا سیاسییەکانی بەریتانیا بوو. کە هەوڵی دەدا بیکاتە داردەستێک بەئارەزووی خۆی بیسووڕێنی بۆ ئەوەی بتوانێت بەرژەوەندییەکانی ئابووری و ستراتیژی خۆی لە وڵات و لە ناوچەکەدا جێبەجێ بکات. چونکە هەر لادانێک لەم بەرژەوەندییانە بەتێڕوانینی لەندەن کارێکی قەدەغە بوو وەڕێگەی پێ نەدەدرا، ئا بەم شێوەیە دانان و نەخشەکێشانی هەموو شتێک لە پێناوی خزمەتی ئەم ڕەوتە دارێژرا،(٥٥). شتێکی نامۆنییە دارشتنی یاسای بنەڕەتی عێراقی لە ساڵی ١٩٢٥ لە وەزارەتی مستعمەراتی بەریتانی لە لەندەن کرا، وە ئەنجوومەنی دامەزرێنەری عێراقی هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو، تەنها دەبوایە پرۆژەکە پەسەند بکات بەبێ ئەوەی بتوانێت هیچ شتێک لە ناوەڕۆکی دەقەکان بگۆڕێت یان بیهاوێتە سەر(٥٦).

ئەوەی شاردراوە نییە کە دەزگا کۆلۆنیالیزمەکانی بەریتانیا لە سەرەتای سەردەمی دەست بەسەرداگرتنی عێراقدا حوکمڕانی ئەم وڵاتەیان بەبنەماڵەی پادشایەتی هاشمی سپارد، کە لە حیجاز هێندرابوون وە ئەم بنەماڵەیە حوکمڕانییان دەکرد. وە بەهاوکاری کەمینەیەک لە دەرەبەگەکان و خاوەن زەوی و زارە گەورەکان کە تەنها ڕێژەی ١٪ لە دانیشتوانی لادێ بوون، بەڵام دەستیان بەسەر (٧٥٪)ی زەوی و زارەکانی کشتوکاڵی بەکارهێنراو لە عێراقدا داگرتبوو، کە بەشی هەر زەوییەک (٤٠٠,٠٠٠) چوارسەد هەزار دۆنم زیاتر بوو(٥٧).

هەروەها بەهاوکاری چینی بۆرژوای گەورە کە بەسەرقاڵی کاری بازرگانێتی کڕینی زەوی و زاری بوو، وە ئەم جۆرە بۆرژوایە لە سایەی پەیوەندییەکانی کۆلۆنیالیزم دروست بوون و، کە پێوەست بوون بەیەکەوە(٥٨).

ئابەم جۆرە پەیوەندی ئابووری هاوبەش بەدیاردەکەوێت کە ئەم چینە لە یەکتر گرێ دەدا لە لایەک و، وە بەسیستەمی پادشایەتی سەر بەکۆلۆنیالیزمی بەریتانی لە لایەکی ترەوە، هەر گەیشتن بەدەسەڵات چ بۆ ئەندامێتی ئەنجوومەتی گەل بێت یان بۆ پایەی وەزارەت و، بەدرێژایی سەردەمی پادشایەتی هەر بۆ ڕۆڵەکانی ئەم چینانە دەبوو کە لە ڕووی ئابوورییەوە بەسیستەمی حکوومەتەوە گرێ درابوون، بەڵام ڕۆڵەکانی چینەکانی هەژار و نەدار لە کرێکاران و جوتیاران و کاسبکاران بەهیچ شێوەیەک بۆیان نەبوو بگەنە ئەم پایانە.

ئەم جۆرە ڕەفتارە سیاسییە بەدرێژایی کات دۆڵێکی فراوان و قووڵی دروستکرد لە نێوان دەسەڵاتداران (الحاکمون) کە کەمینەبوون وە حکووم کراوەکان (المحکومین) زۆربنەی گەل بوو و، چینە بەش خوراوەکانی لە کاسبکارە بچووکەکان و، خاوەن پیشە دەستییەکان و کرێکارەکان و جوتیارەکان بوون؛ کە ئەم کارە وای لەم چینە زۆر لێکراوانە کرد پشتی یەکتری بگرن و شان بەشانی یەک تێکۆشان بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەک بۆ ڕزگاربوونیان لەم بارودۆخە ئاڵۆزە و ترسناکەدا، دەتوانین ئەم ڕاستییە بەشێوەیەکی فراوانتر بسەلمێنین ئەگەر زانیمان کە ئەفسەرە ئازادیخوازەکان لە باری کۆمەلایەتی دەگەڕانەوە بۆ چینە ناوەندییەکان و هەژارەکان و ماف خوراوەکان[٥٩].

وە هەروەها سەرکردەی شۆڕشەکە کە زەعیمی ڕوکن عەبدولکەریم قاسم بوو کوڕی بنەماڵەیەکی هەژار و بەش خوراو بوو[٦٠]. وانەبێ زێدەڕۆیی بێت ئەگەر بڵێین هەموو فاکتەرە سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵایەتییە جیاکان و هەروەها فاکتەرەکانی ناوەوە و دەرەوەی عەرەبی و جیهانی- کە مەودای ئەوەی نییە لە لێکۆڵینەوەکەمان بەدوور و درێژی باسی بکەین ئەمانە هەمووی بەیەکەوە بەشدارییان لەوە کرد کە حکوومەتی پادشایەتی لە چواردەی گەلاوێژی/١٩٥٨ زوو کۆتایی پێ بهێنرێت لەسەر دەستی ڕێکخستنی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان کە دروست بوونی بنەچەکەکەی بۆ ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٢ دەگەڕێتەوە[٦١].

ڕێکخستن و بیرۆکە و مەبەستەکانی و؛ هەروەها ناوەکەی لە ڕێکخستنی ئەفسەرە[٦٢] ئازادیخوازەکانی میسر؛ کە بەشۆڕشی یۆلیۆ/١٩٥٢ هەستیان بۆ وەرگرتبوو.

چونکە ئەم شۆڕشە و ڕێگەی ئەنجامدانی و مەبەستەکانی و دروشمەکانی نەتەوایەتییەکان جۆش و خرۆشی ئەفسەرە عێراقییەکانی زیاد کرد؛ ئەوانەی کە لە بنەڕەتەوە بەپرنسیپەکانی نیشتمان پەروەری و نەتەوایەتی چەکداربوون وە لە هەل دەگەڕان بۆ ڕزگارکردنی عێراق لە ڕژێمە گەندەڵەکەی و، گۆڕینی بەحوکمێکی نیشتمانی کە سەرچاوەکەی لە بنکەیەکی جەماوەری فراوان وەربگرێت. لە دواییدا هەردوو ڕێکخستنی سەرەکی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان لە ک٢/ ١٩٥٧ تێکەڵ یەک بوون[٦٣].

شایانی باسە جارێکی تر هەوڵدرا بەبەرپاکردنی شۆڕش، بەڵام هەموو جارێ چاوی لێ دەپۆشرا پێش ئەوەی بگاتە قۆناغی ئەنجامدان[٦٤].

لە ١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ هەلی گۆڕانی بۆ ڕەخسا ئەوکاتەی کە هەندێک لە ئەفسەرە

ئازادیخوازەکان بەتایبەتی سەرکردەی شۆڕش زەعیم ڕوکن عەبدولکەریم قاسم و جێگرەکەی سەرهەنگ ڕوکن عەبدولسەلام عارف کە هەلی تێپەڕبوونی هەندێک لە یەکە سەربازییەکانی کە بەبەغدای پایتەخت بەرەو ئوردن قۆستەوە و هەلیان کوتایە سەر دامودەزگاکانی سەردەمی پاشایەتی و، دەست بەسەر جێگاکان و شوێنە گرینگەکان داگیراو، شۆڕش سەرکەوت لە دوای چەند کاتژمێرێک لە دەست پێکردنی هاوولاتیانی عێراقی لە ڕژێمێک کە (٣٧) سالّ چۆکی بەسەر سینگی دا کوتابوون ڕزگارکرد.

شۆڕش پێشوازییەکی گەرمی لە لایەن زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی گەلی بەکورد و عەرەب و کەمە نەتەوایەتییەکانەوە لێ کراو، لە چرکە سەرەتاییەکانی داگیرسانی زۆرینەی حیزبە سیاسییەکانی گۆڕەپانی عێراق چ نهێنی یا ئاشکرا پشتگیریان لێ کرد، لەبەرئەوەی زۆربەیان ئاگاداری دەنگ و باسی نزیک بوونی شۆڕش بوون پێش ئەنجامدانی.(٦٥) ئا بەم جۆرە ئامانجی جەماوەری زۆرلێکراو هاتەدی ئەو کاتە لەو ڕۆژانەدا عێراق یەکگرتنێکی بێ وێنەی وای بەخۆوە دیت لە نێوان حکوومەتی نیشتمانی و گەلدا کە لە دەوروپشتی کۆبوونەوە هەروەک بازن دەوروپشتی باسک دەدات و دەگری و، حکوومڕانی عێراق کەوتە سەر بنچینەیەکی جەماوەری پان و بەرین بنیات نرا. وە لە ڕاستیدا بەدوور ناکەوینەوە ئەگەر بڵێین ئەم حکوومەتە جێگەی تانە لێدان لە نیشتمان پەروەرێتی نەبوو، چونکە لەسەردەمەکەی خۆی زۆر دەستکەوتی بۆ گەلی عێراقی بەدی هێنا، بۆ نموونە لەسەر ئاستی سیستەمی سیاسیی یاسای بنەڕەتی عێراقی ساڵی ١٩٢٥ پووچەڵ کرایەوە و دەستووری کاتی لە ٢٧/ گەلاوێژی/١٩٥٨ دەرچوو و، سیستەمی حکومڕانی کۆماری ڕاگەیەنرا و، پەیماننامەی عێراقی بەریتانی پووچەڵ کرایەوە و حکوومەتی تازە زاڵ بوو بەسەر دەسەلاتی بێگانە و، بەتایبەتی دەسەلاتی بەریتانیا و، خۆکشاندنەوەی لە پەیماننامەی بەغدا و، لە یەکێتی عەرەبی هاشمی و لە ناوچەی ئیسترلینی و خۆی بەستەوە بەسیاسەتی بێ لایەنی پۆزەتیڤانە (الحیاد الایجابي). هەروەها ڕێکەوتنی هاوکاری ئابووری لەگەڵ یەکێتی کۆمارەکانی شۆشیالیستی سۆڤیەتدا بەستا. وە لە بواری ئازادییە گشتییەکان دان بەمافەکان و ئازادییە بنچینەییەکانی هاوولاتیان نرا. بۆ نموونە سەربەستی ڕادەربڕین و، سەربەستی کارکردنی سیاسیی، گەلێک لە حیزبە سیاسییەکان مۆڵەتی کارکردنیان پێ درا لەمانەش ئەو حیزبانەی کە لە ژێر باری بەرەی یەکێتی نیشتمانی بوون ئەویش وەکو حزبی نیشتمانی دیموکراتی و حزبی سەربەخۆیی و حزبی شیوعی عێراق و حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالیستی و حزبی دیموکراتی کوردستانی و چەند حیزبێکی دیکە، هەروەها بەندکراو و

زیندانە سیاسییەکان بەڕەڵاکران و، بڕیارەکانی لێ سەندنەوەی و ڕەگەزنامەی عێراقی لە هەندێ هاووڵاتی پووچەڵ کرایەوە و، هەندێ ئاسانکاری پێویست بۆ گەڕانەوەی دوور خراوە سیاسییەکانی دەرەوەی وڵات پیادەکرا و، یاسای پاکسازی دەزگای حکومی جێبەجێ کرا.[٦٦] هەروەها لە بواری ئابووریدا حکوومەتی شۆڕش دیاردەی دەرەبەگی و چەوسانەوەی قەڵاچۆکرد و، یاسای چاکردنی کشتوکاڵی ژمارە (٣٠)یساڵی ١٩٥٨ی دەرکرد کە ئەویش بەسەرکەوتنێک بۆ جەماوەری جووتیارە ماف خوراوەکان لە قەڵەم درا.[٦٧] هەروەها شۆڕش چەند دەستکەوتێکی نیشتمانی گرینگی لە بواری بەگژداچوون و سنووردارکردنی ئەو کۆمپانییانەی کە دەستیان بەسەر گۆڕەپانی پیشەسازی نەوت داگرتبوو و گەیشتە چلەپۆپەی بەدەرکردنی یاسای ژمارە (٨٠)ی ساڵی ١٩٨١ کە بەپێی ئەوەوە ناوچەکانی کارکردنی ئەم کۆمپانییانەی دیارکرد؛ بەکارێکی نیشتمانی گەورە درایە قەڵەم.[٦٨] کە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەسەر ورووژان و هارکردنی دەوڵەتە کۆلۆنیالیزمە گەورەکان دژ بەحکوومەتی نیشتمانی لە عێراقدا.

وە ئەوەی کە پەیوەندی بەمیللەتی کوردان کە زۆر لە ڕۆڵەکانی پەیوەندییان هەبوو بەڕێکخستنی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان کە ڕابەرایەتی شۆڕشیان وە هەندێکیان بەشدارییان لە هێرشبردنە سەر بەغدا لە بەرەبەیانی شۆڕش کرد.[٦٩] لەم بارەیەوە دەستووری کاتی کورد و عەرەبی بەهاوبەش لەم نیشتمانەدا لە قەڵەم دا[٧٠]. هەروەها کوردێک دامەزرا لە ئەنجوومەنی سەروەری کە لە سێ کەس پێکهاتبوو. وە مەلا مستەفای بارزانی سەرۆکی حزبی دیموکراتی کوردستان بانگهێشتە کرا لە ئاوارەیی لە جێگای دوورخستنەوەی لە یەکێتی سۆڤیەت بوو گەڕایەوە و بەپێشوازییەکی زۆر گەرموگوڕ بەخێرهاتنەوەی لە لایەن ڕۆڵەکانی گەلی عێراق بەعەرەب و کورد و کەمە نەتەوایەتییەکانەوە لێ کرا. هەروەها هاوەڵەکانی بارزانیش کە ژمارەیان (٧٨٤) کەس بوو لە دوای دوورکەوتنەوەیە درێژەی کە پتر لە (١٢) ساڵی خایاند بۆ خاکی نیشتمان گەڕانەوە[٧١]. هەروەها پارتی دیموکراتی کوردستان مۆڵەتی بەکارکردنی سیاسیی بەئاشکرا پێدرا، ئەم کردارانە کارێکی زۆری کردە دەروونی ڕۆڵەکانی گەلی کورد کە لە دەوروپشتی شۆڕش کۆبوونەوە و بەهەموو توانایەکیانەوە بەرگرییان لێ دەکرد پێش ئەوەی ئەو پەیوەندییە تووشی گرژی بێت لە قۆناغەکانی دواتر. بەڵام ئەو شۆڕشەی کە دڵی جەماوەری توێنی بەئازادی بەتوندی بۆ لای خۆی کێشابوو، هەر لە سەرەتای ساڵی دووەمی تەمەنییەوە بەرە بەرە ڕۆشنایی و تیشکی جەماوەری کەم دەبووەوە. چونکە

ناکۆکی کەوتە نێوان ئەو سەرکردانەی کە بەشۆڕشەکە هەڵسابوون. وە دەتوانین بڵێین هزرێکی هاوبەش نەبوو کە ئەفسەرە ئازادیخوازەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، بەڵکو ئەو ئەفسەرانە بیروباوەڕی جیاجیایان هەبوو وە لەپێش شۆڕش ئامانجێکی نیشتمانی بەرز و پیرۆز کۆی دەکردنەوە، ئەویش ڕووخانی ڕژێمی پادشایەتی بوو وە لە کاتێک کە ئەم مەبەستە هاتەدی بەسەرکەوتنی شۆڕش ئەو ئەفسەرانە بەناکۆکی نێوانیان وە حەز و ئارەزووی کەسایەتی تایبەتی خۆیان کە لە ڕۆژی یەکەمی شۆڕشدا پێوەیان دیاربوو گیرۆدە بوون، هەروەکو چۆن هەریەکە لە سەرکردەی شۆڕش کە عەبدولکەریم قاسم و جێگرەکەی سەرهەنگ عەبدولسەلام عارف دەستیان بەسەر هەموو پۆستە گرینگەکان داگرت. وە بەشێوەیەکی زەق و ئاشکرا، هاوڕێکانیان لە لیژنەی بالای ڕێکخستنی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان پشت گوێ خست هەروەها لە بیرۆکەی دامەزراندنی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کە پێش بەرپابوونی شۆڕش لەسەری ڕێکەوتبوون پاشگەز بوونەوە ئەمە لە لایەک و، لە لایەکی تریشەوە ململانێ لەسەر دەسەڵات لە نێوان هەردوو هاوڕێی دوێنێ تەقییەوە کە زەعیم ڕوکن عەبدولکەریم قاسم ڕۆڵی سەرهەنگ ڕوکن عەبدولسەلام عارفی بەرە بەرە بەلاوە ناو تاوەکو بەیەکجارەکی لە دەسەڵات دووری خستەوە لە دوای ئەوەی کە بۆی بەدیارکەوت و ڕوون بووەوە کە عەبدولسەلام عارف دەستی بەزێدە ڕووی لە ڕۆڵەکەی خۆی کردووە دەویست ڕۆڵی عەبدولکەریم قاسم کەم بکاتەوە و بەلاوەی بنێ؛ نەک هەر ئەوەندەش بەڵکو نەخشە و پلانی دادەنا بۆ ئەوەی جێگەکەی بگرێتەوە، ئەوەش (عبدولکەریم قاسم)ی ناچار کرد کە (عەبدولسەلام عارف)ی بداتە دادگای گەل کە حوکمی لە سێدارەدانی دەرکرد و، ئەو حوکمەی جێبەجێ نەکرا چونکە عەبدولکەریم قاسم بەخودی خۆی نەیهێشت. هەروەها عەبدولوەهاب ئەلشواف ئەندامی لیژنەی بالای ئەفسەرە ئازادیخوازەکان کە زۆر ڕقی لە سەرکردەی شۆڕش دەبۆوە لەبەرئەوەی کە هیچ بایەخێکی بەئەو نەدابوو و، هەروەها هیچ پۆستێکی گرینگیشی پێ نەسپاردبوو، کە بووە هۆی ئەوەی عەبدولوەهاب ئەلشواف بەهەوڵدانە سەرنەکەوتووەکەی هەڵبستێ بۆ وەرگێڕانی سیستەمی حوکمڕانی لە ئاداری ساڵی ١٩٥٩، وە ململانێ لەسەر دەسەڵات، بەهەموو ڕووکەشی و دروشمە جیاجیاکانی وانەبێ تەنها ئەفسەرە ئازادیخوازەکانی گرتبێتەوە؛ بەڵکو بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی گرتەوە، چونکە ئەو هەموو هەوڵانەی کە بۆ زیندووکردنەوەی ئەم بەرەیە دران، بۆ دووبارە ژیانەوەی بێ سوودبوون لەبەرئەوەی ئەو حیزبانەی لە ژێر ئالای بەرەی ناوبراو دابوون نەیانتوانی پێکەوە کاربکەن، بەڵکو بۆ دوو ڕەوتی سەرەکی دابەش

بوون؛ یەکێکیان: باڵی حزبی شیوعی عێراقی و حزبی نیشتمانی دیموکراتی کە داوای پەلە نەکردنیان دەکرد لە مەسەلەی یەکبوونی وڵاتە عەرەبییەکان و، لەجیاتی ئەو یەکبوونە داوای یەکگرتنێکی فیدراڵیان لە نێوان دەوڵەتە عەرەبییەکان دەکرد و، وە هەروەها دۆستایەتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا ببەستن، وە ئەوە بۆچوونی سەرکردەی شۆڕش (عەبدولکەریم قاسم) هەر بۆی هاوکاری دەکرد، بەڵام باڵی دووەم کە باڵی حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالیست و حزبی سەربەخۆیی و لایەنە نەتەوەییەکانی دیکەی بوو کە بانگهێشتی یەکبوونی دەست بەجێیان لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوودا دەکرد، وە ئەم باڵە پشتگیری و هاوکاری (عەبدولسلام عارفی) دەکرد(٧٢).

ئەمەیان لە لایەک و، لە لایەکی ترەوە ڕۆژگار بەدیاری خست کە (عەبدولکەریم قاسم) ئارەزووی لە تاکڕەوی دەسەڵات دەکرد و دەیویست هەموو کاروباری وڵات بۆ خۆی و لە دەستەخۆی بێت و، وە بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە زۆر لە ڕێگای هاندانی ململانێ نێوان حیزبەکان و هەوڵدانی پێکتردادانیان، ئەوە بوو کە پشتگیری و لایەنگیری خۆی لە حزبێک بۆ حزبێکی تر دەگۆڕی بەبیانووی کەوا ئەو لەسەرووی هەموو ئارەزوو و ڕەوتە سیاسییەکانە.

لە هەوڵدانێکی کە وەک بڵێی هاووڵاتییان و حزبەکان (چاوبەستە کێیان بکات) و ئارەزووە دیکتاتۆرییەکانی خۆی تێدا بشارێتەوە.

وە لە ئەنجامی ئەمەدا شۆڕش پاشەکشەیەکی لە هەموو بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی تۆمار کرد تەنانەت لە بواری سیاسەتی ناوەخۆیدا حکوومەتی شۆڕش نەیتوانی سوود لە یەکبوون و باوەش لێگرتنەوەی جەماوەر وەرگرت کە لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا وە هەروەها نەیتوانی ڕای گشتی کۆبکاتەوە دەربارەی ئەو کێشانەی کە گرینگییەکی نیشتمانییان هەبوو. وە هەروەها لە زۆر لە بەڵێنەکانی پێشووی خۆی سەبارەت بەکێشەی میللەتی کورد پاشگەز بۆوە، بەڵکو ئاگری شەڕی دژی گەلی کورد لە ١١/ئەیلوولی/١٩٦١دا هەڵگیرساند و، ڕووی کردە هەمان شێوازەکانی حکوومەتەکانی پادشایەتی پێشوو لە پشت بەستانی بەپیاوانی کۆنەپەرست و بەکرێگیراو بۆ ئەوەی بەکاریان بێنێت دژی گەلی کورد و نوێنەرە ڕاستەقینەکەی کە پارتی دیموکراتی کوردستانییە بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی. وە بواری بۆ لایەنە شۆفینییەکان ڕەخساند بۆ ئەوەی کە بەئارەزووی خۆیان بانگهێشتە بۆ توانەوەی نەتەوەی کورد

بکەن[٧٣]. وە ئەم بانگهێشتە بەم جۆرە کردەوانە زیانێکی زۆری بەبرایەتی کورد و عەرەب گەیاند.[٧٤]

وە لە بواری ئازادییەکاندا حکوومەت پاشگەز بووەوە لە پرنسیپی بەڕەلاکردنی ئازادییە گشتییەکان و کەسایەتییەکان وەکێشانەوەی مۆڵەتی کارکردنی ئاشکرا لە زۆر حزبە سیاسییەکان.

وە هەروەها لە بواری سیاسەتی دەرەوە عێراق لە ساڵەکانی دوایی شۆڕشدا دووچاری دوورکەوتنەوەیەکی زۆرترهات لەسەر ئاستی ولاتانی عەرەبی و نێو دەوڵەتی، ئەم دوورکەوتنەوەیە لە دوای بڕیاری عێراق لە خۆکشانەوە لە یەکێتی دەوڵەتە عەرەبییەکان[٧٥] زیاتر بوو.

وە لە بواری دارایی و ئابووریدا ولات تووشی هەلاّیسانێکی دراوی (التضخم النقدي) و گرانییەکی زۆری لە ڕادە بەدەرو بلاوبوونەوەی بێ کاری و دەست بەتاڵی بوو.[٧٦] وە زیادبوونی بێتوانایی لە تەرازووی بازرگانیدا بەشێوەیەکی ترسناک بەتایبەتی لە دوای ئەوەی کە تەرازووی بازرگانی دابەزینێکی گەورەی لە ساڵی یەکەمی شۆڕشدا تۆمارکرد.[٧٧] وە هەروەها بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ حکوومەتی شۆڕش پاشگەز بووەوە لە یاسای چاککردنەوەی کشتوکاڵی بەگەڕاندنەوەی دەرەبەگەکانی لە هەردوو شاری (عەمارە و ناسریە) لە ژێر ڕووکەشی جیاجیا وە بەناوی پابەندبوون و مافی پابەندێتی[٧٨] سەرەڕای ئەوەی کە ولات بەدەست نەبوونی پلانی ئابووری ڕێکوپێک و بەسوود دەینالاند وە لە بواری ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی لەم پاشگەزبوونەوەیە و پاشان تەسککردنەوە بەدوور نەبوون، چونکە سەربەستی بلاوکردنەوە پابەندکراو وە ئاکامی زۆر لە هەلبژاردنە پیشەییەکان بەفرت و فێلّ دەستکاری کرا بۆ بەرژەوەندی ئەو لایەنانەی کە لەسەر حکوومەت دەژمێردران[٧٩].

وە سەرەڕای ئەو هۆیانەی کە لە پێشەوەدا باسمان لێکردن، چەندەها هۆی دیکەش هەنە کە کات و ساتی باسکردنیان لێرەدا نییە، هەموویان بەتێکڕایی بوونە هۆی نوشستی شۆڕش لە هێنانەدی ئاواتەکانی جەماوەر هەر بۆیێ ئەو باوەش لێگرتنە جەماوەرییە لە دەرەوەی شۆڕش کە لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا دیاربوو گۆڕدرا بەرق لێ بوونەوەیەکی جەماوەری دژی شۆڕش کە ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبووندا بوو هەتا وای کرد ئەم حکوومەتە بەیەکجاری لە ٨/شوباتی/١٩٦٣بڕوخێت.

۲- شۆڕشی بەعسی یەکەم و کۆماری دووەم:

حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست بەهاریکاری لەگەڵ هەندێ لە ئەفسەرانی نەتەوەییدا و، لەسەرروویانەوە سەرهەنگ عەبدولسەلام محەمەد عارف بەشۆڕشێک هەستان لە دژی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم و توانییان بیرووخێنن. وە جڵەوی دەسەڵات وەرگرن لە ۸/شوباتی/ساڵی۱۹٦۳دا، وە پلەی عەبدولسەلام محەمەد عارف بۆ پایەی مشیر روکن بەرز کرایەوە و، بوو بەسەرکۆمار لە کاتێکدا ئەحمەد حەسەن بەکر بەسەرۆکی وەزیران دامەزراندرا، لەبەرئەوەی حیزبی بەعسی عەرەبی سوشیالیست هیچ شارەزاییەکی پێشووی نەبوو لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتداریتی و، لەبەرئەوەی زۆربەی زۆری سەرکردەکانی لە گەنجەکانی کەم شارەزابوون و، زۆری پێ نەچوو ناکۆکی زۆر کەوتە نێوانیان(۸۰) لەبەرئەوەی ئەم ئەزموونە تەمەنی هەندە درێژ نەبوو (کورت بوو) بەڵکو پێش ئەوەی نۆ مانگ تەواو بکات کۆتایی پێ هات:

۳- سەردەمی هەردوو برا (عەبدولسەلام و عەبدولڕەحمان محەمەد عارف) وە کۆماری سێیەم:

ئەو کاتەی کە لەپێش (۸)ی شوباتی ساڵی۱۹٦۳ ئامانجێکی هاوبەش هەبوو هەردوو لایەن کە بریتی بوون لە (عەبدولسەلام محمد عارف و ئەفسەرە نەتەوەییەکان لە لایەک و، حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لە لایەکی ترەوە خرپەکردەوە ئەویش ئامانجی خۆ ڕزگارکردن بوو لە عەبدولکەریم قاسم و دەسەڵاتدارییە تاکڕەوەکەی، بەڵام لەپاش ئەوەی ئەم مەبەستە هاوبەشییانە هاتەدی هەر دەستبەجێ دووبەرەکی زۆرکەوتە نێوان هەردوو لایانەوە لەگەڵ ڕکابەرییەکی زۆر توند لەسەر دەسەڵات. بۆ ئەم مەبەستەش عەبدولسەلام محەمەد عارف لە ۱۸/ت۱۹٦۳/۲دا شوێن و پایەی خۆی وەک سەرکۆمار بەکارهێناو پشتی بەهەندێ سەرکردە گەورەکانی ناو سوپا بەست بەهەڵکوتانە سەر دۆستەکانی پێشووی لە ناو حیزبی بەعسدا وە دووریانی خستنەوە لە دەسەڵات و بارەگاکانی حیزبی بەعسی داخست و، ئەندامەکانی دەستگیرکرد بەبیانووی ئەوەی کەوا ئەو بەعسییانەی ئەندام بوون لە ڕێکخراوی پاسەوانی نەتەوەیی هەستابوون بەپێشێلکردنی یاسا بەشێوەیەکی ترسناک و وەدەست درێژییان کرد بۆ سەر هاووڵاتییان. بەم شێوەیە مشیر عەبدولسەلام محمد عارف توانی دەسەڵات بەلای خۆیەوە بگرێ و بەتەنیا دەستی بەسەردا بگرێت وە تاکڕەوی پیادە بکات. ئەوەی شایانی باسە کە عەبدولسەلام عارف

ئارەزوویەکی گەورەی پیشان دا بەرامبەر ئەو لایەنانەی کە داوای یەکبوونی وڵاتە عەرەبییەکانی دەکرد، بەڵکو بەخۆی ئاڵای یەکبوونی بەخێرایی و بەپەلە لەگەڵ میسر و سوریادا بەرز دەکردەوە. بەڵام بەشێوەیەکی فراوان وا هەست دەکرا کە دژبەیەک بوونێکی گەورە هەبوو لە نێوان دروشم و قسەکانی وە ڕەفتاری ڕاستەقینەی لە گۆڕەپانی پراکتیکیدا، وە لەم بوارە، عەلی سالح ئەلسەعدی ئەمینداری نهێنی سەرکردایەتی هەرێمی حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لە ساڵی ١٩٦٣دا دەیگوت: «عەبدولسەلام عارف هیوا و ئاواتێکی گەورەی هەبوو وە بۆیێ لە مێژووی عێراقدا مرۆڤێکی دیکە لەو نەفام و بێ هۆشتر و بیر تەسک و ناسیاسی و ڕەفتار خەراپتر نەبووە. چونکە ئەو کەسێک بوو کە ڕۆژانە لە دژ بەیەکبوونێکی تەواو لە نێوان دروشمەکانی و ڕەفتاری دا، وە بەشێوەیەکی ڕەها هیچ جۆە بیروباوەڕێکی نەبوو؛ کەسێک بوو ئامادەبێت خیانەتی لەگەڵ برای و کوڕی خۆی و هەموو کەسێک دەکرد؛ تەنها بۆ ئەوەی بەدیارکەوێت». (٨١) فەریق ڕوکن عەلاء ئەلجەنابی دەڵێت: «عەبدولسەلام عارف نە لەوانە بوو کە نەیەکبوونی وڵاتە عەرەبییەکانی دەویست و، نەتەوەیی بوو، وە نەناسرش بوو، بەڵکو ئەو زۆر لە عەبدولکەریم قاسم خەراپتر بوو» (٨٢). سەرۆک جەمال عەبدولناسر کەسایەتی عەبدولسەلام عارفی بەکرچ و کاڵ و پێنەگەیشتوو شیکردۆتەوە (٨٣) وە حوکمڕانی عەبدولسەلام کۆتایی پێ هات بەهۆی مردنی بەکارەساتی فڕۆکە کە لە ١٢/نیسانی/١٩٦٦ ڕووی دا، عەبدولڕەحمان محەمەد عارفی برای دەسەڵاتی لە ڕۆژی دواییدا وەرگرت، وە دەتوانین بڵێین کە حوکمڕانی عەبدولڕەحمان محەمەد عارف سیمای هێمنی مامناوەندێتی پێوە دیاربوو؛ وە بەردەوام بوو هەتا لە ١٧/گەلاوێژی/١٩٦٨ ڕووخا.

### ٤- شۆڕشی بەعسی دووەم و کۆماری چوارەم:

حیزبی بەعسی سۆشیالیست لە ١٧/گەلاوێژی/١٩٦٨ هەستا بەشۆڕشی دووەم وە حوکمڕانی عەبدولڕەحمان محەمەد عارفی لەسەر دەسەڵات لادا و، وە بەخۆی دەسەڵاتی گرتە دەست.

ئەوەی شایانی باسە کە ئەم حیزبە سوودی لە ئەزموونی یەکەمی خۆی ساڵی ١٩٦٣ و هەڵەکانی ئەوکات وەرگرت، واش بەڵێنی بەخۆی دا کە ئەم هەڵانەی پێشوو کە لە ساڵی ١٩٦٣ ڕوویان دا دووبارە نەکاتەوە هەر لەم میانە گوتەیەکی بەناوبانگی بڵاو دەکردەوە کە

دەڵێ «ئەم وەچەیە بۆ ئەوە هاتووە بۆ ئەوەی بمێنێتەوە» واتا بەردەوام بوونی دەستگرتنی بەسەر دەسەڵات بەردەوام دەبێت و، وە جلەوی دەسەڵات لە دەست نادات و، بەڕاستی لەم بەڵێنەی خۆی تا ئێستایشی بەلای کەمەوە ڕاستگۆ بووە، چونکە جلەوی دەسەڵاتی هەتا ئەمڕۆ هەر لە دەستە، لەگەڵ ئەو هەموو تەنگژانەی کە ڕووبەڕووی بوونەوە، وەکو شەڕی ناوخۆی لە کوردستان و هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی کەنداو.

**پەراوێزەکانی ئاخاوتنی سێیەم:**

(١) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - السياسي الحديث- الجزء الثالث- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٥.

(٢) لە دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد- صفحات تاريخ العراق المعاصر- دراسة تحليلية منشورات مكتبة البدليسي- بغداد- ١٩٨٧ لا ١٢١ وەرگیراوە.

(٣) الدكتور كمال مظهر احمد- صفحات من تاريخ العراق المعاصر- هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٣- ١٢٦

(٤) الدكتور كمال مظهر احمد- صفحات من تاريخ العراق المعاصر- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٤

(٥) الدكتور حامد محمود عيسى- المشكلة الكردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١- مطبعة اطلس- القاهرة ١٩٩٢ ص١١٧.

(٦) الدكتور وليد محمد سعيد الاعظمي- إنتفاضة رشيد عالى الگيلاني والحرب العراقية- البريطانية ١٩٤١-
دار واسط للطباعة والنشر والتوزيع بغداد ١٩٨٧ ص٤٤.

(٧) الدكتور وليد محمد سعيد الاعظمي- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٧.

(٨) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء الخامس- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٧.
الدكتور وليد محمد سعيد الاعظمي- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٧.

(٩) الدكتور وليد محمد سعيد الاعظمي- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤٨.
عبدالرزاق الحسنى- تاريخ الوزرات العراقيه - الجزء الخامس- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٣٩.

(١٠) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء الخامس- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٣٨.

(١١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٤.

(١٢) الدكتور وليد محمد سعيد الاعظمى- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٠- ١١١- ١٢٣.

(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٨.

(١٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٩.

(١٥) له سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٣ وەرگیراوە.

(١٦) بۆ درێژەی شەڕو هۆکارەکانی شکستهێنانی بزووتنەوەی مایس- بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ل ٨٩- ١٢٣.

(١٧) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية - الجزء السابع- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٤- ٢١٧.

(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢١٤- ٢١٥. له دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد- صفحات تاريخ العراق المعاصر- دراسة تحليلية منشورات مكتبة البدليسي- بغداد- ١٩٨٧ ل ١٣٧.

(١٩) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية - الجزء السابع- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٣٠.

(٢٠) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية - الجزء السابع- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٣٠.

(٢١) الدكتور كمال مظهر احمد- صفحات من تاريخ العراق المعاصر- هەمان سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣٧.

(٢٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٨.

(٢٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٨.

(٢٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٩.

(٢٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٣.

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٤٠.

(٢٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٤٠.

(٢٨) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية - الجزء الثامن- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٢٥.

(٢٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٢٥.

(٣٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٣٥.

(٣١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٣٥.

(٣٢) عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزارات العراقية - الجزء التاسع- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٩- ٢٤٧.

(٣٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٣.

(٣٤) بۆ درێژە پێدانی بڕوانە، الدكتور جعفر عباس حميدي- التطورات والاتجاهات السياسية الداخلية في العراق ١٩٥٣- ١٩٥٨. دکتۆر نامەیەکە پێشکەش بەزانکۆی بەغدا- کراوە- چاپی یەکەم ١٩٨٠ ل ١٤٦.

(٣٥) الدكتور جعفر عباس حميدي- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٧.

عبدالرزاق الحسني- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء العاشر- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٩٦.

(٣٦) الدكتور جعفر عباس حميدي- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٣، ١٦٠، ١٦١.

(٣٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٢- ١٦٣.

(٣٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٤- ١٦٥.

(٣٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٥.

(٤٠) عبدالرزاق الحسنى- تاريخ الوزرات العراقيه - الجزء العاشر- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٣.

(٤١) الدكتور جعفر عباس حميدى- سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٩.

(٤٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٥- ١١٦.

(٤٣) ئەوانیش ئیبراهیم ئەحمەد و عومەر مستەفا و حلمی شەریف بوون.
بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: الدكتور جعفر عباس حميدي- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٣٠.

(٤٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٣٠.

(٤٥) بۆ درێژەی ئەو یاداشتانە سەیری عبدالرزاق الحسنى- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء العاشر- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٦- ١٣٦.

(٤٦) الدكتور جعفر عباس حميدي- سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٨- ١٧٩.

(٤٧) عبدالرزاق الحسنى- تاريخ الوزرات العراقية - الجزء العاشر- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٤.

(٤٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٤. الدكتور جعفر عباس حميدى- سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٣.

(*) عبدالرزاق الحسنى- تاريخ الوزرات العراقيه - الجزء العاشر- هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٦.

(٤٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٧.

(٥٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٧.

(٥١) دادگای دەرکردنی بە بەندیکردنی توندی عەلی کامل چادرچی بۆ ماوەی (٣) سێ ساڵ چاودێری کردنی عەلی محەمەد سەدیق شنشل و فائق السامرائی بۆ ماوەی ساڵێک و بەرەڵلا کردنی عەلی حسێن جەمیل و سامی باش بەدەستەبەری و بەبڕی (٥) پێنج هەزار دینار بۆ ماوەی ساڵێک.

(٥٢) الدكتور جعفر عباس حميدي- سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٠- ١٨٢.

(٥٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٥.

(٥٤) ليث عبدالحسن الزبيدي- ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق- توزيع الدار الوطنية للنشر والاعلان- - دار الحرية للطباعة بغداد ١٩٧٩ بدون رقم طبعة ص١٥.

(٥٥) بۆ ئەم مەبەستە سەیری (ل٢١- ٢٢)ی ئەم دکتۆرا نامەیە بکە (الفدرالية وإمكانية تطبيقها في العراق) ١٩٩٨

(٥٦) ليث عبدالحسن الزبيدى- سەرچاوەی پێشوو ل ١٨- ١٩.

(٥٧) هەر بۆ زانین ٨٥٪ لە دانیشتوانی گوندەکان خاوەنی بستێک زەوی کشتوکاڵی نەبوون.

(٥٨) ليث عبدالحسن الزبيدى- سەرچاوەی پێشوو ل ٣٣- ٣٤.

(٥٩) جگە لە سەرهەنگ (ناجی تالیب) نەبێت کە لە خێزانێکی خاوەن زەوی و زاری کشتوکاڵی زۆربوو؛ کەچی لەگەڵ ئەوەش لافی ئەوەی لێ نەدەدا. بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە: ليث عبدالحسن الزبيدي- سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٣.

(٦٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٨٠.

(٦١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٢١.

(٦٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١١٦- ١١٧.

(٦٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٦.

(٦٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٠- ١٩٠.

(٦٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٩- ٢٣٢.

(٦٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤٧، ٢٤٨، ٢٦٦.

(٦٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٠٠- ٣٠٥.

(٦٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣١٥- ٣٢٠.

(٦٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٨٧.

(٧٠) ماددەی سێیەم لە دەستووری کاتیساڵی ١٩٥٨.

(٧١) مسعود البارزاني- البارزاني والحركة التحررية الكردية- الكرد وثورة ١٤ تموز ١٩٥٨- ١٤ تموز ١٩٥٨- ١١ أيلول/ ١٩٦١- كردستان في ١٥/ ١٩٩٠ بدون دار النشر یان بەبێ چاپخانە و ژمارەی چاپ ل ٥٤- ٦٥.

(٧٢) ليث عبدالحسن الزبيدي- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٥١.

(٧٣) مسعود البارزاني- البارزاني والحركة التحررية الكردية- الكرد وثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٧.

(٧٤) ليث عبدالحسن الزبيدي- سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦٠.

(٧٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦٦.

(٧٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦٥.

(٧٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦٣.

(٧٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦١.

(٧٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦٦.

(٨٠) الدكتور مجيد خدوري- العراق الجمهوري- الدار المتحدة للنشر- الطبعة الاولى- ص٣٦٠

(٨١) هادي حسن عليوي- عبدالكريم قاسم الحقيقة- دار الحرية للطباعة- بغداد- ١٩٩٠ ص٥٩

(٨٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩.

(٨٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٩.

ئاخاوتنی چوارەم

## دەرهاوێشتەکانی کۆمەڵایەتی عێراقی نوێ

گەلی عێراقی هەروەکو زۆربەی زۆری گەلانی جیهان ئەویش چەندایەتی نەتەوایەتی و ئایین و تایفەگەری و زمانەوانی و ڕۆشنبیری بەخۆیەوە گرتووە، وە بەواتایەکی تر گەلی عێراق چەند تایبەتمەندێتی کۆمەڵایەتی جیاجیای تێدا هەیە، ئەمەش بەبۆچوونی ئێمە لە ئەنجامی سروشتی پێکهاتنی عێراقی نوێ و بەلکاندنی ویلایەتی مووسڵ پێوەی هاتووە هەروەکو پێشتر ڕوونمان کردەوە؛[1] ئەمە لە لایەک، وە لەبەر دێرینی شارستانێتی وڵاتی نێوان هەردوو ڕووبارەکەدا (میزوپۆتامیا) لە لایەکی دیکەوە بەدرێژایی هەزاران ساڵ لەمەوپێش چەند شارستانێتی و ئایین و نەتەوە و زمانی جیاجیا لە دوای یەکتر تێیدا هاتوونە ئەم وڵاتە و تێیدا ژیاون لەبەر هۆی بەپیتی بەرەکەتی دۆڵی ڕافیدەین و دەوڵەمەندیەکەی کە ئەم وڵاتەی کردە سەرچاوەیەک بۆ ڕاکێشانی شارستانییەتی بیزەنتی و فارسی کە هەردووکیان لە ململانێیەکی بەردەوام دابوون، هەروەها ئەم ناوچە چەندجار بۆ ماوەیەکی درێژ ڕکابەری و ململانێی فورس و تورکی بەخۆیەوە دیت بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە و دەست بەسەرداگرتنی خێروبێری.

وە لەبەر شوێنی ئەم وڵاتە کە زۆر ستراتیژی بوو وە دەکەوێتە سەر هێڵەکانی هاتوچۆی نێوان خۆرهەڵات و خۆر ئاوا بۆیە هەردەم وەکو پێویست بەکارهاتووە وەک سەرە پردێک لە لایەن داگیرکەرانی کۆنینە.[2] دەتوانین بڵێین کە بەشێکی زۆری ئەم چەندایەتییەی گەلی عێراق سیمایەک لە سیماکانی وە بەشێک لە بەشەکانی ئەو سەردەمە جیاجیایانەی کە بەسەر ئەم وڵاتەدا هاتن، دراوسێتی هاوبەشی کە لە ئەنجامی ئەم سەردەمانە هاتە کایەوە[3] بۆیێ ئێمە لەم ئاخاوتنەدا باسی چەندایەتی لە کۆمەڵگەی عێراقدا دەکەین وە لەپێشی هەموویانەوەش باسی فرە نەتەوەیی دەکەین لە پاشان باسی فرە ئایینی و تایفەگەری وە لە دوایی هەمووشیاندا باس لەوە دەکەین کە هەتا چ ڕادەیەک ئەم چەندایەتییە جیاجیایانەی سەرەوە لە ناو کۆمەڵگەی عێراقی پێکەوە ڕێک و تەبان.

### یەکەم: فرە نەتەوەیی:

عـێــراق لە چەند نەتەوەیەک پێک دێت و، نەتەوەی عــەرەب بەزۆربەی زۆری ئەم وڵاتە دەژمێردرێت، لە ناوەڕاستی عێراق و باشوور و هەندێک لە بەشەکانی باکووردا دەژین، وە دانیشـتوانی عـەرەب بەپێی ئامـاری ساڵی١٩٤٧ ڕێژەی (٧١,١ ٪)ی دانیشـتـوانن.[٤] کـەچی ژمـارەیان لە سـاڵی١٩٥٧(٥٠١٨٩٦٢) پێنـج مليـۆن و هەژدە هەزار و نۆسـەد و شـەست و دوو کـەس بوون لە کـۆی دانیـشــتـوانی عـێــراق کـە ژمــارەیان دەگــەیشــتــە (٦,٥٠٠,٠٠٠) شەش ملیۆن و پێنج سەد هەزار کەس بوون؛ ڕێژەیان (٧٧,٢ ٪) هەبوو لە دانیـشــتــوانی عــێــراقــدا.[٥] وە ژمــارەیان بەپێی ئامــاری ســاڵی ١٩٧٧ گــەیشــتــە (٩٧٠٢٨٤٩) نۆ ملیـۆن و حەفت سەدو دوو هەزار و هەشت سەد و چل و نۆ کەس بوون لە کۆی دانیشتوانی عێراق کە ئەوکات دەگەیشتنە (١١٨٦٢٦٢٠) یازدە ملیۆن و هەشت سەد و شەست و دوو هەزار و شەسەد و بیست کەس.

وە بەم جـۆرەش ڕێژەیان بەپێی ئەوە (٨١,٧٩ ٪) لە کـۆی دانیـشــتـوان بوو.[٦]، کـورد بەنەتەوەی دووەم لەم وڵاتە دەژمێـردرێت کە ڕێژەیان بەپـێی ئامـاری ١٩٤٧ (١٩,٨ ٪) لە دانیـشــتـوانی عـێـراق بوو، کـەچی ژمـارەیان لە سـاڵی (١٩٥٧)دا (١,٠٤٢,٧٧٤) یەک ملیـۆن و چل و دوو هەزار و حەفت سەد و هەفـتـا و چوار کەس بوون لە کۆی دانیـشـتـوانی عـێــراق کــە لە ســەرەوە ئامــاژەی پێ کــرا، بەم جــۆرە ڕێژەیـان بەپێی ئامــاری ســاڵی ١٩٥٧(١٦,٠٤ ٪) لە کـۆی دانیـشــتـوان بوو.[٧] کـەچی ژمـارەی دانیـشــتـوانی کـورد لە ئامـاری سـاڵی ١٩٧٧ (١٩٠٣٤٠٢) ملیـۆنەک و نۆسـەد و سێ هەزار و چوارسـەد و دوو کەس بوو لە کۆی دانیـشـتـوانی عـێـراق کە لەسەرەوەدا هاتبوو، ئابەم شێـوەیە ڕێژەیان لە ئامـاری ١٩٧٧ (١٦,٠٥ ٪) بوو.[٨] بەڵام تورکـمـانەکان بەپێی سـەرژمـێـری (١٩٤٧) ڕێژەیان (٢ ٪) بوو، لە کـاتێکدا ڕێژەیان بەپێی ئاماری ١٩٥٧ (٢,١ ٪)بوو، وە ڕێژەیان بەپێی ١٩٧٧(١,١٦ ٪)بوو، وەڕێژەی دانیـشـتوانی دیانەکـان لە کلدانی و ئاشووریەکـان و ئەرمەن ساڵی (١٩٤٧) (٣,١ ٪)بوو. وە ئەم ڕێژەیەش هەروەکو خۆی مایەوە لە ئاماری ساڵی (١٩٥٧)دا.

**دووەم: فرە ئایینی و تایفەگەری:**

گەلی عێراق بەعەرەب و کورد و هەموو کەمە نەتەوایەتییەکانی گەلێکی موسڵمانن بەشێوەیەکی گشتی جگە لە کەمینەیەکی زۆر بچووک نەبێت، بەڵام موسڵمانەکان بەسەر دوو جۆرە تایفە کە بریتین لە شیعەو سونە دابەش دەبن[9].

وەهەندێ لە لێکۆڵەرەوەکان؛ عێراق دەکەنە سێ ناوچەی ئایینی سەرەکی و، لەپێش هەموویاندا ئەو ناوچەیەیە کە دەکەوێتە باشووری بەغدای پایتەخت کە بەناوچەیەکی پڕ دانیشتوانی گەورە دەژمێردرێت و، بەجێنشینی عەرەبی شیعە بەشێوەیەکی گشتی دادەنرێت، کەچی لە نێوان ئەو دەریاچە شیعاتییە چەند دوورگەیەکی سونی بەدی دەکرێت هەندێکیان بچووکن، وە هەندێکیان گەورەتر کە لە بەسرە و ناسریەدان بەتایبەتی شاری زوبێر کە کەوتۆتە باشووری ڕۆژئاوای بەسرە؛ ئەویش شارێکی سونی تەواوە[10].

بەڵام ناوچەی ئایینی دووەم ئەو ناوچەیەیە کە پێک هاتووە لە دۆڵەکانی فورات لە باکووری بەغدا و دۆڵەکانی دیجلە لە نێوان بەغدا و مووسڵدا، ئەم ناوچەیە بەجێنشینی عەرەبە سونەکان بەشێوەیەکی گشتی دادەنرێت، هەندێک ڕووبەری شیعایەتی بچووک لە دوجێل و بەلەد و سامراء لێ دەرچێت هەروەها ناوچەی سێیەم ئایینی لە عێراقدا ئەو ناوچەیەیە کە شێوەی مانگێکی لە چیا دروست کراو پێک دەهێنێ ئەویش نیشتمانی کوردانە کە بەشێوەیەکی گشتی موسڵمانی سوننە مەزهەبن، کوردەکانی خانەقین و مەندەلی کە شیعەن وە یەزیدییەکان و شەبەکەکانی کوردی خاوەن مەزهەبی تایبەتین لێ دەرچێ، وە کوردەکان بەوە جیاوازن لە هاووڵاتیانی دیکەی عێراق لە هەردوو ناوچەی یەکەم و دووەم دانیشتوون ڕێچکەی سۆفیگەری ڕووحی پەیڕەو دەکەن. وە لێرە و لەوێ ناوچەی دووەم و سێیەم[11] وە بەدرێژایی ڕێگای پۆستەی کۆن لە نێوان بەغدا و مووسڵ چەند گردبوونەوەیەکی تورکمانی هەیە هەندێکیان شیعەن و، لە قەرەتەپە و توز خورماتوو داقوق و تازە خورماتوو تەلەعفەر و هەندێکی کەیان سونین کە لە کفری و کەرکووک و ئاڵتون کۆپری دادەنیشن[12].

وە هەرسێ ناوچەکانی ئایینی لە بەغدای پایتەخت کە شارێکی هەمەڕەنگە وە لە دیالە کە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی بەغدا دەگەنە یەک.

وە کوردە فەیلییەکان لە بەغدا دادەنیشن و، خاوەن مەزهەبی تایفەیان شیعەن. وە

پێویستە باس لەوەش بکەین کوردە لوڕیەکانیش بوونیان لە هەردوو پارێزگای (کوت و عەمارە) هەیە.

وە لە عێراقدا کەمینەیەکی دیان هەن؛ ئەوانیش لە کلدانەکان و ئاشووریەکان و نەستووریەکان و ئەرمەنییەکانن، وە بەشێوەیەکی پەرت و بڵاو لەسەرتاپای وڵات بڵاوبوونەتەوە، تەنها ئەوە نەبێت ژمارەیەکی زۆریان وە بەشێوەیەکی گردبوونەوە لە ناوچەی باکووری مووسڵ دادەنیشن[١٣]. کەمینەیەکی جوولەکان هەبوو کە ژمارەیان بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٤٧ (٢,٦٪) لە کۆی ژمارەی دانیشتوان بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٤٨ لە دوای دامەزراندنی ئیسرائیل و، داگیرکردنی فەلەستین کۆچیان کرد. وە هەروەها کەمینەیەکی (صائب)یش لە باشووری عێراق هەیە، وە بەتایبەتی لە (عیمارە)دا دەژین[١٤].

لەبەرئەوەی کە ئێمە لە بواری باسکردنی چەندایەتی ئایینی و تایفەگەری لە وڵاتەکەماندا دەدوێین وا بەباش دەزانین کە بەشێوەیەکی ورد بزانین هەتا چەند لایەنگیری ئایینی و تایفەگەری گرینگی خۆی هەیە لە لایەن ڕۆڵەکانی ئەم تایفە جیاجیایانە لە عێراقدا.

وە دەتوانین بڵێین کە لایەنگیری ئایینی لەلای ڕۆڵەکانی عەرەبی سونە مەزەب لە پلەیەکی کەمتر و بایەخدانێکی کەمتری هەیە لە لایەنگیری نیشتمان و نەتەوایەتیدا. بەڵام لەلای کوردەکان کە بەشێوەیەکی گشتی سونە مەزەبن تەنها ژمارەیەکی کەمیان نەبێت. لایەنگیری ئایینی کەمتر پێوەیان دیارە هەرچەندە زۆر پەیوەستن بەئایینی ئیسلامی وەڕێچکەکانی سۆفیگەری لە کوردستان باوە، بەڵام لایەنگیری ئایینی لە نێوان کوردەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا زۆر لاوازە و بەڕادە کەمتر لایەنگرتنی نەتەوایەتی و نیشتمانی لەلای ئەواندا، بەڵام ئێمە وا دەبینین کە لایەنگیری تایفەگەری دەگاتە چڵەپۆپەی لە لایەن برا عەرەبە شیعەکان کە لەلای ئەوان لایەنگیری مەزهەب لە ڕووی گرینگییەوە هیچ کەمتر نییە لە ئاستی لایەنگرییەکانی نیشتمانی و نەتەوەیی، ئەگەر بایەخی پتر نەبێت، وە ئەم لایەنگیرییەش خۆڕاگری و چەسپاندن و بەردەوام بوونی دەسەڵاتی مەزەبی شیعە لە وڵات نیشان دەدات لە دەست بەسەرا گرتنی مەزهەبی سونی لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانییەکاندا کە حکومڕانییان درێژەی هەبوو لە ساڵی ١٥٣٤هەتا ١٦٢٢ وە لە ١٦٣٨- ١٩١٧ هەبوو و، هەندێ کەس[١٥]. ئەم خۆڕاگرییەو

بەردەوامبوونە بۆ بوونی ئەو گۆڕە پیرۆزانەی کە لە (نەجەف و کەربەلادا) هەن، هەروەها بوونی ئەو قوتابخانە ئایینییانەی کە لە (نەجەف و حیلە)دا هەن و وە هەروەها بەردەوامبوونی پەیوەندییەکانی ئایینی و بازرگانی لە نێوان ڕۆڵەکانی شیعە لە عێراق و شیعەی ئێراندا دەگەڕێننەوە.

### سێیەم: ڕادەی گونجانی چەندایەتییە جیاجیاکان لە پێکەوە ژیان لە عێراقدا:

شتێکی سروشتییە بوونی چەند نەتەوە و ڕەگەز و ئایین و مەزەب و زمان لە وڵاتێکدا چونکێ زۆر کەم وا ڕوو دەدات کە وڵاتێک لە وڵاتانی جیهاندا ئەم چەندایەتییە بەخۆ نەگرێت، بەڵام ئەوەی کە نامۆ و نائاساییە ئەوەیە کە نەگونجان و ناتەبایی ئەم هەموو چەندایەتییانە لە بۆتەی یەک نیشتماندا، بەشێوەیەک کە لایەنگیری بۆ نیشتمان لە هەموو لایەنگیرییەکانی تر لە پێشتر و لە هەمووان بەهێزتربێت هیچ زێدەڕۆیەکی تێدانییە ئەگەر بڵێین ئەم هەموو چەندایەتییانە و تایبەتمەندییە جیاجیاکان کە لە عێراقدا هەن و نارێکن و تەواوکەری یەکتری نینە و، بەڵکو دەتوانین بڵێین دژ بەیەکترن و بەسەر یەکتری دابەش کراون. مەلیک فەیسەڵی یەکەم (شاه) لەم بارەیەوە لە نامە نهێنییە و گرینگەکەی دا کە بۆ پیاو ماقووڵان و یارمەتیدەرانی خۆی لە ١٥/ ئاداری/ ساڵی ١٩٣٢دا ناردبووی و دەڵێت: وڵاتی عێراق لەو وڵاتانەی کە لە توخمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی تیادا نییە، ئەویش یەک بوونی بیر و نەتەوە و ئایین، کەواتە لەم حاڵەتەدا هێزەکەی پەرتوبڵاوە بەسەر خۆیاندا دابەش بووە و، سەرکردە سیاسییەکانی پێویستە بن بەحکیم و بە ڕا و تەگبیر بن، لە هەمان کاتیشدا لە هەموو بوارێکدا بەهێزبن و، وە پەلکێش نەکرێن بۆ شتی کەموکورت و چرووک و یان مەبەستی کەسایەتی یان تایفەگەری یان زێدەڕۆیی و موکڕ بن لەسەر سیاسەتی داد پەروەری و هاوسەنگی بەهێزی لە هەمان کاتدا لەگەڵ گرینگیدان و ڕێز لێنانی دابونەریتی خەڵکی، وە نەکەونە ژێر کاریگەری کۆنەپەرستی و بیروڕای شۆفینی کە وەڵامدانەوەی توندی لە دوا دەبێت، هەرچەندە حکومەت لە ڕواڵەت خاوەن ئەو هێزەیە کە بتوانێ خەڵک ملکەچ بکات، بەڵام گوێ نەدان بەڕای خەڵکی هەرچەندە ئەو ڕایە بێ بایەخ بێت خەتایەکە. کە لێبووردنی بۆ نەبێت(١٦). هەروەها لە کۆتایی نامەکەی دەڵێت: «هەر لەم بوارەوە بەدڵێکی پڕ لە داخدا دەڵێم بەبیرو بۆچوونی من لە عێراقی هەتا ئێستا گەلێکی عێراقی نییە بەڵکو چەند کۆمەڵگایەکی بەتاڵن لە هەر بیرۆکەیەکی نیشتمانی وە پڕن لە دابونەریت و خەراپ و

شتی ئەفسووناوی ئایینی وە هیچ پەیوەندییەک کۆیان ناکاتەوە، ئا لەم کاتەدا پێویستمان بەگەلێکە پەروەردەی بکەین و فێری بکەین»[١٧].

ئای ئەمڕۆ چەند بەدوێنێ دەچێت!، ئەگەر بێتوو بەوردی سەیری ئەم شیکردنەوە و ڕاڤەکردنە بکەین کە دامەزرێنەری عێراقی نوێ پێشکەشی کرد، سەبارەت پێکهاتەی گەلی عێراق لە پێش زیاتر لە (٦٥) ساڵ بەراوردی بکەی لەگەڵ بارودۆخی ئەم گەلە لە ڕۆژانی ئیمڕۆدا زۆر بەداخەوە لەگەڵ هەستی بێ مرادی دەبینین کە ئەم پێکهاتەیە هیچ پێشکەوتنێکی گرینگی بەخۆیەوە نەبینیوە سەبارەت بەگونجان و تەبایی لە نێوان نەتەوە تایبەتمەندە جیاجیاکان لە یەک بۆتەی نیشتمانی فراوان، کە جێی هەموویانی تێدا ببێتەوە، بەڵکو لە ڕەشبینی و لە زیادەڕۆیی نەبێت ئەگەر پاشەکشەیەک لە بواری گونجان و تەبایی و پێکەوە ژیانی نەتەوەیی ڕووی دا وە لەجیاتی پێشکەوتنی داخوازکراو، چونکە ئێمە وا دەبینین کە فاکتەرەکانی جیابوونەوە و لەیەکتر دووربوونەوە کە ئێستا هەیە زۆر بەهێزترە لە فاکتەرەکانی پێکەوە ژیان لە لێکتر نزیک بوونەوە، وە بەواتایەکی تر لایەنگیری بۆ نیشتمان تا ئێستا نەیتوانیوە کە لایەنگیرییەکانی تر وەکو نەتەوەیی و ئایینی و مەزهەبی لە شوێنەکانی خۆی بلەقێنێ ئەمەش دەگەڕێتەوە بەپلەیەکی بنەڕەتی بۆ ئەوەی کە ئەم هەموو چەندایەتییە جیاجیایانەی کە لە عێراق هەن نەیانتوانیبوو تایبەتمەندییەکانی خۆیان پەیڕەو و جێبەجێ بکەن هەر بۆیێ لایەنگیری نەتەوەیی و ئایینی و ئەو چەندایەتییانە بەپلەیەکی بەرز لە گرینگی ماوە بۆ پاراستنی تایبەتمەندییەکانی خۆیان و پارێزگارییان لە سڕینەوە و بزربوون و نەمان. هۆی سەرەکی ئەمەش بەبیروبۆچوونی ئێمە دەگەڕێتەوە، بۆ هەبوونی نارێکییەک لە ڕێکخستنی دەستووری وڵات و، شێوەی زاڵبوونی ناوەند لە دەسەڵاتدا کە بووە هۆی زاڵبوونی نەتەوەیەک بەتەنها مەزەبێکی دیاریکراو لەسەر هەموو نەتەوە و ئایین و مەزەبەکانی تر، کە ئەمەش هەست بەغەدر لێکردن و چەوساندنەوەی لە لایەک ئەم هەموو کۆمەڵانە دروست کرد وە پاڵی پێوەنان بۆ ئەوەی هەوڵ بدەن بۆ سەلماندنی بوونی وە هەروەها هاتنەدی و جێبەجێکردنی هەموو ئاواتەکان و تایبەتمەندییەکان بەڕێگەی تری جیا جیا. هەروەها ئەم کۆمەڵانەی لە نەتەوە و ئایینیانە لایەنگیری نەتەوایەتی و ئایینی (مەزەبی) خۆیان بەهەمان پلەو هەمان هێز هێشتەوە بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان بپارێزن دژی هەوڵدانی تواندنەوەیان و تەنانەت بەعەرەب کردنیشیان، وە ئەم ڕا پەڕینانە و شۆڕشەکانی کورد لە عێراقدا و، بێزاری برا شیعەکانمان لە باشووردا و، سەرهەڵدانیان هەر جارێک دەرفەت بوویێت بەڵگەیەکی

ئاشکرایە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە، وە ئەمەیش بەڕاشکاوی بەدیار کەوت لەو ڕاپەڕینەی کە لە هەردوو ناوچەی باشوور و کوردستانی عێراقدا لە ئاداری/١٩٩١/دا ڕووی دا لە دوای ئەو کارەساتە گەورەیەی بەسەر عێراقدا هات لە پاش جەنگی کەنداوی دووەم.

ئەوەی کە لەسەر شانی حکوومەت و ئەوانەی کاربەدەستن ئەوەیە کە هەوڵی پتەوکردنی لایەنگیری نیشتمانی وە بەهێزکردنی پەیوەندی خۆشەویستی نیشتمان لە لایەن هەموو نەتەوە و ئایین و مەزەبەکان، ئەمەش بەوە نایەتە دی کە نەتەوەکان و مەزەبەکان بچەوسێننەوە مافەکانیان بخورێت بەڵکو بەوە جێبەجێ دەبێت کە مافی ئەم کۆمەڵانە بدرێت و هان بدرێن بۆ پێشخستن و پەرە پێدانی تایبەتمەندێتی خۆیان و داب و نەریتیان و زمانی تایبەتی خۆیان بەکاربێنن.

وە لەم بارەیەوەش لایەنێک لە گوتەکانی جێگری نوێنەری بەرزی بەریتانی لە بەغدا لە ٢٥/ک٢/١٩٢٦ دەخەینە ڕوو هەرچەندە بڕوامان وایە کە مەبەستی لەو وڵاتانە تەنها چاو بەستانەوە و مژینی ڕق لێبوونەوەی کوردەکان بوو لەو کاتەدا بووە کە دەڵێت ئامانجی حکوومەت دەبێ ئاوابێت کە هەموو توخمەکانی کە وڵات پێک دەهێنن هان بدات بۆ ئەوەی ببنە ڕۆڵی باش و بەوەفای نیشتمان لە ناو جەستەی دەوڵەتی عێراقی وە حکوومەتیش ئەو کات بەباشترین شێوە لە ڕێگای هاندانی ئەو توخمانە نەک چەوسانەوەیان بۆ ئەوەی شانازی بەنەتەوە و ئایینی خۆیان بکەن. کورد عەرەب نییە هەروەکو چۆن ئیسکوجی ئینگلیز نییە، وە ئێوە دەتوانن بیکەنە عێراقییەکی نیشتمان پەروەر بەهاندانی بۆ ئەوەی ببێتە کوردێکی ڕاستەقینە نەک بەزۆر لێکردن کە فێری زمانی عەرەبی بن یان داب و نەریتی عارەب وەربگرن، وە هەموو هەلێکی بۆ بڕەخسێت لەم بوارە نەک بەوەی زۆری لێ بکرێت بۆ ئەوەی بەزمانی عەرەبی قسە بکات یان دابونەریتی عەرەبی هەڵبگرێت.[١٨] شا فەیسەڵی یەکەم لە هەمان مێژوو و هەمان بۆنەدا دەڵێت: «ئێوە زۆر چاک دەزانن لە هەرە فاکتەرە گەورەکان زیاتر کە پاڵی بەعەرەب وەنا بۆ دژایەتی تورکەکان، ئەوەبوو کە دیتیان تورکەکان ئارەزوو دەکەن عەرەبەکان بکەن بەتورک، وە گومانم لەوە دانییە کە ئەم بیرۆکەیە بووە یەک لە فاکترە گەورەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. لەو بڕوایە دام کە گەورەترین ئەرکەکانی هاووڵاتی عەرەب ئەوەیە کە برا کوردەکەی هان بدات بۆ شانازیکردن بەکوردایەتی خۆی و، هاتنە ژێر سایەی ئاڵای عێراقی کە سمبوولی هاوبەشی هەمووانە و سەرچاوەی خۆشیانە»[١٩] ئێمە لە ڕاستیدا بەدوور ناکەوینەوە ئەگەر بڵێین مامەڵەکردن و هەڵسوکەوت لەگەڵ هەموو نەتەوە

و ئايین و تایفەکان بەیەکسانی و ئینسافەوە، وە دانی مافە ڕەواکانی هەمووان بەبێ جیاوازی بەپێی پرنسیپی هەلڕەخساندن بۆ هەمووان وەکو یەکتری کە پەیماننامەکانی جیهانی مافی مرۆڤ و دەستوورە نوێیەکانی وڵاتان هاتووە دەبێتە هۆی پتەوبوون بەهێزبوونی یەکێتی نیشتمانی وە هەروەها ڕادەی لایەنگیری نیشتمانی وە خۆ بەختکردن لە پێناوی نیشتماندا، ئەو کاتە هەموو شتێک سانا دەبێت لە پێناو پاراستنی سەربەرزی و سەروەری وڵاتدا.

دەتوانین بڵێین بەدەست هێنانی تەبایی لە نێوان ئەو چەندایەتییە جیاجیایانە پێویست بەلەخۆبووردنی بەرامبەر دەکات کە ئەم چەندایەتیانە بکەن بۆ یەکتری و، هەروەها وا پێویست دەکات ڕێز لە یەکتر بگرن و، هەستی یەکتریش بریندار نەکەن، وە بەواتایەکی تر هیچ لایەنێک نابێت دەستدرێژی بکاتە سەر مافی لایەنەکانی تر، یان هەستیان بریندار بکات یان دەست لە تایبەتمەندێتییەکانیان وەربدات. وە دەتوانین بڵێین کە ئەوەی لە بەیاننامەی کۆنگرەی نەتەوەیی یازدەمینی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست سەبارەت بە کەمە نەتەوایەتییەکان لە عێراقدا بکات، چونکە دەستدرێژی دەکاتە سەر پیرۆزییەکانی نەتەوەیی کورد و تایبەتمەندییەکانی کە دەڵێ: «بەڵام سەبارەت بەئەو نەتەوانەی کە خاوەن ڕێژەی قورسایی (ڕێژەی ژمارەی دانیشتوانن) لە چوارچێوەی نیشتمانی عەرەبیدا دەژین و، زمانی تایبەتی و سیمای تایبەتمەندێتی خۆیان هەیە و، کە جیایان دەکاتەوە لە زمان و سیماکانی نەتەوەی عەرەب، وەک: نەتەوەی کورد» ناچارین دەبێ ئەم تایبەتمەندییە نەتەوەییە خۆجێیەتییە پەسەند بکەین و وە چارەسەری هەموو دژ بەیەک بوونێک لە نێوان ئەم تایبەتمەندییانە و بزووتنەوەی نەتەوەی عەرەب بکەین. چونکە ئەم نەتەوانە زمان و سیمای تایبەتی خۆیان هەیە کە جیاوازە لە زمان و نەتەوەی عەرەب، وە لە هەمان کاتدا بەهەڵەدا دەچین ئەگەر بڵێین ئەم نەتەوانە لە نەتەوەی عەرەب جیاوازن، بەهەمان ڕادەی کە نەتەوەی فارس و هیند و نەتەوەکانی تر لێی جیاوازن. چونکە ئەو نەتەوانە کە خاوەن زمان و سیمای جیاوازن لە زمان و سیمای عەرەبی وە لە نیشتمانی عەرەب بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دەژین وەکو نەتەوەی کورد کە بەنەتەوەی عەرەب پەیوەست بوون بەپەیوەندی ڕەگ داکوتراو لە نێوانیان دایە چونکە لە بنەڕەتدا وە ئەوان لە کاتی پەیدابوونیانەوە و، بەدرێژایی ئەم ماوەیە لەم خاکەدا دەژین کە لە مێژووەوە ناسراوە بەنشتمانی عەرەبی، سەرەڕای جیاوازی ناوەکانی لە نێوان بەشەکانی داو وە هەروەها جیاوازی ناوی ئەو دەوڵەتانەی کە لەسەر ئەو نیشتمانە دروست بوونە، وە ئەمەیش مەسەلەیەکی زۆر گرینگە،

سەرەڕای جیاوازی ناوەکانی لە نێوان بەشەکانیدا و وە هەروەها جیاوازی ناوی ئەو دەوڵەتانەی کە لەسەر ئەو نیشتمانە دروست بوونە، وە ئەمەش مەسەلەیەکی زۆرگرینگە، چونکە ئەو خاکەی کە ئەو نەتەوانە لەسەری دەژین بەشێک بووە لە دەوڵەتە عەرەبییەکان کە بەهەزاران ساڵ لەمەوپێش پەیدابووینەوە.

کە دواییەکەی دەوڵەتی گەورەی عەباسی بوو، ئەو زەوییەش- لە هەمان کات- نیشتیمانی ئەو نەتەوانە بوو، لەسەر ئەم بنچینەیەش ناسنامەی عەرەبی خاکەکە کە ئەو نەتەوانە لەسەری دەژیان لە ڕێگای ئیمپریالیزم و زەبروزەنگ نەهاتووە. بەڵکو لە ئاکامی ڕاستەقینەی مێژوویی بەدرێژایی ساڵ هاتووە. دەربارەی ئەم بابەتە هیچ ناخۆشی و جیاوازی و کێشە نەبووە[٢٠]. ئا بەم جۆرە دەبینین کە ئەم بەیاننامەیە ناسنامەی کوردی لە کوردستان دەستێنێت و، بەزەوییەکی عەرەبی دادەنێت بەبەڵگەی ئەوە کە کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەتە ئیسلامییە لە کاتێک لە کاتەکاندا!! دەتوانین بڵێین ئەم ڕایە ئاکامی خراپ و ترسناکی لێ دەکەوێتەوە، وە ئەگەر ئەم لۆژیکەمان (منطق)ەمان برد دەبێ وا دابنێین کە زەوی فارسی زەوییەکی عەرەبییە چونکە لە زۆر لە کاتەکاندا لە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی ئیسلامی بووە؛ چ لە سەرەتای ئیسلام یان لە سەردەمی ئەمەوییەکان یاخود لەسەردەمی عەباسییەکاندا. بەهەمان لۆژیک زەوی نیوەدوورگەی عەرەبی بەزەوی تورکی دابنرێت چونکە چەندان سەدە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بووە، ئەم لۆژیکە ڕاست نییە و زوڵمێکی گەورە لە مافی نەتەوەی کورد دەکات، چونکە دەیەوێت بێ بەشی بکات لە گەورەترین پیرۆزییەکانی کە خاکی کوردستانە؛ خاکی باوک و باپیرانییەتی کە لە هەزاران ساڵ لەسەری دەژیت. کوردستان وەکو زۆر لە دەوڵەتان لە ژێر دەستی ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەتی ئیسلامی بووە پێش ئەوەی بنەمای نەتەوایەتی و دەوڵەتی نەتەوەیی بێتە کایەوە؛ ئەویش لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا؛ وە ئەمەش بەهیچ جۆرێک نابێت کوردستان بەزەوییەکی عەرەبی دابنرێت چونکە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی دابووە لە سەرەتای ئیسلام و دەوڵەتی ئەمەویی و عەباسی.

هەروەها زەوی تورکیش نییە لەبەر ئەوەی لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی بووە لە هەندێ کاتدا. تا ئەو ڕێکەوتنە ڕووبدات لە نێوان فرە نەتەوەیی نابێ یەکێک ڕەت بکەیتەوە بۆ بەرژەوەندی ئەوەکەی دیکە وەکو لە بەیاننامەکەی کە لەوەوپێش باسمان لێوەکرد بەدیاردەکەوێت، بەڵکو بەپێچەوانە ئەم گونجانە لە ڕێگە ڕەخساندن بۆ فرە نەتەوەییەکان بۆ شانازی کردن بەتایبەتمەندییان دێت.

بەبڕوای ئێمە ئەوەی لە بەیاننامەکەدا هاتووە ڕای زۆرینەی چینی ڕۆشەنبیری عەرەبی ناگرێتەوە بۆ دووپاتکردنەوەی ئەمەش بیروڕای چەندان ڕۆشەنبیری عەرەب دەخەینە ڕوو؛ عەبدولڕەحمان بەزاز لە بواری مافدان بەکورد دەڵێت: «لە کاتێکدا کە هەقی عەرەب و تورک و ئێرانی- کە دراوسێی کوردن و کوردەکانیش نیشتەجێی ئەو سێ وڵاتەن- هەست بکەن بەنەتەوایەتی خۆیان دروشمیان بەرزبکەنەوەو هەوڵ بدەن بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان، بێ ئینسافییە ئەگەر ئەم مافە نەدرێتە کورد یاخود لێیان ئینکاری بکەن» (٢١)

هەروەها دکتۆر شاکر خەسباک هەمان قسە دەکات: «پێویستە دووپاتی بکەینەوە لەسەر پێنەدانی دووبارەکردنەوەی هەڵەکانی پێشوو. ئەمەش دەبێ ڕاستەقینە مێژووییەکە لەبەرچاو بگرین کە ئەوەیە کورد کەمینە نەتەوایەتی ڕەگەزپەرستی نییە کە هاتنە ناو عێراق بەڵکو خۆیان دانیشتوانی ڕەسەنی ئەم ناوچەیەن هەر لە هەزارانساڵی پێش ئێستاوە، مافیان لە عێراق یەکسانە بەمافی عەرەبەکان» (٢٢).

هەروەها دکتۆر جەمال ئەلئەتاسی لە پێشەکی پەرتووکی ئەلمقەدەم منذر الموسلی بەناونیشانی کورد و عەرەب «ئەگەر لێرە من جەخت بکەم لەسەر هۆشیاری نەتەوەی عەرەبی کە پێشتر بووە و بنەماکانی کۆنتر بووە لە کات و شوێن و قۆناغەکانی پێشەوەچوونی تەواوترە لە ئابووری و ڕامیاری و ڕۆشنبیریدا ئەمەش نابێتە هۆی کەمکردنەوەی مافی نەتەوایەتی کورد، لەوانەیش مافی چارەی خۆنووسی و مافی ژیانی ئازادی و خۆشبەختی لەسەر زەوی خۆی کە ئەوە چەندان ساڵە لەسەری دەژیت وە مافی بوونی قەوارە و نیشتمانی خۆیەتی» (٢٣)

وە مقدم منذر الموصلی لە هەمان ئاراستە باس دەکات و دەڵێت: «کورد نەتەوەیەکی تەواوە و نەتەوەیەکە تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی و داب و نەریتی تایبەتی خۆی هەیە و ژیانێکی تایبەتی نیمچە یەکگرتوو لە نیشتیمانێکی یەکگرتوویدا هەیە؛ سەرەڕای دابەشکردنی ڕامیاری (سیاسی) کە پێیدا تێپەڕبوە» . (٢٤)

## پەراوێزەکانی ئاخاوتنی چوارەم

(١) بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە لا٧- ١٨ لەم دکتۆرا نامەیە «الفدرالية وامكانية تطبيقها في العراق» ١٩٩٨

(٢) الدكتور الحسن الچلبي- العراق والفدرالية- مقالة منشورة في جريدة الحياة اللندنية ايلول ١٩٩٥- و مطبوعة على الآلة الكاتبة ص١٢.

(٣) الدكتور الحسن الچلبي- العراق والفدرالية- سەرچاوەی پێشوو ل ١٢.

(٤) بۆ ژمارەی نەتەوەکان و تایفە جیاجیاکانی دانیشتوانی کە لەسەر ژمێری ١٩٤٧دا هاتووە- بڕوانە پەرتووکی حنابطاطو- الطبقات الاجتماعية والحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام الجمهورية- الكتاب الاول- عەفیف ئەلرەزاز- مؤسسة الأبحاث العربية. بيروت الطبعة العربية الاولى ١٩٩٠ ص٦٠.

(٥) عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی بەهەڵە ڕێژەی دانیشتوانی عەرەبی بە لە ٧٨٪ بردووە. بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە- عبدالرزاق الحسني- العراق قديماً وحديثا- سەرچاوەی پێشوو لا٣٦. وەهەروەها ليث عبدالحسن الزبيدى تووشی هەمان هەڵە بووە ئەوکاتەی کە باسی ڕێژەیان دەکات لە ساڵی ١٩٥٧دەکات کە (٨٠٪) بووە.

بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە- ليث عبدالحسن الزبيدي- سەرچاوەی پێشوو ص٢٩.

(٦) فەیسەڵ دەباغ. کورد و کەمە نەتەوایەتییەکانی تر لەسەر ژمێری ساڵی (١٩٩٧)دا بەشی یەکەم ل ٤.

(٧) عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی دەڵێت: ڕێژەیان لە ساڵی ١٩٥٧ گەیشتۆتە (١٧٪). بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە- عبدالرزاق الحسني- العراق قديماً وحديثا- سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦.

(٨) فەیسەڵ دەباغ- سەرچاوەی پێشوو ل ٤.

(٩) حنا بطاطو- سەرچاوەی پێشوو ل ٥٧.

(١٠)حنا بطاطو- سەرچاوەی پێشوو ل ٥٧.

(١١) مامۆستا حنا بطاطو دەڵێت: کۆمەڵەی تورکمانی لە نێوانی ناوچەی دووەم و سێیەمدا هەیە؛ بەڵام ئەمە پێچەوانەی ڕاستییە چونکە کەرکووک و کفری و دوزخورماتوو داقوق و تازە خورماتوو ئاڵتون کۆپری دەکەوێتە نێوانی هەرێمی کوردستانی عێراق. بڕوانە حنا بطاطو- سەرچاوەی پێشوو ل ٥٧- ٥٨

(١٢) لە کەرکووک یەک گەڕەک هەیە بۆ تورکمانی شیعە ئەویش گەڕەکی (تسعين)ە.

(١٣) الدكتور فاضل حسين- سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٢.

(١٤) الدكتور وليد محمد سعيد الأعظمي- المرجع السابق ص٢٦.

(١٥)حنا بطاطو- سەرچاوەی پێشوو ل ٥٨- ٦٠

(١٦) له عبدالرزاق الحسني- تاريخ العراق السياسي الحديث- الجزء الاول- سەرچاوەی پێشوو ص٧- ٨ وەرگیراوە.

(١٧) له سەرچاوەی پێشوو ل ٩- ١٠ وەرگیراوە.

(١٨) له عبدالرزاق الحسني- التاريخ الوزارات العراقية- الجزء الثاني سەرچاوەی پێشوو ل ٥٣- ٥٤ وەرگیراوە.

(١٩) له سەرچاوەی پێشوو ل ٥٥ وەرگیراوە.

(٢٠) مسألة الاقليات القومية في الوطن العربى- من مقررات المؤتمر القومي الحادي عشر لحزب البعث العربي الاشتراكي- مطابع دار الثورة- بغداد- ١٩٧٩.

(٢١) عبدالرحمن البزاز- العراق من الاحتلال حتى الأستقلال- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٨٦

(٢٢) الدكتور شاكر خصباك- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو ل ٨٦.

(٢٣) المقدم منذر الموصلي- عرب و أكراد- رؤية عربيه للقضية الكردية- دار الغصون- بيروت- ط١- ١٩٨٦ ص١٨

(٢٤) سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٠.

## بەشــی دووەم

# مەسەلەی کورد لە عێراق

بەو پێیــەی مــەبەسـتی بابەتی ئەو تێـزە بەشـێـوەیەکی بنەڕەتی دۆزینەوەی شـێـوازێـکی دەستووریی لەبارو گونجاوە لە پێناوی چارەسەرکردنی دۆزی کورد لە عێراق، بۆیە پێویستە باس لە زۆربەی لایەن و تەوەرەکانی ئەو کێشەیە بکرێ لەوانە، وەک بنەچەی گەلی کورد و شوێنی نیشـتـەجێبوون و زمـان و دیمەنێکی پێـویست و گـونجاویش دەربارەی کوردستـانی عـێراق و هاوولاتیـانی بخرێتە ڕوو، وێڕای ئاماژەکردن بەو نائومـێدییەی کە لە ئەنجامی پاشگەزبوونەوە لە پەیماننامـەی سیڤەر دووچاری گـەلی کورد بووەوە لەگـەڵ ئەو ڕاپەڕین و شـۆڕشانەی کـە لە پێناوی دەسـتـەبەرکـردنی مـافـەکـانیـان چ لە ژێر سـایەی داگـیرکـاری و ئینتیدابی بەریتانی و چ لە دوای سەربەخۆبوونی عێراق بەرپایان کرد.

بۆ خستنەڕووی وێنەیەکی گونجاویش سەبارەت بەو بابەتە، دەبێ تیشک بخرێتە سەر کـرۆکی ئەو داخـوازییـانـەی بوونەتە هۆکـاری بەرپابوونی ئەو شـۆڕش و ڕاپەڕینانـەی گـەلی کورد لە ڕێگەیانەوە ویستوویەتی دەستەبەریان بکات و هەڵوێستی حکوومەتە یەک لە دوا یەکەکان بەرامبەر بەو داخوازییانە بخەینە ڕوو. بۆیە ئەو فەسڵە دەکەینە پێنج بەش، بەشی یەکەم سـەبارەت بەئاخاوتن دەربارەی بنەچەی گەلی کـورد و شـوێنی نیـشـتـەجێبوونی، لە بەشی دووەمـیـشـدا دەپرژێینە سـەر بێ ئومـێـدی و ڕاپەڕینەکـانی گـەلی کـورد لە سـایەی داگـیـرکـاری و ئینتـیـدابی بەریتـانیـدا، لە بەشی سـێـیـەمـیـشـدا گـفـتـوگـۆ دەربارەی مـەینەتییـەکـانی گـەلی کـورد و شـۆڕشـەکـانی دەکـەین لە دوای سـەربەخۆبوونی عـێـراق، لە بەشی چوارەمــیــشــدا ئەو داخــوازییــانە دەخــەینە ڕوو کــە گــەلی کــورد لە پێناوی دەسـتـەبەرکـردنیـان تێکۆشـاوە، دوایین بەشـیش بۆ هەڵوەسـتـەکـردن دەربارەی چۆنیـەتی مـامـەڵەکردنی حکوومـەتە عـێراقیـیـە یەک لە دوایەکـان لەگـەڵ ئەو داواکارییـانە تەرخـان دەکەین.

ئاخافتنی یەکەم

# بنەچەی گەلی کورد و شوێنی نیشتەجێبوونی

لەبەرئەوەی بابەتی ئەو لێکۆڵینەوەیە پەیوەندی لێکۆڵینەوەی مەسەلەی کورد لە عێراق و هەوڵی دۆزینەوەی چەند ڕێگە چارەیەکی دەستوورییەوە هەیە، بۆیە دەبێ شتێک دەربارەی بنەچەی گەلی کورد و شوێنی نیشتەجێبوونیان بەیان بکەین، ئەو ناوچەیەی کە هەزاران ساڵ بەر لەزایین تا ڕۆژی ئەمڕۆمان کورد تیایدا دەژین ئەویش کوردستانە، مەسەلەکە ئەوەش دەخوازێ بەکورتی ئاماژە بەزمان و کلتووری کورد بکەین، لەو بڕگانەی خوارەوەشدا ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکەین:

## یەکەم: بنەچەی گەلی کورد

لە ڕووی مێژووی سەقامگیری و بوونیان لەو ناوچەیەدا، کورد لە نێوان دراوسێکانیدا تازەترین میللەت نییە، بەڵام درێغیکردن لە لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد لە لایەک و نا بابەتی و نەبوونی بێ لایەنیی هەندێک نووسەر هۆکارێک بووە بۆ خولقاندنی جۆرە نادیاریی و شاراوەییەک سەبارەت بەبنەچەو پێشکەوتنی مێژوویی ئەو گەلە.

لەو بارەوە دکتۆر عەبدوڕەحمان قاسملو دەڵێت:

بنەچەی کورد بۆ بەرچاوترین میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە، ئەو میللەتانەی کە بێشکەی شارستانیەتی کۆنن، تا ئێستاش وەکو پێویست لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد نەکراوە، هەر ئەمەش بووەتە مایەی ئەوەی کە چەندین بیروبۆچوون سەبارەت بەبنەچەی کورد و پێشکەوتنی مێژووییان سەرهەڵبدەن، تەنانەت هەندێک مێژوونووس بەئەنقەست و بەهەڵە هەوڵی شیکردنەوەی ڕاستییە مێژووییەکان دەدەن، مەبەستیشیان گەیشتنە بەدەرئەنجامە بێ بنەماکان و هەوڵێکیشە بۆ خستنە ڕووی ئەوەی کە بنەچەی کورد سامی یان تورکییە، هەندێکی دیکەش نزیکیی نێوان زمانی فارسی و کوردی دەکەن بەبیانوویەک بۆ ئەوەی بڵێین: کورد ئێرانین (واتە فورس)، ئەوانە تەنانەت دان بەوەشدا نانێن کە گەلی کورد خاوەنی بوونێکی سەربەخۆی خۆیەتی، بەمەش پێشکەوتنی مێژوویی دەشێوێنن.[1] سەرەتا هەندێک لەو خورافاتانە دەخەینە ڕوو کە سەبارەت بەگەلی کورد وتراون: لە ساڵی ١٥٩٦ ئەمیر شەرەفخانی بەدلیسی لە شەرەفنامەدا دەگێڕێتەوە و

دەڵێ: لە دێر زەمانەوە پادشایەکی ئێرانی بەناوی (زوهاک) یان (ضحاک) هەبووە و دووچاری نەخۆشییەکی سەیر بووە، لە بەرامبەریشدا ئیبلیس دەرمانێکی بۆ داناوە بریتی بووە لە مێشکی دوو گەنجی ڕۆژانە ئامادەکراو، لەو پێناوەشدا پادشای ناوبراو فەرمانی داوە هەمــوو ڕۆژێک دوو لاوی وڵات بکوژرێن، بەڵام بکوژی (جەلاد) ئەو لاوانە وەکو سۆزدارییەک ڕۆژانە تەنها یەکێکی لەو دوو گەنجە کوشتووە و ئەوەی تری ئازاد کردووە و لەجیاتی ئەوە مێشکی بەرخێکی ئامادە کردووە، بەمەش لاوە دەربازبووەکە لە کوشتن ڕزگاری دەبوو و پەنای دەبردە بەر چیاکان، بەم جۆرە ژمارەی لاوانی هەڵاتوو لە دڕندایەتی پادشا ڕووی لە زیادبوون کرد و میللەتێکیان لێ دروست بووە و لە چیاکان گیرساوەتەوە، ئەو میللەتەش گەلی کورد بووە[٢].

ئەفسانەیەکی دیکەی ئێرانییش هەیە دەڵێت: کورد ڕۆڵەی جنۆکە و ئەو ئافرەتە کارەکەرانەن کە سلێمانی حەکیم لە ڕۆژئاوا کڕیونی، بەڵام ئیبلیسەکان ڕێگەیان پێ گرتوون و کردوویانن بەخێزانی خۆیان و لە ئەنجامیشدا ژمارەیان زۆر بووە و گەلی کوردیان پێکهێناوە[٣].

هەندێک لەو خورافاتانەش پێیان وایە کە کورد ڕۆڵەی سامی کوڕی نوحن[٤].

ئەلمەسعوودیی گەڕۆکیش وای بۆ دەچێت کە کورد عەرەبن و بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ ڕەبیعەی کوڕی نزار یان بۆ موزری کوڕی نزار کە هۆزێک بووە لە ڕەبیعە (لە ناوچەی مووسڵ) یان لە موزر (ناوچەی ڕقە ) ژیاوە، ناوبراو باس لەوەش دەکات کە لە دوای بەرپابوونی کێشەیەک لە نێوانیاندا، کورد لە هۆزەکەیان جیابوونەتەوە و ڕوویان کردۆتە چیاکان و تێکەڵاوی چەند توخم و ڕەگەزێکی دیکە بوون[٥].

دەکرێ بڵێین ئەو لێکۆڵەرە پایەگرانە بەئاسانی و بەبێ هیچ ماندووبوونێک ناڕاستیی ئەو جۆرە وتە و ئەفسانانەی بۆ دەردەکەوێ و خستوونیەتە خزمەتی شیکردنەوە و لێکدانەوەی حەقیقەتی بنەچەی گەلی کورد، ئەگینا چۆن بیر لەمە دەکرێتەوە کە گەل یانی میللەتێکی دیار و خاوەن زمان و شارستانیەتی جیاواز لە زمان و شارستانیەتی میللەتانی دیکە دروست بووبێ. لە میانەی ئەو ئەفسانەو خورافاتانەشدا زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین ڕەگ و ڕیشەی گەلی بەناخی مێژوودا بڵاوەی کردووە و خورافات و ئەفسانەی لەو جۆرەش توانای شیکردنەوەی بنەچەی ئەو گەلەیان نییە. بۆیە سەبارەت بەبنەچەی کورد ژمارەیەک تیۆری زانستی جۆراوجۆر دەرکەوتوون، لێرەدا دەیانخەینە ڕوو:

**١ – ئەو تیۆرانەی دەڵێن کورد لە گەلانی دیکە وەدواکەوتوون:**

مینۆرسکی وای بۆ دەچێت کە کورد لە بەختانییەکانەوە وەدواکەوتوون، هەروەها دەڵێت: بەپێی هیرۆدۆتی مێژوونووسی ئەغریقی، ئەو بەختانییانە لەگەڵ ئەرمەنەکان نەوەی سێزدەیان لە ئیمپراتۆریەتی فارسی پێکهێناوە[٦]، بۆیە ئەو زانایە پێی وایە کە کورد دەگەڕێنەوە سەر بنەچەی ئارییەکان بەلاّم لەگەڵ چەند ڕەگەزێکی دیکە تێکەلاّو بوون، لەو ڕووەوە دەڵێت: ئەگەر بزانین شەپۆلی یەکەمی کۆچکردنی ئارییەکان لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی پێش زایین ڕوویداوە، ئەوکاتە دەکرێ باوەڕ بکەین بەڵکو بێ گومان دەبین لەوەی کە لەو ماوەیەدا میدییەکان لەگەڵ هاوپەیمانانیاندا لە ساڵی ٦٠٧ (پ.ز) ئاشووریان لە ناوبردووە و لە ئەنجامیشدا ژمارەیەکی زۆری کورد ڕوویان کردۆتە ڕۆژئاوا.[٧] مینۆرسکی لەو تیۆرەیدا زمان دەکاتە بەڵگەیەکی سەرەکی و جەختیشی لەسەر دەکاتەوە و دەڵێت «ئێمە دەزانین کە کورد نەوەک تەنیا لە ڕووی زمانەوە ئارین بەڵکو زمانەکەیان دەچێتەوە سەر خانەوادەی زمانە ئێرانییەکان، بەپێی ئەم بنەمایەش پێم وایە نیشتمان و (هەروەها زمانیشیان) لە ڕۆژهەلاّتەوەیە[٨]»

بەگوێرەی لێکدانەوەی مینۆرسکی و لەبەرئەوەی زمانی کوردی لە گرووپی زمانە ئێرانییەکانە، بەوپێیەش کە زمان ئاماژەیەکی یەکلاکەرەوەیە سەبارەت بەبنەچەی قسەکەران، بۆیە بەدیدی ئەو زانایە بنەچەی کورد ئاری و ئێرانییە و ئەوان لە دەریاچەی (ورمێ) تا بۆتان بلاّوەیان کردووە پاشان لە سەدەی چوارەمی پێش زاییندا ئیمارەتی مەکهەرتی کوردییان دامەزراندووە[٩]. لە نێوان ئەو بۆچوونانەشدا کە لە لێکدانەوەی مینۆرسکییەوە نزیکن، بۆچوونی هەریەکە لە نۆلدکە و هارتمان و ویسباخ- ن، ئەوان وای بۆ دەچن کە کورد لە ولاّتی فارسەوە هاتوون و لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون[١٠].

بەپێی ئەو تیۆرەش کورد لە کیرتییەکانن و وشەی کیرتیش پەرەی سەندووە و بۆتە کاردا پاشان کاردۆخی کە بۆ یەکەم جار زەینەفونی سەرکردەی یۆنانی باسی کردووە، بەو پێیەش کاردۆخییەکان کە بەگوێرەی ئەو تیۆرە باپیرە گەورەی کوردن، بەبنەچە هیندی- ئارین، بۆیە دەبێ کوردیش سەر بەهەمان ڕەگەزبن[١١].

تیۆرێکی لەو جۆرەش تەنیا پەیوەست نییە بەبەڵگە زمانەوانییەکان بەڵکو پشت بەو وێکچوونەش دەبەستێ کە لە دابونەریت و ناوچەی نیشتەجێبوونی نێوان کرتییەکان و کاردۆخییەکاندا بەدی دەکرێ، جگە لەمەش نووسەرە کۆنەکان باسیان لەوە کردووە کە

کیرتییەکان لە ئێران لە نزیک چیاکانی زاگرۆس، (لەو ناوچەیەی کە بەمیدیا ناسراوە) ژیاون، پاشانیش ناوی وڵاتی فارسی[١٢] لێ نراوە.

(کونیک)ی زاناش بەپشت بەستن بەژمارەیەک بەڵگەنامەی مێژوویی دووپاتی دەکاتەوە کە پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان بنەچەی گەلی کورد و گەلانی مۆدێرندا هەیە کە لە کۆنەوە لە ئاسیای ناوەڕاستدا جێگیربوون، هەروەها گوتوویەتی کە کورد وەکو ئێرانییەکان و گەلانی دیکەی ئاسیای بچووک ئارین، بوونی پەیوەندییەکی بەهێزیش لە نێوان زمانی کوردی و ئێرانیدا[١٣] بەڵگەیە بۆ ئەمە. وەکو وێکچوونێکیش لەگەڵ مینۆرسکیدا ئەو زانایە تیۆرەکەی لەسەر بنەمای زمان بونیاد ناوە و لە لایەن هەریەکە لە ڕینان و دورن و لرشیش[١٤] لایەنگیریی لێ کراوە.

هەندێ زانای کۆنیش باسیان لەوە کردووە کە کورد لە ڕەگەزی کلدانەکانن، چەند نووسەرێکی سەردەمی کۆن وای بۆ دەچن کە کلدانەکان لە ناوچەی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا نیشتەجێ بوون، مارکو بولو لە میانەی باسکردن لە کلدانەکان وتوویەتی گەلێکی کوردی مەسیحی لە چیاکانی مووسڵ نیشتەجێن، بەم جۆرە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بۆچوونی ئەوە لە ئارادابوو کە کورد نەوەی کلدانییەکانن[١٥] لە سەدەی سێزدەش گەورە مێژوونووس و زانایانی زمانەوانی ئەو تیۆرەیان بەڕاست و دروست زانیوە، بەڵام لیهمان بوتی زانا بەرەورووی ئەو وتەیە بووەوە و ڕەتی کردەوە، جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە کلدانەکان لەو سامییانەن کە هیچ پەیوەندییەکیان بەخلدییەکانەوە[١٦] نییە، هەروەها چەند زمانناسێکی وەک بوت و ڕۆدیجار ناڕاستیی ئەو تیۆرەیان دەرخستووە کە دەڵێت زمانی کوردی لە ڕەچەڵەکی کلدانییە و دووپاتیان کردۆتەوە کە پەیوەندی لە نێوان ئەو زمانە و زمانی فارسی و زەندیدا هەیە کە بنەچەی زمانی فارسین.

**٢- ئەو تیۆرانەی ڕەسەنایەتی گەلی کورد دووپات دەکەنەوە:**

بەپێچەوانەی ئەو تیۆرانەی پێشتر باسیان لێوە کرا، زانا (مار) پێیوایە کە کورد لە ناوچەی دیکەوە نەهاتوونەتە ئەو ناوچەیە، بەڵکو ئەوان دانیشتوانی ڕەسەنی چیاکانی ئاسیای بچووکن[١٧] و هەر لەو ناوچەیەشدا زمانەکەیان دروست بووە کە لە بنەڕەتدا زمانێکی جۆرجی و خلدیە و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیش بەرەو زمانێکی هیندۆ- ئەورووپی هاوشێوە لەگەڵ زمانە ئێرانی و ئەرمەنییەکاندا پەرەی سەندووە و هەندێک توخمی تورکیش دەگرێتە خۆی[١٨].

ئەو زانایە بیردۆزەکەی خۆی دەربارەی بنەچەی کورد لەسەر بنچینەی هەڵسوکەوت و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو گەلە دارشتووە، بەو پێیەی کە وێکچوونێک لە نێوان ئەو دابونەریتانە و هی گەلانی پێشووتری ناوچەکەدا هەیە، وەک مارەکردنی ئامۆزا و چرینی ئەو گۆرانییانەی کە لە قورگەوە دێنە دەر[١٩].

بۆیە زانای ناوبراو ئەوە رەت دەکاتەوە کە کورد ئاری بن، سەرەرای بوونی خاڵی وێکچوون لە نێوان زمانی ئەوان و زمانی ئارییەکاندا، وێرای ئەمە جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە کە زمانی کوردی بەوە ناسراوە کە خاوەنی زۆر تایبەتمەندیی رەسەنە[٢٠] هەروەها (مار) باوەری بەبوونی نزیکییەک لە نێوان کورد و کاردۆخییەکان و کرتییەکاندا هەیە[٢١].

(محەمەد ئەمین زەکی)ش لە دیاریکردنی رەچەڵەکی گەلی کورد پشت بەبنەمای وڵات دەبەستێ کە کوردستانە، چونکە ئەو پێی وایە گەران بەدوای بنەچەی هەر میللەتێک دەبێ پشت بەو خاکە ببەستێ کە ئەو گەلە لەسەری ژیاوە، لەو رووەوە دەڵێت: کوردستان وڵاتی یەکەمی رەچەڵەکی دووەمی مرۆڤایەتی و شوێنی بڵاوبوونەوەیەتی بۆ لایەکانی دیکە بەپێی رووداوە مێژووییەکان، لە سەرەتای مێژووشەوە گەلانی چیاکانی زاگرۆسی تیادا ژیاون و لە میللەتانی (لوللو) و (کوتی) و (کاسای) و (سوبارو) و (هەوری) پێک دێن، عیلامییەکانیش لە کۆتایی رۆژهەڵاتی باشووری ئەو ناوچەیەدا ژیاون. بەگوێرەی هەندێک تێکەڵی زمانەوانیش چەند رۆژهەڵاتناسێک وای بۆ چوون کە ئەو نەتەوانە لە سەرجەلەی قەوقاسین، چونکە ئەمانە جگە لە عیلامییەکان بنەچەی زۆر کۆنی گەلی کوردن[٢٢].

ئەو زانایە باس لەوەش دەکات کە سەرەتای شەپۆلەکانی کۆچکردنی ئەو نەتەوانە بۆ چیاکانی زاگرۆس بووە دواتر روویان کردۆتە رۆژهەڵات و رۆژئاوای ئەو چیایانە، کۆچکردنێکی لەو جۆرەش ماوەی هەردوو سەدەی نۆیەم و دەیەمی پێش زایین دەستی پێکردووە، گەلی میدیش کە لە رۆژهەڵاتی دەریاچەی ئورومیە نیشتەجێ بوون گەورەترین و بەرفراوانترین ئەو شەپۆلانەیان پێکهێناوە ئینجا دوای ئەوان چەند نەتەوەیەکی ئاری دیکە کۆچیان کرد لەوانە: بارسی، مانەیی، باسیوی، بارث، کاردۆخی یان کاردۆشوی، لە ئەنجامی ئەو کاریگەرییەشدا کە ئەو نەتەوانە کردوویانەتە سەر دانیشتوانی رەسەنی چیاکانی زاگرۆس و کوردستان، هەموویان بوون بەئاری[٢٣].

محەمەد ئەمین زەکی لەو باوەڕەشدایە کە ڕەوکردنی دوا گرووپ (کاردۆخییەکان)- کە لە ساڵی ٤٠١ی پ.ز زەینەفون دیدەنیی کردوون- لە سەدەی حەوتەمی پ.ز ڕووی داوە[٢٤].

وەکو لێکدانەوەیەکی نزیکیش لە بۆچوونەکەی محەمەد ئەمین زەکیی زانا، دکتۆر شاکر خەسباک پێی وایە کە کورد نەوەی کوتییەکانن، خودی کوتییەکانیش بەپێی ئەو بۆچوونە لە ئەنجامی تێکەڵبوون و توانەوە لەگەڵ دانیشتوانی ڕەسەنی چیاکانی زاگرۆس و شەپۆلە سەرەتاییەکانی کۆچکردنی ئارییەکانەوە دروست بوون، ئەو شەپۆلانەی کە لە دەوروبەری ساڵی ٢٠٠٠[٢٥] پ.ز لە ناوچەکەیاندا گیرسانەوە.

دکتۆر شاکر خەسباک بەمەبەستی بەهێزکردنی بۆچوونەکەی ژمارەیەکی زۆر بەڵگەی مێژوویی خستوونەتە ڕوو و هەموویان جەخت لەسەر بوونی کوتییەکان دەکەنەوە، لەو بارەوە دەڵێت کۆنترین ئاماژە بۆ بوونیان (کوتییەکان) ئەوانەن کە لە نووسینە سۆمەرییەکاندا هاتوون، چونکە سۆمەرییەکان سکاڵایان لە نەتەوەیەکی شەڕکەر هەبووە بەناوی کوتییەکان کە لە چیاکان هاتوونەتە خوارەوە و هێرشیان بردۆتە سەر شارەکانیان، لە لایەن خۆیانەوە ئەکەدییەکانیش دانیان بەدەوڵەتی کوتییەکان وئارابخوای پایتەختەکەیدا ناوە کە دەکەوێتە نزیک شاری کەرکووکی ئێستا[٢٦]، دکتۆر خەسباک هەروەها دەڵێت: «هەندێک نووسەر پێگەی شانشینی کوتییەکانیان لە چوارگۆشەی نێوان زاب و ڕووباری دیجلە و گردۆڵکەکانی سلێمانی و دیالا[٢٧] دیارکردووە».

کوتییەکان هەڕەشەشیان لە ئاشوورییەکان کردووە کە بەکاردۆ ناویان بردوون و ئەوان سەرەڕای بەرپابوونی چەندین شەڕوشۆڕ لە نێوان هەردوو لادا[٢٨] بەڵام نەیانتوانیوە کۆنترۆڵی کوتییەکان بکەن.

بەگوێرەی ئەو بۆچوونەش لە دوای ڕووخانی نەینەوا لە ساڵی ٦٦٠ پ.ز[٢٩]، کوتییەکان تێکەڵاوی میدییەکان بوون.

دکتۆر عەبدوڕەحمان قاسملوش لە بۆچوونێکی هاوشێوە و نزیکیدا لەگەڵ بۆچوونی محەمەد ئەمین زەکی و دکتۆر شاکر خەسباک، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بەپێی بەڵگە زانستییەکان دەرکەوتووە کە کورد لە زنجیرەی هۆزەکانی زاگرۆسەوە هەڵقوڵاون کە غوتی (کوتی) و لولومی و ژمارەیەک هۆزی دیکەن و لە کۆنەوە لە دەوروبەری چیاکانی زاگرۆس گیرساونەتەوە، ئەمە وێڕای هۆزە هیندۆ- ئەوروپییەکان کە لە هەزارەی دووەمی پێش زایینیدا[٣٠] ڕوویان کردۆتە ئەو ناوچەیە. بەپێی ئەم بۆچوونەش هەردوو هۆزی غوتی

و لولومی لە ماوەی ساڵی ۲۰۰۰ پ.ز پەیوەندییان لەگەڵ ئەکەدییەکان گرێداوە، تەنانەت لە هەندێ لەو ماوانەدا[٣١] ژمارەیەک لە پیاوانی هەردوو هۆزی ناوبراو لە دەوڵەتی ئەکەددا دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست.

## دووەم: کوردستان یان نیشتمانی کوردان

وشەی کوردستان لە دوو بڕگە پێک دێت کە (کورد) و (ستان)ن و ستان مانای وڵات یان نیشتیمان دەبەخشێت، بەم جۆرە کوردستان واتای وڵاتی کوردان دەگەیەنێ، وەک چۆن عەرەبستان وڵاتی عەرەب و ئەفغانستان مانای وڵاتی ئەفغان دەبەخشێت.

کوردستان ناوچەیەکی بەرفراوان دەگرێتەوە و دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئاسیای ڕۆژئاوا[٣٢]، بەڵام تا ئێستا خاوەنی سنووری سیاسیی خۆی نییە[٣٣]، بگرە لە نێوان چەند دەوڵەتێکی وەک تورکیا و ئێران و عێراق- بەشێکی بچووکیشی لە سوریا[٣٤]- دا دابەش کراوە، کۆنترین ئەو سەرچاوانەش کە ئاماژەیان بەو ناوچەیە کردووە، سەرچاوە یۆنانییەکانن، بەڵام ئەو ناوانەی کە لە لایەن نووسەرە یۆنانی و ڕۆمانییەکانەوە بەکارهێنراون تا ڕادەیەک جیاوازن، ئەوەتا بە(کوردونس) یان (کوردیای) ناویان بردوون، سریانییەکانیش بەکاردۆ ناویان ناون، ئەو جۆرە ناوانەش زیاتر ئاراستەی ئەو ناوچانە کراون کە کاردۆخییەکانیان تیادا دەژیان و دەکەوتنە نێوان دیاربەکر و نسێبین و زاخۆ، ئەگەرچی هەموو نیشتمانی کوردان ناگرنەوە[٣٥]. نووسەرانی عەرەبیش ئەو ناوچانەیان بە(کەرتی چیاکان)[٣٦] ناو بردووە، پاشان کردوویانەتە (عێراقی عەجەمی) وەکو جیاکردنەوەیەک لە عێراقی عەرەبی، عێراقی عەجەمییش ئەو ناوچانەی دەگرتەوە کە یۆنانییەکان بە(میدیا)[٣٧] ناویان بردووە.

بەڵام وشەی کوردستان وەکو زاراوەیەکی جوگرافی تەنیا لە سەدەی دوازدەی پێش زایین نەبێ بەکارنەهێنراوە، ئەوکاتەی کە (سنجار)ی دوا سوڵتانی سەلجوقییەکان یەکێک لە هەرێمەکانی شانشینەکەی بەو ناوە ناوزەدکردووە، هەرێمەکەش لە چەند ویلایەتێک پێکهاتووە و زنجیرە چیاکانی زاگرۆسیان کەوتۆتە نێوانەوە، ئەوانیش ویلایەتەکانی: هەمەدان و دیناوەر و کرماشان بوون لە ڕۆژهەڵاتی ئەو زنجیرە چیایەدا وێڕای هەردوو ویلایەتی شارەزوور و سنجار لە ڕۆژئاوا، هەمووشیان سەر بەقەڵای بەهاری پایتەختی کەرتەکە بوون کە دەکەوتە ڕۆژهەڵاتی هەمەدان[٣٨].

مستەوفی قەزوینی خاوەنی کتێبی (نزهة القلوب)یش کە لە ساڵی ٧٤٠ی کۆچی بەرامبەر بەسەدەی چوارەمی کۆچی[٣٩] چاپ کراوە، یەکەم نووسەری عەرەب بووە ئەو زاراوەیەی بەکارهێناوە.

دەربارەی سنوورەکانی کوردستان و ئەو ناوچانەش کە دەیانگرێتە خۆی، مینۆرسکی دەڵێت: «ئەگەر بەشەکانی سەرەوەی ڕووباری فورات و ناوچەکانی دەریاچەی وان (ئەرمینیای کۆن) ئەو خاکە کۆنە بێت کە کوردی تیادا دەرکەوتوون، ئەوا پێموابێ- بەشەکانی باشووری تۆرۆس و کەنارەکانی چەپی دیجلە (بۆتان، خەربوت، زێی گەورە)- نیشتمانی دایکی گەلی کوردە»[٤٠] ئینجا درێژەی پێ دەدات و دەڵێت: «ئەگەر بمانەوێ لە سەرەتای مێژووەوە لە وڵاتی کوردان بگەڕێین، دەبێ بچینە بەشە دوورەکانی ڕۆژهەڵات و باشوور، ئەو سێ ناوچانەی خوارەوەش نیشتمانی کوردن: زنجیرە چیاکان لە ئەرمینیا و کوردستانی تورکیا و چیاکانی فارسی ڕۆژئاوا. بەم جۆرە دەبینین کە حاڵی حازر کورد لە خاکێکی بەرفراوان، لە نزیک سنوورەکانی تورکیا و فارس لە شاری مەندەلی (لە ڕۆژهەڵاتی بەغدا) تا دەگاتە ئارارات دەژین، خاکەکەیان سنوورەکانی ئێمەش دەبڕێ و دەچێتە قەفقاسیا. کورد و ئەرمەن پێکەوە لە هەموو زنجیرە چیاکانی ئەرمینیا دەژین و سنوورەکانی باکووریشیان لە تورکیا لە نزیک ئەرزەڕۆم تەواو دەبن، لە باشووریشدا کورد کۆنترۆڵی چەندین ناوچەی بەرفراوان دەکەن تا کۆتایی دەشتەکانی نێوان هەردوو ڕووبار (بین النهرین)، لە ڕۆژئاواش ڕووباری فورات یان قەرەسو[٤١] بەسنووری ئەوان دادەنرێ».

لە وەسفکردنی سنوورەکانی کوردستانیشدا باسیل نیکیتین دەڵێ: «کوردی ئیمڕۆ لەسەر خاکێکی زۆر بەرفراواندا دەژین کە لە نزیک بەغدا لە مەندەلییەوە دەست پێ دەکات و بەدرێژایی سنوورەکانی عێراق- ئێران- تورکیا لە ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە چیای ئارارات، تەنانەت ناوچەی قۆقازی سۆڤیەت (واتە هەردوو هەرێمی ئەرمینیا و ئازەربایجان)[٤٢]یش دەگرێتەوە».

بەهەمان شێوە ئەدمۆندز باس لەوە دەکات کە سنوورەکانی کوردستان، ئەوانەی تیایاندا کورد وەکو گرووپێکی یەکگرتوو دەژین، بەناو یەکێتی سۆڤیەتدا تێپەڕ دەبن، کوردستانیش وا وەسف دەکات کە (لە نێوان تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا و یەکێتی سۆڤیەت) دابەش کراوە. سنوورەکانی لە باکوورەوە لەگەڵ هێڵی وێنەکێشراو لە یەریڤان- ئەرزەڕۆم- ئەرزنجان درێژ دەبنەوە ئینجا لە دەوروبەری مەرعەش بەرەو حەڵەب بادەدەنەوە،

له باشووری ڕۆژئاواش ئەو سنوورانە هاوکات لەگەڵ ئەو تەپۆلکانەی ڕوو لە دیجلە دەکەن درێژ دەبنەوە تا دەگەنە باکووری چیای حەمرین لە خاڵێک لە نزیک سنوورەکانی عێراق-ئێران لە مەندەلی. لە ڕۆژهەڵاتیشدا لە ئێران، سنوورەکانی کورد ڕوو دەکەنە باشووری ڕۆژهەڵاتی یەریڤان و هەرێمی ماکۆ و بەشێکی خوی و ڕەزائیە و مەهاباد (ساوجبلاق) و سەقز و سنە و کرماشان دەگرنە خۆیان[٤٣].

لەو وەسفکردنەی سنووری کوردستاندا دکتۆر شاکر خەسباک لەگەڵ ئەدمۆندز کۆکە، بەڵام دکتۆر خەسباک ئەوەش زیاد دەکات و دەڵێت «لە حاڵەتێکدا ئەگەر هۆزی لوڕ بەکورد بژمێردرێن، ئەو کاتە سنوورەکانی کوردستان بەدرێژایی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس درێژ دەبنەوە تا دەگەنە کەنداوی عەرەب»[٤٤].

دکتۆر عەبدوڕەحمان قاسملووش پێی پێی وایە کە حاڵی حازر هیچ بەشێکی کوردستان ناکەوێتە ناو یەکێتی سۆڤییەت، جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بەپێی ئەو پەیماننامەیەی لە ٢١ی مارسی ١٩٢١ لە نێوان ڕووسیای سۆڤیەتی و تورکیادا مۆرکراوە، ئەو چەند پارچە بچووکەی کە لە ئەرمینیای سۆڤیەتییەوە درێژ بوونەوە (هەردوو ناوچەی قارس و ئەردەهان) گێڕدراونەتەوە بۆ تورکیا[٤٥].

قاسملوو ژمارەی ئەو کوردانەش کە لە ساڵی ١٩٣٩ لە یەکێتی سۆڤیەت ماونەتەوە بە (٤٥,٨٦٦) کەس مەزەندە دەکات[٤٦].

لێرەوە دەکرێ بڵێین ئەو سنوورانەی کە هەریەکە لە ئەمۆندز و دکتۆر شاکر خەسباک دیاریان کردووە زیاتر لەگەڵ واقیعدا دەگونجێن و وردترین وەسفیشە بۆ نیشتمانی کوردان.

### سێیەم: زمانی کورد

بێگومان زمان یەکێکە لە گرنگترین بنەماکانی گەل یان میللەت، گەلی کوردیش خاوەنی زمانی تایبەت بەخۆیەتی.

سەبارەت بەڕەسەنایەتی زمانی کوردیش، زۆربەی مێژوونووسان[٤٧] پێیان وایە ئەو زمانە دەچێتەوە سەر گرووپی زمانە ئێرانییەکان کە لە خێزانی زمانە هیندۆ-ئەوروپییەکان دەبێتەوە، زمانی کوردی و فارسیش لەوانەن، لەو بارەوە مینۆرسکی دەڵێت: «زمانی کوردی لە خێزانی زمانە ئێرانییەکانە، وەک ئاشکراشە ئەو خێزانە لە زمانی فارسی و ئەفغانی و بلوجی و ئەسیتینی و چەند شێوەزارێکی دیکەی کۆن و تازە

پێک دێت، زمانی کوردیش بریتی نییە لە فارسییەکی دەسکاریکراو، بەڵکو زمانێکی سەربەخۆیە و خاوەنی یاسای فۆنەتیکی و سینکسیسی تایبەتە، پەیوەندیشی لەگەڵ فارسی وەکو پەیوەندی سربی بەڕووسییەوەیە، یان وردتر بڵێین هاوشێوەی پەیوەندی نێوان زمانی ئادی سویسرییە چیاییەکانە لەگەڵ زمانی ئیتالی[٤٨]» پاشان دەڵێت: «بۆچوونێک لە ئارادایە سەبارەت بەوەی کە زمانی کوردی وەکو زۆربەی شێوەزارە تازەکان لە ئێران، زۆر لە پێکهاتەکانی دروستبوونی لە زمانی میدیی لە ناوچوو وەرگرتووە، میدیاش ئەو شانشینەیە کە حوکمی ئێرانی کۆنی کردووە[٤٩]».

هەردوو زمانناس بوت و ڕویدجاریش دەگەنە هەمان ئەنجام کاتێک دەڵێن: زمانی کوردی پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ زمانی زەندیدا هەیە کە بنەچەی زمانی فارسییە[٥٠].

سدنی سمیسی پسپۆڕی بەریتانیش ئەوە دووپات دەکاتەوە کە زمانی کوردی هەڵێنجراو یان لە زمانی فارسی نەبۆتەوە[٥١]. دوو شێوەزاری سەرەکیی کوردی هەن کە کرمانجی و سۆرانین، شێوەزاری کرمانجی لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژ ئاوای کوردستان بڵاوەی هەیە، تیایاندا زۆرینەی کورد- کە کوردی تورکیان دەژین جگە لە دەوروبەری دەرسیم کە بەشێوەزاری زازا دەئاخڤن- و کوردی سوریا و بادینان لە عێراق و ئەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە باکووری ورمێ لە ئێران، لە کاتێکدا شێوەزاری سۆرانی لە نێوان ئەو کوردانەدا باوە کە لە باشووری ئەو هێڵە خەیاڵییەدا دەژین کە ڕواندز لە عێراق و ورمێ لە ئێران پێکەوە دەبەستێتەوە[٥٢]، بەڵام ئەمەیان لە شێوەزارەکەی دیکە کەمتر بڵاوەی هەیە.

### چوارەم: کوردستانی باشوور یان عێراقی کوردی:

کورد لە بەشی باکووری عێراق دەژین، ئەو ناوچەیە هاوکات بەشی باشووری کوردستانی گەورەیە و بەر لە پێکهاتنی عێراقی تازەش[٥٣] بەشی هەرە گەورەی ویلایەتی مووسڵی پێک دەهێنا، حاڵی حازریش ئەو ناوچە جوگرافییە بەهەرێمی کوردستان ناو دەبرێ، ئەگەر چیش خاکی تورکیا هاوسنووری ئەو هەرێمەیە لە باکوور و خاکی ئێرانیش سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی پێکدێنێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سنوورەکانی باشوور و باشووری ڕۆژئاوای تا ئێستاش جێگیر نین و نادیارن و مایەی مشتومڕن لە نێوان حکوومەتی عێراق و سەرکردایەتی کورددا، دەکرێ بڵێین هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی حکوومەتە عێراقییە یەک لە دوایەکەکان لە کاتی دروستبوونی عێراقی تازەوە لە سەرەتای

بیستەکانی ئەو سەدەیەدا[٥٤]، هەوڵی سنووردارکردنی ئەو ناوچە کوردییانەیان داوە کە لە ناوچە عەرەب نشینەکان نزیک بوون، لە ڕێگەی نیشتەجێکردنی هاووڵاتییانی عەرەب لەو ناوچە کوردییانەدا لە دوای ڕاگواستنی دانیشتوانە کوردەکان بۆ ناوچەی دوورتر. سەبارەت بەبۆچوونی مێژوونووس و لێکۆڵەرەوانیش دەربارەی ئەو سنوورانەی کە لە هەمان کاتدا سنوورەکانی باشوور و باشووری ڕۆژئاوای کوردستانی گەورەن، دەبلیو ئەرهی دەڵێت:

«هەموو ئەو خاکانەی دەکەونە ڕۆژهەڵاتی دیجلە و باکووری ئەو هێڵەی کە لە مەندەلییەوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە زێی بچووک، خاکی کوردانن و کەرکووک و سلێمانیش بەگرنگترین مەڵبەند دادەنرێن لە باشووری زێی بچووک»[٥٥] ئەدمۆندزیش دەڵێت: سنوورەکانی باشووری ئەو ناوچەیە لەگەڵ ئەو تەپۆلکانە درێژ دەبنەوە کە ڕوو دەکەنە دیجلە و باکووری چیای حەمرین تا دەگەنە خاڵێک لە لای سنوورەکانی عێراق- ئێران لە نزیک مەندەلی[٥٦].

عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنیی مێژوونووسی بەناوبانگی عێراقیش لەو بارەوە ڕوو دەکاتە بۆچوونێکی نزیک و جەخت دەکاتەوە کە «کورد لە چەند شار و گوندێکدا دەژین و لە سنوورەکانی ئێران- عێراقەوە بەهێڵێکی ڕاست دەست پێ دەکەن و لە چیای حەمرینەوە تا چیای سنجار درێژ دەبنەوە و دەگەنە سنوورەکانی عێراق- تورکیا- سوریا»[٥٧] ئەوەی لەو بارەشەوە مایەی ئاماژە پێکردنە، ئیبن خەلدونی مێژوونووسی بەناوبانگی عەرەب کە لە ساڵی ٨٠٨ی کۆچی بەرامبەر ١٤٠٦ی زایینی کۆچی دوایی کردووە، شەش سەدە بەر لە ئێستا[٥٨] چیای حەمرینی بەچیای کوردان ناو بردووە، ئەمەش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە و جێگیرە لەسەر ئەوەی کە چەند سەدەیەکە دەوروبەری ئەو چیایە وڵاتی کوردانە. سەبارەت بەخودی کوردیش دەکرێ ئاماژە بەبۆچوونی محەمەد ئەمین زەکیی گەورە مێژوونووسی کورد بکەین کە ئەو سنوورانەی وا دیارکردوون کە لەمەندەلییەوە دەست پێ دەکەن بەرەو ڕووباری دیجلە لەگەڵ درێژبوونەوەی چیاکانی حەمرین بۆ خاڵی بەیەکگەیشتنی زێی ژێری لەگەڵ ڕووباری ناوبراو درێژە دەکێشن[٥٩] دکتۆر ئازاد نەقشبەندیش دەڵێ: سنوورەکانی کوردستانی عێراق لە شاری بەدرەوە دەست پێ دەکەن و ڕوو دەکەنە مەندەلی و شارەبان لە نزیک چیای حەمرین تا لە ڕووباری دیجلە دەپەڕنەوە، لە ڕۆژئاوای دیجلەشدا لەگەڵ چیای مەکحول و سنجار درێژ دەبنەوە تا دەگەنە سنوورە نێودەوڵەتییەکان لەگەڵ سوریا[٦٠].

بەگوێرەی ئەوەی باسی لێوە کرا، دەکرێ بوترێ سنوورەکانی هەرێمی کوردستانی عێراق لە سنوورەکانی عێراق- ئێران لە نزیک شارۆچکەی مەندەلییەوە دەست پێ دەکەن و بەقەراغی بەرزاییەکانی حەمریندا درێژ دەبنەوە تا فەتحە لەسەر ڕووباری دیجلە پاشان ڕوو لە باکوور دەکەن بەرەو چیای مەکحول و سنجار تا سنوورەکانی عێراق- سووریا.

بەمەش کوردستانی عێراق لە پارێزگاکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و دهۆک و قەزاکانی ئاکرێ و شێخان و تلکیف و سنجار لە پارێزگای مووسڵ و خانەقین و کفری و مەندەلی (جگە لە ناحیەی بەلەدروز) لە پارێزگای دیالا و قەزای توزخورماتوو لە پارێزگای سەلاحەدین پێکدێت و کۆی پێوانەی ئەو هەرێمەش (٧٤٠٠٠) کیلۆمەتر چوارگۆشەیە[٦١].

دەبێ ئەوەش بزانین کە کورد ئەگەرچی زۆرینەی دانیشتوانی کوردستانی عێراق پێکدێنن بەڵام چەند کەمینەیەکی عەرەبی و تورکمانی و ئەرمەنی و نستوری (ئاسووری) لە نێوانیاندا دەژین.

سەبارەت بەژمارەی دانیشتوانی کوردیش لە عێراق لە ڕاستی لانادەین ئەگەر بڵێین لەو بارەوە ئامار و سەرژمێری ورد و ڕاست نین، بەپێی ئەو سەرژمێریانەی کە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٢- ١٩٢٤ لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە ئەنجام دراون و ئاراستەی لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێو نەتەوەیی کراون، ژمارەی دانیشتوانی کورد لە ویلایەتی مووسڵ ئەوکاتە(٥٢٠,٠٠٠) هەزار کەس بووە- بە یەزیدییەکانیشەوە لە کۆی ژمارەی دانیشتوانی ئەو ویلایەتە کە (٨٠٠) هەزار کەس بووە، بەپێی سەرژمێری ساڵی (١٩٤٧)یش، لە کۆی ژمارەی دانیشتوانی عێراق، ڕێژەی کورد گەیشتۆتە ١٩,٨٪، ئەو ڕێژەیەش لە ساڵی ١٩٥٧ دابەزیوەو گەیشتۆتە ١٦,٠٤٪. هیچ هۆکارێکی دیاریش نییە کە دابەزینی ڕێژەی دانیشتوانی کورد لەو ماوەیەدا شی بکاتەوە لە کاتێکدا ڕێژەی دانیشتوانی عەرەب ڕووی لە زیادبوون کردووە، دەبێ ئەوەش بزانین کە لەو سەردەمەدا هیچ جۆرە کارەسات یان دەردێک ڕووی نەداوە و بڵاونەبۆتەوە بەجۆرێک کە تەنیا پەیوەست بن بەناوچەی کوردی، وەک زانراویشە کورد بەفرەژنی و وەچەی زۆر و ژنهێنان و شووکردنی زوو ناسراون.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەندامانی تایەفەی یەزیدی و ڕۆڵەکانی هۆزی گەرگەری و شەبەک (کە گومان لە ئینتیمایان بۆ کورد ناکرێ) بەعەرەب تۆمارکراون[٦٢] بەڵام بەپێی

سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧ ژمارەی دانیشتوانی کورد گەیشتۆتە ١٦,٠٥ ٪ی کۆی ژمارەی دانیشتوانی عێراق، جگە لەمە سەدان هەزار کوردی عێراق ئەوانەی لە دوای نسکۆی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٧٥(٦٣) پەنایان بردە بەر ئێران و وڵاتانی دیکە فەرامۆش کراون.

بۆیە بەگوێرەی ئەوەی باس کرا، هەندێک کەس وای بۆ چوون(٦٤) کە ڕێژەی کورد لەوانەیە بگاتە ٢٥ ٪ی کۆی دانیشتوانی عێراق، بەڵام دوای وردبوونەوە و لێکدانەوەی ژمارە باسکراوەکان و بەهەند هەڵگرتنی مەسەلەی تەعریبکردنی ئەو تایەفە و هۆزانەی گومان نییە لە ئینتیمایان بۆ کورد و هێنانەوە یادی ژمارەی ئەو کوردانەی دوای ساڵی ١٩٧٥ پەنایان بردۆتە بەر ئێران و دەوڵەتانی تر، دەکرێ بڵێین کە ڕێژەی کورد هەموو کاتێک زیاتر لە ٢٠ ٪ی کۆی دانیشتوانی عێراق ڕووی لە زیادبوون کردووە.

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی یەکەم

(١) دکتۆر عەبدوڕەحمان قاسملو- کوردستان والاکراد- لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و ئابوورییە- المؤسسة اللبنانية للنشر- بەیروت. ل ٣٩.

(٢) لەم بارەوە بڕوانە- الأمير شرف خان البدليسي- الشرفنامة في تأريخ الدول والأمارات الكوردية- جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی- چاپخانەی النجاح- بەغدا- ١٩٥٣، ل ١٨- ١٩.

(٣) دکتور شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو ل ٦-٧.

(٤) لەم بارەوە بڕوانە: جەلال تاڵەبانی- كوردستان والحركة القومية الكردية- دار الطليعة للطباعة والنشر- بەیروت- چاپی دووەم- ١٩٧١، ل ٢٦.

(٥) لەم بارەوە بڕوانە: دکتۆر شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو ل ٧.

(٦) باسیل نیکیتین- الأكراد- دار الروائع- بەیروت ١٩٦٧. ل ١٨.

(٧) ف. ف. مینۆرسکی- الأكراد ملاحظات وانطباعات- وەرگێڕانی دکتۆر مارف خەزنەدار- چاپخانەی النجوم بەغدا
١٩٦٧- ل ٢٢.

(٨) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢.

(٩) باسیل نیکیتین- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٩.

(١٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٦.

(١١) دکتۆر شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو- ل ٨.

(١٢) سەرچاوەی پێشوو- ل ٨.

(١٣) باسيل نيكيتين- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨.
(١٤) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨.
(١٥) سەرچاوەی پێشوو. ل ١٧.
(١٦) سەرچاوەی پێشوو. ل ١٧.
(١٧) دکتۆر شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو- ل ٧.
(١٨) باسيل نيكيتين- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٠.
(١٩) دکتۆر شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو ل ٧.
(٢٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ٧-٨.
(٢١) باسيل نيكيتين- سەرچاوەی پێشوو لا ١٦، ١٩، بەڵام نيكيتين باسی ئەوەش دەکات کە (مار) پێی وانەبووە کورد نەوەی کاردۆخییەکانن، ئەوانەی بەپێی بۆچوونی (مار) باپیرە گەورەی جۆرجییەکانن.
(٢٢) محەمەد ئەمین زەکی- خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان- جلدی یەکەم- جوزئی یەکەم- چاپخانەی دار السلام- بەغدا- ١٩٣١- ل ٦٢- ٦٣.
(٢٣) سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٣.
(٢٤) سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٣.
(٢٥) دکتۆر شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو- ل ١١- ١٣.
(٢٦) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢.
(٢٧) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢.
(٢٨) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢- ١٣.
(٢٩) سەرچاوەی پێشوو- ل ١١.
(٣٠) د. عەبدوڕەحمان قاسملوو- سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٠.
(٣١) سەرچاوەی پێشوو- ل٤٠.
(٣٣) باسيل نيكيتين- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٤.
(٣٤) د. عەبدوڕەحمان قاسملوو- سەرچاوەی پێشوو- ل ١١.
(٣٥) د. شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣- ١٤.
(٣٦) باسيل نيكيتين- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٥.
(٣٧) د. شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣- ١٤.
(٣٨) باسيل نيكيتين- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٤- ٢٥.
(٣٩) د. شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥.
- باسيل نيكيتين- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٥.

(٤٠) ف. ف. مینۆرسکی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤.

(٤١) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤- ١٥، قەرەسوو یەکێکە لە لقەکانی ڕووباری فورات.

(٤٢) باسیل نیکیتین- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨.

(٤٣) سی. جی. ئەدمۆندز- کورد و تورک و عەرەب- وەرگێڕانی جەرجیس فەتحوڵڵا- چاپخانەی تایمس- بەغدا- ل ٥- ٦

(٤٤) د. شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥.

(٤٥) د. عەبدوڕەحمان قاسملوو- سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٦.

(٤٦) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٤.

(٤٧) بڕوانە ف. ف. مینۆرسکی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٧.

(٤٨) ف. ف. مینۆرسکی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٧.

(٤٩) سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٧- ٣٨.

(٥٠) نیکیتین- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨.

(٥١) لە محەمەد ئەمین زەکی وەرگیراوە- سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٠.

(٥٢) د. عەبدوڕەحمان قاسملوو- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٠.

(٥٣) بڕوانە ل١٠ی ئەو تێزە.

(٥٤) لەو بارەوە بڕوانە د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد- هەرێمی کوردستانی عێراق- چەند لێکۆڵینەوەیەک سەبارەت بەپێکهاتەی نەتەوایەتی دانیشتوان- هەولێر- کوردستانی عێراق ١٩٩٨- ل ٤٣- ٤٤.

(٥٥) لە جەزا تۆفیق تالیب- دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی عێراق- لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای سیاسیی- نامەی ماستەر ئاراستەی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین کراوە لە ئاداری ١٩٩٥، ل ١٧ وەرگیراوە.

(٥٦) سی. جی ئەدمۆندز- سەرچاوەی پێشوو- ل ٥- ٦.

(٥٧) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ العراق السياسي الحديث- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٥٩.

(٥٨) ئیبن خەلدون- مقدمه تاريخ ابن خلدون- جلدی یەکەم، دارالبیان، بەیروت- ل ٧٤.

(٥٩) محەمەد ئەمین زەکی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٠.

(٦٠) ئازاد نەقشبەندی- نیشانکردنی سنووری کوردستان- گۆڤاری سیاسەتی دەولی- سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی لە کوردستان- ژمارە ١٠ی تەمووزی ١٩٩٤- ل ٢٢.

دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد لەگەڵ بۆچوونی دکتۆر ئازاد نەقشبەندی کۆکە سەبارەت بەوەی کە ئەو سنوورانە لە بەدرەوە لە پارێزگای واسیت دەست پێ دەکەن، ئینجا دکتۆر خەلیل باس لەوە دەکات

کە ئەو سنوورانە بەرەو باکوور درێژە دەکێشن تا ڕۆژئاوای شارۆچکەی مەندەلی و دواتر تا فەتحە بەقەراغی بەرزاییەکانی حەمریندا تێپەڕ دەبن، لەوێشەوە لەگەڵ ڕێڕەوی ڕووباری دیجلەدا دەڕۆن تا دەگەنە باکووری شاری مووسڵ، پاشان بەرەو باشووری ڕۆژئاوا ڕووەو شارۆچکەی حەزەر دەچن و ئینجا ڕوو دەکەنە ڕۆژئاوا بەرەو سنوورەکانی عێراق- سوریا لە باکووری شارۆچکەی بەعاج. جەزا تۆفیق تالیبیش

وای بۆ دەچێ کە ئەو سنوورانە لە شاری مەندەلییەوە دەست پێ دەکەن و لەگەڵ بەرزاییەکانی حەمریندا درێژ دەبنەوە- کە بەسنوورێکی جیاکەرەوەیان دەزانێ لە نێوان هەرێمی کوردستان و بەشەکانی دیکەی عێراق- تا دەگەنە فەتحە، ئینجا ئەو سنوورانە تا باکووری شاری مووسڵ لەگەڵ ڕێڕەوی ڕووباری دیجلە درێژ دەبنەوە، پاشان هەردوو قەزای تەلەعفەر و سنجار دەگرنە خۆیان تا دەگەنە سنوورە نێودەوڵەتییەکان لەگەڵ سووریا.

لەو بارەوە بڕوانە: د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد- سەرچاوەی پێشوو - ل ١١.

جەزا تۆفیق تالیب - سەرچاوەی پێشوو - ل ٢٢.

(٦١) د. محەمەد هەمەوەندی- قراءة قانونية لفكرة الحكم الذاتي وتطبيقها في كوردستان العراق- لێکۆڵینەوەیەکە

لە گۆڤاری دراسات كوردية کە لە لایەن ئەنستیتۆی کوردی لە پاریس دەردەچێت، بڵاوکراوەتەوە- ساڵی هەشتەم- ژمارە

٣- ٧- ساڵی ١٩٩٢- ل ٢٦.

- د. عەبدوڕەحمان قاسملوو باس لەوە دەکات کە ڕووبەری کوردستانی عێراق ٧٢٠٠٠ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، لە کاتێکدا د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد دەڵێت ئەو ڕووبەرە ٧٨٧٣٦ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، لەو بارەوە بڕوانە:

عەبدوڕەحمان قاسملوو- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢ د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد- سەرچاوەی پێشوو- ل ١١.

(٦٢) فەیسەل دەباغ- سەرچاوەی پێشوو- ل ٤.

(٦٣) سەرچاوەی پێشوو- ل ٤.

(٦٤) سەرچاوەی پێشوو- ل ٤.

ئاخافتنی دووەم

# نائومێدیی کورد و ڕاپەڕینەکانی

لە دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهان، کورد لە نێو ئەو میللەتە چەوساوانەدابوو کە بەدەستی داگیرکاری ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە دەیانناڵاند و چاوەڕێی ڕزگاربوونیان دەکرد، دوای مۆرکردنی پەیماننامەی سیڤەریش لە ١٠ی ئابی ١٩٢٠، کورد لە هەموو شوێنێکدا گەشانەوەیەکی بەخۆیەوەدیت لە نێوانیاندا کوردی عێراق، زیاتریش بەهۆی بوونی بەندەکانی ژمارە(٦٢، ٣٦، ٦٤)[١] بوو لەو پەیماننامەیەدا کە مافی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆیان بەکورد بەخشی وێڕای مافی ئەوەی کە ئەو دەوڵەتە دەبێ ویلایەتی مووسڵیش بگرێتە خۆی، بەڵام پرۆژەی نەتەوەیی کورد ڕووناکیی بەخۆیەوە نەدیت بگرە بەخێراییش کپ کرایەوە بەهۆی دژایەتیی تورکیای کەمالی[٢]

لە لایەکی دیکە و لە ئەنجامی ناجیدییەتی دەوڵەتە زلەکان (بەتایبەتی بەریتانیا) بەپابەندبوون پێی، ئەوەبوو بەپەلە پاشگەزیی لەو پرۆژەیە کرایەوە و تورکیا ئامادە نەبوو پەیماننامەکە مۆر بکات، دوای ئەوەی مستەفا کەمال توانی سەرکردایەتی وڵاتی خۆی بکات لە وەدیهێنانی چەند سەرکەوتنێکی گەورە لە شەڕی تورکی- یۆنانییدا و هاوپەیمانانیش ڕازی بوون بەوەی لە پێناوی مۆرکردنی پەیماننامەیەکی تازەدا لەگەڵ لایەنی تورکی دەست بەدانوستان بکەن کە تا ٢٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٢٣، واتە تا کاتی مۆرکردنی پەیماننامەی لۆزان درێژەیان کێشا، ئەو پەیماننامەیەی کە تیایدا بەهیچ شێوەیەک باس لە کورد و مافەکانی نەکرا. لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥یشدا بڕیاری کۆمەڵەی گەلان سەبارەت بەوەی کە عێراق ویلایەتی مووسڵ بگرێتە خۆی دەرکرا، بەم جۆرەش کوردستان لە نێوان چوار دەوڵەت (تورکیا، ئێران، عێراق، سوریا)دا دابەش کرا و کێشەی کوردیش لە چوارچێوەی یاسای گشتی نێودەوڵەتییەوە چووە چوارچێوەیەکی نێوخۆیی[٣] و کوردی عێراق لە لایەن حکوومەتە عێراقییە بەدوایەکدا هاتووەکان دووچاری زوڵم و چەوساندنەوەیەکی گەورە هاتن و هیچ کاتێک بەگیانی دادوەری و یەکسانی و ئینسافەوە مامەڵەیان لەگەڵ نەکراوە بەڵکو هەموو دەنگێکی دڵسۆز کە داوای مافە نەتەوەییە ڕەواکانی خۆی لە چوارچێوەی یەکێتی خاکی عێراقدا کردبێ لە دیدی ئەو حکوومەتانە وەکو بانگەشەیەک بۆ جیابوونەوە و خیانەتکاری حیسابی بۆ کراوە لەجیاتی

بیرکردنەوە لە گەڕان بەدوای دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەکی ئاشتییانە بۆ کێشەکە و چارەسەرکردنی هۆکارەکانی. لە بەرامبەریشدا ئەو حکوومەتانە (بەبێ جیاوازیی) هەمیشە لە پێناوی لەناوبردنی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کورد ڕوویان کردۆتە ڕێگەچارەی سەربازی، ئەگەریش بەشێک لەو حکوومەتانە (هەندێک جار) پەنایان بردبێتە بەر گفتوگۆ و دانوستان ئەوە تەنیا بریتی بووە لە تاکتیکێکی کاتیی بەمەبەستی ئامادەسازی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی کە هەمیشە بەتاکە ڕێگە چارەیان زانیوە، هەروەها هەندێک لەو حکوومەت و سەرکردایەتییە سەربازییە شۆڤێنییانە شەڕکردنیان لە دژی کوردستان بەگۆڕەپانێک بۆ مەشق پێکردنی یەکە سەربازییەکان و فێرکردنی هونەرەکانی شەڕکردن زانیوە بێ ئەوەی هیچ بایەخێک بەژیانی ڕۆڵە بێ دیفاعەکانی گەلی کورد و ماڵ و مۆڵکیان بدەن. لە ئەنجامیشدا سەدان هەزاریان بوونە قوربانی ئەو جۆرە سیاسەتانە، ئەی. ئێم. هاملتۆن دەڵێت:

**جارێکیان ئەوکاتەی لە ساڵی ۱۹۳۱دا حکوومەت هەڵمەتێکی بۆ سەر شێخ ئەحمەدی** بارزانی دەست پێکرد، ڕووبەڕووی ئەو پرسیارەی خوارەوە بوومەوە:

باشە چی لە سوپای عێراق بکەین کە بڕە پارەیەکی لە بن نەهاتوو بۆ ئامادە و ڕێکخستنی خەرج کراوە، ئەگەر ڕەوانەی (ڕێگەی تۆ)، ڕێگەی ڕواندزی نەکەین بۆ ئەوەی فێری هونەرەکانی شەڕبێن و مەشق لەسەر بەرپاکردنی شەڕ لە دژی کورد بکەن، ئەمەش وەڵامی من بوو کە بەگاڵتەجاڕی وەڵامی درایەوە:

نزیکتر لەو ناوچەیە بۆ بەغدا و مووسڵ ڕووبەری بەرفراوان لە ناوچە دەشتانییە بەتاڵەکان هەن کە دەشێن وەکو گۆڕەپانێک بۆ تاقیکردنەوەی تفەنگ و تۆپ و جموجۆڵ پێکردنی زرێپۆش و فڕینی فڕۆکەکان بەکاربهێنرێن، با لەوێ تۆپەکان بتەقێنرێن، ئەوکاتە مەترسی نییە کە بەر هیچ کەسێک بکەون، بەڵام ڕەوانەی کوردستانیان مەکەن چونکە لەوێ عەرەبیش هەن و لەوانەیە تووشی ئازاربێن[٤].

### یەکەم: ئیدارەی ڕاستەوخۆی ئینگلیز لە سلێمانی و ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموودی حەفید[٥]

کاتێک هێزەکانی بەریتانی بەشی زۆری خاکی وڵاتیان داگیرکرد و بنەماکانی دەوڵەتی عوسمانیش داڕمان، ئەوکاتە تورکەکان ئەرکی ئەوەیان خستە ئەستۆی شێخ مەحموودی حەفید کە بەناوی دەوڵەتی عوسمانییەوە ئیدارەی سلێمانی بەڕێوە ببات و حوکمی

ناوچەکە بکات. بەڵام ئینگلیز توانییان شێخ مەحموود ڕازی بکەن کە بەپێی ماددەی ژمارە(١٦) لە مەرجەکانی ئاگربەسی مۆدرۆس کاربکات کە لە (٣٠) تشرینی دووەمی ١٩١٨ مۆر کرا و تیایدا هاتووە: «تەسلیم کردنی هەموو پێگە سەربازییەکان لە سوریا و حیجاز و عەسیر و یەمەن و نێوان هەردوو ڕووبار بە پایەبەرزترین سەرکردە لە وڵاتانی ئیئتیلاف و پاشەکشەکردنی یەکە تورکییەکان لە ئەدەنە، جگە لەو سەربازانەی کە بۆ مەبەستی ڕێکخستن پێویست دەبن بەپێی ماددەی ژمارە پێنج[٦]».

بەم جۆرە شێخ مەحموود پێشنیازی کرد کە حامیەی سلێمانی تەسلیم بەهێزەکانی بەریتانیا بکات، لەو پێنکاوەشدا ئەو سەرباز و ئەفسەرە تورکانەی لە حامیەی ناوبراو مابوونەوە ڕەوانەی بەغدا کران، لە ئەنجامیشدا کۆلۆنیل ئەی. تی. ولسنی بریکاری گشتی پادشایەتی لە بەغدا شێخ مەحموود حەفیدی بەپلەی حاکمی ناوچەی سلێمانی دامەزراند، وێڕای دامەزراندنی هەندێک سەرکردەی هۆزەکانی ناوچەکە وەکو حاکم بەسەر یەکە ئیدارییەکانی دەوروبەر لە ناوچەکەدا، پاشان لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا کۆلۆنێل ئەی. تی ولسن سەردانی شاری سلێمانی کرد و لەگەڵ کەسایەتی و سەرۆک هۆزەکانی ناوچەکەدا کۆبووەوە، دواتریش شێخ مەحموود یاداشتنامەیەکی ئاراستەی بریکاری گشتی حاکمی پادشایەتی لە بەغدا کرد کە ژمارەیەک لە داواکارییەکانی کوردی گرتبووە خۆی[٧]، لە وەڵامیشدا حاکمی گشتی ڕایگەیاند کە بەشێوەیەکی سەرەتایی بەو داواکارییانە ڕازییە و لە ڕووی ئەدەبیشەوە ستایشی شێخ مەحموود دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا شێخی لەوە ئاگادار کردەوە کە بەناوی حکوومەتی بەریتانییەوە حوکمی سلێمانی بکات و ڕێنمایی و ڕاسپاردەکانیشی بەجێ بگەیەنێ[٨]. ئینگلیزەکان پایەی حوکمدارییان بەشێخ مەحموود بەخشی[٩] بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی و موچەیەکی گەورەشیان بۆ بڕییەوە[١٠]، مێجەر نۆئیلیش وەکو ڕاوێژکارێکی پادشایی و مێجەر دانلیسیش وەکو ڕاوێژکارێکی سەربازی دامەزرێنران.

### ١- ڕاپەڕینی یەکەمی شێخ مەحموودی حەفید(ساڵی ١٩١٩):

دەکرێ بگوترێ کە مانۆڕ و مەبەستە نابەجێیەکانی بەریتانیا لە لایەک و ناتەواویی مەزەندەکردنی کاروبارەکان لە لایەن ئیدارەی کوردی و نەگونجانیان لەگەڵ سەردەم لە لایەکی دیکە، بووە مایەی پەلەکردن لە تێکچوونی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو لا، ئەوەبوو ئینگلیزەکان بۆ کەمکردنەوەی هەژموونی شێخ مەحموود هەموو هەواڵێکیان خستە

گەڕ، کاتێکیش شێخ مەحموود دەرکی بەبەدنیازیی ئینگلیز کرد، بڕیاری دا دەستپێشخەری بکات، ئەوەبوو لە ٢١ی مایسی ساڵی ١٩١٩ دەستی بەسەر شاری سلێمانیدا گرت و دەسەڵاتدارە سیاسییە بەریتانییەکانی دەسگیر کرد و خۆی بەحاکمی گشتی دامەزراند و دەستی بەسەر مەوجوداتی حکوومەت و کتێب و تۆمارە تایبەتییەکاندا گرت و ئاڵایەکی تایبەتیشی دیارکرد کە لە مانگێکی سوور و ئەرزییەکی سەوز پێکهاتبوو، دەستیشی کرد بەدەرکردنی پوولی تایبەتی پۆستە[١١].

دوای ئەوەی بارودۆخەکان لە سلێمانی و هەڵەبجە هێور بوونەوە، شێخ مەحموود بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی شاری کەرکووک ڕووی کردە تەنگەبەری تاسلووجە، ئەمەش بووە مایەی وروژاندنی دەسەڵاتی داگیرکەری بەریتانی و، لە ئەنجامیشدا بڕیاریان بەهێزەکانی خۆیان دا بەتایبەتی فرقەی ١٢ کە ئەوەی پێویست بێ بیکەن بۆ بنبڕکردنی بزووتنەوەکە، لە دوای شەڕێکی گەورەشدا کە لە هاوینەهەواری دەربەندی بازیان ڕووی دا و بەهۆی خیانەتکردنی یەکێک لە ئاغاکانی کورد لە هۆزی هەمەوەند[١٢]، هێزەکانی بەریتانیا توانییان جموجوڵێک بکەن و دەوری هێزەکانی کوردی بدەن و بیانشکێنن، هەروەها لە حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ و دوای بریندابوونی، ئینگلیزەکان شێخ مەحموودیان بەدیل گرت و لە لایەن دادگایەکی سەربازییەوە بڕیاری لە سێدارەدانی درا، ئینجا ئەو بڕیارە لە لایەن سەرکردەی گشتی هێزەکانی بەریتانیاوە بەبڕیاری زیندانی هەمیشەیی و دوورخستنەوە بۆ دوورگەی ئەندامان لە هیند گۆڕا[١٣]، دوای چەند کورتە شەڕێکی سووکیش هێزەکانی بەریتانیا دووبارە شاری سلێمانییان داگیرکردەوە[١٤].

**٢- گەڕانەوەی ئیدارەی ڕاستەوخۆی ئینگلیز بۆ سلێمانی و هەڵوێستی حکوومەتی عێراقی لە بارەیەوە:**

لە کاتی پێکهێنانی حکوومەتی عێراقیدا لە ٢٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠، مەندوبی سامی مافی کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی لەسەر ناوچە کوردییەکاندا هێشتەوە، ئەمەش تا کۆتایی ساڵی ١٩٢٢ درێژەی کێشا، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لایەنگیری ئەوە بوون کە ئەو ناوچانە بگێڕدرێنەوە سەر عێراق، ئەمەش زیاتر لە کاتی سەرهەڵدانی ناکۆکی سەبارەت بەیەکلاکردنەوەی ئەو ناوچانە لە نێوان عێراق و تورکیا سەری هەڵدا و دەرکەوت کە پاشان - وەک پێشتر باسی لێوە کرا- کۆمەڵەی نەتەوەکان دەخالەتی کرد[١٥].

دەسەڵاتدارانی ئینگلیز پێیان وابوو کە دابڕینی ئەو ناوچانە لە عێراق شتێکی وا ئاسان نییە چونکە ئەمە زەرەرمەندیی ئابووری لێ دەکەوێتەوە و مانای دوورخستنەوەی بەرهەمە کشتوکاڵی و ئاژەڵییەکانی کوردستان لە بازاڕە سروشتییەکانیان لە ناوەڕاست و باشووری عێراق دەگەیەنێ، هەروەها تێبینی نەبوونی پەیوەندی ئابووریش کرا لە نێوان کوردستانی باشوور و هەریەکە لە کوردستانی تورکیا و ئێران، جگە لەمە ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییانەی لە نێوان کوردی ویلایەتی مووسڵ و عەرەبی عێراقدا دروست بووبوون و پێشکەوتنێکی بەرچاویان بەخۆوە دیتبوو، بووە مایەی نزیکبوونەوەیەکی گەورە لە نێوان هەردوو میللەتی ناوبراودا، ئەوەبوو کورد بەروبوومەکانیان لە ئاژەڵداری و تووتن و ڕەژوو و گوێز و سماق و هی تر دەگەیاندە شارەکانی مووسڵ و بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق و بەنرخەکانیشی کەلوپەل و بەروبوومی دیکەیان دەکڕی کە لەو شارانە و دەوروبەرەکانیاندا گەشەیان سەندبوو[١٦].

سەبارەت بەو هەڵوێستەی دەسەڵاتدارانی ئینگلیزیش بەرامبەر بەناوچە کوردییەکان، مەندوبی سامی لە بەغدا لە ئایاری ساڵی ١٩٢١دا بەیاننامەیەکی گرنگی لەو بارەوە دەرکرد کە ئەمە دەقەکەیەتی:

«مەندوبی سامی پراکتیکییانە دەڕوانێتە ئەو ڕێوشوێنانەی کە دەبێ بەرامبەر بەئیدارەی ناوچە کوردییەکان لە عێراق بگرێنەبەر، پێشی ڕاگەیەنراوە کە ترسی ئەگەری بەستنەوەیان بەحکوومەتی بەغداوە لە ئارادایە، ئەو کارەی وای لە هەندێک کەس کردووە پەنا ببەنە بەر داواکردنی سیستمێکی سەربەخۆیی، لە هەمان کاتیشدا سەرکردایەتی گشتی کورد هەست بەپەیوەندییە ئابووری و پیشەسازییەکان دەکات کە بەعێراقیانەوە گرێ دەدات. لەو حاڵەتەشدا مەندوب دەخوازێ (ئەگەر کرا) هیواو داخوازییە ڕاستەقینەکانی کورد ئاماژەیان پێ بکرێ، لە کاتێکدا ئەگەر مانەوە لە ژێر سایەی حکوومەتی عێراق بەباشتر بزانن، ئەوا بەڕێزیان ئامادەیە ڕێگەچارەیەکی لەم جۆرە ئاراستەی ئەنجوومەنی دەوڵەت بکات[١٧]:

١- دەربارەی ئەو ناوچە کوردییانەی دەکەونە لیوای مووسڵ و چوارچێوەی ئینتیدابی بەریتانی، لیوایەکی فەرعی[١٨] پێکبهێنرێ قەزاکانی: زاخۆ- ئاکرێ- دهۆک- ئامێدی بگرێتە خۆی و دهۆک ببێتە مەڵبەندەکەی و لە ژێر دەسەڵاتی یاریدەدەری پارێزگارێکی بەریتانیشدا بێ و قایمقامەکانیش بەریتانی بن، دواتر چەند

فەرمانبەرێکی کورد و عەرەب شوێنیان دەگرنەوە، بەمەرجێک زمانی کوردی بزانن و مایەی ڕەزامەندی کوردیش بن.

لە ڕووی کاروباری دارایی و دادوەریشەوە ئەو لیوایە سەر بەحکوومەتی نیشتمانیی بەغدا دەبێ و نوێنەری خۆشی ڕەوانەی ئەنجوومەنی دامەزرێنەر دەکات. بەڵام دەربارەی کاروبارە پەیوەنددارەکان بەئیدارەی گشتی، قایمقامەکان دەگەڕێنەوە لای پارێزگار، لە لایەکی دیکەوە مەندوبی سامی بەڕاوێژ لەگەڵ حکوومەتی هەنووکەییدا دامەزراندنە ئیدارییەکان جێبەجێ دەکات.

٢- مەندوبی سامی لە مەسەلەی بەشداربوونی ئەفسەرە بەریتانییەکان لە ئیدارەی هەولێر و کۆیە و ڕواندز دەکۆڵێتەوە و لە کاتی دامەزراندنی فەرمانبەری حکومیشدا ڕەچاوی ویستی هاوولاتیان دەکات، درێژەی ئەمەش ئەوکاتە دەردەکەوێ کە بارودۆخەکان ڕێگە بدەن.

٣- وەکو پارێزگایەک مامەڵە لەگەڵ سلێمانیدا دەکرێ و لە لایەن موتەسەریفێکیشەوە حوکم دەکرێ بەمەرجێک مەندوب دایبمەزرێنێ و ڕاوێژکارێکی ئینگلیزیشی هەبێ، تا کاتی دەستنیشانکردنی موتەسەریفیش، حاکمی سیاسیی بەریتانی ئەرکەکانی جێبەجێ دەکات، دەسەڵات و تواناکانی موتەسەریفیش لە لایەن مەندوبەوە دیاردەکرێن پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ خودی موتەسەریف و ئەنجوومەنی دەوڵەت[١٩]، حاڵی حازریش قایمقامەکان بەریتانی دەبن ئینجا دوای دۆزینەوەی خەڵکانی خاوەن توانا بۆ ئەو ئەرکە، قایمقامی کورد شوێنیان دەگرنەوە[٢٠]».

هەروەها مەندوبی سامی لە بەغدا لە ٢٢ی شوباتی ساڵی ١٩٢١ و لە ڕێگەی سکرتێری خۆیەوە ئەو نووسراوەی بەژمارە ٣٣٣٠ ئاراستەی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق کردووە: «لە ئەنجوومەنی وەزیران شاراوە نییە کە پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ تورکیا جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی تورکیا نابێت نابەدڵیی ولاتانی هاوپەیمانان بکات لە کاتێکدا ئەگەر ناوچە کوردییەکانی سەر بەلیوای مووسڵ لە ماوەی ساڵێک لە مێژووی مۆرکردنی ئاشتی لەگەڵ تورکیا بیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ حکوومەتی کوردستان، لە لایەن خۆشیەوە مەندوبی سامی دان بەبەرژەوەندییە ئابوورییەکان و هی تریشدا دەنێ کە لیوای سلێمانی بەعێراقەوە دەبەستنەوە، بۆیە بۆ بەڕێزیان دەردەکەوێ کە ئەوەی لە تواناندا بێ بۆ گەلی کورد و حکوومەتی نیشتمانیش بکرێ لە ڕێگەی پێکهێنانی ئیدارەیەک لە لیوای

سلێمانی کە کاروبارەکانی لە لایەن بەرێزیانەوە بەڕێوە ببرێن بەراوێژکردن لەگەڵ وەزیراندا لەجیاتی ئەو شێوازەی ئێستا. واتە دەستەیەکی وەزاری بەراوێژ لەگەڵ مەندوبی سامیدا کاروبارەکان بەڕێوەببات، ئەو ئیدارەیەش کاتیی دەبێت و دوای تەواوبوونی ئەو ماوەیەی کە لە پەیماننامەی ئاشتیدا بۆی دیارکراوە سەرلەنوێ چاوی پێدا دەخشێنرێتەوە.

سێر برسی کوکسیش سیاسەتێکی وا پیادە دەکات دوورنییە ببێتە مایەی پشتگیریکردن لە ئۆتۆنۆمیی، لەو ڕووەشەوە ژمارەی بڕیارە کارپێکراوە بەریتانی و هیندییەکانی کەم کردۆتەوە و دەستیشی کردووە بەدامەزراندنی قایمقامی نیشتمانی، جگە لەمە بەڕێزیان بیر لە دامەزراندنی موتەسەریفێک بۆ لیوای سلێمانی دەکاتەوە، سیاسەتیش ئەگەرچی لە عێراق و سلێمانیدا یەک مەبەست و ئامانجی هەیە، بەڵام دەبێت گەڕانەوەی موتەسەریفی لیوای سلێمانی ڕاستەوخۆ لەگەڵ مەندوبی سامی بێت لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ وەزیران بێ، لەو بارەشەوە بەڕێزیان مەبەستیەتی بۆچوونی ئەنجوومەنی وەزیران بزانێ هیواداریین ئەوان بەو پلانە ڕازی بن[٢١]»

لە وەڵامی ئەو نووسراوەشدا ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق لە ٧ی ئاداری ساڵی ١٩٢١دا ئەو پێشنیازەی خوارەوەی خستە ڕوو:

«دوابەدوای نووسراوی ژمارە ٤/٣٣٣٠ی ٢٢ی شوباتی ١٩٢١ی مەندوبی سامی کە پەیوەندی بەبەڕێوەبردنی کاروباری لیوای سلێمانییەوە هەیە، ئەنجوومەن بەکۆی دەنگ بڕیاری ئەمەی خوارەوەی دا:

بەهۆی گرنگیی پێگەی جوگرافی لیوای سلێمانی و ئەو پەیوەندییە ئابووری و سیاسییانەشەوە کە دەیبەستنەوە بەعێراق و دابونەریتە هاوبەش و کۆنەکانی نێوان هەردوو لا، ئەنجوومەنی وەزیران پێشنیازی هێشتنەوەی کۆن لەسەر کۆنیەتی خۆی و یەکخستنی ئیدارەی عێراق و لیوای ناوبراو ئاراستەی مەندوبی سامی دەکات، لیوای ناوبراویش لە هەموو کاروبارەکانیدا دەبێ وەکو تەواوی لیواکانی دیکەی عێراق مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ[٢٢].

پێشنیازێکی لەو جۆرەش نەبووە مایەی ڕەزامەندی مەندوبی سامی، بۆیە- وەکو باس کرا- تا کۆتایی ساڵی ١٩٢٢ ڕاستەوخۆ سلێمانی لە لایەن خۆیەوە بەڕێوە دەبرا.

### ٣- گەڕاندنەوەی شێخ مەحموودی حەفید لە مەنفاکەی لە هیندەوە (هیندستان)ەوە بۆ سلێمانی:

لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٢دا بارودۆخەکان لە سلێمانی ڕوویان لە ئاڵۆزبوون کرد بەهۆی دزەکردنی ئۆزدەمیری سەرکردەی تورکی[٢٣] بۆ ناوچە کوردییەکان و بەهاندانی هۆزەکان لەسەر یاخیبوون، ئەوەبوو بارودۆخەکان ورووژانێکی دیکەیان بەخۆوە دیت کاتێک ئەو سەرکردە تورکە پێشڕەویی کرد و گەیشتە ڕانیە، ئەمە بووە مایەی هەڕەشە بۆ سەر سلێمانی و تەواوی ناوچەکانی دەوروبەر و بڵاوبوونەوەی ترس لە نێوان هاووڵاتیاندا، ئەم پێشهاتە کاردانەوەیەکی گەورەی هەبوو بۆ سەر بەرپابوونی شۆڕشی هەمەوەند- هۆزێکی کوردە لە ناوچەی چەمچەماڵ و دەوروبەریدا لەسەر ڕێگەی نێوان کەرکووک و سلێمانی دەژیت- لە دژی دەسەڵاتدارانی بەریتانی، ئەو کارەش دەسەڵاتدارانی ڕووبەڕووی ئیحراجی کردەوە و ناچاری کردن پەناببەنە بەر پیادەکردنی سیاسەتی ئاسن و ئاگر کە دوورنییە دەرەنجامی پێچەوانەی لێ بکەوێتەوە، بەڵام ئەوان لەجیاتی گرتنەبەری سیاسەتێکی لەو جۆرە وایان بەباش زانی شێخ مەحموودی حەفید لە مەنفاکەی لە هیند بگەڕێننەوە و ئیدارەی ناوچەکەشی بدەنەوە دەست، هەرواش کرا، ئەوە بوو سەرەتا گواستیانەوە بۆ کوێت ئینجا هێنایانەوە عێراق، دوای گەڕانەوەشی بۆ سلێمانی پێشوازییەکی گەرموگوڕی لێ کرا.[٢٤] شێخ مەحموود دووبارە دەستی کردەوە بەدامەزراندنەوەی تەشکیلاتە کوردییەکان و کۆششێکی گەورەشی خستە گەڕ لە پێناوی فراوانکردنی دەسەڵات بەسەر کەرکووک و هەولێر و لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا توانی وەزارەتێکی نەتەوەیی پێکەوە بنێ و لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵیشدا خۆی کردە مەلیکی کوردستان، لە بەرامبەریشدا ئینگلیزەکان بەو حکوومەتە خۆجێییە کوردییە ڕازی نەبوون و بەنابەجێیی ئیدارە[٢٥] تۆمەتباریان کرد.

لە کۆتایی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢شدا مەندوبی سامی لە بەغدا ئەو ڕاگەیاندنەی خوارەوەی دەرکرد: «حکوومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی و حکوومەتی عێراق دان بەمافی ئەو کوردانەدا دەنێن کە لە چوارچێوەی سنووری عێراق دەژین، دەشتوانن لە چوارچێوەی ئەو سنوورەدا حکوومەتێکی کوردی دابمەزرێنن، هەردوو حکوومەتیش هیوادارن کە لایەنە کوردییەکان لە نێوان خۆیاندا بگەنە ڕێککەوتن دەربارەی ئەو شێوازەی کە دەخوازن حکوومەتەکەی لەسەر بونیاد بنێن و ئەو سنوورانەش کە دیاردەکرێن. سەبارەت بەجۆری

پەیوەندییە ئابووری و سیاسییەکانیش لەگەڵ حکوومەتی خاوەن شکۆی بەریتانی و حکوومەتی عێراق نێردراوی خاوەن دەسەڵات بنێرنە بەغدا[٢٦]».

دواتر دەرکەوت کە ئەو ڕاگەیاندنە تەنیا مانۆڕێکی سیاسیی بەریتانی بووە. بۆ فشار خستنە سەر حکوومەتی عێراق بۆ مۆرکردنی پەیماننامەی عێراقی - بەریتانی هەروەها نامەیەکی ناڕاستەوخۆش بووە بۆ تورکیا کە لەسەر ویلایەتی مووسڵ لەگەڵ بەریتانیا و عێراق ناکۆک بوو، دەبێ بزانرێ ئەم ڕاگەیاندنە تاکە پەیمان نەبووە کە بەریتانیا لە دوای دەستەبەرکردنی ئامانجەکانیدا لێی پەشیمان بیتەوە، بەڵکو لە ڕابردوودا زۆرجار لە پەیمانی دیکەی لەو جۆرە پاشگەز بۆتەوە.

## ٤- ڕاپەڕینی دووەمی شێخ مەحموودی حەفید لە ساڵی ١٩٢٢ - ١٩٢٧ و گێڕانەوەی سلێمانی بۆ ئیدارەی ڕاستەوخۆی عێراقی:

شێخ مەحموود کە خۆی بەمەلیکی کوردستان ڕاگەیاندبوو، لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢دا بەهاوکاری هۆزە گرنگەکانی ناوچەکە دەستی کرد بەبەهێزکردنی هەژموونی خۆی، بەڵام لە بەدبەختی دەرکەوت کە شێخ لە ئەزموونی ڕابردوویدا لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئینگلیز سوودی وەرنەگرتووە، ئەوەبوو دووبارە ئەو سنوورانەی بەزاندنەوە کە بەریتانییەکان بۆیان دیارکردبوو لە ڕێگەی ئۆزدەمیری سەرکردەی تورکی کە لە نزیک ڕواندزبوو، سەرقاڵی نزیکبوونەوە بوو لە تورکیای دوژمنی ئینگلیز، جگە لەمە دەستی کرد بەپەیوەندی بەستن لەگەڵ دوژمنانی تری ئینگلیز کە سۆڤییەتەکان بوون.

ئەو هەڵوێستەی شێخ هەڕەشەیەکی گەورەی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا هەبوو لە ناوچەکەدا.

کاتێکیش بەریتانیا و عێراق درکیان بەنیاز و کردەوەکانی شێخ کرد کە مایەی هەڕەشە بوون بۆ سەر بەرژەوەندییەکانیان، لە ژێر فشاری بۆردوومانکردنی ئاسمانییەوە ئاگاداریان کردەوە کە دەبێ شاری سلێمانی جێبهێڵێ، ئەوەبوو شێخ شاری چۆڵ کرد و پەنای بردە بەر چیاکانی دەوروبەر، بەر لەوەی لە ڕۆژی ٤ی ئاداری ١٩٢٣ فڕۆکە بەریتانییەکان شار بۆردومان بکەن[٢٧].

لە دوای مۆرکردنی پرۆتۆکۆلی ٣٠ نیسانی ساڵی ١٩٢٣ش لە نێوان عێراق و بەریتانیا، مەندوبی سامی لە مەسەلەی هێشتنەوەی سلێمانی لە ژێر حوکمی ڕاستەوخۆی خۆی پەشیمان بووەوە و وەکو باقی لیواکانی دیکەی عێراق حیساب کرا. لە دانیشتنی

ڕۆژی ۱۱ی تەمموزی ساڵی ۱۹۲۳شیدا ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق وەکو هەوڵێک بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخ و دڵ و دەروونەکان ئەو بڕیارانەی خوارەوەی دەرکرد:

١- جگە لە کارمەندە تەکنیکارەکان، حکوومەت نیازی دامەزراندنی هیچ کارمەندێکی عەرەبی نییە لە قەزا کوردییەکاندا.

٢- لە مامەڵە ڕەسمیەکانیشیاندا حکوومەت نیازی ناچارکردنی دانیشتوانی قەزا کوردییەکانی نییە لەوەی زمانی عەرەبی بەکاربێنن.

٣- لەو قەزا ناوبراوانەدا دەبێ هەموو مافەکانی هاووڵاتیان و وەزیفە ئایینی و مەدەنییەکان بپارێزرێن[٢٨].

بەڵام شێخ مەحموود دووبارە گەڕایەوە و هێرشی بردە سەر شاری سلێمانی و لە تەمووزی ساڵی ۱۹۲۳دا دەستی بەسەرداگرت و سەر لەنوێ کاروبارەکانی بەڕێوە دەبرد.

ئەو گفتوگۆیانەش کە لە لۆزان لە نێوان هاوپەیمانان لە لایەک و تورکیا لە لایەکی دیکە لە ئارادا بوون، مۆرکردنی پەیماننامەی لۆزانیان لە ٢٤ی تەمووزی ساڵی ۱۹۲۳ لێ کەوتەوە و تیایدا باس لە کورد نەکرابوو، بەمەش قوربانیدان بەبەرژەوەندییەکانی گەلی کورد وەکو خەڵاتێک وابوو کە هاوپەیمانان لە پێناوی نزیکبوونەوە و مسۆگەرکردنی دۆستایەتی لەگەڵیدا بەتورکیایان بەخشی[٢٩].

ئەو بارودۆخانەش کە لە دوای مۆرکردنی پەیماننامەی لۆزان هاتنە پێشەوە پاڵیان بەئینگلیزەکانەوە نا کە دووربوونەوە لە کورد و ڕەتکردنەوەی مافەکانیان بکەنە ڕێگەیەک بۆ خۆنزیککردنەوە لە تورکیا و ئێران و عێراق[٣٠].

تا نزیکەی ساڵێکیش، واتە تا تەمووزی ساڵی ۱۹۲٤، شێخ مەحموود حوکمی سلێمانی کرد، ئەوەبوو حکوومەتی عێراق بەیارمەتی هێزی ئاسمانی بەریتانی توانی دووبارە کۆنترۆڵی ئەو شارە بکاتەوە و سەرلەنوێ شێخی ڕاپەڕیو وەدەربنێتەوە و ئەویش پەنا بباتەوە بەر ناوچەی شاخاویی دەوروبەر، تا ئەو کاتەش کە لە ساڵی ۱۹۲۷ ناچارکرا لە عێراق بچێتە دەرەوە و ڕووبکاتە ئێران، شێخ توانی لەو چیایانە بژیت و خۆی پەنا بدات[٣١].

وەک لەمەوبەریش باسمان کرد، لە ٢٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۲٥دا لیژنەی لێکۆڵینەوەی سەر بەکۆمەڵەی گەلان بەمەبەستی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بەچارەنووسی ئەو ویلایەتە گەیشتە مووسڵ و سەردانی هەموو لیوا و زۆربەی شار و

شارۆچکەکانیشی کرد و لە ئەنجامیشدا ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلی سەبارەت بەچارەنووسی ئەو ویلایەتە ئامادەکرد، لە ماوەی لێکۆڵینەوەکانی لیژنەکەشدا هەڵوێستی کورد ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەوەبوو بەهەموو ڕاشکاویەک گەڕانەوەیان بۆ عێراق بەباشتر زانی لە مانەوە لە ژێر دەسەڵات و هەژموونی تورکی... دەربارەی بۆچوونی خەڵکی شاری سلێمانی، ئێم. دی. فیرسن لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت: جگە لە ژمارەیەک بۆچوونی کەم نەبێ، ئەو کەسانەی دیمانەمان لەگەڵ کردن، حکوومەتی عێراقییان بەباشتر زانی... لیژنە قەناعەتی تەواوی بەوە هێنا کە خەڵک ئازادانە ویستەکانی خۆیان دەربڕیوە... ئەوەمان بینی کە هەستی نەتەوایەتی کوردی ئەگەرچی هێشتا لەسەرەتادایە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەربڵاو و مەعقولە، خەڵکیش ئارەزووەکانی کۆتایی خۆیان دەربارەی سەربەخۆیی دەربڕی بەڵام درکیشیان بەسوودەکانی (وسایەت) کردووە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئاماژەیە بۆ بیرکردنەوەیەکی بەرفراوان و قووڵ(٣٢).

### ٥- یاسای ساڵی ١٩٣٠ی زمانی کوردی لە عێراق:

حکوومەتی عێراق لە ١٠ی نیسانی ساڵی ١٩٣٠دا بڕیاری دەرکردنی یاسای زمانی کوردی دا، ئەمەش لە بەیانی ١٠ی نیسانی ساڵی ١٩٣٠ ئەنجوومەنی وەزیراندا هاتووە و تیایدا باس لەمەی خوارەوە کراوە:

دوای ئەوەی وەزارەت کاروباری گرتە دەست، دەخوازێ بایەخ بەو شتانە بدات کە گرنگن و لەگەڵ ویست و خواستەکانی میللەت دەگونجێن لەوانە هەندێک لەو کێشانەی پەیوەندییان بەبەشێک لە دانیشتوانی لیواکانی باکورەوە هەیە، بۆیە بڕیاری دا لیستێکی یاسایی ئامادە بکات و لە کاتی کۆبوونەوەی داهاتوویدا ئاراستەی ئەنجوومەنی گەل بکرێ بۆ ئەوەی بەپێی ماددەی ژمارە ١٧ لە یاسای بنەڕەتیدا زمانی کوردی لە ناوچە کوردییەکاندا بکرێتە زمانی ڕەسمی، هەروەها حکوومەت سوورە لەسەر پیادەکردنی پلانێک کە گیانی ئەو پەیمانانە بگرێتە خۆی کە پێشتر لە عێراق بەکورد دراون(٣٣). ئەوەبوو بەشێوەیەکی کردەیی ئەنجوومەنی گەل دەستی کرد بەداڕشتنی یاسای ئاماژە پێکراو(٣٤).

### ٦- کاردانەوەی پەیماننامەی چوارەمی عێراقی- بەریتانی لەسەر کورد:

مۆرکردنی پەیماننامەی چوارەمی عێراقی- بەریتانی لە ٣٠ حوزەیرانی ١٩٣٠دا

خراپترین ئاسەواری هەبوو بۆ سەر دەروونی کورد لە عێراق بەو پێیەی کە تیایدا باس لە مافەکانی ئەوان نەکرابوو[٣٥].

بۆیە دەستیان بەهەڵمەتێکی پرۆتستۆکردنی بەرفراوان کرد و چەندین بروسکەی ناڕەزایییشیان ئاراستەی بارەگای کۆمەڵەی گەلان لە ژنێڤ و مەندوبی سامی لە بەغدا و حکوومەتی عێراقی کرد، کارێکی لەو جۆرە حکوومەتی بەریتانی و عێراقیشی ناچارکرد کە شاندێکی هاوبەش پێک بهێنن[٣٦]، شاندەکە سەردانی لیوا کوردییەکانی (کەرکووک و سلێمانی و هەولێر)ی کرد و لەگەڵ چین و توێژەکانی کۆمەڵ کۆبوونەوە و چەندین وتاریش خوێنرانەوە کە دەلالەتیان لە نیازپاکی حکوومەتی عێراق دەکرد و هێوربوونەوەشیان دەخستە دڵ و دەروونی کورد.

لە ژنێڤیش لیژنەی ئینتیداباتی سەر بەئەنجوومەنی گەلان چاوی بەو یاداشتنامەیەدا خشاند کە لەو بارەوە ئاراستەی کرابوو و وای بەچاک زانی ئەمەی خوارەوە بخاتە بەردەمی ئەنجوومەنی گەلان:

١- وەڵامی یاداشتنامەی کەسایەتییە کوردییەکان بدرێتەوە و لە ژێر سەرپەرشتی ئەنجوومەنی گەلانیشدا کار بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی بکرێ.

٢- داوا لە دەوڵەتی مونتەدەب بکرێ کە تێبینی ئەوە بکات ڕێوشوێنە تەشریعی و ئیدارییەکان کە لە پێناوی زامنکردنی بارودۆخی کورد دانراون بەهەند هەڵبگیرێن و بەبێ هیچ کەموکوڕی و درێغییەکیش دەست بەجێبەجێکردنیان بکرێ.

٣- بڕوانرێتە حیکمەتی گرتنەبەری ئەو ڕێوشوێنانەی دەبنە مایەی مانەوەی ئەو بارودۆخە بۆ کورد لە کاتێکدا ئەگەر عێراقیش لە ویسایەتی دەوڵەتی مونتەدەب ڕزگاری ببێ.[٣٧]

### ٧- ڕووداوەکانی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠:

لە بڕگەی ڕابردوودا باس لە ناڕەزایییەکانی کورد کرا بەرامبەر پەیماننامەی چوارەمی عێراقی- بەریتانی، یەکێک لە کاردانەوەکان بەشدارنەبوونیان بوو لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران لە کوردستاندا، لە ٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ چەند خۆپیشاندانێکی میللی بەرپابوون و هەموو چین و توێژەکانی خەڵکی شار بەشدارییان تیادا کرد، لە ئەنجامیشدا پێکدادانی خوێناوی لە نێوان هێزەکانی پۆلیس و خەڵک ڕووی دا، کاتێکیش هێزەکانی پۆلیس نەیانتوانی کۆنترۆڵی بارودۆخەکان بکەن، داوای

یارمەتیان لە سوپای پڕ چەک کرد ئەوانیش ئاگریان بەسەر خۆپیشاندەراندا باراند و دوای زەرەرمەندییەکی گەورەی مرۆیی بڵاوەیان پێکرا، بەیاننامەی ئەنجوومەنی وەزیران لە ٢١ی ئەیلوولی ١٩٣٠[٣٨] باس لەوە دەکات کە ژمارەی قوربانییانی خۆپیشاندەران (١٣) کوژراو و (٢٣) بریندار بووە و لە لایەنی حکوومەتیش سەربازێک کوژراوە و سێ سەرباز و نۆ پۆلیسیش برینداربوون، لە ڕاپۆرتە نارەسمییەکانیشدا[٣٩] هاتووە کە ژمارەی قوربانییان لە ناو خەڵک زۆر لەوە زیاتر بووە و گەیشتۆتە (٤٥) کوژراو و (١٩٥) بریندار لەگەڵ دەسگیرکردنی ژمارەیەک کەسایەتی شار[٤٠] بەتۆمەتی هاندان و بەشداریکردن لە خۆپیشاندانەکان و ڕەوانەی کەرکووک کران، بۆیە ئەم ڕۆژە لە شاری سلێمانی بەڕۆژی ڕەش ناوزەدکراوە[٤١].

٨- ڕاپەڕینی سێیەمی شێخ مەحموودی حەفید لە ساڵی ١٩٣٠- ١٩٣١:

مۆرکردنی پەیماننامەی چوارەمی عێراقی- بەریتانی و ڕووداوەکانی ٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ لە سلێمانی وایان لە شێخ مەحموودی حەفید کرد کە مەنفاکەی خۆی لە ئێران جێ بهێڵێ و سەرلەنوێ بگەڕێتەوە عێراق و بەندەکانی ئەو ڕێککەوتنەش پێشێل بکات کە لەگەڵ حکوومەتی عێراق مۆری کردبوو و خەڵکێکی زۆری ناوچەکەش پەیوەندییان پێوە کرد، ئەمەش بووە مایەی هەڕەشەیەکی گەورە بۆ هەڵوێستی حکوومەتی عێراق، بەتایبەتی دوای ئەوەی شێخ یاداشتنامەیەکی ئاراستەی مەندوبی سامی لە بەغدا کرد و تیایدا داوای دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردیی لە ناوچە کوردییەکاندا کرد کە لە زاخۆوە تا خانەقین بگرێتە خۆی و حکوومەتەکە لە ژێر ئینتیدابی بەریتانیدا بێت، بەڵام لە بەرامبەر ئەو داواکارییانەدا هیچ وەڵامێکی نەدرایەوە[٤٢]، بگرە لەجیاتی ئەوە مەندوبی سامی لە بەغدا و وەزیری ناوخۆ داوایان لێ کرد بگەڕێتەوە ئەودیوی سنوورەکان، بەڵام شێخ ئەو ئاگادارییانەی ڕەت کردەوە و لە ئەنجامیشدا لە ناوچەکانی چوارتا و پێنجوین لە باکووری سلێمانی[٤٣] پێکدادانی چەکداری لە نێوان هەردوو لا بەرپابوو، ئەم پێکدادانانە لە مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٣٠ تا ١٣ی ئایاری ساڵی ١٩٣١ درێژەیان کێشا، واتا ئەو کاتەی شێخ مەحموود خۆی دایە دەستی دەسەڵاتدارانی عێراق و پاشان گوازرایەوە بۆ سەماوە ئینجا بۆ ناسریە، دواتر گەڕاندرایەوە بۆ بەغدای پایتەخت و ڕێگەی ئەوەی پێدرا تیایدا نیشتەجێ ببێت دوای ئەوەی دەسەڵاتداران بڕیاریان دا دەست بەسەر ماڵ و موڵکیدا بگرن[٤٤].

**٩- هەوڵی شێخ مەحموودی حەفید بۆ بەرپاکردنی ڕاپەڕینی چوارەم لە ساڵی ١٩٤١دا:**

دوای هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهان، هیواکانی کورد بەئۆتۆنۆمی گەشانەوە، لە ئەنجامی پەرەسەندنی گیانی نەتەوەخوازیی لە ڕیزی ڕۆشنبیرانی کورد و دەرکەوتنی ڕێکخستنە حزبییە کوردییەکانی وەک حزبی هیوا، هەروەها لە ئەنجامی هاندانی ئەو گیانە نەتەوەیییە و باسکردنی ئۆتۆنۆمی لە لایەن هەندێک دەوڵەتی وەک وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیاوە[٤٥].

وەکو بەردەوامبوونێکیش لەسەر سیاسەتی مانۆڕ و هەڵخەڵەتاندن، جارێکی دیکە و لە کاتی بەرپابوونی شۆڕشی مایسی ١٩٤١ لە عێراق[٤٦] بەریتانیا خۆی لە کورد نزیک دەکاتەوە، شێخ مەحموودی حەفیدیش ئەوکاتە لە ژێر ئیقامەی سەپێنراودا لە بەغدا دەژیا و ڕووداوەکانی ئەو شۆڕشەی قۆزتەوە و گەڕایەوە سلێمانی و خۆی بۆ بەرپاکردنی ڕاپەڕینێکی تازە ئامادە کرد. لە ٧ی حوزەیرانی ١٩٤١دا داواکارییەکی ئاراستەی سەرکردە و سەرۆک هۆزەکانی کورد کرد و پێی ڕاگەیاندن کە خۆیان کۆبکەنەوە و یەک بگرن و لە پێناوی خزمەتکردنی نیشتمان و بەرژەوەندی گشتیدا تێ بکۆشن[٤٧]، لە ئەنجامیشدا ژمارەیەک سەربازی کورد چوونە پاڵ شێخی ڕاپەڕیو و پێشنیازیشی کرد ئەرکی بەڕێوەبردن بخرێتە ئەستۆی لایەنە خۆماڵییەکان وێڕای گرنگیی پێکهێنانی هێزێکی خۆماڵی کوردی بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی پاراستنی ئاسایش[٤٨]، بەڵام ئەو پێشنیازانە لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە ڕەت کرانەوە بەریتانیاش دوای ئەوەی شۆڕشی مایسی لەناوبردو عەبدولئیلای میری هەڵاتووشی بۆ دەسەڵات گێڕایەوە، جارێکی دیکە پشتی لە کورد کردەوە، ئەمەش بووە مایەی بێ ئومێدیی شێخ مەحموودی حەفید و درککردنی بەوەی کە لە سایەی بارودۆخە تازەکاندا سەرنەکەوتن دەبێتە چارەنووسی هەر جموجۆڵێک کە ئەنجامی بدات، بۆیە شێخ مەحموود لەگەڵ عەقید نورەدین مەحموودی نێردراوی حکوومەتی عێراق لەسەر کۆتایی هێنان بەیاخیبوونەکەی ڕێک کەوت لە بەرامبەر چەند مەرجێکی کەسێتی ساکاردا، ئەوەبوو حکوومەت ڕێگەی پێدا لە گوندی (داری کەلی) سەقامگیر بێ و هەموو هەینییەکیش بەمەبەستی نوێژکردن بچێتە سلێمانی لە بەرامبەر ناردنی شێخ لەتیفی کوڕی بۆ بەغدا وەکو دووپاتکردنەوەی نیازپاکی، بەوەش حکوومەت حاڵەتی ئەحکامی عورفی هەڵگرت و هێمنی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشایەوە[٤٩].

## دووەم: بزووتنەوەکانی بارزان:

### ڕاپەڕینی هەردوو ساڵی ١٩٣١ - ١٩٣٢ای بارزان:[٥٠]

دوای شەهید بوونی شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی برا گەورەی لەسەر دەستی والیی عوسمانی لە مووسڵ، لە کۆتایی ساڵی ١٩٤١، شێخ ئەحمەدی بارزانی ڕێبەرایەتی ئایینی وەرگرت لە بارزان. حکوومەتی بەریتانیش کە لە عێراق مونتەدەب بوو، بەرامبەر بەدەسەڵات و پەیوەندی پتەوی شێخ ئەحمەد لەگەڵ ڕۆڵەکانی هۆزەکەیدا ڕازی نەبوو کە دڵسۆزییەکی ڕەهایان بەرامبەر بەخۆی و دەسەڵاتی لە ناوچەکەدا دەنواند، جگە لەوە شێخ ئەحمەد بەوە ناسرابوو کە ڕاشکاوانە دژایەتی داگیرکاریی ئینگلیزی دەکرد هەروەها داوای مافە ڕەواکانی کوردی دەکرد، پەیوەندی گەرموگوڕیشی لەگەڵ سەرکردەکانی دیکەی کورد لە کوردستانی تورکیادا هەبوو لەوا نە شێخ سەعیدی پیران و شێخ عەبدولقادری کوڕی سەید عوبەیدوڵڵای نەهری[٥١].

لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوە ئینگلیزەکان بڕیاریان دا یەکەم دەرفەت بقۆزنەوە و تۆڵە لە شێخ و لە هۆزەکەی بسەننەوە و لە دەسەڵاتیشی دووربخەنەوە، بەڵام ئەوان چاوەڕێی کاتی گونجاویان دەکرد[٥٢].

سەرەتا دەستیان کرد بەهەڵگێڕانەوەی هۆزەکانی دەوروبەری وەک برادۆستییەکان و هاندانیان بۆ ئەوەی شەڕ بەبارزانییەکان بفرۆشن، بەڵام ئەوە هەموو مەبەستەکانی نەپێکا بۆیە بڕیاریان دا ڕاستەوخۆ لەگەڵ شێخ ئەحمەد ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە، سەرەتای ئەو ڕووبەڕوو بوونەوانەش لە (٩)ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣١ ڕووی دا کاتێک لە بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا هێزێکی سوپا کە بەفەوجێک مەزەندە دەکرا، بەمەبەستی ناچارکردنی شێخ لە خۆ بەدەستەوەدان و دەسگیرکردنی گەیشتە نزیک گوندی بارزان، بەڵام ئەو هەوڵە بەرەتکردنەوەی خۆبەدەستەوەدانی شێخ و ناچاربوون لە بەرگریکردن لە خۆ شکستی هێنا و هێزە هێرشبەرەکەش ناچارکرا پاشەکشە بکا و هەڵبێت، ژمارەیەکی زۆریش کوژراو و دیل و کەلوپەلی لە دوای خۆی جێهێشت[٥٣].

بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگر لە بەردەمی حکوومەتی عێراق و ئینگلیزەکاندا کە هەوڵی دیکە بدەن بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە و دەرکردنی شێخ ئەحمەد، ئەوە بوو لە بڕیارێکی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقدا کە لە دانیشتنی ڕۆژی ١٢ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٢ دەرکرا، هاتووە:

«بەهۆی زیادەڕۆیی شێخ ئەحمەد لە یاخیبوون و بەردەوامبوونی لەسەر هێرشبردن بۆ سەر ئەندامانی ئەو هۆزانەی کە لە ژێر دەسەلاتیدا نین و ڕازی نەبوونی بەبەخشینی باج و لە پێناوی دامەزراندنی ئیدارەیەکی مەدەنی ڕێکوپێک لە ناوچەی بارزان، ئەنجوومەنی وەزیران لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٣٢/١/١٢ بڕیاری دا ناحیەیەک لە ناوچەکانی شێروان و باروش (بارزان) و مزووری بالا دابمەزرێنێ و لە هەر ناوچەیەکیشدا باڵەخانەیەک بۆ ناوەندی ناحیە و دوو مەخفەری پۆلیس بنیات بنێ، لە کاتێکیشدا کە هەردوو وەزارەتی ناوخۆ و بەرگری ڕێک دەکەون، دەبێ جموجۆڵ لە دژی شێخ ئەحمەدی بارزانی بەردەوامیی هەبێ[٥٤]»

لەو بەیاننامەیەدا ئاستی ئەو هەڵخەڵەتاندن و ناڕاستییانە دەردەکەون، ئەوانەی شێخ ئەحمەد بەدەست درێژبکەر و یاخیبوو وەسف دەکەن- بەپێچەوانەی واقیع- هەروەها بەیاننامەکە ئیدیعای ئەوە دەکا کە باج نادات، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بیانوویەکی دەستکردە، چونکە پێشتر شێخ سەبارەت بەبەخشینی باجی مەڕ و مالات لەگەڵ حکوومەت ڕێککەوتبوو، بەمانای ئەوەی هەموو ساڵێک شێخ بڕە پارەیەکی دیاریکراو بۆ مەڕ و مالاتی خۆی تەسلیم بکات، بەبێ ئەوەی ژمارەی ئەو مەڕ و بزنانە دیاربکرێ، کاتێکیش حکوومەت ویستی شەڕ لە دژی شێخ بەرپا بکات و کۆتایی بەدەسەلاتی بهێنێ، لە ڕێککەوتنی پێشووی پاشگەز بووەوە و ڕاشیگەیاند کە دەیەوێ باجی مەڕ و مالاتی لەسەر بنەمای کودە لێ وەربگرێ کە باجێکی ڕێژەییە و پشت بەژماردنی مەڕ و مالات و وەرگرتنی باج لەسەر کۆی ئەو ژمارەیە دەبەستێ[٥٥].

لە بەرامبەریشدا شێخ ئەحمەد بەمە ڕازی بوو بەلام حکوومەت ئەمجارە بیانوویەکی دیکەی بەکارهێنا ئەویش چوونی بوو بۆ ناوچەکە بەمەبەستی دروستکردنی مەخفەری پۆلیس.[٥٦] بەمەش دەردەکەوێ کە مەسەلەکە تەنیا بریتی بووە لە بیانوو و عوزر هێنانەوەیەک بۆ هەڵوێستی حکوومەت کە بریتییە لە سووربوون و پێشتر بڕیاردان لەسەر هێرشبردن بۆ سەر شێخ ئەحمەد و هۆزەکەی، چونکە ئەو ئامادە نییە سازش بۆ دەسەلاتدارانی بەریتانی و بۆ کلکەکانی بکات بۆیە مایەی هەڕەشەیە.

لەو پێناوەدا حکوومەتی عێراق بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە لە بارزانییەکان خۆی بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێکی بەرفراوان ئامادەکرد و هێزێکی سەربازیی مەزنیشی لە ناوەندی شارۆچکەکانی ئاکرێ و ئامێدی و ڕواندز ئامادەکرد[٥٧] هێزی ئامادەکراو لە نیوەی یەکەمی ئاداری ساڵی ١٩٣٢دا و بەهاوکاری هێزی ئاسمانی مەلەکی بەریتانی

(R.A.F)[٥٨] دەستی بەهێرشەکانی خۆی کرد و چەندین شەڕی توندوتیژ بەرپابوون تیایاندا هەردوو لا و دانیشتوانیش دووچاری زەرەرێکی گەورەی گیانی و ماڵیی بوونەوە. کاتێک شێخ ئەحمەد دڵنیا بوو لە نەبوونی پارسەنگ لە تەرازووی هێزەکاندا و نەتوانینی هۆزێکی بچووک لە وەستان بەرامبەر بەدوو حکوومەت کە یەکێکیان ئیمپراتۆریەتی بەریتانییە کە بەبەهێزترین و دەسەڵاتدارترین دەوڵەت دادەنرا و لە پێناوی دانانی سنوورێک بۆ زەرەرمەندییەکان، شێخ بڕیاری دا عێراق جێبهێڵێ و پەنا بباتە بەر تورکیا، ئەوەبوو لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩٣٢دا لەگەڵ براکانی و نزیکەی ١٠٠ کەسی دیکە چوونە ناو خاکی تورکیا، دوای تێپەڕبوونی ساڵێکیش حکوومەتی تورکیا شێخ ئەحمەدی تەسلیمی عێراق کردەوە و لە ئەنجامیشدا براو شوێنکەوتووەکانی گەڕانەوە ناوچەی بارزان و لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٣٣دا توانییان حکوومەتی عێراق ناچار بکەن کە جارێکی دیکە شێخ بگێڕێتەوە شوێنی لە دایکبوونی، بەڵام پاشان لە ڕێگەی گرتنەبەری شێوازەکانی غەدر و خیانەتدا، حکومەت لە پەیمانەکانی پەشیمان بووەوە و شێخ و براکانی و ژمارەیەک لە هەڤالانی لەگەڵ خانەوادەکانیان نەفی مووسڵ کرد، ئینجا گوازرانەوە بۆ بەغدا و دواتر بۆ ناسریە و حیللە و دیوانیە، دوابەدوای ئەمە گوازرانەوە بۆ سلێمانی و تا کاتی بەرپابوونی شۆڕشی بارزان لە ١٩٤٣ لەوێ جێگیربوون[٥٩].

لە ئەنجامی نەفیکردنی شێخ ئەحمەد و براکانیشیدا، ژمارەیەک لە سەرکردە بارزانییەکان لە نێوانیاندا خەلیل خۆشەوی و ئەحمەد نادر بڕیاریان دا پەنا ببەنە بەر چیاکان، بەڵام هەردوو حکوومەتی عێراقی و تورکی هاوکاری یەکتریان کرد و لە ئاداری ساڵی ١٩٣٦دا توانییان ئەو گرووپە لە ناو ببەن[٦٠].

دەکرێ بڵێین ئەو ڕاپەڕینە زیاتر مۆرکی ناوخۆیی و هۆزایەتی پێوە دیاربوو بۆیە نەیتوانی پشتگیری ماددی و مەعنەوی پێویست لە لایەن ناوچە و چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردیی وەک چینی ڕۆشنبیران مسۆگەر بکات، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ڕاپەڕینی بارزان بەکرۆکی شۆڕشی ڕزگاریخوازی کوردی دادەنرێ کە دوای نزیکەی دە ساڵ مەلا مستەفا بارزانیی- برا بچووکی شێخ ئەحمەد- ڕێبەرایەتی کرد.

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی دووەم

(١) بڕوانە دەقی ئەو بڕگانە لە ل ١٦ی ئەو تێزە.

(٢) حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالية- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥.

(٣) بەهەمان مەبەست بڕوانە- العراق والفدرالية- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥.

(٤) لە: مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- ڕاپەڕینی یەکەمی بارزان ١٩٣١- ١٩٣٢، کوردستان، کانوونی دووەمی ١٩٨٦- ل ٣٠ وەرگیراوە.

(٥) شێخ مەحموودی حەفید سەرکردەیەکی نیشتمانپەروەری ناسراوە، نەوەک تەنیا لە ناو کورددا بەڵکو لە سەرئاستی هەموو ناوچەکەشدا خاوەنی ناوبانگ و دەسەلاتێکی بەرفراوان بووە، ئەمەش بەهۆی چەندین هۆکار لە نێوانیاندا: ئەو ئەندامی خانەوادەیەکی ئایینی ناسراوە و نەوەی شێخی گەورە کاکە ئەحمەدی کوڕی شێخ مەعروفی نۆدەهییە کە لە لایەن شوێنکەوتووانیەوە بەوەلی و پیرۆز حیسابی بۆ کراوە، جگە لەوە شێخ مەحموود لە پێناوی خزمەتکردنی کێشەی کورد ئەرک و کردەوەی لە یادنەکراوی ئەنجام داون، تەنانەت عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی مێژوونووسی بەناوبانگی عێراق لە بارەیەوە دەڵێت: «بەڕاستی دەکرێ بڵێین کە شێخ مەحموود مێژووی مەسەلەی کوردە و مەسەلەی کوردیش خودی شێخ مەحموودە» لەو ڕووەوە بڕوانە عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی یەکەم- ل٢٨٠، لە پێناوی کێشەی گەلەکەیدا شێخ مەحموود هەوڵی زۆر و قوربانی گەورەی داوە، لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهان و دواتریش پەیوەندی بەژمارەیەک وڵاتی زلهێز و زۆربەی سەرکردایەتییە کوردییەکانەوە کردووە لە هەموو پارچەکانی کوردستان، ئەمەش هەمووی لە پێناوی دەستەبەرکردنی مافە ڕەواکانی کورد.

(٦) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ العراق السياسي الحديث- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٦١- ٢٦٢.

(٧) بڕوانە دەقی یاداشتنامەکە لە ل ١١٣ ئەو تێزە.

(٨) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٦٣.

(٩) ئەو پایە هاوشێوەی پلەی حاکم یان (Governor)ە.

(١٠) ئەو مووچەیە بە(١٥) هەزار ڕۆپیە دیارکراوە.

(١١) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی یەکەم- ل ٢٧٩.

(١٢) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٧٩.

(١٣) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٧٩.

(١٤) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨٠.

(١٥) بڕوانە ل ١٥- ٢٥ی ئەو تێزە.

(١٦) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨٠- پەراوێز.

(١٧) مەبەستی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقە.
(١٨) زاراوەی لیوا کیفایەتە بەڵام لیوای فەرعی لە جیهانی ئیدارەدا زاراوەیەکی نامۆیە.
(١٩) مەبەستی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقە.
(٢٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨١
(٢١) سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٥.
(٢٢) سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٤- ٣٥.
(٢٣) ئۆزەمیر، عەلی شەفیق بەگە لە شەرکەسییەکانی میسر.
لەو ڕووەوە بڕوانە: تالیب عەبدولجەبار حەیدەر- المسألة الكوردية في الوثائق العراقية- المشكلة- الحل- النتيجة، نامەیەکی ماستەرە لە زانستە سیاسییەکان ئاراستەی کۆلێژی یاسا و سیاسەت کراوە لە زانکۆی بەغدا- تەمووزی ١٩٨٢- ل ٩٩.
(٢٤) عەلائەدین سجادی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٤- ٩٥.
(٢٥) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تأريخ العراق السياسي الحديث- بەشی سێیەم- ل ٢٦٦- ٢٦٧.
(٢٦) تالیب عەبدولجەبار حەیدەر- سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٦- ٩٧.
(٢٧) عەلائەدین سەجادی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٠٠.
(٢٨) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تأريخ العراق السياسي الحديث- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٦٧.
(٢٩) بەهەمان مانا بڕوانە- د. کەمال مەزهەر ئەحمەد- کوردستان لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهاندا- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٥١.
(٣٠) تالیب عەبدولجەبار حەیدەر- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٠.
(٣١) د. عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی دووەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٠- ١٢٢.
(٣٢) لە: سی. جی- ئەدمۆندز- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٧٦ وەرگیراوە.
(٣٣) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤- ١٥
(٣٤) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥.
(٣٥) هەریەکە لە حکوومەتی بەریتانی و عێراقی ڕایانگەیاند کە پەیماننامەی ناوبراو پەیماننامەی هاوپەیمانێتی نێوان عێراق و بەریتانیایە بۆیە (بەپێی ڕاگەیاندنەکانیان) نابێ مەسەلەی دیکەی دەرەوەی ئەو بابەتە بگرێتە خۆی.
(٣٦) شاندەکە لە (مێجەر یانگ)ی بریکاری مەندوبی سامی لە بەغدا و جەعفەر عەسکەریی بریکاری سەرەک وەزیران و وەزیری بەرگری و جەمیل مەدفەعیی وەزیری ناوخۆ و جەمال بابانی وەزیری داد پێکهاتبوو.

(٣٧) لەو بارەوە بڕوانە: عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٥-٦٤.

بڕیاری ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە وەڵامی ئەو یاداشتنامەیەی خوارەوەدا دەرکرا کە لە لایەن ژمارەیەک کوردەوە بۆی بەرز کرابووەوە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

*سلێمانی- کوردستانی باشوور*
**١٩٣٠/٧/٢٦**

*لە ڕێگەی مەندوبی سامی لە عێراق- بەغدا*
*بۆ سکرتاریەتی ئەنجوومەنی گەلان- ژنێڤ*

*بەڕێز، لە پێناوی پاراستنی برایەتییەکی جێگیر و هەمیشەیی لە نێوان عەرەب و کورددا، کورد لە هەموو هەلێکدا و لەو کاتەشەوە کە بڕیاری ژیانیان لە عێراق داوە، داوای بەخشینی مافە نەتەوەییەکانی خۆیان کردووە کە کۆمەڵەی گەلان دانی پێدا ناون، بەڵام لە هیچ حاڵەتێک لە حاڵەتەکاندا جێبەجێ نەکراون... دەربارەی ئەو پەیماننامە تازەیەش ئێمە داوای لامەرکەزی (مختارية الأدارة)مان لە عەرەب کردووە بەڵام بەداخەوە زانیمان کە زۆربەی کارمەندە ئیدارییەکان لە ناوچە کوردییەکاندا عەرەبن و دەستیان کردووە بەفشار دروستکردن و ترساندنی کورد بۆ ئەوەی لە مافە ڕەواکانیان پەشیمان بکەنەوە لە ئەنجامی هەڵسوکەوتی کارمەندانی حکوومەتی عێراق و لە وەختێکدا کە هێشتا ئینتیداب ماوە، بۆیە لەو باوەڕە داین کە لە دوای تەواوبوونی ئینتیدابیش ئیدارەی ئێستا لە ئیدارەی تورکی خراپتر دەبێت... بەپێی ئەو ڕاستییانەش کە ئاماژەمان بۆ کردوون، بڕیاری کۆتایی کورد ئەوە دەبێ کە لە ژێر چاودێری کۆمەڵەی گەلاندا حکوومەتێکی کوردی دابمەزرێنرێت، ئێمە داوای یارمەتی و دەستەبەرکردنی ئامانجە ڕەواکانمان دەکەین.*

(٣٨) لە عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٧٠- ٧١ وەرگیراوە.

(٣٩) عەلائەدین سجادی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٧.

(٤٠) ئەو کەسایەتییانەی دەسگیرکران ئەمانە بوون: (١) شێخ قادری برای شێخ مەحموود ٢- میرزا تۆفیق ٣- ڕەمزی ئەفەندی ٤- حەمە ئاغا ٥- عەزمی بەگ بابان ٦- عیزەت بەگ عوسمان پاشا ٧- عەبدوڕەحمان ئاغا ئەحمەد پاشا ٨- محەمەد ساڵح بەگ ٩- مەجید ئەفەندی کانی ئاسکان ١٠- فائیق بەگ بابان ١١- شێخ محەمەد کلای.

(٤١) عەلائەدین سجادی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٧.

(٤٢) عەلائەدین سجادی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣٠- ١٣١.

(٤٣) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣١- ١٣٢.

(٤٤) عەبدوڕەحمان بەزاز- العراق من الأحتلال حتی الأستقلال- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٢.

(٤٥) د. حامید مەحموود عیسا- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٨.
(٤٦) د. حامید مەحموود عیسا- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٨.
(٤٧) د. حامید مەحموود عیسا- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٨.
(٤٨) د. حامید مەحموود عیسا- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٨.
(٤٩) د. حامید مەحموود عیسا- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٩

(٥٠) بارزان گوندێکی کوردییە، دەکەوێتە دامێنەکانی باشووری چیای شیرین و (٢٥) کیلۆمەتر لە باکووری رۆژهەلاتی قەزای ئاکرێ، هۆزی بارزانیش بەهۆی ئەو گوندەوە ئەو ناوەیان لێ نراوە کە بارەگای شێخەکانی بارزان و تەکیەی بەناوبانگی بارزانی لێیە، هۆزی بارزان تەنیا یەک هۆز نییە بەڵکو لە حەوت هۆز پێکدێت کە ئەمانەن: ١- شێروانی ٢- دولۆمەری ٣- مزووری ٤- بەرۆژی ٥- گەردی ٦-هەرکی بنەجی ٧- ......، هەمووشیان وەلای ئایینیی رەهایان بۆ شێخەکانی بارزان هەیە، بۆیە پێکەوە بەهۆزی بارزان ناوبراون شێخەکانی بارزانیش دەگەرێنەوە سەر زنجیرەی میرەکانی ئامێدی و (مەسعود)ی باپیرە گەورەیان رووی کردۆتە گوندی هفکای دەوروبەری گوندی بارزان، پاشان شێخ تاجەدینی نەوەی چۆتە بارزان و تەکیەی بەناوبانگی بارزانی تیادا دامەزراندووە و بەیەکێک لە کۆنترین تەکیەکانی ناوچەکە دەژمێردرێت، دوای وەفاتی شێخ تاجەدینیش، شێخ عەبدورەحمانی کوری شوێنی گرتۆتەوە، دوای ئەویش شێخ عەبدوڵلای کوری شوێنی گرتۆتەوە، ئەویش شێخ عەبدوسەلامی کوری ناردۆتە لای شێخ سەید تەهای نەهری بۆ ئەوەی لەسەر دەستی ئەو بخوێنێ و فێرببێ، شێخ عەبدوسەلام زیرەکی و توانایەکی گەورەی پیشان داوە و دوای وەفاتی باوکیشی شوێنی گرتۆتەوە، ئەمە پاڵی بەمەولانا شێخ خالیدی نەقشبەندی (دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشبەندی)یەوە ناوە کە بیکات بەخەلیفەی خۆی لە ناوچەکەدا، دوای وەفاتی شێخ عەبدوسەلامیش رێبەرایەتی ئایینی بۆ شێخ محەمەدی کوری گواستراوەتەوە کە بەخواپەرستی ناسراوە و پێنج کوریشی هەبووە کە ئەمانەن:
شێخ عەبدوسەلام، شێخ ئەحمەد، محەمەد سەدیق، بابۆ، مەلا مستەفا.
لە دوای مردنی باوکیشی شێخ عەبدوسەلامی براگەورە رێبەرایەتی گرتۆتە دەست و زیرەکی و توانایەکی سیاسیی بەرچاوی دەرخستووە بەجۆرێک هیچ کەسێکی پێش خۆی نەیتوانیوە ئەم کارە بکات، هەر ئەوە بووە مایەی زیادبوونی شوێنکەوتووانی و چەندین چاکسازیی کۆمەلایەتی بنەرەتیشی ئەنجام دا، لەوانە نەهێشتنی دەرەبەگایەتی و دابەشکردنی زەویوزار بەسەر جووتیاران و بەرپاکردنی شۆرش لە دژی تورکە عوسمانییەکان، بەڵام ئەو شۆرشە سەری نەگرت و ناچار بوو بەرەو کوردستانی ئێران ناوچەکە بەجێ بهێڵێ، دەسەلاتدارانی عوسمانیش لە رێگەی بەکرێگیراوانی خۆی و غەدر و خیانەتەوە توانییان دەسگیری بکەن و لە ١٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٤ لەگەڵ سێ هەڤاڵی خۆی لە مووسڵ لە سێدارە دران، بۆچوونێکی دیکەش هەیە دەڵێ: لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٥ لە سێدارە دراوە و لە دوای ئەو شێخ ئەحمەدی بارزانی رێبەرایەتی ئایینی گرتۆتە دەست.

له درێژەی ئەم بابەتەدا بڕوانە: مەسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- ڕاپەڕینی یەکەمی بارزان ١٩٣١- ١٩٣٢- کوردستان- کانوونی دووەمی ١٩٨٦- ل ١٢- ١٦.

(٥١) مسعود بارزانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٥.

(٥٢) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی سێیەم- ل ١٨٩.

- حەسەن مستەفا- البارزانيون وحركات بارزان ١٩٣٢- ١٩٤٧ دار آفاق عربية للصحافة والنشر بغداد- چاپی دووەم ١٩٨٣- ل ٢٣.

(٥٣) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨٨- ١٨٩.

(٥٤) مەسعوود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- ڕاپەڕینی یەکەمی بارزان ١٩٣١- ١٩٣٢- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣١- ٣٢.

(٥٥) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨٨.

(٥٦) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨٨.

(٥٧) مسعود بارزانی- سەرچاوەی پێشوو-ل ٣١- ٣٢.

- حەسەن مستەفا- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣١- ٤٥.

(٥٨) عەبدوڕەحمان بەزاز- العراق من الأحتلال الى الاستقلال- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٣.

(٥٩) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٤.

(٦٠) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی چوارەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٥.

## ئاخافتنی سێیەم

# مەینەتیی و شۆڕشەکانی کورد لە سایەی سەربەخۆییدا:

دەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێ کە پێشتر باسمان لێ دەکرد، سەبارەت بەوەی حکوومەتە عێراقییە مەلەکییە بەدوایەکدا هاتووەکان هەمیشە و بەبەردەوامی هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی سەربازی و سیاسەتی ئاسن و ئاگرەوە مامەڵە لەگەڵ شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورددا بکەن، بەبێ ئەوەی بیر لە دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی ئاشتییانە و بنەبڕ بکەنەوە.

سەربەخۆبوونی عێراقیش بووە مایەی گۆڕینی ئەو سیاسەتە، بەوپێیەی کە سەربەخۆیی شتێکی ڕواڵەتی بووە و عێراقیش لە خولگەی سیاسەتی بەریتانییەوە نەچۆتە دەرەوە، هەر لەبەر ئەوەش سیاسەتە گشتییەکانی ئەو حکوومەتانە لە سەردەمی سەربەخۆییدا گۆڕانێکی ئەوتۆیان بەخۆوە نەدیتووە، ئەو حوکمە مەسەلەی کوردیش دەگرێتەوە، ئەوە بوو ئەو حکوومەتانە مافەکانی کوردیان وەلاوە نا و کێشەکەش وەکو ئاگرێکی ژێر خۆڵ مایەوە کە گڕ و بڵێسەی لە زیادبوون دابێ، هەر کاتێکیش بارودۆخی گونجاوی بۆ هاتبێتە پێش کڵپەی سەندووە، لەو بارەوە دکتۆر شاکر خەسباک دەڵێت: بێ گومان ئێمە دەزانین کە ئەو حکوومەتانەی لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێراقەوە تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی پیرۆزەوە دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، یان بەبڕیاری بێگانە و بەپێی بەرژەوەندییە ئیستیعمارییەکانیەوە بەڕێوەچوون یان ئەوەتا کەسانی لێهاتوو و دڵسۆزیان نەبووە، هەر بۆیە ئەو مامەڵەیەی لە هەموو بۆنەکاندا و بەرامبەر بەهەموو داواکارییەکان لەگەڵ کورد کرا، بووە مایەی نائومێدییەکی توند و لەوانەبوو بگاتە ئاستی پەشیمانبوونەوە بەرامبەر بەهەڵبژاردنیان بۆ چارەنووسێکی لەو جۆرە[١].

### یەکەم: سەردەمی پادشایەتی

#### ١- شۆڕشی بارزان لە نێوان ساڵانی ١٩٤٣ - ١٩٤٥:

بەپێی بارودۆخە سەیرەکانی ناوچەی کوردستان و دان نەنانی حکوومەت بەمافە ڕەواکانی کورد و هەوڵدان بۆ لەناوبردنیان و نەفیکردنی سەرکردەکانیان و ئەو زوڵمە گەورەیەی کە بەشێوەیەکی تایبەت بارزانییەکان بەدەستیانەوە ناڵاندیان[٢]، لە ١٢ی

تەمووزی ساڵی ١٩٤٣، مەلا مستەفای بارزانی بڕیاری جێهێشتنی مەنفا بەسەر داسەپێنراوەکەی خۆی لە سلێمانی دا و بەنهێنی ڕووی کردە ئێران، لەوێشەوە خۆی گەیاندە ناوچەی سیدەکان لە کوردستانی عێراق و دەستی کرد بەبەرپاکردنی شۆڕش لە دژی حکوومەت، لە ماوەی مانگی تشرینی دووەمی هەمان ساڵیشدا توانی دەست بەسەر زۆربەی ئەو پێگانەدا بگرێ کە حکوومەت بۆ پۆلیس لە ناوچەکەدا دروستی کردبوون[٣].

مەسەلەکە بەمە کۆتایی نەهات بەڵکو لە هەوڵێکیدا بۆ بەرگرتن لە شۆڕشگێڕان، سوپا خۆی تێ هەڵقورتاند بەڵام هیچی لە دەست نەهات[٤].

ئەوەی لەو شۆڕشەدا مایەی ئاماژەپێکردنە ئەوەیە کە شۆڕشی ئەمجارە هاوشێوەی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٣١- ١٩٣٢ی بارزان نەبوو کە مۆرک و سیمای هۆزگەرێتی و ناوخۆیی سنووورداری پێوە دیاربوو، زیاتریش لەبەرئەوەی شۆڕشی ١٩٤٣تەنیا تایبەت نەبوو بەهۆز یان ناوچەی بارزان، بەڵکو بوو بەبزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی ڕزگاریخوازی چوارچێوە فراوان و لە لایەن زۆر لە ئەفسەرانی کوردی ناو سوپای عێراقیشەوە پشتگیری لێ کرا، هەروەها چەندین چین و توێژی بەرفراوان لە ڕۆشنبیران و لاوان و قوتابیانی کورد لایەنگیریبیان کرد، جگە لەمە ئەو شۆڕشە پشتی بەڕێکخستنی حزبایەتی بەست وەکو شێوازێک بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی و لیژنەی ئازادی و حزبی هیوا‌ش لە دوایەوە وەستان[٥] کاتێکیش حکوومەتی عێراق و حکوومەتی بەریتانی دەرکیان بەسەرنەکەوتنی ڕێگەچارەی سەربازی کرد بەهۆی سەرقاڵبوونی بەریتانیا بەجەنگی دووەمی جیهان، ڕوویان کردە گفتوگۆ و دانووستان بەمەبەستی قۆزتنەوەی کات و گرتنەبەری شێوازە تەکتیکییەکان بۆ لەناوبردنی شۆڕش، تەنانەت ئەمە ئەگەر دوای کاتی دیاریکراویش بێت.

بۆ ئەم مەبەستەش لە ٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٤دا یەکێک لە وەزیرانی[٦] خۆی نارده ناوچەکە و چاوی بەمەلا مستەفای بارزانیی سەرکردەی شۆڕش کەوت، لە بەرامبەریشدا بارزانی داواکارییەکانی کوردی پێشکەشی وەزیری میوان کرد[٧] کە دەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆیان بکەینەوە:

١- دامەزراندنی ویلایەتێکی کوردی کە لیواکانی کەرکووک و سلێمانی و هەولێر و قەزاکانی مووسڵی وەک دهۆک و زاخۆ و ئامێدی و ئاکرێ و سنجار و شێخان و قەزا کوردییەکانی وەک مەندەلی و خانەقین لە دیالا بگرێتەوە.

٢- لەو ویلایەتەدا کوردی بەزمانی ڕەسمی بناسرێ.
٣- دامەزراندنی وەزیرێکی کورد بۆ ئەوەی ببێتە بەرپرس لەسەر ویلایەتی کوردستان.
٤- لە هەر وەزارەتێکی دەوڵەتدا بریکارێکی وەزیری کورد دابمەزرێندرێ.
٥- کاروباری سەربازی و دارایی و دەرەوە لە ویلایەتی کوردستاندا لە دەستی دەوڵەتی ناوەندیدا دەبێ.
٦- قەرەبووکردنەوەی زەرەرمەندان.
٧- گێڕانەوەی دەرکراوان بۆ ناوچەکە و ئازادکردنی بەندکراوان.
٨- دوورخستنەوە یان گواستنەوەی ئەو کارمەندانەی بەوە ناسراون کە بەرتیلیان وەرگرتووە یان بەشێوەیەکی نابەجێ دەسەڵاتیان بەکارهێناوە.
٩- کردنەوەی ڕێگاوبان و نەخۆشخانە و ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە[٨].

ئینجا شاندی حکوومەت گەڕایەوە بەغدا و سەبارەت بەدەرەنجامەکانیش ڕاپۆرتێکی ئاراستەی ئەنجوومەنی وەزیران کرد، ئەنجوومەنیش لیژنەیەکی تایبەتی بۆ دیراسەکردنی ئەو پێشنیازانە و پێشکەشکردنی ڕێنمایی لە بارەیانەوە پێکهێنا، دواتر لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٤دا ئەنجوومەنی وەزیران کۆبووەوە و ئەو بڕیارانەی خوارەوەی لە بارەوە دەرکرد[٩]:

١- دەستکردن بەدامەزراندنی ئیدارە لە قەزاکانی زێبار و ڕواندز و ئامێدی و ناحیەکانی مێرگەسوور و شێروان مەزن و بارزان و دامەزراندنی کارمەندی مەدەنی شارەزاو توند بۆیان، لە کاتی پێویستیشدا دەکرێ سوود لە خزمەتگوزاریی ئەفسەرانی سوپای وەک بریکار و ئەفسەرانی پەیوەندی وەربگیرێ.
٢- دانانی پێگە لەسەر سنوورەکانی عێراق و ڕێگەوبان و دەرووەکاندا و فراوانکردنی ئەو پێگانەی کە دەکەونە نزیک ناوەندی ناحیەکانەوە.
٣- بونیادنانی پێگە لەسەر ڕێگەی ئەم ناوچانە: خەلیفان - ڕێزان- ئامێدی- بلە- ئاکرێ- بارزان- مێرگەسوور- شێروان مەزن- دیانا- کانی ڕەش.
٤- پەلەکردن لە دوورخستنەوەی مەلا مستەفا لە ناوچەی بارزان و نیشتەجێکردنی لە پیراندا.
٥- گێڕانەوەی شێخە بارزانییە دوورخراوەکان بۆ شوێنەکانیان و ڕازیبوون بەهاتنی مەلا

مستەفا بۆ بەغدا بەمەبەستی دەخالەت کردن، بەمەرجێک کات و چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەمە بۆ وەزیری ناوخۆ و وەزیری بێ وەزارەت بەجێ بهێڵرێت.

٦- دەستکردن بەگێڕانەوەی ئەو چەک و کەلوپەلانەی کە مەلا مستەفا و گرووپەکەی دەستیان بەسەردا گرتوون.

٧- ڕازیبوون بەدەرکردنی لێبووردنێکی گشتی لە بارزانییەکان، جگە لە ئەندامانی هێزە چەکدارەکان و کارمەندانی دەوڵەت کە لەگەڵ ئەو گرووپانەدا بەشداریان کردووە، بەمەرجێک مێژووی دەرکردنی ئەو لێبووردنە بۆ بڕیاری حکوومەت جێ بهێڵرێ کە دواتر لێی دەکۆڵێتەوە.

٨- وەزارەتە پەیوەندیدارەکان هەموو ئەو بڕیارانە جێبەجێ بکەن کە پەیوەندییان پێیانەوە هەیە.

وا دیارە پێچەوانەییەکی گەورە لە نێوان ئەو داواکارییانەی کە شۆڕشی کورد پێشکەشی کردن لەگەڵ بڕیارەکانی ئەنجوومەنی وەزیراندا هەیە، مسعود بارزانی دەربارەی ئەو پێچەوانەییە دەڵێت:

«نازانم ئاخۆ ماجید بەئەمانەتەوە ئەو بڕیارانەی بۆ بارزانی و هیوا گواستوونەتەوە یان نا؟ چونکە بڕیارەکان لەگەڵ ئەو خاڵانەدا ناگونجێن کە بارزانی تەسلیمی ماجیدی کردبوون.

وەک دیاریشە حکوومەت سیاسەتێکی تەکتیکی و یەکێکی ستراتیژیشی بۆخۆی وێناکردووە»[١٠] لە ٢٢ی شوباتی ١٩٤٤دا مەلا مستەفا بارزانی سەردانی بەغدای کرد و لە لایەن عەبدولئیلای وەسی و نوری سەعیدی سەرۆک وەزیران و چەند وەزیرێکەوە پێشوازی لێ کرا، پاشان گەڕایەوە بارزان[١١].

شایەنی باسە ئەو بڕگانەی کە لە بڕیاری ناوبراوی ئەنجوومەنی وەزیراندا هاتبوون، هیچ شتێکی بنەڕەتییان تیا نەبوو کە دەلالەت لە نیازپاکیی حکوومەت بکەن بۆ چارەسەرکردنی یەکجاری و ئاشتییانەی کێشەی کورد، بگرە ئەو شێوازەی بڕیارەکانی پێ دەرکراوە دەلالەت لە ئاستی سستی حکوومەت دەکات و بەدەربووە لە گیانی ئاشتیخوازی. لە لایەکی دیکە، ئەم بڕگانە جگە لە هەندێ ڕێوشوێنی بێ مانا نەبێ هیچی تریان تێدا نەبوو، مەبەستیش لە دوایانەوە هەڵخەڵەتاندن و دواخستنی ململانێی سەربازی بوو بۆ کاتێکی داهاتووی دیکە، بۆ ئەوەی بتوانن لە کاتێکی گونجاودا شۆڕش لە

ناو ببەن. ئەمەش بەکردەوە ڕووی دا، ئەوەبوو دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهان و دەست بەتاڵبوونی بەریتانیا و هاتنە پێشەوەی بارودۆخی گونجاو بۆ حکوومەتی عێراق لە شۆڕشی کورد و داواکارییەکان و بیانوو و هۆکاری جۆراوجۆریشی خولقاند کە بوونە مایەی ئاڵۆزبوونی بارودۆخ و تەشەنەکردنی، لە کۆتاییشدا و دوای هەڵکەوتنی کات و هۆکارەکان و بڕیاری پەنابردنی بۆ ڕێگەچارەی سەربازی دا.

لە ٨ی ئابی ساڵی ١٩٤٥ ئەنجوومەنی وەزیران بەمەبەستی کۆڵینەوە لە مەسەلەی بارزان کۆبوونەوەیەکی تایبەتی ئەنجام دا، دوای خوێندنەوە و خستنەڕووی ئەو بڵاوکراوە و ڕاپۆرتانەش کە وەزارەتی ناوخۆ دەستی کەوتبوون و پاش گوێگرتن لەو ڕوونکردنەوانەی هەریەکە لە وەزیری بەرگری و ناوخۆ پێشکەشیان کرد، ئەنجوومەن بڕیاری لەسەر ئەمەی خوارەوە دا:

ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە سەرەوە لێکۆڵینەوەیان لە بارەکراوە بەئاشکرا دەلالەت لەوە دەکەن کە بارودۆخی ئاسایش لە قەزای زێبار و دەوروبەریدا بەشێوەیەکی ترسناک ڕووی لە ئاڵۆزی کردووە، بەهۆی ئەو تاوانکاری و سەرپێچییانەش کە لەو ناوچەیەدا لە لایەن مەلا مستەفا بارزانی و شوێنکەوتووانییەوە ئەنجام دراون و لە ئەنجامی تێکدانی هێمنی و ئاسایشی گشتی، لەبەرئەوەی گێڕانەوەی نیزام و نەهێشتنی تاوانکاریش ئەرکێکە و دەبێ جێبەجێ بکرێ، بۆیە ئەنجوومەن بڕیاری دا ئەو ناوچەیە وەکو داگیرکردنێکی سەربازی داگیر بکرێ[١٢].

دوای چەند شەڕێکی گەورەش کە تیایاندا هەردوو لا زەرەرمەندیی گەورەی گیانی و ماڵییان پێکەوت و خەڵکێکی مەدەنی و بێ دیفاعی- زۆریش لە بەساڵاچوو و ئافرەت و منداڵ بوونە قوربانی و بەشێکی دیکەشیان پەرتەوازە بوون و ماڵ و ئاژەڵیان تیاچوو، کاتێکیش بۆ سەرکردایەتی شۆڕش دەرکەوت کە حکوومەت توانیویەتی هەندێ لە پیاوانی هۆزەکان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و دوور نییە ئەم شەڕە ببێتە شەڕێکی ناوخۆیی لە نێوان خودی کورد، بۆیە بڕیاری دا کە دەبێ پێشمەرگە و خانەوادەکانیان ڕووبکەنە کوردستانی ئێران، بەمەش لە ١٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥، حکوومەتی عێراق کۆتایی هاتنی کردەوە سەربازییەکانی ڕاگەیاند و بەمە لاپەڕەیەکی دیکە لە لاپەڕەکانی مەینەتییەکانی گەلی کورد هەڵدرایەوە، بەشێوەیەکی کاتی و بەهۆی نەبوونی هاوسەنگی لە تەرازووی هێزەکانیشدا ململانێی سەربازی وەستێنرا، لەو کاتانەدا هێزی ئاسمانیی بەریتانی (R.

A. F) خــزابوونه نێــو شــەڕ و لایەنی ســوپای عــێــراقی دەگــرت لە شــەڕ لە دژی شۆڕشگێڕاندا[١٣].

سەبارەت بەبەڵێنەکانی حکومەتیش دەربارەی داواکارییەکانی کورد، چیتر لە لایەن ئەو حکوومەتەوە باسیان لێوە نەکرا کە کەوتبووە ژێر کاریگەریی نەشوەتی سەرکەوتن.

شایەنی باسیشە حکوومەت بڕە پارەیەکی زۆر سنووورداری تەرخان کردبوو بۆ ئەوەی وەکو یارمــەتی بەناوچەکــە بیــبــەخــشێ، ئەمــەش بووبووە مــایەی نارەزایی، چونکە ئەمــە فەرامۆشکردنی حەقیقەتی شۆڕش و ئامانجەکانی بوو و وەک ئەوەش پیشانی دەدا کە لە پێناوی دەستەبەرکردنی یارمەتی تێ بکۆشێ، دەبێ بوترێت تەنانەت ئەو بڕە پارە کەمە لە لایەن دەزگــا حکوومــیــیــەکــانەوە بەنابەجــێــیی بەکــار هێنرا و دواتر نەگەیەنرایە دەســتی خەڵک[١٤].

## دووەم: سەردەمی کۆماری

### ١- شــۆڕشــی ئەیلوولی[١٥] ئازادیخواز لە نێوان ساڵانی ١٩٦١ - ١٩٧٥:

لەمەوبەر بینیمــان گەلی کورد چۆن لەسەردەمی پادشایەتی ڕووخاودا دووچاری چەندین مەینەتی و زوڵم و ناڵەباری بوو بووەوە و مەلا مــستەفای سەرکردەش بۆ مــاوەی نزیکەی ١٣ ســاڵ لە تاراوگــە لە یەکــێــتی ســۆڤــیــەتدا ژیانــی دەبردەســەر و لە هەمــان کــاتــیــشــدا چالاکــیــیــەکــانی پارتی دیموکــراتی کــوردســتــانی نوێنەری ڕاســتــەقــینەی بزووتنەوەی ڕزگــاریخــوازی کورد بەهەمــوو شــێــوەیەک قەدەغە و یاســاخ بوو، بۆیە گەلی کــورد وەکو برا عــەرەبەکــان و تەواوی کــەمــە نەتەوەکــانــی دیکەی وڵات بەســەبرێکی زۆرەوە چاوەڕێی ڕزگــاربوونی لە ژێر چەپۆکی ئەو ڕژێمــەدا دەکــرد، کــاتــێــکیش کــە شــۆڕشــی ١٤ی تەمووزی ســاڵی ١٩٥٨ بەرپابوو، گــەلی کــورد بەر لە هەمــوو لایەک گــەشــبــینی خــۆی دەربڕی و لە دەوری کۆبووەوە، بگرە بەهیوای هاتنەدیی ئاواتە نەتەوەیییە ڕەواکانی، ئەو شۆڕشەی گرتە باوەش بەتایبەتیش کاتێک دەستی بەکوتانی سەنگەرەکانی ئیستعماری ئینگلیزی کرد- دوژمنی گەلی کورد و مافە نەتەوەیییەکانی- بۆ ماوەیەکیش عێراق کەشوهەوای ئاشتی و برایەتی و یەکێتی نیشتمانی ڕاستگۆیانەی لە نێوان عەرەب و کورد و کەمە نەتەوەکانی دیکە بەخۆوە دیت.

ناکرێ نەڵێین ئەو شۆڕشە لە سەرەتای بەرپابوونیەوە دەسکەوتی بەرچاوی بۆ کورد وەدی

نەهێنا، ئەوەبوو لە دەستووری کاتیدا کە لە ٢٧ی تەمموزی ١٩٥٨ دەرکرا، باس لەمەی خوارەوە کراوە:

«عەرەب و کورد لەو ولاتەدا هاوبەشی یەکترن»[١٦] ئەنجوومەنی دەسەلاتیش پێکهێنرا کە بالاترین دەسەلاتی دەستووریە لە ولات و سەرۆک و دوو ئەندامیشی بۆ دیارکرا کە یەکێکیان کورد بوو، لە لایەکی دیکە، حکوومەتی شۆڕش لە نێو خۆشحالییەکی ڕەسمی و میللیی گەورە و بەرفراوان ڕێگەی بەگەڕانەوەی مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و هەڤالانی دا بۆ خاکی نیشتمان. بەپێی بنەماکانی شۆڕشیش دەربارەی والاکردنی ئازادییە سیاسییەکان، لە ٩ی شوباتی سالی ١٩٦٠دا مۆلەتی کاری سیاسیی بەپارتی دیموکراتی کوردستان درا، بەلام وەک چۆن پێشتر باسی لێوە کرا، شۆڕشی تەمموز دووچاری کۆسپ و گلانی گەورە بووەوە بەهۆی ئەو بەش بەشیەی کە لە ئەنجامی ململانێ لەسەر دەسەلاتدا لە ناو بالە جیاجیاکاندا سەری هەلدا، پارتە سیاسییەکانیش پارچە پارچەییان تێکەوت و لە ئەنجامدا بەرەی یەکێتی نیشتمانی دارما، ئەو بەرەیەی لەوکاتەدا پارتە نیشتمانییە گرنگەکانی تیادا کۆبووبوونەوە[١٧].

ئەو ململانێیانە و ئەو دەرەنجامانەش کە لێی کەوتنەوە بوونە مایەی ئەوەی عەبدولکەریم قاسم دەسەلات داگیر بکات و دواتر شۆڕش وردە وردە لە بنەما سەرەکییەکانی خۆی لایدا و پێگە میللییەکەشی ڕووی لە کەمبوون و پووکانەوە کرد، وەکو ئەنجامێکی سروشتیش بۆ ئەمە، پەیوەندی نێوان عەبدولکەریم قاسمی سەرکردەی شۆڕش و پارتی دیموکراتی کوردستان و مستەفا بارزانیی سەرۆکەکەی، ڕووی لە ئالۆزی کرد، هۆکاری ئەمە بۆ پاشگەزبوونەوەی عەبدولکەریم قاسم لە بەلێنەکانی پێشووی دەگەڕێتەوە سەبارەت بەچاکسازییە کۆمەلایەتییەکان و جێبەجێ نەکردنی هیچ پلانێکی کردەیی لە پێناوی دانان بەمافە نەتەوەییەکانی کورد لە ماددەی سێیەمی دەستووردا هاتووە[١٨] و نزیکبوونەوەی لە هەندێک لایەنی وەلاوە نراوی کوردی کە لەسەر ڕژێمی پێشووەوە حیسابیان بۆ دەکرا[١٩].

جگە لەمە قاسم پشتگیری هەندێک کەسی ئیداری کرد کە ڕق و قینەیان بەرامبەر کورد هەبوو و بواریشی بەژمارەیەک دژە لایەن دا کە بانگەشەی شۆڤینی بلاوبکەنەوە، ئەو بانگەشانەی داوای تواندنەوەی نەتەوەی کوردیان لە بۆتەقەی گەلی عەرەبدا دەکرد، تەنانەت ئەگەر مەسەلەکە پێویستی بەبەکارهێنانی هێزیش هەبێ[٢٠].

پارتی دیموکراتی کوردستانیش بەشی خۆی لە دیکتاتۆریەتی عەبدولکەریم قاسم و

شێوازە نابەجێکانی بەرکەوت کە بەمەبەستی لەباربەک بردن و تێک بەردانی پارتە سیاسییەکان دەیگرتنە بەر، لەو پێناوەشدا قاسم هەوڵی برینی ریزەکانی پارتی ناوبراوی دا بەڵام شکستی هێنا[٢١] و ناچاربوو بارەگاکانی دابخات و کاری سیاسیی قەدەغە بکات و ئەندامانی دەسگیر بکات و سەرکردەکانیش راوەدوو بنێ، دواتر لە ئاداری ١٩٦١دا رۆژنامەی ناوەندیی ئەو پارتەی داخست و بەکۆتایی هاتنی مانگی ئایاری هەمان ساڵیش، پارتی دیموکراتی کوردستان ناچار کرا دەست بەخەباتی ژێرزەمینی بکاتەوە[٢٢].

لە ئەنجامی ئەو رێوشوێنە نابەجێیانەشدا مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٣٠ تەمووزی ساڵی ١٩٦١دا یاداشتنامەیەکی دوورودرێژی ئاراستەی عەبدولکەریم قاسم کرد، لەبەر گرنگیی ئەو داواکارییانەی کە لە یاداشتنامەکەدا هاتوون، وا لە خوارەوە دەقەکانیان دەخەینە روو[٢٣]:

١- کێشانەوەی ئەو هێزانەی بەم دواییانە نێردراونەتە چەند ناوچەیەکی دیاریکراو لە کوردستان بۆ بارەگا و شوێنەکانی خۆیان و ئەنجام نەدانی هیچ جموجوڵێکی نا ئاسایی سەربازی لە غەیری ئەو شوێنانەی کە لە چەند ساڵی رابردوودا بۆیان دیاری کراوە.

٢- کێشانەوەی بەرپرسانی ئیدارە و ئاسایش و پۆلیس و ئەو بەرپرسانەش کە لە رووداوەکانی ئەم دواییەدا رۆڵی بەرچاویان بینیوە، چ لە رێگەی گوێ نەدانی ئەنقەست یان هاندان و شێواندنی راستییەکان و راپێچ کردنیان بۆ بەردەمی دادگا پەیوەندارەکان بۆ ئەوەی سزای رەوای خۆیان وەربگرن.

٣- گێڕانەوەی ئەو کارمەندانەی کە لە کوردستان دوورخراونەتەوە یان گواستراونەتەوە، بۆ شوێنەکانیان و دامەزراندنی موتەسەریف و قایمقامی کورد بۆ لیوا و قەزا کوردییەکان، ئەوانەی بەرامبەر بەکۆمار و برایەتی کورد و عەرەب دڵسۆزن.

٤- بەتەواوەتی جێبەجێکردنی ماددەی سێیەمی لە دەستووری عێراق و هێنانەدی یەکسانی تەواو و هەمەلایەنە لە نێوان نەتەوەی عەرەب و کورد وەکو دوو نەتەوەی برا لە سایەی دەوڵەتی عێراقدا.

٥- خاوێنکردنەوەی حکوومەت لەو کەس و لایەنانەی کە دژایەتیی گیانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ئازادیخواز دەکەن.

٦- واڵاکردنی ئازادییە دیموکراسییەکان بۆ میللەت و کۆتایی هێنانی خێرا بەماوەی

ئینتیقالی، بۆ ئەوەی کاروباری وڵات بەپێی سیستەمێکی دیموکراتی تەندروست و لە لایەن حکوومەتێکی بەرپرس بەرامبەر بەپەرلەمانێکی هەڵبژێردراو لە لایەن میللەت لە هەڵبژاردنێکی ئازاد و ڕاستەوخۆوە بەڕێوە ببرێ، وێڕای لادانی ئەحکامی عورفی و نەهێشتنی ئاسەوارەکانی.

٧- جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەی ساڵی ١٩٦٠ی مامۆستایانی کورد لە پێناوی پێشخستنی کلتووری کوردی.

٨- زمانی کوردی لە هەموو فەرمانگە ڕەسمییەکان لە ناوچەی کوردستاندا بکرێتە زمانی ڕەسمی.

٩- نەهێشتنی ئاسەواری هەموو سیاسەتە ڕەگەز پەرستییەکان کە بەرامبەر بەکورد پیادە دەکرێن و پێشتر باسیان لێوە کراوە و سزادانی هەموو ئەوانەی بانگەشە بۆ جیاوازی لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلی عێراق دەکەن.

١٠- ڕێگەدان بەچاندنی تووتن و نەهێشتنی بەربەستی دۆنم لەو ناوچانەی کە بۆ چاندن شیاون.

١١- هەموارکردنی یاسای باجی زەوی، لە پێناوی سووککردنی ئەو بارگرانییەی ئەو یاسا تازەیە خستوویەتیە ئەستۆی جوتیاران.

١٢- چارەسەرکردنی بێکاری بەربلاو لە ڕێگەی جێبەجێکردنی پڕۆژەی ئاوەدانکردنەوە و پیشەسازی و پەلەکردن لە تەواوکردنی پڕۆژە وەستاوەکان و هی دیکەش بخرێتە پلانی ئابوورییەوە.

١٣- نەهێشتنی گرانی لە ڕێگەی سزادانی ئەوانەی یاری بەنرخەکان دەکەن و مۆنۆپۆڵی خواردن و خۆراکی میللەتیش دەکەن.

بەڵام وەکو بەردەوامبوون لەسەر پرۆگرامی دیکتاتۆریانەی خۆی، عەبدولکەریم قاسم هیچ بایەخێکی بەو یاداشتنامەیە نەدا و دەرگای لە بەردەمی هەر هەوڵێکی ئاشتیخوازانە داخست بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی گونجاو بۆ کێشەکە، بەڵکو ئەو سوور بووە لەسەر گەیاندنی مەسەلەکان بەئەوپەڕی ئاڵۆزی و بەبێ پاشگەزبوونەوەش بڕیاری بەکارهێنانی ڕێگە چارەی سەربازی دا، لەو پێناوەشدا یەکەی سەربازیی جۆراوجۆری ڕەوانەی ناوچەی کوردستان کرد و بارودۆخەکان ڕووەو ئاڵۆزی زیاتر چوون، تا ئەو کاتەی لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١دا ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارییان لە نێوان هەردوو لادا لێکەوتەوە. دکتۆر مەجید

خەدوری لەو ڕووەوە دەڵێت: «لە ماوەی بوونی قاسم لە دەسەڵاتدا، لە تواناداد نەبوو بیر لە ڕێگەچارەیەک بکرێتەوە، ئەگەرچیش هەندێک لە حزبە سیاسییەکان بەمەبەستی گەیشتن بەڕێگەچارەیەکی ئاشتییانە کۆمەڵێک پێشنیازیان خستە ڕوو، چونکە قاسم بڕیاری لەناوبردنی مەلا مستەفای دابوو، بەڵام وا دیاربوو لە خەملاندنی هێزی نەتەوەیی کورد بەهەڵەدا چووبوو، بۆیە کردەوە سەربازییەکان بۆ ماوەی دوو ساڵ درێژەیان کێشا»(٢٤).

شۆڕشی ئەیلوول بەبەرفراوانیی پێگەی جەماوەری و پشتگیری میللیی بێ وێنە لە لایەن هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی کوردی لە شۆڕشەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە، جوتیار و کرێکاران پێگەی سەرەکیی هێزەکانی پێشمەرگەیان پێکهێنا(٢٥)، ئەو هێزانەی هەزاران کەس لە پۆلیس و سەربازی کورد چوونە ڕیزیانەوە و پەیوەندییان پێوەکردن، بەمەش ئەو شۆڕشە هەنگاوێکی نەوعیی گەورەی لە ڕێڕەوی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد هێنایە کایەوە، بەبۆچوونی ئێمە، ئەو پێشکەوتنە لە ئەنجامی زیادبوونی هوشیاری نەتەوایەتی لە نێوان کورد و ڕێوشوێنەکانی ڕژێمی دیکتاتۆری لە دژیاندا ڕووی دا.

ئەو شۆڕشە بەپێشهاتێکی دیکەی سەرنج ڕاکێش و گەشبینیش دەناسرێتەوە، ئەویش دەرکەوتنی هەندێک لایەن بوو لە ناو برا عەرەبەکاندا، کە پشتگیرییان لە داواکارییە نەتەوەییە ڕەواکانی کورد کرد، ئەوەبوو هەریەکە لە حزبی نیشتمانی دیموکراتی و حزبی نیشتمانی پێشکەوتوو خواز لایەنگیری خۆیان بۆ بیرۆکەی بەخشینی ئۆتۆنۆمیی بەکورد ڕاگەیاند، لە لایەکی دیکەشەوە سەد ڕووناکبیری عەرەب لە سەروویانەوە: کامیل چادرچی و عەبدوڕەحمان ئیبراهیم، لە ئایاری ساڵی ١٩٦١دا یاداشتنامەیەکیان بۆ عەبدولکەریم قاسم بەرزکردەوە و تیایدا داوای گفتوگۆ و دانووستانیان لەگەڵ کورد کرد.

بەڵام سەیر لەوەدایە عەبدولکەریم قاسم لەجیاتی جێبەجێکردنی ئەوەی کە لە یاداشتنامەکەدا هاتبوو، هەشت کەسی لەوانە دەسگیرکرد کە ئیمزایان لەسەر ئەو یاداشتنامەیە کردبوو، تەنانەت حوکمی پێنج ساڵ زیندانیکردنیش بەسەر هەندێکیاندا درا.(٢٦) شەڕ لە نێوان هەردوو لا کلپەی سەند و حکوومەتیش هەموو چەکە زەمینی و ئاسمانییەکانی خۆی خزاندە گۆڕەپانەکان، ئەمەش زەرەرمەندییەکی مرۆیی و مادی گەورەی لە هاوولاتیان دا.

لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا یەک دەگرینەوە کە دەڵێ(٢٧):

«بەرپاکردنی ئاگری شەڕ لە دژی کورد یەکێک بوو لەو هۆکارە گرنگانەی بەشدارییان لە ڕووخانی حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم کرد لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣، چونکە

بەبەرپاکردنی ئەو شەڕە(قاسم) بۆشاییەکی لە نێوان خۆی و گەلی کورد دروست کرد و دۆستێکی گرنگ و هاوپەیمانێکی بەهێزیشی لە دەست دا کە دەکرا لە ناخۆشییەکاندا پشتی پێ ببەستێ» لەو بارەوە ئەدمون غەریب دەڵێ: «یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی بەرپابوونی شۆڕش لە دژی قاسم، نەتوانینی ناوبراو بوو لە مامەڵەکردن لەگەڵ مەسەلەی کورد، بۆردومانکردنی گوندە سیڤیلەکان و گرتنەبەری تەکتیکاتی وەحشیگەرانەی دیکەش، وایان کرد کە ژمارەیەکی زۆری کورد ڕووبکەنە هێزەکانی بارزانی. سەرنەکەوتنی قاسم- یش لە تێکشکاندنی یاخیبووانی کورد بووە مایەی وروژاندنی نەتەوەخوازە عەرەبەکان و لە دەستدانی جەماوەر و خولقاندنی ناکۆکییەک لە ڕیزەکانی سوپادا، هەروەها لە ئەنجامی ئەو شەڕە درێژخایەنەدا عێراق بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دووچاری گرفتی ئابووری بووەوە بەتایبەتیش دوای هەڕەشەکردنی یاخیبووانی کورد لە بیرە نەوتییەکان. لە ڕاستیدا شۆڕشی کورد ئاماژەیەک بوو بۆ لاوازیی ڕژێمی قاسم»[٢٨].

دوای ڕووخانی حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم و هاتنی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستیش، شۆڕشی ئەیلوول درێژەی کێشا، ئەوەبوو لەسەرەتادا هەردوو لا لەسەر ئاگربەستێک ڕێککەوتن بەڵام بەپەلە تەواو بوو و حکوومەت دەستی بەکردەوە سەربازییەکانی کردەوە لە دژی شۆڕشی کورد. لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٦٣دا حکوومەت نوێنەرانی کوردی دەسگیر کرد و داوای ئەوەشی کرد کە مەلا مستەفا و هێزەکانی دەبێ لە ماوەی (٢٤) کاتژمێردا خۆیان بدەنە دەستەوە، لە هەمان ڕۆژیشدا هێرشێکی بەرفراوانی کردە سەر پێگەکانی کورد و شەڕ تا سەرەتای مانگی شوباتی ١٩٦٤ درێژەی کێشا[٢٩] لەو ماوەیەدا، لە ١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣، حکوومەتی بەعس لە ئەنجامی کودەتایەکی سەربازی کە عەبدوسەلام عارف و هەندێک لە گەورە ئەفسەرانی سوپا ئەنجامیان دا، ڕووخا، بەم جۆرە پاشگەزبوونەوەی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی لەو بەڵێنانەی کە بەر لە هاتنی بۆ دەسەڵات بەسەرکردایەتی کوردی دابوون و بریتی بوون لە دانان بەئۆتۆنۆمی بۆ کورد و لەجیاتی ئەوە پەنابردنی بۆ شێوازی سەربازی، یەکێک بوون لەو هۆکارە سەرەکییانەی بوونە مایەی ڕووخانی حکوومەتەکەی. لەو ڕووەشەوە دکتۆر مەجید خەدوری دەڵێت: «سەرەڕای ئەوەی کە لاچوونی حکوومەتی بەعس زیاتر لە ئەنجامی بوونی ناکۆکییە ناوخۆییەکان بوو، بەڵام بوونی جیاوازی بیروڕاش دەربارەی کێشەی کورد و دەستپێکردنەوەی شەڕ ئەو لاچوونەیان خێراتر کرد[٣٠]».

هەروەها دکتۆر سەعد ناجی جەواد لەو بارەوە دەڵێت:

«حکوومەتی بەعسیش لە خەملاندنی ئاستی هێزی بزووتنەوەی کورد شکستی هێنا[٣١]» دوای ئەوەی عەبدوسەلام عارف دەسەڵاتی داگیرکرد، تاهیر یەحیای وەکو سەرۆک وەزیران هەڵبژارد، ناوبراو دەستی کرد بەواڵاکردنی دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و لەو ڕووەوە شارەزاییەکی زۆری هەبوو و پێشتریش لە ساڵی ١٩٦٢دا، بەر لە ڕووخانی ڕژێمی قاسم، لەجیاتی نەتەوەخوازە عەرەبەکان گفتوگۆی لەگەڵ کردبوون[٣٢] و بووبووە مایەی مۆرکردنی دوو بەیاننامەی جیاواز کە لە ١٠ی شوباتی ساڵی ١٩٦٤ لە لایەن هەریەکە لە عەبدوسەلام عارف و مەلا مستەفا بارزانی ڕاگەیەنران.

دواتر ئەو مسویادەرەیە بەڕێککەوتنی ١٠ی شوبات ناونرا. بارودۆخی ئاگربەستی ڕاگەیەنراوی نێوان هەردوو لاش سەرەڕای بوونی ئەو شک و گومانەی کە بەهۆی نەگرتنەبەری هیچ ڕێوشوێنێک لە لایەن حکوومەت لە پێناوی هێنانەدی ویست و خواستی گەلی کورد لە نێوان هەردوو لادا سەری هەڵدابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بارودۆخە بەردەوام بوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەو ڕێوشوێنانەی کە دواتر حکوومەت گرتنیە بەر هەر هەموویان دژی ئەو ویستە بوون، قوڕەکەیان خەستتر کردەوە. ئەوەبوو حکوومەت لە ٣ی ئەیاری ساڵی ١٩٦٤دا دەستووری کاتیی تازەی دەرکرد کە ڕەنگدانەوەیەکی نێگەتیڤانەی بۆ سەر کوردی عێراق هەبوو، چونکە ئەمە پاشگەزبوونەوەیەک بوو لە دەستووری ٢٧ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨، کە لە ماددەی سێیەمیدا هاتووە: عەرەب و کورد لە عێراقدا هاوبەشن[٣٣]. لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٥یشدا بارودۆخەکان ڕوویان لە ئیفلیجی کرد و سەرەڕای نیازپاکیی عەبدوڕەحمان بەزازی سەرۆک وەزیران و ئەو گفتوگۆیانەش کە لە نێوان سەرکردەکانی کورد و حکوومەتدا لە ئارا دابوون، بەڵام لە ژێر فشار و هەژمونی ژمارەیەک لە ئەفسەرە دڵڕەقەکانی سوپادا، جارێکی دیکە لە ٣ی نیسانی ساڵی ١٩٦٥دا دەست بەشەڕکرایەوە لە دژی کورد، ئەو شەڕەی کە ساڵێکی تەواوی خایاند، واتە تا نیسانی ساڵی ١٩٦٦، بەبێ ئەوەی حکوومەت هیچ سەرکەوتنێکی وا بەدەست بێنێ[٣٤].

ئەوەبوو لە ١٢ی نیسان و لە ئەنجامی ڕووداوی تێکشکانی فڕۆکەیەکی هێلیکۆپتەردا، عەبدوسەلام عارف گیانی لە دەست دا و بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە دەسەڵات بۆ عەبدوڕەحمان عارفی برای گوێزرایەوە، ناوبراو داوای لە عەبدوڕەحمان بەزازی سەرۆک وەزیرانی پێشوو کرد کە وەزارەتێکی تازە پێکبهێنێ.

عەبدوڕەحمان عارف ڕقی لە ڕێگەچارەی سەربازی و بنبڕکردن بوو و پەنابردن بۆ گفتوگۆی ڕاستگۆیانە و دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەکی گونجاوی بۆ ئەو کێشەیە بەباشتر دەزانی، بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو نیازپاکییەش، حکوومەت بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ی ڕاگەیاند کە هەندێک خاڵی ئیجابی دەگرتە خۆی[٣٥]، بەڵام حکوومەتی عەبدوڕەحمان عارف هیچ بەندێکی لەمانە بەجێ نەگەیاند، بەڵکو بەمەرەکەبی سەر کاغەز مانەوە و، بەهۆی سروشتی حوکمی عەسکەریی ئەوکاتەش، عەبدوڕەحمان بەزاز نەیتوانی پێشنیاز و بیرۆکەکانی خۆی وەکو پێویست بخاتە ڕوو و پیادەیان بکات[٣٦].

وەکو ئاماژەیەکیش بۆ پاشگەزبوونەوەی حکوومەت لەو بەڵێنانەی کە بەپێی بەیانی حوزەیران بڕیاری جێبەجێکردنی دابوو، بەزاز لە سەرۆکایەتیی وەزیران لادراو داوا لە ناجی تالیب کرا کە وەزارەت پێکبێنێ، ناوبراو ئەفسەرێکی پایەبەرزبوو لە ناو سوپادا و بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردیش باوەڕی بەڕێگەچارەی ئاشتییانە نەبوو و تەواو لەگەڵ ئەوەی پێش خۆیدا جیاوازبوو[٣٧]. بەم جۆرە حکوومەتی عەبدوڕەحمان بەزاز وەکو حکوومەتەکانی تر نەیتوانی چارەیەکی گونجاو بۆ ئەو کێشە درێژخایەنە بدۆزێتەوە کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ عێراقییەکانی دووچاری ناڕەحەتی کردبووەوە، تەنانەت دوای دووبارە گەڕانەوەی حزبی بەعسیش بۆ دەسەڵات لە ١٧ی تەمووزی ١٩٦٨دا، بارودۆخی نەشەڕ و نەئاشتی لە نێوان هەردوولادا بەردەوام بوو، دواتر بۆ ماوەیەک هێمنی باڵی بەسەر بارودۆخەکاندا کێشا، ئینجا ماوەی زستانی ١٩٦٨- ١٩٦٩ تەوژمێکی توندی شەڕی بەدوادا هات[٣٨] بەڵام دیاربوو سیماکانی گۆڕانکاری خەریک بوو بەسەر سیاسەتی حزبی بەعس بەرامبەر بەکێشەی کورد سەریان هەڵدەدا، ئەویش لە میانەی بڕیارەکانی کۆنگرەی قوتریی حەوتەمی ئەو حزبە کە لە کانوونی دووەمی ١٩٦٩دا بەسترا و بەشێکی گەورەی بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد تەرخان کرابوو[٣٩]. وەک چۆن دکتۆر سەعد ناجی جەوادیش بۆی دەچێ، خاڵی وەرچەرخان و یەکلاکەرەوە لە ماوەی هەردوو مانگی ئادار و نیسانی ساڵی ١٩٦٩ هاتە پێشەوە، ئەوەبوو حکوومەت قەناعەتی هێنا کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەبێ پەنا ببرێتە بەر ڕێگەچارەی ئاشتیخوازانە، لەمیانەی گفتوگۆکردن لەگەڵ بزووتنەوەی کورد و پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا بارزانی، دکتۆر سەعد ئەمە بۆ سێ هۆکار دەگێڕێتەوە[٤٠]:

یەکەمیان سەرکەوتنی پێشمەرگە لەوەی کە بەچەکی تازەو پێشکەوتوو هێرش ببەنە سەر دامەزراوکان لە کەرکووک، دووەمیان کە گرنگیی زیاتری هەیە، ئەویش بڕیاری ئێران بوو

لە نیسانی ١٩٦٩دا بەلادان و پووچکردنەوەی پەیماننامەی ساڵی ١٩٣٧ کە لەگەڵ عێراق مۆری کردبوو. هۆکاری سێیەمیش گرفت و کێشەکانی عێراق بوون لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوت کە ڕوویان لە زیادبوون دەکرد.

پاش تاقیکردنەوەی یەکتر و ئاڵوگۆڕکردنی هاتوچۆ لە نێوان هەردوو لادا، لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠دا گفتوگۆی ڕاستەوخۆ لە بەغدای پایتەخت دەستیان پێکرد(٤١) و تیایاندا سەرکردە باڵاکانی حکوومەت و کورد بەشداربوون، بەڵام سستیی ڕێڕەوی دانوستانەکان بەڵگەیەک بوو بۆ قووڵیی ناکۆکیی و کێشەکانی نێوان هەردوولا. وادیاربوو سەبارەت بەژمارەیەک مەسەلەی گرنگ ناکۆکیی و کێشەی زۆر لە ئارادابوون، لە هەموویان بەرچاوتر دەربارەی شاری کەرکووکی دەوڵەمەند(٤٢) بەنەوت. دەکرێ بوترێ ئەو گفتوگۆیانە لە هەندێک قۆناغدا گەیشتنە لێواری شکستهێنان، بەڵام کۆششە گەرموگوڕەکانی سەدام حوسێن بوونە مایەی نەهێشتنی هەندێک ناکۆکی و دواخستنی هەندێکی دیکەو پاشان مۆرکردنی ڕێککەوتنی ئادار و دەرچوونی بەیانی ١١ی ئاداری مێژوویی کە بەیەکەم دانانی ڕاشکاوانەی حکوومەتی عێراق دادەنرێ بەمافی گەلی کورد لە ئۆتۆنۆمی، بەمەش حکوومەتی دووەمی بەعس لەو مەیدانەدا پێشڕەویی بۆ خۆی تۆمارکرد.

بەڵام دواتر سەبارەت بەشێوازی پیادەکردنی ئۆتۆنۆمی کێشە و ناکۆکیی گەورە لە نێوان حکوومەت و پارتی دیموکراتی کوردستان و بزووتنەوەی کوردیدا سەریان هەڵدا، دەریشکەوت کە حکوومەت لەو گیانە پاشەکشەی کردووە کە لە کاتی گفتوگۆکان و مۆرکردنی ڕێککەوتنەکەدا لە ئارادابوون. ئەو ناکۆکییانە زیاتر پەرەیان سەند تا ئەو ئاستەی کە حکوومەتی عێراق یەک لایەنانە یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە(٣٣)ی ساڵی ١٩٧٤ی بۆ ناوچەی کوردستان دەرکرد، لەمەشیاندا هیچ ڕاوێژکارییەکی بەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد نەکرد و کەرکووک و خانەقین و مەندەلی و کفری و سنجار و شێخان و چەندین قەزای دیکەی کوردیشی لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی دابڕی، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە دووبارە و بەشێوەیەکی توندتر شەڕ لە نێوان هەردوولادا بەرپاببێتەوە و زەرەرێکی گەورەی گیانی و ماڵیش بەر هەردوو لا بکەوێ، ئەم شەڕە نزیکەی ساڵێکی خایاند، واتە لە ئاداری ١٩٧٤ تا ئاداری ١٩٧٥، کاتێک هەریەکە لە عێراق و ئێران بەیارمەتیی جەزائیر ڕێککەوتننامەی شەشی ئاداریان مۆرکرد و بەهۆیەوە عێراق لە بەرامبەر بەڵێنی ئێراندا بەلێدانی بزووتنەوەی کورد، دەسبەرداری بەشێک لە شەتولعەرەب بوو، ئەمە لە کاتێکدا

ئەگەر کورد شەڕ نەوەستێنن، شتێکی لەو جۆرەش بووە هۆی دارمانی شۆڕشی کورد، پارتی دیموکراتی کوردستانیش خۆی هەڵوەشاندەوە و هەزاران شەڕکەری کورد و بەرپرسانیان لەگەڵ خانەوادەکانیاندا خۆیان دایە دەستی حکوومەتی عێراق و ژمارەیەکی زۆریشیان لە ئێران مانەوە. دەکرێ بوترێ لە ئەنجامی ڕێککەوتنی جەزائیردا کورد دووچاری نسکۆیەکی گەورە بووەوە کە هەرگیز حیسابێکی بۆ ئەمە نەکردبوو، هەر بۆیەش کاریگەریی توند و سەختی لێکەوتەوە، بەڵام لەسەر ئاستی درێژخایەندا دەرەنجامی نابەجێی بۆ سەر عێراقیش هەبوو، چونکە حکوومەتی عێراق بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە تەنازولی لە بەشێکی شەتولعەرەب کرد بۆ ئێران لە بری داننان بەئۆتۆنۆمیی ڕاستەقینە بۆ گەلی کوردی خۆی، تەنازولێکی لەو جۆرەش شەڕێکی دوورودرێژی لەگەڵ ئێران بەدواداهات کە هەشت ساڵی خایاند، دوای ئەوەی عێراق ویستی لەو تەنازولە پەشیمان ببێتەوە.

**٢- شۆڕشی کورد لە نێوان ساڵانی ١٩٧٦ - ١٩٩١دا:**

پاش نسکۆی شۆڕشی ئەیلول، هێمنی لە کوردستاندا درێژەی نەکێشا، چونکە ڕێککەوتنی جەزائیر تەنیا بووە مایەی وەستاندنێکی کورتخایەنی چالاکییە سەربازییەکان، بەو پێیەش کە هێشتا هۆکارەکانی شۆڕش لە ئارادابوون و ئۆتۆنۆمیی ڕاستەقینەش لە عێراق بەکورد نەدرا، بگرە ئەوەی حکوومەت بەناوی یاسای ئۆتۆنۆمی دەری کرد تەنیا بریتی بوو لە واجیهەیەکی کارتۆنیی بێ ناوەڕۆک، زوڵم و زۆرداریش لە دژی کورد لە عێراق ڕووی لە زیادبوونێکی بەرچاوکرد. لەو ماوەیەدا پارتی دیموکراتی کوردستان بەپێکهێنانی سەرکردایەتی کاتیی سەر لەنوێ ڕیزەکانی خۆی ڕێکخستنەوە، هەروەها لە مانگی ٦ی ساڵی ١٩٧٥دا ڕێکخراوێکی تازە دروست بوو کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو و بزووتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان دواتر بوو بەحیزبی سۆشیالیستی کوردستان- و عوسبەی مارکسیی لینینی گرتە خۆی. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٧٦ لە ڕێگەی مەفرەزەکانی پێشمەرگەوە سەر لەنوێ شۆڕشی کورد دەستی بەچالاکییە سەربازییەکانی خۆی کردەوە، بەڵام ئەو چالاکییانە زیاتر لە چوارچێوەی شەڕی پارتیزانیدا بوون، بەپێچەوانەی ئەو شەڕە بەرەییەی کە لە کۆتایی شۆڕشی ئەیلوولدا ڕووی دا، هۆکارەکانی ئەو گۆڕانەش دەگەڕێنەوە بۆ گۆڕانی سەنگی تەرازووی هێزەکان بۆ بەرژەوەندیی حکوومەت. دواتر گۆڕەپانی کوردی عێراقی دەرکەوتنی چەند حزبێکی دیکەی وەک حزبی گەلی دیموکراتی کوردستان و بزووتنەوەی سۆشیالیستی کورد (پاسۆک)ی بەخۆوە دیت.

دەکرێ بوترێ کە بەبەراورد لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوولدا، شۆڕشی کورد لەم قۆناغەدا مەترسییەکی گەورەی نەبوو بۆ سەر حکوومەت لە بەغدا، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک لەوانە:

زیادبوونی بەردەوامی هێزی حکوومەت لە دوای ڕێککەوتننامەی جەزائیر و بەرتەسک بوونەوەی پشتگیری دەرەکی بۆ شۆڕشی کورد، ئەمە وێڕای سەرقاڵبوونی حزبە کوردییەکان بەناکۆکییە ناوخۆیییەکانیانەوە، بەجۆرێک لەجیاتی شەڕی کورد- حکوومەت، کردەوە سەربازییەکان مۆرکی شەڕی کورد- کوردیان پێوە دیاربوو، ئەوەی شایەنی باس و مایەی داخیشە حکوومەتی عێراق لە ساڵی ١٩٨٣دا هەشت هەزار کەسی لە بارزانییەکان دەسگیرکرد و ڕەوانەی شوێنی نادیاری کردن بەڕادەیەک تا ئەمڕۆش چارەنووسیان نادیارە. هەروەها لە نیوەی دووەمی هەشتاکاندا دەستی بەئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفالە بەدناوەکان کرد لە کوردستاندا و بوونە مایەی دەسگیرکردن و دواتر لەناوبردنی نزیکەی (١٨٢٠٠٠) کورد، ئەمە سەرەڕای بەکارهێنانی چەکە کیمیاوییە قەدەغەکراوەکان لە دژی گەلی کورد. بۆردوومانکردنی شاری هەڵەبجەی کوردی بێ دیفاعیش لە لایەن فڕۆکە عێراقییەکانەوە لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨دا و بەکارهێنانی چەکە کیمیاوییەکان و کوشتنی زیاتر لە (٥) هەزار پیرو منداڵ و ئافرەتی ئەم شارە، تەنیا یەک نموونەیە بۆ ئەمە، بەڵام لەو بارەوە تاکە نموونە نییە، پاش پرۆسەی ئەنفالەکانیش شۆڕشی کورد تا ڕادەیەکی زۆر ڕووی لە بەرتەسکبوونەوە کرد و ئەم بارودۆخە تا کاتی جەنگی دووەمی کەنداو دەرئەنجامەکانی، لە دیارکردنی ناوچەی دژە فڕین بۆ کورد لە کوردستانی عێراق درێژەی کێشا.

**پەراوێزەکانی ئاخافتنی سێیەم:**

(١) دکتۆر شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو- ل ٨٣.

(٢) هەندێک کەس باس لەوە دەکەن کە هۆکاری جێهێشتنی سلێمانی لە لایەن بارزانی و بەرپاکردنی شۆڕش لە دژی حکوومەت نالەباریی باری ئابووری و کەمیی ئەو دەرماڵە حکومییە بووە کە بۆی تەرخان کراوە، لەو بارەشەوە بڕوانە: عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی شەشەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨٩.

(٣) لەو بارەوە بڕوانە: مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- شۆڕشی بارزانی ساڵی ١٩٤٣- ١٩٤٥- ئەدرەسی چاپخانەکەی دیار نییە- کوردستان- ئابی ١٩٨٦- ل ٢٤- ٢٨.

(٤) لەو بارەوە بڕوانە: مسعود بارزانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩- ٣٢.

(٥) بەهەمان مەبەست بڕوانە:

- عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی تاريخ الوزارات العراقيه- بەشی شەشەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٣.
- مەسعوود بارزانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٥- ٣٦.

(٦) ئەم وەزیرە ماجید مستەفا بووە، ناوبراو کورد بووە و لە وەزارەتی حەفتەمی نووری سەعیددا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەپلەی وەزیری بێ وەزارەت دامەزرێنراوە.

(٧) مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- شۆڕشی بارزانی ساڵی ١٩٤٣- ١٩٤٥ سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٨.

- عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنیش باس لەوە دەکات کە مەلا مستەفا بارزانی بەر لە گەیشتنی ماجید مستەفای وەزیری بێ وەزارەت بۆ ناوچەکە، ئەو داواکارییانەی ئاراستەی باڵیۆزی بەریتانی لە بەغدا کردوون، لەو بارەشەوە بڕوانە: عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی شەشەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٠.

(٨) تێبینی ئەوەش دەکرێ کە عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی تەنیا باسی پێنج داواکاری کردووە.
لەو بارەوە بڕوانە: عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی شەشەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٠.

(٩) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩١- ٢٩٢.

- مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- شۆڕشی بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥- سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٣.

(١٠) مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- شۆڕشی بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥- سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٣.

(١١) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی شەشەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٢.

- مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- شۆڕشی بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥ سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٤- ٤٥.

(١٢) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی پێنجەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٥.

- مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- شۆڕشی بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥ سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٣.

(١٣) مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد. شۆڕشی بارزانی ساڵی ١٩٤٣- ١٩٤٥ سەرچاوەی پێشوو- ل ٧٨.

(١٤) لەو بارەوە بڕوانە: عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی شەشەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٥- ٢٩٦.

(١٥) ئەم شۆڕشە بۆیە بەشۆڕشی ئەیلول ناونرا چونکە لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ بەرپابوو.

(١٦) ماددەی سێیەمی دەستووری کاتی کە لە ٢٧ی تەمووزی ١٩٥٨ دەرچوو.

(١٧) کە بریتی بوون لە پارتی نیشتمانی دیموکراتی و حزبی شیوعی عێراق و حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالستی و پارتی دیموکراتی کوردستان و پارتی سەربەخۆیی (الأستقلال).

(١٨) دکتۆر مەجید خەدوری- العراق الجمهوري- خانەی المتحدة بۆ بڵاوکردنەوە- بەیروت- چاپی یەکەم ١٩٧٤- ٢٣٨- لەیس عەبدولحەسەن ئەلزوبێدی- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٩.

(١٩) مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- کورد و شۆڕشی ١٤ی تەمووز- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣١.

(٢٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣٧.

(٢١) لوقا زدوو- المسألة الكوردية والقوميات العنصرية في العراق- بەیروت- ١٩٦٩- چاپی یەکەم- ل ١١-١١٤.

(٢٢) ئەدمون غەریب- الحركة القومية الكوردية- خانەی ئەلنەهار بۆ بڵاوکردنەوە- بەیروت ١٩٧٣- ل ٤٨.

(٢٣) لە: جەلال تاڵەبانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨٨- ٢٩٦ وەرگیراوە.

(٢٤) دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٤٢.

(٢٥) وشەی پێشمەرگە، وشەیەکی کوردییە و مانای خۆ بەختکەر دەگەیەنێ و باڵی سەربازیی شۆڕش پێک دێنن.

(٢٦) لەیس عەبدولحوسێن زبێدی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٥.

(٢٧) دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٤٢

- ئەدمون غەریب- سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٨.

(٢٨) ئەدمون غەریب- سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٨.

(٢٩) دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٦٠.

(٣٠) دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٦٠.

(٣١) دکتۆر سەعد ناجی جەواد- سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٦.

(٣٢) ئەدمون غەریب- سەرچاوەی پێشوو- ل ٨٢.

(٣٣) سەرچاوەی پێشوو- ل ٨٤.

(٣٤) دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٦١.

- دکتۆر سەعد ناجی جەواد- سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٨، ئەدمون غەریب- سەرچاوەی پێشوو- ل ٨٩.

(٣٥) سەبارەت بەدەقەکانی ئەو بەیاننامەیە بڕوانە ل ١٢٩- ١٣٣ی ئەو تێزە.

(٣٦) حەبیب محەمەد کەریم- چەند تێبینییەک دەربارەی شۆڕشی ئەیلوول- لێکۆڵینەوەیەکە لە گۆڤاری کادری زمانحالی پارتی دیموکراتی کوردستان بلاوکراوەتەوە- ژمارە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٩٢- چاپخانەی خەبات- ل ٨.

- دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ٣٦١- ٣٦٥.

(٣٧) دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٦٥.

(٣٨) دکتۆر سەعد ناجی تالیب- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٥

(٣٩) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٦.

(٤٠) لە درێژەی ئەمەدا بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٧- ١٥٩.

(٤١) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٦٢.

(٤٢) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٦٣.

# داواکارییەکانی کورد

بایەخ و زەروورەتی باسکردن لەو بابەتە و زانینی ڕاستی و ناوەڕۆکی نیازەکانی کورد بەرامبەر بەعێراق، لە میانەی دیراسەکردنی ئەو داواکارییانەی کە کورد لە ماوەکانی ڕابردوودا خستوونەتیە ڕوو وەکو چوارچێوەیەکی گونجاو بۆ مافەڕەواکانی، لە بوونی نائاشکرایی و ناوردبینی، بگرە دژە پڕوپاگەندەیەکی زۆریش دەربارەی ئەو نیازانە هەڵدەقوڵێ، لایەنە شۆڤێنیستەکان لە زۆر لەو ماوانەدا بانگەشەیان بۆ ئەوە کردووە کە بزووتنەوەی کوردی بزووتنەوەیەکی جیاخوازە و کوردیش داوای جیابوونەوە لە عێراق دەکەن[1]، هەندێک لەوانە لە حکوومەتە یەک لە دوایەکەکاندا پلەو پایەی گرنگیان هەبووە، هەر ئەمەش پاڵی بەشاکر خەسباکی مێژوونووسی بەناوبانگی عێراقی (کە یەکێکە لە ڕۆشنبیرانی عەرەب)ەوە ناوە کە بڵێت: «حکوومەتەکانی پێشوو لە درندەییدا گەیشتنە ئاستی ئەوەی هەر کوردێک کە داوای چاکسازی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ ناوچەی خۆی بکات، بەگیانی جیاخوازی تۆمەتباری بکەن»[2] ئەو لایەنانەش کە پڕوپاگەندەی لەو جۆرەیان بڵاودەکردەوە مەبەستیان هێنانەدی ئامانجی جۆراوجۆربوو، یەکەمیان تێکدانی یەکێتی نیشتمانی و کوتانی بزمارێک بوو لە نێوان عەرەب و کوردی برا کە پەیوەندی زۆر بەیەکەوە دەیانبەستێتەوە.

لەگەڵ قەناعەتی تەواوی ئێمە بەوەی کە جیابوونەوە یان سەربەخۆیی بەلای گەلی کورد مەسەلەیەکی پێچەوانە یان شتێکی نامۆ نییە و ناکرێ ئەو گەلە لە میللەتانی دیکە بەکەمتر بزانرێ و جیابوونەوە یان سەربەخۆییش لایەنێکە لە لایەنەکانی ڕاستی یاخود مافی بڕیاردانە لەسەر چارەنووس، بگرە یەکێکە لە هەنگاوە کردەیییەکانی ئەو ماف و بنەمایەی کە لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانی بەوە پێناسە کراوە کە:

«بنەمایەکە- ئاماژە بەڕاستی دەکات- هەر گەلێکیش ئازادە لەوەی ئەو حکوومەت و سیستەمە سیاسی و شارستانییە دەستنیشان بکات کە لەگەڵ پێداویستییەکانیدا دەگونجێ»[3].

میساقە نێودەوڵەتییەکانیش بەتایبەتی میساقی کۆمەڵەی گەلان و نەتەوە

یەکگرتووەکـان دانیـان بەو مـافـە داناوە، لە برگـەی دووەمی مـاددەی یەکـەمی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە:

یەکێک لە مەبەستەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بریتییە لە: «بووژاندنەوەی پەیوەندییە دۆستـایەتییـەکـان لە نێـوان گـەلاندا لەسـەر ئەسـاسی ڕێزگـرتنی ئەو بنەمـایەی ڕێگە بەیەکسـانی مـافـەکـان لە نێوان گـەلان دەدات و هەریەکەشیـان خـاوەنی مـافی دیارکـردنی چارەنووسی خۆیان هەبێ». هەروەها لە مـاددەی ژمـارە (٥٥)ی هەمـان ئەو میسـاقـەدا هاتووە: «لە پێناوی فەراهەمکردنی پێداویستییەکانی سەقامگیری و خۆشگوزەرانیی بۆ دروستبوونی پەیوەندی ئاشتی و دۆستـانە لە نێـوان گەلانـدا لەسەر ئەساسی ڕێزگرتن لەو بنەمایەی کە ڕێگە بەیەکسـانی مـافەکان لە نێوان گەلان دەدات و هەریەکەشیـان خـاوەنی مـافی دیارکـردنی چارەنـووسی خۆیان هەبێ» ئەمـە لە کـاتێکدا برگـەی دووەم لە مـاددەی سێیەمی هەمان ئەو میساقەدا باس لەوە کراوە:

«بۆ ئەوەی هەموو ئەندامـانی دەستە، ماف و سیماکانی سیفەتی ئەندامێتی بەنیازپاکی بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن، دەبێ بەهەموو ئەو ئیلتیزامـاتانەوە پابەندبن کە ئەو میساقە لە خۆی گـرتوون». هەروەها مـاددەی ژمـارە (٥٦)ی هەمـان ئەو مـیـسـاقـە دەڵێ: «هەمـوو ئەندامـان پەیمان دەدەن کە چ بەتەنیا یان پێکەوە و بەهاوکاری دەستە، ئەوەی لە دەستیـان بێ بیکەن لە پێناوی گەیشتن بەو مەبەستانەی کە لە ماددەی ژمارە (٥٥)دا هاتوون».

سـەرەڕای ئەوەی باسـمـان لێـوە کـرد و لە مـیـانەی خـسـتـنەڕووی ئەو یاداشـتـنامـە و داواکاریانەی کە هەموو سەرکردایەتییە بەرپرسەکانی کورد لە زۆربەی قۆناغـەکـاندا، هەر لەکاتی دەرچوونی بڕیاری کۆمەڵەی گەلانەوە سەبارەت بەگێڕانەوەی ویلایەتی مووسڵ بۆ عـێـراق لە ١٦ی کـانوونی یەکـەمی ١٩٢٥تا ڕۆژی ئەمـڕۆمـان، دەردەکـەوێ کـە لە هیچ یەکێکیاندا داوای جیابوونەوە لە عێراق نەکراوە، بەڵکو هەموو ئەو داواکاریانە لە نێوان لامەرکەزیی ئیـداری و یەکـێتی فـیـدراڵی و دانانی کـوردسـتـانی عـێـراق بەهەرێمـێک لە چوارچێوەی ئەو یەکـێـتـییـەدا خولاونەتەوە، ئەمـەش لە هەمـوو حاڵەتێکدا لەویستی ژیان بەکەرامەت و لە ئاستێکی گونجاوی مافە نەتەوایەتییە ڕەواکان لە ناو سنووری عێراقدا تێپەڕی نەکردووە[٤].

لەو بارەوە دکـتـۆر حـەسـەن چەلەبی دەڵێت: «لە دوای بڕیاری گـێـڕانەوەی مـووسڵ و تەواوی ناوچەکانیان بۆ عێراق لە ساڵی ١٩٢٥دا، کورد ڕۆژێکیش داوای جیابوونەوەیان

نەکردووە، بگرە هەموو ئەوەی داوایان کردووە و لە پێناویدا خەباتیان کردووە ، ئازادی لە کاروبارە تایبەتییەکان و سەربەخۆیی زاتی بووە لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتیدا»[٥] دەنگدانی هاوولاتیانی کوردیش لەویلایەتی مووسڵ، بەتایبەتی لە لیوای سلێمانی بۆ بەرژەوەندیی یەکگرتن لەگەڵ عێراق لەبەردەم لیژنەی گەلان لە ساڵی ١٩٢٥[٦] دا، بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر نەبوونی نیازی جیابوونەوە لە لایەن کورد، بگرە ئەوان داوای مافە نەتەوایەتییە ڕەواکانی خۆیان دەکەن لە چوارچێوەی خاکی ولاتدا، ئەو مافانەش کە بەشێوازێک لە شێوازەکانی دیموکراسییەت دادەنرێن، لەسەر هەموو ئاستێکدا ناسراون و لە زۆربەی ئەو ولاتانەشدا دانیان پێدانراوە کە لە نەتەوە و تایەفەی جۆراوجۆر پێک دێن.
دەکرێ دروشمی (دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) کە لە لایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بەرز کرابووەوە بەڕاستگۆترین دەربڕین دابنرێ بۆ داواکاریەکانی کورد و ناوەڕۆکەکانی. ئەمەو سەبارەت بەڕەتکردنەوەی تۆمەتی جیابوونەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان دەڵێت:

«ئەو بیرۆکە ژەهراویانەی دەربارەی بوونی بزووتنەوەیەک لە نێوان گەلی کورد بلاو دەکرێنەوە کە گوایا مەبەستی جیابوونەوەی هەبێت لە کۆماری عێراق، لە سەرچاوەی دیاریکراوەوە دەردەچن و مۆرکی ئەوانەشیان پێوەیە کە بلاویان دەکەنەوە و هیواکانیشیان لەبەردەم بەردی یەکێتی عەرەبی کوردیدا تێکوپێک شکاون.

ئەو ئیستیعمارەی کە شۆڕشی عێراق گورزێکی لێ وەشاندووە، هێشتا لە ئەگەری گێڕانەوەی دەسەلات لە ڕێگەی پیادەکردنی پلانی بونیادنراوە لەسەر سیاسەتی- فرق تسد- ی ئیستیعماریەوە بێ ئومێد نەبووە، ئەو سیاسەتەی کە لە پیادەکردنیدا چ قازانج و سوودێکی گەورەی لێ بینیوە.... بەبۆچوونی ئێمە، جیابوونەوەی هەر میللەتێک لە هەر ولاتێکی دونیادا دەبێ لە ڕوویێکی دیاریکراوەوە سەیری بکرێ، ئەویش ئەوەیە ئاخۆ ئەو جیابوونەوەیە دەبێتە مایەی لاوازکردنی هەژموونی ئیستیعمار و لەقاندنی پێگەکەی و بەهێزکردنی بەرەی گەلان و سەرخستنیان لە خەبات لە پێناوی ئاشتی و ئازادی و دیموکراسیدا؟

ئەگەر وەلام سەلبی بوو، واتە ئەمە دەبووە مایەی بەهێزکردنی ئیستیعمار و توندکردنی جێ پێی و لاوازکردنی بەرەی گەلان و دواخستنی خەباتیان، ئەو کاتە جیابوونەوە شەڕو نەخۆشی دەبێ نەوەک تەنیا بۆ ئەو دەوڵەتانەی مەبەستیانە لێیان جیاببنەوە بەڵکو بۆ خودی ئەو گەلانەش کە داوای جیابوونەوە دەکەن، لەو حاڵەتەشدا دەبێ دژایەتیی

جیابوونەوە بکرێ.... لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیانەشدا بەئاشکرا دەردەکەوێ کە جیابوونەوەی کوردستان لە کۆماری عێراقی لاو کارێکە لە بنەڕەتدا دژی بەرژەوەندییەکانی هەردوو گەلی عەرەب و کوردە و خزمەتی ئیستیعمار دەکات، نەوەک تەنیا لە عێراقیشدا بەڵکو لە وڵاتانی هەردوو ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ناوەڕاستدا دەبێتە مایەی بەهێزکردنی پێگەکەی و ڕاستەوخۆش بزووتنەوەی ئازادیخوازی تەواوی گەلانی ئەو ناوچەیە لاواز دەکات بەگەلی کوردیشەوە»[٧].

**یەکەم: یاداشتنامەی شێخ مەحموودی حەفید و کەسایەتییەکانی کورد:**

دەکرێ بوترێ یەککگرتن لەگەڵ عێراق ناوەڕۆک و ئامانجی یەکەم یاداشتنامە بووە کە لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا لە لایەن شێخ مەحموودی حەفید و چل کەسایەتیی کوردیی ئاراستەی موعتەمەدی سامی لە بەغدا کراوە و تیایدا ئەمەی خوارەوە هاتووە:

«بەو پێیەی لەمەوبەر حکوومەتی بەریتانی ویستی خۆی بەرامبەر بەرزگارکردنی گەلانی ڕۆژهەڵات لە دەستی تورک و یارمەتیدانیان لەسەربەخۆیی بوونیان دەربڕیوە، بۆیە سەرکردەکان بەسیفەتی ئەوەی کە نوێنەری دانیشتوانی کوردستانن، داوای لێ دەکەن (لە بەریتانیا) (کە بیانخاتە ژێر پارێزگاری خۆی و بەعێراقەوە بیانبەستێتەوە، بۆ ئەوەی کە سوودەکانی پەیوەندییەکی لەو جۆرە لە دەست نەدەن هەروەها ئەوان داوا لە حاکمی مەدەنی لە عێراق دەکەن نوێنەرێکی خۆی بنێرێتە لایان بۆ ئەوەی دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکات و گەلی کورد بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە و لەسەر بنەماکانی مەدەنییەت و بەسەرپەرشتی بەریتانیا و حکوومەت بتوانێ پێشکەوتن وەدەست بێنێ، لە کاتێکیشدا ئەگەر یارمەتییان بدرێ و پارێزگارییان لێ بکرێ، ئەوان پەیمان دەدەن کە بەفەرمان و ڕێنماییەکان ڕازی دەبن»[٨].

**دووەم: ئەو یاداشتنامەیەی لە لایەن ژمارەیەک نائیبی کوردەوە بەرز کراوەتەوە:**

لە شوباتی ساڵی ١٩٣٠دا شەش نائیبی کورد[٩] لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقیدا، یاداشتنامەیەکیان بۆ مەندوبی سامی بەرزکردەوە و تیایدا داوای هەندێک چاکسازی ئیداری و کۆمەڵایەتی دەکەن بەڵام هیچ وەڵامێک وەرناگرنەوە، پاشان ئەو نوێنەرانە یاداشتنامەکەیان ئاراستەی سەرۆک وەزیرانی عێراق کرد.

دەکرێ گرنگترین ئەو داواکارییانەی کە لە یاداشتنامەکەدا هاتوون لە خوارەوە کورت بکرێنەوە:(١٠).

١- دامەزراندنی لیوایەکی کوردی کە ناوەندەکەی دهۆک بێ و قەزا کوردییەکانی لیوای مووسڵیش: ئاکرێ، زێبار، ئامێدی، زاخۆ سەر بەو لیوایە بن و لە دامەزراندنیشیدا هەمان ئەو بنەمایانە بگیرێنە بەر کە لە پێکهێنانی لیوا کوردییەکانی دیکەدا پیادە کراون، وەک ئەوەی تیایدا زمانی کوردی بکرێ بەزمانێکی ڕەسمی.

٢- دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتییەکی مەعاریفی گشتی تایبەت بەلیوا کوردییەکان، بەڕێوەبەرەکەشی کوردبێ و بنکەکەشی لە یەکێک لە لیوا کوردییەکان بێت.

٣- یەکخستنی ئیدارەی هەر چوار لیوای کوردی- سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و دهۆک- و دامەزراندنی پشکێنەرایەتییەکی گشتی و یەکێک لەو کوردانە سەرۆکایەتی بکات کە بەشارەزایی و پسپۆڕی ناسراون.

٤- یەکسانیکردن لە نێوان ناوچەی کوردی و ناوچەکانی دیکە لە مەسەلەی خەرجکردن و بودجەدا، ئەو بودجەیە دەبێ لەسەر ئەساسی ڕێژەی دانیشتوان و ئاستی داهاتەکان بێ کە حکوومەت لە ناوچەکاندا وەدەستیان دێنێ، ئەمە بەداهاتی گومرگەکانیشەوە.

بەڵام ئەو یاداشتنامەیە لە لایەن حکوومەتەوە پشتگوێ خراو وەکو مەرەکەبی سەرکاغەز مایەوە.

## سێیەم: یاداشتنامەی ساڵی ١٩٤٤ی مەلا مستەفا بارزانی:

هەروەها مەلا مستەفا بارزانی بەناوی شۆڕشی کوردەوە لە سەرەتای کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٤دا یاداشتنامەیەکی ئاراستەی حکوومەتی عێراق کرد کە داواکارییەکانی شۆڕشی گرتبووە خۆی و لەمەی خوارەوەدا کورتیان دەکەینەوە[١١]:

١- پێکهێنانی ولایەتی کوردستان لە لیواکانی (کەرکووک، سلێمانی، هەولێر و قەزا کوردییەکان لە لیوای مووسڵ کە بریتین لە: زاخۆ، ئامێدی، دهۆک، ئاکرێ، شێخان، سنجار و هەردوو قەزای خانەقین و مەندەلی لە لیوای دیالا).

٢- داهێنانی وەزارەتێک کە لە لایەن وەزیرێکی کوردەوە سەرپەرشتی بکرێ و ئەرکی کاروباری ویلایەتی کوردستانی پێ بسپێردرێ.

٣- دامەزراندنی جێگری وەزیرێکی کورد لە هەر وەزارەتێک لە وەزارەتەکاندا.

٤- لەو ویلایەتەدا زمانی کوردی بەزمانی ڕەسمیی دابنرێ.
٥- لە ویلایەتی کوردستاندا کاروباری سەربازی و دارایی و دەرەوە تایبەت دەبن بەدەوڵەتی ناوەندی.
٦- قەرەبووکردنەوەی زەرەرمەندبووان.
٧- کردنەوەی قوتابخانە و نەخۆشخانە و دروستکردنی ڕێگاوبان و ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە.
٨- گێڕانەوەی دوورخراوان بۆ ناوچەکە و ئازادکردنی بەندکراوان.
٩- لادان یان گواستنەوەی ئەو کارمەندانەی کە بەوەرگرتنی بەرتیل و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات ناوبانگییان دەرکردووە.

## چوارەم: داخوازییەکانی ساڵی ١٩٦٣ی پارتی دیموکراتی کوردستان:

هەفتەیەک دوای ئەوەی عێراق و میسر و سوریا میساقی یەکگرتنیان لە قاهیرە لە ١٧ی نیسانی ١٩٦٣ مۆرکرد، شۆڕشی کورد داخوازییەکانی خۆی ئاراستەی حکوومەتی عێراق کرد،[١٢] کە لە شێوەی پرۆژەیەکدا خۆیان نواند و چۆنیەتی ڕێکخستنی دەسەڵاتە ناوەندی و ناوخۆییەکان لە عێراق و پسپۆڕیی و دەسەڵاتەکانی هەریەکێکیشیان گرتبووە خۆیان، دەربارەی سروشت و تایبەتمەندییەکانی دەسەڵاتی ناوخۆی کوردیش ئەمەی خوارەوە هاتووە:

چوارەم:

١- پیادەکردنی مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد لە ڕێگەی ئەنجوومەنێکی تەنفیزیەوە دەبێ کە لە ئەنجوومەنێکی تەشریعی هەڵبژێردراو لە ڕێگەی دەنگدانی نهێنیی ئازاد و ڕاستەوخۆی دانیشتوانی کوردستانەوە سەری گرتبێ.
٢- ئەو دەزگا نەتەوەییەی کە لە سەرەوە بڕیاری لەسەر دراوە، تایبەتمەند دەبێ بەکاروباری: دادوەری، ناوخۆ، پەروەردە و فێرکردن، تەندروستی، کشتوکاڵ، تووتن، شارەوانییەکان، کار و کاروباری کۆمەڵایەتی، ئاوەدانکردنەوە و گەشتوگوزار و هەموو ئەو لایەنانەی پەیوەندییان بەبەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی و کۆمەڵایەتی و بووژاندنەوەی ئابووری و مەسەلەی ترەوە هەیە کە لە سنووری تایبەتمەندێتی حکوومەتی ناوەندیدا نەهاتوون.
٣- ئەنجوومەنی تەشریعی: هەموو ئەو یاسایانە دادەڕێژێ کە بۆ پیادەکردنی ئەو

دەسەلاتانە پێویستن کە لە بڕگەی دووەمدا باسیان لێوە کراوە، هەروەها ئەنجوومەنی تەشریعی هەڵدەستێ بەهەڵبژاردنی سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی، مافی کێشانەوەی متمانەی ئەو سەرۆکە و ئەندامانی ئەنجوومەنی تەنفیزیشی هەیە.

٤- ئەنجوومەنی تەنفیزی لە سنووری ئەو دەزگا نەتەوەییەی کە لە بڕگەی دووەمدا باسی لێوەکراوە، هەڵدەستێ بەمومارەسەکردنی دەسەلاتی تەنفیزی و ئەو یاسا و سیستەمە گشتییانەش جێبەجێ دەکات کە لە لایەن ئەنجوومەنی تەشریعی و حکوومەتی ناوەندییەوە بەگوێرەی پەیوەندییان بەکوردستانەوە دەردەکرێن. ئەنجوومەن مافی دامەزراندنی کارمەندانی دەزگا ئیداری و فەرمانگەکانی دیکەشی هەیە لە ناوچەکەدا و لە هەموو ئەو ئەرکانەشیدا بەرامبەر بەئەنجوومەنی تەشریعی بەرپرس دەبێ.

ئەو پرۆژەیە مەرجی ئەوەشی گرتبووە خۆی کە ناوچەی کوردستان خاوەنی دەستووری تایبەت بەخۆی بێ[١٣]، سەرەڕای دیارکردنی ئەو ڕەگەز و داهاتانەی کە دارایی ناوچەکەیان لێ پێکدێت[١٤] و بەپێی پرۆژەکە- لیواکانی سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و ئەو قەزا و ناحیانەش دەگرێتەوە کە لە سنووری هەردوو لیوای مووسڵ و دیالەن و زۆربەی دانیشتوانیان کوردن[١٥] لە پرۆژەکەدا داوای ئەوەش کراوە کە جێگری سەرۆک کۆمار کوردبێ و لە لایەن دانیشتوانی کوردستانەوە هەڵبژێردرێ[١٦] وێڕای بوونی ژمارەیەک نوێنەر کە بەپێی ڕێژەی کورد لە عێراق نوێنەرایەتی گەلی کوردستان بکەن، هەروەها لە وەزارەتی ناوەندیشدا ژمارەیەک وەزیر هەبن لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکەدا گونجاوبین[١٧] قوتابیانی کوردیش دەبێ لە زانکۆی بەغدا و پەیمانگا بالاکان و کۆلێژی سەربازی و کۆلیژەکانی پۆلیس و ئەرکان و هێزی ئاسمانی وەربگیرێن، بەپێی ژمارەی دانیشتوانی کوردستانیش مافی بەشداریکردنیان لە بەعسە و زەمالەکانی دەرەوەدا هەبێ[١٨] هەر لەو پرۆژەیەدا داواکراوە کە لە ناو سوپادا فەیلەقێکی کوردی دابمەزرێنرێ و لە کۆکردنەوەی سەرباز و ئەفسەرانی خەڵکی کوردستان لە ناو سوپای عێراق پێک بێت ، تیایدا دانیشتوانی ئەو هەرێمە خزمەت دەکەن، هەموو ئەو ئەفسەر و ئەفسەر ڕیزانەش بگێڕدرێنەوە ناو سوپای عێراق کە لەبەر هۆکاری سیاسی و نەتەوەیی دەرکراون، ئەوانە دەگێڕدرێنەوە بۆ ئەو یەکە سەربازییانەی لە کوردستان هەڵیانداوە و یەکێک لە جێگرەکانی سەرۆکی ئەرکانی سوپاش کورد بێت[١٩] لە پرۆژەکەدا ئەوەش هاتووە کە هەموو دەقێکی تەشریعی- سەرچاوەکەی هەرلایەکیش بێت- بەبەتاڵ دادەنرێ لە کاتێکدا ئەگەر ببێتە مایەی بەستنەوەی مافە نەتەوەیی و دیموکراسییەکانی گەلی کورد

یان بوارەکانی بەخشینیان بەرتەسک بکاتەوە[٢٠]. دکتۆر حەسن چەلەبی وای بۆ دەچێ کە گەلی کورد بۆ یەکەم جار لە ڕێگەی ئەو یاداشتنامەیەدا داوای فیدراڵییان کردووە، ئەگەرچی بەنائاشکرا ئاماژە بەسیفەت و پێداویستییەکانی ئەو سیستمە کراوە[٢١].

**پێنجەم: پرۆژەی ئۆتۆنۆمیی پێشنیازکراو لە لایەن پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٣دا:**

پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٩ی ئاداری ساڵی ١٩٧٣دا پرۆژەیەکی ئۆتۆنۆمیی پێشکەشی حکوومەتی عێراق کرد[٢٢] پرۆژەکە خاڵە گشتییەکانی پێکهاتەو دەسەڵاتەکانی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی لە هەرێمی کوردستان گرتبووە خۆی کە بریتین لە ئەنجوومەنی تەشریعی هەرێمایەتی. لە پرۆژەکەدا هاتووە کە هەرێمی کوردستان ئەنجوومەنێکی تەشریعیی هەڵبژێردراوی دەبێت[٢٣] و تایبەت دەبێ بەداڕشتنی یاسا هەرێمییەکان و دانانی باجە ناوخۆییەکان و هی تر لە داهاتە هەرێمییەکان[٢٤] و گفتوگۆ و بڕیاردان لەسەر بوودجەی هەرێم و ڕازیبوون لەسەر پلانەکانی بووژاندنەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری هەرێم لە چوارچێوەی پلاندانانی گشتی وڵاتدا[٢٥] و بەخشین و کێشانەوەی متمانە و لێپرسینەوە لەگەڵ سەرۆک و ئەندامان[٢٦] و دانانی سیستمی ناوخۆیی و هەڵبژاردنی سەرۆک بۆ ئەنجوومەنی تەنفیزی.[٢٧] هەروەها لە پرۆژەکەدا هاتووە: هەرێم ئەنجوومەنێکی تەنفیزی دەبێ و لەبەردەم ئەنجوومەنی تەشریعیدا بەرپرس دەبێ[٢٨]، سەرۆکەکەشی لە لایەن ئەنجوومەنی تەشریعییەوە هەڵدەبژێردرێ، پاشان بڕیارێکی کۆماری دەربارەی دامەزراندنەکەی دەردەکرێ[٢٩]، ئەندامانی ئەنجوومەنی تەنفیزیش لە لایەن سەرۆکی ئەنجوومەن و دوای وەرگرتنی ڕەزامەندیی ئەنجوومەنی تەنفیزی دەپاڵێورێن ئینجا سەرۆک کۆمار دایاندەمەزرێنێ و ئەو ئەندامانە پلەی وەزیریان دەبێ[٣٠]. ئەنجوومەنی تەنفیزی هەڵدەستێ بەسەرپەرشتیکردنی ئیدارەی فەرمانگە هەرێمییەکان واتە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی حکوومەتی ناوەندی لە چوارچێوەی هەرێمدا، لەو کاروبارانەی کە لە سنووری تایبەتمەندییە ناوەندییەکان دەردەچن و ئەو کاروبارانەش کە لە یاسای پارێزگاکاندا هاتوون و پەیوەندییان بەدەسەڵاتی یەکە ئیدارییەکانەوە هەیە[٣١]، دوانزە وەزارەتی هەرێمیش بەئەنجوومەنی تەنفیزییەوە دەبەسترێنەوە کە بریتین لە وەزارەتەکانی:

پەروەردە و فێرکردنی باڵا، ئیدارەی ناوخۆیی، تەندروستی و کارو خزمەتگوزارییە

کۆمەڵایەتییەکان، ئەشغال و نیشتەجێکردن، دارایی و خەزێنە، پلاندانان، شارەوانی و گەشتوگوزار، کشتوکاڵ کە کشتوکاڵ و چاکسازی کشتوکاڵی و ئاودێری دەگرێتەوە، ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری و لاوان، داد و ئەوقاف، پیشەسازی، بازرگانی ناوخۆیی و ئیعاشە، جگە لە ئەنجوومەنی پلاندانانی هەرێمی و هەردوو دەزگای پشکنین و بەدواداچوون و دیوانی ئەنجوومەن[٣٢]، سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزیش ئەندامی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق دەبێ بەپلەی جێگری سەرۆک وەزیران[٣٣].

لە پرۆژەکەدا جەخت لەسەر زەروورەتی دامەزراندنی دادگای باڵای دەستووریش کراوەتەوە کە نیوەی ئەندامانی لە لایەن ئەنجوومەنی تەشریعی هەرێمی کوردستان دادەمەزرێنرێن، دادگاکەش تایبەت دەبێ بەچاوخشاندنەوە بەدەستووریەتی یاسا هەرێمییەکان، لە کاتێکدا ئەگەر بۆ دەسەڵاتە تەشریعییەکانی ناوەندی دەرکەوت کە یاسایەکی هەرێمی پێچەوانەی دەستوور یان یاساکانی ناوەندییە[٣٤].

دادگای باڵای دەستووری بەوەش تایبەت دەبێ کە چاو بەدەستووریەتی یاسا ناوەندییەکاندا بخشێنێتەوە لە کاتێکدا ئەگەر بۆ ئەنجوومەنی تەشریعی هەرێمی دەرکەوت کە یاسایەکی مەرکەزی پێچەوانەی دەستوورە، لەوانەی کە پەیوەندییان بەئۆتۆنۆمیی یان تایبەتمەندییەکانی هەرێمەوە هەیە یاخود ئیلتیزاماتی تازە بەسەر هەرێمدا دەسەپێنن[٣٥].

پرۆژەکە بڕیار لەسەر ئەوەش دەدات کە هەر یاسا یان دەقێک پەیوەندییان بەئۆتۆنۆمیی و یاساکانییەوە هەبێ، دەبێت بەر لە جێبەجێکردنیان لە لایەن ئەنجوومەنی تەشریعی هەرێمییەوە ڕەزامەندییان لە بارەوە وەربگیرێ[٣٦] و پرۆژەی هەمووارکردنی بڕگەکانی دەستوور و یاسا ناوەندییەکانیش کە پەیوەندییان بەئۆتۆنۆمییەوە هەیە بەر لە پێشکەشکردنیان بەو دەسەڵاتانەی کە تایبەتن بەهەموارکردنی دەستوور و یاسا ناوەندییەکان، دەبێ ڕەزامەندیی ئەنجوومەنی تەشریعی هەرێمیان لە بارەوە وەربگیرێ[٣٧]. شایەنی باسکردنە حکوومەتی عێراق بەشێوەیەکی نا ئاشکرا ئەو پرۆژەیەی ڕەت کردەوە، بەبەڵگەی ئەوەی کە یەک لایەنانە و بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان- وەک چۆن پێشتر لەسەری ڕێککەوتبوون- یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە (٣٣)ی ساڵی ١٩٧٤ی دەرکرد، ئەمەش لە بەشی داهاتوودا دەبێتە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ.

**شەشەم: یاسای بنەڕەتیی ویلایەتی کوردستانی فیدراڵی:**

پاش دەستپێکردنەوەی شەڕ لە نێوان حکوومەتی بەغدا و شۆڕشی کورد لە دوای مانگی ئاداری ١٩٧٤، شۆڕشی کورد پرۆژەیەکی بەناوی (یاسای بنەڕەتیی ویلایەتی کوردستانی فیدراڵی) ئامادەکرد، واتە دەستووری ویلایەتی کوردستان و ١١٥ مادەش دەگرێتە خۆی.

ئەو پرۆژەیە لە چوارچێوەی داواکاری و ویست و خواستەکانی گەلی کورد خۆی دەنوێنێ بۆ ئەوەی ببێتە بناغە بۆ گفتوگۆ و دانوستان لەگەڵ هەر حکوومەتێکدا کە دەسەڵات بگرێتە دەست لە بەغدا[٣٨]، بەڵام نسکۆهێنانی شۆڕش بەهۆی ئەو پیلانە نێو دەوڵەتییە گەورەیەی کە پێی ڕێککەوتننامەی جەزائیرلە ٦ی ئاداری ساڵی ١٩٧٥ تووشی بوو، هەر ئەمە وای کرد پرۆژەکە نەچێتە گۆڕەپانی جێبەجێکردنی پراکتیکییەوە، بەمەش پرۆژەکە بوو بەبەڵگەیەکی هەڵگیراو لە ئەرشیفی پارتی دیموکراتی کوردستاندا.

ماددەی سێیەمی پرۆژەی ئاماژەپێکراو باسی لەوە کردووە کە ویلایەتی کوردستانی فیدراڵی لە پارێزگاکانی کەرکووک و سلێمانی و هەولێر و دهۆک و قەزاکانی سنجار و شێخان و ئاکرێ و حەمدانییە و تەلکیف و خانەقین و ناوەندی مقدادیە (شارەبان) و مەندەلی (جگە لە ناحیەی بلدروز) و ناحیەی مەنسوریە پێک دێت.

لە پرۆژەکەدا باس لە دامەزراندنی ئەنجوومەنێکی تەشریعی کراوە کە نوێنەرانی ویلایەت دەگرێتە خۆی، ئەوانەی لەسەر بناغەی هەڵبژاردنی گشتی و نهێنیی ڕاستەوخۆ بەڕێژەی یەک نوێنەر بۆ هەر (٢٠,٠٠٠) هاووڵاتی بەلایەنی کەم هەڵدەبژێردرێن. ئەو ئەنجوومەنە دەبێتە نوێنەر بۆ سەروەریی ویلایەت و باڵاترین دەسەڵات تیایدا و مافی داڕشتنی ئەو یاسایانەشی هەیە کە پەیوەندییان بەکاروبارەکانییەوە هەیە[٣٩]، ئەمە جگە لە لە هەمواركردنی یاسای بنەڕەتی[٤٠] و دیارکردنی بودجەی گشتی ویلایەت و شوێن گۆڕینی لە نێوان بەشە جۆراوجۆرەکانی و ڕازیبوون لەسەر هەر خەرجییەک کە تیایدا نەهاتبێ[٤١] و بڕیاردان لەسەر پلانە دووروودرێژەکانی گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری ویلایەت بەهاوکاری لەگەڵ پلاندانانی گشتی کۆماری عێراق[٤٢] پێشنیازکردنی لائیحە یاساییەکان کە خاوەنی مۆرکی گشتین بۆ ئەنجوومەنی نیشتمانی ئیتیحادی[٤٣] و سەپاندنی باج و گومرگ و هەمواركردن و نەهێشتنیان لە چوارچێوەی ویلات[٤٤] و بەخشینی متمانە بەوەزارەتی هەرێمایەتی بەپێی پێشنیازێک کە بەلای کەم لە لایەن ٢٠ نائیبەوە پێشکەش دەکرێ[٤٥] و چاودێریکردنی ئەرک و کارەکانی دەسەڵاتی

تەنفیزی لە ویلایەت[٤٦] و دانانی سیستمی ناوخۆیی و دیارکردنی مووچەکانیان[٤٧] و بڕیاردان سەبارەت بەڕاست و دروستیی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنە[٤٨]

پرۆژەکە دەسەڵاتی تەنفیزی لە هەرێمدا دەخاتە ئەستۆی هەریەکە لە:

١- حاکمی گشتی: لە نێوان سێ پاڵێوراودا کە پێشتر لە لایەن ئەنجوومەنی تەشریعی و لە نێوان ئەندامانیاندا بەزۆرینەی سێیەکی ئەندامە ئامادەبووەکانییەوە دیار دەکرێن و پاشان یەکێکیان لە لایەن سەرۆک کۆمارەوە دادەمەزرێنرێ. حاکمی گشتی بەهاوکاری لەگەڵ ئەنجوومەنی وەزیراندا[٤٩] بەنوێنەری باڵای دەوڵەتی ئیتیحادی لە ویلایەت دادەنرێ و مومارەسەی دەسەڵاتی تەنفیزی و ئەو دەسەڵاتانەش دەکات کە لە لایەن سەرۆک کۆماری عێراقەوە پێی دەدرێ، لە بۆنەو مەراسیمە ڕەسمی و گشتییەکانیشدا نوێنەرایەتی سەرۆک کۆمار دەکات[٥٠]، هەروەها تایبەتمەندیش دەبێ بەڕازیبوون و ڕەتکردنەوەی ئەو یاسایانەی کە لە لایەن ئەنجوومەنی تەشریعییەوە دەردەچن و دەتوانێ تەنیا بۆ یەک جار داوای هەمواری کردنی ئەو یاسایانە بکات لە ڕێگەی گێڕانەوەیان بۆ ئەنجوومەن بەمەبەستی چاو خشاندنەوە پێیاندا[٥١]، حاکمی گشتی بانگهێشتی ئەنجوومەنی وەزیرانیش دەکات بۆ کۆبوونەوە و بەشداربوون و سەرۆکایەتیکردنی ئەو دانیشتنانەی بەشدارییان تیادا دەکات و بۆشی هەیە داوای ڕاپۆرت لە ئەنجوومەنی وەزیران بکات دەربارەی ئەو دانیشتنانەی کە تیایاندا ئامادە نابێت[٥٢]، وێڕای دەرکردنی بڕیارو فەرمان بەپێی پێشنیازێک لە لایەن ئەنجوومەنی وەزیران[٥٣] و وەرگرتنی دەست لە کارکێشانەوەی وەزارەت یان لادانی، لە کاتێکدا ئەگەر ئەنجوومەنی تەشریعی متمانەی لێ وەربگرێتەوە و ڕاسپاردنی وەزارەتی لادراو یان دەست لە کارکێشراوە بەبەردەوامبوون لەسەر کارەکانی تا کاتی پێکهێنانی وەزارەتێکی تازە[٥٤] و دەرکردنی لێبوردنی تایبەتی و سووککردنی حوکمی دادگاکانی ویلایەت[٥٥]، هەروەها دەسەڵاتی دەرکردنی بەیاننامەیەکی دەبێ سەبارەت بەئەنجامدانی هەڵبژاردنە گشتییەکان لە چوارچێوەی یاسادا و بانگەشەکردنی ئەنجوومەنی تەشریعی بۆ بەستنی خولی ئاسایی یان نا ئاسایی[٥٦]، لە لایەکی دیکەوە هەڵدەستێ بەتەنسیقکردن لە نێوان ئەو ئەرک و کارانەی کە دەستەکانی ویلایەت و دەسەڵاتی ئیتیحادی[٥٧] لە ویلایەت ئەنجامی دەدەن.

٢- ئەنجوومەنی وەزیرانی ویلایەت: بریتییە لە دەستەی تەنفیزی و ئیداری باڵا لە ویلایەت[٥٨] و لە سەرۆک وەزیران و ژمارەیەک وەزیر پێک دێت. دەبێ ژمارەیان لە

١٢ وەزیر کەمتر نەبێ و لە ١٧ وەزیریش زیاتر نەبێ. ئەوانە لە لایەن ئەو سەرۆکەوە هەڵدەبژێردرێن کە حاکمی گشتی ڕایسپاردووە بەپێکهێنانی وەزارەت لە نێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی تەشریعی یان کەسانی تری خاوەن مەرجی نوێنەرایەتی، بەمەرجی ئەوەی ڕێژەکەیان بەگوێرەی کۆی ژمارەی وەزیران لە چواریەک تێپەڕ نەکات. سەرۆک وەزیرانی ڕاسپێردراو لیستێک بەناوی وەزارەتەکەی ئاراستەی حاکمی گشتی دەکات بەمەبەستی ڕازیبوون و دەرکردنی بڕیاری پێکهێنانی وەزارەت، ئینجا وەزارەت داوای وەرگرتنی متمانە لە ئەنجوومەنی تەشریعی دەکات، لەکاتی سەرنەکەوتنیشیدا لە وەدەستهێنانی ئەو متمانەیە، دەبێ دەست لەکار بکێشێتەوە(٥٩).

ئەنجوومەنی وەزیران بۆی هەیە بڕیار بدات لەسەر ئەوەی ئاخۆ دەبێ سەبارەت بەکاروبارە پەیوەندارەکان بەئیدارەی ویلایەت یان دەربارەی ئەو بڕیار و ڕێنمایی و داواکارییانەی لە دەسەڵاتی ئیتیحادییەوە بۆی دێن چ ڕێوشوێنێک بگیرێتە بەر و چاویش بەر کاروبارانەدا دەخشێنێتەوە کە پەیوەندییان بەزیاتر لە وەزارەتێکەوە هەیە، سەرۆکی ئەنجوومەن حاکمی گشتی لەو بڕیارو ڕێنمایی و کاروبارانە ئاگادار دەکاتەوە کە لەو داتیشتنانەدا دەردەکرێن کە تیایاندا حاکمی گشتی ئامادە نابێت(٦٠). هەروەها سەرۆکی ئەنجوومەن هەڵدەستێ بەئامادەکردنی پرۆژەی یاساکان و دەرکردنی سیستەم و بڕیارەکان(٦١) و دانانی پرۆژەی بودجەی گشتی ویلایەت(٦٢) و دارشتنی درێژەی پرۆژەی پلانەکانی ویلایەت بۆ گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری و گرتنەبەری ڕێو شوێنە پێویستەکان بۆ دەستکردن بەجێبەجێکردنیان(٦٣) و دارشتنی سیاسەتی گشتی ویلایەت لە بواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئیداری(٦٤) و سەرپەرشتیکردنی کاری وەزارەت و دامەزراو و پێگە گشتییەکانی ویلایەت و ئاراستەکردن و بەدواداچوون و چاودێری و تەنسیقکردن لە نێوانیاندا و دەسەڵاتی لادان و هەموارکردنی بڕیارەکانی(٦٥) و چاودێریکردنی چۆنیەتی جێبەجێکردنی یاسا و سیستەم و بڕیارەکان و پاراستنی ئاسایشی ویلایەت و بەرژەوەندی و مافەکانی هاوولاتیان(٦٦) و دامەزراندنی کارمەندان و دیارکردنی مووچەکانیان و بەرزکردنەوە و دەرکردن و خانەنشین کردنیان بەپێی یاسا(٦٧) و وەرگرتن و دانی قەرز و مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی تایبەت بەپرۆژە گشتییەکان لە ویلایەتدا(٦٨) دەربارەی ئەوەش کە پەیوەندی بەقەزاوە هەیە، یاساکە بڕیار لەسەر دامەزراندنی دەسەڵاتێکی قەزایی تایبەت بەویلایەت دەدات کە پێکهاتەکانی دادگاکان بەهەموو جۆر و پلەگانی دەگرێتە خۆی بەپێی یاسایەک کە لە لایەن ئەنجوومەنی تەشریعی ویلایەتەوە دەردەچێ لە شێوازی

یاسای دەسەڵاتی قەزایی کارپێکراو لە کۆماری عێراقدا[٦٩].

هەروەها لە پڕۆژەکەدا بڕیار لەسەر پێکهێنانی دادگایەکی دەستووریی باڵا بۆ ئیتیحاد دراوە کە لە ٨ ئەندام پێک دێت، نیوەیان لە لایەن ئەنجوومەنی نیشتمانی ئیتیحادی و ئەنجوومەنی تەشریعی ویلایەتەوە هەڵدەبژێردرێن، سەرۆک کۆماریش سەرۆکی دادگای ناوبراو دەستنیشان دەکات بەمەرجێک ئەندامی ئەنجوومەنیش ڕازی بن[٧٠].

دادگای ناوبراو تایبەتە بەشیکردنەوەی دەستووری کۆماری عێراق و یاسای بنەڕەتی ویلایەت (دەستووری ویلایەت)[٧١] و چاوخشاندن بەدەستووریەتی یاساکان بەمەبەستی دڵنیابوون لە گونجانی ئەو یاسایانەی کە لە ویلایەت دەرکراون لەگەڵ یاسای بنەڕەتی و دەستووری کۆماری عێراق و گونجانی یاسا ئیتیحادییەکان لەگەڵ ئەحکامی یاسای بنەڕەتی ویلایەت[٧٢] و پێچەوانە نەبوونیان. دادگای ناوبراو بۆی هەیە چاو بەمەسەلەی ناکۆکییەکانی نێوان دەستە ئیتیحادییەکان و دەستەکانی ویلایەتدا بخشێنێتەوە بەداگاکانیشیەوە[٧٣] و یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانەش کە پەیوەندییان بەمەسەلەکانی سنووری نێوان ئیتیحاد و ویلایەتەوە هەیە[٧٤]. هەر لەو پڕۆژەیەدا هاتووە کە ئەو دادگایە بەتەواوی ئەندامانییەوە کۆبێتەوە و بەکۆی دەنگیش بڕیارەکانی خۆی دەربکات، ئەو بڕیارانەش کە دەریان دەکات بڕیاری کۆتایی دەبن[٧٥].

هەروەها هاتووە کە دەبێ بودجەیەکی یەکگرتوو بۆ ویلایەت دابنرێ و داهات و خەرجییە خەملێنراوەکانی ویلایەتیش بگرێتە خۆی و دەبێ یاسای ئەو بودجەیە دوو مانگ بەر لە کۆتایی هاتنی ساڵی دارایی[٧٦] ویلایەت بخرێتە بەردەمی ئەنجوومەنی تەشریعی، داهاتەکانی ویلایەتیش لەمانەی خوارەوە پێک دێن:

أ- باج و ڕەسم و مەکوس و کرێی خزمەتگوزارییەکانی پێگە گشتییەکان لە ویلایەت و داهاتی دامەزراو و کۆمپانیا و بەرژەوەندییە تایبەتییەکان لە ویلایەتدا.

ب- بەخشش و یارمەتیی کەس و دامەزراو و کۆمەڵە عێراقی و بیانییەکان.

ج- ئەو پشکەی کە دەسەڵاتی ئیتیحادی لە داهاتی سامانە سروشتییەکان بەویلایەتی دەبەخشێ لەگەڵ پارەی کەلوپەلی فرۆشراوی ناوخۆ و دەرەوە و بەشی ویلایەت لە بەخشش و یارمەتی و قەرزە بیانییەکان کە بەکۆماری عێراق بەخشراون بەپێی ڕێژەی دانیشتوانی ویلایەت بەرامبەر بەکۆی ژمارەی دانیشتوانی کۆمار[٧٧].

لە پڕۆژەکەدا ئەوەش هاتووە ژمارەیەک لە نوێنەران کە لەگەڵ ژمارەی دانیشتوان

بەرامبەر بەکۆی ژمارەی دانیشتوانی وڵات گونجاو بێت، لە ئەنجوومەنی نیشتمانیی ئیتیحادیدا نوێنەرایەتی ویلایەت دەکەن و کوتلەی پەرلەمانی ویلایەت پێکدێنن[٧٨] و کۆکردنەوە لە نێوان ئەندامێتی ئەنجوومەنی نیشتمانی و ئەنجوومەنی تەشریعی[٧٩] لە دوو ئەنجوومەن پێکدێت، یەکێکیان بۆ ویلایەت و ئەوی تریان بۆ هاووڵاتیان وەک چۆن لە هەموو سیستمە فیدراڵییەکاندا باوە.

جگە لەمە، شیکردنەوەی یاسا و سیستمەکانی ویلایەت ئەرکی دەستەی تۆمارکردنی یاسایی دەبێ کە بەپێی یاسایەک پێک دەهێنرێ[٨٠].

لە لایەکی دیکەوە پرۆژەی ناوبراو بڕیاری لەسەر بەتاڵ کردنی هەموو یاسا یان سیستم یاخود مەرسوم و بڕیار و هەموو ماددەیەک داوە کە پیادەکردنیان ببێتە مایەی دانانی سنوورێک بۆ مافە نەتەوایەتی و دیموکراسییەکانی هاووڵاتیانی ویلایەت یان دەبنە مایەی سنووردارکردنی بوارەکانی مومارەسەکردنی ئەو مافانە یان ئەوەی کە لەگەڵ ئەحکامەکانی یاسای بنەڕەتیدا نەگونجاو بێت[٨١]. سووربوونی کوردی عێراقیش لەسەر داواکاری پەیوەند بەپیادەکردنی سیستمی فیدراڵی لە عێراق لە میانەی بڕیاری ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق (پەرلەمان)ی هەڵبژێردراو لە ڕێگەی دەنگدانی گشتی نهێنی و ئازاد و ڕاستەوخۆ لە لایەن زۆربەی هاووڵاتیانی کوردستانەوە دەردەکەوێ، ئەو بڕیارەی کە لە ٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٢ دەرچووەو جەختی لەسەر پیادەکردنی سیستمی فیدراڵی لە عێراق کردۆتەوە.

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی چوارەم:

(١) سەبارەت بەو تۆمەتانە بڕوانە: مەحموود ئەلدوڕە- القضية الكوردية- بڵاوکراوەکانی دار الطليعة- بەیروت- چاپی دووەم ١٩٩٦- ل ٢٨٠- ٣٠٤.

(٢) دکتۆر شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- سەرچاوەی پێشوو- ٨٣- ٨٤.

(٣) حوسێن عەلی ئەلحبیشی- تقرير المصير- دیراسەیەکی بەراوردکارییە لە مێژوو و یاسا و ئابووری و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا- خانەی الكتاب العربي- ١٩٩٧- بەبێ ناوی چاپخانە و ژمارەی چاپ- ل ٢٧.

(٤) هەندێک داواکاری لە ٢٠، ٢٦ی تەمموزی ١٩٣٠ ئاراستەی کۆمەڵەی گەلان کراون و تیایاندا داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی کراوە، بەڵام ئەو داواکاریانە لە لایەن سەرکردە بەرپرسەکانی ئەوکاتەوە بەرز نەکراونەتەوە، بەڵکو لە لایەن هەندێک کەس و خەڵک کە سیفەتی ڕەسمییان نەبووە.

(٥) دکتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٣.

(٦) لەو بارەوە بڕوانە: سی. جی. ئەدمۆندز- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٧٦.

(٧) ئەمە لە یاداشتنامەی پارتی دیموکراتی کوردستاندا هاتووە کە لە ١٩٥٨/٩/١١دا ئاراستەی سەرۆک وەزیران و پارت و کەسایەتییەکانی عێراقی کراوە و لە: جەلال تالەبانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٠٦- ٧ ٣٠ وەرگیراوە.

(٨) عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی- تاریخ العراق السیاسی الحدیث- بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٦٢- ٢٦٣.

(٩) بریتین لەو نائیبانەی خوارەوە: حازم شەمدین ئاغا، جەمال بابان، محەمەد سالح، ئیسماعیل رواندزی، سەیفوڵلا خەندان، محەمەد جاف.

(١٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٥- ٦٦.

(١١) مسعود بارزانی- بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد- شۆڕشی بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٨.

(١٢) لە درێژەی ئەمەدا بڕوانە- حەبیب محەمەد کەریم- سەرچاوەی پێشوو.

- دکتۆر مەجید خەدوری جەخت لەسەر گرنگی ئەو بەڵگەنامە تایبەتییە دەکاتەوە چونکە وەک خۆی دەڵێت: قەوارەی کوردی بەپێناسەیەکی تازە دەناسێنێ وەک ئەمەی خوارەوە:

١- ئەگەر عێراق وەک خۆی بەبێ گۆڕانی دەستووری مایەوە، ئەوکاتە کورد بەلامەرکەزی رازی دەبن، وەک چۆن لەو بەیانە حکومییەدا هاتووە کە لە ٩ی ئاداری ١٩٦٣دا دەرکراوە.

٢- ئەگەر عێراق بڕیاری یەکگرتنی لەگەڵ چەند ولاتێکی دیکەی عەرەبی دا، ئەوکاتە کورد داوای ئۆتۆنۆمیی دەکەن بەهەموو مانایەکیەوە.

٣- ئەگەر عێراق لە چوارچێوەی دەولەتێکی یەکگرتوودا بڕیاری یەکگرتنی لەگەڵ چەند ولاتێکی عەرەبی دا، ئەو کاتە کورد داوا دەکەن کە وەکو هەرێمێکی جیابووەوە لە چوارچێوەی ئەو دەولەتەدا حیسابیان بۆ بکرێ.

لەو بارەوە بڕوانە:- دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٥٩- ٣٦٠.

(١٣) بڕگەی هەشتەم لە پڕۆژەکە.

(١٤) بەندەکان ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦ لە بڕگەی پێنجەمی پڕۆژەکە.

(١٥) بڕگەی شەشەم لە پڕۆژەکە.

(١٦) بڕگەی حەوتەم لە پڕۆژەکە.

(١٧) ماددەی ١، ٢ لە ماددە گشتییەکانی پڕۆژەکە.

(١٨) ماددەکانی ٤- أ، ٤- ب، ٨ لە ماددە گشتییەکانی پڕۆژەکە.

(١٩) ماددەی ٥، ٦، ٧ی ماددە گشتییەکانی پڕۆژەکە.

(٢٠) ماددەی ١١ لە ماددە گشتییەکانی پڕۆژەکە.

(٢١) دكتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالية- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨.
(٢٢) حەبیب محەمەد کەریم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٣- ٤٠.
(٢٣) بڕگەی ١- ١- ٢ لە پرۆژەکە.
(٢٤) بڕگەی ٢- ١- ٢ لە پرۆژەکە.
(٢٥) هەردوو بڕگەی: ٣- ١- ٢، ٤- ١- ٢ لە پرۆژەکە.
(٢٦) هەردوو بڕگەی: ٧- ١- ٢، ٦- ١- ٢ لە پرۆژەکە.
(٢٧) هەردوو بڕگەی: ٩- ١- ٢، ١٠- ١- ٢ لە پرۆژەکە.
(٢٨) بڕگەی ١- ٢- ٢ لە پرۆژەکە.
(٢٩) بڕگەی ٢- ٢- ٢ لە پرۆژەکە.
(٣٠) بڕگەی ٣- ٢- ٢ لە پرۆژەکە.
(٣١) بڕگەی ٤- ٢- ٢ لە پرۆژەکە.
(٣٢) بڕگەی ٧- ٢- ٢ لە پرۆژەکە.
(٣٣) بڕگەی ٥- ٢- ٢ لە پرۆژەکە.
(٣٤) هەردوو بڕگەی ٩- ٤، ١- ٩- ٤ لە پرۆژەکە.
(٣٥) بڕگەی ٢- ٩- ٤ لە پرۆژەکە.
(٣٦) بڕگەی ٧- ٤ لە پرۆژەکە.
(٣٧) بڕگەی ٨- ٤ لە پرۆژەکە.
(٣٨) حەبیب محەمەد کەریم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٤١.
(٣٩) هەردوو بڕگەی أ،ب لە ماددەی ژمارە (٢٥)ی پرۆژەی بنەڕەتی ویلایەتی کوردستانی فیدراڵی.
(٤٠) بڕگەی أ لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤١) بڕگەی ج لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤٢) بڕگەی د لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤٣) بڕگەی هـ لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤٤) بڕگەی و لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤٥) بڕگەی ک لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤٦) بڕگەیی لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤٧) بڕگەی ل لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤٨) بڕگەی ز لە ماددەی ژمارە ٤٣ لە پرۆژەکە.
(٤٩) هەردوو ماددەی ژمارە ٥٣ و ٥٤ی پرۆژەکە.
(٥٠) بڕگەی أ لە ماددەی ژمارە ٥٩ لە پرۆژەکە.

(٥١) بڕگەی ب لە ماددەی ژمارە ٥٩ لە پرۆژەکە.
(٥٢) بڕگەی ب لە ماددەی ژمارە ٥٩ لە پرۆژەکە.
(٥٣) بڕگەی ه لە ماددەی ژمارە ٥٩ لە پرۆژەکە.
(٥٤) بڕگەی ز لە ماددەی ژمارە ٥٩ لە پرۆژەکە.
(٥٥) بڕگەی د لە ماددەی ژمارە ٥٩ لە پرۆژەکە.
(٥٦) بڕگەی ج لە ماددەی ژمارە ٥٩ لە پرۆژەکە.
(٥٧) بڕگەیی لە ماددەی ژمارە ٥٩ لە پرۆژەکە.
(٥٨) ماددەی ژمارە (٦٤) لە پرۆژەکە.
(٥٩) ماددەی ژمارە (٦٣) لە پرۆژەکە.
(٦٠) بڕگەی أ لە ماددەی ژمارە ٦٥ لە پرۆژەکە.
(٦١) بڕگەی ب لە ماددەی ژمارە ٦٥ لە پرۆژەکە.
(٦٢) بڕگەی ل لە ماددەی ژمارە ٦٥ لە پرۆژەکە.
(٦٣) بڕگەی ج لە ماددەی ژمارە ٦٥ لە پرۆژەکە.
(٦٤) بڕگەی د لە ماددەی ژمارە ٦٥ لە پرۆژەکە.
(٦٥) بڕگەی ه لە ماددەی ژمارە ٦٥ لە پرۆژەکە.
(٦٦) بڕگەی ز لە ماددەی ژمارە (٦٥) لە پرۆژەکە.
(٦٧) بڕگەی ح لە ماددەی ژمارەی ٦٥ لە پرۆژەکە.
(٦٨) بڕگەی ط لە ماددەی ژمارە ٦٥ لە پرۆژەکە.
(٦٩) هەردوو ماددەی ژمارە ٧١ و ٧٢ لە پرۆژەکە.
(٧٠) هەردوو ماددەی ٧٦ و ٧٧ لە پرۆژەکە.
(٧١) بڕگەی أ لە ماددەی ژمارە ٧٦ لە پرۆژەکە.
(٧٢) بڕگەی ب لە ماددەی ژمارە ٧٦ لە پرۆژەکە.
(٧٣) بڕگەی ج لە ماددەی ژمارە ٧٦ لە پرۆژەکە.
(٧٤) بڕگەی د لە ماددەی ژمارە ٧٦ لە پرۆژەکە.
(٧٥) بڕگەی أ لە ماددەی ژمارە ٨٣ لە پرۆژەکە.
(٧٦) هەردوو بڕگەی أ، ب لە ماددەی ژمارە ٨٧ لە پرۆژەکە.
(٧٧) بڕگەکانی أ، ب، ج لە ماددەی ژمارە ٩٠ لە پرۆژەکە.
(٧٨) بڕگەی أ لە ماددەی ژمارە ٩٦ لە پرۆژەکە.
(٧٩) بڕگەی ج لە ماددەی ژمارە ٩٦ لە پرۆژەکە. بەلاّم باس لەوە نەکراوە لە دەسەلاّتی تەشریعی.
(٨٠) ماددەی ژمارە ١٠٦ لە پرۆژەکە.
(٨١) ماددەی ژمارە ١٠٧ لە پرۆژەکە.

## ئاخافتنی پێنجەم

# ئاستی وەڵامدانەوەی حکوومەتە یەک لە دوایەکەکان بەرامبەر بەداواکارییەکانی کورد

### یەکەم: سەردەمی پادشایەتی

حکوومەتی بەریتانی لە هەردوو سەردەمی داگیرکردن و ئینتیدابکردنیدا بۆ عێراق و هەروەها حکوومەتە عێراقییە یەک لە دوایەکەکان لە سەردەمی ئینتیدابدا هیچ بایەخێکی جیدییان بەمافە نەتەوەییەکانی کورد نەداوە، بگرە هەموو ئەوەی کردوویانە، گرتنەبەری چەند ڕێوشوێنێکی ئیداری و کلتووریی ساکار بووە، وەنەبێ ئەمەشیان لەبەر ڕەشایەتیی چاوی کورد کردبێ بەڵکو لە پێناوی قۆزتنەوەی ڕەزامەندیی کۆمەڵەی گەلان و دواتر دۆزینەوەی بیانووی گونجاو بۆ ناچارکردنی ئەو کۆمەڵەیە لەسەر دەرکردنی بڕیاری گێڕانەوەی ویلایەتی مووسڵی خاوەن زۆرینەی کوردی بۆ عێراق، بڕیاری ناوبراوی کۆمەڵەش بەهۆی بوونی مەرجێکەوە هەڵپەسێردرابوو ئەویش پێشکەشکردنی زەمانەتی پێویست بوو لە لایەن حکوومەتی بەریتانیا بەمەبەستی ڕەچاوکردنی ویستەکانی کورد، ئەوانەی کە پەیوەندییان بەئیدارەی زاتییەوە هەیە[1]، سەرەڕای ئەوەش کە هەردوو حکوومەتی بەریتانی و عێراقی لە ٢١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢دا بەیاننامەیەکی هاوبەشیان دەرکردووە و تیایدا دانیان بەمافەکانی کورد لە دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی لەو ناوچانەدا ناوە کە کوردیان تیایاندا دەژی و ئومێدی خۆشیان دەربڕیوە لەوەی کە کورد لەسەر شێوازی ئەو حکوومەتە و سنوورەکانی ڕێک بکەون و داواشیان کردووە کە بەمەبەستی کۆڵینەوە لە پەیوەندییە ئابووری و سیاسییەکان لەگەڵ هەردوو حکوومەتی بەریتانیا و عێراقدا نوێنەرانی خۆیان بنێرنە بەغدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ڕێوشوێنێکی ئەوتۆیان بۆ گواستنەوەی ئەو بەیانە بۆ قۆناغی پراکتیکی نەگرتە بەر، بەڵکو دەرکەوت کە ئەمە تەنیا بۆ ڕازیکردن بووە[2] لەو باوەڕەداین کە مەبەست لە دوایەوە قۆزتنەوەی کات و یەکێک بووە لە مانۆڕە سیاسییە زۆرەکان کە فەرهەنگی سیاسی ئینگلیزیان پێ دەناسرێتەوە، بەهێزترین بەڵگەش بۆ ئەمە گێڕانەوەی سلێمانی بوو بۆ عێراق لە دوای مۆرکردنی پرۆتۆکۆلی ٣٠ نیسانی ساڵی ١٩٢٣ لە نێوان بەریتانیا و

عێراق، پاش ئەوەی بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە ژێر سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی مەندوبی سامی لە بەغدا بوو وەک چۆن پێشتر باسمان لێوە کرد[٣]. لە ١٠ی نیسانی ساڵی ١٩٣٠دا ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق ئەو بەیاننامەیەی خوارەوەی دەرکرد: «دوای ئەوەی وەزارەت کاروباری گرتە دەست، وای بەباش زانی بایەخ بەو مەسەلانە بدات کە دەبنە مایەی دڵنەوایی و هێنانەدی ویست و خواستەکانی میللەت، لە نێوانیاندا هەندێک مەسەلەی پەیوەندار بەبەشێک لە دانیشتوانی ویلایەتەکانی باکوور، بۆیە بڕیاری دا لائیحەیەکی یاسایی ئامادە بکات و لە کۆبوونەوەی داهاتوویدا بخرێتە بەردەم ئەنجوومەنی گەل بۆ ئەوەی بەپێی ماددەی ژمارە (١٧)ی یاسای بنەڕەتی[٤] زمانی کوردی لە ناوچە کوردییەکاندا بکرێ بەزمانی ڕەسمی، دواتر ئەو لائیحە تایبەتە ئاراستەی ئەنجوومەنی گەل کرا و ئەویش دەستی کرد بەداڕشتنی[٥]. دەکرێ دەرچوونی ئەو یاسایە بەتاکە دەسکەوت دابنرێ کە لە مەیدانی مافە نەتەوەییەکانی کورد وەدی هێنرابن، بەڵام ئەو یاسایە کە بەمافێکی سروشتی دادەنرێ و شتێکی سەیر نییە، تەنیا یاسایە کە بەمافێکی سروشتی دادەنرێ و شتێکی تەنیا لە چوارچێوەیەکی تەسک و لە ژمارەیەکی کەم لە قوتابخانە کوردییەکاندا پیادە کرا.

ئەگەر ئەمە بەرنامەی حکوومەتە عێراقییە یەک لە دوای یەکەکان بووبێ لە ماوەی بەر لەسەربەخۆییدا، ئەوە بەرنامەی ئەو حکوومەتانە لە دوای سەربەخۆیی ڕووی لە باشی نەکرد بەڵکو بارودۆخەکان بەرامبەر بەکورد و مافە نەتەوایەتییەکانی ڕوویان لە خراپی زیاتر کرد، ئەوەبوو هەر لەکاتی سەربەخۆبوونی عێراق و چوونی بۆ ڕیزی کۆمەڵەی گەلان لە ٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٢ تا کاتی ڕووخانی سەردەمی پادشایەتی لە ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨، ئەو حکوومەتانەی کە لە دوای یەکدا کاروباریان گرتە دەست هیچ داواکاری یان مافێکی نەتەوەیی کوردیان نەهێنایە جێ، بگرە وەک چۆن لەوەو پێش بینیمان[٦] پەنایان بردەبەر جۆرەها شێوازی مەکر و هەڵخەڵەتاندن و پاشان بەکارهێنانی هێزی سەربازیی چەکدار بەهەموو جۆرەکانییەوە و بەپشت بەستن بەهێزی ئاسمانی بەریتانی لە پێناوی کپکردنەوەی شۆڕشی بارزانی ساڵی ١٩٤٣- ١٩٤٥ و پەرتەوازەکردنی هەزاران کەس لە خەڵکی ناوچەکە و سووتاندنی گوندەکانیان، ئەمە سەرەڕای قوربانییە گیانی و ماڵییەکان.

بەمەش ئەو ماوەیە هیچ پێشکەوتنێکی لە بواری مافە نەتەوەییەکانی کورد بەخۆوە نەدیت، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمە دەکرێ بوترێ کە لەو بوارەوە پاشەکشەی کرد.

## دووەم: سەردەمی کۆماری

دەکرێ ئەو سەردەمە دابەش بکرێ بۆ:

### ١- حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم

سەرەڕای پێشوازی بەرفراوانی کورد لە شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ و ئەو ئومێدانەش کە لە پێناوی بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانیان پێیان بوو و وێڕای هەندێک هەنگاوی ئیجابی کە شۆڕش لە سەرەتادا نای وەک بڕیاردان لە ماددەی سێیەمی دەستووری ڕاگەیەنراو لە ٢٧ی تەمموزی ١٩٥٨ لەسەر ئەوەی کە عەرەب و کورد هاوبەشن لەو ولاتەدا و پێشوازیی حکوومەت لە گەڕانەوەی مەلا مستەفا بارزانی سەرکردەی کورد و هەڤالانی بۆ خاکی نیشتمان و بەخشینی مۆڵەتی کاری سیاسی بەپارتی دیموکراتی کوردستان، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو حکوومەتە هەر زوو سیاسەتی خۆی بەرامبەر بەکورد گۆڕی و دوای ئەوەی بەنزیکترین هاوپەیمانی دادەنران، وای لێهات بەچاوی گومان و دڵەڕاوکێوە سەیری دەکردن، بگرە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو لا بەخێرایی ڕوویان لە ئالۆزی کرد بەهۆی پاشگەزبوونەوەی عەبدولکەریم قاسم لە بەڵێنە پێشووەکانی، سەبارەت بەچاکسازییە کۆمەلایەتییەکان و نەگرتنەبەری هیچ هەنگاوێکی کردەیی بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی کە لە ماددەی ژمارە سێی دەستووردا هاتووە دەربارەی یەکسانی نێوان هەردوو نەتەوەی عەرەب و کورد، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمە، حکوومەت مۆڵەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی بەتاڵ کرد و بارەگاکانیشی داخست و ئەندامانی دەسگیرکرد و سەرکردەکانی ڕاونا و لایەنگرانی لە کارەکانیان دەرکرد[٧]، کارێکی لەو جۆرەش پاڵی بەپارتی دیموکراتی کوردستانەوە نا کە ئەو یاداشتنامەیە بۆ عەبدولکەریم قاسم بەرزبکاتەوە کە لە ٢٠ی تەمموزی ساڵی ١٩٦١ ئامادەی کردبوو و پێشتر باس لە دەقەکەی کرا[٨] تیایدا گازاندەی لە بارودۆخی ناهەمواری گەلی کورد کرد، بەلام ئەمە سوودی نەبوو، ئینجا بارودۆخ ڕووی لە خراپی کرد تا بەرووبەڕووبوونەوەی سەربازی لە نێوان هەردوو لا گەیشتە لووتکە، ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیەی بەڕووخانی عەبدولکەریم قاسم نەبێ تەواو نەبوو.

بەم جۆرە لە سایەی ئەو حکوومەتەدا کە بەتەواوەتی پشتی لە داواکارییەکانی کورد کرد و ئەو کەسەشی بەبەکرێگیراوی بیانی لە قەڵەم دەدا کە داوای بکردایە[٩]، کوردیش نەیتوانی بەهیچ مافێکی ڕەوای خۆی بگات.

جگە لە ماددەی سێیەمی دەستووریش، حکوومەتی عەبدولکەریم قاسم هیچ دەسکەوتێکی دەستووریی دیکەی بۆ کورد دەستەبەر نەکرد[10] هەندێک کەس لەو بارەوە دەڵێن: «کەواتە... لیستی حیسابکردن کە عەبدولکەریم قاسم بەبرا کوردەکانمانی دەبەخشێ لە عێراق، لیستێکی سپی دەبێ»[11]

هەر سەبارەت بەمە دکتۆر مەجید خەدوری دەڵێت:

«وا دیارە نەعەبدولکەریم قاسم و نەسیستمی تازەی حوکم هەوڵی جێبەجێکردنی ئەوەیان داوە کە لە دەستووری کاتیدا هاتووە لەوەی ئازادی بەکورد بدرێ و لەگەڵ برا عەرەبەکانیاندا بەیەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، کوردیش وایان زانی ئەمە مانای ئۆتۆنۆمیی دەگەینێ لە کوردستان یان بریتییە لە پشکێکی گەورەی پرۆژەکانی گەشەسەندنی ئابووری و کاروباری کۆمەڵایەتی و بەهێزکردنی زمان و کلتووری کوردی، بەڵام رژێمی شۆڕشگێڕی (النظام الثوري) لە پێناوی چاککردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردستان هیچی نەکرد، بەم جۆرەش خەیاڵی کورد هاتەوە سەرخۆی و ئومێدەکەشیان بەهیچ دەرچوو.[12]

### ٢- حکوومەتی یەکەمی بەعس:

بەر لە شۆڕشی ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣، سەرکردایەتی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد هەبوو، لەو قۆناغەشدا بەڵێنی داننانی بەمافە نەتەوەییەکانی کورد دابوو بەئۆتۆنۆمیشەوە، بەڵام دوای سەرکەوتنی شۆڕش و وەرگرتنی دەسەڵات لە لایەن حزبی بەعس، لە ژێر کاریگەریی سەرکەوتن لەو بەڵێنانە پەشیمان بووەوە.

دەربارەی ئەو هەڵوێستە دکتۆر سەعد ناجی جەواد دەڵێت:

«.... سەرکردایەتی کورد لە لایەن خۆیەوە نەیتوانی دەرک بەوە بکات کە سەرکردەکانی حزبی بەعس لە ماوەی خۆ ئامادەکردنیاندا بۆ ڕووخاندنی عەبدولکەریم قاسم پێویستییان بەهەموو یارمەتییەک هەبوو، دوای وەدیهێنانی ئامانجە سەرەکییەکەشیان کە خستنی عەبدولکەریم قاسم بوو، دووبارە بەهەڵوێستەکانیاندا دەچنەوە»[13].

شتێکیش کە بایەخ نەدانی ئەو حکوومەتە بەداواکارییەکانی کورد دووپات دەکاتەوە ئەوەبوو ئەرکی بەدواداچوونی دۆسیەی کێشەی کوردی بەشاندێکی میللی سپارد کە خاوەنی هیچ سیفەتێکی ڕەسمی نەبوو. لە ١٧ی نیسانی ساڵی ١٩٦٣یشدا میسر و

سوریا و عێراق لەسەر پێکهێنانی یەکێتییەکی فیدراڵی لە نێوان خۆیاندا پێکهاتن بەبێ ئەوەی لەو ڕێککەوتنەدا باس لە کورد و مافەکانی بکرێ.
دەکرێ بوترێ حکوومەتی یەکەمی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی بەر لەوەی هیچ هەنگاوێکی کردەیی لە بواری داننان بەمافە نەتەوەییەکانی کورد دابنێ دەسەڵاتی جێهێشت.

### ٣- حکوومەتی عەبدوسەلام عارف و بەیاننامەی ١٠ی شوبات:

لە کاتێکدا عەبدوسەلام عارف لە ١٨ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣دا توانی حکوومەتی بەعس لەناوببات، لە هەمان ئەو کاتانەدا شەڕێکی گەورە لە نێوان سوپای عێراق و هێزەکانی شۆڕشی کورد لە کوردستان درێژەی هەبوو، ڕژێمی تازەش دەستی کرد بەهەوڵدان بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ سەرکردایەتی کورد، دواتر وەک چۆن لەمەوبەر باسمان کرد گفتوگۆ و دانوستان لە نێوان هەردوو لادا دەستی پێکرد[١٤]، لە ئەنجامیشدا دەرچوونی دوو بەیاننامەی لە لایەن عەبدوسەلام عارف و مەلا مستەفا بارزانی لێکەوتەوە لە ١٠ی شوباتی ساڵی ١٩٦٤. ئەو دوو بەیاننامەیە وەکو جاڕدانی ئاگر بەستێک وا بوو لە نێوان هەردوولا، ئەمەی خوارەوەش دەقی ئەو بەیاننامەیە کە لە لایەن عەبدوسەلام عارفی سەرۆک کۆماری عێراقەوە ڕاگەیەنرا:

بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

لە پێناوی ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی گشتی و وەڵامدانەوەی برا کوردەکانمان و ئەوەی کە لە بانگەوازی مەلا مستەفا بارزانیدا هاتووە و وەکو ویستێکی ئێمەش بۆ گێڕانەوەی ژیانی ئاسایی بۆ بەشی باکووری نیشتمانی خۆشەویستمان و دانانی سنوورێک بۆ هەوڵەکانی ئیستیعمار و کلکەکانی و بڕینی قۆڵی هەلپەرستان هەروەها بەمەبەستی ڕێگەگرتن لە ڕژانی خوێنی بێ تاوانان و بەپێی ئەوەی کە بەرژەوەندی باڵای وڵات لە ئێمەی دەخوازێ، بڕیاری ئەوەی خوارەوەمان دا:

یەکەم: داننان بەمافە نەتەوەییەکانی برا کوردەکانمان لە چوارچێوەی گەلی عێراق لە یەکێتییەکی نیشتمانی پێکەوەییدا و جێگیرکردنی ئەمە لە دەستووری کاتیدا.

دووەم: ئازادکردنی بەندکراو و گیراو و ئەوانەی بەهۆی ڕووداوەکانی باکوور حوکم دراون و دەرکردنی لێبووردنی گشتی و لادانی زەوتکردنی ماڵ و موڵکی گواستراوە و نەگواستراوەی ئەو کەسانەی پێشتر دەست بەسەر ماڵ و موڵکیان داگیراوە.

سێیەم: گێڕانەوەی ئیدارە ناوخۆییەکان بۆ ناوچەکانی باکوور.
چوارەم: گێڕانەوەی کارمەند و بەردەستان.
پێنجەم: هەڵگرتنی کۆتە سەپێنراوەکان لەسەر بەبازاڕکردنی مادده بژێوییەکان بەهەموو جۆرەکانییەوە.
شەشەم: دەستکردن بەئاوەدانکردنەوەی ناوچەی باکوور و پێکهێنانی لیژنە جۆراوجۆرەکان لە پێناوی نەهێشتنی ئەو ئاستەنگانەی دەربارەی پابەندبوون بەئەرکە ڕۆتینییەکان دێنە پێشیەوە لەگەڵ تێبینی کردنی قەرەبووکردنەوەی زەرەر لێکەوتووان.
حەوتەم: قەرەبووکردنەوەیەکی دادپەروەرانەی خاوەن ئەو زەوییانەی کەوتوونەتە بەر ئاوی هەردوو بەستی دوکان و دەربەندیخان.
هەشتەم: پیادەکردنی ئەو ڕێوشوێنانەی دەبنە مایەی زامنکردنی گێڕانەوەی هێمنی و ئاسایش بۆ ناوچەی باکوور، لەو بارەشەوە داوا لە برا کوردەکانمان دەکەین بگەڕێنەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆیان بۆ ئەوەی خێر و خۆشی لە بەرەکەتی ئەو وڵاتە ببینن و ڕیزی نیشتمانیش یەک بخەن بەرامبەر بەپیلانەکانی ئیستیعمار و کلکەکانی، با برا کوردەکانیشمان بزانن کە ئێمە کار بۆ زامنکردنی مافە ڕەواکانیان دەکەین وەکو هاووڵاتیانی دیکە لە کۆماری عێراق، خواش لە پەنای مەبەستدایە.
نۆیەم: وەزارەتە پەیوەندارەکان لە سەریانە ئەم مەرسوم و فەرمان و ڕێنماییانە جێبەجێ بکەن کە لەو بەیاننامەیەدا هاتوون».

بەڵام وا دیارە ئەوەی لە سەرەوە باسی لێوەکرا تەنیا بریتی بوو لە ئاگربەستێکی کاتی بەمەبەستی هەناسەوەرگرتن لە لایەن حکوومەت و قۆزتنەوەی کاتی زیاتر بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ گەڕێکی تازەی شەڕ. لە ڕاستیشدا پێشهاتەکانی دواتر ڕاستی ئەم بۆچوونەیان دەرخست. دەکرێ بوترێ سەرەڕای ئاسانی و بێ بایەخیی بەندەکانی ئەو بەیاننامەی کە باسی لێوەکرا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حکوومەت لە بواری جێبەجێکردنیاندا هیچ هەنگاوی کردەیی نەنا، بەڵکو بەپێچەوانەوە حکوومەت لە میانەی دەستووری کاتییەوە کە لە ئایاری ساڵی ١٩٦٤ ڕاگەیەنرا، ڕۆڵ و قەبارەی دانیشتوانی کوردی لە عێراق فەرامۆش کرد، ئەوەش خۆی لە خۆیدا پاشگەزبوونەوە بوو تەنانەت لە ماددەی سێیەمی دەستووری کاتیشدا کە لە تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم ڕاگەیەنرا و عەرەب و کوردی بەهاوبەش لە عێراق دانا[١٥].

**٤- حکوومەتی عەبدوڕەحمان عارف و بەیانی ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦:**

حکوومەتی عەبدوڕەحمان عارف لە ١٣ی نیسانی ساڵی ١٩٦٦دا دەسەڵاتی گرتە دەست، لە دوای مردنی عەبدوسەلام عارفی برای لە ئەنجامی ڕووداوی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەکەی وەک پێشتر باسمان کرد.

عەبدوڕەحمان بەزازی سەرۆک وەزیرانی پێشوو ڕاسپاردرا کە وەزارەتێکی تازە پێکبهێنێ، بەزاز کەسایەتییەکی سیاسی و مەدەنی و دووربین بوو، دڵسۆزانەش دەیویست ڕێگە چارەیەک بۆ ئەو کێشەیە بدۆزێتەوە کە بۆ ماوەیەکی زۆر دەوامی کردبوو گەلی عێراقیشی بەعەرەب و کوردەوە دووچاری قوربانی و زەرەرمەندیی زۆر کردبووەوە، بۆیە بەهەوڵ و کۆشش و ڕۆڵی بەرچاوی ئەوەوە بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ دەرکرا کە پرۆگرامێکی کاری لە خۆ گرتبوو و حکوومەتیش ئەرکی جێبەجێکردنی خستبووە ئەستۆی خۆیەوە. لە دیباچەی بەیاننامەکەدا هاتووە:

«وەک ویستێکی ئەو حکوومەتە بۆ دانانی سنوورێک بۆ بارودۆخی نائاسایی لە باکووری وڵات و بۆ بەدواداچوونی ئەوەی کە لە بڕگەی چوارەمی نووسراوی ڕاسپاردندا هاتووە لە کاتی پێکهێنانی وەزارەت، لە پاراستنی یەکێتی خاکی عێراق و هێنانەدیی یەکێتی نیشتمانی و دووپاتکردنەوەی ئەو پەیوەندییانەی کە لە نێوان عەرەب و کورد هەن و داوای کاری دڵسۆزانەیان لێ دەکەن لە پێناوی خێر و خۆشیی وڵاتی هاوبەشیان، حکوومەت ئەو بەرنامەیەی خوارەوە ڕادەگەینێ و پابەندبوونی خۆشی پێیەوە دووپات دەکاتەوە و بەپەلەش هەوڵی جێبەجێکردنی دەدات»[١٦].

بەیاننامەی ناوبراو ١٢ بڕگەی گرتە خۆی، بەمەبەستی سوودمەندبوون، دەقەکانیان لە خوارەوە دەخەینە ڕوو[١٧]:

یەکەم: حکوومەت بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە و لەکاتی هەموارکردنی دەستووری کاتیدا دانی بەنەتەوەی کورد داناوە و ئامادەشە ئەو مانایە لە دەستووری کاتی زیاد بکات و دووپاتی بکاتەوە، بەجۆرێک کە بەڕوونی دان بەنەتەوەی کورد و مافە نەتەوەییەکانی کورد لە چوارچێوەی یەک عێراقدا بنێ کە دوونەتەوەی سەرەکیی دەگرێتە خۆی ئەوانیش عەرەب و کوردن و هەردووڵاش بەماف و ئەرکی یەکسان شادبن.

دووەم: حکوومەت ئامادەیە بوونی کردەیی بەو ڕاستییە هەمەلایەنە ببەخشێ لە یاسای

پارێزگاکان- کە لە ڕێگەی دارشتن دایە- لەسەر بناغەی لامەرکەزی، بەوەی هەر لیواو قەزاو ناحیەیەک خاوەنی کەسایەتییەکی مەعنەوی دان پێدانراوبێ. هەموو ئەو یەکە ئیدارییانەش ئەنجوومەنی هەڵبژێردراو و دەسەڵاتی بەرفراوانی خۆیان لە کاروبارە تایبەتییەکاندا هەبێ، لە نێوانیاندا کاروباری پەروەردە و فێرکردن و تەندروستی و ئەوەی کە پەیوەندی بەکاروباری ناوخۆ و شارەوانییەوە هەبێ، بەگوێرەی ئەوەی یاسای ناوبراو باسی لێوە کردووە.

هەروەها یاسای ناوبراو ڕێگە بەهەموارکردن دەدات لە سنووری یەکە ئیدارییەکاندا، لە کاتی پێویست و بەپێی ئەوەی کە بەرژەوەندی گشتی دەیخوازێ، یاساکە ڕێگە بەدامەزراندنی یەکەی ئیداری تازەش دەدات.

سێیەم: وەکو شتێکی ئاساییش، حکوومەت دان بەزمانی کوردیدا دەنێ وەکو زمانێکی ڕەسمی لەگەڵ زمانی عەرەبی لەو ناوچانەدا کە زۆرینەی دانیشتوانیان کوردە و لە پاڵ زمانی عەرەبیشدا دەبنە زمانی فێرکردن لەو سنوورانەدا کە یاسا بڕیاریان لەسەر دەدات و ئەنجوومەنە ناوخۆییەکانیش دیاری دەکەن.

چوارەم: ئەو حکوومەتە سوورە لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردنە نیابییەکان لەو ماوەیەدا کە دەستووری کاتیی بڕیاری لە بارەوە داوە و پرۆگرامی وەزاریش بەڕاشکاوی دیاری کردووە.

لە ئەنجوومەنی نیشتمانی داهاتووشدا کورد بەپێی ژمارەی گونجاو لەگەڵ کۆی دانیشتوان و بەو شێوازەی کە یاسای هەڵبژاردنەکان یەکلای دەکاتەوە، نوێنەرایەتی دەکەن.

پێنجەم: ئاساییە کە کورد لەگەڵ برا عەرەبەکانیاندا هاوبەش بن لە هەموو پلەو پایە گشتییەکاندا بەپێی ڕێژەی دانیشتوانیان، لە نێوانیاندا وەزارەت و ئەرکە ئیدارییە گشتی و قەزایی و دبلۆماسی و سەربازییەکان بەپێی شارەزایی و پسپۆڕی.

شەشەم: بەگوێرەی شارەزایی و پسپۆڕی پێویستی وڵات، ژمارەیەک لە قوتابیانی کورد لە هەموو لق و لەسەر هەموو ئاستەکاندا بەزەماڵە دەنێردرێنە دەرەوەی وڵات، زانکۆی بەغداش بایەخی زیاتر بەزمانی کوردی و کلتووری فیکری و شارستانی کورد دەدات، لەکاتی بوونی تواناشدا زانکۆی ناوبراو بۆ کردنەوەی لقێک لە باکوور تێدەکۆشێ.

حەوتەم: شتێکی ئاسایی دەبێ کارمەندە خۆماڵییەکان لە لیوا و قەزا و ناحیە کوردییەکاندا کوردبن بەپێی ژمارەی پێویست، تەنها بەقەبارەی ئەوەش نەبێ کە بەرژەوەندی ئەو ناوچانە دەیخوازی پەنا نابرێتە بەر کارمەندی غەیرە کورد.

هەشتەم: دوابەدوای ژیانی نیابی (الحیاة النیابیة) هەندێک ڕێکخراوی سیاسی دادەمەزرێنرێ و ڕێگەش بەڕۆژنامەگەری دەدرێ کە دەربڕی ویستەکانی حکوومەتیش ڕێگەی ئەمە بەکورد دەدات لەو سنوورانەی یاسا دیاریان دەکات، ڕۆژنامەوانیی سیاسی و ئەدەبیش لە ناوچە کوردییەکاندا بەزمانی کوردی یان بەزمانی عەرەبی یاخود بەهەردوو زمان دەبێ، بەپێی داوای پەیوەندیداران.

نۆیەم: أ- کاتێک کردەوەکانی توندوتیژی تەواودەبن، لێبووردنی گشتی بۆ هەموو ئەوانە دەردەکرێ کە بەشدارییان لەو کردەوانەدا کردووە لە باکوور یاخود ئەوانەی پەیوەندییان پێیانەوە هەبووە، بەوانەشەوە کە بەهۆی ئەو جۆرە کردەوانە حوکم دراون یان ئازادییەکانیان داگیرکراوە.

ب- هەموو کارمەند و بەردەستانی کورد دەگەڕێنەوە سەر کارەکانی پێشوویان و میلاکی پێویستیشیان بۆ زامن دەکرێ لەگەڵ ڕەچاوکردنی بارودۆخەکانیان.

ج- حکوومەت تێدەکۆشێ لە پێناوی گێڕانەوەی کرێکارە کوردە دەرکراوەکان بۆ سەر کارەکانی پێشوویان بەهەموو تواناکانیانەوە.

دەیەم: هاوکات لەگەڵ دەرچوونی ئەو بەیاننامەیە، کارمەند و ئەندامانی هێزە چەکدارەکانیش دەبێ بگەڕێنەوە بۆ یەکەکانیان، ئەمەش لە ماوەی دوومانگ جێبەجێ دەکرێ، هێمنانەش مامەڵە لەگەڵ گەڕاوەکان دەکرێ و لێبووردنیان بۆ دەردەکرێ.

أ- ئەو کەسەی ئەندامی سوپا بووە، دەبێ بەخۆی و چەکەکەیەوە بگەڕێتەوە ناو سوپا.

ب- ئەوەی سەر بەپۆلیسیش بووبێ، دەبێ بەخۆی و چەکەکەیەوە بگەڕێتەوە نێو پۆلیس.

ج- ئەوانی دیکەش کە چەکیان هەڵگرتووە، بەدەستەیەکی سەر بەحکوومەت دادەنرێن و لە لایەن خۆیەوە حکوومەت دەبێ هەوڵی گێڕانەوەیان بدات بۆ ژیانی ئاسایی، تا کاتی جێبەجێکردنی ئەمەش حکوومەت لە ژیان و گوزەرانیان بەرپرس دەبێ و هەموو ئەو کەسانەش کە بۆ ژیانی ئاسایی دەگێڕدرێنەوە، دەبێ تەواوی کەلوپەل و چەک و جبەخانەکانیان بدەنەوە حکوومەت، ئەمەش بەپێی پلانێکی دیاریکراو لە لایەن پەیوەندارانەوە جێبەجێ دەکرێ.

د- کارێکی سروشتیشە کە پاش گێڕانەوەی هێمنی و ئاسایش، فورسانەکان بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانیان و بەپێی پلانێکی دارێژراویش دەست دەکرێ بەوەرگرتنەوەی چەکەکانیان.

یازدەم: ئەوەش دەگوترێ کە ئەو پارەیەی ئەمڕۆ لە ڕووبەڕووبوونەوەی توندوتیژی و شتی تر خەرج دەکرێ، ئەمە هەمووی لە ئاوەدانکردنەوەی باکوور خەرج دەکرێ و دەستەیەکی تایبەتیش بەبوونیادنانەوەی ناوچەی کوردی لە عێراق پێکدەهێنرێ و لە پلانی ئابووریشدا بڕە پارەی پێویستی بۆ تەرخان دەکرێ، لە پێناوی ئاوەدانکرنەوە و پەرەدان بەپڕۆژە بووژێنەرەکان، ئەو مەسەلەیەش پەیوەندی بەوەزیرێکی بەرپرس دەبێ کە ئەرکی بەڕێوەبردنی گەشتوگوزار و کاروباری دارستانەکان و تووتن لە باکوور دەخرێتە ئەستۆی وەزارەتەکەی، جگە لەمە سەرپەرشتی ئەو کاروبارانە دەکات کە پەیوەندییان بەو یەکە ئیدارییانەوە هەیە کە زۆربەی دانیشتوانیان کوردن و بایەخدان بەکلتوور و پرۆگرامی فێرکردن بەزمانی کوردی دەبێتە ئەرکی هەمان وەزارەت.

حکوومەت بەهەموو تواناکانییەوە هەوڵی قەرەبووکردنەوەی دادوەرانەی هەموو زەرەرمەندان دەدات، بەجۆرێک وایان لێ بکات بگەڕێنەوە بۆ ژیانێکی پڕ بەرهەم و سوود بەمەبەستی بەشداریکردن لە بووژاندنەوەی ئابووری وڵات و ژیان بەئاشتی و هێمنی.

بەپێی چەند ئیعتیباراتێکی نیشتمانی و مرۆییش، حکوومەت هەموو ئافرەتە مێرد مردوو و بێ دایک و باوک و ئەو کەم ئەندامانە دەگرێتە خۆی کە بوونەتە قوربانیی کردەوەکانی توندوتیژی لە باکووری وڵات و بەپەلە و بەهاوکاری لەگەڵ دەستە پەیوەندارەکانیشدا، دەست دەکرێ بەدامەزراندنی پەناگە و پەیمانگاکانی ڕاهێنان بۆیان.

دوازدەم: حکوومەت هەوڵی نیشتەجێکردنی هەموو ئەو کەس و گرووپانە دەدات کە ناوچەکانیان بەجێهێشتووە یان کۆچیان کردووە، لە بنەڕەتیشدا ئەمە بریتییە لە گێڕانەوە بۆ بارودۆخی ئاسایی کۆن، هەر شتێکیش کە دواتر بۆ دەوڵەت پێویست بێ و بەمەبەستی سوودی گشتی دەستی بەسەردا بگیرێت، ئەمە دەبێ بەپێی بڕگەکانی یاسا ئەنجام بدرێ و قەرەبوویەکی خێرا و دادوەرانەشی بەدوادا دەبێ.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بەیاننامەیە لە سنووری بەرنامەیەکی کار زیاتر تێناپەڕێ کە ژمارەیەک بەڵێن دەگرێتە خۆی، لەڕووی یاساییشەوە بایەخێکی ئەوتۆی نییە، چونکە بەکارێکی تەشریعی دانانرێ، دوای دەرچوونیشی حکوومەت هیچ یاسایەکی دەرنەکرد سەبارەت بەجێبەجێکردنی ئەو بڕگانەی تیایدا هاتوون، تەنانەت یاسای پارێزگاکانیش کە

بەیاننامـەکـە بەڵێنی دەرکـردنی داوە، لە سـەردەمی ئەو حکـوومـەتەدا دانەڕێژرا. یاسـای پارێزگاکـانیش تەنیـا پراکـتیـکێکی ئیـداریی تازەیە و لە زۆر وڵاتانی جیـهـانیـشـدا پیـادە دەکرێ، مەبەست لە دوایەوە دوورکەوتنەوەیە لە جەختکردنەوەی دەسەڵات لە پەنابردن بۆ لامەرکەزی ئیداری هەرێمی کە یەکێکە لە شێوازەکانی دیموکراسییەت، بەمەش یاساکە هیچ دەسکەوتێکی بنەڕەتی و بایەخداری بۆ کورد نەگرتە خۆی.

لەجیاتی هەڵکەوتنی دەرفەت بۆ ئەوەی بەزاز بڕگەکانی ئەو بەیاننامەیە جێبەجێ بکات، وەزارەتەکـەی دەسـتی لە کـار کـێـشـایەوە بۆ ئەوەی وەزارەتێکی تازە بەسـەرۆکـایەتی ئەفسـەرێکی توندڕەو شوێنی بگرێتەوە. ئەو ئەفسەرە کە ناجی تالیب بوو، تەواو جیاواز بوو لەگەڵ بەزاز و باوەڕی بەڕێگەچارەی ئاشتییانە بۆ ئەو مەسەلەیە نەبوو(١٨).

بەم جۆرە مەسەلەکان ڕوویان لە ئاڵۆزی کرد و جێبەجێکردنی کردەیی ئەو بەرنامەیەش ئاسـتـەنگی تێکەوت، لەو بارەوە دکـتـۆر مـەجـیـد خـەدوری دەڵێت: « لەو کـاتەدا یاسـای بەڕێوەبردنی پارێزگـاکـان لەسـەر بناغـەی لامـەرکـەزی بوو کـە لە ڕێگەی ئەنجـوومـەنە ناوخۆییەکانەوە مافی بەڕێوەبردنی کاروبارە ناوخۆییـەکان بەکورد دەدات، بەڵام نەناجی تالیب و نە ئەوانەش کـە لە دوای هاتن هەنگاوێکی وایان نەنا لەپێناوی تەواوکـردنی ڕەشنووسی ئەو یاسایەی کە لە بنەڕەتدا عەبدوڕەحمان بەزاز ئامادەی کرد(١٩).

دوابەدوای دەست لە کـارکـێشـانەوەی بەزازیش چوار وەزارەتی دیکە هاتنە دەسـەڵات و هیچ کامێکیان تەنانەت هەنگاوێکی بەرەوڕووی ئاشتبوونەوە و هێنانەدی داواکارییەکانی گەلی کورد نەنا، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئاماژەیەک بوو بۆ نەبوونی متمانە کە ماوەیەکی دوورودرێژ بوو لە نێوان هەردوولادا چەکەرەی کردبوو(٢٠).

لەمـەشـدا ئاسـتی پاشگەزبوونەوەی حکـوومـەتی عـەبدولڕەحـمـان عـارف دەردەکـەوێ لە جێـبەجێکردنی بڕگـەکـانی بەیاننامـەی حـوزەیرانی ئامـاژەپێـکراو سـەرەڕای ئاسـانیی ئەو مـافـانەی تیـایدا هاتبـوون. عـەبدولڕەحمان بەزاز نەیتـوانی لەسـەر ئەو بەرنامـە بەردەوام بێ کە لە بەیانەکەدا بڕیاری لەسەر درابوو بەهۆی کۆنترۆڵی عەقڵیـەتی سەربازی بەسـەر هزری دەسەڵاتداران لە بەغدا(٢١)، لەو بارەشـەوە دکـتـۆر حـەسـەن چەلەبی دەڵێت: «چارەنووسی بەرنامەی بەزاز لە تەواوی ئەو هەوڵانە باشـتر نەبوو کە پێشـتر و دوای ئـەویش لە پێناوی چارەسـەرکـردنی مـەسـەلەی کـورد دران، ئەوەبوو هەر لەکـاتی دەرچوونی ئەو بەرنامـەیە لە لایەن پیاوانی دەسەڵات لە بەغدا قبووڵ نەکرا(٢٢).

### ٥- حکوومەتی دووەمی بەعس و ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار:

دەکرێ بوترێ هەر لەسەردەمی پێکهاتنی عێراقی تازەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان، گرنگترین هەوڵ کە لە پێناوی چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردی درابێ، لەسەردەمی حکوومەتی دووەمی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی بووە کە لە ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ گەیشتە دەسەلات، ئەوەبوو دوای خولێکی توندی شەڕ لە نێوان هەردوو لا لە ماوەی پایزی ١٩٦٨- ١٩٦٩، سەرکردایەتی حزبی بەعس دەستی کرد بەبیرکردنەوە لە ڕێگەچارەیەکی ئاشتییانە بۆ ئەو مەسەلەیە، دوای ئەوەی بێ بایەخیی شێوازی سەربازی بۆ دەرکەوت، چەند هۆکارێکیش بوونە مایەی سەرهەلدانی ئەو ئاراستە تازەیە کە پێشتر باسمان لێوە کردوون[٢٣]، سەرەتاکانی ئەو ئاراستەیەش لە بڕیارەکانی کۆنگرەی قوتری حەوتەمی حزبی بەعسدا دەرکەوتن و باسیان لەوە کردبوو:

«مەسەلەی کورد لە عێراق یەکێکە لە گرنگترین ئەو مەسەلانەی کە ڕووبەڕووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی عەرەب و بزووتنەوەی نیشتمانی دەبێتەوە، سالانێکی زۆریش بەبێ هێنانەدی هیچ ڕێگەچارەیەکی مەنتیقی بۆ ئەو مەسەلەیە تێپەڕیوون، ئەمەش کارەساتی زۆری بەسەر هاوولاتیانماندا (لە عەرەب و کورد) هێناوە. جگە لەمە بەقۆزتنەوەی سەرنەکەوتنمان لە گەیشتن بەڕێگە چارەیەکی گونجاو بۆ کێشەکە دەرفەت بۆ ئیمپریالی و بەکرێگیراوە کۆنەپەرستانیان ڕەخسا بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری عێراق وەربدەن....

کۆنگرە دووپاتی دەکاتەوە کە حزبەکەمان بەڕێزەوە دەڕوانێتە داخوازییە نەتەوەییە پێشکەوتووخوازەکانی کورد و بەمافی ڕەواو مرۆیی و دادوەرییان دەزانێ»[٢٤] کۆمەلێک ڕاسپاردەش لەو کۆنگرەیە کەوتنەوە بەشێوەیەکی بنەڕەتی جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەبێ ڕێگە چارە ئاشتییانە بێت و بەتوندیش لە بەرامبەر هەموو ئەو هەولانە بوەستێ کە لە پێناوی تێکدانی پەیوەندییەکانی عەرەبی- کوردیدا دەدرێن، سەرەڕای کارکردن بۆ جێبەجێکردنی بەپەلەی ئەو مادانەی کە لە بەیاننامەی حوزەیراندا بەهەلپەسێردراوی[٢٥] مابوونەوە.

بەو پێیەی سەرکردایەتی حزبی بەعس لە کۆنگرەی - باس لێکراودا- بڕیاری گرتنەبەری ڕێگەچارەی ئاشتییانەی دابوو کە بەبێ پیادەکردنی ئۆتۆنۆمیی نەبێ نایێتە دی، بۆیە ئەرکی ڕازیکردنی عێراقیانی کەوتە ئەستۆ، ئینجا چ ئەوانەی لە ڕیزەکانی ئەو حزبە

دابوون یان چین و توێژەکانی دیکەی کۆمەڵ، سەبارەت بەپێویست بوون بەرێگەچارەیەکی ئاشتییانە کە لەسەر ئەساسی ئۆتۆنۆمییەوە سەری گرتبێ. لە پێناوی هێنانەدی ئەو ئامانجەش سەرکردایەتی ئەو حزبە دەستی کرد بەدەرکردنی بڵاوکراوەی زۆر و ئامادەکردنی گەلی عێراق بۆ هەنگاوی داهاتوو لەو بوارەدا(٢٦)، لە لایەکی دیکە هەوڵی دا سەرکردایەتی کوردی تاقی بکاتەوە و عەزیز شەریفی کەسایەتی نیشتمان پەروەر و سەرۆکی پێشووی حزبی گەلی وەکو نوێنەرێکی نارەسمی ناردە کوردستان و سەردانەکە دەرئەنجامی ئیجابی لێ کەوتەوە، دواتر شاندە رەسمییەکان روویان کردە کوردستان، بەڵام گفتوگۆ کردەییەکان لە کانونی دووەمی ١٩٧٠ دەستیان پێکرد و دوای چەند خولێکی گفتوگۆکردنی زەحمەت، هەندێک کێشە و ناکۆکی ئاڵۆز سەریان هەڵدا وەکو کێشەی شاری کەرکووکی دەوڵەمەند بەنەوت و چارەنووسی هێزەکانی پێشمەرگە و رێکخستنی دەستووری و ئیداری دەوڵەت و شێوازی بەشداربوونی کورد تیایاندا، بەڵام وادیارە هەردوو لا بریاری دواخستنی زۆربەی ئەو ناکۆکییانەیان دا بۆ کاتێکی داهاتوو و روویان کردە مۆرکردنی رێککەوتننامەی ١١ی ئادار کە تیادا هاتووە:

شۆڕش لە رۆژە یەکەمەکانیدا چاوی خۆی خستۆتە سەر ئەرکی وەدیهێنانی یەکێتی نیشتمانی بۆ گەلی عێراق، بەبێ جیاوازیکردن بەهۆی رەگەز، زمان، ئایین یان باری کۆمەڵایەتی، هەروەها چاوی بڕیوەتە دابینکردنی هەموو مەرجە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییە پێویستەکان کە بنەماکانی ئەو یەکێتییە پێویستییان پێی هەیە، بۆ ئەوەی عێراق بتوانێ بەهەموو وزە و تواناکانییەوە روو بکاتە شەڕی نەتەوەیی چارەنووسساز(٢٧) هەر لەو رێککەوتننامەیەدا هاتووە: چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراق لە سەرووی ئەو کێشە نیشتمانییانە بووە کە شۆڕش رووبەروویان بۆتەوە، بەتایبەتیش دوای نەتوانینی سەردەمە پێشووەکان لە تێگەیشتنی کێشەکە، بگرە نەبوونی خواستی دڵسۆزانە لە لایەن ئەو حکوومەتانەوە بۆ چارەسەرکردن و دانانی رێگەچارەی دروست و ئەو ئیستیغلال کردنەش کە لە لایەن ئیستیعمار و بەکرێگیراوانییەوە بەدوایدا هات، ئەمە هەمووی بووە مایەی ئاڵۆزی زیاتر، بگرە کێشەکە وەکو گرفتێکی چارەنەکراو خۆی پیشان دەدا، بەتایبەتیش دوای ئەوەی توندوتیژی شوێنی گفتوگۆی دیموکراسی برایانە و بابەتییانەی گرتەوە کە سروشتی کێشە نیشتمانییەکە پێویستی پێیەتی، ئەو کێشەیەی مافە رەواکانی بەشێک لەگەلی عێراق دەگرێتە خۆی.

کاتی پیلانی ئیستیعماری زایۆنی کۆنەپەرستیش لە دژی کۆماری عێراق رێکەوت

نەبوو، بەڵکو هاوکات بوو لەگەڵ ئەو کاتانەی کە خەریک بوو ئاشتی لە باکووری خۆشەویست سەر هەڵبدات، بەهۆی کۆششی دڵسۆزانەی حکوومەتی شۆڕش و وەڵامدانەوەی دڵسۆزانە لە لایەن سەرکردایەتی ڕێزدار مستەفا بارزانییەوە(٢٨). دواتر دەڵێت:

بەگوێرەی ئەوەی باسی لێوەکرا، ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش چەند پەیوەندییەکی لە نێوان خۆی و سەرکردایەتی ڕێزدار مستەفا بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان گرێدا ئاڵوگۆڕی بۆچوونەکانیش کرا، دواتر هەموو لایەک بەزەروورەتی ڕازیبوون بەناوەڕۆکی ئەو بەیانە و جێبەجێکردنی قەناعەتیان هێنا...(٢٩) بەیاننامەکە بڕیارێکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی تیادا خراوەتە ڕوو کە ١٥ بڕگە دەگرێتە خۆی، ئەمەی خوارەوە گرنگترینیانە:(٣٠)

١- زمانی کوردی دەبێتە زمانی ڕەسمی لەگەڵ زمانی عەرەبی لەو ناوچانەی زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن، زمانی کوردی دەبێتە زمانی فێرکردن تیایاندا و لە هەموو ئەو قوتابخانانەشدا کە بەزمانی کوردی دەخوێنن، زمانی عەرەبی دەخوێنرێ.

هەروەها لە ناوچەکانی دیکەی عێراق زمانی کوردی وەکو زمانی دووەم دەخوێنرێ بەگوێرەی ئەو سنوورانەی یاسا دیاریان دەکات.

٢- بەشداربوونی برا کوردەکانمان لە حوکم و جیاوازی نەکردن لە نێوان کورد و ئەوانی تر لە وەرگرتنی ئەرکە گشتییەکان، بەپلەو پایە هەستیار و گرنگەکانیشەوە لە دەوڵەت وەکو وەزارەت و سەرکردایەتییەکانی سوپا و هی تر، ئەمانە لە ڕابردوودا و تا ئێستاش لەو مەسەلە گرنگانەن کە حکوومەتی شۆڕش بۆ هێنانەدییان تێدەکۆشێ، بۆیە لە کاتێکدا کە دان بەو بنەمایە دادەنێت جەختیش لەسەر کارکردن لە پێناوی هێنانەدی ئەو ئامانجانە دەکاتەوە بەشێوەیەکی دادوەرانە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی پسپۆڕی و شارەزایی و ڕێژەی دانیشتوان و ئەو نەبوونییەی کە لە ڕابردوودا برا کوردەکانمان تووشی بوون.

٣- بەپێی ئەو دواکەوتنەی کە لە ڕابردوودا لە ڕووی ڕۆشنبیری و پەروەردەییەوە دووچاری نەتەوەی کورد بۆتەوە، پلانێک بۆ چارەسەرکردنی ئەو دواکەوتووییە دادەڕێژرێ لە ڕێگەی:

أ- پەلەکردن لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەربارەی

زمان و مافە کلتوورییەکانی گەلی کورد و دانان و گرێدانی پرۆگرامە تایبەتییەکان بەکاروباری نەتەوەیی کوردی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بەبەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی کوردی.

ب- گێڕانەوەی ئەو قوتابیانەی کە بەهۆی بارودۆخی توندوتیژی ناوچەکە دەرکراون یان ناچاربوون خوێندن جێ بهێڵن بۆ قوتابخانەکانیان بەبێ ڕەچاوکردنی تەمەنەکانیان.

ج- زیادکردنی کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچەی کوردی و بەرزکردنەوەی ئاستەکانی پەروەردە و فێرکردن و وەرگرتنی قوتابیانی کورد لە زانکۆ و کۆلیژە سەربازییەکان و بەعسە و زەمالە بەڕێژەیەکی دادپەروەرانە.

٤- کارمەندان لەو یەکە ئیدارییانەی زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن یان ئەوانەن کە زمانی کوردی بەباشی دەزانن، بەپێی ژمارەی پێویست کورد دەبن و دەست دەکرێ بەدامەزراندنی بەرپرسە سەرەکییەکان- پارێزگارو قایمقام، بەڕێوەبەری پۆلیس، بەڕێوەبەری ئاسایش- و هی تری لەوجۆرە، بەزووترین کات و بەڕاوێژکردن لەگەڵ لیژنەی باڵای سەرپەرشتیکەری جێبەجێکردنی ئەو بەیاننامەیە، دەست بەپێشخستنی دەزگاکانی دەوڵەت دەکرێ لە ناوچەکەدا، بەو جۆرەی کە ببێتە مایەی پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی و سەقامگیری لە ناوچەکە.

٥- حکوومەت دان بەمافی گەلی کورد لە پێکهێنانی ڕێکخراوی قوتابیان و لاوان و ئافرەتان و مامۆستایانی تایبەت دادەنێت، ئەو ڕێکخراوانە دەبنە ئەندام لە ڕێکخراوە عێراقییە نیشتمانییە هاوشێوەکان.

لە برگەی هەشتەمی بڕیارەکەدا هاتووە: «گێڕانەوەی دانیشتوانی گوندە عەرەبی و کوردییەکان بۆ شوێنی پێشوویان، بەڵام دانیشتوانی ئەو گوندانەی کە ناشێن وەکو شوێنی نیشتەجێبوون سوودیان لێ وەربگیرێ و حکوومەت بەمەبەستی سوودی گشتی و بەپێی یاسا دەیانکات بەموڵکی خۆی و دانیشتوانیش لە ناوچەکانی دەوروبەریاندا نیشتەجێ دەکرێن و بەگوێرەی ئەو زەرەرەش کە پێیان کەوتووە قەرەبوو دەکرێنەوە»

برگەی دەیەمی بڕیارەکەش بەندی (أ، ب، ج) دەگرێتە خۆی و تیایاندا هاتووە:

أ- گەلی عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی پێکدێ ئەوانیش عەرەب و کوردن، ئەو دەستوورەش دان بەمافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد و کەمە نەتەوەکاندا دەنێ، هەموویان لە چوارچێوەی یەکێتی عێراقدا.

ب- زیادکردنی ئەو بڕگەیەی خوارەوە بۆ ماددەی چوارەم لە دەستوور: «زمانی کوردی لەگەڵ زمانی عەرەبی دەبێتە زمانی ڕەسمی لە ناوچەی کوردی».

ج- جێگیرکردنی ئەوەی باسی لێوەکرا لە دەستووری هەمیشەیی. هەروەها بڕگەی دوازدەمی بڕیارەکە باس لەوە دەکات کە یەکێک لە جێگرەکانی سەرۆک کۆمار دەبێ کورد بێ.

لە بڕگەی چواردەمی بڕیارەکەشدا هاتووە:

دوابەدوای ڕاگەیاندنی بەیاننامەکە و بەڕاوێژکردن لەگەڵ لیژنەی باڵای سەرپەرشتکاری جێبەجێکردن، ڕێو شوێنی پێویست بگیرێتە بەر لە پێناوی یەکخستنی ئەو پارێزگا و یەکە ئیدارییانەی زۆرینەی کوردیان تیادا دەژی، بەپێی ئەو سەرژمێرییە ڕەسمییانەی ئەنجام دەدرێن و دەوڵەتیش لە پێناوی پێشخستنی ئەو یەکە ئیدارییە و قووڵکردن و فراوانکردنی مومارەسەی گەلی کورد تیایاندا تێدەکۆشێ، بۆ ئەوەی مافە نەتەوەییەکانی بکاتە زەمانەتێک بۆ شادبوونی بەئۆتۆنۆمیی تا کاتی هێنانەدی ئەو یەکە ئیدارییەش ڕێکخستنی کاروباری کوردی لە ڕێگەی کۆبوونەوەی مانگانەی نێوان لیژنەی باڵا و پارێزگاکانی ناوچەی باکوورەوە بەڕێوەدەچێ. بەوپێیەش کە ئۆتۆنۆمیی لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا دەبێ، بۆیە ئیستیغلال کردنی سامانە سروشتییەکان لەو ناوچەیەدا دەکەوێتە ئەستۆی دەسەڵاتدارانی ئەو کۆمارەوە.

هەروەها لە بڕگەی پازدەم (دوابڕگە)ی بڕیارەکەدا هاتووە:

گەلی کورد بەگوێرەی ڕێژەی دانیشتوان بەرامبەر بەدانیشتوانی عێراق بەشداری لە دەسەڵاتی تەشریعیدا دەکات.

لەو دەقانەی ڕابردوودا دەردەکەوێ کە بەیانی ١١ی ئادار بۆ جاری یەکەم بیرۆکەی بەخشینی ئۆتۆنۆمیی بەگەلی کورد لە عێراق هێناوەتە ئارا، ئەمەش خۆی لە خۆیدا پێشهاتێکی گرنگ و بنەڕەتییە لە ڕێڕەوی مافە نەتەوەییەکانی کورد.

ئەمەو دەستووری کاتی کە لە ١٩٧٠/٧/١٦ دەرچووە، دەقێک دەگرێتە خۆی دووپاتکردنەوەیە بۆ ئەوەی کە لە بڕگەی دەیەمی بەیانی ئاداردا هاتووە، کە ئەمەی خوارەوەیە: «گەلی عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی پێکدێت کە نەتەوەی عەرەب و کوردن، ئەو دەستوورە دان بەمافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد و مافە ڕەواکانی تەواوی کەمە نەتەوەکانی دیکەشدا دەنێ لە چوارچێوەی یەکێتی عێراق»[٣١].

بەڵام حکوومەتی عێراق لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد ڕێک کەوتبوو کە ماوەی چوار ساڵ بۆ جێبەجێکردنی بەیانی ۱۱ی ئادار و پیادەکردنی ئۆتۆنۆمیی دیار بکرێ، لەو ماوەیەشدا چەندین کێشە ڕووی دا و بووە مایەی ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو لا و بۆچوونەکانیش سەبارەت بەشیکردنەوەی ژمارەیەک برگەی ڕێککەوتننامەی ئادار لێک دوورکەوتنەوە، دەربارەی ئەو ناوچانەش کە دەبوایە بخرێنە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمیی ململانێ توند بوو.

ناکۆکیی سەرەکیش لەسەر شاری کەرکووکی دەوڵەمەند بەنەوت و قەزاکانی خانەقین و مەندەلی و سنجار و شێخان بوو. دوابەدوای تەواوبوونی ماوەی دیاریکراویش بۆ جێبەجێکردنی بەیانی ئادار، دەرکەوت بۆشاییەکی گەورە و قووڵ لە نێوان هەردوولادا هەیە و بەئاسانی کەم ناکرێتەوە و کۆنترۆڵ ناکرێ، وەک دیاریشە ئەو گیانی هاوکارییەی کە لە ڕۆژانی دەرچوونی بەیانەکەدا بەهەردوو لاوە دیاربوو، نەمابێت، جگە لەمە دەرکەوت کە لایەنی حکوومەت جیدی نییە لە جێبەجێکردنی تەواوی برگەو بابەتەکانی بەیاننامەکە، بگرە دەیەوێ شاقاویان بەسەردا بهاوێ لە هەڵوێستی دیکەی جیاوازیشەوە دەست پێ بکات.

لە ۹ی ئاداری ساڵی ۱۹۷۳دا پارتی دیموکراتی کوردستان پرۆژە تایبەتەکەی خۆی سەبارەت بەئۆتۆنۆمیی پێشکەشی حکوومەتی عێراق کرد- پێشتر ئاماژەمان بەچەند دەقێکی کرد[۳۲] بەڵام هیچ وەڵامدانەوەیەکی لە لایەن حکوومەتەوە نەبوو وەک بڵێی ئامادە نەبووبێ هیچ بیرو بۆچوونێکی سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردی بەهەند هەڵبگرێ، ئەوەبوو ئەو پرۆژەیەشی ڕەت کردەوە کە لە لایەن باڵێکی سەرەکی کێشەکەوە خرابووە ڕوو، ئەو باڵەی حکوومەت گفتوگۆی لەگەڵ کرد و بووە زەمینە خۆشکەرێک بۆ دەرچوونی بەیانی ئادار و دواتر بڕیاردان لەسەر ئۆتۆنۆمی، بەڵام ئەمجارە حکوومەت ویستی هەموو شتەکان بەپێی بۆچوونی خۆی بێ، تەنانەت دیارکردنی ناوچەی کوردیش بەپێی بەرژەوەندی و خواستی ئەو بێ، بەمانایەکی دیکە: سەپاندنی سیاسەتی ئەمری واقیع بەسەر میللەتی کورد بەبێ ئەوەی هیچ ڕۆڵ و بۆچوونێکی لەو بارەوە هەبێ، سەیریش لەوەدایە گەلی کورد و نوێنەرانی لە مەسەلەیەکی گرنگی وەک ئۆتۆنۆمیدا هیچ بۆچوون و ڕۆڵێکیان نەبێ.

هەر ئەوەش ڕووی دا کە خێرخوازانی عەرەب و کورد لە ڕۆڵەکانی عێراق لێی دەترسان،

ئەوەبوو حکوومەت یەک لایەنە یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ی بۆ ناوچەی کوردستان ڕاگەیاند، بەبێ ڕاوێژکردن یان وەرگرتنی ڕەزامەندی پارتی دیموکراتی کوردستان وەک پێشتر لە سەری ڕێککەوتبوون، ئەمەش بووە هۆی بەرپابوونی ململانێیی سەربازی لە نێوان هەردوولا، ئەو ململانێیەی کە نزیکەی ساڵێک درێژەی کێشا بەر لەوەی لە ئەنجامی مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیر لە نێوان هەردوو حکوومەتی عێراق و ئێران لە ٦ی ئاداری ساڵی ١٩٧٥ کۆتایی بێت.

بەوپێیەی سیستمی ئۆتۆنۆمی پەیوەندی بەبابەتی تێزەکەمانەوە هەیە کە دەربارەی لامەرکەزی سیاسییە لە لایەک و ئەو تێبینییە زۆرانەش کە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان دەیانوروژێنێ، بۆیە لە بەشی داهاتوودا باس لە بابەتی ئۆتۆنۆمی دەکەین و هەوڵی ڕوونکردنەوەی لایەنە تیۆری و پراکتیکییەکانی دەدەین، ئەمە وێڕای هەڵسەنگاندنی ئەو تاقیکردنەوانەی کە لەو بارەوە ئەنجام دراون بەئەزموونی ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی عێراقیشەوە.

### پەراوێزەکانی ئاخافتنی پێنجەم:

(١) دکتۆر فازل حوسێن، سەرچاوەی پێشوو- ل ١٧٤.

(٢) عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی دەڵێت: بەیاننامەی ناوبراو لە لایەن هیچ کەسێکەوە گوێی پێ نەدراوە.
- لەو بارەوە بڕوانە: عەبدولرەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية- بەشی یەکەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨٢- پەراوێز.

(٣) بڕوانە لا ٨٤ی ئەو تێزە.

(٤) عەبدوڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ الوزارات العراقية - بەشی سێیەم- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤- ١٥.

(٥) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥.

(٦) بڕوانە لا٩٥- ١٠٠ی ئەو تێزە.

(٧) ئەحمەد فەوزی- خناجر وجبال- قاسم والاكراد- بەبێ ئەدرەسی چاپخانە یان شوێنی چاپکردن و مێژووەکەی- لا١٢٢- ١٢٣.

(٨) بڕوانە ل ١٠٢- ١٠٣ی ئەو تێزە.

(٩) لەیس عەبدولحوسێن زوبێدی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨٧ و دواتری.

(١٠) ئەحمەد فەوزی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨٠.

(١١) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨١.

(١٢) دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٣٨.

(١٣) دکتۆر سەعد ناجی جەواد- سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٧.

(١٤) بڕوانە لا ١٠٥ی ئەو تێزە.

(١٥) ئەدمۆن غەریب- سەرچاوەی پێشوو- ل ٨٤

(١٦) لە: حەبیب محەمەد کەریم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٠ وەرگیراوە.

(١٧) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٠- ٢١.

(١٨) دکتۆر مەجید خەدوری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٦٥.

(١٩) سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٦٥.

(٢٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٦٥.

(٢١) بەهەمان مانا بڕوانە: حەبیب محەمەد کەریم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٨

(٢٢) دکتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٩.

(٢٣) بڕوانە ل ١٠٧ی ئەو تێزە.

(٢٤) لە: دکتۆر سەعد ناجی جەواد- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٦ وەرگیراوە.

(٢٥) سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٦.

(٢٦) لە درێژەی ئەو هەولانەدا، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٨- ١٩٢.

(٢٧) لە: حەبیب محەمەد کەریم- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧ وەرگیراوە.

(٢٨) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٥- ٢٦.

(٢٩) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٧.

(٣٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨- ٣١.

(٣١) ماددەی پێنجەم- برگەی ب لە دەستووری کاتی کە لە ١٦ی تەمموزی ١٩٧٠ دەرکرا.

(٣٢) بڕوانە ل ١١٦- ١١٧ی ئەو تێزە.

## بەشی سێیەم

# ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی کوردستانی عێراق

# لە نێوان تیۆری و پراکتیکدا:

ئۆتۆنۆمی یەکێکە لەو ڕێگەچارانەی کە دەوڵەتان لە پێناوی چارەسەرکردنی کێشەکانی فرەنەتەوەیی یان ئایینی یاخود زمانەوانی و کلتووری پەنای بۆ دەبەن، چونکە گرووپە خاوەن تایبەتمەندییە ڕەگەزی و ئایینی و زمانەوانی و کلتوورییەکان ئەوانەی نەیانتوانیوە سەربەخۆیی دەستەبەر بکەن و قەوارەی نێودەوڵەتی تایبەت بەخۆیان پێکبهێنن هەست بەناتەواوی و زوڵم و ماف خوراوی دەکەن، ئەمەش پاڵی بەو دەوڵەتانەوە نا کە ئیشکالیەتی لەو جۆرەیان تیادا بەدی دەکرێ، هەوڵی دۆزینەوەی ئەو ڕێگەچارانە بدەن کە دەبنە مایەی زامنکردنی تەواوی مافەکانی ئەو گرووپانە، لەو پێناوەشدا هەندێک وڵاتی وەک ئیسپانیا و ئیتالیا و بەلجیکا پەنایان بردە بەر پیادەکردنی سیستمی ناوچە سیاسییەکان کە بەیەکێک لە شێوازەکانی ئۆتۆنۆمی دادەنرێ.

یەکێتی سۆڤیەتیش بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی فرەنەتەوەیی لەو وڵاتە بەرفراوانەدا کە زیاتر لە سەد نەتەوەی هەمەجۆر دەگرێتە خۆی، ڕووی کردە پیادەکردنی سیستمی ئۆتۆنۆمی(١).

لە عێراقیشدا ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە١١ی ئاداری ١٩٧٠ بڕیاری دا کار بەسیستمی ئۆتۆنۆمیی بکات لە ناوچەی کوردستان، هەروەها دەستووری کاتیی ساڵی ١٩٧٠ش بەزیادکردنی ئەو بڕگەیەی خوارەوە بۆ ماددەی هەشتەم هەموارکرا(٢).

ج- بەپێی ئەوەی کە یاسا دیاری دەکات، ئەو ناوچەیەی زۆرینەی دانیشتوانی کوردن ئۆتۆنۆمی پێ دەدرێ.

هەروەها یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤یش داڕێژرا.

ئۆتۆنۆمیش لەبەرئەوەی تا ئێستا لە عێراق ئەو سیستمەیە کە لە ڕووی یاساییەوە بڕیاری لەسەر دراوە، بۆیە دیراسەکردنی ئەو سیستمە بەدرێژی خۆی دەسەپێنێ، بۆ ڕۆشنایی خستنە سەر هەموو لایەنە جۆراوجۆرەکانی، بۆیە لە پشکی یەکەمی ئەو فەسڵەدا باس لە پێناسەکردنی ئۆتۆنۆمی و دەرخستنی سروشتی یاسایی ئەو سیستمە دەکەین، پاشان دەچینە سەر پشکی دووەم کە بۆ قسەکردن دەربارەی بنەماکانی ئۆتۆنۆمی تەرخانی دەکەین، لە دوا پشکیشدا کە پشکی سێیەمەو دەچینە سەر هەڵسەنگاندنی ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی ئۆتۆنۆمی، بەئەزموونی ئۆتۆنۆمیی کوردستانی عێراقیشەوە.

## ئاخافتنی یەکەم

# پێناسەی ئۆتۆنۆمیی و سروشتی یاسایی ئەو سیستمە

### یەکەم: پێناسەی ئۆتۆنۆمیی:

بیرۆکەی ئۆتۆنۆمیی- وەک ڕێگەچارەیەک بۆ کێشەی نەبوونی تەواوی لەو دەوڵەتانەدا کە نەتەوە و ئایین و تایەفە و زمان و کلتووری جۆراوجۆر دەگرنە خۆیان- هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە بۆتە مایەی ورووژاندنی جەدەلێکی یاسایی و سیاسی گەورە، چونکە ئەو بیرۆکەیە ئەگەرچی لە کۆنەوە لە هزری سیاسی و فەلسەفیدا بوونی هەبووە بەڵام وەکو ڕێکخستنێکی یاسایی کە چارەسەری مەسەلەی نەبوونی تەواویی گرووپە خاوەن تایبەتمەندییە هەمەجۆرەکان دەکات، بیرۆکەیەکی تازەیە و سەدەکانی ڕابردوو بەخۆیانەوەی نەدیتووە[٣].

وشەی ئۆتۆنۆمیی بەرامبەر بە Autonomy یان Self -Government یە و لە ئینسکلۆپیدیای تریکانیشدا Enciclopedi a Treccani هاتووە کە وشەی Auto-nomia لەبنەڕەتدا وشەیەکی ئیغریقییە و لە دوو بەش پێکدێت: Auto کە مانای خود و nomia مانای یاسا دەبەخشێ. وشەکەش بەهەر دوو بەشییەوە مانای توانینی داڕشتنی یاساکان بۆ خود دەگەیەنێ، واتە مرۆڤ خۆی حوکمی خۆی بکات.

هەندێک کەسیش وای بۆچوون[٤] کە زاراوەی Autonomy یان Self-government کە دەکەونە بەرامبەر وشەی ئۆتۆنۆمیی، لەو کاتانەدا دێنە پێشەوە کە باس لە مەسەلەکانی دابەشکردنی دەسەڵات دەکرێ، بەزۆریش ئەو کاتانە بەکاردەهێنرێن کە دەسەڵاتی کۆنترۆڵکردنی کاروبارە ناوخۆییەکان بەو وڵات و گرووپە ناوخۆییانە دەدرێ کە هێشتا نەگەیشتوونەتە قۆناغی سەربەخۆیی، بەبێ ئەوەی بتوانن کۆنترۆڵی کاروبارە دەرەکییەکان بکەن.

بەشێوەیەکی وردتر ئۆتۆنۆمیی Self -government مانای بەشێک لە حوکمی خود A Share of Self -government

دەبەخشێ، بیرۆکەی ئۆتۆنۆمییش چەند دەلالەتێکی هەیە، لە بواری یاسای گشتی نێودەوڵەتیدا بەکاردەهێنرێ و لەو بوارەدا گەلانی دیاریکراو هەن کە هەموو مەرج و

سیفەتەکانی دەوڵەتی وەک هەرێمی سەربەخۆ و گەلێ تایبەتمەندییان تیادا بەدی دەکرێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەو قۆناغەی کە تیایدا بتوانن حوکمی خۆیان بکەن، ئەو وەختە ئۆتۆنۆمییان پێ دەبەخشرێ چونکە حکوومەتەکانیان هەموو سیماو سیفەتەکانی دەوڵەتیان تیادا بەدی دەکرێ بێجگە لە نەبوونی سەروەری کە لەجیاتی ئەو، ئەو دەوڵەتە ئیستیعمارییە دەیبێ کە بۆ ماوەیەکی کاتی مافی وسایەی پێ دراوە.[٥]

کەواتە ئۆتۆنۆمیی رێوشوێنێکی ئینتیقالییە و بەپێی بەڵگەنامەیەکی نێودەوڵەتی دروست دەبێ، ئینجا چ لە رێگەی کۆمەڵەی گەلان یان دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە هاتبێ بەمۆرکردنی رێککەوتننامە لەگەڵ هەندێک لەو وڵاتانەی ئیدارەی کاروباری هەرێمە ژێردەستەکانیان بەڕێوەدەبەن، وەک ئینتیدابی بەریتانی کە پێشتر باسمان لێوە کرد[٦] یان لە رێگەی رێککەوتننامەیەکی دوولایەنە وەک رێککەوتننامەی بەریتانی- میسری کە بەهۆیەوە لە ساڵی ١٩٥٣دا ئۆتۆنۆمیی لە سودان پیادەکرا، بەپێی ئەم چەمکەش ئۆتۆنۆمیی لە پیادەکردنەکانی یاسای گشتی نێودەوڵەتییەوە شەرعیەت و بنەماشی لە پێگەکانی ئەو یاسایە وەردەگرێ و ملکەچیش دەبێ بۆ برگە و بابەتەکانی، ئۆتۆنۆمیی بەو مانایە: «دارشتنێکی یاساییە بۆ چەمکێکی سیاسی و جۆرێکی نوێ لە سەربەخۆیی خودی بۆ هەرێمە ژێر دەستەکان دەگرێتە خۆی، چونکە لە هەردوو رووی سیاسی و ئابوورییەوە شایستەی ئەوەیە کە بەتەنیا لەگەڵ موومارەسەکردنی سەروەریی لە لایەن دەوڵەتی داگیرکەر بەسەریاندا بوەستێ[٧].

سەرەڕای ئەوە ئۆتۆنۆمیی چەمکێکی دیکە دەگرێتە خۆی ئەویش ئەوەیە کە ئەو زاراوەیە شێوازێکی لامەرکەزی ئیداری هەرێمییە لە چوارچێوەی یەکێتی یاسایی و سیاسی دەوڵەت، بەو دیمەنەش ئۆتۆنۆمیی هیچ پەیوەندییەکی بەیاسای گشتی نێو دەوڵەتییەوە نییە بەڵکو سیستمێکی یاسایی ناوخۆی تەواوە و بناغە و مەشرووعیەتی لە دەستوور و بنەماکانی یاسای ناوخۆییەوە وەردەگرێ و بەهۆیەوە دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی موومارەسەی هەندێک بواری تەشریعی و تەنفیزی دەکەن بەڵام لە چوارچێوەی یەکێتی یاسایی و سیاسی دەوڵەت و لە ژێر سەرپەرشتی و چاودێری دەسەڵاتی ناوەندیدا.

بەم جۆرەش ئۆتۆنۆمیی بەوپێیەی کە رێگەچارەیەکی ناوخۆییە، دەبێتە بابەتی هەردوو یاسای ئیداری و دەستووری.

ئەوەی لە بواری لێکۆڵینەوەکەشماندا بایەخدارە، ئۆتۆنۆمیی ناوخۆییە کە بەمەبەستی چارەسەرکردنی کێشەی ناتەواویی و فرەلایەنی بەهەموو شێوەکانییەوە لە هەندێک وڵاتدا

پیادە کراوە و لە هەندێک لایەنیشیەوە لەگەڵ فیدراڵی بەیەک دەگەن، بۆیە لێکۆڵینەوەکە تەنیا ئەو بوارە دەگرێتەوە.

دینیسۆڤی Denisov زانای سۆڤیەتی، ئۆتۆنۆمیی وا پێناسە کردووە کە: «ڕێگەچارەیەکی گونجاوە بۆ ڕێکخستنی دەوڵەت لەسەر ئەساسی ویستی جەماوەر، تەنانەت لە حاڵەتی دەرنەبڕینی ویستی جیابوونەوە یان لەبەرئەوەی توانای دەربڕینیشی نییە لە پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ[٨]».

دکتۆر عەبدولحەمید متوەلیش بەوە پێناسەی دەکات کە:

«جەماوەری میللەت دەسەڵاتی خۆی لە هەموو بوارەکاندا بەڕێوەببات»[٩]، تێبینی دەکرێ کە ئەو پێناسەیە بەڕەهایی هاتووە، هەر ئەمەش وای کرد کە دووربێ لە وردبینی یاسایی پێویست.

دکتۆر حەمید ئەلساعیدی بەم جۆرەی خوارەوە پێناسەی دەکات و دەڵێت: «بریتییە لە سیستمێکی لامەرکەزی و لەسەر ئەساسی دانان بەسەربەخۆیی خودیی بەشێک لە هەرێمی دەوڵەتەوە سەردەگرێ لە چوارچێوەی چاودێری و سەرپەرشتی دەوڵەت[١٠]».

ئەو پێناسەیەش ئاماژەی بەهۆکارەکانی بەخشینی ئەو سەربەخۆییە خودییە نەکردووە.

دکتۆر محەمەد هەمەوەندیش وای بۆ دەچێ کە ئۆتۆنۆمیی بریتییە لە: «سیستمێکی لامەرکەزی بونیادنراو لەسەر ئەساسی دانان بەسەربەخۆیی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی هەرێمێکی تایبەتمەندی نەتەوەیی و ڕەگەزی لە ناو دەوڵەت، لە ژێر سەرپەرشتی و چاودێری دەسەڵاتی ناوەندیدا»[١١] دەرکەوت ئەو پێناسەیە هۆکارەکانی بەخشینی ئۆتۆنۆمیی تەنیا بەهۆکارە نەتەوەییەکانەوە بەستووەتەوە، لە کاتێکدا لە پیادەکردنی پراکتیکیدا دەبینین کە ئۆتۆنۆمیی لەسەر ئەساسی دیکەی وەک ئایینی و زمانەوانی و کلتووریش دەبەخشرێت.

دەکرێ ئۆتۆنۆمیی بەوە پێناسە بکەین کە، «شێوازێکی پێشکەوتووی لامەرکەزی ئیدارییە و بەهۆیەوە دەوڵەت- لە چوارچێوەی یەکێتی یاسایی و سیاسیدا- لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی خۆیدا دان بەهەندێک دەسەڵاتی تەشریعی و ئیداری نەتەوە یان گرووپێکی ئایینی یان زمانەوانی و کلتووری دابنێ».

## دووەم: سروشتی یاسایی ئۆتۆنۆمیی

تا ئەو کاتەی سەرقاڵی دیراسەکردنی سیستمی ئۆتۆنۆمیی بین، ئەوا باسکردن لە سروشتی یاسایی ئەو سیستمە خۆی دەسەپێنێ، ئەو مەسەلەیە کێشەیەکی فقهیشی ناوەتەوە، ئەوەبوو یاسادانەران نەیانتوانی سەبارەت بەسروشتی یاسایی ئۆتۆنۆمیی ڕێک بکەون، بەڵام ئێمە پێمان وایە کە ئەو کێشە فقهییە لە نێوان دوولایەنی سەرەکی دایە.

بەشێک وای بۆ دەچێ کە ئۆتۆنۆمیی سیستمێکی سێیەمەو شوێنێکی ناوەڕاست لە نێوان لامەرکەزی ئیداری و فیدراڵی وەردەگرێ، شارل دیران Durand سەبارەت بەڕاهاتنی لەگەڵ سروشتی یاسایی ئۆتۆنۆمییدا دەڵێت: «چەند سیستمێکی یاسایی هەن کە بەناوەڕاستی نێوان دەوڵەتی یەکگرتوو و دەوڵەتی فیدراڵی دادەنرێن» هەروەها دەڵێت: ئەوانە حاڵی حازر ئەگەر چی کەم وێنەن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوورنییە ڕوو لە زیادبوون بکەن[١٢]. کلۆد پالازۆلی C. Palazzoli یش-دوای ئەوەی دەپرسێ ئاخۆ لە تواناد ا هەیە ئەو ناوچە سیاسییانەی کە خاوەنی ئۆتۆنۆمیین لە شوێنێکی ناوەڕاستی نێوان دەوڵەتی یەکگرتوو و دەوڵەتی فیدراڵی دابنرێن- دان بەزەحمەتیی دیارکردنی سروشتی یاسایی ئەو ناوچانەدا دەنێ، چونکە حاڵی حازر تیۆرێک بۆ دەوڵەتی هەرێمی نییە کە مایەی قبووڵکردن بێ، بەڵام ئەمە نابێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی ئەو ناوچانە بەدەوڵەتی هەرێمی ناوببرێن[١٣]، ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەربڕینی پشتگیرییە بەرامبەر بەو ئاڕاستەیە.

هەر لەو ڕووەوە دکتۆر محەمەد هەمەوەندی دەڵێت: «...... لەوەی ڕابردوودا دەگەینە دەرئەنجامی ئەوەی کە چەمکی ئۆتۆنۆمیی لە یاسای ناوخۆییدا ئەگەرچیش شێوازێک لە شێوازەکانی سیستمە لامەرکەزییەکان بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناچێتە چوارچێوەی هیچ کامێک لەو جۆرانەی کە شارەزایانی یاسای گشتی لەسەری پێکهاتوون، چونکە ئۆتۆنۆمیی ناگاتە ئاستی فیدراڵی و بۆ ئاستی لامەرکەزی ئیداری هەرێمیش دانابەزێ، بەو جۆرەش دەبێ سیستم و جۆرێکی تایبەت و خاوەن سروشتێکی یاسایی تایبەت بێ[١٤]».

بەڵام لایەنەکەی تری شارەزایان ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە ئۆتۆنۆمیی یان سیستمی ناوچە سیاسییەکان بەسیستمی سێیەم دابنرێ لە پاڵ سیستمی لامەرکەزی ئیداری و لامەرکەزی سیاسی (فیدراڵی).

لەو ڕووەشەوە بۆردۆ Burdeau وای دەبینێ کە سیستمی ناوچە سیاسییەکان لە

ئیتالیا تەنیا بریتییە لەوەی جۆرە لامەرکەزیەتێکی ئیداری بەرفراوان پێکبهێنێ، چونکە ئەو دەسەڵاتانەی ئەنجوومەنی هەرێمەکان هەیانە تا ڕادەیەکی زۆر کۆتەک بەند و چوارچێوەدارن، ئەو کارەی کە ناکرێ لەگەڵیدا باس لە بوونی سەربەخۆییەکی تەشریعی ڕاستەقینە بکرێ.(١٥) دکتۆر مونزیر ئەلشاویش بەهەمان ئەنجام دەگات، بەو پێیەی سیستمی ئۆتۆنۆمیی شێوازێکی پێشکەوتووی لامەرکەزییە، لەو بارەوە دەڵێت: «لەوانەیە لامەرکەزی پلەیەکی دیکەش بگرێتە خۆی و لەگەڵیدا لەبەردەم ئەو زاراوەیە بوەستین کە بەفەرەنسی بەهەرێمییەتی سیاسی Le Regionalisme politgue ناودەبرێ و بەرزترین پلەکانی لامەرکەزی دادەنرێ بەجۆرێک دەگەینە دامێنەکانی فیدراڵی»(١٦).

دکتۆر خالید قەبانی بەهەمان ئەو ئاراستەیەدا دەڕوات و دەڵێ: لە ژێر ڕۆشنایی ئەمەدا دەکرێ بوترێ کە سیستمی ناوچەیی ئیتاڵی سیستمێکی لامەرکەزی خاوەن ڕوویەکی سیاسییەو لە چوارچێوەی دەوڵەتی یەکگرتوودا سەردەگرێ، لێرەشەوە لەگەڵ ئەو وتەیەی بۆردۆدا دەگەینە یەک کە دەڵێ: لە نێوان دەوڵەتی فیدراڵی و دەوڵەتی یەکگرتووی لامەرکەزیدا هیچ سیستمێکی یاسایی یان شێوازی سێیەمی دەوڵەتێکی هەرێمی یان هەرێمایەتی سیاسی نییە، چونکە ناوچەکە ئەگەرچی مومارەسەی سیاسەت دەکات بەڵام ناکرێ بەقەوارەیەکی سیاسی دابنرێ(١٧). لە لایەن خۆشمانەوە باوەڕمان بەڕاستی دوا ئاراستە هەیە، بەو پێیەی کە ناکرێ ئۆتۆنۆمیی بەسیستمێکی ناوەڕاست لە نێوان لامەرکەزی ئیداری و لامەرکەزی سیاسی (فیدراڵی) دابنرێ، چونکە تا ئێستا شێوازی سێیەمی دەوڵەتان نییە لە پاڵ دەوڵەتی یەکگرتووی ئاسایی کە لە ژێر سایەیدا سیستمی لامەرکەزی سیاسی ئیداری پێکدەهێنرێ و دەوڵەتی لێکدراو «فیدراڵی» کە سیستمی لامەرکەزی فیدراڵی دەگرێتە خۆی.

تا ئەوکاتەش مەسەلەکە بەو شێوەیە بێ یان دەبێ ئۆتۆنۆمیی بەشێوازێک لە شێوازەکانی لامەرکەزی سیاسی دابنرێ کە ناکرێ چونکە ئۆتۆنۆمیی پێویستی بەبوونی دەوڵەتی ئیتیحادی هەیە کە تیایدا ناوەندی سیاسی جۆراوجۆر هەن و دەسەڵاتی سیاسیش دابەش دەکرێ، لە کاتێکدا دەبینین زۆربەی ئەزموونەکانی ئۆتۆنۆمیی کە لە سایەی دەوڵەتی یەکگرتووی ئاساییدا پیادەکراون، ئەو دەوڵەتەی ڕێگە بەبوونی فرە ناوەندی سیاسی و دابەشکردنی دەسەڵاتی سیاسی نادات، ئەوەتا مادەی پێنجەمی دەستووری ساڵی ١٩٤٨ی ئیتاڵی کە ئۆتۆنومی بەخشیوەتە هەندێک هەرێمی خۆی، بڕیار دەدات کە: «کۆمار یەکەیەکی یەکگرتووە و دابەش ناکرێ».

هەروەها لە بڕگەی ج ی ماددەی یەکەمی یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤یشدا هاتووە: «ناوچە بەیەکەیەکی ئیداری یەکگرتوو دادەنرێ و خاوەنی کەسێتی مەعنەوی خۆیەتی و لە چوارچێوەی یەکێتی یاسایی و سیاسی و ئابووری کۆماری عێراقیشدا خاوەنی ئۆتۆنۆمیی دەبێ». ئەگەرچیش هەندێک کەس وای بۆچوون کە ئەنجوومەنەکانی ئۆتۆنۆمیی خاوەنی هەندێک دەسەڵاتی تەشریعین، ئەمە بوار بۆ ئەوە دەڕەخسێنێ کە بوترێت لەوانە ئەو ئەنجوومەنانە خاوەنی جۆرێک لە لامەرکەزی سیاسی بن بەڵام ئەو دەسەڵاتانە تا ئاستی دوورخستنەوەی مۆرکی سیاسی لەو ئەنجوومەنانە کۆتبەند و چوارچێوەدارن، بەوپێیەی کە دەکەونە ژێر سانسۆری توندی دەسەڵاتی ناوەندی کە بریتییە لە سانسۆرێکی ئیداری و قەزایی و پەرلەمانی و لەو سانسۆرە ناوەندییەش چڕوپڕترن کە دەخرێتە سەر یەکە ئیدارییەکان لە سیستمی لامەرکەزی ئیداری تەقلیدیدا. ئەو کارەی کە دەستەکانی ئۆتۆنۆمیی دەخاتە پێگەی شوێنکەوتنێکی توند بۆ دەسەڵاتی ناوەندی، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە دەستەکانی ئۆتۆنۆمیی- وەک یەکە ئیدارییەکان لە سیستمی لامەرکەزی ئیداری- بەشدار نابن لە مومارەسەکردنی دەسەڵاتی مەرکەزی، واتە لە دانانی دەستوور یان هەموارکردنی، ئەمەش مانای وایە کە بەبێ ویستی خۆیان دەسەڵاتەکانیان قابیلی هەموارکردنن.

بەم جۆرە لەگەڵ بۆردۆدا ڕێک دەکەوین لەوەی کە ئۆتۆنۆمیی شێوازێکە لە شێوازی لامەرکەزی ئیداری بەرفراوان، ئەوەی دەبێتە مایەی پتەوکردنی ئەو بۆچوونەش ئەوەیە یاسای چاکسازی سیستمی یاسایی ژمارە ٣٥ی ساڵی ١٩٧٧ لە عێراق ڕاشکاوانە ئەو سیستمەی بەدیمەنێکی پێشکەوتوو لە دیمەنەکانی لامەرکەزی ئیداری داناوە[١٨].

**پەراوێزەکانی ئاخافتنی یەکەم:**

(١) لەوبارەوە بڕوانە هەردوو بەشی دەیەم و یازدەم لە دەستووری کاتی.

(٢) ئەو هەموارکردنە بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی ژمارە ٢٤٧ی ١٩٧٤/٣/١١ ئەنجام درا.

(٣) هەندێک کەس پێیان وایە ئۆتۆنۆمیی لە لایەن ئیغریق و ڕۆمانەکان ناسراو بووە بەڵام مانایەکی دیکەی جیاوازی هەبووە لەگەڵ ئەو مانایەی ئێستا هەیەتی، ئەو چەمکە لە قۆناغی دیکەشدا ناسراوە لەو بارەوە بڕوانە:-
دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الادارية والسياسية- خانەی المستقبل العربي- قاهیرە- چاپی یەکەم ١٩٩٠- ل ٣٥- ٣٦.

(4) Cleveland and New York 1948. Page 26.

Roger Serution,adictionary of Political thoug ht, Hill and wang, New York 1984. Page 33- 34.

(٥) لەو بارەوە بڕوانە بەشی ١١ و ١٢ و ١٣ لە میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان و سیستمی ئینتیدابی بڕیار لەسەر دراو بەپێی کۆنگرەی سان ڕیمۆ لە ٢٥ی نیسانی ١٩٢٥.

(٦) بڕوانە ل ٢١- ٢٨ی ئەم تێزە.

(٧) لە دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحکم الذاتي والنظم اللامرکزیة الأداریة والسیاسیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢.

(8) Dinesov. A. soviet state law, moscow 1960, page 72.

(٩) دکتۆر عەبدولحەمید متوەلی- الأنظمة السیاسیة والمبادئ الدستوریة العامة في الأنظمة الغربیة- الماركسیة- قاهیرە ١٩٥٧- ل ٦٣٤.

(١٠) دکتۆر حەمید ئەلساعیدی- مبادی القانون الدستوري وتطور النظام السیاسي في العراق- خانەی حیکمە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- مووسڵ- عێراق ١٩٩٠- ل ٢٢٣.

(١١) دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحکم الذاتي والنظم اللامرکزیة الاداریة و السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٣.

(١٢) لە: دکتۆر خالید قەبانی- اللامرکزیة ومسألة تطبیقها في لبنان- بڵاوکراوەکانی البحر المتوسط و عویدات- بەیروت- پاریس- چاپی یەکەم ١٩٨١- ل ١٦٢.

(١٣) لە: دکتۆر خالید قەبانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨٨.

(١٤) دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحکم الذاتي والنظم اللامرکزیة الاداریة و السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٢.

(١٥) دکتۆر خالید قەبانی ئاماژەی پێ داوە- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨٨.

(١٦) دکتۆر مونزیر ئەلشاوی- القانون الدستوري- نظریة الدولة- لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی لێکۆڵینەوە یاساییەکان- خانەی قادسیە بۆ چاپکردن- بەغدا ١٩٨١، لا ٢٢٤، ئەمەو دکتۆر مونزیر ئەلشاوی پێی وایە کە جیاوازی لە نێوان لامەرکەزی ئیداری و لامەرکەزی سیاسی (فیدراڵی) لە جیاوازی پلە دایە نەوەک لە سروشت.

لەو بارەوە بڕوانە: دکتۆر مونزیر ئەلشاوی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٥١.

(١٧) دکتۆر خالید قەبانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٩٠.

(١٨) اصلاح النظام القانوني وحرکة التغییر الثوري- بڵاوکراوەکانی الثورة، خانەی الحریة بۆ چاپکردن- بەغدا ١٩٧٧- ل ٧٥.

## ئاخافتنی دووەم

# بنەماکانی ئۆتۆنۆمیی

ئۆتۆنۆمیی وەکو ڕێکخستنێکی یاسایی ناوخۆیی لە زۆر لەو وڵاتانەدا پیادە کراوە کە ڕێک نەکەوتنی دانیشتوانیان تێدا بەدی دەکرێ، مەبەستیش لە دوایەوە چارەسەرکردنی ئیشکالیەتی ئەو ناتەواوییەیە کە لە ئەنجامی بوونی تایبەتمەندیی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆرەوە دروست بووە، ئەمە وێڕای هێنانەدی ویست و خواستە تایبەتەکانیان. دروستبوونی ئەو ڕێکخستنەش دەوەستێتە سەر چەند بنەمایەکی دیاریکراو و لە پێناوی پیادەکردنیشیدا دەبێ ئەو بنەمایانە دابین بکرێن، بەو پێیەش کە هۆکاری پیادەکرنی ئۆتۆنۆمیی هێنا نەدی ویست و خواستی هەندێک گرووپی دیاریکراوی ناو دەوڵەتە و پیادەکرنی ئەو سیستمەش پەیوەستە بەچوارچێوەیەکی شوێنی یان هەرێمی دیاریکراوەوە، بۆیە بەر لە پیادەکرنی دەبێ مەرجێک یان بنەمایەکی سەرەکی دابین بکرێ ئەویش پەیوەست بوونی نەتەوە یان گرووپێکی ئایینی یاخود زمانەوانی و کلتوورییە بەهەرێمێکی دیاریکراو، ئەمە سەرەڕای بنەماکانی دیکەی ئەو سیستمە کە سەربەخۆیی زاتی و سانسۆری مەرکەزین. لێرەشەوە جیاوازی نێوان سیستمی ئۆتۆنۆمیی و سیستمە لامەرکەزییە ئیدارییە تەقلیدییەکان دەردەکەوێ کە تەنیا هاتنە ئارایان پێویستی بەبوونی هەردوو بنەمای سەربەخۆیی زاتی و سانسۆری ئیداری هەیە، چونکە ئەو سیستمانە لەسەر ئیعتیباراتی ئیداری و ئابووری ڕووتەوە سەرچاوە دەگرن[١]

بەم جۆرە دەردەکەوێ کە هاتنەئارای ئۆتۆنۆمیی پێویستی بەدابینکردنی ئەو بنەمایانەی خوارەوە هەیە:

یەکەم: پەیوەستبوونی گرووپێکی نەتەوەیی یان ئایینی یان زمانەوانی یاخود کلتووری بەهەرێمێکی دیاریکراوەوە.

دووەم: سەربەخۆیی زاتی.

سێیەم: چاودێریی (سانسۆر)ی ناوەندی.

**یەکەم: پەیوەست بوونی گرووپێکی نەتەوەیی یان ئایینی یان زمانەوانی یاخود کلتووری بەهەرێمێکی دیاریکراوەوە:**

پێشتر ڕوونمان کردەوە کە ئۆتۆنۆمیی لە یاسای ناوخۆییدا ئەگەرچی لە زۆربەی سیماکانیدا لەگەڵ سیستمە لامەرکەزیی ئیدارییە تەقلیدییەکاندا هاوبەشە، بەڵام مەبەست لە دوای پیادەکرنیدا جیاوازە ، بەو پێیەی کە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا مەبەست لە دوایەوە هێنانەدی ویست و تایبەتمەندی هەندێک نەتەوە یان گرووپە تایبەتەکانی ناو دەوڵەتە، ئەمەش لەو بنەمایەدا خۆی دەنوێنێ کە لە هەندێک بواردا خۆیان حوکمی خۆیان بکەن، بەوەی دەسەڵاتی ناوەندی ڕێگەی مومارەسەکردنی بەشێک لە دەسەڵاتە تەشریعی و تەنفیزییەکانیان لە چوارچێوەی یەکێتی یاسایی و سیاسی دەوڵەتدا بۆ بهێڵێتەوە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو بنەمایانەدا و بەمەبەستی پیادەکردنی سیستمی ئۆتۆنۆمیی بەپێی ئەو چەمکەی پێشتر باسی لێوەکرا، دەبێ گرووپێکی نەتەوەیی یان ئایینی و زمانەوانی و کلتووری دیاریکراو هەبێ و لە ناوچەیەکی دیاریکراوی هەرێمی دەوڵەتدا بژیت، چونکە لە کاتێکدا ئەگەر ئەو گرووپانە بەشێوەیەکی بەربڵاو و ناچڕوپڕ لە ڕووبەرێکی جوگرافی دیاریکراو لە ناو دەوڵەت بژین ئەو کاتە لە ڕووی پراکتیکییەوە ناکرێ ئۆتۆنۆمییان پێ ببەخشرێ و لەسەر ئەرزی واقیعدا پیادە بکرێ. وەکو گونجانێکیش لەگەڵ ئەو ئاراستەیەدا یاسای چاکسازی سیستمی یاسایی ژمارە ٣٥ی ساڵی ١٩٧٧ لە عێراق باس لەوە دەکات: «... بەڵام لە ناو دەوڵەتدا ناوچەی دیاریکراو هەن و پەیوەندی تایبەت دانیشتوانیان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، سەرەڕای پەیوەندییە هاوبەشەکان لە نێوان هاووڵاتیانی دەوڵەت....»[٢].

دکتۆر مونزیر ئەلشاوی لە کاتی باسکردنی هەرێمییەتی سیاسی ئیسپانیدا کە دەستووری ئەو وڵاتە کە لە ٩ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣١ دەرچووە- لە ماددەکانی ١١- ٢٢ دا بڕیاری لەسەر داوە و دەڵێت: «ئەو بیرۆکە بنەڕەتییەی کە هەرێمییەتی سیاسی ئیسپانیای لێوە هەڵدەقوڵێ بوونی ناوچە Province ی- هاوسێی یەکترن کە چەند سیفەتێکی مێژوویی، کلتووری، ئابووری هاوبەشیان هەیە، بۆیە ئەو هەرێمانە دەتوانن لە نێوان خۆیاندا ڕێک بکەون و لەسەر شێوازی هەرێمێکی سەربەخۆ خۆیان ڕێک بخەن، سەربەخۆییەکی خودی، بەمەبەستی پێکهێنانی ناوەڕۆکێکی سیاسی- ئیداری لە ناو دەوڵەتدا[٣].

دکتۆر ئیسماعیل غەزال پێی وایە حکوومەتی زاتی (خودی) بەمانای ئەوە دێت ئەو هەرێمەی لەسەر بنەما جوگرافی و مێژوویی و ڕەگەزی و زمانەوانییەکان یەکێتییەک پێکدێنێ و هەوڵی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی سیاسی و ئەنجوومەنە سیاسییە تایبەت و سەربەخۆکان دەدات کە جیاوازبن لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی[٤].

دکتۆر سەعد عەلوشیش لەو ڕووەوە ئەوە دووپات دەکاتەوە کە: «ڕووبەری جوگرافی خاوەن ئۆتۆنۆمیی لە سنووری ئەو ناوچەیەدا یەک دەگرێتەوە کە تیایدا دانیشتوانی کورد بەگوێرەی کۆی ژمارەی دانیشتوان زۆرینەن»[٥] دکتۆر محەمەد هەمەوەندیش دەگاتە هەمان ئەنجام و دەڵێت: «پیادەکردنەکانی ئۆتۆنۆمیی ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو هەرێمانەی خاوەنی سیستمێکی لەو جۆرەن لەڕووی مێژووییەوە بۆ یەک نەتەوە یان گرووپی ڕەگەزی دیاریکراو دەگەڕێنەوە و ئەندامانیشی هەر لەو هەرێمانەدا ژیاون و گیرساونەتەوە، ئەمەش بۆتە مایەی پتەوبوونی پەیوەندییەکانی نێوانیان و کارلێککردنی هەست و سۆز و دید و بۆچوونەکانیان بەرامبەر بەوکێشانەی کە بەلایانەوە بایەخیان هەیە، بۆیە زۆرجار ئۆتۆنۆمیی بەئۆتۆنۆمیی هەرێمیی نەتەوەیی ناودەبرێ[٦]».

بەگوێرەی ئەو ئیعتیبارات و بنەمایانەش، ماددەی ژمارە ١١٥ لە دەستووری ئیتاڵی کە لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧ دەرچووە دەڵێت: ئەو ناوچانە دەستەی تایبەت بەئۆتۆنۆمیی پێکدێنن و خاوەنی دەسەڵاتی خودی و ئەرکی تایبەتیش دەبن[٧]. ماددەی دووەمی دەستووری ئیسپانیی ساڵی ١٩٧٨یش بڕیاری داوە کە «دەستوور دان بەسەربەخۆیی خودی ئەو نەتەوە و ناوچانەدا دەنێت کە پێکی دێنن و مافەکانیشیان زامن دەکات»[٨].

یاسادانەری عێراقیش لە هەموارکردنی دەستووری کاتیی ساڵی ١٩٧٠دا هەمان ئەو ئاراستەیەی گرتەبەر لە ڕێگەی زیادکردنی ئەو بڕگەیەی خوارەوە بۆ ماددەی هەشتەم:

بەپێی ئەوەی یاسا دیاری دەکات، ئەو ناوچەیەی کە زۆرینەی دانیشتوانی کوردن ئۆتۆنۆمیی پێ دەبەخشرێ[٩].

هەروەها لە ماددەی یەکەمی یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤یشدا هاتووە کە: ناوچەی کوردستان ئۆتۆنۆمیی پێ دەبەخشرێ و ناوچەکەش بەو ناوە ناوزەد دەکرێ لە یاسادا هاتووە.

بەمەش دەردەکەوێ کە هەرێم یان ڕووبەری جوگرافی کە گرووپێکی نەتەوەیی یان ئایینی

یاخود زمانەوانی و کلتووری تیادا دەژی، بەکارێکی پڕ بایەخ و بنەڕەتی دادەنرێ لە پێناوی داننان بەئۆتۆنۆمیی بۆ ئەو گرووپانە، دەکرێ بوترێ کە بوونی هەریەکە لە هەرێم و گرووپی خاوەن تایبەتمەندی لەو بوارەدا دوو شتی لەیەک جیانەکراوەن و تەواوکەری یەکترن، چونکە هیچ گرووپی خاوەن تایبەتمەندی نەتەوەیی یان ئاینی نییە بەبێ چڕبوونەوە لە ڕووبەرێکی جوگرافی یان هەرێمێکی دیاریکراودا بتوانێ ئۆتۆنۆمیی دەستەبەر بکات، هەروەها هەرگیز ناشکرێ دان بەئۆتۆنۆمیی هەرێمێک دابنرێ بەبێ ئەوەی زۆرینەی گرووپێکی نەتەوەیی یان ئاینی یاخود زمانەوانی و کلتووری لەو هەرێمەدا نیشتەجێ نەبووبن، کەواتە ئەو پەیوەندییەی نێوانیان تەواوکاری یەکترن، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەرێم یەکێکە لەو بنەما سەرەکییانەی کە دەوەستێتە دوای دروستبوونی تایبەتمەندی نەتەوەیی و هی تر، بەواتایەکی دیکە: هەرێم بەوپێیەی کە بنەمایەکی گرنگی دەوروبەرە بۆیە لە دروستبوونی دابونەریت و بەها هاوبەشەکاندا ڕۆڵێکی گەورەی هەیە، بۆیە بەشێوازێک لە شێوازەکان کاریگەر دەبێ لە پێکهاتنی نەتەوە یان گەل و گرووپە تایبەتەکانی دیکە، بەو مانایەش کالاسۆ Calasso دەڵێت: زاراوەی ئۆتۆنۆمیی تەنیا کورتکراوەی بڕگەی «بوونی مافی سروشتییە بۆ گرووپی مرۆڤایەتی» لەبەرئەوەی هەرێمیش شێوازێکە لە شێوازەکانی تایبەتمەندی -هەر جۆرێکی بێت- بۆیە داننان بەئۆتۆنۆمیی بۆ گرووپێکی دیاریکراو، بێگومان داننان بەهەرێمیشی لێ دەکەوێتەوە وەکو بنەمایەکی سەرەکی لە هزری ئۆتۆنۆمییدا[١٠].

تەنانەت لە ڕووی بەرزی و نزمی جوگرافیشدا لەوانەیە هەرێمی خاوەن ئۆتۆنۆمیی لە هەرێمەکانی دیکە جیاوازبێ، ئەوەش بەئاشکرا لە هەرێمەکانی ئیسپانیا و هەرێمی باشووری سودان بەدی دەکرێ کە خودای گەورە سروشتێکی جیاوازی پێ بەخشیوە کە لەگەڵ تەواوی ناوچەکانی دیکەی سودان جیاوازە[١١].

ئەمە هەرێمی کوردستانی عێراقیش دەگرێتەوە کە ناوچەیەکی شاخاوی خاوەن کەشوهەواو بەرزی و نزمی جیاوازە لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی عێراق، ئەم جیاوازیە لایەن و بواری دیکەش دەگرێتەوە.

لە ڕوانگەی گرنگیی هەرێمیشەوە بەنیسبەت گرووپی نەتەوەیی یان ئاینی و هی تر و بەهۆی ڕێزگرتنی هەست و سۆزی ئەو گرووپانەوە دەبینین هەندێک لەو دەستوورانەی ئەو سیستمەیان هەڵبژاردووە، باسیان لە ڕێگە نەدان بەئەنجامدانی هەر جۆرە هەمووارکردنێک کردووە لە هەرێمی ئۆتۆنۆمییدا بەبێ ڕەزامەندی ئەو گرووپانە، بۆ نموونە لە دەستووری

سۆڤییەتیدا هاتووە: «تەنیا بەرەزامەندی ئەوان نەبێ هیچ هەمواركردنێك لە سنووری كۆماری خاوەن ئۆتۆنۆمییدا ناكرێ»[١٢]، هەروەها ئەو هۆكارە سەرەكییەی بووە مایەی ئالۆزبوونی پەیوەندییەكانی نێوان حكوومەتی عێراق و سەركردایەتی شۆرشی كورد لە دوای بەیانی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠، نەبوونی رێككەوتن بوو لە نێوان هەردوو لا سەبارەت بەدیاركردنی هەرێمی ئۆتۆنۆمیی، بەوپێیەی حكوومەتی عێراق رازی نەبوو بەگێرانەوەی چەند ناوچەیەكی گرنگی كوردیی وەك كەركووك و خانەقین و مەندەلی و سنجار و شێخان بۆ هەرێمی ئۆتۆنۆمیی، بەڵكو خستنیە سەر ناوچە ناوەندیەكان.

## دووەم: سەربەخۆیی خودی (الاستقلال الذاتی)

مەبەست لێیەوە بەخشینی جۆرە سەربەخۆییەكی تەشریعی و ئیداری و داراییە بەو دەستانەی كە لە هەرێمی ئۆتۆنۆمییدا پێكدەهێنرێن، ئەو سەربەخۆییە بەبنەما سەرەكییەكانی سیستمی ئۆتۆنۆمییش دادەنرێ بەوپێیەی كە دەربری ئاراستەی دەسەڵاتی مەركەزییە لە كەمكردنەوەی دەسەڵاتەكانی لە هەندێك بواردا لە رێگەی بەخشینی بەشێكیان بەودەستانەی ئۆتۆنۆمیی كە لە لایەن خەڵكی هەرێمەوە هەڵبژێردراون و بوونەتە دەربری ویست و خواستەكانی دانیشتوان.

لە پێناوی گەیاندنی دیمەنێكی ئاشكراش سەبارەت بەسەربەخۆیی خودی، دەبێ باس لە دەستەكانی ئۆتۆنۆمیی و ئەو شێوازە گونجاوە بكرێ كە دەبێتە مایەی زامنكردنی و روونكردنەوەی شێواز و سیماكانی ئەو سەربەخۆییەی ئەو دەستانە هەیانە.

### ١ - دامودەزگاكانی ئۆتۆنۆمیی:

لە میانەی چاوخشاندن بەئەزموونەكانی ئۆتۆنۆمیی بەراوردكراودا، بۆمان دەردەكەوێ كە دەستە(دامودەزگا)كانی ئۆتۆنۆمیی لەمەی خوارەوە پێك دێن:

أ- ئەنجوومەنی تەشریعی یان ئەنجوومەنی هەرێم.

ب- ئەنجوومەنی تەنفیزی.

أ- ئەنجوومەنی تەشریعی یان ئەنجوومەنی هەرێم:

بریتییە لەو دەستەیەی كە ئەركی تەشریعی لە چوارچێوەی هەرێمدا بەرێوە دەبات. بەپێی دەستووری ئیسپانی ئەو دەستەیە بەپەرلەمان ناودەنرێ و لە ئیتالیا بەئەنجوومەنی ناوچە یان كۆمەڵەی هەرێمی و لە عێراقیش بەئەنجوومەنی تەشریعی.

تێبینی دەکرێ کە لەماددەی ١١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ی دەستووری ئیتالیدا باس لە ئەرکەکانی ئەنجوومەنی ناوچە کراوە لە تەبەنناکردنی یاسا تەشریعییەکان لەو بابەتانەی کە ماددەی سەرەوە باسی لێوە کردوون بەمەرجێک ئەو یاسایانە لەگەڵ بنەما سەرەکییەکاندا پێچەوانە نەبن کە یاساکانی دەوڵەت دیاریان دەکەن هەروەها لەگەڵ بەرژەوەندی نیشتمانی و هەرێمەکانی دیکەدا بگونجێن[١٣]، ماددەی ناوبراو ئەرکەکانی ئەنجوومەنی ناوچەشی بەتەشریعکردن لە بابەتەکانی پۆلیسی ناوخۆیی و پێشانگا و بازاڕ و فریاگوزاری گشتی و فێرکردنی پیشەیی و تەکنیکی و یارمەتی قوتابخانەکان و ئیشە گشتییە خاوەن مۆرکە هەرێمییەکان دیارکردووە[١٤]، هەروەها ئەنجوومەنی ناوچە بۆی هەیە پێشنیازی یاساکان بکات و بەمەبەستی تەشریعکردنیان ئاراستەی پەرلەمانی ناوەندییان بکات[١٥].

شایەنی باسە پەرلەمانی ناوچەی کاتالۆنیای ئیسپانی بەپێی سیستمی بنەڕەتی ناوچەکە کە لە ١٥ی ئەیلوولی ١٩٣٢ دەرکراوە[١٦] توانای دەرکردنی یاسا ناوخۆییەکان و بڕیاردان لەسەر بوودجەی هەبوو.

ئەنجوومەنی تەشریعی ناوچەی کوردستانی عێراقیش تایبەتمەندە بەدەرکردنی بڕیارە تەشریعییە پێویستەکان بەمەبەستی پێشخستنی ناوچەکە و پەرەدان بەپێگە کۆمەڵایەتی و کلتووری و ئاوەدانی و ئابوورییەکان، ئەوانەی خاوەنی مۆرکی ناوخۆیین[١٧]، بەڵام لە توانایدا نییە ئەو بڕیارە تەشریعییانە دەربکات کە تایبەتن بەفەرمانگە نیمچە ڕەسمییەکان و ئەو بەرژەوەندییانەی خاوەنی مۆرکی ناوخۆیین تەنیا بەڕاوێژکردن نەبێ لەگەڵ لایەنە ناوەندییەکانی دەوڵەت[١٨]، جگە لەمە ئەنجوومەنی ناوبراو دەسەڵاتی داڕشتنی یاسا و سیستمە هەرێمییەکانیشی نییە.

مایەی تێبینییە ئەو پسپۆڕی و دەسەڵاتانەی کە بەدەستە تەشریعییەکان دراون سنووردارن لە کاتێکدا ئەگەر ئەو حیکمەتە بەراورد بکرێن کە لە دوای دامەزراندنی ئەو سیستمەدایە وەکو شێوازێک بۆ وەدیهێنانی ویست و خواستی نەتەوە و گرووپە خاوەن تایبەتمەندییە جیاوازەکان. کەواتە ئەگەر ئەمە سروشتی تایبەتمەندی دەستە تەشریعییەکان بێ لە هەرێمەکانی ئۆتۆنۆمییدا، دەبێ ئەو شێوازە چی بێ کە بەهۆیەوە سەربەخۆیی ئەندامانی ئەو دەستانە زامن دەکرێ؟

پێویستە کەمێک لای ئەو مەسەلەیە بوەستین، چونکە پێکهێنانی سیستمی ناوخۆیی

ئۆتۆنۆمیی دانانە بەمافە نەتەوەیی و زمانەوانی و ئایینی و کلتوورییەکانی نەتەوە، یان گرووپێکی ئایینی و زمانەوانی و کلتووری تایبەتمەند، بەهۆی ڕێگەدانیان بەڕێکخستنی ناوخۆیی و موومارەسەکردنی بەشێک لە پسپۆڕییە تەشریعی و ئیداری و داراییەکان، بۆ پیادەکردنی ئەمەش لە ڕووی پراکتیکییەوە دەبێ ڕێگە بەدانیشتوانی هەرێم بدرێ کە موومارەسەی دەسەڵاتی هەرێمی بکەن لە ڕێگەی نوێنەرانیانەوە لە دەستە تەشریعی و تەنفیزییەکان، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو سیستەمە بەو ئامانجە بگات و سەربەخۆیی ئەندامانی ئەو دەستانەش زامن بکەین، دەبێ ئەو ئەندامانە بەدەنگدانی گشتی و ئازاد و نهێنی و ڕاستەوخۆ لە لایەن دانیشتوانی هەرێمەوە هەڵبژێردرێن.

ئەمەو (لیکۆییر) باس لە دەرخستنی بەهێزیی و توندوتۆڵیی پەیوەندی نێوان ئەو سەربەخۆییەی کە دەبێ بۆ دەستەکانی ئۆتۆنۆمیی وەدی بهێنرێ لەگەڵ زەروورەتی پیادەکردنی بنەمای هەڵبژاردنەکان دەکات، جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە پێناوی بەرپابوونی لامەرکەزی هەرێمی و ئۆتۆنۆمییدا باسکردن لە بوونی پێداویستی تایبەت بۆ کۆمەڵگایەکی بچووک کیفایەت نییە، بەڵکو ئەو کۆمەڵگەیە دەبێ بەخۆی ئەو پێداویستییانە دابین بکات بەبێ ئەوەی پشت بەدەسەڵاتی ناوەندی ببەستێ، لەو بارەشەوە دەڵێت: دەوڵەت لە بەردەمی کۆمەڵگادا تاکە نوێنەر نییە بۆ بەرژەوەندییەکان، چونکە هەندێک بەرژەوەندی هەن تایبەتن بەناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو و دەکرێ لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت بەجیاواز لە قەڵەم بدرێن، بۆیە دەبێ لە لایەن خودی نوێنەری دانیشتوانی ئەو هەرێمەوە بەڕێوەببرێن[١٩].

دکتۆر سەفاء حافز بەهەمان مانا دووپاتی دەکاتەوە کە ئەنجوومەنی تەشریعی لە هەرێمی کوردستاندا دەبێ دەسەڵاتی باڵابێت، لەبەرئەوەی گەلیش سەرچاوەی دەسەڵاتە بۆیە ئەندامانی ئەو دەسەڵاتە دەبێ لە لایەن دانیشتوانی کوردستانەوە- کورد و هی تر- و لەسەر ئەساسی هەڵبژاردنی گشتی و ڕاستەوخۆ و بەدەنگدانی گشتی هەڵبژێردرێن[٢٠].

لە کۆتاییدا دەکرێ بوترێ ئەگەر بۆچوونی زۆرینەی شارەزا و پسپۆڕان ئەوەبێ کە هەڵبژاردن تاکە ڕێگابێت بۆ هێنانەدی لامەرکەزی هەرێمی، ئەو کاتە واباشترە باس لە هێنانەدی ئەو بنەمایە بکرێ لە ژێر سایەی ئۆتۆنۆمییدا کە بەشێوازێکی پێشکەوتوو دادەنرێ بۆ سیستەمە لامەرکەزییە هەرێمییەکان.

لە تاقیکردنەوە بەراوردکارەکانی ئۆتۆنۆمیی ناوخۆییشدا دەردەکەوێ کە لە زۆربەی

دەوڵەتاندا و بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی دەستەی تەشریعی هەڵبژاردن دەگرێتەبەر، لە دەستووری ئیتالیشدا هاتووە کە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی هەرێم لە لایەن دانیشتوانیەوە دەبێ بەپێی یاسایەکی ناوەندی بێت کە ئەو مەسەلەیە ڕێک دەخات[٢١].

لە عێراقیشدا ماددەی دەیەم لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ بڕیاری لەسەر ئەوە داوە کە: « ئەنجوومەنی تەشریعی بریتییە لە دەستەی تەشریعی هەڵبژێردراو لە ناوچەکەدا و بەهۆی یاسایەکیشەوە پێکهاتەو ڕێکخستن و ڕێڕەوی کارکردنی دیاردەکرێ».

ئینجا یاسای ژمارە ٣٦ی ساڵی ١٩٧٤ی ئەنجوومەنی تەشریعی ناوچەی کوردستان دەرکرا کە بڕیاری لەسەر گرتنەبەری هەڵبژاردنی ئازاد و ڕاستەوخۆ دا بۆ ئەندامان و مەرجەکانی ئەندامێتی و چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کارەکانی، پێشتریش ماددەی دەیەمی ئەو یاسایە باسی لە حوکمی ئینتیقالی و ئیستیسنائی کردبوو، ئەویش ئەگەری هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی تەشریعی یەکەم لە ڕێگەی دامەزراندنەوە[٢٢]، هەندێک کەس پێیان وایە کە وەسفکردنی ئەو حوکمە بەئینتیقالی دەلالەت لە پەرۆشی یاسادانەری عێراقی دەکات لە گرتنەبەری ڕێگەی هەڵبژاردن[٢٣].

ب- ئەنجوومەنی تەنفیزی:

ئەو ئەنجوومەنە وەکو ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێم وایە و بەدەسەڵاتی باڵای تەنفیزی دادەنرێ و لە سەرۆک و ژمارەیەک ئەندام پێکدێت کە هەریەکەیان سەرۆکایەتی ئیدارەیەکی هەرێمی دەکەن، چۆنیەتی هەڵبژاردنی سەرۆک و ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنەش لە دەوڵەتێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، لە ئیتاڵیا سەرۆک و ئەندامانی دەستەی تەنفیزی ناوچەکە بە(جونتا La Giunta) ناوزەد دەکرێ، لە لایەن ئەنجوومەنی ناوچەو لە نێوان ئەندامانیدا هەڵدەبژێردرێن، سەرۆکی جونتاش تایبەتە بەدەرکردنی یاساو سیستەمە هەرێمییەکان و بەڕێوەبردنی کارە ئیدارییەکانی هەرێم کە لە لایەن دەسەڵاتە ناوەندییەکانەوە پێی دراوە و لەبەردەم ئەو دەسەڵاتانەشدا بەنوێنەری ڕاستەقینەی هەرێم دادەنرێ[٢٤].

دەشکرێ سەرۆک و ئەندامانی ئەنجوومەنی تەنفیزی لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە دابمەزرێنرێن، ڕۆڵی ئەنجوومەنی تەشریعیش تەنیا بریتی دەبێ لە پاڵاوتنیان و پێشکەشکردنی ڕێنمایی، بەدەسەڵاتی ناوەندی بۆ دامەزراندنیان، ئەمەش بەپێی یاسای

ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ لە عێراق پیادە دەکرا و تیایدا ئەنجوومەنی تەنفیزی بەدەستەی تەنفیزی ئیدارەی دەسەلات لە ناوچەکە دانراو لە سەرۆک و جێگر و ژمارەیەکی یەکسانی ئەندامان لەگەڵ ژمارەی ئیدارە هەرێمییەکانی ناوچەکە یان زیاتر لەو ژمارەیە پێکدەهێنرێت[٢٥]، لە هەمان یاسادا هاتووە کە هەڵبژاردنی سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی لە لایەن سەرۆک کۆمار و لە نێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی تەشریعیدا هەڵدەبژێردرێ[٢٦].

دواتر کەسی دەستنیشانکراو بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەن جێگرو ئەندامانی ئەنجوومەنی تەنفیزی لە نێو ئەندامانی دەسەلاتی تەشریعی هەرێمی یان لە ناو ئەوانەی مەرجەکانی ئەندامێتیان هەیە هەڵدەبژێری و پێشکەش بەئەنجوومەنی تەشریعیان دەکات، ئەنجوومەنی ناوبراویش بەئامادەبوونی زۆربەی ئەندامانی پرۆسەی دەنگدان ئەنجام دەدات بەمەبەستی بەخشینی متمانە پێیان، دوای تەواوبوونی ئەو ڕێوشوێنانە ئەنجوومەنی تەشریعی دەیانپاڵێوێت و ڕاسپاردەی پێویست ئاراستەی سەرۆک کۆمار دەکات بۆ دەرکردنی بڕیاری تایبەت بەدامەزراندنیان[٢٧].

لەوەی ڕابردوودا دەردەکەوێ کە دەسەلاتی ناوەندی لە عێراق دەتوانێ سانسۆرێکی توند بخاتە سەر کاروبارەکانی هەرێم لە ڕێگەی مافی دەستنیشانکردنی سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی و دەستوەردان لە دیارکردنی ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنەوە، جگە لەوەی کە سەرۆک کۆمار تایبەتمەندە بەدامەزراندنی هەموویان، با ئەمە بەپێی پاڵاوتن و ڕاسپاردەی ئەنجوومەنی تەشریعیش بێ. ئەنجوومەنی تەنفیزی ناوچەی کوردستان چەند تایبەتمەندییەکی خراوەتە ئەستۆ کە ئیداری و دارایی ئاسایین[٢٨] کە زۆر لە تایبەتمەندییەکانی یەکە ئیدارییەکانی سیستمە لامەرکەزییە تەقلیدییەکانەوە جیاوازنین، بەلام ئەوەی مایەی تێبینییە ئەوەیە کە ئەنجوومەنی تەنفیزی دەسەلاتی دەرکردنی بڕیارە تەشریعییە ناوخۆییەکانی هەیە[٢٩] بەبێ ئاماژەکردن بەماهیەتی ئەو بڕیارانە یان ئەو بوارانەی کە لە بارەیانەوە دەردەچن، بەڕای ئێمە ئەمەش تێکەڵیەک لە نێوان دەسەلاتەکان پەیدا دەکات و پێچەوانەی یاسا و ڕێنماییە پەیڕەوکراوەکانیشە کە لەسەر ئەساسی ڕێزگرتنی بنەمای جیاکردنەوە لە نێوان دەسەلاتەکان سەری گرتووە.

٢- سەربەخۆیی دارایی:

هەرێمی ئۆتۆنۆمیی- وەک تەواوی یەکە لامەرکەزییە ئیدارییەکانی تر- خاوەنی کەسایەتی مەعنەوی سەربەخۆی خۆی دەبێ، گرنگترین ئەنجامە یاساییە وەدەستهێنراوەکانی ئەو کەسێتییە یاساییەش ئەوەیە کە بودجەیەکی دارایی سەربەخۆی هەبێ، بەمانایەکی دیکە هەرێم دەبێ خاوەنی بودجەیەکی سەربەخۆبێ لە بودجەی دەوڵەت، بۆ ئەوەی دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی بتوانن کاروباری هەرێم ڕاپەڕێنن و بەڕێوەیان ببەن و لە ڕووی ئابووری و ئاوەدانی و کلتووری و پەروەردەیی و تەندروستییەوە پێشکەوتن زامن بکەن و خزمەتگوزاری گشتی و پێویستیش پێشکەش بەدانیشتوانی هەرێم بکەن، چونکە بەبێ بوونی بودجەیەکی سەربەخۆ لە ڕووی سەرچاوەکانی بەخشین و خەرجکردنی خودییەوە دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی ناتوانن ئەو ئەرکانە جێبەجێ بکەن.

بەم جۆرە دەبینین کە یەکێک لە ئەرک و تایبەتمەندییەکانی پەرلەمانی کاتالۆنیا Cat-alogne لە ئیسپانیا بریتی بووە لە بڕیاردان لەسەر بودجەی هەرێم[٣٠]، لە عێراقیش ئەنجوومەنی تەشریعی تایبەتمەندە بەڕازیبوون لەسەر بودجەی ئاسایی ناوچەکە و بەرزکردنەوەی بۆ دەسەڵاتی ناوەندی بەمەبەستی گفتوگۆکردن لە بارەیەوە، هەروەها بەهەمموارکردنی بودجەی تایبەت بەناوچەکە دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو و بەجۆرێک کە لەگەڵ یاسا کارپێکراو و پلانەکانی بووژاندنەوە لە دەوڵەت دژ بەیەک نەبن[٣١].

بەڵام دەکرێ بوترێ کە سەربەخۆیی دارایی دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی سەربەخۆییەکی سنووردارە چونکە سیستمی ئۆتۆنۆمیی لە دەوروبەری یەکێتی یاسایی و سیاسی دەوڵەت پێکدەهێنرێ، بۆیە سەربەخۆیی دارایی دەستەو دامەزراوەکانی نابێ ئەو لایەنانە فەرامۆش بکات، بەمەش ناکرێ ئەمە بەسەربەخۆییەکی ڕاستەقینە دابنرێ، چونکە دەستەکانی ئۆتۆنۆمیی ناتوانن باج لەسەر هاتن و چوونی کەلوپەل بۆ ناوچەکانی دیکەی دەوڵەت بسەپێنن، ماددەی ١٢٠ی دەستووری ئیتالی ڕاشکاوانە باس لەو کۆتە دەکات[٣٢].

هەروەها ئەو دەستەو دامەزراوانە دەبێ پابەندبن بەو بنەما گشتییانەی کە لە یاسا ناوەندییەکاندا هاتوون و لە کاتی دیارکردنی بودجەی هەرێمیشدا لێیان لانەدەن. هەروەها

دەستەکانی ئۆتۆنۆمیی ناتوانن نرخی باج دیار بکەن یان باجی تایبەت بسەپێنن، چونکە ئەمە دەچێتە کرۆکی تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی ناوەندی، لەو بوارەشدا دەستووری سۆڤیەتی باس لە تایبەتمەندییەکانی یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییەکانی سۆڤیەتی دەکات بەهۆی دەستەو دامەزراوە بالآکانی لە دانانی بودجەیەکی یەکگرتوو بۆ یەکێتی سۆڤیەت و رازیبوون پێی و بەو راپۆرتەی کە تایبەتە بەجێبەجێکردنی و بەڕێوەبردنی یەک سیستمی نەقدی و قەرزکردن و بڕیاردان لەسەر باج و داهاتە تەرخانکراوەکان و بۆ پێکهێنانی بودجەی یەکێتی سۆڤیەت و ڕەچاوکردنی سیاسەت لە مەیدانی نرخ و کرێیەکان[٣٣].

## سێیەم: چاودێریی ناوەندی

سیستمی ئۆتۆنۆمیی- وەکو هەموو سیستمە لامەرکەزییە ئیدارییەکانی دیکە- سروشتی یاسایی دەوڵەت ناگۆڕێ بەڵکو بەیەکگرتوویی دەمێنێتەوە، چونکە ئەو سیستمە زیاتر لە سایەی یەکێتی یاسایی و سیاسی دەوڵەتدا پێکدەهێنرێ، بۆیە لەو بوارەدا سەرەتا یەکێتی دەوڵەت دێت ئینجا یەکگرتوویی تایبەتمەندییە هەمەجۆرەکانی، هەڵاوێردنیش لەوەدا دەبێ کە بەشێکی ئەو تایبەتمەندیانە بدرێتە دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی، بەو پێیەش کە ئەو سیستمە لەسەر ئەساسی پێویستی و ئیعتیباراتی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە بونیاد دەنرێ و مەبەست لە دوایەوە بەخشینی مافەڕەواکانی نەتەوە یان گرووپێکی ئەتنۆلۆژی تایبەتە، ئەم زەروورەتەش بەقەد خۆی هەڵدەسەنگێنرێ و نابێ هەڵاواردن پێش ڕەچەڵەک بکەوێ، بۆیە بەهرەمەندبوونی هەرێمێکی دەوڵەت بەئۆتۆنۆمیی مانای ئەوە نابەخشێ ئەم هەرێمە جیابۆتەوە[٣٤].

بەم جۆرە ئەو سەربەخۆییە خودییەی کە هەرێمی ئۆتۆنۆمیی پێی بەهرەمەند دەبێ تەواو و ڕەهانییە بەڵکو سەربەخۆییەکی سنووردارە، هەر بۆیەش دەبینین کە دەسەڵاتی مەرکەزی هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدات کە دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی لە چوارچێوەی ئەو بوارەدا بهێڵێتەوە کە بۆی دیارکراوە و ئەو سنوورانە نەبەزێنێ، بۆ زامنکردنی ئەمەش لایەنە ناوەندییەکان هەمیشە جۆرە سانسۆر و چاودێرییەک لەسەر دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی دەهێڵنەوە ئینجا ئەو چاودێرییە چ لەسەر ئەندامانیان بێ یان لەسەر چالاکییەکانیان. هەرگیز ناشکرێ هاوسەنگییەک لە نێوان مافی دەوڵەت لە پاراستنی یەکێتی یاسایی و سیاسی خۆی و مافی هەرێم لە مومارەسەکردنی جۆرێک لە سەربەخۆیی خودی وەدی بهێنرێت تەنیا لە ڕێگەی چاودێری ناوەندییەوە نەبێت بەسەر دەستەو

دامـەزراوەکـانی ئۆتۆنۆمـیــدا، لە پێناوی زامنکردنی دەرنەچوونی لە تایبـەتمەندییـە دەستنیشانکراوەکانی بەپێی یاسا دەستووری و یاساییەکان.

**چوارەم: جۆرەکانی چاودێریی ناوەندی لەسەر دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی:**

دەکرێ جۆرەکانی چاودێریی ناوەندی لەمەی خوارەوە کۆبکەینەوە:

١- چاودێری ئیداری.

٢- چاودێری قەزایی.

٣- چاودێری پەرلەمانی.

١- چاودێری ئیداری:

ئەو چاودێرییە دەبێتە دووبەش:

أ- چاودێری لەسەر دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی.

ب- چاودێری لەسەر چالاکییەکانی ئۆتۆنۆمیی.

**أ- چاودێری ئیداری لـەسـەر دەسـتەو دامـەزراوەکانی ئۆتۆنۆمـیی:**

ئەو جۆرە چاودێرییە خۆی لە مانەی خوارەوەدا دەنوێنێ:

دامەزراندن، ناردنی نوێنەر، هەڵوەشاندنەوەی داموەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی- دامەزراندن:

مـافی دەسەڵاتی ناوەندی لە دامەزراندنی هەندێک ئەندامی داموەزگـاکـانی ئۆتۆنۆمـیی یەکـێکە لەو شـێـوازانەی کە بەهۆیەوە دەسەڵاتـی ناوەندی چاودێری دەخـاتە سـەر دەسـتـەو دامەزراوەکـانی ئۆتۆنۆمیی، وەکو مـافی سەرۆک کۆمـاری عێراق لە دامەزراندنی سەرۆک و ئەندامـانی ئەنجـوومـەنی تەنفـیزی بەپێی ڕاسپـاردەی ئەنجـوومەنی تەشریعی هەرێم[٣٥] و مـافی دامەزراندنی سەرۆکی یەکە ئیـدارییەکان لە نـاوچەی ئۆتۆنۆمیی[٣٦]، ئەمە سەرەڕای ئەو دەسـەڵاتە سـەرۆکـایەتیـیـەی کـە حکوومـەتی ناوەندی بەرامـبـەر بەئەوانی تر پیـادەی دەکـات. دەکرێ بـوترێ ئەو چاودێرییـەی کـە دەسـەڵاتی ناوەندی لە عـێـراق- لەو بوارەدا- پیادەی دەکات تەنانەت لە چاودێریکردن لە سیستمە لا مـەرکەزییە ئیدارییە تەقلیدییەکان توندتر و چوارچێوەدارترە.

**ناردنی نوێنەر لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە:**

لەوانەیە حکوومەتی ناوەندی نوێنەرێکی خۆی لە هەرێمی ئۆتۆنۆمیی دابمەزرێنێ بۆ ئەوەی چالاکییەکانی نێوان حکوومەتی ناوەندی و دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی رێک بخات. لە دەستووری ئیتالیدا هاتووە کە دەوڵەت نوێنەرێکی لە پایتەختی هەرێم هەبێ کە سەرپەرشتی چالاکییە ئیدارییەکانی حکوومەتی ناوەندی بکات و لەگەڵ چالاکییە هاوشێوەکانی هەرێمدا یەکیان بخات، هەروەها ڕەزامەندیش سەبارەت بەو یاسایانە دەردەبڕێ کە ئەنجوومەنی ناوچە دایاندەڕێژێ و لەگەڵ دەستوور و یاساکان و بەرژەوەندی نیشتمانی و هەرێمەکانی تردا پێچەوانە نابن[٣٧].

لە عێراقیش یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ بڕیاری لەسەر دامەزراندنی وەزیری دەوڵەت داوە لە لایەن حکوومەتی مەرکەزییەوە بۆ ئەوەی ئەرکی یەکخستنی چالاکییەکانی هەریەکە لە دەسەڵاتی ناوەندی و دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی جێبەجێ بکات[٣٨].

**هەڵوەشاندنەوەی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی:**

زۆربەی سیستەمەکانی ئۆتۆنۆمیی لەسەر بەخشینی مافی هەڵوەشاندنەوەی دامودەزگاکانی خۆی بەدەسەڵاتی ناوەندی ڕاهاتوون، لە ماددەی ژمارە (١٢٦)ی دەستووری ئیتالیدا باس لە مافی دەسەڵاتی ناوەندی کراوە لە هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی هەرێم، لە کاتێکدا ئەگەر ئەنجوومەنی ناوبراو کاری وا ئەنجام بدات کە پێشێلی دەستووری کۆماری ئیتالی بکات یان ئەو کارانە پێچەوانەی یاسابن، یاخود ئەگەر سەبارەت بەگۆڕینی (جونتا)و سەرۆکەکەی کە ئەرکی دژ بەدەستوور و یاسایان ئەنجام دابێ مل بۆ بڕیارەکانی حکوومەت شل نەکەن، هەروەها دەکرێ ئەنجوومەنی هەرێم هەڵبوەشێنرێتەوە لە کاتێکدا ئەگەر ئەو ئەنجوومەنە کەوتبێتە بارودۆخێکی وا کە بەهۆی دەست لەکارکێشانەوەی ئەندامانی یان نەتوانینی دروستکردنی زۆرینە تیایدا، نەتوانێ ئەرک و کارەکانی جێبەجێ بکات، جگە لەمە دەکرێ ئەو هەڵوەشاندنەوەیە پەیوەندی بەسەلامەتی نەتەوەییەوە هەبێ، ئەوکاتە لە دوای ڕاوێژکردن لەگەڵ لیژنەیەکی تایبەت بەمەسەلە هەرێمییەکان کە لەژمارەیەک نوێنەر و پیر پێکدێت[٣٩]، سەرۆک کۆمار بڕیاری هەڵوەشاندنەوەکە دەردەکات.

لە عێراقیش مادەی ٢٠ی یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە ٣٣ی ساڵی

١٩٧٤ باسی لە مافی سەرۆک کۆمار کردووە لە هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی تەشریعی لەکاتی هاتنە پێشەوەی ئەو حاڵەتانەی خوارەوە:

* جێبەجێ نەکردنی دەسەڵات و ئەرکەکان بەهۆی دەست لەکارکێشانەوەی نیوەی ئەندامانییەوە.
* نەبوونی زۆرینەی یاسایی بەمەبەستی ئەنجامدانی کۆبوونەوە، ئەمەش لەماوەی ٣٠ رۆژ لە مێژووی بانگەشەکردنی بۆ کۆبوونەوە.
* نەبەخشینی متمانە بەئەنجوومەنی تەنفیزی بۆ زیاتر لە دووجار.
* پشتگوێخستنی بڕیارەکانی دەستەی چاودێری کە لە ماددەی (١٩)ی یاسای ناوبراودا هاتوون.

هەروەها لە بڕگەی (و) لە ماددەی (١٣)ی هەمان یاسادا باس لە مافی سەرۆک کۆمار کراوە لە بەخشینی سەرۆکی ئەنجوومەنی تەنفیزی لە کارەکەی، لەو حاڵەتەشدا ئەنجوومەن بەهەڵوەشاوەیی دادەنرێ تا کاتی پێکهێنانی ئەنجوومەنێکی تازەش بەردەوام دەبێ لە بەڕێوەبردنی کاروبارە ڕۆتینییەکان، ئەو ماوەیەش دەبێ لە ١٥ رۆژ تێپەڕ نەبێ.

ب- چاودێری ئیداری لەسەر چالاکییەکانی ئۆتۆنۆمیی:

زۆربەی ئەرک و کاروباری دەستەو دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی دەکەونە ژێر چاودێری دەسەڵاتی ناوەندی، بەڵام ئەو چاودێرییە دەبێ زیادەڕۆیی تیادا نەکرێ و لە مەبەست دەرنەچێ و نەبێتە تەنیا چەند کۆت و بەندێک لە ڕێگەی جێبەجێکردنی کاروباری دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی، بەڵکو دەکرێ ئەو چاودێرییە لە چوارچێوەی ڕازیبوون و لادان پیادە بکرێ.

**پەسەندکردن یا دانپیانان:**

ئاشکرایە کە سەربەخۆیی خودی دەستە هەرێمییەکان سەربەخۆییەکی دیاریکراوە بۆیە زۆر لە ئەرک و کارەکانی ئەو دامودەزگایانە دەبێ بەپێی ڕەزامەندی دەسەڵاتی ناوەندی بن، ئەو ڕێوشوێنەش دەرئەنجامێکە بۆ بنەمای یەکێتی یاسایی و سیاسی دەوڵەت، ئینجا بڕیار و ڕاسپاردەکانی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی نابێ پێچەوانەی ئەو بنەمایەبن و لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیش بگونجێن و نەبنە مایەی زەرەرمەندی بۆ یەکێتی نیشتمانی. لەو ڕوانگەیەشەوە دەبینین کە یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ی ناوچەی

کوردستان باسی له ڕێگەنەدان بەئەنجوومەنی تەشریعی ناوچە کردووە لەوەی ئەو بڕیارە تەشریعییانە دەربکات کە پەیوەندییان بەفەرمانگە نیمچە ڕەسمییەکان و دامودەزگاو بەرژەوەندییە خاوەن مۆرکە ناوخۆییەکانەوە هەیە تەنیا دوای ڕاوێژکردن نەبێ لەگەڵ لایەنە پەیوەندارەکان(٤٠)، هەروەها لە هەمان یاسادا هاتووە کە دەبێ بڕیارەکانی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی ڕاستەوخۆ لە دوای دەرچوونیان بەوەزیری دەوڵەت بۆ تەنسیقکردن ڕابگەیەنرێن، ئەو وەزیرەی کە نوێنەری دەسەڵاتی مەرکەزی بوو لە هەرێم بەر لەوەی ئەو پلەیە لابدرێت، دواتر ئەو ئەرکە بەوەزیری داد دەسپێردرێت(٤١). دەستووری ئیتالی ڕێگەی ڕازیبوون بەیاسا هەرێمییەکان بەنوێنەری دەسەڵاتی ناوەندی لە هەرێم دەدات کە بەCommisaire ناودەبرێ، لە کاتێکیشدا ئەگەر دەرکەوت کە یەکێک لەو یاسایانە پێچەوانەی بەرژەوەندی نیشتمانی یان بەرژەوەندی هەرێمەکانی ترە، ئەوکاتە بۆی هەیە بیگێڕێتەوە بۆ ئەنجوومەنی هەرێم بەمەبەستی چاو پێداخشاندنەوە.

ئەنجوومەنی هەرێمیش ئەگەر بەکۆی دەنگی ئەندامانی سوور بوو لەسەر بۆچوونی پێشووی خۆی، حکوومەتی ناوەندی مافی ئەوەی هەیە یاساکە ئاراستەی دادگای دەستووری یان پەرلەمانی ناوەندی بکات بۆ ئەوەی چاو بەمەشروعییەت و ئاستی گونجانی ئەو یاسایەدا بخشێنێتەوە، لە حاڵەتی بەرپابوونی ناکۆکیش دەربارەی ئەو لایەنەی کە تایبەتمەندە بەلێکۆڵینەوە لە شەرعیەتی یاسای هەرێمی، ئەو کاتە دادگای دەستووری تایبەتمەند دەبێ بەدیارکردنی لایەنی خاوەن دەسەڵات(٤٢).

**پووچەڵکردنەوە:**

ئەرکی چاودێریکردنی دەسەڵاتی ناوەندی لەسەر کاروباری دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی تەنیا بریتی نییە لە ڕازیبوون یان ڕەخنەگرتن لەو کارانە، بەڵکو هەندێک جار دەگاتە ئاستی لادان و ڕەتکردنەوەشیان، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر بۆ دەسەڵاتی ناوەندی دەرکەوت کە ئەو کارانە لە دەستوور و یاسا کارپێکراوەکان دەردەچن یان پێچەوانەی بەرژەوەندی باڵای دەوڵەتن و زەرەر بەبەرژەوەندی نیشتمانی و هەرێمەکانی دیکە دەگەیەنن. لەو بوارەدا سانسۆری دەسەڵاتی ناوەندی تەنیا تایبەت نییە بەدەرخستنی مەشروعییەت، واتە مافی حکوومەتی ناوەندی لەلادانی یاسا و بڕیارە هەرێمییەکان کە پێچەوانەی ئەو ڕێسایانە دەرکراون کە لە دەستووردا هاتوون، بەڵکو دەسەڵاتی ئەو سانسۆرە لەوەش تێپەڕ دەبێ و دەگاتە ئاستی سانسۆری گونجان (الملائمة)، بەمانای دانان بەدەسەڵاتی ناوەندی بەلادانی هەر یاسا و بڕیارێکی هەرێمیی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی بەبیانووی دژایەتیکردنی لەگەڵ

بەرژەوەندی نیشتمانی وڵات یان لەگەڵ بەرژەوەندی هەرێمەکانی تر[٤٣]، ئەو بەرژەوەندییەش چەمکێکی یاسایی دیاریکراو ناگرێتە خۆی بەڵکو مەبەستێکی سیاسی نەرمونیان و نارێکی بەدواوەیە کە ناتوانرێ پێشتر دیاربکرێ و تیایدا شوێنی ئەگەری زۆر دەبێتەوە، واتە ئەمە چەمکێکی مەترسیدارە و لە دەستی حکوومەتی ناوەندیدایە، بەتایبەتیش ئەگەر حکوومەت بەدنیازبێ بەرامبەر بەدامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی، ئەوکاتە بەبیانووی دژایەتی لەگەڵ بەرژەوەندی نیشتمانیدا دەتوانێ هەموو یاسا یان بڕیارێکی هەرێمی ڕەت بکاتەوە.

لە ماددەی ژمارە (١٤١)ی ساڵی ١٩٧٧ی دەستووری سۆڤیەتیدا هاتووە: «ئەنجوومەنی وەزیرانی کۆماری یەکگرتوو مافی وەستاندنی جێبەجێکردنی بڕیار و فەرمانەکانی ئەنجوومەنی وەزیرانی کۆمارە خاوەن ئۆتۆنۆمییەکانی هەیە، هەروەها مافی ڕەتکردنەوەی بڕیار و فەرمانەکانی لیژنە (تەنفیزییەکانی) (سوفیاتی) نوێنەرانی گەلی هەیە لەو هەرێم و کەرت و شارانەی کە ڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی کۆماری دان، بەهەمان شێوە دەتوانێ بڕیار و فەرمانەکانی لیژنە تەنفیزییەکانی (سوفیاتی) نوێنەرانی گەل لەو کەرتانەی کە خاوەنی ئۆتۆنۆمیین ڕەت بکاتەوە.

٤- چاودێری قەزایی:

بەر لەوەی ڕوو بکەینە بابەتی سانسۆری قەزا، دەبێ ئەوە ڕوون بکەینەوە کە بەشکردنی ئەرکەکان لەگەڵ هەرێمەکانی ئۆتۆنۆمییدا دەسەڵاتی قەزایی ناگرێتەوە، بەڵکو قەزا بەیەکگرتوویی دەمێنێتەوە و لە سایەی سیستەمەکانی ئۆتۆنۆمییشدا سەر بەحکوومەتی ناوەندی دەبێ.

چاودێری قەزایی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمییش شێوازی جۆراوجۆر وەردەگرن وەک چاودێری دادگا ئاسایی یان ئیدارییەکان لە ڕێگەی قەزای قەرەبووکردنەوە یاخود قەزای ڕەتکردنەوە یان چاوخشاندنەوە بەبڕیارەکانی دەستەکانی ئۆتۆنۆمیی لە لایەن دادگای دەستووری یان دەستەیەکی دادوەریی کە بەتایبەتی بۆ چاوخشاندنەوە بەبڕیارە ڕەتکراوەکانی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندیەوە پێکدەهێنرێ.

لە ئیتاڵیا ئەگەر لەبەردەم دادگایەکی دەستووریدا دان بەناشەرعییەتی یاسایەکی هەرێمیی دابنرێ و دادگاش هەمان بڕیاری دا ئەو کاتە یاسای ناوبراو لە مێژووی دەرچوونی حوکمەوە بەبەتاڵ دادەنرێ[٤٤].

هەندێک کەسیش وای بۆ دەچن کە لە یەکێتی سۆڤیەت داواکاری گشتی چاودێری قەزایی لەسەر دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی پیادە دەکات[٤٥].

بەڵام لە میانەی چاوخشاندنەوە بەلایەنەکانی چاودێری داواکاری گشتی، دەردەکەوێ کە سیماکانی چاودێری قەزایی ناگرێتە خۆی بەڵکو دەکرێ بەلایەنێک لە چاودێری دەسەڵاتی تەنفیزی دابنرێ چونکە ئاشکرایە کە ناوەڕۆکی چاودێری قەزایی خۆی لە دەرکردنی حوکمە قەزاییەکاندا دەنوێنێ لەسەر ئەو کێشەو سکاڵایانەی دەخرێنە بەردەم دادگاکان.، لەو ڕوانگەیەشەوە ناکرێ چاودێری داواکاری گشتی لە یەکێتی سۆڤیەت بخرێتە چوارچێوەی چاودێری قەزایی، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک لە نێوانیاندا: ئەندامانی داواکاری گشتی دادوەر نین هەروەها ئەو دەزگایە لە توانایدا نییە، بەڵکو ئەرکی دەرکردنی بڕیارە قەزاییەکان نییە. بەم جۆرە- بەبۆچوونی ئێمە- چاودێری داواکاری گشتی لە یەکێتی سۆڤیەت تەنیا بریتییە لە لایەنێک لە لایەنەکانی چاودێری ئیداری.

بەڵام لە عێراق چاودێری قەزایی بەسەر دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی لە لایەن دەستەیەکی قەزاییەوە ئەنجام دەدرێ، ئەو دەستەیە بەسەرۆکایەتی سەرۆکی دادگای تەمییز و ئەندامێتی چوار دادوەر پێکدەهێنرێ، هەر چوار ئەندامیش لە لایەن دادگای ناوبراوەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێن، ماوەی دیاریکراویش قابیلی درێژکردنەوە دەبێت. وەزیری دادیش کە شوێنی وەزیری دەوڵەتی بۆ تەنسیقکردن لەگەڵ دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی گرتۆتەوە، تایبەتمەند دەبێ بەڕەتکردنەوەی بڕیارەکانی ئەو دامودەزگایانە لە ماوەی ٣٠ ڕۆژ لە مێژووی گەیاندنیان بۆ بەردەمی دەستەی یاسایی ناوبراو لە کاتێکدا ئەگەر بۆی دەرکەوت ئەو بڕیارانە پێچەوانەی دەستوور و یاسا و ڕێساکانن[٤٦]، بۆ هەڵگرتنی حوکمی لادانی بڕیارەکەش دەبێ تا کاتی یەکلایی کردنەوەی مەسەلەکان کارکردن بەبڕیارە لادراوەکە بوەستێنرێ[٤٧]، ئەو دەستەیە دەبێ لە ماوەی ٣٠ ڕۆژ لە مێژووی پێشکەشکردنییەوە کار بۆ هەڵگرتنی حوکمی لادانی بڕیارەکە بکات[٤٨]، لە کاتێکدا ئەگەر دەستەی ئاماژەپێکراو حوکمی خۆی بەنامەشروعییەتی بڕیارەکە دا، ئەوە لەمێژووی دەرچوونی ئەو حوکمەوە دەبێ بڕیارەکە بەلادراوی دابنرێ و هەموو ئاسەوارە یاساییەکانیشی لادەدرێن، دەستەی قەزایی ناوبراویش لەسەریەتی ئەو بڕیارەی کە لەو بارەوە دەریکردووە بەو لایەنەی ڕابگەیەنێ کە داوای لادانی بڕیارەکەی کردبوو جگە لە سەرۆکی هەردوو ئەنجوومەنی تەشریعی و تەنفیزی، بڕیاری دەرکراوی دەستەی قەزایش کۆتایی و یەکلاکەرەوە دەبێت[٤٩].

٣ - چاودێری پەرلەمانی:

لە ڕابردوودا بینیمان کە چاودێری دەسەڵاتی ناوەندی لەسەر دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی فرە لایەنە و شێوازی جۆراوجۆریش دەگرێتە خۆی لەوانە: چاودێری پەرلەمانی ناوەندی لەسەر دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی، ئەگەرچیش ئەو چاودێرییە شێوازێکی دیاریکراوو جێگیر وەرناگرێ بەڵکو لە ناوەڕۆکدا لە دەوڵەتێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ.

دەستووری ئیتالیش ئەو جۆرە چاودێرییەی پیادە کردووە، ئەگەر دەسەڵاتی ناوەندی ڕەخنەی لە یاسایەکی هەرێمی گرت و لە بەرامبەریشدا ئەنجوومەنی هەرێم سووربوو لەسەر ئەو یاسایە، ئەوکاتە لایەنی ناوەندی مافی ئەوەی هەیە کە یاسا ڕەخنەدارەکە ئاراستەی پەرلەمانی ناوەندی بکات، ئەگەر پێی وابوو ئەو یاسایە پێچەوانەی بەرژەوەندی گشتی وڵات یان هەرێمەکانی دیکەیە، بەمەبەستی چاوخشاندنەوە بەئاستی گونجانی ئەو بڕیارە لەگەڵ ئەو بەرژەوەندییانەدا[٥٠] لە یەکێتی سۆڤیەتیشدا (سوفیاتی) باڵا کە پەرلەمانی ئیتیحادییە خاوەنی دەسەڵاتی بەرفراوانە و شێوازی هەمەجۆری چاودێرییش پیادە دەکات، لایەنەکانی ئەو چاودێرییەش کە دەستووری ساڵی ١٩٧٧ی سۆڤیەتی باسی لێوە دەکات ئەمەیە:

«هەموو دامودەزگا و فەرمانگەکانی دەوڵەت و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان و ئیدارییەکان لەسەریانە داواکاری لیژنەکانی (سوفیاتی) باڵا لە یەکێتی سۆڤیەت و لیژنەکانی هەردوو ئەنجوومەنەکەی جێبەجێ بکەن و مادده و بەڵگەنامەی پێویستیشیان پێشکەش بکەن.

ڕاسپاردەکانی ئەو لیژنانەش دەبێ لە لایەن دامودەزگاکانی دەوڵەت و دەستە کۆمەڵایەتییەکان و فەرمانگە و ڕێکخراوەکانەوە ببنە مایەی لێکۆڵینەوەی بەزۆر و لە ماددەی دیاریکراویشدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان یان ئەو ڕێوشوێنانەی کە گیراونەتەبەر بەلیژنەکان ڕابگەیەنرێن»[٥١]، هەروەها لە هەمان دەستووردا هاتووە: «سوفیاتی باڵا لە یەکێتی سۆڤیەت چاودێری دەخاتە سەر چالاکی هەموو دامودەزگاکانی دەوڵەت، ئەوانەی کە لە بەردەمیدا بەرپرسن»[٥٢].

لە عێراقیش هەندێک شێوازی چاودێری پەرلەمانی لەسەر دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی بەدی دەکەین، یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ی ناوچەی کوردستان باسی لەوە کردووە کە ئەنجوومەنی تەشریعی ناوچەی کوردستان ڕەزامەندی خۆی سەبارەت

بەبودجە ئاسايييەكانى ناوچە ڕابگەيەنێ پاشان بەمەبەستى بڕياردان لەسەرى، بۆ دەسەلاتى تەشريعى ناوەندى (ئەنجوومەنى نيشتمانى) بەرزى بكاتەوە[٥٣]، بەم جۆرەش ئەنجوومەنى نيشتمانى عێراقى پيادەى بڕێک چاودێرى لەسەر دامودەزگاكانى ئۆتۆنۆميى دەكات لە ڕێگەى پێداچوونەوە بەبودجەى ناوچەو حيساباتەكانى، بڕياردان لەسەرى.

## پەراوێزەكانى ئاخافتنى دووەم:

(١) بڕوانە ل ٣٣٣ى ئەو تێزە.

(٢) اصلاح النظام القانوني وحركة التغيير الثوري- سەرچاوەى پێشوو- ل ٧٥.

(٣) دكتۆر مونزير ئەلشاوى- سەرچاوەى پێشوو- ل ٢٢٤- ٢٢٥ پەراوێز.

(٤) دكتۆر ئيسماعيل ئەلغەزال- القانون الدستوري والنظم السياسية- دەزگاى الجامعية بۆ لێكۆڵينەوە و بلاوكردنەوە- بەيروت- لوبنان- چاپى يەكەم ١٩٨٢- ل ٩٦.

(٥) دكتۆر سەعد عەلوش- لمحات من تجربة الحكم الذاتي في العراق- لێكۆڵينەوەيەكە لە گۆڤارى الحقوقي العربي دا بلاوكراوەتەوە- ساڵى يەكەم- ژمارەيەكى كانوونى دووەمى ١٩٧٦- ل ٥٠.

(٦) دكتۆر محەمەد هەمەوەندى- الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الأدارية والسياسية- سەرچاوەى پێشوو- ل ٩٤- ٩٥.

(٧) لە: دكتۆر ئيسماعيل ئەلغەزال- سەرچاوەى پێشوو- ل ٩٦ وەرگيراوە.

(٨) لە: دكتۆر محەمەد هەمەوەندى- الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الأدارية والسياسية- سەرچاوەى پێشوو- ل ٩٦ وەرگيراوە.

(٩) بڕوانە بڕيارى ژمارە ٢٤٧ى ١٩٧٤/٣/١١ى ئەنجوومەنى سەركردايەتى شۆڕش.

(١٠) لە: دكتۆر محەمەد هەمەوەندى: الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الادارية والسياسية- سەرچاوەى پێشوو- ل ٩٢ وەرگيراوە.

(١١) سەرچاوەى پێشوو ل ٩٥.

(١٢) ماددەى (٨٤) لە دەستوورى يەكێتى كۆمارە سۆشياليستييەكانى سۆڤيەتى ساڵى ١٩٧٧.

(١٣) دكتۆر مونزير ئەلشاوى ئاماژەى بۆ كردووە- سەرچاوەى پێشوو- ل ٢٢٦.

(١٤) دكتۆر خاليد قەبانى ئاماژەى بۆ كردووە- سەرچاوەى پێشوو- ل ١٧١.

(١٥) دكتۆر مونزير ئەلشاوى ئاماژەى بۆ كردووە- سەرچاوەى پێشوو- ل ٢٢٦ پەراوێز.

(١٦) دكتۆر خاليد قەبانى ئاماژەى بۆ كردووە- سەرچاوەى پێشوو- ل ١٩١.

(١٧) ماددەى ١٢، بڕگەى ب لە ياساى ئۆتۆنۆميى ناوچەى كوردستانى ژمارە ٣٣ى ساڵى ١٩٧٤.

(١٨) ماددەى ١٢، بڕگەى د لە ياساى ئۆتۆنۆميى ناوچەى كوردستانى ژمارە ٣٣ى ساڵى ١٩٧٤.

(١٩) دكتۆر محەمەد هەمەوەندى ئاماژەى بۆ كردووە- الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الأدارية والسياسية- سەرچاوەى پێشوو- ل ١٠٥.

(٢٠) دكتۆر سەفاء حافز- حول مفهوم الحكم الذاتي وتطبيقاته في العراق- لێكۆڵینەوەیەكە لە گۆڤاری الثقافة الجدیدة دا بلاوكراوەتەوە- ژمارە ١٥- تەمموزی ١٩٧٠، ل ٥١.

(٢١) دكتۆر مونزیر ئەلشاوی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢٦.

(٢٢) ماددەی دەیەم- ئینتیقالی- دەكرێ بەبێ هەڵبژاردن ئەندامانی ئەنجوومەنی تەشریعی یەكەم دەستنیشان بكرێن.

(٢٣) دكتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحكم الذاتي والنظم اللامركزیة الأداریة والسیاسیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٢

(٢٤) دكتۆر مونزیر ئەلشاوی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢٦.

(٢٥) ماددەی ١٣، هەردوو بڕگەی أ، ب لە یاسای ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ی ئۆتۆنۆمیی بۆ ناوچەی كوردستان.

(٢٦) ماددەی ١٣، بڕگەی ج لە یاسای ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ی ئۆتۆنۆمیی بۆ ناوچەی كوردستان.

(٢٧) ماددەی ١٣، بڕگەی ج لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤.

(٢٨) ماددەی ١٥ لە یاسای ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ی ئۆتۆنۆمیی بۆ ناوچەی كوردستان.

(٢٩) ماددەی ٥، بڕگەی د لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوبراو.

(٣٠) دكتۆر خالید قەبانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٩١.

(٣١) ماددەی ١٢، بڕگەی (و) لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی كوردستان.

(٣٢) دكتۆر خالید قەبانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٧٢

(٣٣) ماددەی (٧٣)، بڕگەی ٦ لە دەستووری یەكێتی كۆمارە سۆشیالیستییەكانی سۆڤییەتی ساڵی ١٩٧٧.

(٣٤) بەهەمان مانا بڕوانە: دكتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحكم الذاتي والنظم اللامركزیة الأداریة والسیاسیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٢٠- ١٢١.

(٣٥) ماددەی(١٣) بڕگەی ج لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی كوردستان.

(٣٦) ماددەی ١٦ لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی كوردستان.

(٣٧) دكتۆر مونزیر ئەلشاوی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢٧.

(٣٨) بەپێی بڕیاری ئەنجوومەنی سەركردایەتی شۆڕش ژمارە (١٧٥٠)ی ١٩٧٩/١٢/١٧ پلەی وەزیری دەوڵەت بۆ تەنسیق كردن لادرا و هەندێك لەو ئەركانە بەوەزیری داد سپێردران.

(٣٩) دكتۆر مونزیر ئەلشاوی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢٧.

(٤٠) ماددەی ١٢، بڕگەی (د) لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی كوردستان.

(٤١) بڕیاری ئەنجوومەنی سەركردایەتی شۆڕش ژمارە(١٧٥٠)ی ١٩٧٩/١٢/١٧.

(٤٢) دكتۆر مونزیر ئەلشاوی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢٧.

(٤٣) ماددەی ژمارە ١١٧ی ساڵی ١٩٤٨ لە دەستووری ئیتالی.

(٤٤) دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحكم الذاتي و النظم اللامركزية الادارية والسياسية- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٣٣.

(٤٥) سەبارەت بەو بۆچوونە بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٧.

(٤٦) ماددەی ١٩، بڕگەی (ب)ی هەموارکراو لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان.

(٤٧) ماددەی ١٩، بڕگەی (ج) لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان.

(٤٨) ماددەی ١٩، بڕگەی (د) لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان.

(٤٩) ماددەی ١٩، بڕگەی (و) لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان.

(٥٠) دکتۆر مونزیر ئەلشاوی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢٧.

(٥١) ماددەی ژمارە (١٢٥)ی ساڵی ١٩٧٧ لە دەستووری یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییەکانی سۆڤیەتی.

(٥٢) ماددەی ژمارە (١٢٦)ی ساڵی ١٩٧٧ لە دەستووری یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤیەتی.

(٥٣) ماددەی ژمارە ١٢، بڕگەی (و) لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان.

## ئاخافتنی سێیەم

# هەڵسەنگاندنی ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی ئۆتۆنۆمیی

ئاشکرایە کە زۆر دەوڵەت هەن لە ڕووی دانیشتوانیانەوە لە کۆمەڵگای نەگونجاو پێکدێن، وەک چۆن لەمەوبەر ڕوونمان کردەوە، بەمانای پێکەوەژیانی چەند نەتەوە یان ئایین و زمان و کلتووری جیاواز لە ناو ئەو دەوڵەتانە، لەوانەشە هەندێک لەو نەتەوە و گرووپە ئەتنیکییە جۆراوجۆرانە بارودۆخیان لە لایەنی تری ناو دەوڵەت باشتر بێ، چ لە ئەنجامی چڕوپڕی گەورەی دانیشتوانەوە بێ یان بەهێزیی ئابووری و کۆنترۆڵکردنی پلەو پایەکانی دەسەڵات، هەر ئەمەش هەستی مافخوراوی و زوڵم و ستەم لە لایەن نەتەوە و گرووپەکانی دیکە دەورووژێنێ و لە ئەنجامدا ئەو بزووتنەوە سیاسییانەی کە نوێنەرایەتییان دەکەن دروشمی ئۆتۆنۆمیی وەکو سیستەمێکی گونجاو بۆ هێنانەدی ویست و خواستەکانیان بەرزدەکەنەوە، لەو ڕووەشەوە دەبینین پارتی دیموکراتی کوردستان کە بۆ ماوەی زیاتر لە پەنجا ساڵ دەبێ نوێنەرایەتی بزووتنەوەی نەتەوەی کورد دەکات، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ دروشمی دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمیی بۆ کوردستانی بەرزکردبووەوە.

ئەو دەوڵەتانەش کە تیایاندا ئەو تایبەتمەندییە هەمەجۆرانە پێکەوە دەژین و لە پێناوی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی گونجاو بۆ ئیشکالیەتی نەگونجان، تیایاندا، هەندێکیان پەنایان بردە بەر ئۆتۆنۆمیی وەک یەکێک لەو چارەسەرییانەی کە لەوانەیە ببێتە مایەی هێنانەدی گونجانی دانیشتوان. یەکێتی سۆڤیەت- کە لە ئەنجامی شۆڕشی بەلشەڤی لە ساڵی ١٩١٧ و دوای بەدوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی قەیسەری پێکهاتوو لە چەندین نەتەوە و گرووپی ئەتنیکی، دامەزرێنرا- لە نێوان یەکەمین ئەو دەوڵەتانەدایە کە ئەو سیستەمەیان پیادە کردووە و لە دەستووری یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا کاری پێکردووە.

ئەو وەختە لەو وڵاتەدا (٢٠) کۆمار و (٨) کەرت و چەند فەرمانگەیەکی خاوەن ئۆتۆنۆمیی هەبوون[١]. ئیسپانیاش سەبارەت بەهەرێمی کاتالۆنیا سیستەمی ناوچە سیاسییەکانی پیادە کردووە- کە یەکێکە لە جۆرەکانی ئۆتۆنۆمیی- و لە دەستووری ساڵی ١٩٣١دا بڕیاری لەسەر داوە و تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٣٩ لەسەر دەستی ژەنەڕاڵ فرانکۆ لادراوە، ئیسپانیا بەردەوام بووە لەسەر پیادەکردنی ئەو سیستەمە، پاشانیش هەمان سیستەم لە ساڵی ١٩٧٨ بۆ هەرێمی باسک گێڕدرایەوە.

ئیتالیاش بەپێی ماددەی ژمارە ١١٦ی دەستووری خۆی و لە ساڵی (١٩٤٨)ەوە سیستمی ناوچە سیاسییەکانی بۆ پێنج لە هەرێمەکانی پیادە کردووە ئەوانیش:

سقلیە Sicile و سەردینیا Sardaigne و ترانتین هوت ئاج Trantin Haut Adigeو ئەوست Valleed, Aoste و فریولی فینتی جولینی Friol Venetie Ju-liene. بەلجیکاش بەهەمان شێوە و بەپێی دەستووری ساڵی ١٩٧٠ سسیستمی ناوچە سیاسی و زمانەوانی و کلتوورییەکانی پیادە کردووە و سێ ناوچەی سیاسیشی هێناونەتە کایەوە کە: ئەلواللون Wallone و فلامند Flamande و برۆکسل Bruxelloise، هەروەها دەستووری ناوبراو سێ ناوچەی زمانەوانیشی بۆ زمانەکانی فەرەنسی و نزرلەندی و ئەڵمانی دیارکردووە، ئەمە سەرەڕای ناوچەیەکی زمانەوانی دوولایەن بۆ پایتەخت، جگەلەوە سێ تایەفەی کلتووریشی بۆ کلتوورەکانی فەرەنسی و نزرلەندی و ئەڵمانی دروست کرد. وەک چۆن لە ڕابردوودا بینیمان، عێراقیش بەپێی یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ی ناوچەی کوردستان سیستمی ئۆتۆنۆمیی پیادەکردووە، هەروەها سودانیش چووە ریزی ئەو دەوڵەتانەی کە ئەو سیستمەیان پەیرەو کردووە بەپێی یاسای ئۆتۆنۆمیی هەرێمی ساڵی ١٩٧٣ بۆ باشووری سودان.

**یەکەم: هەڵسەنگاندنی ئەزموونەکانی ئۆتۆنۆمیی لە دەرەوەی عێراق:**

ئەگەر لەسەرخۆ و وردبینانە بڕوانینە ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی ئۆتۆنۆمیی، دەبینین ئەو سیستمە نەگەیشتووەتە ئاستی ئەو هیواو ئومێدانەی کە پێیەوە بەستراون لە هێنانەدی ویست و خواستی نەتەوە و تایبەتمەندییە جیاوازەکان.

دەکرێ بوترێ کە ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی لە یەکێتی سۆڤیەت تەنیا بریتی بوو لە بەخشینی هەندێک مافی کلتووری و زمانەوانی بەو نەتەوە جیاوازانەی[2] کە ئەو وڵاتە دەیانگرێتە خۆی ژمارەیان لە سەرووی سەد نەتەوە دەبێ[3].

ئەمەو ئەو ئەزموونە بەخشینی تایبەتمەندی تەشریعی، سەربەخۆیی دارایی پێویستی بۆ دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی نەگرتە خۆی، هەروەها دانیش بەسەروەری کۆمارە خاوەن ئۆتۆنۆمییەکان دانەنرا- بەپێچەوانەی کۆمارە یەکگرتووەکان- بەڵکو دەسەڵاتی ئیتیحادی لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا هەندێک هەرێمی وەک: کۆمارە ئەڵمانییەکان لە ڤۆڵگاو چیچان ئەنگۆش و کلمۆش لادان[4].

جگە لەوە کەرتە خاوەن ئۆتۆنۆمییەکان خاوەنی هیچ نین تەنیا سیستمێکی ئیداری تایبەت نەبێ کە چەند تایبەتمەندییەکی تەشریعی سەبارەت بەبارودۆخە مافپەروەرییەکانیان دەگرێتە خۆی و لەسەر پێشنیازی (سوفیاتی) نوێنەرانی گەل[٥] لە لایەن ئەنجوومەنی (سوفیاتی) بالآ لە کۆماری یەکگرتوو دەردەچێ، فەرمانگە و ناوچە نەتەوەییەکانیش بەیەکەی ئیداری ئاسایی دادەنرێن و بەتەنیا دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە کە لە نێو هاولاتیاندا کارمەندانی ئەو ناوچانە هەڵبژێرن[٦].

بۆیە لەگەڵ ئەوانە[٧] رێک ناکەوین کە دەڵێن سیستمی ئۆتۆنۆمیی پەیرەوکراو لە یەکێتی سۆڤییەت سەرکەوتوو بووە، ئەگەرچی ئەوانە دووپاتی دەکەنەوە کە ئەو سەرکەوتنە بۆ خودی سیستمی ئۆتۆنۆمیی ناگەرێتەوە[٨].

دەکرێ بوترێ ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی، بگرە سیستمی فیدرالیش لە یەکێتی سۆڤییەت هەر لە سەرەتای پیادەکردنییەوە شێواو بووە، هەر بۆیەش لە کۆتاییدا شکستی هێنا، چونکە ئەو دروشمە سەرنج راکێشانەی کە شۆرشی بەلشەڤی لە سەرەتادا بلاوی کردنەوە و ئەو چوارچێوانەش (لە نێوانیاندا ئۆتۆنۆمیی و یەکێتی فیدرالی) کە دروستی کردن تەنیا شێواز و تاکتیکێکی قۆناغی بوو لە پێناوی پتەوکردن و پشتگیری کردن لە هەڵوێستی حزبی شیوعی لە کۆنترۆڵکردنی دەسەلاتی سیاسی، دواتر دەرکەوت ئەو شێواز و چوارچێوانەی سیستمی حوکم دەیانگرێتە خۆی بەقەد هەژموون و کۆنترۆلی فیکر و فەلسەفەی مارکسی- لینینی بەسەر تەواوی یەکێتی سۆڤییەت بۆ ئەو حزبە گرنگ و بایەخدار نەبووە، بەڵکو زێدەرۆیی نییە ئەگەر بوترێت حزبی ناوبراو شێوازە دەستوورییەکانی وەک فیدرالی و ئۆتۆنۆمیی بەمەبەستی پتەوکردنی هەڵوێست و سەپاندنی هەژموونی تاک لایەنەنانەی خۆی بەسەر دەسەلات قۆزتوونەتەوە و بەکاری هێناون، بەتایبەتیش چونکە ئەو حزبە وەکو رێوشوێنی ئینتیقالی دەیروانییە ئەو چوارچێوە و شێوازانە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا پێچەوانەی ناوەرۆکی فەلسەفەی مارکسی- لینینی نییە و لە کاتی گواستنەوە بۆ سیستمی شیوعیی چاوەروانکراودا وەلاوە دەنرێن. مارکسییەت دەوڵەت بەچوارچێوەیەکی مێژوویی دەزانێ کە تەنیا لەگەڵ هەندێک قۆناغی پێشکەوتنی کۆمەلایەتیدا دەگونجێ[٩]. بەپێی ئەو تیۆرەش دەوڵەت بەرهەمی کۆمەڵگایە لە یەکێک لە قۆناغەکانی پێشکەوتنیدا[١٠]

هزری مارکسی لە خاڵێکەوە سەردەگرێ ئەویش ئەوەیە ناوەرۆکی دەوڵەت لە کۆمەڵگای چینایەتی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەندامانیدا بەپێی سیستمی ئابووری و سیاسی ئەو

کۆمەڵگایە دیاردەکرێ[١١]، کاتێکیش پرسیار لە پیاوانی یاساناسی سۆڤییەت دەکرا دەربارەی ئاستی مانەوەی دەوڵەت و سەرهەڵدانی سیستمی کۆمەڵایەتی دیکە بەجۆرێک کە شوێنی دەوڵەت بگرنەوە، ئەوان بەوە وەڵامیان دەدایەوە کە مارکسییەت دەوڵەت بەسیستمێکی بەردەوام و هەمیشەیی نازانێت، بگرە- بەڕای ئەوان- دەوڵەت لە ئەنجامی دابەشبوونی کۆمەڵگا بۆ چەند چین و توێژێک سەری هەڵداوە و هەرکاتێکیش ئەو دابەشبوونە چینایەتییە نەمێنێ دەوڵەتیش دیار نامێنێ و ون دەبێ[١٢]، بەڵام بەر لەوەی ئەو پێشبینییانەی سەبارەت بەنەمانی دەوڵەت بێنە دی، مارکسییەت ڕووی لەبەر تەسک بوونەوە کرد. کاتێکیش حزبی شیوعی هەژموونی خۆی بەسەر دەسەڵاتی سیاسیدا سەپاند، دەوڵەتی سۆڤییەتی بەتایبەتی لەسەردەمی ستالین وەرچەرخا بۆ سیستمێکی پشت بەستوو بەمەرکەزییەتێکی توند، بەجۆرێک بووە هۆی کپکردنەوەی نەتەوەکان و ڕێگەگرتن لە دەربڕینی ویست و خواستەکانیان، بەتایبەتی لە کاتێکدا ئەگەر ئەمە پێچەوانەی سیاسەتی گشتی حکوومەتی ئیتیحادی و حزبی شیوعی سۆڤییەت بوایە[١٣]، جگە لەوە دەستووری ئیتیحادی هیچ پارێزگارییەک بۆ سنوورەکانی کەرت و فەرمانگە نەتەوەییە خاوەن ئۆتۆنۆمییەکان ناگرێتە خۆی، لەوەش بەولاوە مافی کۆمارە یەکگرتووەکان لە جیابوونەوە لە یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییەکانی سۆڤییەتی تەنیا مەسەلەیەکی تیۆری بووە و ڕێگەی جیابوونەوە لە یەکێتی سۆڤییەت بەهیچ یەکێک لەو کۆمارانە نەدراوە. هەندێک کەس[١٤] وای بۆ دەچن کە ئەگەرچی دەستووری سۆڤییەتی مافی جیابوونەوەی ئازادانەی کۆمارە یەکگرتووەکانی لە یەکێتی سۆڤییەت زامن کردووە بەڵام ئەو شتەی کە زۆر واقیعیانەیە لە دەربڕین لەو مافە، سروودی نیشتمانیی سۆڤییەتییە کە ئەو یەکێتییە بەوە وەسف دەکات کە قابیلی جیابوونەوەی کۆمارە ئازادەکان نییە- Unbreak able union of free republics.

لە ڕووی داراییشەوە ئەو دەوڵەتە ئیتیحادییە سیاسەتی مەرکەزییەتێکی توندی گرتەبەر، تەنانەت کۆمارە یەکگرتووەکانیش هیچ سەربەخۆییەکی داراییان نەبوو، چونکە دەستووری سۆڤییەتی دانانی بودجەیەکی یەکگرتوو بۆ یەکێتی سۆڤییەت و بڕیار لەسەردان و وەرگرتنی ڕەزامەندی لەسەر ڕاپۆرتی تایبەتی بەجێبەجێکردنی و بەڕێوەبردنی سیستمی نەقدی و قەردی یەکگرتوو و بڕیاردان لەسەر باج و داهاتە تەرخانکراوەکان بۆ پێکهێنانی بودجەی یەکێتی سۆڤییەت و دەستنیشانکردنی سیاسەتی گشتی لە مەیدانی کرێیەکانی بەدامودەزگاکانی ئیتیحاد سپاردبوو[١٥]، بۆیە پێمان وایە کە ئەو سیاسەتەی پشتی

بەمەرکەزییەتی توند لە دەسەلات بەستبوو و نەبەخشینی هیچ دەسەلاتێکی بنەڕەتی بەکۆمار و هەرێمەکان پاڵی بەهەندێک کەسەوە نا[١٦] ئەوە ڕەت بکەنەوە کە یەکێتی سۆڤییەت سیستمێکی فیدراڵی بێت، سەرەڕای ئەوەی دەستوورەکەشی ڕاشکاوانە دان بەمەدا دەنێت[١٧].

دوابەدوای تەواوبوونی ئەو قۆناغە و هەڵهاتنی ئاسۆی قۆناغێکی تازە بەگەیشتنی میخائیل گۆرباچۆف بۆ دەسەلات و دەستپێکردنی پرۆسەی دووبارە بوونیادنانەوە (بیرسترۆیکا)[١٨] لە بەهاری ساڵی ١٩٨٥، کێشە و گرفتەکانی قۆناغی پێشوو دەستیان بەئاشکرابوون کرد، میخائیل گۆرباچۆڤی سەرکردەی سۆڤیەتی دەڵێت:

بیرسترۆیکا پاڵی بەکۆمەڵێک کێشەو شتی دژ بەیەکەوە نا لە بواری پەیوەندی نێوان نەتەوەکان کە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئاشکرا بێن و دەربکەون، ئەو کێشانە پەیدابوونی ئەمڕۆنین، بەڵکو لە دایکبووی ئەو کاتەن کە بنەمای نەتەوەیی وەلاوە دەنرا، کاتێکیش ڕەسمییانە ڕاگەیەنرا کە مەسەلەی نەتەوەیی چارەسەرکراوە، ئەو کێشانە گەیشتنە لووتکەی پێکدادان و پەرەسەندنیان، هەر ئەوکاتە دوورنەبوو تەواوی چەند میللەتێک بەهۆی تاوانێکەوە سزا بدرێن کە ئەوان ئەنجامیان نەدابوو[١٩].

ڕووداوەکانی کەرتی ناکۆرنۆ کاراباخیش دەریان خست کە مەسەلەی نەتەوەکان بەتەواوەتی و لە بنەڕەتەوە چارەسەر نەکراون، ئەوەبوو دانیشتووانی ئەو کەرتە کە ئەرمەنن- داوای ئەوەیان کرد کە لە کۆماری ئازەربایجانی فیدراڵی جیابینەوە و بچنە باوەشی کۆماری ئەرمینیا، ئەو داواکارییەش لە بڕیارێکی پەرلەمانی کاراباخدا هات بەڵام بڕیارەکە لە لایەن دەستەی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی باڵای سۆڤییەتەوە ڕەت کرایەوە، کارێکی لەو جۆرەش بووە مایەی زیادکردنی بێ ئومێدی لە نێوان دانیشتوانی ئەو کەرتە. هەروەها ڕووداوەکانی کۆماری چیچان کە لەم ساڵانەی دواییدا ڕوویان دا بەڵگەی ئاشکران بۆ ئاستی ئەو ناڕەزایی و هەستکردن بەنەبوون و نایەکسانییەی زۆر لە نەتەوەکان بەدەستییەوە دەناڵێن، کاتێکیش دانیشتوانی ئەو کۆمارە داوای جیابوونەوەیان لە یەکێتی ڕووسیا کرد، دەسەلاتی یەکێتی ڕووسی ئەوەیان بەتاوانێکی گەورە دانا، ئەمەش بووە هۆی بەرپابوونی ڕووداوی خوێناوی گەورە و تیایاندا دەیان هەزار کەس لە ڕۆڵە بێ تاوانەکانی ئەو گەلە بوونە قوربانی و گرۆزنی پایتەختیش بوو بەپاشماوە، نەوەک لە ئەنجامی تاوانێکدا کە خەڵکەکەی ئەنجامیان دابێ، بەڵکو لەبەرئەوەی داوای جیابوونەوە لە یەکێتی ڕووسی دەکەن، ئەوکارەی کە دەستووری یەکێتی سۆڤییەت بەئاشکرا ڕێگەی

پێداوە، سەرەڕای ئەوەش کە حاڵی حازر ڕووداوەکانی توندوتیژی وەستاون بەڵام ئەو مەسەلەیە هێشتا لە نێوان بینەو بگرە دایە لە هەمبەر هەردوو لایەنی کێشەکە، لە کاتێکدا کۆماری چیچان سوورە لەسەر دەستەبەرکردنی سەربەخۆیی، لایەنی ڕووسی ئەمە ڕەت دەکاتەوە و کێشەکەش تا ئێستا چاوەڕێی چارەسەرکردن دەکات.

ئەگەر چاوێکیش بەئەزموونەکانی ولاتانی تری ئۆتۆنۆمییدا بخشێنین، دەبینین ئیسپانیا بەپێی دەستووری ساڵی ١٩٣١ ئۆتۆنۆمیی بەهەرێمی کاتالۆنیا بەخشیوە، بەڵام دواتر لەسەردەمی ژەنەڕاڵ فرانکۆ لە ساڵی ١٩٣٩ لەمە پەشیمان بۆتەوە و گەڕاوەتەوە بۆ سەر پیادەکردنی سیاسەتی مەرکەزییەتی توند، پاشان لە ساڵی ١٩٧٨ و لە دوای نەمانی دەسەڵاتی فرانکۆ، ئەو سیستمە جارێکی دیکە سەبارەت بەهەرێمی باسک پیادەکرایەوە، بەڵام ئەمە نەبووە مایەی وەستانی توندوتیژی لەو هەرێمەدا، بەواتای بێ سوودی ئەو هەنگاوە و پیادەنەکردنی بەو جۆرەی کە ویست و خواستی پێ هەڵپەسێردرابوو.

ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی لە هەرێمی باشووری سودانیش بەهەمان شێوە شکستی هێنا چونکە نەیتوانی ببێتە مایەی وەستاندنی ئاڵۆزییەکان و چارەسەرکردنی ئیشکالیەتی ناتەواوی، بگرە بەپێچەوانەوە کردەوەکانی توندوتیژی درێژەیان کێشاو تا ڕۆژی ئەمرۆشمان بەردەوامن، ئەمەش بووە هۆی گەورەبوونی کێشەکە تا ئاستێک خەریکە دەبێتە مەترسی بۆ سەر قەوارەی سودان.

لەگەڵ دید و گوتەی هەندێک کەسیشدا(٢٠) ڕێک دەکەوین سەبارەت بەوەی ئەزموونی ئەو دەوڵەتانەی کە لە پێناوی چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوەییدا ئۆتۆنۆمییان پیادەکردووە، ئیفلیجی و شکستهێنانی ئەو سیستمەیان دەرخستووە. دەکرێ هۆکارەکانی چەقین و سەرنەکەوتنی ئەزموونە بەراوردکارییەکانی ئۆتۆنۆمییش بۆ ئەوەی خوارە بگێڕینەوە:

١- سیستمی ئۆتۆنۆمیی لە پێناوی چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوە یان گرووپە ئایینی و زمانەوانی و کلتوورییەکان داهێنراوە، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە سیستمێک بۆ دەسەڵات و بەڕێوەبردن بەمەبەستی جێبەجێکردنی خواستە سیاسییەکانی ئەو گرووپە ئەتنیکییە هەمەجۆرانە، بەڵام لەمەیدانی پراکتیکیدا نەگەیشتۆتە ئاستی پێویست بگرە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دابەزیوە بۆ ئاستی لامەرکەزی ئیداری تەقلیدی لەگەڵ هەندێک بەخششی کەم، هەر ئەمەش وای کرد کە شکست بهێنێ، چونکە جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان سیستمی ئۆتۆنۆمیی و سیستمی لامەرکەزی ئیداری

هەرێمیدا هەیە لە ڕووی حیکمەت و ئەو هیواو ئاوات و ئومێدانەی کە پێیانەوە دەبەسترێتەوە.

٢- لە ئەزموونە بەراوردکراوەکانی ئۆتۆنۆمییدا دەردەکەوێ کە هەندێک دەوڵەت لە ژێر فشار و کاریگەری ئاڵۆزییە ناوخۆییەکان و ڕکابەرییە چەکدارییەکاندا ئۆتۆنۆمییان پیادەکردووە، بەبێ ئەوەی ئەو دەوڵەتانە قەناعەتی تەواویان هەبووبێ بەوەی کە ئەو سیستمە شێوازێکە بۆ پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە لە نێوان گرووپە ئەتنیکییە جیاوازەکاندا، بەواتایەکی دیکە، ئەوان وەکو شتێکی حازر و ئامادەکراو هەوڵی هێنان و پیادەکردنیان داوە، بەبێ بوونی مەرجە بابەتییە پێویستەکان بۆ جێبەجێکردنی، وەکو مەرجی شارستانی و بوونی سیستمی دیموکراسی، چونکە ئاشکرایە کە بەخشین و پیادەکردنی ئۆتۆنۆمیی لە لایەن بەشێک لە دانیشتوانی دەوڵەت خۆی لە خۆیدا حاڵەتێکی پێشکەوتووە لە پیادەکردنی دیموکراسیدا، ئەمەش پێویستی بەبوونی کەشوهەوای لەبار هەیە بۆ پیادەکردنی. لەو ڕوانگەیەشەوە پیادەکردنی ئۆتۆنۆمیی لە لایەن دەوڵەتێکەوە کە ئەو مەرجانەی تێدا نەبێ وەکو تەوژمێکی وەرزی وایە و لەکاتی بەریەک کەوتندا لەگەڵ بارودۆخە بابەتییە ناگونجاوەکاندا بەپەلە لە ناو دەچێ و گەرموگوڕی نامێنێ.

٣- سەرەڕای دامەزراندنی سیستمی ئۆتۆنۆمیی و پێکهێنانی دامودەزگا جۆراوجۆرەکانی وەک ئەنجوومەنە تەشریعی و تەنفیزییەکان بەڵام حکوومەتە ناوەندییە هەمەجۆرەکان لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەسەڵاتی داڕشتن و هەموارکردنی هەموو ئەوەی کە پەیوەندی بەو ناوچانەوە هەیە لە ژێر دەستی خۆیاندا دەهێڵنەوە، بگرە زۆرجار ئەو حکوومەتانە لە یەک کاتدا ڕۆڵی لایەنی ناکۆک و دادوەر دەبینن بەهۆی نەبوونی لایەنێکی میانگیری وەک دادگای دەستووری کە لەوانەیە بێ لایەنانە و وەکو پێویست بتوانێ ئەو کێشەو ناکۆکییانە یەکلا بکاتەوە کە لە نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمییدا سەرهەڵدەدەن و بەرپادەبن، ئەمە جگە لە دان نەنان بەهەندێک دەسەڵاتی دیاریکراو بۆ دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی بەجۆرێک بتوانێ بەبێ دەستێوەردانی دەسەڵاتی ناوەندی جێبەجێیان بکات.

هەموو ئەمەش بووە مایەی شکستهێنانی سیستمی ئۆتۆنۆمیی لە هێنانەدی ئەو هیواو ئومێد و ئامانجانە کە پێیەوە بەسترابووەوە لە زۆربەی ئەو دەوڵەتانەی تیایاندا ئەو سیستمە پیادە کراوە.

**دووەم: هەڵسەنگاندنی ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی کوردستانی عێراق:**

ئەو ئۆتۆنۆمییەی کە بەپێی یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ بۆ ناوچەی کوردستان لە عێراق پیادەکرا هیچ سەرکەوتنێکی وەدی نەهێنا چونکە ئەو خاڵە سەرەکییانەی تێدا نەبوو کە کورد هەوڵیان بۆ دەدا، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی شکست بێنێ، بەڵام سەرەڕای ئەو هۆکارە گشتییانەی بوونە هۆی سەرنەکەوتنی ئەزموونە بەراوردکراوەکانی ئۆتۆنۆمیی، لەو باوەڕەداین هۆکاری تایبەتیش لە دوای سەرنەکەوتنی ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی بوون لە کوردستانی عێراق کە دەکرێ لەمەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە:

١- ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ لە نێوان حکوومەتی عێراق و سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردی بەنوێنەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکەکەی مەلا مستەفا بارزانی مۆر کرا، ئەو دەسکەوتە نەتەوەییییە گەورەیەش بەرهەمی ڕێککەوتنی هەردوولا بوو، چاوەڕێش دەکرا بڕگەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە جێبەجێ بکرێن لە سەرووشیانەوە یاسای ئۆتۆنۆمیی لە ڕێگەی ڕێککەوتنی هەردوو لا لەسەر درێژە و وردەکارییەکان و گفتوگۆی دۆستانە لە ماوەی کاتی ڕێککەوتنەکەدا کە چوار ساڵ بوو. هەر لەسەر ئەو ئەساسەش سەرکردایەتی شۆڕشی کورد پرۆژەی خۆی بۆ ئۆتۆنۆمیی- کە پێشتر باسی لێوە کرا[٢١] لە ٩ی ئاداری ساڵی ١٩٧٣ پێشکەش بەحکوومەتی عێراق کرد بەمەبەستی گفتوگۆکردن لە بارەیەوە لەگەڵ لایەنە حکوومییە تایبەتمەندەکان، بەڵام حکوومەتی عێراق ئەو پرۆژەیەی پشتگوێ خست بگرە پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو لا تا ڕادەیەکی زۆر ڕوویان لە ئاڵۆزی کردبوو و شک و گومان و ململانێش شوێنی متمانەی ئاڵوگۆڕکراو و ئەو کەشوهەوایەی گرتەوە کە پێشتر لە ئارادا بوو، ئەمەش پاڵی بەحکوومەتەوە نا کە یەک لایەنە یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ بۆ ناوچەی کوردستان دەربکات، بەبێ ئەوەی پێشتر گفتوگۆ و ڕێککەوتن لەگەڵ لایەنی کوردی پەیوەندار بەبابەتەکەوە ئەنجام بدات، بەمەش حکوومەت کۆتایی بەهەموو شتێک هێنا کە لە نێوان هەردوو لادا مابووەوە و جارێکی دیکە شەڕێکی توندتر هەڵگیرسایەوە لە ئەنجامی ڕازی نەبوونی لایەنی کوردی بەیاسای ناوبراو چونکە ئاستی نزمی ویست و خواستەکانی نەهێنایەدی و لەگەڵ ئەو خەباتەشدا گونجاو نەبوو کە کورد لەو پێناوەدا کردبوویان. بۆیە دەکرێ بوترێ ئەو تازە میوانە (یاسای ئۆتۆنۆمیی) بەناتەواوی لەدایک

بوو. دەشکرێ بپرسین مانای چییە لە دوای پیادەکردنی ئۆتۆنۆمیی سەرلەنوێ شەڕ دەست پێ بکاتەوە؟ مانای ئەوەیە کە ئەو سیستەمە ویست و خواستەکانی کوردی وەدی نەهێناوە کە لە پێناویاندا خەباتی کردووە و قوربانیی گەورەشی پێشکەش کردووە.

٢- ئەو یاسایە هیچ ئاماژەیەکی دەربارەی بەخشینی هەندێک ئیعتیباراتی سیاسی بەهەرێمی ئۆتۆنۆمیی تێدا نەبوو بەڵکو تێبینی دەکرێ کە بڕگەی ج لە ماددەی یەکەمی یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوبراو باسی لەوە کردووە کە:

«ناوچەکە بەیەک یەکەی ئیداری دادەنرێ...» ئەمەش دەلالەت لەوە دەکات کە یاسادانەری عێراقی ڕازی نەبووە تەنانەت بەشێوەیەکی ڕواڵەتیش ئاماژە بەسیفەتی سیاسی ئەو ناوچەیە بکات، ئاشکرایە کە ئەو یاسایە بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی درێژخایەن و بەردەوام- بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە- دارێژراوە، وەک باویشە ئۆتۆنۆمیی هەندێک ئیعتیباراتی سیاسی دەگرێتە خۆی و لە هەندێک وڵاتدا بە(هەرێمی سیاسی) ناودەبرێ، بۆیە ئەم ڕێگەچارەیە بەناتەواوی هاتە پێشەوە و واشی لە کۆمەڵێک کەس کرد بڵێن: «دەتوانین سروشتی یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوبراو وەکو یاسایەکی ڕێکخراوەیی دیار بکەین، ناوچەی کوردستانیش تەنیا بریتییە لە پارێزگایەک لە ناو دەوڵەتێکی یەکگرتوودا»[٢٢].

٣- ئەم یاسایە لە دوور و نزیک ئاماژەی بەسەربەخۆیی خودی نەکردووە، لە کاتێکدا ئەمە ناوەڕۆکی ئۆتۆنۆمیی پێکدێنێ، لە هەمان کاتدا ئەو یاسایە زیاتر لە جارێک یەکێتی یاسایی و سیاسی دەوڵەت دووبارە دەکاتەوە[٢٣]، بۆ نموونە یاساکە بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە ناوچەکە بەئۆتۆنۆمیی بەهرەمەندبێ لە «چوارچێوەی یاسایی و سیاسی و ئابووری کۆماری عێراقدا[٢٤]، هەروەها تیایدا هاتووە کە: «ناوچەکە بەشێکی جیانەکراوەیە لە خاکی عێراق، گەلەکەشی بەشێکی جیانەکراوەیە لەگەلی عێراق»[٢٥].

٤- ڕاگەیاندنی یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوبراو هاوکات دەبێ لەگەڵ دەستکردنی حکوومەت بەدابڕینی ڕووبەرێکی بەرفراوان لە کوردستان و نووساندنی بەناوچە ناوەندییەکانەوە، لەگەڵ زانینی ئەوەی کە ئەو ناوچانە خاوەنی زۆرینەی کوردن و هەموو بەڵگە مێژوویی و سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانیش دەردەخەن کە بەشێکن لە کوردستان، ئەوانیش: پارێزگای کەرکووک و قەزاکانی خانەقین و مەندەلی و سنجار و شێخان و کفری و توزخورماتوون. ڕووبەری ئەو خاکە کوردییانەش کە لە کوردستان دابڕێنراون(٣٩٩٣٨) کیلۆمەتر

چوارگۆشەیە لە کۆی ڕووبەری ناوچەکە کە (٧٤٠٠٠) کیلۆمەتر چوارگۆشەیە(٢٦)، ئەو کردەوەیەش ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە سیستمی ئۆتۆنۆمیی لە عێراق، چونکە ئومێدی کوردی لە هێنانەدی خواستە نەتەوەییەکانیان لاواز کرد بگرە بووە مایەی هەستکردنیان بەنائومێدی و شکو گومان لە نیازەکانی حکوومەت بەرامبەریان کە لەجیاتی داننان بەمافە ڕەواکانیان دەستی کرد بەتاڵانکردنی خاکەکەیان.

٥- دەردەکەوێ کە یاسای ئۆتۆنۆمیی لە عێراق باسی لە مافی ناوچەکە نەکردووە لە دەرکردنی دەستوور یان سیستمی بنەڕەتی خۆی، بەپێچەوانەی زۆر لە ئەزموونەکانی دیکەی ئۆتۆنۆمیی، بۆ نموونە دەبینین کۆمارەکانی خاوەن ئۆتۆنۆمیی لە یەکێتی سۆڤییەت و هەروەها لە هەرێمە سیاسییەکانی هەریەکە لە ئیتالیا و ئیسپانیا دەستوور یان بڕیارە سیاسییەکانی خۆیان دەردەکەن لە دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی لە لایەن پەرلەمانە ناوەندییەکانەوە لە کاتێکدا سیستمی ئۆتۆنۆمیی لە عێراق دەوەستێتەوە سەر یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ و یاسای ئەنجوومەنی تەشریعیی ژمارە ٥٦ی ساڵی ١٩٨٠ کە هەردووکیان لە لایەن حکوومەتی ناوەندییەوە دەرکراون بەبێ بوونی هیچ دەورێکی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی لە دەرکردنیان.

٦- هەردوو ماددەی ١٢ و ١٥ لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوبراودا تایبەتمەندی و ئەرکەکانی هەریەکە لە ئەنجوومەنی تەشریعی و تەنفیزی ناوچەی کوردستانیان دیارکردوون کە چوارچێوە و سنووردارن، لە کاتێکدا تایبەتمەندییەکانی دیکەیان کە لەو بوارانەدا نەهاتوون- بەدەسەڵاتی ناوەندی بەخشیوە[٢٧].

بەگوێرەی ماددەی ژمارە ١٢، ئەنجوومەنی تەشریعی بۆی نییە یاسا هەرێمییەکان دابڕێژێ بەڵکو تەنیا دەتوانێ بڕیارە تەشریعییە هەرێمییەکان دەربکات، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە ئەو بوارانەی بۆ دەرچوونی ئەو بڕیارانە دیارکراون بواری نادیار و نا ئاشکران، ئەوەتا دەبینین لە بڕگەی (ب)ی ماددەی ١٢ دا هاتووە: «دەرکردنی بڕیاری تەشریعی پێویست لە پێناوی پێشخستنی ناوچەکە و بووژاندنەوەی پێگە کۆمەڵایەتی و کلتووری و ئابوورییە خاوەن مۆرکە ناوخۆییە دیاریکراوەکان لە چێوارچێوەی سنووری سیاسەتی گشتی دەوڵەت». لە بەرامبەر ئەو هەموو سنوورانەشدا دەکرێ بپرسین: ئایا هیچ بوارێک بۆ ئەنجوومەنی تەشریعی ماوە کە کاری تێدا بکات لەگەڵ ئەو هەموو نا ڕوونییەی بەدەقەکانەوە دیارە؟

دەربارەی هێزی یاسایی بڕیارە تەشریعییە هەرێمییەکانیش، ئەوانە- وەک لە مەوبەر باسمان کرد- بەیاسا دانانرێن، بەڵکو لە ڕووی هێزی یاساییەوە لەو سیستمە تەنفیزییانە بێ بایەخترن کە لە لایەن حکوومەتی ناوەندییەوە دەردەکرێن(٢٨).

٧- دەستوور یان یاسای ئۆتۆنۆمیی هیچ زەمانەتێکی بۆ دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی تێدا نەبوو سەبارەت بەسنوور نەبەزاندنی دەسەڵاتی ناوەندی و دەخالەت نەکردنی لە ماف و تایبەتمەندییەکانیان- ئەو ماف و تایبەتمەندییانەی کە لە بنەڕەتدا سنووردار کراون- هەروەها ڕازیبوونی ئەو دامودەزگایانە لەسەر هەمموارکردنی یاسا تایبەتەکان بەئۆتۆنۆمیی نەکردۆتە مەرج، بۆیە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش چەند بڕیارێکی سەبارەت بەهەمموارکردنی دەقەکانی یاسای ئۆتۆنۆمیی دەرکرد بەتایبەتی بڕیاری ژمارە ١٧٥٠ لە ١٧/ ١٢/ ١٩٧٩ کە هەمموارکردنێکی زۆری تیادا کرا ئەوەتا لە بڕگەی یەکەمی ئەو بڕیارەدا هاتووە کە سەرۆکی ئەنجوومەنی تەشریعی ئەندامی ئەنجوومەنی وەزیران دەبێ و ئەرکەکانی وەزیر جێبەجێ دەکات بەرامبەر بەو دەزگا ئیدارییانەی کە بەپێی سیستمی پێکهاتە ئیدارییەکانی ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٤ی ساڵی ١٩٧٥ سەرۆکایەتییان دەکات، دەکرێ بوترێ ئەمە پێشهاتێکی مەترسیدارە لە پێشێلکردنی بنەمای جیاکردنەوە لە نێوان دەسەڵاتەکاندا، هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی کە دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی بەن بەچەند بازنەیەک لە ناو دەزگاکانی دەسەڵاتی ناوەندیدا و هەموو جۆرە سەربەخۆییەکیش لە دەست بدەن، بەواتایەکی دیکە ئەمە خۆی لە خۆیدا مانای پاشگەزبوونەوە تەنانەت لە لامەرکەزی ئیداریش دەبەخشێ، مایەی سەرسوڕمانیشە ماددەی ١٥ لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ئەرکی دەرکردنی بڕیارە تەشریعییە ناوخۆییەکانی بەئەنجوومەنی تەنفیزی سپاردووە، چونکە- وەک چۆن پێشتر ڕوونمان کردەوە- ئەمە لە بنەڕەتدا ئەرکی ئەنجوومەنی تەشریعییە!!

٨- لە میانەی دیراسەکردنی سیستمی ئۆتۆنۆمیی لە عێراقدا، نەبوونی تەرەفێکی بێ لایەن دەردەکەوێ بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکییانەی کە لەوانەیە لە نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمییدا سەر هەڵبدەن، ئەو دەستەیەش کە حاڵی حازر لە ئەندامانی دادگای تەمییز پێکهێنراوە توانای پێکانی مەبەستی نییە چونکە لایەنێکی ناوەندییە و چاوەڕێ ناکرێ ببێتە ناوبژیوانێکی بێ لایەن و ڕاستگۆ، بێ لایەنی داواکراویش تەنیا بەبوونی دادگایەکی دەستووری نەبێ دەستەبەر ناکرێ کە پێکهێنانی بەجۆرێک بێ ببێتە مایەی متمانەی هەردوو لا.

٩- پشتگوێ خستنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە لایەن حکوومەت و دەستپێکردنەوەی شەڕ لە دژیدا، ئەو حزبەی کە سەرکردایەتی بزووتنەوەی کوردی دەکرد و نوێنەری ڕاستەقینەی ویست و خواستەکانی گەلی کوردیش بووە، بووە مایەی پشت بەستنی ئیدارەی دەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی بەلایەنی لەرزۆک و لاواز کە توانای ئەوەیان نەبێ بەڕاستی نوێنەرایەتی گەلی کورد بکەن، چونکە ئەوانە بریتین لە گرووپێک لە شوێنکەوتووانی دەسەلاتی ناوەندی، لەو ڕووەوە حەبیب محەمەد کەریم دەڵێ:

«ڕووداوەکانی سالانی دواتر دەریانخست کە ڕێککەوتننامەی ئادار لە دیدی حزبی بەعسەوە فرتوفێڵێکی گەورە بووە و مەبەست لە دوایەوە دروستکردنی پەیکەرێکی کارتۆنی بووە بۆ ئۆتۆنۆمییەکی دەستکرد کە لە لایەن دەسەلاتی ناوەندی و دەزگاکانی ئاسایش و موخابەراتەوە بەڕێوەببرێ و هەندێک خائین و بەکرێگرتەش لە سەرەوەی ئەو پەیکەرە قیت بکاتەوە و ئەو ئۆتۆنۆمییە دەستکردە بکاتە سەرپۆشێک بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی خۆی بەرامبەر بەگەلی کورد بەمەبەستی بەعەرەبکردن و بەبەعسکردنی ناوچەکە»[٢٩].

هەر ئەمەش بووە هۆی ئیفلیج بوونی دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی و نەتوانینی چارەسەرکردنی کێشەکانی هەرێم و بەڕێوەبردنیان وەکو پێویست، بگرە ئەو دامودەزگایانە نەیانتوانی هیچ کارێکی بنەڕەتی ئەنجام بدەن کە جیاوازبن لەوەی کە فەرمانگە ئاساییەکانی دیکە لە سایەی لامەرکەزی ئیداریدا پێی هەڵدەستن، ئەوانە لە ماوەی زیاتر لە ١٨ ساڵدا نەیانتوانی هیچ بڕیارێکی پەیوەندار بەپیادەکردنی مافە نەتەوەییەکان دەربکەن، لەو ماوە دووردرێژەدا هەموو ئەوەی کە لە لایەن ئەنجوومەنی تەشریعییەوە دەرکراوە بریتی بووە لە داهێنانی فەرمانگەیەکی باجی خانوبەرە لە کۆیە[٣٠]، ئەمەش خۆی دەسەلاتێکی ئاساییەو تەنانەت وەزیری پەیوەندار یان ئەو پارێزگار و بەڕێوەبەرە گشتییانەی ئەو ئەرکەیان پێ دەسپێررێ دەتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن، هەر لەو ماوەدا دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی نەیانتوانی بەکارهێنانی زمانی کوردی پیادە بکەن کە مافێکی دەستوورییە و بەپێی یاسایەک کە لە ساڵی ١٩٣٠ لە لایەن حکوومەتی عێراقەوە دەرچووە بڕیاری لەسەر دراوە وەک چۆن لەمەوپێش ڕوونمان کردەوە، بگرە ئەوانە بەبیانووی پڕوپووچ و نالۆژیکییەوە پابەندبوون بەبەکارنەهێنانی زمانەکەیان[٣١].

هەموو ئەو هۆکارانەش وایان لە دامودەزگاکانی ئۆتۆنۆمیی کرد کە ببن بەناوی بێ

ناونیشان و شێوازی بێ ناوەڕۆک، کارێکی لەو جۆرە پاڵی بەدکتۆر حەسەن چەلەبییەوە نا لەو بارەوە جەخت بکاتەوە لەسەر ئەوەی: «.... ئەوانەی بەیاننامەی ئاداریان مۆرکرد توندڕەوترین دەسەڵاتدارانی عێراقن بەرامبەر بەرەتکردنەوەی ئەوەی تیایدا هاتووە ئەگەرچی تەنیا ناگاتە ئاستی لامەرکەزییەکی ئیداریش کە لە هەر کاتێکدا و بەبڕیارێکی ساکاری بەغداوە دەکرێ لە دەسەڵاتدارانی ناوچەکە بسەنرێتەوە» (٣٢).

**پەراوێزەکانی ئاخافتنی سێیەم:**

(١) لەو بارەوە بڕوانە هەردوو بەشی دەیەم و یازدەم لە دەستووری ساڵی ١٩٧٧ی یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییەکانی سۆڤییەتی.

(٢) بەخشینی ئۆتۆنۆمیی بەنەتەوەکان لە یەکێتی سۆڤییەت بۆ هەوڵ و تێکۆشانی حزبی شیوعی سۆڤییەتیی خاوەن هزر و فەلسەفەی مارکسی- لینینی دەگەڕێتەوە، ئەو حزبەی هەوڵی دا بەشێوازی ڕزگارکەری نەتەوە ستەمدیدەکان خۆی دەربخات، ڕزگارکردنی نەتەوەکان لەو زوڵم و گەندەڵییەی کە بەناو جەستەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بڵاوەی کردبوو و بەرامبەر بەنەتەوە ڕووسییەکانیش خاوەنی تۆمارێکی خراپ بوو و لەگەڵیاندا بەشێوەیەکی لایەنگیر و نایەکسان و ناعادیلانە مامەڵەی دەکرد، هەر ئەمەش بووە مایەی زیادکردنی نارەزایی و ڕق و کینە لە دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی ئەو نەتەوانەی کە تەنانەت لە ساکارترین مافەکانیان بێبەش کرابوون، ئیمپراتۆریەتی قەیسەری وەکو تەنیا چەند موستەعمەرەیەک دەیڕوانییە لایەنە ڕۆژهەڵاتییەکان و تیایاندا بواری بەهیچ پێشکەوتنێک نەدا و دانیشتوانی تەنانەت لەوەش بێبەش کرد کە منداڵانیان بەزمانی نەتەوەیی خۆیان فێربکەن. دەکرێ بوترێ هەڵوێستی حزبی شیوعی سۆڤییەتی بەرامبەر بەنەتەوەکان وەکو کاردانەوەیەک وابوو بەرامبەر بەهەڵوێست و سیاسەتی حکومەتی قەیسەری لادراو دژ بەنەتەوە غەیرە ڕووسەکان.

ئەمەو تیۆرەکانی مارکس و ئەنجلز بەخشینی ئۆتۆنۆمیی بەنەتەوەکان لە یەکێتی سۆڤییەتیان تیادا نەبوو بەڵکو ئەو ڕێو شوێنانەی کە پەیوەندییان بەسیستمی حوکمەوە هەبوو لە لایەن لینینی سەرۆکی حزبی شیوعی سۆڤییەتی داهێنران و پیادەکران وەکو ڕێوشوێنێکی ئینتیقالی و کاتی بەر لە گواستنەوەی بۆ سیستمی شیوعی چاوەڕوانکراو، چونکە وەک خۆی دەڵێ ئەو باوەڕی بەمافی ئەو نەتەوە زۆرانە هەبوو کە یەکێتی سۆڤییەت دەیانگرێتە خۆیان، ئەوەتا سەبارەت بەدەربڕین لە مافی ئەو نەتەوانە لینین دەڵێت: «مەبەست لە ئازادی گەلان لە دیارکردنی چارەنووسی خۆیان، جیابوونەوەیانە وەکو دەوڵەت لە گرووپی نەتەوەی دیکە، بێگومان پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆیە».

هەر لەو ڕوانگەیەشەوە حکومەتی کرێکار و جوتیاران لە نۆڤەمبەری ١٩١٧دا بەڵگەنامەیەکی گرنگی دەرکرد تیایدا جاڕی مافی گەلان لە دیارکردنی چارەنووسی خۆیان درابوو و مافەکانی نەتەوە جیاوازەکانیش ڕوون کرابوونەوە، لەو بارەوە لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە:

ئەنجــومــەنی نوێنەرانی گــەل بڕیاری دانانی ئەو بنەمــایانەی خــوارەوەی دا وەکــو بناغــەیەک بۆ چالاکییەکانی سەبارەت بەمەسەلەی نەتەوەکانی ڕووسیا:

١- یەکسانی لە نێوان گەلانی ڕووسیا و مافی هەموویان لە سەروەریدا.

٢- مــافی گــەلانی ڕووســیــا لەوەی بەئازادی بڕیار لەســەر چارەنووسی خــۆیان بـدەن، بەجــیــابوونەوە و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆشەوە.

٣- نەهێشتن و لادانی هەموو جۆرە ئیمتیاز و بەربەستێکی نەتەوەیی و ئایینی.

٤- پێشکەوتنی ئازادانە بۆ کەمینە نەتەوەیی و ئەو گرووپانەی لەسەر خاکی ڕووسیا دەژین.

بەڵام دواتر لینین لەمە پاشگەز بووەوە و مافی نەتەوەکانی لە جیابوونەوە بەمافی جیابوونەوەی ژن و مێرد چواند کە تەنیا لە کاتی زۆر پێویست نەبێ پەنای بۆ نابرێ، بەهاتنی ستــالینیش بۆ دەسەڵات بارودۆخــەکــان بەتەواوەتی گــۆڕان، چونکە ناوبراو ســیــاســەتێکی ناوەندی توندی پیــادە دەکــرد و ئازادییەکانیش کپ کرانەوە، ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەو بنەمایانە

بوون کە لە سەرەوە هاتوون.

لەو بارەوە بڕوانە:- دکــتــۆر مــحــەمــەد حوســێن بەکــر- النظام الفدرالي بين النظرية والتطبيق- نامــەی دکتۆرا- چاپخانەی دار النشر للثقافة- قاهیره ١٩٧٧- ل ١٠٥- ١١١.

(٣) مــیــخــائیل گــۆرباچۆڤ- إعــادة البنــاء والفكر الأشــتــراكي- وەرگــێــڕانی د. عــەباس خــەلەف- شــركــة المعرفة للنشر والتوزيع المحدودة- بەغدا ١٩٩٠- ل ١٥.

(٤) عــارف ئەلحــمــســانی- مــحــاضــرات فــي النظم الســيــاســيــة والقــانون الدســتــوري- مــديرية الكتب والمطبوعات الجامعية ١٩٦٣- ١٩٦٤- ل ٢٢٠.

Adam. B. Ulam, The Russian Political System, Random House, House, Newyork, Third edition 1974, Page 71- 72.

(٥) ماددەی ٨٦ لە دەستووری ساڵی ١٩٧٧ی یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییەکانی سۆڤییەتی.

(٦) عارف ئەلحمسانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢١.

(٧) دکــتــۆر مــحــەمــەد هەمــەوەندی- الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الادارية- ســەرچاوەی پێشــوو- ل ١٤٦.

(٨) دکــتــۆر مــحــەمــەد هەمــەوەندی باس لەوە دەکات کــە ســەرکــەوتنی ئــەزمــوونی ئۆتــۆنۆمــیی لە یەکــێــتی ســۆڤــیــەت ئەوەنــدە بۆ خــودی ئەو ســیــســتــمــە ناگــەڕێتــەوە بەقــەد ئــەوەی بۆ هزری مــارکــسی- لــینینی دەگــەڕێتــەوە کــە لــەمــەی خــوارەوە کــورت دەکــرێتــەوە:«بارودۆخی ئابووری گــەلێـک دەتوانێ دۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و ئایینی ئەو گەلە دیار بکات».

لەو بارەوە بڕوانە: دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٦.

(9) V. M. chkhikvadze, The Soviet state and Law, Institute of state and Law, Academy of Science of the U. S. S. R progress publishers Moscow, First Printing

1969, Page 11.

(10) Op. Cit Page 11

(11) Op. Cit Page 13 .

(12) Op. Cit Page 23

(13) Leoard Schapiro. The Government and Politics of the soviet union, HutchinSon university Library 1986 Page 87- 88.

(14) Adam B. ulam Op. Cit Page 68.

(١٥) ماددەی ٧٣، برگەی ٦ لە دەستووری ساڵی ١٩٧٧ی یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییەکانی سۆڤییەتی.

(١٦) دکتۆر حەسەن چەلەبی- القانون الدولي العام- بەشی یەکەم- اصول القانون الدولي العام- الدولة- چاپخانەی شەفیق- بەغدا ١٩٦٤- ل ٢٤٣- ٢٤٦.

K. C. Wheare, Federal Government, oxford university press, London newyork, Toronto, Forth edition 1967. Page 25- 26.

- دکتۆر محەمەد کامیل لیلە- النظم السیاسیة- الدولة والحکومة- دار الفکر العربي- القاهرة ١٩٦٧- ١٩٦٨- ل ١٥٣- پەراوێز.

(١٧) ماددەی ٧٠ لە دەستووری ساڵی ١٩٧٧ی یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییەکانی سۆڤییەت.

(١٨) بیرسترۆیکا وشەیەکی رووسییە مانای دووبارە بونیاد نانەوە دەبەخشێ، یان لە فەرهەنگی زمانی رووسی-کە دانەرەکەی بۆرسیۆنە- لە لاپەڕە ٦٧دا هاتووە بەوەی کە بریتییە لە دووبارە چاوخشاندنەوە بەعەقائیدەکانەدا.

(١٩) بڕوانە. سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٢٧.

(٢٠) ریاز ئەلزوهێری: کوردستان العراق: هل تصلح الفدرالیة ماأفسده الحکم الذاتي؟ بابەتێکە لە گۆڤاری الثقافة الجدیدة بلاوکراوەتەوە- ساڵی ٤٠- ژمارەی ٣- کانوونی دووەم- شوباتی ١٩٩٣- ل ٢٧.

- دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحکم الذاتي والنظم اللامرکزیة الاداریة والسیاسیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٩- ١٥١.

(٢١) بڕوانە ل ١١٦- ١١٨ی ئەو تێزە.

(٢٣) بەهەمان مەبەست بڕوانە: ریاز ئەلزوهێری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٦.

(٢٤) ماددەی یەکەم- برگەی ج لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان.

(٢٥) ماددەی یەکەم- برگەی د لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان.

(٢٦) دکتۆر محەمەد هەمەوەندی - قراءة قانونیة لفکرة الحکم الذاتی وتطبیقها في کوردستان العراق- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٦.

(٢٧) ماددەی ١٦ لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤.

(٢٨) ماددەی ١٩- بڕگەی ب لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان.

(٢٩) حەبیب محەمەد کەریم- سەرچاوەی پێشوو- ل ٨- ٩.

(٣٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ٩.

(٣١) لە نێوان ئەو بیانووانەدا بانگەشەکردن بۆ نەبوونی ئامێری چاپکردن بەزمانی کوردی وەک چۆن لە بەڵگەنامەکانی ئەنجوومەنی تەشریعی ناوچەی کوردستاندا هاتووە.

(٣٢) دکتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالیة - سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٠.

لەبەرئەوەی بابەتی ئەم دکتورانامەیە (فیدرالّیەت و دەرفەتی پیادەکردنی لە عێراقدا)یە بۆیێ دەبێتە پێویستیی کە باس لە بنەما گشتییەکانی سیستەمی فیدرالّی بکەین بەوەیی مەبەست لە فیدرالّیەت ڕوون بکەینەوە و هەروەها پێناسەی بکەین و چوونیەتی دروست بوونی دەولّەتی یەکگرتوو (فیدرالّی) پیشان بدەین هەروەها خستنە ڕووی سیما بنچینەییەکانی سیستەمی فیدرالّی و ئەو پرنسیپانەی کە لە سەریان ڕادەوستیت و باس کردنی ڕوالّەتەکانی یەکیەتی لە دەولّەتی فیدرالّی و هەروەها دراسەتکردنی سروشتی یاسایی دەولّەتی فیدرالّی خۆی دەسەپێنێت لەم بوارەدا بۆ لێکۆلّینەوە لە ئالّۆزییەکانی مەسەلەی سەروەری لەم جۆرە دەولّەتە، هەروەها جیاوازکردنی فیدرالّیەت لە هەریەک لە کونفدرالیەت و ئۆتۆنۆمی و نامەرکەزییەتی کارگێڕی هەرێمی و سیستەمی ولایات لە ئیسلامدا سەرباری جیاکردنەوەی فیدرالّیەتی هەرێمی لە فیدرالّیەتی کەسایەتی بۆیە بەشی یەکەمی ئەو دەروازەیە تەرخان دەکەین بۆ بەدیارخستنی سەرەتاکانی بەدەرکەوتنی فیدرالّیەت و پیشاندانی سیما سەرەکییەکانی لە ڕێگای پێناسە کردنی و دیارخستنی ڕێگاکانی دروست بوونی و لە دوای ئەوە دەچینە بەشی دووەم کە تیایدا باس لە پرنسیپەکانی فیدرالّیەت و سروشتی یاسایی یەکیەتی فیدرالّی و ڕوالّەتەکانی دەکەین، بەلاّم لە بەشی سێیەم و کۆتایی لەم دەروازەیە باس لە جیاکردنەوەی فیدرالّیەت لە سیستەمە هاوشێوەکانی دەکەین.

## بەشــی یەکەم

# سەرەتاکانی فیدراڵییەت و سیما سەرەکییەکانی

سەرەتاکانی فیدراڵیەت و سیما سەرەکییەکانی فیدراڵیەت وەکو ڕواڵەتێک لە ڕواڵەتی سیستەمە یەکگرتووەکان بەچەند قۆناغێک لە مێژوودا تیپەڕبوو پێش ئەوەی بگاتە قۆناغی سەردەم و ڕواڵەتی ئێستای، بۆیێ پێوستە باس لەو قۆناغە مێژووییانە بکەین کە ئەم سیستەمە لە سەفەرە دوورودرێژەکەی پێیاندا تێپەڕیوە و سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. هەروەها فیدراڵیەت بەسیما و جیاکەرەوەکانی خۆی دەناسرێت کە جیای دەکەنەوە لە سیستەمە هاوشێوەکانی دیکە. و بۆ دروستکردنی تێڕوانینێکی تەواو لەسەر یەکیەتی فیدراڵی پێویستە ئەو سیما و جیاکەرانەوە بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بۆیە ئەو بەشە دابەش دەکەین بەسەر دوو ئاخافتن کە لە ئاخافتنی یەکەم باس لە سەرەتا پێشینەکانی پێناسەی فیدراڵیەت وەکو سیستەمێکی دەستووری دەکەین و ڕێگاکانی دروست بوونی دیار دەکەین و لە دواییدا ئاخافتنی دووەم تەرخان دەکەین بۆ دیارخستنی خەسڵەتەکانی سیستەمی فیدراڵی.

## ئاخافتنی یەکەم

# سەرەتاکانی فیدرالّییەت و پێناسەکردنی

### یەکەم: سەرەتاکانی فیدرالّیەت

#### ١- شارەکانی یۆنانی کۆن

ئارەزووی کومەڵگا کۆنەکان لە شارەکان بۆ بەدیهێنانی رێککەوتن و تەبایی بۆ مەبەستی بەرگریی هاوبەش و بەرەو پێش بردنی خۆیان مەسەلەیێکی سروشتییە و ئەو ئارەزووەش لە قۆناغە سەرەتاکانی مێژووی مرۆڤایەتی بەدەرکەوت و ئەوەی جێگای گومان نییە شارەکانی یۆنانی کون لە ئاستێکی شایستە بوون لە بواری شارستانی و پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و هەندێک لە شارەزایان دەلّێن کە هەمووممان قەرداری یۆنانین لە پەیدا بوونی هەردوو لایەنی تیۆری و پراکتیکی فیدرالّیەت کەوا لەو ولاتە لە سەدەی پێنجەمی پێش لە دایکبوون بەدەرکەوت[١] و لە یۆنانی کۆن جیاکاری هەبوو لە نێوان هەردوو رێکخستنی سایماچیا Symmachia و سایپولیتیا Sympolitia و جیاوازیی لە نێوانیاندا لە ناوەرۆک بوو بەو شێوەی کە لە کاتێک سایما چیا کەمێک لە یەکیەتێکی سەربازی بەهێزتر بوو سایپولیتیا زۆر قوولّتر و پتەوتر بوو بەجۆرێک کە هاوبەشی لە ژیانی سیاسیی تێدا بەدی دهات و ئەوەش پێویستی بەبوونی حکوومەتێکی ناوەندی دەکرد و ئەو کاتەش پێویستی دابەشکردنی دەسەلاتەکان لە نێوان حکوومەتی ناوەندی و حکوومەتە خۆجێیەکان لە شارەکان دەهاتە پێش هەروەها بوونی دوو سۆزیی نیشتیمانییەتیش (مواطنة مزدوجة) و دوو سۆزیی لایەنگیری (ولاء مزدوج) یەکێکیان بۆ حکوومەتی فیدرالّی و ئەوەی دیکەیان بۆ حکوومەتی خۆجێیی[٢] بێجگە لەوەی کە حکوومەتی ناوەندی تایبەتمەند بوو بەکاروباری دەرەوە و بەرگری و هەروەها سەیرکردن و بینینی کێشەکانی تاوانی خیانەتکاری ئەمە لە کاتێکدا حکوومەتی خوجەیەتیەکان تایبەتمەندبوون بەکاروباری دیکە[٣].

و لە ژێر تیشکی ئەو زانیارییە کەمانەی کە لێرەو لەوێ پێمان گەیشتوون سایماچیا زۆر لە کونفدرالییەتە تازەکان دەچوو لە رووی نەرم و خاوی و نەبوونی رێکخستنێکی کارامە لە کاتێکدا سایمپولیتیا زۆر نزیک بوو لە بیرۆکەی تازەی فیدرالّییەت و هەندێک جار

سایماچیا پەرەی دەسەند و بەرەو پێشەوە دەچوو و دەگەیشتە پلەی سایمپولیتیا وەکو یەکییەتی یاخود کۆمەڵەی إیتولیان[٤] و گەورەترین کونفیدراڵییەکانی سەردەمە کۆنەکان کە بایەخیان پێ درا ئەوانە بوون کە لە کۆمارە یەکگرتووەکانی یۆنان کە لە ژێر سایەی ئەنجوومەنی امفکتیونک (Amphictyonic) پەیدابوون کە ئەندامەکانی بەپاسەوانانی ئایین و پارێزگارانی گەنجینە زۆر و زەبەنەکانی پەیکەری دلفوس (Delphos) دادەندران و لە ڕێکخستنە نایابەکانی ئەو دەسگایە بەناوبانگە زۆر نموونە لە ڕێگای پێوانە (قیاس) گوازراوەتەوە بۆ کونفدرالییەتی ئەمەریکا کە لە ساڵی ١٧٨١[٥] دامەزراو ئەندامانی ئەو یەکیەتییە پارێزگارییان دەکرد لەسەربەخۆیی و سەروەری دەوڵەتەکانیان و دەنگی یەکسانییان لە ئەنجوومەنی امفکتیونکی فیدراڵی هەبوو[٦] و ئەو ئەنجوومەنە دەسەڵاتی تەواوی هەبوو بۆ پێشنیار و بڕیاردان لەسەر ئەو شتانەی کە پێی وابوو پێویستن بۆ بەختەوەری یۆنان و هەروەها دەسەڵاتی بڕیاردانی هەبوو لە بواری جاردانی جەنگ و دەست پێکردنی بێجگە لەوەی کە دەسەڵاتی دەرکردنی بڕیاری کۆتایی هەبوو لەمەڕ ئەو ناکۆکییانەی دەکەوتنە نێوان ئەندامەکان و سزادانی لایەنی دەست درێژکەر لە ڕێگای بەکارهێنانی هێز لە دژی ئەو لایەنەی کە لە یەکیەتی یاخی دەبێت و هەروەها دەسەڵاتی وەرگرتنی ئەندامی تازەی هەبوو. بێجگە لەوەش خۆجێییەتییەکان تایبەتمەندبوون بەکاروباری دیکە و وەکو مەرجێکی زیاتر و بۆ زیادکردنی کارامەیی دەسەڵاتە فیدراڵییەکان ئەندامانی ئەنجوومەنی ناوبراو بەرامبەر یەکتری سوێندی ئەوەیان دەخوارد کە بەرگری لە شارە یەکگرتووەکان بکەن و بیانپارێزن و سزای ئەو ئەندامە بدەن کە ئەو سوێندە پێشێل دەکات[٧].

لەگەڵ ئەوەی کە ئەو هەموو دەسەڵاتانە لە لایەنی تیووری تێروتەسەل بوون بۆ هەموو ئامانجە گشتییەکان بەڵام لە بواری ژیانی پراکتیکی دەستدرێژییان لەسەر دەکرا هەر بۆیێ جیاوازیی هەبوو لە نێوان تیۆری و پراکتیکدا و لە کاتێک کە هەموو شتێک لە بواری تیۆریدا بەوردییەکی زیاد ڕێکخرابوو بۆ ئەوەی هەموو لایەنێک دەسەڵاتەکانی خۆی جێبەجێ بکات بەبێ هیچ دەستدرێژییێک لەسەر دەسەڵاتی لایەنەکانی دیکە یاخود دەست بەسەراگرتنی لایەنێک بەسەر هەموو دەسەڵاتەکان بەڵام لەڕاستییدا هەموو شتێک بەپێچەوانە بوو چونکە دەسەڵاتەکان لە لایەن هەندێک لە نوێنەرانی شارەکان جێبەجێ دەکرا ئەویش بەپێی هێز و توانای سیاسی ئەو شارانە هەر بۆیێ لاوازیی و دواییش بەرەلایی سەری هەڵدا هەتا لە کۆتاییدا ئەو فیدراڵییەتە پارچە پارچە بوو و ئەندامە

بەهێزەکان لەجیاتی ئەوەی پاراستنی هێمنی و ڕێسا بەرقەرارکەن و پەیماننامەکان پێڕەو بکەن هەستان بەئەنجامدانی کاری خۆسەپاندن بەسەر ئەندامەکانی دیکە هەروەکو ئەسینا (أثینا) کە بۆ ماوەی (٧٣) هەفتا و سێ ساڵ خۆی بەسەر ئەندامەکانی تر سەپاند لە کاتێکدا کە لاسیدیمونیا بۆ ماوەی (٢٩) بیست و نۆ ساڵ خۆی سەپاند بەڵام لە ماوەی دوای جەنگی لیوکترا Leuctra شاری طیبە بەم ڕۆڵە هەستا واتە ڕۆڵی خۆ سەپاندن و مادامەکی نوێنەرانی شارە بەهێزەکان هەڵدەستان بەترساندن و تۆقاندن و بەرتیل کردنی نوێنەرانی شارە لاوازەکان حوکم و بڕیارەکان لە بەرژەوەندی لایەنی بەهێز دەردەچوو[٨]. و ئەو ماوەیە لە مێژوو بێ توانایی یەکیەتییەکەی سەلماند و چاوچنۆکی و ناکۆکی و قین و کینەی ئەندامە بەهێزەکان و کلکایەتی و سەر شۆڕی و ئاست نزمی ئەندامەکانی دیکەی بەدیار خست و ئەو ئەندامانە هەرچەندە دەیانتوانی بەیەکسانی لە ڕووی بەرزی و گەورەیی لە دەوری ناوەندە هاوبەشەکە بسووڕێنەوە بەڵکو لە ڕاستیدا بوونە چەند مانگێک کە لەدەوری قطبی سەرەکی دەسووڕانەوە[٩].

چەند یەکییەتێک (Leagues) لە یۆنانی کۆن هەبوون بەڵام شێوازەکانیان جیاجیابوون و هەندێکیان بۆ ماوەیەک بەردەوام بوون و لەو یەکییەتییانەی کە لەوی دامەزرابوون یەکیەتی بیلووبونیسیان و یەکیەتی بوویووتیان و یەکییەتی ایتولیان و یەکییەتی أثینا بوون[١٠].

و یەکییەتی بوویووتیانی اولیجارکی لە سەرەتای سەدەی چوارەمی لە دایکبوون پەیدا بوو کە بوون بەهاووڵاتی تێدا لەسەر موڵکداری ڕادەوەستا هەروەها حکوومەتە خۆجێییەکان یەک شێوازیان هەبوو و لە ئەنجوومەنێک پێک دەهات (Boule) کە یەک لەسەر چواری هاووڵاتیانی خزمەتیان تێدا دەکرد و هەروەها لە کۆمەڵەیێک (Ecclesia) کە لە هەموو هاووڵاتییە ئازادەکانی دیکە پێک دەهات. و ئەنجوومەن Boule دەسەڵات و بەرپرسیارییێکی زۆر و فراوانی لە دەستا بوو بەڵام لە ئەنجامدا هەر سەر بەکۆمەڵە (Ec-clesia) بوو. و بۆ مەبەستی فیدراڵی وڵاتی یەکییەتی بوویووتیان دابەش کرابوو بەسەر (١١) یانزە بەش و طیبە (ثیبیس) و ئەو ناوچانەی بەسەریەوە دەستیان بەسەر چوار بەشیان گرتبوو لە کاتێک کە چوار بەشی دیکە سەر بەدوو شار و ناوچەکانیان بوون هەروەها بەشەکانی دیکە لەسەر شێوەی چەند کۆمەڵگای بچووک تێکەڵ ببوون. و هەر یەکێک لەو (١١) یانزە بەشە (٦٠) شەست ئەندام و هەندێ دادوەریی دەنارد بۆ ئەنجوومەن Boule و هەروەها بەشێوەییێکی یەکسان بەشدارییان دەکرد لە دارایی

یەکیەتی فیدراڵی و هەروەها بەژمارەییێکی دیاریکراوی نەگۆڕ لە ناردنی سەرباز بەهەردوو جۆری پیادە و سوارە بەشدارییان دەکرد[١١].

هەروەها یەکییەتی (عصبە)ی ئاخییەکان Achaean کە لە سەدەی سێیەم و دووەمی پێش لە دایکبوون گەیشتە ئەو پەڕی گەشەکردنی خۆی کە بەیەکێک لە ڕێکخستنەکانی کۆمارەکانی یۆنانی کۆن دەژمێردرێت و بەگەورەترین هێزی کاریگەر لەو وڵات لەو مێژووە لە قەڵەم دەدرا. و ئەو یەکیەتیە زۆر کارامە و مەعقولتر بوو لە نموونەکانی پێشوو[١٢] چونکە ئەو شارانەی ئەو یەکیەتییەیان پێک دەهێنا دەسەڵاتەکانی خۆجێییەکانی خۆیان لە دەست نەدا و هەروەها لە ژێر سێبەری یەکسانییێکی تەواو دەژیان و ئەنجوومەنی پیران کە نوێنەرایەتی شارە ئەندامەکانی دەکرد هەر بەخۆی بەتەنها دەسەڵاتی شەڕ و ئاشتی هەبوو و هەروەها دەسەڵاتی ناردن و پێشوازی کردنی لە بالویزەکانی هەبوو و هەر بەخۆی پەیماننامەکانی گریدەدا و هەروەها دەسەڵاتی چوونە ناو هاوپەیمانیەتی هەبوو و ئەحلاف و دامەزراندنی بریتور کە سەرۆکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی لە دەست دابوو[١٣] ئەمەو بریتور سەرکردایەتی سوپای دەکرد و بەڕاوێژکاری (١٠) دە کەس لە پیران حکوومەتی بەڕێوە دەبرد لە کاتی پشووی ئەنجوومەن Boule لە پاڵ ئەوەی کە باڵا دەست بوو لەو وتووێژانەی کە لە ئەنجوومەنی پیران ئەنجام دەدران[١٤] و ئەوهاش دەردەکەوێت کە هەموو شارە ئەندامەکان لەو یەکیەتیە هەمان یاسا و داب و نەریتیان پیرەودەکرد و هەروەها ئامرازی پێوان و کێشان و دراو یەک بوو لە نێوانیاندا هەرچەندە هەتا ئێستا نەزانراوە کە هەتا چ ڕادەییێک ئەم کارانە بەدەسەڵاتی ئەنجوومەنی فیدراڵی هاتووتنەدی چونکە دەوترا کە شارەکان ناچار دەکران بۆ وەرگرتنی هەمان یاسا و دابونەریت، و لەوکاتەی کە لاسیدیمون Lacedemon هێنرایە ناو یەکیەتییەکە لە لایەن فیلوبومینەوە Philopmen هەموو یاسا و ڕێساکانی لایکور جزی Lycurgus پووچەڵ کردەوە و ئەو یاسا و ڕێسایانەی پێڕەودەکرد کە لە لایەن ئاخییەکان جێبەجێ دەکران[١٥]. ئەو ڕاستییە گرنگە کە لە لایەن هەموو ئەو مێژوو نووسانەی کە تیبینیان پیشانداوە دەربارەی کاروباری ئاخییەکان بریتییە لەوەی کە لە دوای زندیکردنەوە و تازەکردنەوەی یەکیەتییەکە لە لایەن آراتوس Aratos و لە پێش تێکچوونی بەهۆی فرت و فێڵ و ئایین و آویینی مەکدونیا Macedon نۆژەنکردنەوە و دادوەرییێکی بێ سنووری تێدا بەدی دەکرا لە بەڕێوەبردنی حکوومەت و ڕادەییێک لە توندوتیژی و هاندان بۆ ئاژاوە و یاخیبوون کە بەڕێژە کەمتر بوو لە هەموو شارێکی دیکە کە بەتەنها هەڵدەستا بەبەکارهێنانی سەروەری و جیاووکەکانی

خۆی[١٦] و آبی مابلی Abbemably لە تێبینییەکانی خۆی سەبارەت بەیۆنان وتوویەتی کەوا حوکمی خەڵکی (الحكم الشعبی) کە گەردەلوولی لە شوێنێکی دیکە دروست کردبوو هیچ بەرەلایێکی لە لای ئەندامانی کۆماری ئاخییەکان دروست نەکرد لەبەرئەوەی سووک و ئاسان کرا بوو لە ڕێگای دەسەڵاتی گشتی و یاساکانی ئەو کۆنفدرالییەتە[١٧] و هەموو یەکیەتییە یۆنانییەکان لە شێوازدا لە یەک دەچوون لەگەڵ ئەوەی هەندێ جیاوازییان لە نێواندا هەبوو ئەویش لە وردەکارییەکان و ئەو پرنسیپە گشتییانەی کە لە بەراوردی هەموویان بەدی دەکرێت ئەوانەیە:

یەکەم: بوونی دوو لقی حکومەت کە بریتین لە ئەنجوومەن Boule و کۆمەڵە Ec-clesia و قەبارەی ڕێژەیی

هەر یەکێکیان دەبێت جیاوازی هەبێت لەگەڵ ئەوەی دیکە بەڵام ماوەی خزمەت تیایاندا دەبێت کورت بێت بۆ ئەوەی بەرژەوەندی تایبەت سەرهەڵنەدا و گەشە نەکا و هەموو ئەندامانی ئەنجوومەن خزمەتی پێشتریان هەبووە لە کۆمەڵە.

دووەم: بەشداری دارایی ڕێکوپێک و بەشدارییە چاوەڕوانکراوەکانی دیکە کەوا لە لایەن ئەندامەکان دەستنیشان کرابوون بەڵام شتێکی ئاسایی بوو کە داوا لە ئەندامە گەورەکان و دەوڵەمەندەکان بکرێت کە ئاستی بەشدارییان زیاتر بێت و هەروەها مەسەلەی دابەشکردنەوەی دووبارە هەبوو[١٨].

لە فیدراڵیەتە یۆنانیەکان وا مەبەست بوو کە کۆمەڵە بایەخێکی کەمتری لە ئەنجوومەن هەبێت[١٩] و ئەمەش بەڕاشکاوی وەکو نموونە لە هەردوو یەکیەتی ایتولیان و ئاخینەکان بەدەرکەوت[٢٠] و ئەوەی جێگای داخە ئەو زانیارییانەی کە پێمان گەیشتوون لەسەر ئەو دامەزراوە سرنج ڕاکێشە زۆر کەموکوڕی تێدایە و ئەگەر بتوانرایە بەتەواوی سیستەمی ناوخۆیی ئەو دامەزراوە بزانرابایە وا چاوەڕوان دەکرا کە ببوایە هۆی تیشک خستنە سەر حکوومەتی فیدراڵی بەڕادەیێکی زیاتر لە هەموو ئەزموونێکی هاوتای دیکە کە زانیاریی لەسەر وەرگیرابێت[٢١].

بەڵام ئەو یەکیەتییانە ون بوون لە شانۆی سیاسی یۆنانی و لە نێوان ئەو هۆکارانەی کە بوونە هۆی کەوتن و لەناوچوونیان ئەوانەی خوارەوە بەدی دەکرێن.

یەکەم: ململانێ لە دژی یەکتریدا و بەخیلی و بوغز وکینە دژ بەیەکتری لە نێوان شارە ئەندامەکان. و لەو یەکیەتییانەی بەناوبانگ بوون أثینا و اسبارطە کە لە دوای

سەرکەوتنیان بەسەر سوپای پیرسیانی پربوون لە مەغروری و خوبایی بوون بەسەرکەوتن و پایە بەرزی و لەسەرەتا دەستیان کرد بەململانێ لەگەڵ یەکتر هەتا لە دواییدا بوونە دوژمنی یەک و ئەو ئازار و هەرەسانەی کە لە دەست یەکتریان دەدیت زۆر زیاتر بوو لەوەی کە لە دەست اکسیرکیس دیتیان و کینە و بەخیلی بەیەکتر و مەترسی نێوانیان بووە هۆی چەنگی بیلوبونیسی بەناوبانگ کە بوکوبلاتی ئەثینییەکان- ئەوانەی کە جەنگیان دەست پێکرد- کوتایی پێ هات(٢٢).

دووەم: ئەو تەنگ و چەلەمانەی لە بواری گەیاندن و کۆنترۆلکردنی ئامرازەکانی هاتوچۆ و لێهاتووی کارگێڕی هەبوو.

سێیەم: بێ توانایی ئەو یەکیەتیانە بوو لە ڕاوەستان لە ڕووی زلهێزەکانMacedonia (٢٣) بۆیە پێویستە چاوەڕوانی بەڵگەی زۆر لە مەڕ فیدراڵیەت لەسەردەمە تاریکەکان نەکەین و ئەو ڕاستییەش لەسەر سەردەمەکانی ناوەڕاستیش پیادە دەکرێت و یەکیەتی لومبارد لە یەکیەتییەکی شل وشاو و تەمەن کورت زیاتر نەبوو و ئەوە بوو کە چەند شارێکی دەوروبەری میلان و بۆ مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی هێرشە یەک لە دوای یەکەکانی هێزە زل و زەبەلاحەکانی ئیمپراتۆریەت و لە دواییش لە فەرەنسا هاتە کایەوە و شاری میلان لاوازییەکی زۆری پێوە دیاربوو لە بەڕێوەبردن و هەروەها نەبوونی سەرکردەییەکی کاریگەر(٢٤).

## ئیمپراتۆریەتی شارلەمان:

لە سەدەی نۆیەمی زایینی ئیمپراتۆریەتی نیمچە سەربازی شارلەمان لەشکرە سەرکەوتووەکانی خۆی بەهەموو لایێک بڵاوکردەوە و ئەڵمانیاش بووە بەشێک لەو وڵاتە پەرت و بڵاو و فراوانە و لە کاتی پارچەپارچەبوونی ئیمپراتۆریەتەکە لە ژێر سێبەری حوکمڕانی کوڕەکانی ئەو بەشە واتە ئەڵمانیا وەکو ئیمپراتۆریەتێکی سەربەخۆ دامەزرا بەڵام ناوچە دەرەبەگییە سەرەکییەکان- کە بەشێوەییەکی میراتگری حوکمڕانی دەکران ئەنجوومەنێکی نیشتمانییان Diet پێکهێنابوو کە شارلەمان دەستی لێ نەدا و هەڵیەنەوەشاندەوە- توانییان وردە وردە لە کۆبلایەتی ڕزگار بن و گەشەیان کرد وەکو چەند دەسەڵاتێکی سەربەخۆ و خاوەن سەروەری و ئیمپراتۆریەتەکە ئەو هێزەی نەبوو کە بتوانێت ئەو هەرێمە بەهێزانە سەرکوت بکات و دەسەڵاتی ئیمپراتۆری نەیتوانی هێمنی و ئاسایش بپارێزێت و ڕێگا لەو بەسەرهاتە ناخۆش و مەینەتییانە بگرێت کە لەو شەڕانەی کە

هەڵدەگیرسان لە نێوان میرەکان و دەوڵەتە جیاجیاکان دەکەوتەوە کە بووە هۆی بەرەڵایی سیاسیی.

James madison دەڵێت لە دەرەوەی ئەو سیستەمە دەرەبەگایەتییە کە سیما گرنگەکانی کونفدرالییەتی بەخۆوە گرتبوو سیستەمی فیدراڵی رووا کە بریتی بوو لە ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی کە دەسەڵاتەکانی بە Diet سپێردرابوون کە نوێنەرایەتی ئەندامە پێکهێنەرەکانی کۆنفدرالیەتی دەکرد و هەروەها لە ئیمپراتۆر کە سەرۆکی کارگێری بوو و دەسەڵاتی رەتکردنەوەی بریارەکانی دایتی Diet هەبوو هەروەها دەسەڵاتەکان سپێردرابوون بەئەنجوومەنی ئیمپراتۆریی و دوو دادگای دادوەری کە دەسەڵاتێکی باڵایان هەبوو بۆ چارەکردنی کێشەکانی نێوان ئەندامانی ئیمپراتۆریەت و هەروەها دایت دەسەڵاتی گشتی یاسا دانان و دەست پێکردنی جەنگ و مۆرکردنی ئاشتی و گرێدانی هاوپەیمانییەتی و دیاری کردنی بەشی ئەندامەکان لە سەرباز و پارەی هەبوو دروستکردنی قەڵات و حەشارگەی قایم و رێکخستنی دراو و وەرگرتنی( ١٠ ) ئەندامەکان و مل کەچکردنی ئەو ئەندامانەی کە دەست درێژی دەکەنە سەر یاسا بۆ لەعنەتی ئیمپراتۆریەت[٢٥] و دەسەڵاتەکانی ئیمپراتۆر زۆربوون و لە هەموویان گرنگتر ئەو مافەیە کە تەنها ئەو هەیەتی لە پێشکەشکردنی پێشنیارەکان بۆ دایت Diet و رەتکردنەوەی بریارەکانی و دەست نیشانکردنی باڵوێزەکانی و پێدانی أوسمە و ئەلقاب بۆ پرکردنەوەی پۆستە بەتاڵەکان سەبارەت بەفەرمانرەوایی ناوچەکان و دامەزراندنی زانکۆکان و پێدانی جیاووکەکان کە زەرەری بۆ دەوڵەتە ئەندامەکانی ئیمپراتۆریەت نەبێت و وەرگرتن و بەکارهێنانی داهاتە گشتییەکان[٢٦]. لەو شیکردنەوەی ئەو دەسەڵاتە دەستوورییانەی کە دراونەتە نوێنەرەکان و سەرۆکی ئەو کۆنفدرالیەتە إفترازي سروشتی ئەو دەبێت کە ئەو کۆنفدرالیەتە هەڵاوێردنە (استشناء) لەو سیفەتە گشتییانەی کە مۆرکی سیستەمە هاوشێوەکانە. بەڵام لە پراکتیکدا لەوە دوورتر ئەبوو. و پرنسیپە گشتییەکان کە کونفدرالیەتە کە لە سەریان پێکهاتبوو ئەوەبوو کە ئیمپراتۆریەتەکە بریتی بوو لە کۆکراوەیەکی چەند دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری و دایت Diet نوێنەری ئەو دەوڵەتە خاوەن سەروەرییانەی دەکرد و یاسا و بریارەکان ئاراستەی دەوڵەتانی خاوەن سەروەری دەکران ئەوەش وای کرد کە ئیمپراتۆریەتەکە ببێتە دەسگاییەکی لاواز و بێ توانا لە رێکخستنی ئەندامەکانی و نا ئەمین دژی خەتەرەکانی دەرەکی و رارا و ئاڵۆز بەپێی ئەو هەڵقولانەی کە لەناو هەناوی رانەدەوەستا[٢٧].

### ٣- یەکگرتووی Hanseatic هانسیاتکی ئەڵمانی:

لە سەدەی سێزدەیەمی زایینی یەکگرتوویێکی دیکە پەیابوو ئەویش یەکگرتووی هانسیاتک Hanseatic بۆ شارە باکوورەکانی ئەڵمانیا بوو ئەو یەکگرتووە لەسەر ئاستێکی باش بوو لە گرنگیدا بەهۆی تەمەن درێژیی و، بەرفراوانی باس لێوەکردنی[٢٨].

کاروباری ئەو هاوپەیمانەتییە بەبەردەوامی لە پێشەوەچوون دابوو هێزو کاریگەریشی گەیشتە چلەپۆپە لە سەدەکانی نێوان ١٣٥٦- ١٦٧٦زایینی و یەکیەتی بەوردی چەسپێنرا لە نێو ڕێکخستنەکانی وەکو یەکێک لە نووسەرەکان دەڵێت: «ئەوەی کە بەسەر شارێک بهاتایە هەموو لایێکی دەگرتەوە».

کۆبوونەوەکانی ئەو یەکگرتووە بەشێوەییێکی ڕێکوپێک بۆ هەموو ئەندامەکان دەبەسترا و برەوییێکی تازە بەبنەما یاسایەکان بەخشرا و دەزگای حوکمڕانی بریتی بوو لە کۆمەڵێک کە لە نوێنەرانی هەموو شارەکان پێکهاتبوو[٢٩] و ئەو یەکگرتووە هەر چەندە نەرم و خاو بوو بەڵام بەکۆنفدرالیەتێکی جێگیر حسێب دەکرا و لە ساڵی ١٣٦١[٣٠] وە بەشی هەموو ئەندامەکان لە مەسروفاتی یەکگرتووەکە دەستنیشان کرا. بەڵام ڕۆڵی ئەو یەکگرتووە ڕووی لە لاواز و کەم بوونەوە کرد هەتا گەیشتە ئەوەی کە لە سەدەی حەڤدەهەم نەمینێت بەهۆی پاڵەپەستۆی زلهێزەکان و ئەو جەنگانەی کەرو بەڕووی بوون.

مێژووی ئەڵمانیا مێژووی جەنگە لە نێوان ئیمپڕاتۆر و میرەکان و ولایەتەکان. مێژووی پابەند نەبوونی لایەنی بەهێز بەهیچ بنەماییێک و زۆرداری و زوڵم کردن لە لایەنی لاواز، مێژووی هێرش کردن و پیلانەکانی هێزەکانی دەرەکی و ساڵنامەکانی مێژووی ئەڵمانی پڕە لە لاپەڕە خوێناوییەکان و ئەگەر هاتباو وڵات سیماییکی زیاتر یەکگرتوویی بەخۆیەوە بدیتابایە لەبەر بوونی هەلومەرجێکی نائاسایی و حاڵەتی بەرگریی لە خۆکردن لەگەڵ ئەوەش بارودۆخی وڵاتەکە هەرچی داخ و ناڕەحەتی بوو لە بەرنارێکی[٣١].

فیدراڵیەتی زەوییە نزمەکان Netherlands: لە سەدەی شانزەهەم فیدراڵیەتی زەوییە نزمەکان دامەزرا لە میانی خەباتی چینی بورژوازی لەو وڵاتە لە پێناوی سەربەخۆیی و جیابوونەوە لە امپریالیەتی دەرەبەگایەتی پادشای ئەسپانیا و ئەو فیدراڵیەتە بۆ زیاتر لە (٢٠٠) دووسەد ساڵ بەردەوام بوو[٣٢] و ئەو یەکیەتیە لە (٧) حەوت دەوڵەتی یەکسان و خاوەن سەروەری پێکهاتبوو و هەر یەکێک لەو دەوڵەتانە یاخود لەو هەرێمانە چەند شارێکی سەربەخۆو یەکسان پێکهاتبوو لە هەموو کێشە گرنگەکان دەبوایە نەک هەر

ڕەزامەندی هەموو دەوڵەتەکان وەربگیرێت بەڵکو دەبوایە ڕەزامەندی هەموو شارەکان وەربگیرێت و سەروەری یەکگرتووەکە (الاتحاد) لە لایەن پەرلەمان State General بەکاردەهات کە لە (٥٠) پەنجا نوێنەر پێکهاتبوو لە لایەن هەرێمەکان دادەمەزران[٣٣]. و پەرلەمان دەسەڵاتی چوونە ناو پەیماننامە و هاوپەیمانییەتی هەبوو بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ و هێنانەدی ئاشتی و هەروەها پێکهێنانی سوپا و ئامادەکردنی ئەسطولەکان و دیاریکردنی بڕە بەشی ئەندامەکان و داواکردنی بەشداری بەڵام ئەو کارە پێویستی بەڕەزامەندی ئەندامە دامەزرێنەرەکانی یەکگرتووەکەی لە هەموو ئەو کێشانە دەکرد. و هەروەها دەسەڵاتی ناردن و قەبول کردنی سەفیرەکان و جێبەجێکردنی پەیماننامە و هاوپەیمانییەکان کە لە ڕێگایێکی ئاساییەوە گرێدرابوون و هەڵدەستا بەئەرکی کۆکردنەوەی ڕسومات لەسەر کالا دەرچوو و هاتووەکان و ڕێکخستنی لێدانی دراو[٣٤] و جێگری پاشا Stadtholder کە میری میراتگرەیی بۆ دەسەڵاتی و پسپۆڕایەتی بەرچاوی لە دەستدابوو و لە بواری سیاسی دەسەڵاتی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان هەرێمەکانی هەبوو کە ڕێچکەکانی دیکە فەشەلیان دەهێناو هەروەها ڕۆڵی یارمەتیدانی هەبوو لە گفتوگۆکانی پەرلەمان و چاو پێکەوتنی باڵوێزە بێگانەکان و هەروەها لە بواری سەربازی سەرکردایەتی هێزەکانی فیدراڵی دەکرد و بەئەرکی دروستکردنی پێگە سەربازییەکان و ڕێکخستنی کاروباری سەربازی هەڵدەستا و بڕیاردان لە مەسەلەی دامەزراندن لە پلەی کۆلۆنیل هەتا ملازم بێجگە لەوەش دەسەڵاتی دامەزراندنی هەبوو لە پۆستەکانی حکوومەت و شارە پۆلاییینە بەهێزەکان و بەپێی دەسەڵاتە دەریاییەکانی ئەو ئەدمیرالی گشتی بوو سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی هەموو هێزەکانی دەریایی و کاروباری دیکەی دەریایی هەبوو و یا بەخۆی یاخود لە ڕێگای جێگرەکەی سەرۆکایەتی ئەدمیرالیەکەی دەکرد و جێگری ئەمیرال و ئەفسەرەکانی تری دادەمەزراند و ئەنجوومەنی جەنگی پێکدەهێنا کە بڕیارەکانی جێبەجێ نەدەکران بەبێ ڕەزامەندی ئەو[٣٥].

فیدراڵیەتی هۆلەندی وەکو فیدراڵیەتێکی نوێخواز و خاوەن داهێنانێکی گەورە بوو ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ فیدراڵیەتەکانی پێشتر[٣٦] بەڵام لە کاتێکدا کە ئەمە هەلومەرجی یەکگرتووەکە بوو لە لایەنی تیۆریدا هەلومەرجەکە بەپێچەوانە بوو لە لایەنی پراکتیکدا چونکە دژ بەیەکبوونێکی گەورە هەبوو لە نێوان هەرێمەکاندا و کاریگەری دەرەکی لەسەر فیدراڵیەتە کە تێبینی دەکرا و ئاڵۆزی و ناسەقامگیری لە کاتی ئاشتی و بەسەرهاتی جەرگ بڕو نەگبەتی لە ئەنجامی جەنگ تێبینی دەکرا[٣٧].

لە کاتە خەتەرناکەکانی نائاسیی پەرلەمان ناچارکرا کە سنوورەکانی دەستووری تێپەڕاند و چەند پەیماننامەیێکی گرنگی بەستا بەبێ ئەوەی تێکرایی دەنگی ئەندامەکان هەبووبێت و بەدوو ڕێچکە توانرا کە ئەو لامەرکەزیەتە توندەی دەستوور بەلاوە بنرێت یەکەمیان ئەوەبوو کە نوێنەرانی هۆڵەندە توانایان هەبوو بەئاسانی زاڵ بن بەسەر پەرلەمان یا لە ڕێگای بەرتیل یاخود لە ڕێگای هێز و هۆڵەندە توانی بەدەوڵەمەندی و دەسەلاتی خۆی ئەوانی دیکە بەلاوەبنێت و بیانکاتە تەنها چەند کلکێک[٣٨] و دووەمیان ئەوەبوو کە زۆربەی پۆستە گرنگەکانی حکوومی لە ڕێگای ئەنجوومەنی ئەدمیرالیەت جێبەجێ دەکرا ئەویش بەشێوەیێک پێکهێنرا بوو کە زاڵبوونێکی کاریگەری بازرگانەکانی ئەمستردامی لەسەر دابێت و ئەو ئەنجوومەنەش حوکمڕانی دەریاوانی (هێزی سەربازی سەرەکی) و کۆمپانییەکانی ئەوبەر دەریاکان بۆ بازرگانی (هێزی بازرگانی سەرەکی) دەکرد و بەهەر حاڵێک بێت ئۆلیجارکەکانی ئەمستردام بەسەر هەموو فیدراڵیەتەکە زاڵ بوون بەشێوازێکی نیمچە ئیمپراتۆری[٣٩].

## کۆنفیدراڵییەتی سویسری

پەیدابوونی کۆنفیدراڵییەتی سویسری دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێزدەهەمی زایینی ئەوەبوو لە ساڵی ١٢٩١ هەرێمەکانی أوری (uri) و شڤیدس (Schwys) و ئەنترڤالدن (Unterwaeden) پەیماننامەیێکیان لە نێوان خۆیان گرێدا بەمەبەستی بەرگریکردنی هاوبەش لە هەر سێ هەرێم لە هێرشەکانی بنەماڵەی هاپسبۆرک Hapsburg[٤٠] و ئەو یەکیەتیە نارەسمییە یەکیەتییێکی کونفدرالی یاخود فیدرالی نەبوو بەڵکو بریتی بوو لە هاوپەیمانییێکی تەنها خاوەن سروشتێکی سەربازی و بەرگری بێت[٤١] و لە دواییدا(١٠) دە هەرێمی دیکە هاتنە ناو ئەو پەیماننامەیە بەوەش بووە هاوپەیمانییەتی(١٣) سێزدە هەرێمەکەی کە هەموویان ئەڵمانی زمان بوون تەنها سولور (Soleure) و بەشێک لە فریبورگ Fribourg نەبێت کە زمانیان فەرەنسی بوو[٤٢] و بۆ ئاگاداریش پێشتر هەر سێزدە هەرێمەکە سەر بەئیمپراتۆرییەتی جەرمانی بوون کە سەروەری خۆی بەسەریان داسەپاند بوو بەڵام بەپێی ڕێکەوتننامەی وستڤالیا Westphalie دان بەسەربەخۆیی تەواوی ئەو هەرێمانە نرا.

ئەو هاوپەیمانیەتییەی کە ئەو هەرێمانەی پێکەوە بەستابوو بەپلەیێکی گەورە لاواز بوو چونکە هەر ئەوەندە بوو کە کۆنگرەیێکی دیبلۆماسی بەناوی بۆندستاج Bundstag

سەرپەرشتی دەکرد و ئەو کۆنگرەیە ساڵی یەک جار کۆدەبووەوە و ژمارەییێکی یەکسان لە نوێنەران نوێنەرایەتی هەرێمەکانیان لەو کۆنگرەیە دەکرد و دەشبوایە بەتێکڕای دەنگ ڕەزامەندی لەسەر بڕیارەکانی بکرێت(٤٣) و ئەو سەردەمە بەزاڵبوونی ڕەگەزی ئەڵمانی و بەهێزبوونی دەسەڵاتی کەنیسە ناسراوە و سیستەمی ئابووری ئەو هەرێمانە لەسەر بنەمای سەندیکا پیشەییەکان بنیادنرا بوو(٤٤) و لەگەڵ ئەوەی کە زمانی ئەڵمانی زمانی ڕەسمی ئەو کۆنفدراڵییەتە کەونە بوو بەڵام بەکارهێنانی زمانی فەرەنسیش لە هەردوو بواری ئابووری و سیاسەت تێبینی دەکرا و ئەوەی کە لەو پێگە بەرزە مابێتەوە ئەوەبوو کە فەرەنسا بەتەنها لە ڕێگای باڵوێزێک لە شاری بوون نوێنەرایەتی دەکرا لە کاتێک کە دەوڵەتانی دیکە تەنها بەنێردراوێکی سیاسی بەدەسەڵاتێکی ڕەها نوێنەرایەتی دەکران(٤٥) و لە ساڵی ١٧٩٨ لەشکرەکانی سوپای فەرەنسا خاکی سویسرایان داگیرکرد و لە ژێر سەرپەرشتی فەرەنسا کۆماری هالیفاتکی Halifatic یەکبوو و قابلی دابەش نەکردن دامەزرا و ئەو سیستەمەی کە لە لایەن فەرەنسییەکان پیادەکرا زۆر ناوەندی و بەهێز بوو و هەروەها لە مێژووی سویسرا ئەوە باو نەبوو کە یەک سیستەمی کارگێڕی لێکچوو بۆ هەموو وڵاتەکە پێڕەو بکرێت ئەمەش لە ژێر سەرپەرشتی فەرەنسییەکان پیادە کرا هەروەها یاساکانیش یەکخران(٤٦)

لە دوای ڕووخانی حکوومەتی بەڕێوەبەرەکان (حكومة المديرين)(٤٧) لە فەرەنسا لەشکرەکانی فەرەنسی پاشەکشەیان کرد لە سویسرا لە ساڵی ١٨٠٢بەڵام ئەو وڵاتە کە تازە لە کێشەییێکی گەورە ڕزگاری ببوو ڕووبەڕووی مەترسییێکی گەورەتر بۆوە ئەویش شەڕی ناوخۆیی لە نێوان لایەنگیران و بەرهەڵستکارانی فیدراڵیەت بۆیە لەو کاتەدا فەرەنسییەکان گەڕانەوە سویسرا بۆ گەڕاندنەوەی ئاسایش هەروەها فەرەنسا داوای لە نوێنەرانی هەردوو لایەن کرد کە لە پاریس ئامادەبن بۆ داڕشتنی دەستوورێکی تازە و ئەویش بوو کە دەستوورەکە دامەزرا و بەکاری مام ناوەندی (عمل التوسط) ناویان لێنا (Act of miditation) و ناپلیون ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە دامەزراندنی.

ئەو دەستوورە کە لە ساڵی ١٨٠٣ خرایە بەرکارپێکردن قەوارەی هەموو هەرێمێکی پاراست و بەوەش سویسرا ڕوو و سیمایێکی زیاتری سیستەمی فیدراڵیەتی بەخۆوە گرت و ئەوەش بوو کە دەسەڵاتی دەست پێکردنی جەنگ و ئاشتی درایە ئەنجوومەنێکی یاسا دانان Diet هەروەهاش بازرگانی لە نێوان هەرێمەکان ڕێکخرا(٤٨) و هەر هەرێمێک دەستووری خۆی دامەزراند لە پاڵ دەستووری یەکگرتوو(٤٩) بەڵام کزبوونی ئەستێرەی

ناپلیۆن و کۆتایی هێنان بەداگیرکردنی ئەو وڵاتە ڕێگا خۆشکەربوو بوو کۆتایی هاتن و لە بەین چوونی ئەو دەستوورە.

لە کۆنگرەی ڤیەنا دەستووری سویسرا پێشنیار کراو ئەو دەستوورە کە بریتی بوو لە چارەسەرییێکی مام ناوەندی لە نێوان یەکیەتییێکی خاو و نا موحکەمی فیدراڵیەتی کۆن لە لاییێک و لایەنگیران و داواکارانی حوکمی ناوەندی لە هەندێک لە هەرێمەکان لە لاییێکی دیکە[٥٠]. و لە کۆنگرەی پاریس کە لە بیستی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٨١٥ گرێدرا دەوڵەتە زل هێزەکان دانیان بەبێ لایەنی سویسرا ناو دەستووری یەکگرتوویان بەسەر داسەپاند[٥١] و بەپێی ئەو دەستوورە بەرزترین دەزگا بریتی بوو لە ئەنجوومەن Diet کە لە باڵوێزە نێردراوەکان لە لایەن هەرێمەکان پێکدەهات کە دەبوایە بەفەرمانی هەرێمەکانیان هەڵسوکەوت بکەن و هەرێمەکان هەریەکی دەنگێکی لەو ئەنجوومەنە هەبوو بەبێ ڕەچاوکردنی ژمارەی دانیشتوانیان و ئەو ئەنجوومەنە شێوازی دیبلۆماسی خۆی پاراست و دەسەڵاتی جاڕدانی جەنگ و گرێدانی ئاشتی و دەست نیشانکردنی باڵوێزەکان و ئامادەکردنی سوپاکان و دامەزراندنی سەرکردەکانی هەبوو لە کاتێکدا هەر هەرێمێک سەروەری ناوخۆیی هەبوو بەڵام ئەنجوومەنی ناوبراو لاواز بوو و هۆی لاوازبوونی دەگەڕایەوە بۆ بێ توانایی چەسپاندن و پیادەکردنی بڕیارەکانی هەتا گەیشتە ئەوەی بەڕاشکاوی هەر جۆرە دەسەڵاتێکی خۆی بەدەست تێوەردان لە کاروباری هەرێمەکان ڕەتکاتەوە بەبیانووی ئەوەی کە هەرێمەکان خاوەن سەروەرین[٥٢] بەڵام بای گۆڕانکاری کە هەڵی کردبوو بەسەر ئەوروپا بەبۆنەی سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی سویسرای لە کاریگەری خۆی بەلاوە نەنا بەڵکو پیشەسازییەکانی سویسرا زۆر گەشەیان کرد و ئەو کارەش پێویستی بەدۆزینەوەی بازاڕەکان و فراوانکردنیان کرد جگە لە لابردنی ئاستەنگە گومرگییەکان لە نێوان هەرێمەکاندا، هەروەها پێویستی دامەزراندنی سیستەمی ئابووری و دارایی یەکبوو هاتە پێش و لە ژێر کاریگەریەتی شۆڕشی ساڵی ١٨٣٠ لە فەرەنسا سویسرا لە ساڵی ١٨٣٢ هەوڵی دا دەستووری خۆی هەموار بکات بەڵام ئەو هەموارکردنانە ڕەتکرانەوە[٥٣] و لە هەمان ساڵ کۆنفدرالییەتی سەربەخۆ بەناونیشانی سوندر بووندی یەکەم First sonder bond پێکهێنرا بەڵام ئەو هەوڵەش لە ڕێگای بەکارهێنانی هێز پووچەڵ کرایەوە و ناکۆکی لە نێوان هەرێمە کاثولیکی و پروتستانتییەکان پەرەی سەند و لە ساڵی ١٨٤٥ سوندربوندی بیوامینز دامەزرا کە بریتی بوو لە کونفدرالییەتێک لە (٧) حەفت هەرێم پێکهاتبوو و بەرهەڵستی کۆکردنەوەی

دەسەڵاتی لە کونفدرالییەتی سویسری دەکرد بەڵام ئەنجوومەن Diet بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی سوندربووندی ناوبراوی لە ساڵی ١٨٤٧ دەرکرد و کاری جێبەجێکردنی ئەو بڕیارەی بەڕێگای سەربازی خستە ئەستۆی خۆیی و سوپاییێکی (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار کەسی پێکەوە نا بەرامبەر بەهێزی سوندربووندی ناوبراو کە لە (٧٩٠٠٠) هەفتا و نۆ هەزار چەکدار پێکهاتبوو و لە ئەنجامی هێرشێکی (١٩) نۆزدە ڕۆژیدا و لە شەڕێک کە بەشەڕی (سوندربووند) ناوزەد کرا هێزەکانی دەوڵەتی سویسرا توانییان ئەو شۆڕشە لەناو ببەن واتە ئەو سوندربووندە لە بەین بەرن[٥٤]

دوا بەدوای ئەو ڕووداوانە و لە ئەنجامی زیادبوونی پێویستی بۆ ڕێکخستن کۆنگرەیێکی نیشتمانی لە سویسرا بەسترا و سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەدامەزراندنی دەستووری فیدراڵی لە ١٨٤٨/٩/١٢[٥٥].

ئەوەبوو کە کۆنفدرالییەتی سویسری و بەدرێژایی سەدەکان گەشەی کرد بۆ ئەوەی ببێتە یەکێک لەو کۆنفدرالییەتە هەرە سەرکەوتوو و بەردەوامانەی کە جیهان بەخۆیەوەی بینیوە و وەکو Ursula K. Hicks دەڵێت جێی خۆیەتی کە بەنموونەی ڕەسەنی فیدراڵییەتی سەرکەوتوو دابنرێت[٥٦].

## دووەم : پێناساندن بەفیدراڵییەت و ڕێچکەکانی دروستبوونی:

پێویستە مەبەست لە زاراوەی فیدراڵییەت شیبکەینەوە و پێناسەشی بکەین وەکو سیستەمێکی یەکگرتوو جگە لەوەش ڕێچکەکانی دروست بوونی ئەو جۆرە دەوڵەتانە شی بکەینەوە، بۆیێ باس لە مەبەست لە زاراوەی فیدراڵییەت و پێناسەی سیستەمی فیدراڵی لە بڕگەی یەکەم دەکەین و لە داوییدا و لە بڕگەی دووەم باس لە ڕێچکەکانی دروست بوونی فیدراڵییەت دەکەین.

### ١ – پێناساندن بەفیدراڵییەت:

. دوو زاراوە لەم بوارە هەن کە زۆر بەکاردێن ئەوانیش فیدراڵییەت Federalism و بەفیدراڵی بوون یاخود یەکگرتووی فیدراڵی Federation (الفدرلة أو الاتحاد الفدرالي)[٥٧] و لە کاتێکدا کە فیدراڵییەت Federalism لایەنە فەلسەفی و أیدیولوجییەکە دەگرێتەوە و مەبەستیش لەو وشەیە پرنسیپی فیدراڵیەتە، وشەی بەفدراڵی بوون یاخود یەکگرتووی فیدراڵی Federation لایەنی ڕێکخستنی دەزگایانە -in

دەگرێتەوە و بەمەبەستی بنیادنان و دامەزراندنی فیدراڵیەت stitutional Arrangment دێت[٥٨].

هەندێک دەڵێن کە زاراوەی فیدراڵیەت لە وشەی لاتینی Foedus هاتووە کە بەمانای پەیماننامە یاخود ڕێکەوتن دێت[٥٩]. هەروەها بۆچوونێکی دیکە هەیە کە دەڵێت فیدراڵیەت شێوەی تاوتوێکی گرێبەندی وەردەگرێت و بەمانای ڕێکەوتن دێت (Foedus or pact) و لە بڕوا بوون (Fides or Trust) هاتووە کە بریتییە لە ڕێکەوتنێکی بەرامبەر و بەئازادی قبول کراو[٦٠]. و هەندێکی دیکە دەڵێن[٦١] کەوا وشەی لاتینی Foedusو بەپێی فەرهەنگی لاتینی مانای هاوپەیمانییەتیە (عصبة) League یاخود ڕێکەوتنە لە نێوان دوو لایەن یا زیاتر (Treaty) یاخود میساق (Compact) یا هاوپەیمانییەتی (تحالف Alliance) یا گرێبەست (Contract) دێت و سەبارەت بەڕەچەڵەکی وشەی (Foedus) ئەویش لە هەردوو وشەی (Fides) واتە بڕوا بوون (Bind)ی ئینگلیزی واتە پابەندبوون سەرچاوەی گرتووە چونکە ڕوون و ئاشکرایە کە وشەی (Foedus) جۆرێک لە ڕێکەوتن دەگرێتەوە کە پشت بەبڕوا بەیەکتری ببەستێت یاخود پەیمانێکی بڕوا پێکراوە Trusting Promise و سەبارەت بەسیاسەتەکانی نێو دەوڵەتی ڕێکەوتووەکان حکوومەتەکانن و ڕێکەوتنەکە ڕێکەوتنێکی فیدراڵییە.

و سەبارەت بەپێناسەکردنی فیدراڵییەت زۆر لە زانایانی یاسای گشتی هەستان بەپێناسەکردنی بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەو پێناسانە لە نێوان گرنگیدان بەدەوڵەتانی ئەندام لە دەوڵەتی یەکگرتوو بەپێی ئەو پلەیەی کە شایانینە و گوێنەدان و بەلاوە نانی ڕۆڵ و گرنگی ئەو دەوڵەتە ئەندامانە و سەیرکردنیان تەنها وەکو بەشەکان یاخود یەکەکانی کارگێڕی دێن و دەچن و لەم بوارە دەبینین کە یاسازان أوپنهایم Oppenheim دەوڵەتی فیدراڵی پێناسە کرد کە «یەکگرتووییێکی هەتا هەتایە لە نێوان چەند دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری جیا جیا کەوا دەزگاکانی تایبەتی خۆی هەیە کە دەسەڵاتیان پێدراوە نەک تەنها لەسەر دەوڵەتە ئەندامەکان بەڵکو لەسەر هاوڵاتییەکانیشیان.

Afederal state is a perpetual union of several soveregin states which has it's own organs which is invested With Power not only over the over their sitizens [٦٢].member- states, but olso

هەروەها یا سازان مارسیل بریلو Marcel Prelot لە پێناسەکردنی فیدراڵییەت دەڵێت «یەکگرتنی چەند دەوڵەتێکە کە بەشێوەییێکی نیواو نیو (جزئی) سەر بەیەک

دەسەڵاتی ناوەندییە (دەسەڵاتی فیدراڵی Pouvoir Federal) لە کاتێک کە بەنیواونیو پارێزی لەسەربەخۆییەکی خودی و دەستووری و کارگێڕی و دادوەری دەکات (دەسەڵاتی دەوڵەتە ئەندامەکان یاخود یەکگرتووەکان Pouvoir Feder)[٦٣]. ئەوەو ئەندریە هوریو Andre Hourio هەمان بۆچوونی هەیە کە دەڵێت «دەوڵەتی فیدراڵی کۆمپانیای دەوڵەتانە کە پەیوەندیی یاسایی نێوخۆ یاخود یاسای دەستووریان هەیە و بەپێی ئەوەش دەوڵەتێک دادەمەزرێت لە سەرووی دەوڵەتە بەشداربووەکان»[٦٤]. و لە نزیکی ئەو بۆچوونەش دکتۆر مەحەمەد طەی دەڵێت «دەوڵەتی فیدراڵی یەکیەتییەکی دامەزراوە لە نێوان چەند دەوڵەتێک لەسەر بنچینەی یاسای نێوخۆیی دەستووری بەشێوەییێک کە دەوڵەتێکی دامەزراو لە سەرووی ئەو دەوڵەتانە دێتە دی»[٦٥].

ولیام ریکەر William Riker فیدراڵییەت بەوە پێناسە دەکا کە «رێکخستنێکی سیاسییە کە تیایدا کارەکانی حکومەتی لە نێوان حکوومەتەکانی هەرێمی و حکوومەتی ناوەندی دابەش دەکرێت بەشێوەییێک کە هەر یەکێک لەو جۆرە حکوومەتانە بەشێکی لەو کارانە لەبەر دەستدا دەبێت و دەتوانێت بڕیاری کۆتایی و یەکلا کەرەوەیان لەسەر دەرکات».

Federalism is apolitical organization in which the activities of Government are divided between Regional Governments and Central Government in such away that
makes[٦٦]each kind of Government has some activities on which it final decisions.

بەڵام جیلینیک Jillinek دەوڵەتی فیدراڵی بەوە پێناسە دەکات کە «دەوڵەتێکی خاوەن سەروەرییە لە چەند دەوڵەتێکی بێ سەروەری پێکهاتووە و دەسەڵاتەکەی لەو دەوڵەتانەی کە پێکیانهێناوە هەڵدەقوڵێت کە بەشێوەییێک پەیوەندی لەگەڵ یەکتری دروست دەکەن کە دەبنە یەک یەکەی سیاسی»[٦٧]

هەروەها کارە دی مالبرج Carre De malberg دەڵێت «دەوڵەتی فیدراڵی بەکۆکراوەیی هەم دەوڵەتە و هەم یەکگرتووی دەوڵەتانە چونکە لە لاییێک دەشوبهێتە دەوڵەتی یەکبوو و بەم جۆرەش لە کۆنفدراڵیەتی دەوڵەتان جیادەکرێتەوە و لە لاییێکی دووەم لە چەند دەوڵەتێکی خاوەن پێوەندیی فیدراڵی پێکدێت، بەم جۆرەش لە دەوڵەتی یەکبوو جیا دەکرێتەوە»[٦٨].

و دەتوانین بڵێین کە ئەو پێناسانەی سەرەوە گرنگی دەدەنە ئەو دەوڵەتانە کە یەکیەتییەکە دادەمەزرێنن چونکە بەدەوڵەتیان لە قەڵەم دەدەن هەرچەندە کە دەوڵەتی یەکگرتوو پلەی لەوان بەرزتر و گرنگترە لە بەر پێویستییەکانی بەرێوەچوونی یەکگرتووەکە.

بەڵام بەرامبەر ئەوەش هەندێک هەن کە لە ڕۆڵی دەوڵەتە ئەندامەکان کەم دەکەنەوە هەر وەکو دکتۆر سموحي فوق العادة کە دەوڵەتی فیدراڵی پێناسە دەکاو دەڵێت «یەکیەتی ناوەندی بریتییە لە سیستەمێک کە بەپێی ئەو سیستەمە ئەندامەکان واز لە سەروەری و هەموو دەسەڵاتەکانی خۆیان دێنن بۆ دەزگایێکی ناوەندی کە هەڵدەستێت بەبەرێوەبردنی هەموو کاروبارە سەرەکییەکان وەکو سیاسەتی دەرەوە و بەرگری نیشتمانی و ئابووری و بازرگانی و پیشەسازی... هەتا دوایی و هەندێک دەسەڵاتی خۆجییەتی پەتی بۆخۆیان دەهێڵنەوە.»(٦٩). بێ گومان ئەو پێناسەیە زۆر دوورە لە واقیعدا لەبەرئەوەی هەموو مەسەلەکان بەدەوڵەتی یەکگرتوو دەسپێردرێت و مەسەلەی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان ناوەند و ویلایەتەکان ڕەچاو ناکات هەروەها گوێ ناداتە ئەو دەسەڵاتە یاسا دانان و کارگێرییانە کە لە ژێر سێبەری ئەو سیستەمە دەدرێنە حکوومەتەکانی ویلایەتەکان بەتایبەتی ئەگەر ئەوەشمان ڕەچاو کرد کە هەندێک لە سیستەمە فیدراڵییەکان وەکو ئەمەریکا و ئوسترالیا و سویسرا هەڵدەستێت بەدەست نیشانکردنی دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی یەکگرتوو لە کاتێکدا کە دەسەڵاتە بەجێماوەکان کە بە(Residuary Powers) ناو زەد کراوە بۆ دەوڵەتەکانی ئەندام بەجێ دێڵن.

ئەمەو پێناسەی بەندە بۆ فیدراڵییەت ئەوەیە کە ڕێکخستنێکی سیاسیی و دەستووری نێوخۆیی ئاوێتەیە بەو پێیە چەند دەوڵەتێکی ئەندام یاخود چەند ویلایەتێک دەچنە ژێر باری دەوڵەتێکی یەکگرتوو لە خۆیان بەرزتر و ئەو ڕێکخستنە دوو ڕووی هەیە یەکێکیان دەرەکییە کە یەکیەتییەکە وەک یەک دەوڵەت لە گۆڕەپانی سەروەری دەرەوە خۆی پیشان دەدات و ڕوویەکی نێوخۆییە کە بریتییە لە پێکهاتەی چەند قەوارەیێکی دەستووری کە بەشداری لە بەکارهێنانی سەروەری ناوەکی دەکەن»

لەبەرئەوە فیدراڵییەت ڕێکخستنێکی سیاسیی و یاساییە نەک گرێبەست بێت هەروەها ڕێکخستنێکی دەستوورییە نەک سیستەمێکی کارگێری جگە لەوەش ڕێکخستنێکی دەستووری نێوخۆییە نەک پەیماننامەی نێودەوڵەتی.

## ڕێچکەکانی دروستبوونی فیدراڵییەت:

لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەزموونە بەراوردکراوەکانی فیدراڵییەت دەتوانین بڵێین کە فیدراڵییەت بەیەکێک لەو دوو ڕێچکەی خوارەوە دروست دەبێت و سێیەمیشیان نییە[٧٠].

أ: یەکیەتی بەکۆکردنەوە یا بەهاتنە ناویەکتری (الاتحاد بالتجمع أو الانضمام)[٧١].

Federalisme Par agregation ou asso ciation

بەپێی ئەو ڕێچکەیە چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ یەک دەگرن یاخود دەچنە ناو یەکتری و یەک دەوڵەتێک کە لە دەوڵەتە ئەندامەکان بەرزترە دادەمەزرێنن و ئەوەش ڕێچکەیێکی ئاسایییە و زۆر کاری پێکراوە بۆ دروست بوونی یەکیەتی فیدراڵی[٧٢]. بەو ڕێچکەیە هەر یەک لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و سویسرا و کەنەداو ئوستراڵیا و ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا و کۆماری فایماری ئەڵمانی Viemar لە ساڵی ١٩١٩ و یەکیەتی باشووری ئەفەریقا دروست بوون[٧٣].

لەو فیدراڵییەتانەی کە بەو ڕێچکەیە دروست بوون تێبینی دەکرێت کە مافەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان بەشێوەییێکی ڕێژەیی زۆرترن لەبەرئەوەی ئەو دەوڵەتە ئەندامانەی کە فیدراڵییەت دادەمەزرێنن تەنها واز لە برێکی کەم و سنووردار لە دەسەڵاتەکانی خۆیان بۆ دەوڵەتی یەکگرتوو دێنن و بەو برەی کە پێویستە بۆ بەڕێوەچوونی یەکیەتییەکە لە کاتێکدا کە دەسەڵاتەکانی دیکە بۆ خۆیان دەهێڵنەوە بەواتایێکی دیکە هەوڵ دەدەن زۆر لە دەسەڵاتەکانی یەکیەتی کەم کەنەوە[٧٤].

ب- یەکیەتی بەلێکبوونەوە (الاتحاد بالتفكك)

Federalis me par segregation ou dissocition

بەپێی ئەو ڕێچکەیە یەکیەتی فیدراڵی لە ڕێگای لێکبوونەوەی دەوڵەتێکی یەکبووی سادە بۆ چەند دەوڵەتێکی ئەندام یاخود چەند ویلایەتێک بەڵام هەر لە ژێر سێبەری هەمان دەوڵەت کە دەبێتە دەوڵەتێکی ئاوێتە (مرکب) و بەم ڕێچکەیەش هەر یەکە لە فیدراڵییەکانی یەکیەتی سۆڤیێت و بەرازیل و ئەرجەنتین و مەکسیک و فەنزەویلا و کولومبیا و هند و مالیزیا و نایجیریا و یوغوسلافیای پێشوو دروست بوون چونکە ئەو دەوڵەتانەی سەرەوە دەوڵەتی یەکبوو و سادە بوون پێش ئەوەی سیستەمە سیاسییەکانی

خۆیان بگۆڕن بۆشێوازی یەکگرتووی ئاوێتە (مرکب) لە ڕێگای پێدانی سەربەخۆیێکی خودی بەو هەرێمانەی کە بەشێکن لەو دەوڵەتە لە ڕێگای ڕەخساندنی دەرفەت بۆیان کە لە بەشێک لە بوارەکان حوکمڕانی خۆیان بکەن و بەمەبەستی ڕێگاگرتن لە جیابوونەوەیان لە دەوڵەتەکە[٧٥].

بەڵام شایانی باسە لەو جۆرە سیستەمانەی فیدراڵی حکوومەتی یەکیەتی زیاترین ڕێژە لە دەسەڵاتەکان بۆ خۆیان هەڵدەگرن بەبەراورد لەگەڵ ئەو سیستەمانەی کە بەپێی ڕێچکەی یەکەم دادەمەزرێن چونکە ئەو فیدراڵییەتانەی کە بەلێکبوونەوە دادەمەزرێن هەرچەندە کە یەکە و ناوچە کارگێڕییەکان دەکەنە قەوارەی دەستووری بەڵام لەگەڵ ئەوەش کەمترین دەسەڵاتیان پێی دەسپێرن.

دەوڵەتی یەکگرتوو- بێجگە لەو ڕێچکانەی کە هەموو جۆرە دەوڵەتەکانی پێی هەڵدەوەشێنەوە وەکو نەمانی یەکێک لە کۆڵەگەکانی- بەد و ڕێچکە کۆتایی پێ دێت.

أ: جیابوونەوەی ویلاتەکان بەهۆی بوونیان بەدەوڵەتی سەربەخۆ.

ب: هەستانی دەوڵەتی یەکگرتوو بەگۆڕینی شێوەی خۆی بوو دەوڵەتێکی یەکبووی سادە بەم جۆرە دەوڵەتە ئەندامەکان و یا ویلایەتەکان لە قەوارەی دەستووری دێنە خوارەوە و دەبنە تەنها یەکە یاخود بەشی کارگێڕی[٧٦].

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی یەکەم

(1) Ursula k. Hicks, federalism, Failure and success, Acompartive study. the Mac milan press Ltd London first published 1978 page 15.

(2) Op. Cit Page 15.

(3) Op. Cit Page 15 .

(4) Op. Cit Page 15.

(5) Alexander Hamilton and James Madison and Jhon Jay The Fedealist, edited by Benjamin Fletcher wright The university press combridge massachusrtts 1966 No18 page 171

(6) Op. Cit No 18 Page 171.

(7) Op. Cit No 18 Page 171.

(8) Alexander Hamilton and James Madison and Jhon Jay, Op, Cit No 18 Page 172

(9) Op, Cit Page 172.

(10) Ursula H. Hicks, Op. Cit Page 16.

(11) Op Cit Page 16.

(12) Alexander Hamilton and James Madison and Jhon Jay Op. Cit Page 173.

(١٣) Ursula K. Hicks دەڵێت کە سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردن ناوی لێ نرابوو Strategos و هەڵدەستا بەسووڕاندنی کاروباری گشتی بەیارمەتی دە کەس کە پێیان دەگوترا Demiurgi و General و لەگەڵ ئەو شتێکیان پێک دەهێنا کە وەکو کابینە بوو و هەموو ئەو فەرمانبەرانەی کە لە گەڵی بوون بەبێ مووچە کاریان دەکرد. بڕوانە Ursula K. Hicks Op. Cit Page 17

(14) Alexander Hamilton and James Madison and Jhon Jay Op. Cit No. 18 Page 179.

(15) Op. Cit No 18 Page 174.

(١٦) James Madison دەڵێت نابێت لەسەر ئەوە وا لێکبدەینەوە کە بەبێ کێشەو ناکۆکی بوون، سەیری Op. Cit No 18 Page 174 بکە.

(17) Quoted From Op. Cit No 18 Page 174 .

(18) Ursula K. Hicks Op. Cit Page 17.

(١٩) Ursula K. Hicks دەڵێت هەندێک لە فیدراڵییەکانی یۆنانی بەرەهایی وازیان لەوە هێنابوو بەڵام ناوی ئەو فیدراڵییانەی نەهێناوە، بۆ ئەوە سەیری Ursula K. Hicks Op Cit Page 17 بکە.

(20) Op. cit Page .

(21) Alex ander Hamilton and James Madison and Jhon Jay No. 18 Page 173.

(22) Op. Cit No. 18 Page 173.

(23)Ursula K. Hicks Op. Cit Page 17.

(24) Op. Cit Page 17.

(٢٥) لەعنەتی ئیمپراتۆریەت بریتییە لە مەحرووومکردنی ئەندام لە مافەکانی سەروەری و دەست بەسەراگرتنی موڵکەکانی بۆ ئەوە بڕوانە

Alexander Hamilton and James madison and Jhon Jay, Op. Cit No. 18 Page 178

(26) Op. Cit No. 18 Page 178.

(27) Op. Cit No. 18 Page 178.

(28) Ursula K. Hicks, Op. Cit Page 17.

(29) Op. Cit Page 17.

(30) Op. Cit P age 17.

(31) Alexander Hamlton and James Madison and Jhon Jay Op. Cit No. 18 Page 178.

(32) William H. Riker, Federalism origin operation Significance Little, Brown and Company Boston and Toronto 1964 Page 8- 10.

(33) Alexandder Hamilton and James Madison and Jhon Jay Op. Cit No Page 182.

(34) William H Riker, Op. Cit Page 8-10.

(35) Op. Cit Page 8- 10.

(36) Alexander Hamilton and James Madison and Jhon Jay Op. Cit No 18 Page 183.

(37) Op. Cit No 18 Page 183.

(38) William H. Riker Op. Cit Page 8-10.

Alexander Hamilton and James Madison and Jhon Jay Op. Cit No 18 Page 185.

(39) William H. Riker Op. Cit Page 9.

(40) Naresh Chandra Roy, Federalism and LingwStic States Firma K. L. Muk hopadhyay, Calcuta 192 Page 8.

(41) Op. Cit Page 87- 88.

(٤٢) عارف حەمصانی- محاضرات في النظم السياسية- بەڕێوەبەرایەتی کتێب و چاپکراوە زانکۆیەکان ١٩٦٣- ١٩٦٤ل ٢٠٧.

(٤٣) سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٧- ٢٠٨.

(٤٤) سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٨.

(45) Ryad Azhari, Federalism, Thesis For obtaining M. A Degree in Political Sci ence From Amarican university OF Beirut 1952 Page 40

(46) Op. Cit Page 40.

(٤٧) حکوومەتی بەڕێوەبەرەکان بەردەوام بوو لە حوکمڕانی فەرەنسا لە ساڵی ١٧٩٥ هەتا ساڵی ١٧٩٩.

(٤٨) عارف حەمصانی- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٨.

Ryad Azhayi Op Cit Page Page 40.

(٤٩) عارف حەمصانی- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٨.

(50) Ryad Azhari, Op. Cit Page 42.

(٥١) عارف حەمصانی- سەرچاوەی پێشو ل ٢٠٨.

(52) Ryad Azhari, Op. Cit Page 42.

(53) Op. Cit Page 42.

(54) Op. Cit Page 43.

(٥٥) عارف حەمصانی- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٩

(56) Ursula H. Hicks Op. Cit Page 18.

(٥٧) عەبدولڕەحمان بەزاز دەڵێت فەرمانگەی زانستی زانستە کۆمەڵایەتییەکان Encyclopedia of the social science ئاماژە بەوە دەکا کە دەستەواژەی Federation تەماوییە و زۆر ڕاشکاو نییە و بەزۆری بەچوار واتا بەکاردێت ئەوانیش.

١- هاوپەیمانیەتی (تحالف Alliance)
٢- عصبە العصبە League
٣- دولەتە ڕێکەوتووەکان (الدول المتفقە) یاخود یەکیەتی کۆنفدرالی Confederation
٤- یەکیەتی فیدرالّی Federation بۆ ئەوە سەیری- عەبدولڕەحمان بەزاز- الدولە الموحدە والدولە الاتحادیە خانەی قەلەم- چاپی سێیەم ١٩٦٦ ل٦٧ بکە.

(58) Prestan King, Federalism and Political Thought, London Y Canbrra 1982 14- 77 .Page

(٥٩) د. محەمەد عەبدولعەزیز نەسر- فی النظریات والنظم السیاسیە- خانەی سەرهەڵدانی عەرەبی بۆ چاپەمەنی و بلاوکردنەوە- بەیروت ١٩٧٣- ل ٤٧٣

(60) Preston King Op. Cit Page 56.

(61) William H. Riker, Handbook of Political Science, Volume 5 Governmental institutions and Processes edited by Fred Greestien & Nelson W. P osby Page 99.

(62) L. oppenhiem, international Law, A Treatise Vol. I Peace Longman, Green and co London. Newyoyk, Toronto Eight Edition Edited by H. Lauter Pacht 1955 Page 175.

(٦٣) لە د. عوسام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٠ وەرگیراوە.

(٦٤) اندریە هوریو- القانون الدستوري والمؤسسات السیاسیة، وەرگێڕانی علي مقلد و شفیق حەداد و عەبدولحەسەن سەعد- خانەی ئەهلی بۆ بلاوکردنەوە و دابەشکردن. بەیروت ١٩٧٤ ل ١٥٢.

(٦٥) د. محەمەد طەی- القانون الدستوري والمؤسسات السیاسیة- چاپی یەکەم ١٩٦٤ ل ٩٧.

(66) William H. Riker, Handbook of Politicul Science Op. Cit Page 101.

(٦٧) وەرگیراوە لە د. میشال ڕەیاشی- إسهام فی الدراسە النظریە التقلیدیە للدولە الفدرالیە - دکتۆرا نامەیە پێشکەش بە کۆلیجی ماف و زانستە سیاسی و کارگێڕییەکان لە زانکۆی لوبنانی کراوە- بەیروت- چاپی یەکەم جلدی یەکەم ل ٢٤٩.

(٦٨) وەرگیراوە لە سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٤.

(٦٩) د. سموحی فوق العادە- القانون الدولی العام بەبێ عنوانی چاپخانە و ژمارە و ساڵی چاپ ل ١٤٥.

(٧٠) دکتۆر عوسمان خەلیل عوسمان و دکتۆر سلێمان محەمەد تەماوی/ المبادئ العامە والدستور المصری- چاپخانەی ئعتماد لە میسر چاپی ١٩٥١- ١٩٥٢ ل ٣٣ بەڵام دکتۆر غسان بەدرەدین و عەلی عواضە بەشێوەییێکی ناڕاستەخۆ باس لە ڕێچکەییێکی سێیەم دەکەن ئەویش گۆڕانی کۆنفدرالیەت بۆ فیدراڵیەت.

بۆ ئەوە سەیری دکتۆر غسان بەدرەدین و دکتۆر عەلی عواضە- المؤسسات السیاسیە والقانون

الدستوری- خانەی ڕاستی- بەیروت چاپی یەکەم ١٩٩٧ ل ٧٠- ٧١ بکە.

(٧١) دکتۆر اسماعیل غزال بەیەکیەتییێکی تێکەڵ بەیەکی ناو دەبا بەڵام یەکیەتی بەلیکترازان بەیەکیەتی جیابووەوە دادەنێیت.

بۆ ئەوە سەیری دکتۆر اسماعیل غزال- القانون الدستوری والمؤسسات السیاسیە- دەزگای زانکۆیی بۆ لێتۆژینەوە و بلاوکردنەوە و دابەشکردن- بەیروت چاپی یەکەم ١٩٨٢ ل ٩٩- ١٠٠ بکە.

(٧٢) دکتۆر مەحموود محەمەد حافظ- موجز القانون الدستوری- المبادئ العامە والدستور المصری- خانەی هزری عەرەبی- چاپخانەی لیژنەی بەیانی عەرەبی ١٩٥٦ل ٣٨ بکە.

دکتۆر شافعی محەمەد بەشیر- القانون الدستوری والنظم السیاسیە السودانیە- بەشی یەکەم- پرنسیپە دەستوورییە گشتییەکانی دەوڵەت و شێوەکانی بکە.

دکتۆر ئیبراهیم عەبدولعەزیز شیحا- الوجیز فی النظم السیاسیە والقانون الدستوری- لێتۆژینەوەیەکی وردی دەستووری لوبنانی خانەی زانکۆیی بەیروت ل ٧٤ بکە.

(٧٣) یەکیەتی باشووری ئەفریقیا لە ساڵی ١٩٠١ لە یەکگرتنی هەر چوار کە بریتین لە کاب و ناتال و اورانج رایغر وترانسفالن پێکهات و لە کاتێکدا زۆربەی زۆری نووسەرانی یاسای دەستووری بۆ ئەوە دەچن کە یەکیەتی باشووری ئەفریقیا بەیەکیەتێکی فیدراڵی لە قەڵەم دەدەن زانا Wheare ئەو شتە ڕەت دەکاتەوە و دەڵێت باشووری ئەفریقیا فیدراڵی نییە بەڵکو دەوڵەتێکی سادەی خاوەن سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕییە بەشێوەیێکی فراوان.

بۆ ئەوە سەیری K. C. Wheare, Fedral Government, Oxford University Press, London, Newyork, Toyonto, Fedition 1967 Page 24.

(٧٤) دکتۆر کمال غالی- مبادئ القانون الستوری والانظمە السیاسیە- چاپخانەی زانکۆی دمەشق چاپی دووەم ١٩٦٧- ١٩٦٨ل ٩١.

(٧٥) دکتۆر شافعی محەمەد بەشیر- القانون الدستوری والنظم السیاسیە السودانیە سەرچاوەی پێشوو ل ١١٣.

دکتۆر مەحموود حلمی المبادئ الدستوریە العامە خانەی هزری عەرەبی- قاهیرە ١٩٦٤ ل ١٦٢.

(٧٦) دکتۆر ئیبراهیم عەبدولعەزیز شیحا- الوجیز فی النظم السیاسیە والقانون الدستوریَ- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٥.

دکتۆر مەحموود حلمی- سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٣.

ئاخافتنی دووەم

## خەسڵەتەکانی سیستەمی فیدراڵی

دەوڵەتی فیدراڵی Federal state[١] بەوە جیا دەکرێتەوە کە چەند سیما و تایبەتمەندیی دیاریکراو بەخۆوە دەگرێت بەو پێیەی کە یەکێکە لە ڕێکخستنەکانی یاسای دەستووری، و بۆ پیشاندانی وێنەیێکی ڕاشکاوتر بۆ ئەو سیستەمە وا باشە کە لە خوارەوە باس لە خەسڵەتەکانی بکەین.

**یەکەم: بوونی دەستوورێکی نووسراو:**

چونکە یەکیەتی فیدراڵی ڕێکخستنێکی یاسایی نێوخۆییە ئەوە بەپێی دەستوور دروست دەبێت و مادامەکی دەستووری یەکیەتی فیدراڵی بەشێوەیێکی گشتی دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکانی ئەندامی تێدایە و ئەو کارە وا ئیجاب دەکات ئەو دابەشکردنە ورد و جێگیربێت و ئەگەری جیاوازیی و ئاڵۆزیی تێدا نەبێت لە کاتی پیادەکردنی پراکتیکیدا و بەکارهێنانی حکوومەتەکان بۆ دەسەڵاتەکانیان بۆیێ پێویستە ئەو دەستوورە نووسراوبێت.

یاسازان ویر Wheare دەڵێت مادامەکی دەقەکانی ئەو ڕێکەوتنە لە ئاستێکی گرنگدان بۆیە پێویستە بخرێنە بواری نووسین و ئەوەش هەرچەندە لە ڕوویێکی تیۆریدا مەرج نییە بەپێی پرنسیپی فیدراڵی بەڵام لە لایەنی پراکتیکیدا دەبێت قبوڵی پێویستی ئەو کارە بکەن[٢].

یاسا زان دایسی Dicey وا پیشان دەدات کە دامەزراندنی ڕێکخستنێک لەم جۆرە لەسەر شێوازی؛ لە یەک حاڵی بوون و داب و نەریت هەر دەبێت لە ئەنجامدا جۆرانێک لە یەک حاڵی نەبوون و ناکۆکی دروست بکات بۆیە بەندەکانی پەیماننامە یا بەواتاییێکی دیکە بەندەکانی دەستوور دەبێت بەنووسین تۆمار بکرێن[٣].

هەندێک لە نووسەرانی یاسایی دەستووری عەرەب بۆ ئەوە دەچن کە دەستووری نووسراو پێویستێکی لۆجیکی دەوڵەتی فیدراڵییە[٤] و سەبارەت بەبواری واقعی و پراکتیکیدا دەبینین کە ئەو یەکیەتییە فیدراڵییانەی لە جیهان دروست بوون و لەوەتەی دامەزراندنی

یەکەم فیدراڵییەتی تازە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ساڵی ١٧٨٧ هەموویان لە دایکبووی دەستووری نووسراون و زانیاریمان وەرنەگرتووە کە هیچ فیدراڵییەتێکی سەردەم بەبێ دەستووری نووسراو دروست بوو بێت بەڵکو دەشبینین کە هەندێک لەو دەستوورانە زۆر درێژە دەدەنە باسکردنی وردەکارییەکانی ڕێکخستنی دەستووری و لەوانەش دەستوورەکانی یەکیەتی سۆڤییێتی پێشوو کە لە ساڵەکانی ١٩٣٦ ، ١٩٧٧ دەرچوون و دەستووری ئەڵمانیایی یەکگرتووی ساڵی ١٩٤٩و دەستووری یوغوسلافی کە لە ساڵی ١٩٦٣ دەرچووە و دەستوور هندی ساڵی ١٩٥٠.

**دووەم: بەرزیی دەستوور:**

دەبێت دەستووری دەوڵەت بەرزترین یاسا بێت لە وڵات و ئەوەش وەکو یاسا زان وییر Wheare دەڵێت ئەوە دەگەینێت کە مەرجەکانی ئەو ڕێکەوتنەی[٥] کە حکوومەتە یەکگرتووەکە و حکوومەتە هەرێمییەکان دامەزرێنێت و دەسەڵاتەکان لە نێوانیان دابەش دەکات دەبێت ملزم بێت بۆ هەریەکێک لەو جۆرە حکوومەتانە[٦]. ئەگەر بێت و ئەرکی حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکان ئەوەبێت کە هاوتەریب بن لە نێوان خۆیاندا ئەوە دەبێت هەریەکێک لەوانە لە ئاستێکی وانەبێت کە بتوانیت دەقەکانی ئەو ڕێکەوتنە کە تایبەتن بەدەسەڵات و ئەو پلەوپایەی لایەکەی دیکە هەیەتی پووچەڵ بکاتەوە و لەو سنوورەی کە ئەو ڕێکەوتنە پێوەندییەکانی ئەو حکوومەتانە و دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوانیاندا ڕێک دەخات دەبێت بەرز Supreme بێت[٧]، بەڵام سەبارەت بەمەسەلەکانی تر کە کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆی نییە بەسەر پێوەندییەکانی بەرامبەر و پلەوپایەی حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکان ئەوە بەرزی دەستوور پێویست نییە[٨].

پرنسیپی بەرزی دەستووری فیدراڵی لە زۆر حاڵەت و بۆنەی جیاواز پیادەکراوە. لەم میانە ماددەی شەش لە دەستووری ئەمەریکی ساڵی ١٧٨٧دەڵێت «ئەو دەستوورە و یاساکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان کە لە ڕۆشنایی ئەو دەردەچن دەبێت یاسای بەرزی وڵات بن و دادوەرەکان بەم کارە پابەند دەبن هەرچەندە دەستوور و یاسای ویلایەتەکان بەپێچەوانەی ئەوە بن»[٩].

لە سویسرا و بۆ چرکەی یەکەم وا بەدیار دەکەوێت کە مەسەلەی بەرزی دەستوور

جەختێکی کەمتری لەسەر کراوە چونکە ئەو یاسایانەی لە کۆمەڵەی یاسادانان دەردەچن بەشەرعی دادەندرێن بەڵام ئەوە نابێ وا ڕاڤە بکرێت کە کۆمەڵەی ناوبراو دەسەڵاتێکی بەرزتری هەبێت لە دەستوور چونکە ئەو ناتوانێت دەستوور هەموار بکات[١٠].

**سێیەم: نەگۆڕیی دەستوور:**

بێ گومان پێویستییێکی زۆر هەیە کە دەستووری یەکیەتی فیدراڵی نەگۆڕبێت چونکە وەکو پێشتر باسمان لێوەکرد ئەو دەستوورە هەڵدەستێت بەدەست نیشانکردنی دەسەڵاتەکانی هەریەکێک لە حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان، و دەرفەت ڕەخساندن بۆ هەموارکردنی ئەو دەستوورە بەرێچکە ئاساییەکان کەوا لە زۆربەی دەوڵەتە یەکبووەکان کاریان پێ دەکرێت- لە وانەیە دەسەڵات و سەربەخۆیی دەوڵەتە ئەندامەکان بخاتە بەر لەرزۆکی و مەترسییێکی خەتەرناک هەروەها دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی قەبارەکەیان و بۆرێگە گرتن لەو مەترسییانە دەبێت دەستووری وڵات لە ئاستێکی نەگۆڕی و سەقامگیری بێت ئەوەش بەوە جێبەجێ دەبێت کە دەسەڵاتی هەموارکردنی بەشێوەیێکی تاکڕەوی و سەربەخۆ نەدرێتە حکوومەتی یەکگرتوو یاخود حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان[١١] هەر ئەوەندەش نا بەڵکو هەندێک هەن بۆ ئاقارێکی لەوە دوورتر دەچن کە یاسای دەستوور یا قابلی گۆڕان نەبێت یاخود ئەو گۆڕانە تەنها لە ڕێگای لایەنێکی بەرزتر بێت واتە لەسەرووی دەزگا ئاساییەکانی یاسا دانان بێت ئینجا چ، دەزگای یاسا دانانی فیدراڵی بێت یاخود هی ویلایەتەکان بن[١٢]. و هەندێکی دیکە دەڵێن ئەوەی شتی کاکڵەیی بێت لە حکوومەتی فیدراڵی ئەوەیە کە دەسەڵاتی هەموارکردنی دەستوور- هەتا ئەو ڕادەییەی کە بەلای کەمەوە پێوەندی بەمەرج و دەقەکانی دەستوورەکە هەیە کە پلەو دەسەڵاتەکانی حکوومەتی ناوەند و حکوومەتە ئەندامەکان هەیە- نەدرێتە حکوومەتی یەکیەتی یاخود حکوومەتە هەرێمییەکان بەتەنها و بەشێوەیێکی تاکڕەوی[١٣]. چونکە ئەگەر هات و تەنها لایێکیان دەستی بەسەر ئەو دەسەڵاتە گرت ئەوە دەرفەتی بۆ دەرەخسێت بۆ ئەوەی لە دەسەڵاتەکانی لایەکەی دیکە کەم کاتەوە. و لە لایەنی لوجیکیدا گرنگ نییە دەسەڵاتی هەموارکردنی دەستوور بە کێ بسپێردرێت بەڵام گرنگ ئەوەیە کە حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکان یاخود گەلەکانیان بەشدار بکرێن[١٤]. و لە پراکتیک و پیادەکردندا دەبینین کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەو پرنسیپەی بەشێوەیێکی ورد و تەواو پیادە کردووە چونکە پێشنیاری هەموار کردنە دەستوورییەکان

دەبێت لە ڕێگای دوو لەسەر سێی هەردوو ئەنجوومەنی کۆنگرس بێت یاخود لە ڕێگای کۆنگرەیێک کە کۆنگرس بانگەشەی بۆ دەکا و ڕێکی دەخا لەسەر داواکاری دوو لەسەر سێی دەزگاکانی یاسا دانانی ویلایەتەکان ئەنجام دەدرێت و ئەو هەموارکردنە دەستوورییانە ناخرێنە بەر کار هەتا دەزگاکانی یاسا دانان لە سێی لەسەر چواری ویلایەتەکان یاخود سێی لەسەر چواری ئەو کۆنگرانەی کە لە ویلایەتەکان بۆ ئەم مەبەستە دەبەسترێن پەسەندی نەکەن[١٥]. هەروەها لە دەقی دەستووری ئەمەریکیدا هاتووە کە نابێت هیچ هەموار کردنێک لەسەر سنووری ویلایەتەکان بکرێت بەبێ ڕەزامەندی دەزگای یاسا دانان لە ویلایەتی پێوەندار و کۆنگرس[١٦].

لە سویسرا هەموارکردنە دەستوورییەکان لە لایەن هەردوو ئەنجوومەنی دەسەڵاتی یاسا دانانی فیدراڵی- و لە هەندێ جار لە لایەن یەکێکیان- یاخود لە لایەن (٥٠٠٠٠) پەنجا هەزار هاوڵاتی پێشنیار دەکرێن و هەر چۆنێک بێت ئەو هەموار کردنە دەستوورییانە ناخرێنە بەر کار هەتا نەدرێنە ڕیفراندۆم (استفتاء) و زۆرینەی دەنگدەران کە مافی هەڵبژاردنیان هەیە لەسەر ئاستی یەکیەتی و زۆرینەی دەنگدەران لە زۆرینەی کانتونەکانی سویسرا ڕەزامەندی لەسەر نەکەن[١٧].

لە ئوسترالیا هەموارکردنە دەستوورییەکان لە لایەن هەردوو ئەنجوومەنی دەسەڵاتی یاسا دانانی فیدراڵی- یاخود لە لایەن یەکێکیان لە هەندێ حاڵەتی دیاریکراو- و بەزۆرینەی ڕەها و لە دوای ئەوە هەموار کردنەکان دەخرێنە بەر ڕیفراندۆمێکی گشتی (استفتاء عام) و دەبێت زۆرینەی دەنگدەران کە مافی هەڵبژاردنیان هەیە لەسەر ئاستی یەکیەتی و زۆرینەی دەنگدەرانی زۆرینەی ویلایەتەکانی ئوسترالیا ڕەزامەنزی لەسەر بکەن[١٨]. بێجگە لەوەی پێشەوەش- هەر هەموارکردنێک کە ببێتە هۆی کەمکردنەوەی قەبارەی نوێنەرایەتی هەر ویلایەتێک لە هەر کامێک لە هەردوو ئەنجوومەنی یاسا دانان یاخود کەمکردنەوەی نزمترین ئاستی نوێنەرانی هەر ویلایەتێک لە ئەنجوومەنی نوێنەران یاخود زیادی و کەمی و هەروەها لە حاڵەتی دیکە گۆڕینی سنووری ویلایەتەکان یاخود دەست تێوەردان بەهەر ڕێگاییێک لە مەرجەکانی دەستوور کە پێوەندی بەوانەی سەرەوە هەیە نابێتە یاسا هەتا زۆرینەی دەنگدەرانی ویلایەتی پێوەندار کە مافی هەڵبژاردنیان هەیە ڕەزامەندی لەسەر پێشان نەدەن[١٩].

لە وڵاتی هند دەستوورەکەی مەسەلەکانی بۆ دووبەش دابەش کردووە کە بەشی یەکەمیان

بریتییە لە چۆنیەتی هەڵبژاردنی سەرۆک کۆمار و سنوورەکانی دەسەڵاتەکانی کارگێڕی و دەزگا دادوەرییەکان لە حکوومەتی یەکیەتی و لە ویلایەتەکان و هەروەها لەو لیستانەی کە دەسەڵاتەکانی حکوومەتی یەکیەتی و حکوومەتەکانی ویلایەتەکان دەستنیشان دەکەن و لە کۆتاییدا پێوەندییەکانی یاسا دانان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و ویلایەتە جۆراوجۆرەکان و چۆنیەتی نوێنەرایەتی کردنی ویلایەتەکان لە پەرلەمانی یەکگرتوو. لە کاتێکدا کە هەموو مەسەلەکانی دیکە لە بەشی دووەمدا هاتووە و ئەگەر ویسترا هەر کامێک لە مەسەلەکانی بەشی دووەم لە دەستوور هەموار بکرێت ئەوە تەنها پێشکەشکردنی پێشنیارێک بەو واتایە و ڕەزامەندی زۆرینەی ڕەهایی هەموو ئەندامانی هەردوو ئەنجوومەن بەشێوەیێک کە لە دوو لەسەر سێی بەشداربووەکان کەمتر نەبێت. بەڵام سەبارەت بەو مەسەلانەی کە لە بەشی یەکەم هاتوون ئەوە دەستوور هەموار ناکرێت هەتا نیوەی ویلاتەکانی هندی ڕەزامەندی لەسەر نەکەن[٢٠].

بەڵام لە لایێکی دیکەوە دەبینین کە هەندێک دەستووری فیدراڵی لەسەر ئەو ڕێڕەوەی سەرەوە نەڕۆیشتن بەڵکو لەسەر ڕێڕەوی دەوڵەتە یەکبووەکان ڕۆیشتن بەواتاییێکی دیکە ڕێچکەی نەرمیان گرتە بەر لە گۆڕینی دەستووری فیدراڵی بۆ نموونەش لە یەکیەتی سۆڤییێتی پێشوو دەستووری ساڵی ١٩٧٧وای تێدا هاتبوو کە تەنها سۆڤیاتی باڵا (السوفیات الاعلی) لە یەکیەتی سۆڤییێت دەسەڵاتدارە بەدانانی دەستووری یەکیەتی سۆڤییێت و هەموارکردنی و قبوڵ کردنی کۆمارە تازەکان لە یەکیەتی سۆڤییەت و دانان بەدامەزراندنی کۆماری تازەی خاوەن ئۆتۆنۆمی و هەرێمی تازەی خاوەن ئۆتۆنۆمی[٢١]. بەم جۆرەش دەبینین کە دەسەڵاتی هەموارکردنی دەستوور پاوان کراوە تەنها بۆ دەسەڵاتی یاسادانانی یەکگرتوو و هیچ ڕۆڵێک بەدەوڵەتە ئەندامەکان نەدراوە.

هەروەها دەبینین کە دەستووری فیدراڵی یوغسلافی لەسەر ڕێڕەوی دەستووری سۆڤییێتی ڕۆیشتووە لە دەسەڵاتدان بەدەزگا یەکگرتووەکان بەهەموارکردنی دەستوور چونکە تێیدا هاتووە «یەکگرتوو تایبەتمەندە بەدەرکردنی یاساکانی تەواو و بنچینەیی و گشتی کەوا پێویستە بۆ بەکارهێنانی ماف و ئەرکەکانی کەوا لە دەستوور هاتوون»[٢٢] هەروەها تیایدا هاتووە «یەکگرتوو نەک لایێکی دیکە تایبەتمەندە لەو بوارانە و لە بوارەکانی دیکە کە مسؤولیەتی ڕاستەوخۆ بەپێی ئەو دەستوورە دەکەوێتە ئەستۆی بەدانانی یاساکان و بنەماکانی دیکە و جێبەجێ کردنیان بەشێوەییێکی ڕاستەوخۆ[٢٣]

**چوارەم: دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان**

یەکێک لە سیما سەرەکییەکان کەوا سیستەمی فیدراڵی لە سیستەمەکانی دیکە جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە بەپێی دەقەکانی ئەو دەستوورەی کە یەکیەتی فیدراڵی دادەمەزرێنێت دەسەڵاتەکانی حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی ویلایەتەکان واتە دەوڵەتە ئەندامەکان دەستنیشان دەکرێن و ئەو لایەنەش گرنگترین مەسەلەیە لە دەقەکانی دەستووری فیدراڵی بەڵکو بەکاکڵەی دەستوورەکە دەژمێردرێت[٢٤]. ئەو مۆرکەش گرنگترین شتە کە یەکیەتی فیدراڵی لە سیستەمەکانی لامەرکەزییەتی کارگێڕی لە دەوڵەتی یەکبوو جیا دەکاتەوە چونکە لەو سیستەمانە باس لە تایبەتمەندی و دەسەڵاتەکانی ناوچە لامەرکەزییەکان لە دەوڵەتی یەکبوو لە دەقەکانی دەستوور ناکرێت بەڵکو لە ڕێگای یاسا ئاساییەکان دەسەڵاتیان پێ دەدرێت.

جیاوازی لە نێوان دەوڵەتە یەکگرتووەکان لە چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان ناگەڕێتەوە بۆ هۆی یاسایی هێندەی کە دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخ و هۆکارە سیاسی و پراکتیکییەکان چونکە هەر دەوڵەتێکی یەکگرتوو بارودۆخی سیاسی تایبەتمەندی خۆی هەیە بەواتایێکی دیکە هەلومەرجی خۆی هەبووە کە کاریگەرییان هەبووە لە کاتی دامەزراندنی یەکیەتییەکە و بۆ دیارخستنی ڕۆڵی ئەو هۆکارانەو مەودای گرنگیان لە بواری دابەشکردنی دەسەڵاتەکان ئاماژە بۆ ڕێچکەی دامەزراندنی دەوڵەتە یەکگرتووەکە دەکەین و چۆنیەتی کارکردنی لە بواری دابەشکردنی دەسەڵاتەکان و ئەگەر ئەو دەوڵەتە لە ئەنجامی پێکهاتنی چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ بەڕێچکەی چوونە پاڵ یەکتر دامەزرابوو ئەمە بەزۆری وا دەکات کە دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی یەکگرتوو تەسک بکرێتەوە لەبەر هۆیێکی سادە کە بریتییە لەوەی کە دەوڵەتە سەربەخۆیەکان گەورەترین بەش لە سەربەخۆیی و دەسەڵات بۆخۆیان دەهێڵنەوە و قبووڵیش ناکەن تنازولاتێکی زۆر بکەن لە بواری سەربەخۆییان بەڵکو تەنها تەنازول لە دەسەڵاتەکانیان بەو ڕادەیە دەکەن کەوا پێویستە بۆ دامەزراندنی یەکیەتی[٢٥]. بەڵام چۆنیەتییەکە بەپێچەوانە دەبێت ئەگەر هات و دەوڵەتی یەکگرتوو لەڕێگای لێکبوونەوەی دەوڵەتێکی یەکبوو هاتەدی چونکە لەو حاڵەتە حکوومەتی یەکگرتوو گەورەترین ڕادە لە

دەسەڵاتەکان بۆ خۆی دەهێڵتەوە لەبەرئەوەی پێشتر هەموو دەسەڵاتەکان لە چنگی خۆی دابوو[٢٦]. هەلومەرجی پەیدابوونی دەوڵەتی یەکگرتوو بەهەر جۆرێک بێت ڕێچکەکانی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان لەو سێ ڕێچکەی خوارەوە دەرناچێت.

ڕێچکەی یەکەم:

بەپێی ئەو ڕێچکەیە دەستووری یەکگرتوو تایبەتمەندی و دەسەڵاتەکانی حکوومەتی یەکگرتوو یەک بەیەک و بەشێوەیێکی تەواو دەستنیشان دەکات و ئەوەی لە دەستوورەکە دەقی پێ نەهاتووە واتە دەسەڵاتە بەجێماوەکان Residuary Power دەبێتە دەسەڵات و تایبەتمەندی حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان شایانی باسە کە هەریەکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و سویسرا و ئوسترالیا و مەکسیک و ئەرجەنتین و یەکیەتی سۆڤیێتی پێشوو بەو ڕێچکەیان وەرگرت و هەمواركردنی دەیەم لە دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەڵێت «ئەو دەسەڵاتانەی لە لایەن دەستوور نەدراوەتە ویلایەتە یەکگرتووەکان و هەروەها لە لایەن ئەویش- واتە دەستوور- قەدەغە نەکراون لەسەر ویلایەتەکان دەبنە دەسەڵاتی ویلایەتەکان بەڕوویێکی تایبەت یاخود گەل»

(The Powers not delegated by the constitution to the united states, nor Prohibited by it to the states are reserved to the states Respectivly, or to the People)

و ڕەخنە لەو ڕێچکەیە دەگیرێت بەوەی کە بەشێوەیێکی زەق و ئاشکرا دەبێتە هۆی لاوازبوونی دەسەڵاتەکانی حکوومەتی یەکگرتوو و هەندێک دەڵێن[٢٧] کە هەرچەندە هەندێک دەستوور ئەو ڕێچکەیان پێڕەو کردەوە بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کە بەو ڕێچکەیان وەرگرتووە لە واقع بەپێچەوانە دەڕۆن و ئەو دەوڵەتانە پەنایان بردووتە بەر فراوانکردنی دەسەڵاتەکانی یەکگرتوو لەسەر حسێبی دەسەڵاتەکانی ویلایەتەکان.

ڕێچکەی دووەم:

بەپێی ئەو ڕێچکەیە و بەپێچەوانەی ڕێچکەی یەکەم تایبەتمەندی و دەسەڵاتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان یەکە یەکە دەستنیشان دەکرێت و بەم جۆرەش دەسەڵاتەکانی حکوومەتە ئەندامەکان باستثناء دادەندرێت و دانانی دەسەڵاتەکانی حکوومەتی یەکگرتوو بەبنچینە[٢٨].

و ڕەخنە لەو ڕێچکەیە دەگیرێت کە دەبێتە هۆی بەهێزکردنی پلەوپایەی حکوومەتی یەکگرتوو و ئەگەر زیادە ڕۆیی لە بەکارهێنانی ئەو ڕێچکەیە کرا بۆ کۆتایی دەبێتە هۆی گۆڕانی دەوڵەتی یەکگرتوو بۆ دەوڵەتێکی یەکبوو[٢٩]. لەبەرئەوەش ئەو ڕێچکەیە باوێکی وای نەبوو و دەستووری کەنەدی پێی وەرگرت[٣٠]. هەروەها دەستووری فەنزەویلا کە لە ساڵی ١٩٥٣ دەرچووبوو بەم ڕێچکەیەی وەرگرت[٣١].

ڕێچکەی سێیەم:

بەپێی ئەو ڕێچکە دەستووری یەکیەتی دەسەڵاتەکانی هەریەکە لە حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان دەستنیشان دەکات[٣٢] و ڕەخنە لەو ڕێچکەیە دەگیرێت کەوا یاسا دانەر (مشرع) لە چ ئاستێکی وردەکاری بیت و چەند فراوان بین بێت هەموو ئەو دەسەڵاتانەی کە دەدرێنە حکوومەتی یەکیەتی و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان بەخەیاڵ نایێت کە باسیان بکات و هەر دەبێت دەسەڵاتی تازە بەدەرکەوێت کە لە دەستوور بوونیان نییە و لەوکاتیشی کێشەی دیارکردنی ئەو لایەنە کە دەتوانێت ئەو دەسەڵاتە بەکاربێنێت دێتە ئارا[٣٣] و ئەمەش ئیجاب دەکات کە دەزگاییێکی دەستنیشانکراو دابنرێت بۆ دیارکردنی لایەنی خاوەن دەسەڵات لەو مەسەلانەی کە لە دەستوور نەهاتوون[٣٤].

ئەمە لە لایێک و لە لایێکی دیکە ئەو دەستنیشانکردنەی کە بەپێی ئەو ڕێچکەیە دەکرێت ڕەنگە لە داهاتوودا دژ بەبەرژەوەندی گشتی وڵات بێت ئەگەر هات و بارودۆخێکی تازە هاتەپێش بەجۆرێک کە هەندێک لەو مەسەلانەی لە تایبەتمەندییەکانی ویلایەتەکانن لە دەستووری یەکگرتوو بینە مەسەلەی خاوەن گرنگی نیشتمانی هاوبەش کەوا إیجاب دەکات بێنە نێوان تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی یەکگرتوو[٣٥].

## پێنجەم: دوانەی دەسەڵاتی یاسادانانی یەکگرتوو:

مەسەلەی دوانەی دەسەڵاتی یاسا دانانی یەکگرتوو بەواتایێکی دیکە پێکهاتنی پەرلەمانی یەکگرتوو لە دوو ئەنجوومەن یەکێکە لە لایەنە چاکەکانی سیستەمی فیدراڵی لەبەرئەوەی یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ئەو سیستەمە کارامە دەکا[٣٦]. هەروەها شێوازی دوو ئەنجوومەن لەگەڵ سروشتی پێکهاتەی یاسایی و سیاسی دەوڵەتی فیدراڵی دەگونجێت و یەکەمیان ئەنجوومەنی باڵایە (المجلس الاعلی Upper House) و ئەویش نوێنەرایەتی

کانتون یاخود ویلایەت یا هەرێمەکانی ئەندام لە یەکیەتی دەکات. لە کاتێک کە ئەنجوومەنەکەی دیکە ئەنجوومەنی خواروو المجلس الادنی Lower house و بەئەنجوومەنی گەل یا نوێنەران ناو دەنرێت و نوێنەرانی گشت دانیشتوانی وڵات دەکات و بەپێی ڕێژەی دانیشتوان.

و لە کاتێکدا کە ئەندامانی ئەنجوومەنی خواروو لە لایەن دانیشتوانی کانتونەکان یاخود ویلایەتەکانی ئەندام و بەپێی ژمارەی دانیشتوانیان هەڵدەبژێردرێن ئەوەش دەبێتە هۆی جیاوازی ژمارەی نوێنەرانی دەوڵەتێکی ئەندام لەگەڵ دەوڵەتێکی ئەندامی تر ئەمە لەکاتێک کە نوێنەرانی دەوڵەتە فیدراڵییەکان یەکسان دەبن لە ئەنجوومەنی باڵا[٣٧] و ئەو ڕێکخستنە دوانەیە بۆ ئەوە هاتووە کە مەترسییەکانی ویلایەتە بچووکەکان بڕەوێنێتەوە لەوەی کە دانیشتوانی ئەو ویلایەتانە کەمن بۆیێ نوێنەریان لە ئەنجوومەنی نوێنەران کەم دەبێت ئەوەش مەترسییان لا پەیا دەکات کە ببنە قوربانی بەرژەوەندیی ویلایەتە گەورەکان. هەروەها ئەو ڕێکخستنە لە بواری یاسا دانان لەوانەیە دەرفەتێکی گونجاو بۆ دەوڵەتە ئەندامە بچووکەکان بڕەخسێنێت بۆ خستنە ڕووی بەرژەوەندی و هزرەکانیان و بەشێوەیێکی کاریگەر لەو حاڵەتانەی کە بەرژەوەندییە هەرێمییەکان لە کێشەکانی سیاسەتی دەرەوە و مەسەلە ئابوورییەکان و بابەتەکانی دیکە جیاوازیان لە نێوان پەیا دەبێت. بۆ نموونە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تێبینی دەکرێت کە(٧) حەوت ویلایەتی شاخاوی کە بریتین لە ئەریزونا، ئیداهو، مونتانا، نیڤادا، مەکسیکۆی تازە، ئوتاما، وایومنگ تەنها (١٢) دوانزە نوێنەریان لە ئەنجوومەنی خواروو (نوێنەران) هەیە لە کاتێک کە (١٤) چواردە سیناتۆریان لە ئەنجوومەنی باڵا (پیران) هەیە بەرامبەر ئەوانەش (٧) حەوت ویلایەتی پیشەسازی (١٧٤) سەد و حەفتا و چوار نوێنەریان لە ئەنجوومەنی خواروو (نوێنەران) هەیە لەوکاتەی کە تەنها (١٤) چواردە سیناتووریان لە ئەنجوومەنی باڵا (پیران) هەیە.

و هەندێک هەن[٣٨] بەرهەڵستی ئەو بۆچوونە دەکەن کە دوانەی دەسەڵاتی یاسا دانان مۆرکێکی دەوڵەتی فیدراڵییە و دەڵێن هەندێک دەوڵەتی یەکبوو هەیە سیستەمی دوو ئەنجوومەنی پێڕەو کردووە وەکو بەریتانیا و فەرەنسا و سوید و نەمسا هەروەها دەڵێن هەندێک دەوڵەتی فیدراڵی وەکو پاکستان و کامیرون سیستەمی دوو ئەنجوومەنیان پێڕەو نەکردووە و ئەنجوومەنی دووەم لە یوغسلافیا هەتا ئێستا بوونی نییە بەڵام ئەم بۆچوونە قبوڵ ناکرێت چونکە زۆربەی زۆری دەوڵەتە فیدراڵییەکان و هەموو فیدراڵییە دێرین و

تۆکمەکان سیستەمی دوو ئەنجوومەنی یاسا دانانیان پێڕەو کردووە، ئەمە لە لایێک و لە لایێکی دیکە مەبەست لە پێڕەوکردنی ئەو سیستەمە لە دەوڵەتی فیدراڵی بۆ پیادەکردنی پرنسیپی بەشداریکردنی دەوڵەتە ئەندامەکان لە دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی یەکگرتوو لەکاتێک کە ئەو پرنسیپە بوونی نییە لەو دەوڵەتە یەکبووانەی کە دوو ئەنجوومەنیان پێڕەوکردووە.

**شەشەم: بوونی دادگاییکی دەستووری:**

دەستووری فیدراڵی وەکو پێشتر باسمان لێوەکرد و لە دەقەکانی خۆیدا مەسەلەی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان و تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکانی تێدا هاتووە ئەم کارەش وا ئیجاب دەکات کە هەر لایێک دەسەڵاتەکانی خۆی بەپێی دەستوور بەکاربێنیت و دەستدرێژی نەکاتە سەر دەسەڵاتەکانی لایەنەکانی دیکە، ئەمەش لە بواری پراکتیکدا دەبێتە هۆی پەیابوونی ناکۆکی دەستووری و دەبێت ئاماژە بەوەش بکەین کە پێوەری سیستەمی فیدراڵی تەنها لە چوارچێوەی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکان ناخولێتەوە بەڵکو دەبێت پیادەکردن و ڕاڤەکردنی ئەو دابەشکردنە نەسپێردرێت بەحکوومەتی یەکگرتوو بەتەنها یاخود بەحکوومەتە هەرێمییەکان بەتەنها و بەواتاییکی دیکە دەبێت قسەی کۆتایی و بڕیاری یەکلاکەرەوە لە مەڕ ڕاڤەکردنی دەقەکانی دەستوور کە پێوەندارن بەدابەشکردنی دەسەڵاتەکان بەشێوەییێکی تاکڕەوی لە دەست لایێک لە هەریەکە لە حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکان نەبێت(٣٩).

لەو بنچینانەی سەرەوە کە لە پرنسیپی فیدراڵی هەڵقولاون و بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئامانجەی کە لە پیادەکردنی ئەو پرنسیپە ڕەچاو دەکرێت پێویستی هەبوونی دامەزراوێکی دەستووری بێ لایەن (مؤسسة دستورية محايدة) دێتە پێش بۆ ئەوەی هەستێت بەڕاڤەکردنی دەستووری فیدراڵی و چارەکردنی ناکۆکییە دەستوورییەکان کە لە ئەنجامی پیادەکردنی براکتیکی لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکان یاخود لە نێوان حکوومەتە هەرێمییەکان بەخۆیان پەیا دەبێت. ئەوەش ڕاستی وتووە کە دەڵێت دەستوور بەبێ یارمەتی و پشتگیریی دەزگای دادوەری فیدراڵی وەکو نامەییێکی مردوو دەمینێتەوە(٤٠). لەگەڵ ئەوەش ڕێک دەکەوین کە دەڵێت لە حکوومەتی دیموکراسی هیچ شتێک لە دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆ بەهێزترنییە(٤١).

ئەو دەزگایە دەستوورییە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا بەدادگای باڵا (Su-preme court) ناو زەدکراوە و لە ئوسترالیا و یەکیەتی سوڤییێتی پێشوو بەدادگای بەرز High Court ناوزەدکراوە لە کاتێک بەدادگای فیدراڵی Federal Tribunal لە سویسرا و بەدادگایی دەستووری Constitutional Court لە ئەڵمانیا ناسراوە.

بەم جۆرەش ئەرکی دادگای دەستووری لە دوو ڕەوت دەرناچێت:

١- بڕیاردان لەو ناکۆکییانەی کە پەیوەندن بەدەسەڵات و تایبەتمەندییەکان کە لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتە هەرێمییەکان یاخود لە نێوان حکوومەتە هەرێمییەکان بەخۆیان پەیدا دەبێت.

٢- ڕاگرتنی حکوومەتە جیاجیاکان لە چوارچێوەی ئەو سنوورەی کە دەستوور بۆی داناون بۆ ئەوەی هیچ کامێکیان دەستدرێژی نەکاتە سەر دەسەڵاتەکانی ئەوەی دیکە[٤٢].

لە پیادەکردن و پراکتیکدا دەبینین کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دوایین قسەو بڕیاری کۆتایی لە ڕاڤەکردنی دەستوور و لە دوایشدا لە دابەشکردنی دەسەڵاتەکان بە دادگای باڵا Supreme Court سپێردراوە و شایانی باسە کە سەرۆک و ئەندامانی ئەو دادگایە لە لایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردن و بەتایبەتی لە لایەن سەرۆک کۆمار دادەمەزرێن لە دوای پەسندکردنی لە لایەن ئەنجوومەنی پیران، بەڵام لەسەر کار لانادرێن مەگەر لە ڕێگای impeachment نەبێت کە بریتییە لە چەند کردارێکی تاوان خستنە پاڵی تایبەت (اجرائات أتهامیة خاصة) کە لە لایەن ئەنجوومەنی نوێنەران وەردەگیرێت و بەمەرجێک کە لە لایەن ئەنجوومەنی پیران و بەئامادەبوونی دوو لەسەر سێی ئەندامانی دادگەری بکرێن[٤٣].

و یاسازان دایسی Dicey دەڵێت «لە دەوڵەتێکی کۆنفدراڵی وەکو ویلاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئاشکرایە کە دادگاکان دەبنە تەوەر کە ڕێکخستنە دەستوورییەکان لە دەوری دەسووڕێنەوە و ڕاڤەکەرانی دەستوور دادوەرەکانن و لەسەر ئەو بنچینەیە دەزگای دادوەری دەتوانیت بەڵکو دەبێت سنووری دەسەڵاتی حکوومەت و دەزگای یاسا دانان دیار بکات و بڕیارەکانی قابلی تێ هەڵچوونەوە (استئناف)نین و ئەنجامی لوجیکی کە بەدوایدا دێت ئەوەیە کە دەزگای دادوەری تەنها پاسەوانی دەستوورنییە بەڵکو و لە ساتی گونجاو بەسەروەری دەستوور (سیدة الدستور) دادەندرێت. فیدراڵیەت دادگەری یا دادوەری دەخاتە پلەی یاسای دانراو و کەسێکی تریش نییە

بێجگە لەو کەسەی کە ڕێز لە یاسا دەگرێت کە مەیلی ئەوەی هەبێت کە دەرچوونی بڕیارێک لە کێشەیێکی دادوەری وەکو دانانی یاسا لە قەڵەم بدات[٤٤] و لە ئەڵمانیای یەکگرتوو و لە ژێر سێبەری دەستووری فیدراڵی ساڵی ١٩٤٩ دادگای دەستووری یەکگرتوو هەڵدەستێت بەیەکلاکردنەوە لە بابەتەکانی ڕاڤەکردنی دەستووری فیدراڵی و لە حاڵەتی هەبوونی ناکۆکی سەبارەت بەماف و ئەرکەکانی هەریەکە لە یەکیەتی و ویلایەتەکان و بەشێوەیێکی تایبەت ئەوەی پێوەندە بەجێبەجێکردنی یاسایێکی فیدراڵی لە لایەن ویلایەتەکان و پیادەکردنی چاودێری یەکگرتوو و لە ناکۆکییەکانی دیکە کە پێوەندییان بەیاسای گشتی هەیە لە نێوان یەکیەتی ویلایەتەکان یاخود لە نێوان ویلایەتەکان یا لە چوارچێوەی یەک ویلایەت هەیە ئەگەر دەقێکی تایبەت نەبێت بەتایبەتمەندبوونی لایەنێکی دادوەری دیکە[٤٥]. ئەمە و لە پاڵ دادگای دەستووری یەکگرتوو دادگایێکی یەکگرتووی باڵا هەیە بۆ هەر یەکە لە دادوەری شارستانی و کارگێڕی و دارایی و کرێکاریی و هەروەها بۆ کاروباری تأمین و ئاسایشی کۆمەڵایەتی[٤٦].

و لە ئوسترالیا هەندێک لە ناکۆکییەکان سەبارەت بەواتای دەستوور و بەقۆناغی کۆتایی لە لایەن لیژنەی دادوەری ئەنجوومەنی بیلاط لە بەریتانیا یەکلا دەکرێتەوە بەڵام هەندێک ناکۆکی کە پێوەندی بەسنووری دەسەڵاتە دەستوورییەکان لە نێوان کۆمۆنوێلس (یەکیەتی) و یەکێک یا زیاتر لە دەوڵەتە ئەندامەکان هەیە یاخود ئەو ناکۆکییانەی کە سەبارەت بەو دەسەڵاتانە لە نێوان دووان یا زیاتر لە دەوڵەتە ئەندامەکان پەیا دەبن ئەوە دادگای بەرز High court دەتوانێت بڕیاری لەسەر بدات و ئەو دادگایە لەو ئەندامانە پێکهاتوون کە لە لایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردنی یەکگرتوو دامەزراون و لابردنیشیان لەسەر داواکاری هەردوو ئەنجوومەنی دەسەڵاتی یاسا دانانی یەکگرتوو دەبێت. و دادگای ناوبراو دەتوانێت ئەگەر ویستی دەرفەت بڕەخسێنێت بۆ ئەوەی بڕیارەکانی سەبارەت بەو بابەتانەی سەرەوە لەلای لیژنەی دادوەری ئەنجوومەنی بیلات تەمییز بکرێت بەڵام ئەو کارەی نەکردووە لە هیچ کێشەیێک هەتا ئێستا[٤٧].

لە کەنەدا یاسای باکووری ئەمەریکای بەریتانی ساڵی ١٨٦٧و لە وەتەی دەرچووە دوایین قسەو بڕیاری کۆتایی لەمەڕ ناکۆکییە دەستوورییەکانی- چ ئەو ناکۆکییانە پێوەندییان بەدابەشکردنی دەسەڵاتەکان بێت یاخود بابەتەکانی دیکە بەدەزگایێک سپاردووە کە هیچ پێوەندیێکی نە بەحکوومەتی یەکگرتوو و نە بەحکوومەتە هەرێمییەکان هەیە ئەویش لیژنەی دادوەری ئەنجوومەنی بیلاتی بەریتانیایە و ئەو وەزعەش هەتا ساڵی

١٩٤٩بەردەوام بوو کە لەو مێـژووە یاسایێک لە پەرلەمـانی کەنەدا دەرچوو و بەپێی ئەو یاسـایە دادگـای باڵای کـەنەدی Supreme court بووە لایەنی تایبـەتمەند لە دەرکـردنی بڕیارە کۆتاییەکان بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو تەمییزانەی کە لەسەر کێشە یاساییەکان پێشکەش دەکرێن و لە نێوانیان ئەو بابەتانەیە کە پێوەندییان بەناکۆکییە دەستوورییەکان هەیە و ئەندامانی ئەو دادگایە لە لایەن دەسەڵاتی جێبەجێکردنی یەکگرتوو (دومیون) دادەمەزرێن بەڵام بەبێ داواکردنی هەردوو ئەنجوومەنی پەرلەمانی یەکگرتوو لەسەر کار لانادرێن[٤٨].

لە سویسرا بارودۆخەکە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوەی کە لە دەوڵەتە ئەندامەکانی سەروەری پێڕەو دەکرێت و لە کاتێکدا کە دادگای فیدراڵی سویسری Federal Tribunal مافی چاودێری یاساکانی دەوڵەتە ئەندامەکانی (کانتونەکان) هەیە و بۆشی هەیە بڕیاری ئەوە دەرکات کە ئەو یاسایانە شەرعی نین لەبەر دژبوونیان لەگەڵ دەستووری یەکیەتی بەڵام دادگای سەرەوە ئەو دەسەڵاتەی نییە سەبارەت بەیاساکانی یەکگرتوو دەربکات، بەڵام ئەم کارەش ئەوە ناگەیەنێت کە دەسەڵاتی یاسادانی یەکگرتووFederal Assembly ئازادییێکی ڕەهای هەیە لە دەرکردنی یاسای دژ بەدەستوور و لە دواییدا بتوانێت دەستوور هەموار بکات چونکە بەپێی دەستووری فیدراڵی سویسری(٣٠٠٠٠) سی هەزار هاووڵاتی یاخود (٨) هەشت کانتون دەتوانن ڕەخنە لە هەر یاسایێک کە لە پەرلەمان دەردەچێت بگرن بەم کارەش دەبێت ئەو یاسایە بدرێتە ڕیفراندۆمێکی گشتی ئەوەش لە ئەنجام وادەگەیێنێت کە هاووڵاتیانی دەنگدەر ڕۆڵی دادگای فیدراڵی دەبینن لە بواری بڕیاردان بەنادەستووری هەر یاسایێکی یەکگرتوو[٤٩].

و دادگای باڵای یەکیەتی سوڤییەتی پێشتوو بەبەرزترین دەزگای دادوەری لە یەکیەتی سۆڤییەتی پێشوو دادەندرا و لە سەرۆک و چەند جێگرێک بوو سەرۆک و چەند ئەندامێک و چەند سوێند خۆری میللی (محلفين شعبيين) پێکدەهات کە لە لایەن ئەنجوومەنی سوڤییەتی باڵا هەڵدەبژێردران و هەروەها سەرۆکی دادگاکانی کۆمارە یەکگرتووەکان بەپێی پلەو پایە خۆیان ئەندام بوون لەو دادگایە[٥٠]. ئەوە و تێبینی دەکرێت کە دەستووری سۆڤییەتی ئاماژەی بۆ تایبەتمەندی ئەو دادگایە نەکردووە سەبارەت بەناکۆکییە دەستوورییەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی کۆمارە ئەندامەکان هەرچەندە کە باسی لە پێویستی ڕێکخستنی دادگای باڵاو چۆنیەتی کارکردنی بەپێی یاسایێکی تایبەت کردووە[٥١].

و هەندێک هەن تێبینی ئەوەیان کردووە کە جیاوازی کاکڵەیی گەورە لە مەڕ شێوازەکانی ڕێکخستن و کارکردن لە نێوان دەسەڵاتی دادوەری لە ئەوروپا و بەتایبەتی ئەڵمانیا و هاوچەشنەکانیان لە ئەمەریکای باکوور (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا) هەیە بەوەی لە ئەڵمانیا بۆ نموونە پرنسیپی تایبەتمەندی (مبدأ التخصص) ڕەچاو دەکرێت چونکە دادگای دەستووری یەکگرتوو تایبەتمەندە تەنها بەسەیرکردنی ناکۆکییە دەستوورییەکان لە کاتێکدا کە دادگا باڵاکان لە ئەمەریکای باکوور هەرچەندە کە چاودێری دەستووری ئەنجام دەدەن بەڵام ئەوان بۆ ئەو مەبەستە بەتەنها دانەمەزراون بەڵکو تایبەتمەندییێکی گشتی و تێکەڵاویان هەیە و ئەنجامی دەدەن[٥٢]. و لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دادگای باڵا Supreme court سەیری ئەو ناکۆکییە شارستانییانە دەکات کە لە بواری یاسای تایبەتن ئەگەر هات و ئەو ناکۆکیانە لە میانی هەندێ بابەت بوون کە پێوەندی بەیاسای یەکگرتوو هەبێت و لە کەنەدا و لەوەتەی پووچەڵ کردنەوەی تەمییز لەپێش ئەنجوومەنی بیلاتی پادشایەتی بەریتانیا دادگای باڵای کەنەدی لە لوتکەی پەیکەری دادوەری ڕادەوەستێت بۆیێ بەدوایین و بەرزترین جێگا دادەندرێت لە بواری تانە لێدان لە کێشەکانی یاسایی تایبەت و یاسایی کارگێڕی و یاسای کار و یاسایی دەستووری و زۆربەی ئەو کێشانەی کە لە لایەن دادگای باڵای کەنەدی Supreme court سەیر دەکرێن پێوەندییان بەیاسای تایبەت هەیە لە ڕووی سروشتیانەوە[٥٣].

**هەفتەم: بێتوانایی دەوڵەتە ئەندامەکان لەمەڕ پووچەڵکردنەوە و جیابوونەوە[٥٤]:**

یەکێک لە مەسەلە بنچینەکان کە جێگای پرسینەوەیە ئەوەیە ئایا دەوڵەتە ئەندامەکان مافی پووچەڵکردنەوەی یاساکانی یەکیەتییان هەیە Nullification یاخود دەتوانن یەکلایەنە جیاببنەوە لە یەکیەتی Secession

ڕەگوڕیشەی مەسەلەی پووچەڵکردنەوەی یاساکانی یەکیەتی دەگەڕێتەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەتایبەتی بۆ ئەو هەڵوێستە بێ وێنەی پێشترە کە ویلایەتی کارولینای باشوور لە ساڵی ١٨٣٢ وەری گرت بەپووچەڵکردنەوەی هەندێک لە یاساکانی یەکیەتی کە پێوەندبوون بەنرخی گومرگ (التعریفە) بەهەنجەتی ئەوەی کە کۆنگرس سنووری خۆی بەزاندووە لە بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی خۆی کە لە دەستووری فیدراڵی هاتوون ئەوەش ڕێگا بەهەر ویلایەتێک دەدات کە ئەو یاسایانە بەپووچەڵ کراو دابنێت.

و ئەو ناکۆکییە لە نێوان دەسەڵاتەکانی یەکیەتی لە لایێک و دەسەڵاتەکانی ویلایەتی

کـارولینـای باشـوور و ویلایەتەکـانی دیکەی باشـوور لە لایێکی دیکە دەنگدانەوەیێکی گـەورەی هەبوو لە نێـوان شـارەزایانـی یاسـای دەسـتـووری و تایبـەتمەندەکـان لە زانسـتـە سیـاسـیـیـەکـان لە هەردوو لا و جـون کـالهـون John Calhoun بووە قـسـەکـەر- بەناوی باشـوور لە کـاتێکدا کـە دانیـال ویبـسـتـر Danial Webster نوێنەرایەتی قـوتابـخـانەی نیشتمانی دەکرد(٥٥).

کالهـون Calhoun هەمـوو توانایێکی خـۆی خسـتـەگڕ بۆ بەرگری کـردن لە هەلوێسـتـی کارولینای باشـوور لە مەڕ پووچەڵکردنەوەی یاساکانی یەکیەتی بەجەخت کردنەوە لەسەر ئەوەی کە حکوومەتی یەکیەتی بریکاری حکوومەتەکانی ویلایەتەکانە بۆیە ئەو حکومەتانە دوایی مـافی ئەوەیان هەیە کە هەر یاسایێـک لە لایەن بریکارەکـەیان دەرچووبێت پووچەڵ بکەنەوە لەوکـاتەی کـە ناتوانـن پێی ڕازی ببن و دەتوانین ئەو بەڵگە یاسـاییـیـانەی کـە کالهون Calhoun پشتی پێ بەستابوون بەو خاڵانەی خوارەوە بخەینە ڕوو:

أ- یەکیەتی ڕێکەوتنێکە لە نێوان دەوڵەتە یەکسانەکان.

ب- حکوومـەتی یەکـیـەتی لە لایەن ئەو دەوڵەتانە دامـەزراوە وەکـو بریکارێک بۆ جێبەجێکردنی دەقەکانی ئەو ڕێککەوتنە کە لە دەستووری یەکیەتی هاتوون.

ج: کاری بریکار ئەگەر سنووری خۆی بەزاند پووچەڵ و بێ نرخ دەبێت.

د: هەر دەوڵەتێک (واتە دەوڵەتی ئەندام) مـافی ئەوەی هەیە کـە بڕیار بدات ئایا حکوومـەتی یەکگرتوو لە هەر کـارێک لە کـارەکـانی سنووری تایبـەتمەندییـەکـانی خـۆی بەزاندووە یان نا(٥٦).

ئەو بنچـینە یاسـاییـیـەی کـە کـالهـون Calhoun پشـتی پێ بەسـتـابوو لە داڕشـتنی تیـۆرییـەکـەی خـۆی کـە نـاسـراوە بەتیـۆری پووچەڵکردنەوە (نظرية الابطال) لە بیـرۆکـەی سـەروەری هەڵدەقـولا و بەبۆچوونی ئەو سـەروەری (سیـادة) بەسیـمـایێک یا مـەرجـێکی پێویست بۆ دەوڵەت دادەندرێت و قابلی واز لێهێنان (تنازل) نییە و هەروەها مەسەلەی دابەشکردنی سەروەری لە دەوڵەتی فیـدراڵی ڕەت کردەوە و جەختی لەسـەر ئەوە کـرد کە ناکـرێت سـەروەری بۆ دەوڵەتی یەکـیـەتی و بۆ ویلایەتەکـان بێت لە هەمـان کـاتدا بەڵکو بەبیروبۆچوونی ئەو سەروەری تەنها بۆ ویلایەتەکانە لەبەرئەوەی لایەنێکن یاخود بەشێکن لەو ڕێکەوتنە دەسـتـوورییـە و هەروەها مـەسـەلەی بەرزی و سـەروەری دادگـای باڵای ڕەت کردەوە.

و کـالهـون Calhoun بەلایەنگیـرێکی بەهێـز بۆمـافی پووچەڵکردنەوە دادەندرێت و نووسـینەکـانی لەم بوارە ویلاتەکـانی باشـووری گـەیاندە بڕواکـردن بەوەی کـە مـافی پووچەڵکردنەوەیان هەیە لەوکاتەی کە کێشەی کویلایەتی لە ساڵی ١٨٦١ ڕووی دا. بەڵام دانیـال ویبستـر Danial Webater تیـۆریەکەی کـالهـونی Calhoun کە تەرخان کرا بۆ بەرگری کردن لە مافی دەوڵەتە ئەندامەکانی ڕەت کردەوە و یەکیەتی بەشتێکی بەردەوام و هەتا هەتایی دانا و مافی ویلایەتەکان لەلای ئەو واتە لەلای دانیـال ویبستر مەسەلەییێکی خەیاڵاوی و سەرابە بەڵکو گەورەترین گەمژەیی و زیادەڕۆییـیە و جـیابوونەوە بەلای ئەو کـارێکە لە کـارەکـانی شـۆڕش دژی حکوومـەت و بۆ ڕاگـرتنی دەسـتـووری سـیـاسی و لە کـارخـسـتنی لە ڕێگـای شـۆڕش و بەهەمـان چاو سـەیری مـەسـەلەی پووچەڵکردنەوەی دەکرد[٥٧]. بێجگە لەوەش تیوری کالهون Calhoun ڕەخنەی توندی لە لایەن لایەنگیرانی یەکـیـەتی The Federalist لێ گـیـرا چونکە ئەوانە دەوڵەتی فـیـدراڵـیـان بەدەوڵەتێکی ڕاسـتـەقـینە دادەنا کـەوا دەسـەڵاتی باڵای هەیە لە سنووری ئەو تایبـەتمەندییـانەی کە پێی سپێردراون و مافی ویلاتەکان لە پووچەڵکردنەوە و جیابوونەوەیان ڕەت کردەوەو لەمیانی ئەو قسانەی کە کردیان لەم بوارە ئەوەیە کە دەستوور بەرێکەوتنێک لە نێوان ویلایەتەکان لە قـەڵـەم نادرێت بەڵـکو ڕێکەوتنی گـەل بەهەمـوویەتی و بەڵـگەشـیـان بۆ ئەو ڕاسـتـیـیـە پێشـەکی دەستووری ئەمـەریکی بوو کە دەڵێت (ئێـمە گەلی ویلایەتە یەکگرتووەکان.... ئەو دەسـتـوورە دادەنێین و دانیـشـی پیـا ئەنێین) (نحن شعب الولايات المتـحدة نقـر وتشـئ هذا الدسـتـور). و ئەو مـشـتـو مڕە سـیـاسی و یاسـاییـیە پەرەی سـەند و بەرەو ملـمـلانێـیـەکی خـوێناوی چەکـدارانە پەرەی سـەند کـە لە سـاڵـی ١٨٦١ گـڕی گـرت بەڕاگـەیاندنی جـیـابوونەوەی کـارولینـای باشـوور لە یەکـیـەتی بەهۆی کـێـشـەی کـۆیلەکـان و (١٠) دە ویلایەتی دیکەی باشوور بەدوای کارولینای باشوور کەوتن و جیابوونەوەی خۆیان ڕاگەیاند ئەوەش وای کرد کە یەکیەتی ناچار بێت سوپای خۆی بنێرێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی جودا خـوازەکـان و ئەو ملـمـلانێـیـە چەکـدارانە چوار سـاڵی خـایاند و لە سـاڵـی ١٨٦٥و بەسەرکەوتنی حکوومەتی یەکگرتوو بەسەر ویلایەتە جوداخوازەکانی باشوور کۆتایی هات. بەم جۆرەش چەک و خوێن چارەسـەرییـەکی کۆتاییـیـان بۆ کێشەی جیابوونەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دانا[٥٨].

و لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ هەندێ ڕاستی لە هزری دەستووری ئەمەریکی جێگیربوون کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- دەستوور لایەنی پێدانی دەسەڵاتەکانە و کۆنگرس تەنها لە سنووری خۆی دەتوانێ یاسا دابنێت.

٢- دەسەڵاتی کۆنگرس لەو سنوورەی لە دەستوور بۆی داندراوە بەرزترین دەسەڵاتە.

٣- هیچ ویلایەتێک بۆی نییە ئەو دەسەڵاتە پووچەڵ بکاتەوە لە ڕێگای ڕەتکردنەوەی دانپێدانان بەو دەسەڵاتە، و هیچ ویلایەتێک بۆی نییە لە دەسەڵاتی حکوومەتی یەکیەتی جیاببێتەوە[٥٩].

و دادگای باڵا بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی لەم بوارە و لە ساڵی ١٨٦٨ دەرکرد کە دەڵێت بەپێی دەستوور «یەکیەتی قابلی لێکبوونەوە نییە و لە ویلایەتەکان پێکدێت کە بۆیان نییە جیاببنەوە.»[٦٠]. و تاکە ڕێگا بۆ جیابوونەوەی ویلایەتەکان یاخود یەکیەتی بتوانیت یەکێک لە ویلاتەکان دەرکات دەبیت لە ڕێگای هەمووارکردنی دەستوور بێت و لەو سنوورەی کە پێوەندە بەدەرکردنی ویلایەتێک ئەوە ڕەزامەندی ویلایەتەکە پێویستە وەربگیرێت بەپێی ئەو دەقە دەستوورییە کە دەڵێت نابێت هیچ ویلایەتێک و بەبێ ڕەزامەندی خۆی بێ بەش بکرێت لە مافی خۆی لە دەنگدانی یەکسان لە ئەنجوومەنی پیران[٦١].

و سابقەییێکی دیکە هەیە لە مەڕ هەوڵی جیابوونەوە کە ویلایەتی ئوسترالیای ڕۆژئاوا لە ساڵی ١٩٣٤داوای لە پەرلەمانی بەریتانیا کرد[٦٢] ئەوەی یاساییێک دابنێت بەڕەزامەندی لەسەر جیابوونەوەی لە کومونویلسی ئوسترالیا بەڵام داواکارییەکەی سەری نەگرت لەبەرئەوەی لیژنەی هەڵبژێردراو لە هەردوو ئەنجوومەنی لۆردات و عموم لە بەریتانیا بڕیاری دا کەوا بەپێی ڕێکەوتنە دەستوورییەکان پەرلەمانی بەریتانیا تایبەتمەند نییە بەمامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کێشانە تەنها لەسەر داواکاری دەوڵەتێکی ئەندام، و ئەو بڕیارەش ئەو ڕاستییەی سەلماند کە لە پراکتیکدا هەروەکو لە یاسادا مافێکی دانپیانراو نییە بۆ دەوڵەتی ئەندام کە بتوانێت یەکلایەنە جیاببێتەوە[٦٣].

بەم جۆرەش هەرچەندە هەردوو ئەزموونی جیابوونەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئوسترالیا لە شێواز جیاوازبوون چونکە یەکەمیان بەشێوەییێکی خوێناوی ڕووی دا و زیانی گیانی زۆری لێکەوتووە لە کاتێک کە دووەمیان بەشێوەییێکی ئاشتییانە ئەنجام درا بەڵام هەردووکیان گەیشتنە هەمان دەرئەنجام ئەویش ڕەتکردنەوەی جیابوونەوە بوو و پیادەکردنی ئەم پرنسیپە تەنها لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئوسترالیا

ڕانەوەستاوە بەڵکو لە زۆربەی دەوڵەتە فیدراڵییەکان پیادەکراوە و لێرەدا تەنها دەستووری سۆڤییێتی پێشوو دانی بەو مافە بۆ دەوڵەتە ئەندامەکان ناوە بەڵام ئەو مافە کەوا لە دەستووری سۆڤییێتی هاتووە و دانی پیانراوە تەنها مەسەلەیێکی تیۆرییە و لەگەڵ ئەوانە ڕێک دەکەوین کە دەڵێن لەگەڵ ئەوەی دەستووری سۆڤییێتی پێشوو دانی بەو مافە ناوە کەمترین ئەگەر هەیە بۆ پیادەکردنی[٦٤]. و دەسەڵاتەکانی یەکگرتوو هەڵدەستێت بەسەرکوتکردنی هەر بزووتنەوەیێک کە داوای جیابوونەوە بکات وەکو ئەو ڕووداوە خوێناوییانە کە لە کۆماری شیشان ڕوویاندا لەمیانی هێرشی سوپای ڕووسیا دوابەدوای ڕاگەیاندنی جیابوونەوە لە لایەن شیشانییەکان و ئەو هێرشە و بەردەوامی شەڕەکان لەو ناوچەیە کاولکارییێکی زۆری لێ کەوتەوە و بووە هۆی زەرەرو زیانێکی گیانی و مالی زۆر و ئەمەش هەمووی بۆ ڕێگاگرتن لەپێش جیابوونەوەی شیشان شایانی باسیشە کە لە ساڵی ١٩٩٩ سوپای ڕووسیا هێرشێکی فراوانی کردە سەر کۆماری شیشان و زۆربەی زۆری ناوچەکانی و لە نێوانیان گروزنی پایتەختی خستە بەر ڕکیفی خۆی و داگیری کرد و حکوومەتە هەڵبژێراوەکەی ناچارکرد کە ڕوو بکاتە چیاکان و لەوێشەوە دەست بەشەڕی پارتیزانی و بەرەنگاربوونەوە بکەن و هەتا ئێستاش شەڕ و کوشتار لەو ولاتە بەردەوامە. هەروەها یەکیەتی سۆڤییێت زەوییەکانی دەوڵەتی هەنگاریای شیوعی لە ساڵی ١٩٥٦ داگیرکرد هەرچەندە کە پەیماننامەی بەرگریش لە نێوانیاندا هەبوو چونکە ئەو ولاتە هەوڵی خۆ دوورخستنەوەی لە چەتری یەکیەتی سۆڤییێتی پێشوو دەدا جگە لەوەش یەکیەتی شۆڤییێتی پێشوو خاکی ولاتی ئەفغانستانی لە ساڵی ١٩٨٠ داگیرکرد کە هەستی بەپێویستی ئەوەکرد کە زیاتر ئەو ولاتە بخاتە ژێر چەتری سیاسەتەکانی خۆی لەگەڵ ئەوەی کە ئەفغانستان ئەندام نەبوو لە یەکیەتی ناوبراو.

و لە کاتێک کە یاسازان ویبر Whear جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە جیابوونەوە بەشێوەیێکی یەکلایەنە بەپێچەوانەی پرنسیبی فیدراڵییەت نییە ئەو جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە پووچەڵکردنەوە Nullification دژ بەفیدراڵییەتە لەبەرئەوەی پووچەڵکردنەوە وا دەکات کە حکوومەتی یەکیەتی ببیتە بریکاری حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان لە کاتێکدا کە جیابوونەوە ئەو دەرئەنجامەی لێ ناکەوێتەوە[٦٥]. و ئەو واتە ویبر Whear جیابوونەوە بەشێوەیێکی ڕەها ڕەت ناکاتەوە کە دەڵێت «بەڵام لە کاتێکدا بوونی جیابوونەوەی یەکلایەنە یا دەرکردنی یەکلایەنە دەگونجێت لەگەڵ هەبوونی دەوڵەتی فیدراڵی بەڵام وا بڕوادەکەم کە ناگونجێت لەگەڵ حکوومەتی فیدراڵی باش»[٦٦].

و ویبیر Whear سەرنج بۆ ئەو خەتەرانە ڕادەکێشێت کە دوابەدوای دانپیانان بەمافی جیابوونەوە یا دەرکردن دێنە پێش و لە نێوانیان ئەوەیە کە دەبێتە هۆی لاواز بوونی حکوومەت چونکە چەکێک لە جۆری ناچارکردنی سیاسی دەخاتە دەست حکوومەتەکان کە بۆ گەیشتن بەئامانجەکانیان بەکاری بێنن، و لەوانەیە حکوومەتی هەرێمی لاواز بەدەرکردن تەهدید بکرێت ئەگەر هات و داواکارییەکانی حکوومەتی یەکگرتووی جێبەجێ نەکرد و هەروەها لەوانەیە حکوومەتی یەکگرتوو لاواز ببێت و لە ڕێگای تەهدید بەجیابوونەوە لە لایەن حکوومەتە هەرێمییە نارازییەکان ناچار بکرێت بۆ ئەنجامدانی هەندێ هەنگاوی نابەجێ(٦٧). و لەلای خۆمانەوە وا دەبینین کە لەکاتێک پووچەڵکردنەوە Nullification بەپێچەوانە و دژ بەسیستەمی فیدراڵی و پرنسیپی سەروەرییە لە دەوڵەتی یەکگرتوو بەڵام جیابوونەوە Secession وانییە واتە ئەو دەرئەنجامەی لێ ناکەوێتەوە بەڵام وا دەبینین کە پێویستە خاڵەکان و مەرجەکانی مافی جیابوونەوە لە دەستووری فیدراڵی ڕێک بخرێت بەشێوەیێک کە هاوسەنگی لە نێوان هەردوو لا پەیا بکات و مافەکانیان بپارێزێت و بەواتاییێکی دیکە نابێت دەرفەت بدرێتە حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان بۆ بەکارهێنانی ئەو مافە بەشێوەییێکی ڕەها و چۆن و لە چ وەختێک ویستیان.

**پەراوێزەکانی ئاخافتنی دووەم**

(١) نووسەرانی یاسای دەستووری چەند ناوێکی جیاجیایان لە سیستەمی فیدراڵی ناوە دکتۆر حەسەن چەلەبی بە(دەوڵەتی یەکگرتوو یاخود یەکیەتی فیدراڵی) ناوی برد لە کاتێکدا دکتۆر ثروت بدوی و دکتۆر عوسمان خەلیل عوسمان و دکتۆر منیر عجلانی بە(یەکیەتی ناوەندی) ناویان برد و دکتۆر سید سەبری و دکتۆر کەمال غالی و دکتۆر مستەفا بارودی و دکتۆر ادمون ڕەبات بە(دەوڵەتی یەکگرتوو) ناویان برد و دکتۆر فواد شباط ناوی لێنا (یەکیەتی نێو دەوڵەتی).

بۆ ئەوە بڕوانە دکتۆر کەمال غالی- مبادئ القانون الدستوري والانظمة السياسية- چاپخانەی دمشق. چاپی دووەم ١٩٦٧-١٩٦٨ ل ٩٠-٩١.

واندریە هوریو وأوپنهایم و گیرهارد و ستراک و دکتور منذرالشاوي و دکتۆر عصام سلیمان بە(دەوڵەتی فیدراڵی) ناویان برد بۆ ئەوەش بڕوانە: اندریە هوریو- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٢

L. Oppenhiem. Op. Cit Page 175

Gerhard von Glahn, Law Among Nations, An Introduction to Public international Law, The Macmillan Compang Collier.

Macmillan Limited New York London Page 70

J. G. Strake, An Introduction to Internatioal Law Butter Worths, London, Fifth edition 1963 Page 104.

دکتۆر منذر الشاوی- القانون الدستوري نظرية الدولة. سەنتەری لێتوێژینەوەی یاسایی- خانەی قادسیه بۆ چاپکردن- بەغدا ١٩٨١ ل ٢٥٠.
دکتۆر عوسام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو ل ٣٩.
پروفیسۆر عەبدولڕەحمان بەزاز- الدولة الموحدة والدولة الاتحادية- سەرچاوەی پێشوو ل ٩٠.
دکتۆر ئیسماعیل غەزال- سەرچاوەی پێشوو ل ٩٩.
عارف حەمسانی- سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٥.
دکتۆر شافعی محەمەد بەشیر ناوی لێنا (یەکێتی دەستووری)- القانون الدولي في السلم والحرب- دەزگای معارف لە ئەسکەندەریە ١٩٧١ ل ١١٨.
دکتۆر هیشام ئەلشاوی و دکتۆر ئیسماعیل میرزە و دکتۆر موحسین خەلیل ناویان بە(یەکیەتی ناوەندی) برد.
بۆ ئەوە بڕوانە دکتۆر هیشام ئەلشاوی- مقدمة في علم السياسة- دەزگای خانەی کتێب بۆ چاپمەندی و دابەشکردن لە موسڵ ل ١٤٩.
دکتۆر ئیسماعیل میرزە- القانون الدستوری- دراسة مقارنة بين الدستور الليبي ودساتير الدول العربية الأخرى- خانەی سادر بەیروت ١٩٦٩ ل ١٨٢.
دکتۆر موحسین خەلیل- النظم السياسية والقانون الدستوري- دەزگای معارف لە ئەسکەندەریە چاپی دووەم ١٩٧١ ل٨٠ و هەریەک لە دکتۆر عەلی سادق ئەبو هەیف و دکتۆر مەحمود سامی جنینە و دکتۆر ئەحمەد عەبدولقادر جەمال ناویان لێنا (دەوڵەتی هاوپەیمانییەتی- الدولة التعاهدية). بڕوانە: دکتۆر عەلی سادق ئەبو هەیف- القانون الدولی العام- دەزگای معارف لە ئەسکەندەریە- ل ١٣١.
دکتۆر مەحموود سامی جنینە- القانون الدولی العام- چاپخانەی اعتماد- ل ١٢٨.
دکتۆر- ئەحمەد عەبدولقادر جەمال- بحوث ودراسات في القانون الدولي العام- کتێبخانەی ڕابوونی میسری- قاهیرە. دکتۆر محەمەد عەلی طی بەدەوڵەتی فیدراڵی یاخود یەکیەتی فیدراڵی ناوی برد. سەیری دکتۆر محەمەد طی- سەرچاوەی پێشوو ل ١٩٧بکە.

(2) K. C. Wheare, Op. Cit Page 54.

(3) A. V. Dicey, introduction to the Study of the Law of the Constitution With an Introduction by E. C. S Wade, London Macmillan & Co Ltd New York, Page 144.

(٤) دکتۆر محەمەد عەبدولعەزیز نەسر- سەرچاوەی پێشوو ل٤٧٦.

(٥) مەبەستی لەوە مەرجەکانی دەستووری فیدراڵییە.

(6) K. C. Wheare, Op. Cit Page 53.

(7) V. Dicey. Op. Cit Page 144.

(8) K. C. Wheare, Op. Cit Page 53.

(9) Article 6 From the American Constitution.

(10) K. C. Wheare Op. Cit Page 55.
(11) Op. Cit Page 55.
(12) A. V. Dicey Op. Cit Page 147.
(13) K. C. Wheare, Op. Cit Page 55.
(14) Op. Cit Page 55.
(15) The Article l From the American Constitution.
(16) The Article 4 Section 3 From the American Constitution.
(17) K. C. Wheare, Op. Cit Page 17, 56.
(18) Artical 128 From the Condtition of the Australian Common Wealth.
(19) Artical 128 From the Constitution of the Australian Common Wealth.
(20) Street, London 1956 Page 370- 373.

(٢١) مادده (١٠٨) له دهستووری یەکیەتی کۆمارەکانی سوشیالستی سۆڤییێتی سالّی ١٩٧٧ هەروەها مادده ١١٤ دەلّێت «یاسای یەکیەتی سۆڤییێت بەپەسەندکراو دەژمێردرێت ئەگەر هاتوو هەر یەک لە دوو ئەنجوومەنەکەی سۆڤییێتی بالاّ بەزۆرینەی ژمارەی گشتی ئەندامانی ئەنجوومەن دەنگیان بۆ دا».

(٢٢) مادده ١١٩ له دهستووری کۆمارەکانی یوغوسلافیای سوشیالستی فیدرالّ کە لە سالّی ١٩٦٣ دەرچووە.

(٢٣) مادده ١١٥ له دهستووری کۆمارەکانی یوغسلافیای سوشیالستی فیدرالّی سالّی ١٩٦٣.

(٢٤) دکتۆر محەمەد کامل لەیله- النظم السیاسیة- الدول والحکومة- خانەی هزری عەرەبی قاهیره ١٩٦٧- ١٩٦٨ ل ١٣٠.

(٢٥) سەرچاوەی پێشوو ل ١٣١.

دکتور سعد عصفور- القانون الدستوري- مقدمة القانون الدستوري- دەزگای معارف لە ئەسکەندەریە- چاپی یەکەم ١٩٥٤ ل ٢٧.

(٢٦) دکتۆر محەمەد کامل لەیله- النظم السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو ل١٣١. دکتور سعد عصفور- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٧.

(٢٧) دکتۆر ئیبراهیم عەبدولعەزیز شیحا- مبادئ الانظمة السیاسیة- دەولّەت و حکوومەتەکان- خانەی زانکۆ- بەیروت ١٩٨٢ ل ٦٨- ٦٩.

(٢٨) دکتۆر محەمەد کامل لەیله- النظم السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٢.

(٢٩) سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٢.

(30) Artical 91 From the British North America Act 1867.

(٣١) دکتۆر ئیبراهیم شیحا- مبادئ الانظمة السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٩.

(٣٢) هەندێک سیستەم هەن کە سەرباری هەردوو لیستی تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی یەکگرتوو حکوومەتە ئەندامەکان دەستوورەکانیان لیستێکی سێیەمی تێدایە کە بریتییە لە تایبەتمەندە هاوبەشەکانی هەردوولا بۆ نموونە دەستووری هیند لیستێکی هاوبەشی تێدایە (٤٧) مەسەلە دەگرێتە

خۆی ئەوانەش تایبەتمەندی هاوبەشن لە نێوان حکوومەتی یەکیەتی و حکوومەتەکانی ویلایەتەکان و لە نێوان یاسای سزایی و کاروباری ژن هێنان و تەلاق و ئیجرائاتی شارستانی و کارەبا و رۆژنامە و کتێب و خانەکانی چاپەمەنی و دابەشکردن دەگرێتە خۆی.

بروانە: فەتحی رەزوان- الدول والدساتير- دروس في المبادئ الدستورية العامة- خانەی رابوونی عەرەبی ١٩٦٥- ١٩٦٦ ل ٥٩ بکە.

(٣٣) دکتۆر محەمەد کامل لەیلە- النظم السياسية- سەرچاوەی پێشوو ل ١٣١.

دکتۆر ئیبراهیم عەبدولعەزیز شیحا- مبادئ الانظمة السياسية- سەرچاوەی پێشوول ٦٨.

دکتۆر یەحیا الجمل- الانظمة السياسية المعاصرة- خانەی رابوونی عەرەبی بۆ چاپەمەنی و دابەشکردن- بەیروت ل ٥٩

دکتۆر ئیسماعیل غەزال- سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٥.

دکتور ثروت بدوي- النظم السياسية- الجزء الاول- النظرية العامة للنظم السياسية- خانەی رابوونی عەرەبی ١٩٦٤ ل ٧٦.

(٣٤) دکتۆر مەحموود حلمي- سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٥.

(٣٥) دکتۆر سەعد عەسفور- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٨.

(٣٦) شایانی باسە کە هەندێ دەوڵەتی یەکبوو هەن کە بەسیستەمی دوو ئەنجوومەن وەردەگرن بەڵام هۆیەکانی پێڕەوکردنی ئەو سیستەمە لە لایەن دەوڵەتە یەکبووەکان جیاوازن لە هۆیەکانی پێڕەوکردنی ئەو سیستەمە لە سیستەمە فیدراڵییەکان.

(٣٧) هەندێک جار نوێنەرایەتی یەکسان پێڕەو نەکراوە لە ئەنجوومەنی باڵا وەکو سیستەمی فیدراڵی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی ساڵی ١٨٧١ کە تەنها بروسیا (١٧) نوێنەری هەبوو لە کاتێک کە (٤١) کەس نوێنەرایەتی دەوڵەتە ئەندامەکانی دیکەیان دەکرد کە ژمارەیان (٢٤) دەوڵەتی ئەندام بوو. و دەستووری کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی ١٩٤٩ سیستەمی نوێنەرایەتی یەکسانی پێڕەو نەکرد و نوێنەرانی دەوڵەتە ئەندامەکان لە نێوان (٣) هەتا (٥) نوێنەر بوون بەپێی رێژەی دانیشتوان، و هەروەها کەنەدا سیستەمی نوێنەری یەکسانی پێڕەو نەکرد

(38) Preston King Op. Cit Page 94- 95.

(39) K. C. Wheare, Op. Cit Page 58.

(40) Tocque Ville Page 140 Quoted From Ryad Azhari Op. Cit Page 129.

(41) Alam F. Westin, The suprome Court, Views From inside w. w.

(٤٢) دکتۆر محەمەد عەبدولمعەز نەسر- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٩٥.

(43) The Artical 1section 3 From the American Constitution.

(44) A. V. Dicey, Op. Cit Page 173- 179.

و بۆ زانین Dicey دەستەواژەی کۆنفیدراڵی بەکارهێناوە لە جیاتی فیدراڵییەت واتە ئەو جیاوازییان لە نێوان ناکات.

(٤٥) مادده ٩٣ برگەی ٣، ٤ لە یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی١٩٤٩.

(٤٦) مادده ٩٦ له یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی١٩٤٩.

(47) K. C. Wheare, Op. Cit Page 58.

(48) Op. Cit Page 58.

(49) Op. Cit Page 17, 56.

(٥٠) ماددەکانی ١٥١ و ١٥٣ له دەستووری یەکیەتی کۆمارەکانی شوشیالیستی سۆڤێتی ساڵی١٩٧٧.

(٥١) مادده ١٥٣ له دەستووری سۆڤێتی سەرەوە.

(52) Edward mc Whinney , Comparttive Federalism, States Rights and National Power, university of toronto press printed in canada 1962 page 24.

(53) Op. Cit Page 24- 26.

(٥٤) نووسەرەکانی یاسایی دەستووری لەسەر ئەوە ڕاهاتوون کە پووچەڵکردنەوە و جیابوونەوە بەماف دابنێن بەڵام ئەوە هەڵەیە چونکە لە لێتوژینەوەی ئەو بابەتە بۆمان دەردەکەوێت یەکلا نەبووتەوە کە پووچەڵکردنەوە و جبابوونەوە بەماف دابندرێن لە بواری دەوڵەتی یەکگرتوو.
لە بواری دانانی پووچەڵکردنەوە و جیابوونەوە بەماف بۆ نموونە سەیری- دکتۆر شافعی محەمەد بەشیر- القانون الدستوري والنظم السیاسیة السودانیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٧٦ بکە.

(55) Ryad Azhari, Op. Cit Page 21.

(٥٦) دکتۆر شافعی محەمەد بەشیر- سەرچاوەی پێشوو- ل١٧٦- ١٧٧.

(57) Ryad Azhari, Op- Cit Page 21.

(٥٨) بەهەمان واتا سەیری دکتۆ شافعی محەمەد بەشیر- سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٩ بکە.

(٥٩) سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٩.

(60) Op. Cit Page 86.

(61) Artical 4 Section 3 From the American Constitution.

(٦٢) تەنها ڕێگا کە ویلایەتە ئوستڕالییەکان یاخود ناوچە کەنەدییەکان دەتوانن بیگرنە بەر بۆ جیابوونەوە دەبێت لە ڕێگای یاساییێک کە لە پەرلەمانی بەریتانیا دەرچێت.

(63) K. C. Wheare, Op. Cit Page 86 .

(64) Ryad Azhari, Op. Cit Page 135- 136.
K. C.Wheare, Op. Cit Page 87.

(65) K. C. Wheare, Op. Cit Page 87.

(66) Op. Cit Page 87.

(67) Op. Cit Page 87.

## بەشی دووەم

# سیستەمی یاسای فیدراڵییەت

بێ گومان سیستەمی فیدراڵی لەسەر چەند پرنسیپێکی دیاریکراو ڕادەوەستێت کە جیای دەکاتەوە لەگەڵ سیستەمەکانی دیکەی حوکمڕانی و دەتوانین بڵێین کە ئەو پرنسیپانە بریتین لە سەربەخۆبی خۆبەتی بەرامبەر بەحکوومەتی یەکیەتی سەبارەت بەو مەسەلانەی کە پێوەندن بەکاروباری هەرێمی. هەروەها دەوڵەتە ئەندامەکان بەشداری دەوڵەتی یەکیەتی دەکەن لە بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی یەکگرتوو. هەروەها سروشتی یاسایی دەوڵەتی فیدراڵی و بەتایبەت مەسەلەی سەروەری تیایدا مشتومڕێکی زۆری لە نێوان شارەزایانی ئەم بوارە خستۆتە ئارا بەواتاییێکی تر مەسەلەی سەروەری و ئەو لایەنەی کە تیایدا جێگیر دەبێت لەو بابەتانەیە کە شایانی باس کردنە. ئەمە لە لایێک و لە لایێکی دیکە یەکیەتی فیدراڵی بەچەند سیمایێکی دیاریکراو لەسەر ئاستی دەرەوە (نێو دەوڵەتی) جیا دەکرێتەوە و لە هەمان کاتدا هەندێ سیمای دیکە یەکیەتی فیدراڵی جیادەکاتەوە لە بواری نێوخۆیی. وردبوونەوە لەو لایەنە کاکڵەییانە لە یەکیەتی فیدراڵی خۆی دەسەپێنێت بۆ ئەوەی تیشکێکی زیاتر بخەینە سەر ئەو سیستەمە و ئەوەش دەبێتە بابەتی باسەکەمان کە بەسەر سێ ئاخافتن دابەشی دەکەین و لە ئاخافتنی یەکەم باس لە پرنسیپەکانی سیستەمی فیدراڵی دەکەین و لە ئاخافتنی دووەم دەچینە سەر بابەتی سروشتی یاسایی دەوڵەتی فیدراڵی و لە دواییدا لە ئاخافتنی سێیەم و کۆتاییدا باس لە سیمای یەکیەتی لە سیستەمی فیدراڵیدا لەسەر هەردوو ئاستی دەرەوە و ناوەوە دەکەین.

ئاخافتنی یەکەم

## پرنسیپەکانی سیستەمی فیدراڵی

لە مۆرکەکانی یەکیەتی فیدراڵی ئەوە بەدەر دەکەوێت کە فیدراڵیەت لەسەر چەند پرەنسیپێکی دیاریکراو ڕادەوەستێت کە جیای دەکاتەوە لە سیستەمەکانی دیکە لەم بوارەدا و لەو پرنسیپە بنچینانەی کە سیستەمی فیدراڵی بەخۆیەوەی دەگرێت پرنسیپی سەربەخۆیی خودییە کە دەوڵەتە ئەندامەکان پێوەی بەهرەمەندن لە بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆیی لە چوارچێوەی هەرێمەکانیان و هەروەها بەهرەمەندبوونیان بەچەند دەسەڵات و تایبەتمەندی بەپێی دەستووری یەکیەتی. جگە لەوەش دەوڵەتی فیدراڵی لەسەر پرنسیپێکی دیکە ڕادەوەستێت ئەویش پرنسیپی بەشداریکردنە واتە بەشداریکردنی دەوڵەتە ئەندامەکان لە ئەنجوومەنی بالای یەکگرتوو بێجگە لە بەشداری کردنیان لە مەسەلەی هەموارکردنی دەستووری فیدراڵی(یەکگرتوو).

### یەکەم: پرنسیپی سەربەخۆیی خودی:

حەز و ویستی دەوڵەتە ئەندامەکان بۆ ئەوەی بچنە ژێر چەتری دەسەڵاتی حکوومەتی یەکگرتوو کافی نییە بۆ دامەزراندنی یەکیەتی فیدراڵی بەڵکو بێجگە لەوەش دەبێت حەز و ویستی سەربەخۆییان لە هەندێک مەسەلە هەبێت بەلای کەمییەوە بۆیە دەبێت حکوومەتی هەرێمی سەربەخۆ بۆ ئەم مەبەستە پێکبێت و بەبێ ئارەزووی سەربەخۆیی لە هەندێک لایەن ئەو کۆمەڵانە حکوومەتێکی یەکبوو لەگەڵ پلەیێکی گونجاو لە لامەرکەزییەت پێکدەهێنن[1].

دەوڵەتی فیدراڵی (یەکگرتوو) گونجاو و بەکەڵک دەبێت ئەگەر هات چەند دەوڵەتێک یاخود چەند کۆمەڵگاییێک ئارەزووی ئەوەیان هەبێت کە لە ژێر چەتری یەک حکوومەتی گشتی سەربەخۆ (حکوومەتی یەکگرتوو) بن بۆ هەندێک مەبەست و مەسەلە و لە ژێر چەتری حکوومەتە هەرێمییە سەربەخۆیەکان بن بۆ مەبەستەکانی دیکە و بەوجۆرەش دەبێت ئارەزووی یەکگرتنیان هەبێت نەک ئارەزووی یەکبوون (... إنها ترغب في أن تتحد ولكنها لاترغب في أن تكون موحدة)[2].

هەندێک بۆ ئەوە چوون کە یەکیەتی فیدراڵی ڕێکخستنێکی سیاسییە بەمەبەستی گونجاندن لە نێوان یەکبوون (الوحدة) و دەسەڵاتی نەتەوەیی (السلطة القومية)[٣].

سەربەخۆیی دەوڵەتە ئەندامەکان لە سیستەمی فیدراڵی لە چەند لایەنێکی دیاریکراو گەلاڵە دەبێت کە لە خوارەوە باسیان لێ دەکەین.

١- سەربەخۆیی دەستووری:

دەوڵەتی یەکگرتوو بە فرە سیستەمی سیاسی لە بواری نێوخۆیی ناسراوە و یەکێک لە ڕووەکانی ئەو فرەیییە ئەوەیە کە چەند دەستوورێکی تێدایە چونکە لە پاڵ دەستووری فیدراڵی چەند دەستوورێکی هەرێمی هەن[٤] و گرنگترین سیماکانی سەربەخۆیی دەوڵەتە ئەندامەکان ئەوەیە کە هەریەکێکیان مافی ئەوەی هەیە دەستووری تایبەتی خۆی هەبێت کە دەسەڵاتی دامەزرێنەر (السلطة التاسيسية) لە هەرێمەکە دایدەنێت هەر ئەو دەسەڵاتەش دەتوانێت هەمواری بکات لەو سنوورانەی کە دەستوور فیدراڵی دەرفەتی پێ دەدات[٥] و بەبێ پێویستی ئەوەی کە دەسەڵاتە فیدراڵییەکان پەسەندی بکەن[٦]. و لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەسەڵاتی دامەزرێنەر (السلطة التأسيسية) یاخود لە ڕێگای ئەنجوومەنی یاسادانانی هەرێمەکان پێک دێت یا لە ڕێگای هەڵبژاردنێکی تایبەت بەمەبەستی پێکهێنانی کۆمەڵەییێکی دامەزرێنەر لەناو ئەنجوومەنی یاسادانان[٧] و بەپێی دەستووری سۆڤییێتی دەبێت کۆماری یەکگرتوو و کۆماری خاوەن ئۆتۆنۆمیی دەستووری خۆیان هەبێت[٨] و سۆڤییێتی باڵا لەو کۆمارانە مافی دانانی دەستووری هەرێمی و هەموارکردنیشی هەیە[٩] و لە سویسرا هەموو دەوڵەتێکی ئەندام (Canton) مافی هەیە بەدانانی دەستووری خۆی بەشێوەیەکی ئازاد وە بەئارەزووی خۆی لە ڕووی پرنسیپەوە دابنێت بەمەرجێک ڕەچاوی سێ بنەما بکات و ئەوانیش بریتین لە ڕەزامەندی هاووڵاتیانی لەسەر دەستوورە هەرێمییەکە هەروەها ئەو دەستوورە دژ بەدەستووری فیدراڵی نەبێت و لە دوایشدا پابەندبێت بەشێوەی کۆماری لە حوکمڕانی[١٠] و دەوڵەتی ئەندام دەتوانیت دەستوورەکەی خۆی هەموار بکات بەمەرجێک ئەو سێ خاڵەی سەرەوە ڕەچاو بکات[١١].

بەڵام ئەو سەربەخۆییە دەستوورییەی دەوڵەتە ئەندامەکان هەندێ جار تەسک دەبێتەوە و بۆ نموونە لە کەنەدا هەموو هەموارکردنەکان کە بەسەر دەستووری هەرێمییەکان دادێن دەبێت لە لایەن دەسەڵاتە یەکگرتووەکان پەسەند بکرێت[١٢] و ئەو ڕێکخستنە کە لە

دەستووری هەرێمیدا هەیە ڕێکخستنێکی تەواوە چونکە هەموو ئەو دامەزراوانەی تێدایە کە دەسەڵات و سیماکانی دەوڵەت بەخۆوە دەگرێت هەر کاروباری دەرەوە نەبێت، و ئەو ڕێکخستنە تەنها لە سنووری سەربەخۆیی کارگێڕی نییە کە یەکە هەرێمییە لامەرکەزییەکان لە دەوڵەتی یەکبوو پیادەی دەکەن بەڵکو ئەو سنوورە دەبەزێنێت بەرەو سەربەخۆیی لە بواری یاسا دانان و هەبوونی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی سەربەخۆ و دەزگای دادوەری هەرێمیی سەربەخۆ[١٣]. بەم جۆرەش دەوڵەتی ئەندام لە یەکیەتی فیدراڵی هەموو ڕوخسار و کۆڵەگەکانی دەوڵەتییان تێدایە لەبوونی گەل و هەرێم و دەسەڵاتی خاوەن سەروەری لەگەڵ بوونی یەک قەید ئەویش نەبوونی سەروەری دەرەوەیە[١٤].

**٢ – دەسەڵاتی یاسادانانی سەربەخۆ:**

یەکێک لە گرنگترین ڕوخسارەکانی ڕێکخستنی خودی (التنظيم الذاتي-Auto organization) ئەوەیە کە دەوڵەتی ئەندام دەسەڵاتێکی یاسا دانانی سەربەخۆیی هەبێت کە بەئەرکی یاسادانان لە مەسەلە نێوخۆییەکان کە بەپێی دەستووری فیدراڵی و هەرێمی دەسەڵاتی تێدا پێ دراوە هەستێت و ئەو دەزگایانەی یاسا دانان لە هەندێک دەوڵەتی ئەندام لە دوو ئەنجوومەن و لەسەر هەمان شێوەی دەزگای یاسادانانی یەکگرتوو پێک دێت لە کاتێک کە لە هەندێ دەوڵەتی دیکە لەیەک ئەنجوومەن پێک دێت و شێوەی گشتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەوەیە کە دەسگاکانی یاسا دانان لە ویلایەتەکان لە دوو ئەنجوومەن پێک بێن یەکێکیان بۆ نوێنەرەکان و ئەوەی دیکە بۆ پیران لەسەر هەمان شێوەی پەرلەمانی یەکگرتوو (کۆنگرس) بەڵام هەندێکیان وەکو ویلایەتی نبراسکا Nebraska بەسیستەمی یەک ئەنجوومەنی وەرگرتووە[١٥]. بەڵام دەزگای یاسا دانان لە دەوڵەتی ئەندام (Canton) لە سویسرا لە یەک ئەنجوومەن پێک دێت و ئەنجوومەنەکانی یاسا دانان لە ویلاتە جیاجیاکان پەنا بۆ ڕیفراندۆمی گشتی و ئامرازەکانی دیموکراسی نیمچە ڕاستەوخۆی دیکە دەبەن[١٦].

پەرلەمانی ویلایەت لە هەندێک ویلایەت لە هند و لە ژێر سێبەری دەستووری ١٩٥٠دا لە دوو دەزگا پێک دێت کە کۆمەڵەی یاسا دانانە Federal Assembly و ئەنجوومەنی یاسا دانانە Legislative Council لە کاتێکدا لە هەندێک ویلایەتی دیکە تەنها لە کۆمەڵەی یاسا دانان پێک دێت.

بەڵام ئەوەی پەیوەندارە بەدەسەڵاتی ئەنجوومەنەکانی یاسا دانانی هەرێمەکان جیاوازی لە

سیستەمێک بۆ سیستەمێکی دیکە هەیە ئەوەش پێوەندی بەمەودای جێگیربوونی سیستەمی فیدراڵی و قوڵبوونەوەی پیادەکردنی هەیە و لەو دەوڵەتانەی کە سیستەمی فیدراڵی پێشکەتوو و نموونەیان (نموذجی) هەیە وەکو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبینین کە دەسگاکانی یاسادانانی هەرێمییەکان هەروەها وەکو دەزگاکانی دیکەی هەرێم دەسەلاتێکی فراوانیان هەیە لەبەرئەوەی دەستووری فیدراڵی دەسەلاتەکانی پەرلەمانی یەکگرتووی دەستنیشان کردووە لە کاتێکدا کە هەموو ئەو دەسەلاتانەی لە دەستوور نەهاتوون بۆ دەسەلاتی یاسا دانانی هەرێم بەجێماوە، بۆیە دەسەلاتی ویلایەتەکان و لە نێوانیاندا پەرلەمانە هەرێمییەکان بەسەرەکی دادەندرێت بەپێی دەستووری ئەمەریکی[١٧].

دەستووری فیدراڵی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی١٩٤٩ دەرفەتی بەئەنجوومەنەکانی یاسا دانانی ویلایەتەکان داوە و لە چوارچێوەی دەسەلاتەکانیان لە بواری یاسا دانان مافی گرێدانی پەیماننامەیان هەبێت لەگەڵ دەوڵەتە بێگانەکان بەلام لە دوای ڕەزامەندی حکوومەتی یەکگرتوو[١٨].

بەلام دەبینین کە مادە (٩٢) لە یاسای باکووری ئەمەریکای بەریتانی ساڵی ١٨٦٧دەسەلاتێکی تەسک و کەمی بۆ ئەنجوومەنەکانی یاسا دانان لە هەرێمەکان داناوە لە کاتێکدا کە مادە (٩١) لە هەمان یاسا دەسەلاتێکی فراوانی بۆ پەرلەمانی کەنەدایی یەکگرتوو تەرخان کردووە ئەو پەرلەمانەی کە بەپێی ئەو یاسایە خاوەن دەسەلاتە بۆ ڕاگرتنی هەر یاساییێک کە دەزگای یاسادانانی هەرێمی دەری دەکات[١٩] و ئەو ئاستەنگانەی کە خراونەتە سەر دەسەلاتی هەرێمەکان پاڵی بەیاسازان ویبیر Wheare نا کە بڵێت دەستووری کەنەدا دەستوورێکی نیمچە فیدراڵییە Quasi Federal[٢٠].

٣- دەسەلاتی جێبەجێ کردنی هەرێمی:

ڕێکخستنی خودی دەوڵەتە ئەندامەکان بێجگە لە دەسەلاتی یاسا دانان دەسەلاتی جێبەجێکردن بەخۆوە دەگرێت کە هەڵدەستێت بەئەرکی فەرمانبەرایەتی کارگێڕی لە دەوڵەتی ئەندام و هەروەها جێبەجێکردنی یاسا و ڕێسا و بڕیارەکان چ هی یەکیەتی بن یاخود هەرێمیی بێجگە لەوەش بەئەرکی پاراستنی ئاسایش و سەقامگیری و ئەرکەکانی دیکە کە بۆی دانراوە هەڵدەستێت.

دەسەلاتی جێبەجێکردن لە دەوڵەتی ئەندام لە سەرۆکەکەی پێک دێت کە بەزۆری بەفەرمانڕەوا (حاکم) ناوزەد دەکرێت و لە هەندێک لە ویلایەتەکانی ئەمەریکا فەرمانڕەوا

لە ڕێگای هەڵبژاردن لە لایەن ئەنجوومەنی یاسا دانان و ئێستا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە لایەن هاووڵاتیانی ویلایەتەکە هەڵدەبژێردرێت.

دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە ویلایەتەکانی هند و بەپێی دەستووری فیدراڵی ساڵی ١٩٥٠ لە پارێزگاری ویلایەتەکە پێک دێت و سەرۆک کۆماری یەکگرتوو دایدەمەزرێنێت و بۆ ماوەی مانەوەی خۆی لە پلەی سەرۆکایەتی و هەروەها لە سەرۆک وەزیرانی ویلایەت کە لە لایەن پارێزگاری ویلایەت دادەمەزرێت هەروەها وەزیرەکانی ویلایەت لە لایەن پارێزگاری ویلایەت دادەمەزرێن بەڵام لەسەر پێشنیاری سەرۆک وەزیرانی ویلایەتەکە[٢١] و لە فەنزەویلا پارێزگار و ئەندامانی دەزگای جێبەجێکردنی ویلایەت لە لایەن سەرۆک کۆماری یەکگرتوو دادەمەزرێن. شایانی باسیشە لەم بوارەدا سپاردنی ئەرکی دامەزراندنی سەرۆک و ئەندامانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە دەست حکوومەتی یەکگرتوو خەتەرناکی پێک دەهێنێت لەسەر سەربەخۆیی ویلایەتەکە و جۆرە کەموکورییێک لەو سەربەخۆییە پەیا دەکات لەبەرئەوەی دەست تێوەردانی حکوومەتی فیدراڵی لە دامەزراندنی ئەندامانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کارتێکردن لە هەڵبژاردنی ئەندامانی دەزگای یاسادانان و ئەو کارەش تەهدیدی قەوارەی (کیان) ویلایەتەکە دەکات و بەتایبەتی سەربەخۆیی خودی ویلایەتەکە ئەوە و ئەگەر زانیمان کە یەکێک لەو پرنسیپە بنەڕەتییانەی کە فیدراڵییەت لەسەری ڕادەوەستێت ئەوەیە کە دەبێت سەربەخۆیی خودی ویلایەتەکان زامن بکرێت[٢٢] بێجگە لەوەش پێویستە کە دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە دەوڵەتی ئەندام سەربەخۆبێت واتە ملکەچی چاودێری و سەر وەسیەتی لە لایەن دەسەڵاتەکانی یەکگرتوو نەبێت لەبەرئەوەی لەو کاتەی کە چاودێری یاخود سەر وەسیەتی پەیا دەبێت دەوڵەتی یەکگرتوو سیمای یەکیەتی لە دەست دەدات و دەبێتە تەنها دەوڵەتێکی یەکبوو سادە[٢٣].

### ٤- دادوەری سەربەخۆ:

چۆنیەتی ڕێکخستنی دادگاکان گرنگییەکی گەورەی هەیە بۆ زانینی ئاستی سەربەخۆیی دەسگای دادوەری هەرێم بەرامبەر بەحکوومەتی یەکگرتوو و بێ گومان پێوەری گونجاو بۆ سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری لە دەوڵەتی ئەندام ئەوەیە کە بڕیارەکانی کۆتایی بن و قابلی تانە لێدان نەبن لەپێش دادگاکانی یەکگرتوو.

و یاسازان Wheare دەڵێت ئەگەر نیاز وابوو کە پرنسیپی فیدراڵییەت بەوردی پیادە

بکرێت دەبێت چاوەڕوانی دامەزراندن و دانانی سیستەمی دوانەیی دادگاکان بین لە دەوڵەتی فیدراڵی بەشێوەییێک کە دەبێت تایفەیێک دادگا هەبێت بۆ ڕاڤە و پیادەکردنی یاساکانی حکوومەتی گشتی (یەکیەتی) و تایەفێکی دیکە بۆ ڕاڤە و پیادەکردنی یاساکانی هەر ویلایەتێک[٢٤] و بەبۆچوونی ئەو واتە وییر Wheare ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە پیادەکردنی ئەو پرنسیپە نزیک دەبێتەوە لەبەرئەوەی سیستەمێکی بۆ دادگا فیدراڵییەکان داناوە کە لە دادگاکانی ناوچەکان دەست پێدەکات و بەرز دەبێتەوە بۆمیانی تایفەیێک لە داگاکانی تێهەڵچوونەوەی گەڕۆک (Circut courts) هەتا دەگاتە چلەپووپە پەیکەری دادوەری (الهرم القضائي) کە دادگای باڵایە Supreme court ئەمە بە هاوتەریبی لەگەڵ سیستەمێک بۆ دادگاکانی ویلایەتە کە ئەویش بەدادگای باڵای ویلایەت کۆتایی پێ دێت[٢٥].

بەڵام یاسازان جیمس برایس James Bryce بۆ ئەوە دەچێت کە «دەسەڵاتی دادوەری دادگاکانی ویلایەت لە هەردوو بواری شارستانی و تاوانکاری سنووردار نییە بەشێوەییێکی گشتی و تانە لە بڕیارەکانی لە پێش دادگاکانی فیدراڵی نادرێت تەنها ئەو کێشە دیارکراوانە نەبێت کە لە دەستووری فیدراڵی دەستنیشان کراون ئەوانیش ئەو کێشانەن کە پێوەندن بەیاسای فیدراڵییەوە[٢٦]. بەڵام وییر Whearدەڵێت ئەو سەربەخۆییە تەواو نییە چونکە هەندێک کێشە هەن کە کۆنگرس دایناوە کە لە لایەن دادگا فیدراڵییەکان سەیر بکرێن وەکو ئەو تاوانانەی کە دژی ویلایەتە یەکگرتووەکان و دەسەڵاتە دەریاییەکان ئەنجام دەدرێن وە کێشەکانی (براءة الاختراع) و مافەکانی چاپکردن و ئیفلاس و ئەو کێشانە خراونەتە ژێر دەسەڵاتی دادگاکانی فیدراڵی لە ناوچەکان بۆ قەدەغەکردنی تێڕوانین و یەکلاکردنەوەی ئەو کێشانە لە لایەن دادگاکانی ویلایەت[٢٧].

شایانی باسیشە چ کاتێک لەو کێشانەی کە لەپێش دادگاکانی ویلایەت هەر مەسەلەییێکی پێوەندار بەدەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یاخود یاساکانی کۆنگرس و پەیماننامەکان هاتەپێش ئەو جۆرەکێشانە دەبێت لە لایەن دادگاکانی فیدراڵی سەیر بکرێت یا لە سەرەتاوە یاخود لە دواییدا لە لایەن دادگای باڵای فیدراڵی Supreme Court ئەویش بەو ڕێچکەی کە کێشەکە لە دادگای ویلایەت دەگوازرێتەوە بۆ دادگای فیدراڵی یاخود بەو پێیەی کە تانە لەو جۆرە داوایە لەپێش دادگای باڵای ویلایەتە یەکگرتووەکان دەدرێت[٢٨].

بەهەر حاڵێک بێت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سیستەمێکی دوانەی دادگاکانی دامەزراندووە کە بێ هاوتایە لە جۆریدا[٢٩].

بەڵام لە سویسرا سەربەخۆیی دەزگای دادوەری هەرێمیی لە ئاستی هاوتا ئەمەریکییەکەی خۆی نییە لەبەرئەوەی دادگاکانی دەوڵەتە ئەندامەکان Cantonal courts و لە کاتی جێبەجێکردنی کارەکانی خۆیان لە پیادەکردنی یاسا فیدراڵی و هەرێمییەکان ملکەچی هەندێک تەحەفوزات دەبێت چونکە دادگای فیدراڵی (دادگای باڵای سویسری) وەکو دادگاییەکی پێداچوونەوە لە سەرووی هەموو دادگا هەرێمییەکان ڕادەوەستێت و دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە لە ڕێگای پێداچوونەوە سەیری هەموو ئەو کێشە شارستانییانە بکات کە نرخیان (١٠٠٠٠) دە هەزار فرەنکە یاخود زیاترە[٣٠].

لە کەنەدا دادگاکان لە سیستەمی دادگاکانی یەک لایەنە و یەکبوو نزیک دەبنەوە و لەگەڵ ئەوەی کە دەسەڵاتێکی تەواو لە دەستوور هەیە کە پەرلەمانی یەکگرتوو (یەکیەتی) و هەروەها پەرلەمانەکانی هەرێمەکان سیستەمێک بۆ دادگاکان دابمەزرێنن هەر یەکێکیان لە چوارچێوەی بواری کارکردنی خۆی و لەگەڵ ئەوەی هەردوو لایەن ئەم دەسەڵاتەیان بەکارهێناوە بەڵام هەموو دادوەرەکان لە لایەن حکوومەتی یەکیەتی دادەمەزرێن و مووچە وەردەگرن هەروەها دادگای باڵای یەکیەتی Supreme Court دەسەڵاتی هەیە وەکو دادگاییەکی پێداچوونەوە لەسەر هەموو ئەو بڕیارانەی کە لە دادگاکانی هەرێمەکان لە کێشە شارستانی و سزاییەکان دەردەچن و لەوەتی یاسای دادگای باڵای کەنەدی لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٩ دەرچووە ئەم دادگایە بووە بەلایەنی دوایی و کۆتایی بۆ پێداچوونەوە لە هەموو کێشە دادوەرییەکانی کەنەدا[٣١].

بەڵام لە هند و بەپێی دەستووری فیدراڵی ساڵی ١٩٥٠ هەستان بەدامەزراندنی دادگای باڵا لە ویلایەتەکان و دادگاییەکی باڵای ناوەندی لە پایتەختی یەکیەتی بەڵام لە هند و بەپێچەوانەی بارودۆخ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سیستەمی دادوەری یەکبووی (نظام القضاء الموحد) پێڕەوکرد بەو جۆرەی کە دادگای باڵای یەکیەتی لە سەرووی پێبلکەی دادوەری و لەسەر دادگا باڵاکانی ویلایەتەکان و دادگاکانی ناوەند و دادگاکانی دیکە لە ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی ڕادەوەستێت و بواری کارکردنی دادگای باڵای یەکیەتی درێژ دەبێتەوە بۆ هەموو ئەو کێشانەی کە دەکەونە ژێر ڕکێفی یاساکانی ولایەتەکان و یاساکانی یەکیەتی و هەموو ئەو بڕیارانەی کە لە دادگا باڵاکانی ویلایەتەکان دەردەچن قابلی تانەلێدانن بەڕێچکەی پێداچوونەوە لەپێش دادگای باڵای یەکیەتی[٣٢].

٥- سەربەخۆیی دارایی دەوڵەتە ئەندامەکان:

سەرچاوە داراییەکان بەیەکێک لە پێویستییە کاکڵەیەکانن بۆ کارکردن و سەرکەوتنی هەر حکوومەتێک دادەندرێن چ حکوومەتێکی یەکگرتووبێت یاخود یەکبوو و چ حکوومەتێکی یەکگرتوو بێت یاخود هەرێمی لەبەرئەوەی هیچ حکوومەتێک ناتوانێت کارە پێراسپاردراوەکانی خۆی جێبەجێ بکات بەبێ هەبوونی سەرچاوەی دارایی بەشێوەی کفایەت و بۆ دیارخستنی ئەو گرنگییە هەندێک[٣٣] ئەو سەرچاوانە بەخوێنی ژیان Life Blood بۆ دەوڵەتی تازە دادەنێن. ئەمە لە لایێک و لە لایێکی دیکە پرنسیپی فیدراڵی وا پێویست دەکات کە هەریەکە لە حکوومەتە گشتییەکان و حکوومەتە هەرێمییەکان سەربەخۆبن لە یەکتری لە بواری داندراو بۆ هەر یەکێکیان و هەروەها هیچ کامێکیان کلکایەتی نەبێت بۆ ئەوەی دیکە بەڵکو دەبێت هاوتەریب بن و پیادەکردنی ئەو پرنسیپە وا پێویست دەکات کە سەرچاوەی دارایی تەواو لە ژێر دەسەڵاتی سەربەخۆی هەریەکە لە حکوومەتە گشتییەکە و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان هەبێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو دەسەڵاتانەی کە تەنها بەوان سپێردراوە و هەروەها جێبەجێکردنی ئەرکە پێویستەکانی دیکەیان[٣٤]. بەو پێیەش دەبێت دەوڵەتی ئەندام لە یەکیەتی فیدراڵی بودجەی خۆی هەبێت و سەربەخۆش بێت لە بودجەی فیدراڵی[٣٥] چونکە لەبەر ڕۆشنایی قسەکانی سەرەوە هەر چۆن پێویستە حکوومەتی یەکگرتوو توانای لە دەست بەسەراگرتن و زاڵبوونی بەسەر سەرچاوە داراییە بۆ دابینکردنی پێویستەکانی یەکێتیُ هەر ئەوهاش پێویستە کە حکوومەتی ویلایەت توانایێکی هاوچەشنی هەبێت سەبارەت بەپردکردنەوەی پێویستییە زۆر و هەمەڕەنگەکانی. بەڵام پێدانی دەسەڵاتی دارایی ڕەها تەنها بەجۆری یەکەم واتە حکوومەتی یەکگرتوو و بەتایبەتی لە بواری سەپاندنی باجەکان لەوانەیە زوو یا درەنگ کارێکی وا بکات کە جۆری دووەم واتە حکوومەتی ولایەت ڕووت بکرێتەوە لە ئامرازەکانی دابینکردنی پێداویستییە زەرووریەکانی[٣٦] بەڵام لە پێش چوونە ناو وردەکارییەکان دەبێت جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە پێویستە حکوومەتی یەکگرتوو دەست بەسەراگرتن و زاڵبوونێکی تەواوی هەبێت لەسەر کاروباری دراو بەڵکو تاکە دەسەڵات بێت لەو بوارە بۆ وە ئەوەش لێدانی دراوی کانزایی (العملة المعدنية) وە دەرکردنی دراوی کاغەز (العملة الورقية) دەگرێتەوە وە ئەو دەسەڵاتە لە هەموو سیستەمە فیدراڵیەکان دراوەتە ئەو حکوومەتە وە دەسەڵاتی دارایی لە لایەن دادگای باڵای ئەمریکی Supreme

Court له کێشەی مەرجەکانی زێڕ لە ساڵی ١٩٣٥ وەسفکراوە بەوەی کە (دەسەڵاتێکی نیشتیمانی فراوان و گشتگیرە لەسەر هەموو بابەتەکانی داهاتەکان وە دارایی و دراو)[٣٧] هەروەها حکوومەتی گشتی خاوەن دەسەڵاتە لە بواری بانکەکان هەرچەندە لە ئەمەریکا ناگاتە ئەوەی کە دەسەڵاتی لەسەر ئەو بانکانە هەبێت کە لە ژێر سێبەری یاسای ویلایەت دادەمەزرێن وە ئەو کاروبارە بانکییەی کە لە سنووری ویلایەتی پێوەندار تێناپەڕێت[٣٨] بەڵام ئەو دەسەڵاتە لە ئوستورالیا دوورتر دەچێت بۆ ئەوەی دەزگا بانکییەکانی ویلایەتەکان بگرێتەوە مادامەکی کارەکانیان پێوەندە بەبابەتی ئیئتیمان وە ئەگەر لەو سیستەمە داراییيانە کە لە لایەن زۆربەی زۆری دەوڵەتە فیدراڵییەکان وردبینەوە دەبینین کە لەسەر بنەمایەک ڕاهاتوون کە بریتییە لەوەی (حکوومەتە گشتییەکان دەسەڵاتێکی ڕەهاو وە بەتەنهایان هەیە لەو بوارەی کە پێوەندە بەڕسوومی گومرگی واتە ئەو ڕەسمانەی کە لەسەر دەرچووەکان وە داهاتەکان (الصادرات والواردات) دەسەپێن چ سەبارەت بەسەپاندنیان یاخود بەکارهێنانی داهاتەکانیان[٣٩] بەڵام لە بواری باجەکانی دیکە حکوومەتە گشتییەکان دەسەڵاتە داراییەکانیان لەگەڵ حکوومەتە هەرێمییەکان دابەش دەکەن بەشێوەیێک کە حکوومەتە هەرێمییەکان داهاتی خۆیان لە موڵکە گشتییەکانی خۆیان و کارە بازرگانییەکان دابین دەکەن و زۆربەی زۆری دەوڵەتە ئەندامەکان زەوی و زاریگشتییان هەیە کە داهاتێکی دیاریان بۆ دابین دەکات هەروەها کرێش وەردەگرن لە خوێندن و فێرکردن و کارە خزمەتگوزارییەکانی دیکە کە پێشکەش بەهاووڵاتیانی دەکەن و بۆ نموونە دەبینین کە ویلایەتەکانی ئوستورالیا هێڵی ئاسنی شەمەندەفەری تایبەت بەخۆیان هەیە و لەگەڵ ئەوەی کە نابێت زیادەڕۆیی لە سەربەخۆیی دارایی ویلایەتەکان بکەین بەڵام دەبینین کە هەردوو دەستووری کەنەدی و ئوستورالی یەکسانیان لە نێوان حکومەتە گشتی و حکوومەتە هەرێمییەکانیان پێڕەو کردووە لە قەدەغەکردنی هەردوو لایان لە سەپاندنی باجەکان بەسەر موڵکەکانی لایەنی دیکە، هەروەها دادگای باڵای ئەمەریکی Supreme Court بڕیاری داوە بەپێڕەوکردنی پرنسیپێکی هاوشێوە هەرچەندە ئەو پرنسیپە بەڕاشکاوی لە دەستووری ئەمەریکی نەهاتووە.

سەبارەت بەسەپاندنی باجەکان پیادەکردنی تیوریانەی پرنسیپی فیدراڵی ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو حکوومەتەکان لە چوارچێوەی یەکیەتی فیدراڵی و هەریەکێکیان لە سنووری خۆی دەسەڵاتی خۆی هەر بۆ سەپاندنی باجی هەبێت بەبێ ئەوەی هیچ ئاستەنگێک لە

لایەن حکوومەتەکانی دیکە بەسەریدا بسەپێت لەبەرئەوەی دەسەڵاتەکەی لە بواری سەپاندنی باجەکان ئەبێت سەربەخۆبێت بەڵام لە ئەنجامی پیادەکردنی پراکتیکی دەبینین کە حکوومەتەکان ئەو پرنسیپەیان بەشێوەیێکی تەواو جێبەجێ نەکردووە و بۆ نموونە لە کەنەدا هەرچەندە کە حکوومەتە هەرێمییەکان دەسەڵاتی سەپاندنی باجە ڕاستەوخۆیەکانیان لە چوارچێوەی هەرێم پێ دراوە بۆ پەیاکردنی داهات بۆ ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیان و هەروەها دەسەڵاتی پێدانی مۆڵەت بەدوکان و سالۆن و قاوەخانە و جێگا گشتییەکان و بەدەلالەکان بۆ پەیاکردنی سەرچاوە بۆ ئامانجە هەرێمی و خۆجێی و شارەوانی بەڵام دەسەڵاتی هەرێمەکان لە سەپاندن و وەرگرتنی باجەکان دەسەڵاتێکی سنووردارە(٤٠).

بەڵام لە ئوستراليا وا دیارە کە دەسەڵاتی ویلایەتەکان لە سەپاندنی باجەکان لە سەرەتای دامەزراندنی یەکیەتی زۆر ئازادانە تربوو، و لەگەڵ توانینی پەرلەمانی کومونویلس بەدەرکردنی یاسا تازەکان سەبارەت بەباجەکان بەڵام دەسەڵاتی ویلایەتەکان لە بواری دارایی هەر وەکو خۆی کە لەکاتی دامەزراندنی یەکیەتی پێی درابوو مایەوەو ویلایەتەکان دەتوانن باجەکان لەسەر مولکە فیدراڵییەکان بسەپێنن بەڵام بەمەرجێک پەرلەمانی یەکگرتوو مۆڵەتیان پێ بدات.

لە سویسرا دابەشکردنی بنچینەیی دەسەڵاتەکان بەو شێوەیە بوو کە دەسەڵاتی سەپاندنی ڕسومی گومرگی لە پسپۆڕیەتی حکوومەتی یەکیەتی بێت هەر وەکو لە زۆربەی زۆری سیستەمە فیدراڵییەکان پێڕەوکراوە بەڵام ئەو دەسەڵاتە نەدەگەیشتە بواری باجەکانی دیکە چونکە سەپاندنی باجە ناڕاستەوخۆیەکانی دیکە و سەپاندنی باجەکانی ڕاستەوخۆ بۆ دەسەڵاتی کانتونەکان بەجێماوە(٤١).

بەڵام لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستووری ئەمەریکی دەسەڵاتی سەپاندنی باج و غەرامە و ڕسوم و مکوس و وەرگرتنیانی داوە بەکۆنگرس (پەرلەمانی یەکگرتوو)(٤٢) بەڵام ئەو دەسەڵاتە سنووردارە بەسەپاندنی یەک شێواز لە باج و ڕسوم و مکوس لە هەموو سوکێکی یەکیەتی هەروەها سەپاندنی باجی کەسیەتی یاخود باجی دیکە لە باجە ڕاستەوخۆیەکان قەدەغە کرد مەگەر لەسەر بنچینەی ڕێژەی دانیشتوان ببێت و بەپێی ئەو ئامارە گشتییەی کە دەستوور بڕیای داوە بەجێبەجێکردنی(٤٣) و لەو کاتەی کە دەستوور ویلایەتەکانی قەدەغەکردووە لە سەپاندنی باجەکان لەسەر کاڵا دەرچووە و هاتووەکان تەنها مەگەر بەڕەزامەندی کۆنگرس بێت(٤٤) بەڵام ڕێیان لێ نەگیراوە لە

سەپاندنی باجە ڕاستەوخۆیەکان Direct tax و حکوومەتەکانی ویلایەتەکان بەشێوەیێکی گشتی باجی موڵکداری Property tax دەسەپێنێت هەروەها حکوومەتەکانی ویلایەتەکان باجی ڕاستەوخۆی دیکە دەسەپێنن وەکو ڕسومی مۆڵەت و جیاووکەکان و باجی میراتی و باجی دەرامەت و ئەوانی دیکە[٤٥] ئەگەر ئەمەش بارودۆخی دابەشکردنی دەسەلاتە داراییەکان بێت لە نێوان حکوومەتی گشتی و حکوومەتە هەرێمییەکان لەسەرەتای دامەزراندنی سیستەمی فیدرالی لەو دەوڵەتانە ئەوەی جێگای سەرنجە کە ئەو ڕێکخستنە گۆڕانکارییێکی گەورەی بەسەرهات لە ئەنجامی ئەو ڕووداوانەی کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم هاتنەپێش و لە هەموویان گرنگتر هەردوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم و سستبوونی ئابووری (الكساد الاقتصادي) بوو چونکە ئەو ڕووداوانە وایان کرد کە داهاتەکانی حکوومەتە گشتییەکان زۆرکەم ببیتەوە بەهۆی دابەزینی ئاستی بازرگانی نێودەوڵەتی و هەروەها زیادبوونی خەرجی ئەو حکوومەتانە بەهۆی بارودۆخی جەنگ و پێداویستییەکانی کە پێویستی بەبەکارهێنانی داهات و وزەکان بۆ ئەم مەبەستە دەرکرد و ئامادەکردنی خەرجەکانی چەک کڕین ئەو کارەی کە پاڵی بەحکوومەتەکان نا کە لە بواری تازە بگەڕێن بۆ سەپاندنی باجی تازە بەمەبەستی خڕکردنەوەی داهاتی دیکە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو کەم دەرامەتییەی کە تووشی بوون بۆیە دەبینین کە حکوومەتە گشتییەکان لە دەوڵەتە فیدراڵییەکان داخڵی گۆڕەپان و بواری باج و دارایی تازەبوون کە پێشتر تەنها بۆ حکوومەتە هەرێمییەکان تەرخان کرابوو و حکوومەتە گشتییەکان ڕێچکەی پێشکەشکردنی یارمەتی داراییان (المنح المالية) Grants بۆ حکوومەتە ئەندامەکانیان گرتە بەر بۆ قەرەبووکردنی ئەو حکوومەتانە لەو زەرەر و زیانانەی کە لێیان کەوتووەو ئەو کەم دەرامەتییەی کە لە ئەنجامدا تووشی بوونە. لە سویسرا و لە ژێر کاریگەری جەنگی جیهانی یەکەم و لەگەڵ بەشدار نەبوونی تیایدا ئەو وڵاتە سوپای خۆی لە حاڵەتی ئامادەباشی بۆ ماوەیێکی دوورودرێژ هێشتەوە و بەهۆی دابەزینی ئاستی داهاتەکانیان لە بازرگانی نێودەوڵەتی و هێڵەکانی ئاسن چەندەها جار دەستووری یەکگرتووی هەموارکرد- ئەو هەموارکردنانە کە بەنادەستووری لە قەڵەم دەدرێن بەبۆچوونی هەندێک- [٤٦] بەمەبەستی هەڵڕەخساندن بۆ حکوومەتی یەکگرتوو بۆچوونە ناو بواری باجی ڕاستەوخۆ و باجەکانی دەرامەت و موڵکداری و قازانج لە ساڵانی ١٩١٥ و ١٩١٩سەپێندران هەروەها دوو باجی دیکە لە ساڵی ١٩١٧ سەپێندران. بەڵام لەو هەموو هەموارکردنانە برگەی وایان تێدا هاتبوو کە بەشێک لەو باجانە بدرێنە حکوومەتەکانی

کانتونەکان و چەندەها هەموارکردنی دەستووری لەم بوارە کرا هەروەها هەندێک هەموارکردنی دەستووری ئەنجام درا کە بووە هۆی دووبارە دابەشکردنی دەسەڵات و فەرمانبەراتییەکان کرا. هەروەها دووبارە دابەشکردنی سەرچاوە داراییەکان بۆ هەریەکە لە حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی کانتونەکان بۆ ئەوەی بتوانن ئەرکەکانی خۆیان بەپێی بارودۆخی تازە جێبەجێ بکەن و بەم جۆرەش دەوڵەتە ئەندامەکان وازیان لە بەشێک لەسەرچاوە داراییەکانی خۆیان هێنا بەڵام بەرامبەر ئەوە داوای بەشێکی دیاریکراویان کرد لەو سەرچاوە داراییانەی کە بۆ حکوومەتی یەکگرتوو دەستیان لێ هەڵگرت و بەشێوەیێکی فعلی ضماناتی دەستووریان پێدرا بەوەرگرتنی ئەو بەشانە لە ڕێگای ڕێچکەیێک کە بە بەشداری یاسایی Legal particpation ناوزەد کراوە بەڵام ئەوە کفایەتی پێویستییەکانی کانتونەکانی نەدەکرد بۆیە ناچاربوون کە پشت بەیارمەتی دارایی ببەستن کە لە لایەن حکوومەتی یەکگرتوو پێشکەشیان دەکرا و بڕی ئەو Crants یارمەتییانەی لە جیاتی بەشە یاساییەکان کە لە دەستوور هاتبوو دەدرا زیادکرا وە بڕی ئەو یارمەتییە داراییانە کە بۆ ساڵی ١٩٦٠ تەرخان کرابوو گەیشتە ڕێژەی ١٠ ٪ لە کۆی دەرامەتی کانتونەکان بۆ ئەو ساڵە و هەروەها ئەو یارمەتییانە زیادبوونی بەردەوامیان بەخۆوە دیت[٤٧] و لە کەنەدا و لە ئەنجامی جەنگی جیهانی دووەم پاڵەپەستۆ لەسەر حکوومەتی دوومنیون زیادی کرد و لە دوای زنجیرەیێک لە گفتوگۆ و تەماع پیشاندان لە ساڵی ١٩٤٢ قەناعەت بەهەرێمەکان کرا کە واز لە بواری باجی دراەمت بێنن لە ماوەی جەنگدا و هەتا دوانزە مانگ لە بەرواری کۆتایی هاتنی بەرامبەر ئەوەی کە یارمەتی دارایی ساڵانە وەربگرن و لەسەر بنچینەی بڕەکانی باجی دەرامەت کە وەری دەگرت یاخود لەسەر بنچینەی ئەرکەکانی لەگەڵ فایزی قەرزەکان حسێب بکرێت، و لە ساڵی ١٩٤٧ هەموو هەرێمەکان تەنها کیوبیک و ئونتاریو نەبێت ڕێکەوتنێکی دیکەیان لەگەڵ حکوومەتی دومینون سەبارەت بەمەسەلە داراییەکان بەستا و دوا بەدوای ئەوەش چەند ڕێکەوتنێکی بەردەوام بەسترا کە ماوەی هەر یەکێک لەو ڕێکەوتنانە پێنج ساڵ بوو، هەروەها ئونتاریوو بەشدارییێکی سنوورداری لە ڕێکەوتی ساڵی ١٩٥٢ کرد و ئەو سیستەمە هەر وەکو دەردەکەوێت هات بۆ ئەوەی بمێنێتەوە هەرچەندە بواریش هەبوو بۆ گفتوگۆ و هەمواركردن سەبارەت بەمەرجەکانی ئەو ڕێکەوتنانە و لە هەموو قۆناغەکانی دانووستان لە سەریان[٤٨].

لە ئوسترالیا کومونولث واتە حکوومەتی یەکیەتی و بەهۆی پێویستی زیادی بۆ سەرچاوە

داراییـیەکـان- و لە دوای ڕەتکردنەوەی پێشنیـارەکەی لە لایەن ویلایەتەکـان سـەبارەت بەدەست هەڵگرتن لە باجی دەرامـەت- لە سـاڵی ١٩٤٢ چوار یاسـای لەم بوارە دەرکـرد یەکەمـیان بریتی بوو لە سەپاندنی باجێکی دەرامەتی یەکگرتوو و بەرز بەشێوەیێک کە یەکسـان بێت لەگەڵ کۆی هەردوو باجی دەرامـەتی حکوومـەتی یەکیـەتی و حکوومـەتی ویلایەت و یاسای دووەم یارمەتییێکی دارایی پێشنیـار کرد بەهەر ولایەتێک کە دەست لە باجی دەرامەت هەڵبگرێت و بڕی ئەو یارمـەتییە یەکسانە بەتێکڕای ئەو بڕە پارەی کە لەم باجە لە دوو سـاڵی دارایی یەکەم لە جەنگی جیـهـانی دووەم بەدەسـتی دەکەوت، و بەپێی یاسای سێیەم ماف درا بەحکوومەتی یەکیـەتی کە لەپێش ویلایەتەکان قەرزەکانی خۆی کە پێـوەندە بە باجی دەرامـەت وەرگـرێتـەوە ئەو یاسـایەی کـە دادگـای باڵای ئوسـتـرالی بەدەستووری دانا(٤٩) و زانا ویبیر Wheare دەڵێت ئەو یاسایانە وای لە ویلایەتەکان کرد کە قەناعەت بێنن نەک هەر لە لایەنی سیاسی بەڵکو لە لایەنی یاساییش کە ناتوانن زیاتر لەو بڕە پارەیان دەست کەوێت کە حکوومەتی یەکیەتی (کومونولث) پێیان دەدات(٥٠) بۆیە پێـویسـتـیـیێکی زیاد بۆ یارمـەتی دارایی (Crants) پەیابوو و کـۆی ئەو یـارمـەتیـیـە داراییـیـانەی کە کومونولث پێشکەش بەویلایەتەکانی کـردووە لە سـاڵی دارایی ١٩٥٩- ١٩٦٠ گەیشتە ڕێژەی٣٧,٥ ٪ لە کۆی دەرامەتی ویلایەتەکان بۆیە گەورەترین سەرچاوەی ئەو دەرامـەتانەی پێکهێنا و لیژنەی یارمەتیـیـەکـانی کـومـونولث Commonwealth Commissiom دامـەزرا کـە بریتی بوو لە دەزگـاییێک لە شـارەزایانی سـەربەخـۆ بۆ ئەوە دامـەزرا کە لە داواکـارییـەکـانی یارمـەتی دارایی کـە لە لایەن ویلایەتەکـان پێشـکەش بەحکوومـەتی یەکیـەتی دەکرێت بکۆڵێتەوە و ڕاسپاردەیان لەسەر دەرببڕێت بۆ حکوومـەتی یەکیەتی کە هەموو ڕاسپاردەکانی لیژنەی ناوبراوی پەسەند کرد(٥١).

ئەمـە و ویلایەتە یەکگرتـووەکـانی ئەمـەریکا هێـشـتـان سـیـسـتـەمی باجی دوولایەنە (الضريبة المزدوجة) پێڕەو دەکات چونکە هەریەکە لە حکوومەتی یەکیەتی و حکوومـەتی ویلایەتەکـان باج لەسـەر هەمـان سـەرچاوەکـانی داهاتەکـان دەسەپێنن. بەواتاییێکی دیکە دەسـەڵاتی سـەپاندنی باج لە ئەمـەریکا دەسـەڵاتێکی هاوبەشـە(٥٢) چونکە حکوومـەتی یەکیـەتی منافسەی حکوومەتەکانی ویلایەتەکانی کرد لە بواری باجە ڕاسـتەوخۆییـەکـان بەڵام وای نەکـرد کـە حکوومـەتەکـانی ویلایەتەکـان لـەم گـۆڕەپانە دووربخـاتەوە یاخـود ئەو لەویەتیـان لەسـەر بسـەپێنێت(٥٣) و ویلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمـەریکا سـیـسـتـەمی یارمـەتیـیە داراییـیـەکـانی پێڕەوکـرد بەڵام نەک لە ڕوانگەی تەمـاع نیـشـانەدان یاخـود

ناچارکردنی ویلایەتەکان بۆ ئەوەی دەست لە گۆڕەپانی باجەکان هەڵگرن بەڵکو بەمەبەستی یارمەتی دانیان لەجێبەجێکردنی ئەرکەکانییان بەڵام هەتاکو ئێستا میکانیزمێکی دیاریکراوی ئەوتۆ جێگیر نەبووە کە لەسەر بنەمای ئەو یارمەتییەکان دابەش بکرێن بەڵکو ئەمەش دەکەوێتە ژێر کاریگەری هۆکارە سیاسییەکان، ویلایەتەکان بڕی (٥٨٠) پێنج سەد و هەشتا ملیۆن دیناریان بەشێوەی یارمەتی أختیاری لە ساڵی ١٩٣٩ لە حکومەتی یەکیەتی وەردەگرت و ئەمەش دەگاتە ڕێژەی ١٥ ٪ لە کۆی دەرامەتی ولایەتەکان و ئەو ڕێژەیەش بەرزبۆوە بۆ ٢٠ ٪ لە کۆی دەرامەتی ویلایەتەکان لە ساڵی ١٩٥٨ و هەروەها ڕێژەی ناوبراو بۆ ٢٣,٣ ٪ لە ساڵی ١٩٦٠ بەرزبۆوە[٥٤].

بەڵام لە هند دەسەڵاتی سەپاندنی باج و کۆکردنەوەی دەسەڵاتێکی دابەشکراو لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و ویلایەتەکان و بەپێچەوانەی دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی یاسادانان کە لە دەستووری هندی ساڵی ١٩٥٠ پێی وەرگرتووە بەدابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە بواری یاسا دانان بەسەر سێ لیست یەکێکیان بۆ دەزگاکانی یەکگرتوو و دووەمیان بۆ ویلایەتەکان و سێیەمیان هاوبەشە Concurrent لە نێوان یەکیەتی و ویلایەتەکان بەڵام دەسەڵاتی سەپاندنی باجەکان و کۆکردنەوەیان لە دوو لیستدا هاتووە کە لیستی یەکەم بۆ حکوومەتی یەکگرتوو و لیستی دووەم بۆ ویلایەتەکانە[٥٥] بەڵام ئەو دابەشکردنە لە بەرژەوەندی یەکیەتی بوو چونکە دەسەڵاتی ویلایەتەکان لە سەپاندنی باج سنووردار کرا بەسەپاندنی هەندێ باجی دیاریکراو لەوانەی کە لە خشتەی حەفتەمی پاشکۆی دەستوور هاتووە لە کاتێکدا کە دەسەڵاتی حکوومەتی یەکگرتوو لە سەپاندنی باجی دیکە سنووردار نەکرا لەگەڵ ئەوەیش کە لیستێک بەباجەکانی یەکگرتوو هەبوو[٥٦]. هەروەها هند سیستەمی یارمەتی دارایی پێڕەوکرد بەم جۆرەش بەپێی دەقەکانی دەستووری هندی ئاماژە پێکراو لێژنەیێکی دارایی Finnace Commission پێکدێت کە لە نێوان ئەرکەکانی پێشکەشکردنی ڕاسپاردەی پێوەندار بەیارمەتی دارایی بۆ ویلایەتەکان بۆ سەرۆکی هند[٥٧].

سیستەمی یارمەتی دارایی کە لە لایەن حکوومەتی یەکیەتی پێشکەش بەدەوڵەتە ئەندامەکان دەکرێت لە یەکێک لە مۆرکە بەرچاو و گرنگەکانی سیستەمی دارایی لە زۆربەی زۆری دەوڵەتە فیدراڵییەکان دادەندرێت چونکە بەشێوەیێک یاخود شێوەیێکی دیکە لە لایەن ئەو دەوڵەتانە کاری پێدەکرێت. بەڵام ئەگەر ئەو سیستەمە بەڕواڵەتێک لە ڕواڵەتەکانی دەوڵەتە فیدراڵییەکان دابندرێت پرسیارێک لێرەدا خۆی دەسەپێنێت ئەویش

ئایا دەکرێت مەسەلەی دەست نیشانکردنی ئەو یارمەتییانە بۆ حکوومەتی یەکگرتوو بەجێهێڵدرێت و لەسەر ئەوەش پشت بەنیازپاکی ئەو حکوومەتە ببەسترێت کە ئەوە وا دەگەیێنێت دەوڵەتە ئەندامەکان لە ژێر ڕەحمەتی حکوومەتی گشتی بمێننەوە ئەو کارەش هەموارکردنی پرنسیپی فیدراڵی لێ دەکەوێتەوە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێین ناتواندرێت مەسەلەی دەست نیشانکردنی یارمەتییە داراییەکان بەحکوومەتی یەکگرتوو بسپێردرێت و پشت ببەستێت بەنیازپاکی ئەو حکوومەتە لەم بوارەدا و لێرەشدا لەگەڵ ئەوانە[٥٨] ڕێک دەکەوین کە داوای پێکهێنانی دەزگاییێکی هاوبەش لە لێزانان دەکەن کە نوێنەرانی حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی ویلایەتەکانی تێدابێت بۆ ئەوەی هەستێت بەدەست نیشانکردنی بڕی ئەو یارمەتییانە و بڕیاردان دەربارەیان لەسەر شێوەی ئەنجوومەنی قەرز و قوڵەی ئوسترالی Australian Loan Council کە نموونەییێکی پراکتیکی ئەوتۆیە کە دەکرێت لاسایی بکرێت لەم بوارەدا بەمەرجێک پیشەی سەپاندن (صفة الالزام) بەم بڕیارانە بدرێت.

لە ئەڵمانیای یەکگرتوو و لە ژێر سێبەری دەستووره فیدراڵییەکەی ساڵی ١٩٤٩ لایەنێکی گەورە لە باج و ڕسووماتی گمرگی لە کاڵا دەرچوو و هاتووەکان (الصادرات والواردات) و باجی فرۆشتن دراوە بەحکوومەتی یەکیەتی لە کاتێکدا هەندێ باجی کەم بایەخ وەکو باجی میراتی و موڵکداری درا بەحکوومەتەکانی ویلایەتەکان[٥٩] هەروەها دەستووری ئەڵمانی پێڕەوی پرەنسیپی دابەشکردنی هەندێک باجی وەکو باجی دەرامەت و کۆمپانییەکانی کرد بەجۆرێک کە ڕێژەی ٣٥٪ بۆ حکوومەتی یەکگرتوو تەرخان بکرێت و ٦٥٪ بۆ حکوومەتەکانی ویلایەتەکان بێت[٦٠]. بەڵام بارودۆخەکە لەم بوارەدا وەکو خۆی لە کاتی دەرچوونی دەستوورەکە نەماوەتەوە بەڵکو گۆڕانکاری بەسەر داهات بەهۆی ڕووبەڕووبوونەوەی حکوومەتی فیدراڵی لەگەڵ خەرجی زیاتر و چاوەڕوان نەکراو وەکو خەرجی جەنگ و داگیرکردن و خۆ پڕچەککردن ئەو کارەی کە پاڵی پێوەنا داوای بەشێکی زیاتر لە داهاتەکانی ویلایەتەکان بکات[٦١].

هەروەها ئەو بارگرانییە زیادەی کە لە ئەنجامی جەنگی جیهانی دووەم ڕووی دا بەشێوەییێکی گەورەتر کاری کردە سەر ویلایەتە دەست کورتەکان کە لە پێشتریشدا شکاتیان لە کەمبوونی دەرامەتە داراییەکانی خۆیان دەکرد[٦٢]، ئەو کارەش وای کرد کە یەکسانی کردن لە نێوان ویلایەتە کەم دەرامەت و دەوڵەمەندەکان ببێتە کارێکی پێویست. بەڵام ئەو هەنگاوانەی کە لەم بوارە نراون بۆ ئەنجامدانی یەکسانی لە نێوان ولایەتەکان

نەگەشیتوونەتە ئاستی پێویست سەبارەت بەقەرەبووکردنی ویلایەتە فەقیرەکان کە بێزاری خۆی پیشان دا لە پشت بەستن بەویلایەتە دەوڵەمەندە جیرانەکان[٦٣].

بەردەوام بوونی کێشە داراییەکان بووە هۆی دەرچوونی یاساییێکی تازە لە ساڵی ١٩٦٩ کە گۆڕینی پرنسیپەکانی دابەشکردنی داهاتەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی ویلایەتەکان و دەسگا خۆجەیەکانی لێ کەوتەوە چونکە بازنەی ئەو باجانەی کە دابەشکردن دەیانگرێتەوە فراوان بوو بۆ ئەوەی بگاتە دوو لەسەر سێی کۆی گشتی داهاتی هەموو باجەکان. و لەگەڵ بەرهەڵستیکردنی ئەنجوومەنی ویلایەتەکان واتە بووندسرات Bundsrat بۆ یاسای سەرەوە بەڵام لەو یاسایە هاتبوو کە دابەشکردنی داهاتەکانی باجی دەرامەت و کۆمپانییەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی ویلایەتەکان بەشێوەیێکی یەکسان بێت لە دوای بڕینی ڕێژەی ١٤٪ لەو داهاتانە بۆ حکوومەتە خۆجەییەکان[٦٤]. و ئەنجامی کۆتایی دابەشکردنی داهاتەکان ئەوەبوو کە پشکی حکوومەتی یەکگرتوو گەیشتە ٧٠٪ لە کۆی گشتی ئەو داهاتانەی کە دابەشکردن دەیانگرێتەوە لە کاتێک کە پشکی ویلایەتەکان گەیشتە ٣٠٪[٦٥] و بەم جۆرەش دەردەکەوێت کە دابەشکردنی داهاتەکان بەو شێوەیە لە بەرژەوەندی یەکیەتی بۆ لەسەر حسابی ویلایەتە ئەڵمانییەکان.

لە دوای باسکردنی لایەنێک لە سیستەمی دارایی هەندێک لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکان لە پیادەکردنی سیستەمی فیدراڵی پێویستە هەڵوەسەیەک بکەین لەلای پرسیارێکی گرنگ و بەبایەخ ئەویش هەتا چ ڕادەیێک دەوڵەتە ئەندامەکان سەربەخۆییانە هەیە لە بواری دارایی و هەتا چەند ئەوانە زاڵن بەسەر مەسەلە داراییەکان بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێین کە لەو باسەی کە کردمان دەردەکەوێت کە دەوڵەتە ئەندامەکان سەربەخۆیی داراییانەیان هەبوو لە سەرەتای دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە فیدراڵییانەی کە باسمان لێوەکردن بەڵام مەودای ئەو سەربەخۆییە لە دواییدا دەستی بەپاشەکشە کرد هەتا گەیشتە دەسەڵاتێکی سنووردار بۆ بەرژەوەندی حکوومەتی یەکیەتی کەوا بەڕاشکاوی دەرکەوت خاوەن هێزێکی گەورەترە لە بواری دەسەڵاتە داراییەکان لەبەرئەوەی بەئاسانی دەتوانێت داهاتی دارایی پێویست بۆ خۆی دابین بکات بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی لە کاتێک کە حکوومەتەکانی ویلایەتەکان توانایێکی هاوتایان نییە بەڵکو وایان لێهات کە زیاتر پشت بەیارمەتی داراییەکان ببەستن کە حکوومەتی یەکگرتوو پێشکەشیان دەکات ئەو کارەش وای کرد کە دەوڵەتە ئەندامەکان بەپلەیێکی زۆر یا کەم بەکلکایەتی حکوومەتی یەکگرتوو

له بواری دارایی ڕازی بن بەڵام ئەوەش نابێت وامان لێبکات وێنەیێکی ڕەشبین لەسەر پیادەکردنی سیستەمی یارمەتییە داراییەکان وەربگرین چونکە لەگەڵ پیادەکردنی ئەو سیستەمەش دەوڵەتە ئەندامەکان هێشتان لایەنێکی گەورەی سەربەخۆیی دارایی خۆیان پاراستووە.

و وەکو دیتمان ئەگەر دەوڵەتە ئەندامەکان لەو یەکیەتییە فیدراڵییانەی کە باسمان لێوەکردن بڕێکی باشی سەربەخۆیی داراییان هەبێت بەڵام هەندێ سیستەمی دیکە هەیە کە دەوڵەتە ئەندامەکانی خۆی بێ بەش کردووە لە هەموو سیمایێک لە سیماکانی سەربەخۆیی دارایی و لە یەکیەتی سۆڤییێتی پێشوو دەبینین کە مادە ١٤ لە دەستوور ساڵی ١٩٣٦ مەسەلەی پەسەندکردنی بوجەدی یەکبووی یەکیەتی بەدەستەی باڵای پێوەندار لە یەکیەتی سپارد، هەروەها لە دەستووری ساڵی ١٩٧٧ هاتووە کە دەزگا باڵاکان لە یەکیەتی کۆمارە سوشیالیستەکانی سۆڤییێتی هەستن «بەدانانی بووجەیێکی یەکبوو بوو یەکیەتی سۆڤییێتی و پەسەندکردنی و هەروەها پەسەندکردنی ئەو ڕاپۆرتەی کە پێوەندە بەجێبەجێکردن و بەڕێوەبردنی سیستەمی پولی و قەرزپێدان و دانپیانانی باجەکان و داهاتەکان کە بۆ پێکهێنانی بووجەی یەکیەتی سۆڤییێت داندراون و دەست نیشانکردنی سیاسەتی گشتی لە بواری کرێیەکان»(٦٦).

## پرنسیپی بەشداریکردن- مبدأ المشاركة:

سیستەمی فیدراڵی جیاوازی هەیە لەگەڵ سیستەمەکانی دیکەی لامەرکەزی کارگێڕی و سیاسی لە بواری حوکمڕانی کەوا پیادەکردنیان باوە لە چوارچێوەی دەوڵەتی یەکبوو و ڕووی جیاوازییەکە ئەوەیە کە ویلایەتەکان یاخود هەرێمەکان یا کانتونەکانی ئەندام لە دەوڵەتی فیدراڵی و بەشێوەیێکی کاریگەر و کارامە بەشداری لە دەرکردنی بڕیارەکانی دەسەڵاتەکانی فیدراڵی دەکەن.

دەسەڵاتی فیدراڵی پێویستی بەبوونی دامەزراوە یەکگرتووەکان (المؤسسات الاتحادية) بۆ بەڕێوەبردنی بەرژەوەندییە گشتییەکان و سەپاندنی مەسەلەی پیادەکردنی یاساکانی بەسەر دەوڵەتە ئەندامەکان ئەو ئەندامانەی کە بەشداری لەو دامەزراوانە دەکەن و هەروەها لە دەرکردنی ئەو بڕیارانەی کە پێوەستن بەکۆی فیدراڵییەتەکە(٦٧) و مەودای ئەو دەسەڵاتانە تەسک یاخود فراوان دەبێت بەپێی بەهێزی پێوەندییە یەکگرتووەکە یاخود لاواز بوونی بەڵام بەهەر حاڵێک دەوڵەتی فیدراڵی ناتوانێت لە بەشداری بوونی دەوڵەتە

ئەندامەکان لە پێکهێنانی دامەزراوە یەکگرتووەکان خۆش بیت و دەبێت ئەو ئەندامانە دەنگێکیان تێدا هەبێت ئەگینا سیمای یەکگرتن نامێنێت و دەکەوینە بەردەم دەوڵەتێکی یەکبوو[٦٨]. و دەتوانرێت ڕووە سەرەکییەکانی بەشداریبوون بەنوێنەرایەتی دەوڵەتە ئەندامەکان لە ئەنجوومەنی باڵا- ئەنجوومەنی ویلایەتەکان- و هەروەها بەبەشداریکردنی ویلایەتەکان لە هەموارکردنی دەستووری یەکگرتوو دەستنیشان بکەین کە یەک لە دوای یەک باسیان لێوە دەکەین.

١- ئەنجوومەنی باڵا (ئەنجوومەنی ویلایەتەکان):

زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتە فیدرالییەکان لە ڕێچکەی دوو ئەنجوومەنیان لانەدا لە پێکهێنانی دەسەڵاتی یاسادانی یەکگرتوو و بەم جۆرەش زۆربەی ئەو دەوڵەتانەی کە ئەو سیستەمە پیادە دەکەن لەسەر پێڕەوکردنی سیستەمی دوو ئەنجوومەنی دەڕۆن[٦٩]. کە یەکێک لەو دوو ئەنجوومەنە نوێنەرایەتی هەموو هاووڵاتیانی وڵات دەکات[٧٠]، لە کاتێک کە ئەوی دیکەیان نوێنەرایەتی ویلایەتەکان وەکو یەکەیێکی سیاسی جیاواز دەکات و دەوڵەتی یەکگرتوو ناتوانێت لەو سیستەمە دوو لایەنە خۆش بێت لەبەرئەوەی تەنها سیستەمەکە لە ژێر سێبەری هەردوو چەمکی یەکبوون و سەربەخۆیی کە زاڵن لەسەر ڕێکخستنی دەوڵەتی یەکگرتوو بەیەک دەگەن[٧١] و ئەنجوومەنی باڵا لە نوێنەری ویلایەتەکان پێکدێت کە هەندێ جار لە ڕێگای دامەزراندن هەتا لە ژیان ماون دادەندرێن وەکو ئەوەی لە کەنەدا پێڕەوکراوە یاخود لە ڕێگای هەڵبژاردن بۆ ماوەیێکی دیاریکراو دادەندرێن وەکو نموونەی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکیەتی سوڤیێتی پێشوو و ئەو دەوڵەتانەی کە سیستەمی هەڵبژاردن پێڕەو دەکەن جیاوازیان هەیە لە شێوەی هەڵبژاردنەکە چونکە هەندێک لەو دەوڵەتانە ڕێچکەی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ و لە ڕێگای دەنگدانی گشتی پێڕەو دەکەن وەکو ئەوەی کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکیەتی سۆڤییێتی پێشوو و ئوسترالیا ئەنجام دەدرێت لە کاتێک کە نوێنەری ویلایەتەکان لەهەندێ دەوڵەتی دیکە وەکو فەنزەویلا لە لایەن ئەنجوومەنەکانی یاسا دانان لە ویلایەتەکان هەڵدەبژێردرێن بەڵام دەستووری ئەڵمانیای یەکگرتووی کە لە ساڵی ١٩٤٩ دەرچووە دەڵێت دەبێت ئەنجوومەنی باڵا لە نوێنەری حکوومەتەکانی ویلایەتەکان پێک بێت چونکە یاسا مافی دامەزراندنی ئەو نوێنەرانە و هەروەها لەسەر کار لادانیانی داوەتە ئەو حکوومەتانە[٧٢].

شێوەی نوێنەرایەتی ویلایەتەکان لەو ئەنجوومەنە جیاوازە لە سیستەمێکی فیدراڵی بۆ سیستەمێکی دیکە و ئەو نوێنەرایەتییە بەشێوەییێکی گشتی لەسەر بنچینەییێکی یەکسان لە نێوان دەوڵەتە ئەندامەکان دەبێت بەبێ سەیرکردنی جیاوازی لە نێوان دەوڵەتەکان یاخود ویلایەتەکان لە ڕووی قەبارەیان یا ڕووبەریان یاخود ڕێژەی دانیشتوانیان و ئەو یەکسانییە بۆ ڕەواندنەوەی مەترسی لەلای ویلایەتە بچووکەکان بەرپا دەکرێت و ترسەکەشیان ئەوەیە کە نەوەکا ببنە قوربانی حەز و ویستی ویلایەتە گەورەترەکان لە ڕووی قەبارە و کاریگەری ئەو یەکسانییە لە نوێنەرایەتی دەبێتە زەمانەتێکی گونجاو بۆ ئەوەی نغرۆ و بزر نەبن لە نێوان ویلایەتە گرنگترەکان یا دەوڵەمەندترەکان یا بەدانیشتوانترەکان[٧٣] چونکە ئەو یەکسانییە جۆرێک لە هەست بەئەمنیەت دەداتە دەوڵەتە ئەندامەکان کە ئەو دەسەڵاتەی کە دایان بەحکومەتی یەکیەتی بەشێوەییێکی وا پیادە ناکرێت کە لە بەرژەوەندی چەند دەوڵەتێکی ئەندام یا چەند ویلایەتێکی کەم بێت[٧٤] هەروەها بوونی ئەو ئەنجوومەنە دەبێتە هۆی سنوور دانان بۆ زیادەڕۆیی ئەنجوومەنی خواروو واتە ئەنجوومەنی نوێنەران [٧٥] و بەبێ هەستکردن بەو ئەمنیەتە و بەبێ بوونی ئەو چاودێری و ئەو زەماناتەی کە ئەنجوومەنی دووەم مەیسەریان دەکات مەحاڵە کە فیدراڵییەت دەست پێ بکات یاخود بەشێوەییێکی باش بڕواتە ڕێوە[٧٦].

هەندێک وا دەبینن کە نوێنەرایەتی یەکسان لە ڕووی سروشتی سیستەمی فیدراڵی شتێکی یاسایی پێویست نییە بەقەدەر ئەوەی کە ڕەهەندەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی و بارودۆخی دروستبوونی یەکیەتی دەیسەپێنن[٧٧].

بەڵام هەرچەندە کە نوێنەرایەتی یەکسان مەسەلەییێکی کاکڵەیی (جوهري) نییە بۆ جەختکردنی بەفیدراڵی بوونی سیستەمێک بەڵام بە شتێکی کاکڵەیی دادەندرێت بۆ ئەوەی سیستەمێکی فیدراڵی بەکاریگەر دابندرێت[٧٨]. ئەمەو هەندێک لە سیستەمە فیدراڵییەکان پەنایان بردە بەر نوێنەرایەتی نایەکسانی ویلایەتەکان لەو ئەنجوومەنە وەکو کەنەدا و ئەڵمانیا و لە کەنەدا دەبینین کە ئەنجوومەنی باڵا Senate لە (١٠٢) سەت و دوو ئەندام پێک دێت و هەریەکە لە هەرێمەکانی کیوبیک واونتاریوو بە(٢٤) ئەندام نوێنەرایەتی دەکرێن و هەرێمەکانی نوفاسکوتیا و نیوبر و نسویک بە(١٠) ئەندام نوێنەرایەتی دەکرێن و هەر شەش هەرێمەکەی دیکە (٣٤) ئەندامیان هەیە و لە ئەڵمانیا و لە ژێر سێبەری ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی کە لە ساڵی ١٨٧١ و لەسەر پێڕەوی سیستەمی فیدراڵی دامەزرا دەوڵەتی بروسیا بەتەنها بە(١٧) ئەندام لە ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان

نوێنەرایەتی دەکرا لە کاتێک کە هەندێک لە دەوڵەتەکانی دیکە لە ئیمپراتۆریەتەکە بەیەک ئەندام نوێنەرایەتی دەکران[٧٩].

هەروەها دەستووری فایماری ئەڵمانی ساڵی ١٩١٩ پرنسیپی نایەکسانی لە نوێنەرایەتی پێڕەوکرد و تیایدا هاتبوو کە هەر ویلایەتێک بەلای کەمی ئەندامێکی دەبێت و ئەندامێکی دیکە زیاد دەکرێت بەرامبەر هەر (٧٠٠٠٠٠) حەفسەت هەزار کەس لە دانیشتوانی ویلایەتەکە بەمەرجێک کە ئەندامانی ویلایەتەکە لە پێنج ئەندام زیاتر نەبن[٨٠]. ئەمە و دەستووری کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی ١٩٤٩ لەسەر هەمان ڕێڕەو ڕۆیشت بەشێوەیێک کە نوێنەرانی دەوڵەتە ئەندامەکان بەلای کەمەوە سێ ئەندام بوون و چوار ئەندام بۆ ئەو ویلایەتانەی کە دانیشتوانیان لە دوو ملیۆن زیاترە و پێنج ئەندام بۆ ئەو ویلایەتانەی کە دانیشتوانیان لە شەش ملیۆن کەس زیاترە[٨١] و ڕۆڵی ئەو ئەنجوومەنە و مەودای گرنگییەتی جیاوازی هەیە لە سیستەمێکی فیدراڵی بۆ سیستەمێکی دیکە و لە کەنەدا دەبینین کە ئەنجوومەنی پیران Senate بەڕۆڵی خۆی هەڵنەستا بۆیە ناتواندرێت زۆری لێ چاوەڕوان بکرێت و بێجگە لەوەی کە سیستەمی نوێنەرایەتی یەکسانی پێڕەو نەکرد لە لایێک و ئەندامەکانی بۆ هەموو ماوەی ژیانیان دادەمەزرێن و هەوادارییان بۆ حزبە دەسەڵاتدارەکان ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە دامەزراندنیان لەو دەزگایە لە لایێکی دیکە[٨٢] و هەروەها لە ئوسترالیا ئەو ئەنجوومەنە جێگایێکی گرنگی بەخۆوە نەگرت چونکە دابەشکردنە حزبییەکان یاخود هەوادارییە حزبییەکان سەلماندی کە زۆر بەهێزترە لە انتمائە هەرێمییەکان لە نێوان ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنە لە ئوسترالیا[٨٣]. ئەمە و دەنگدان لەو ئەنجوومەنە لەسەر بنچینەی حزبایەتی بەڕێوە دەچێت زیاتر لەسەر بنچینەی هەرێمایەتی و هەروەها بێ بایەخی ئەو ئەنجوومەنە لە کەنەدا و ئوسترالیا دەگەڕێتەوە بۆ بوونی سیستەمی کابینەی وەزاری لەو دوو دەوڵەتە، و لە ژێر سێبەری ئەو سیستەمە دەسەڵاتی جێبەجێکردن پێویستی بەپشتگیری حزبەکان لەنێو دەسەڵاتی یاسا دانان هەیە ئەو کارەی کەوا دەکات پێوەندی حزبی بەبایەختر بێت لە بنچینەی هەرێمگەرایەتی و بەهەرحاڵ حکوومەت بەپلەی یەکەم بەرپرسیارە لەبەردەم ئەنجوومەنی نوێنەران هەر بۆیێ ئەنجوومەنی ویلایەتەکان لە سەرەتاوە کەم بایەختر دەبێت، بەڵام ئەو کارە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەنجوومەنی ویلایەتەکان هیچ دەسەڵاتێک یاخود هیچ سەنگێکی نییە هەرچەندە بایەخەکەی لەوە کەمتر بوو لەوەی کە لەکاتی پێڕەوکردنی لێی چاوەڕوان دەکرا لە بواری بەرگری لە بەرژەوەندی ویلایەتەکان[٨٤].

وه لە سویسرا ئەنجوومەنی باڵا یاخود وەکو ناوی لێنراوە بەئەنجوومەنی دەوڵەتەکان هەرچەندە زۆر گرنگترە و کارامەترە لە هاوتایەکانی لە کەنەدا و ئوسترالیا[٨٥] بەڵام گرنگی ڕۆڵەکەی کەمترە لە ئەنجوومەنی خواروو ( ئەنجوومەنی نوێنەران) لەبەرئەوەی هەندێک لە بڕیارەکان وەکو هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی یەکگرتوو و ئەندامانی دادگای یەکگرتوو و مافی لێبووردن لە سویسرا لە ڕێگای دەنگدان لەسەریان لە لایەن هەردوو ئەنجوومەنی دەسەڵاتی یاسا دانان کە بەشێوەی کۆمەڵێکی نیشتمانی گرێدەدرێن دەردەچێت و لەو حاڵەتە بای ئەنجوومەنی نوێنەران دەبێت لەبەرئەوەی ژمارەی ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنە چوارجار زیاترە لە ژمارەی ئەنجوومەنی باڵا[٨٦].

بەڵام بەپێچەوانەی ڕۆڵی ئەنجوومەنی باڵا لەو دەوڵەتانەی کە لە سەرەوە باسمان لێوەکردن ڕۆڵی ئەو ئەنجوومەنە واتە ئەنجوومەنی پیران لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا زۆر گەورە و گرنگ و کارامە بوو و ئەوەش لە هەندێک لایەن دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی سیستەمی سیاسی ئەمەریکی کە سیستەمی سەرۆکایەتییە و لە دواییدا بۆ نەبوونی سیستەمی کابینەی وەزاری کە لە کەنەدا و ئوسترالیا پێڕەوکراوە و ئەوەش بەشێوەیێکی لاوەکی لێپرسیارە لە لاوازی ڕۆڵی ئەنجوومەنی باڵا لەو دوو دەوڵەتە چونکە ڕۆڵێکی گرنگتر دەداتە ئەنجوومەنی نزم (ئەنجوومەنی نوێنەران) و بەپێی سیستەمی سەرۆکایەتی پێڕەوکراو لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەرۆک لێپرسراو نابێت لەبەردەم هەردوو ئەنجوومەنی کۆنگرس بۆیە ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکی ئەو معاناتەی نییە کە هەردوو هاوتاکەی لە کەنەدا و ئوسترالیا هەیانە ئەویش لە بواری کلکایەتی بوون بۆ ئەنجوومەنی خواروو (المجلس الادنی)[٨٧]. ئەمە لە لایێک و لە لایێکی دیکە گرنگی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەسەڵاتە سەربارانەی (السلطات الاضافیة) کە بەپێی دەستووری یەکیەتی لە بواری کاروباری دەرەوە و دامەزراندنی گەورە لێپرسراوانی دەوڵەت پێی دراوە.

زانا وییر Wheare دەڵێت جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە ئەمەریکا ڕۆڵێکی یەکسانی دا بەئەنجوومەنی پیران بەرامبەر بەئەنجوومەنی نوێنەران[٨٨]. و لەسەری دەڕواو دەڵێت حزبەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕۆڵێکی ئیجابییان ئەنجامدا لە کارامەکردنی ئەنجوومەنی پیران چونکە هەردوو حزبی سەرەکی کۆماری و دیموکراسی لە ناوەوەی خۆیان ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندییە هەرێمییە جیاجیاکانن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئەندامانیان ئازادن لە دەربڕینی بۆچوونی جیاجیا لە ئەنجوومەنی پیران

هەروەها لە ئەنجوومەنی نوێنەران چونکە ئەو کارە نابێتە هۆی دەست کێشانەوەی حکوومەت[٨٩].

٢- بەشداریکردنی ویلایەتەکان لە هەموارکردنی دەستوور:

بەشداریکردنی دەوڵەتە ئەندامەکان لە هەموارکردنی دەستووری یەکگرتوو بەیەکێک لە ڕووە گرنگەکانی سیستەمی فیدراڵی دادەندرێت چونکە لەو ڕێگایە بەشداری لە لایەنێکی سەروەری دەکەن بێجگە لەوەی ئەمە زەمانەتێکی بەهێزە بۆ ئەو دەوڵەتانە بۆ ئەوەی بەبێ ڕەزامەندی خۆیان هیچ لە قەوارەکەیان و لە دەسەڵاتەکانیان کەم نەکرێتەوە بەڵام مەودای بەشداریکردنی ویلایەتەکان لە هەموارکردنی دەستووری یەکگرتوو جیاوازی هەیە لە دەوڵەتێکی یەکگرتوو بۆ دەوڵەتێکی دیکە و لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەوڵەتە ئەندامەکان ڕۆڵێکی گەورەیان پێدرا لەبواری هەموارکردنی دەستوور و پەسەندکردنی ئەو هەموارکردنانە چونکە پێشنیاری هەموارکردنی دەستووری ئەمەریکی لەسەر داواکاری یا دوو لەسەر سێی ئەندامانی کۆنگرس یاخود کۆنگرەیێک کە کۆنگرس لەسەر داواکاری دوو لەسەر سێی ئەنجوومەنەکانی یاسا دانانی ویلایەتەکان بانگەشەی بۆ دەکات دەکرێت و ئەو هەموارکردنانە کاتێک قابلی جێبەجێکردن دەبن ئەگەر هات ڕەزامەندییان لەسەر پیشان درا لە لایەن سێی لەسەر چواری ویلایەتە جیاجیاکان یاخود ئەو کۆنگرانەی کە لە لایەن سێ لەسەر چواری دەسەڵاتی یاسا دانانی ویلایەتەکان بانگەشەی بۆ دەکرێت و بۆ ئەم مەبەستە و بەو ڕێگایەی کە کۆنگرس بڕیاری لەسەر دەدات گرێ دەدرێت[٩٠].

ئەمەو لە سویسرا کانتونەکان بەشداری ناکەن لە پێشنیارکردنی هەموارکرنە دەستوورییەکان بەڵام بەشداری دەکەن لە پەسەندکردنی ئەو هەموارکردنانە چونکە هیچ هەموارکردنێکی دەستووری لە سویسرا جێبەجێ ناکرێت هەتا پەسەند نەکرێت لە لایەن زۆرینەی دەنگدەرانی وڵات و زۆرینەی دەنگدەران لە زۆرینەی کانتونەکان[٩١].

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی یەکەم

(1) K. C. Wheare, Op. Cit Page 36.

(2) Op. Cit Page 36.

(3) Op. Cit Page 36.

(٤) بنەمای گشتی لەم بوارەدا ئەوەیە کە دەوڵەتە ئەندامەکان دەستووری تایبەتی خۆیان هەبێت بەڵام وەکو ئەوەی هەموو بنەمایێک ئیستسنائی هەیە لێرەشدا ویلایەتەکانی دەوڵەتی فیدراڵی هند دەستووریان نییە.

(٥) اندریە هوریو- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٥.

د. کەمال غالی- سەرچاوەی پێشوو ل ٩٣.

(٦) د. مەحموود حلمی- سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٣.

(٧) د. محەمەد هەماوەندی- الحکم الذاتی والنظم اللامرکزیه الاداریه والسیاسیه- سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٨.

(٨) ماددەکانی ٧٦، ٨٢ لە دەستووری کۆمارە سوشیالستەکانی سۆڤێتی ساڵی ١٩٧٧.

(٩) ماددەکانی ١٣٧، ١٤٣ لە دەستووری کۆمارە سوشیالستەکانی سۆڤێتی ساڵی ١٩٧٧.

(١٠) دکتۆر عەبدولحەمید متوەلی- یاسای دەستووری و سیستەمە سیاسییەکان- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤٣.

(11) Article 6 Froml the Swiss Federal Constitution.

(12) Article 92 From the Britsh North America Act 1867.

(١٣) دکتۆر کەمال غالی- سەرچاوەی پێشوو ل ٩٣.

(١٤) دکتۆر زوهیر شوکر- الوسیط فی القانون الدستوری- الجزء الأول- القانون الدستوری والمؤسسات السیاسیه- النظریه العامه والدول الکبریٰ- دەزگای جامعی بۆ لێکۆڵینەوەو بڵاوکردنەوەو دابەشکردن، بەیروت چاپی سێیەم ١٩٩٤ ل ٦٤.

(١٥) دکتور طعیمه جرف- نظریه الدوله والاسس العامه للنظام السیاسی، کتێبخانەی قاهیرەی تازە- قاهیره ١٩٦٤ ل ٢٢٧.

(١٦) دکتۆر عەبدولحەمید متولی- القانون الدستوری والانظمه السیاسیه- سەرچاوەی پێشوو ل٢٤٧)

(17) The tenth Amendment of the Amenican Constitution.

(١٨) دکتۆر طعیمه جرف- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٨.

(١٩) دکتور محمد عبدالمعز نصر- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٨٨.

(20) K. C. Wheare, Op. Cit Page 17- 19.

(٢١) نورمان د. بالمر- النظام السیاسی فی الهند- وەرگێڕان و پێشکەشکردنی دکتۆر محەمەد

فەتحوڵڵا خەتیب-
کتێبخانەی ئەنگلو مصری ١٩٦٥ ل ٢٠٠.
دکتۆر طعیمە جرف- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢٩.
دکتۆر طعیمە جرف- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٩٩.
ولێپرسراوی کارگێڕی یەکەم ناوی پارێزگارە (محافظ) نەک حاکم.
(٢٢) ماددەکانی ٨٣، ٨٤، ٨٥ لە یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی ١٩٤٩.
(٢٣) دکتۆر ثروت بدوی- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٤.

(24) K. C. Wheare, Op. Cit Page 65.

(25) Op. Cit Page 65.

(26) Jamcể Bryce, The American COmmonwealth, Abridged edition, New Yor, The Macmillan Company, London macmillan & Co ltd 1944 Page 398

(27) K. C. Wheare, Op. Cit Page 66.

(28) Op. Cit Page 66.

(29) Op. Cit Page 66.

(30) Article 110 From the Swiss Fedral Constitution.

(31) K. C. Wheare, Op. Cit Page 66.

(32) Charles Henry Alexandrowicz, Constitutional Devlopment in india, Oxford univ ersity PRESS 1957 Page 169.

نورمان د. بالمر- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٤.

(33) G. N. Joshi, Op. Cit Page 287.

(34) K. C. Wheare, Op. Cit Page 93.

(٣٥) بڕوانە ماددە (١٠٩) لە یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی ١٩٤٩ دەڵێت «هەر یەکە لە یەکیەتی و ویلایەتەکان سەربەخۆنە لە یەکتری سەبارەت بەبووجە».

(36) Alexander Hamilton and James Madison and Jhon Jay Op. Cit No. 31 Page 239.

(37) K. C. Wheare, Op . Cit Page 95.

(38) Wallace s. Sayer, American Government, by Brance & Noble Inc U. S. A Fif teenth edition 1962 Page 193.

(٣٩) هەرچەندە ئەوە بنەمای گشتییە بەڵام بەرازیل لەو بنەمایە دەرچوو چونکە ئەو بەپێی دەستووری کە لە ساڵی ١٨٩١ دەرچووە دەسەڵاتی چەسپاندنی ڕەسمی دەرکردەی (رسوم التصدیر) داوەتە حکوومەتە هەرێمیەکان لەسەر کاڵا خوجیەکانی خۆیان و هەروەها چەسپاندنی ڕەسمی ئیستیراد لەسەر کاڵا خوجیەکانی خۆیان و هەروەها چەسپاندنی ڕەسمی ئیستیراد لەسەر ئەو کاڵایانەی کە دێنە

هەرێم بۆ ئیستهلاک بەڵام داهاتی ڕەسمی ئیستیراد دەچێتە گەنجینەی گشتی یەکیەتی و لە کاتێک بەڕازیل دابەشکردنی دەسەڵاتی دارایی بەشێوەییێکی بەردەوام پێڕەو دەکات بەئیستسنا ء لە بنەمای گشتی دەبینین کە هەندێ جار ئیستسنای کاتی هەیە لەو بنەما گشتییە وەکو ئەوەی لە ئوسترالیا لە کاتی دامەزراندنی کومونویلسی ئوسترالی لە ساڵی١٩٠١ بۆ یەکەم جار ڕووی دا و بوار درا ویلایەتی ئوسترالیای ڕۆژئاوا کە دەسەڵاتێکی سنووردار بەکاربهێنێت بۆ سەپاندنی باجی گومرگ بەپێوەرێکی تەدریجی بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە بەرواری سەپاندنی باجی یەکسان لە لایەن پەرلەمانی کومونویلس بۆ ئەوەی دەرفەتی پێ بدرێت خۆی لەگەڵ سیستەمی ئابووری تازە بگونجێنیت.

بۆ ئەوە بڕوانە K. C. Wheare, Op. Cit Page ١٥٥

(40) Op. Cit. Page 100.

(41) Op. Cit. Page 103.

لە کاتێکدا سموحی فوق العادە باس لەوە دەکات کە بنەمایێکی کلاسیکی لە سویسرا هەیە کە هێزی پرنسیپی دەستووری هەیە ئەویش ئەوەیە کە کانتونەکان تایبەتمەندن بەکۆکردنەوەی باجە ڕاستەوخۆیەکان بەڵام حکوومەتی یەکیەتی تایبەتمەندە بەکۆکردنەوەی باجە ناڕاستەوخۆیەکان.

بۆ ئەوە سەیری دکتۆر سموحی فوق- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٢بکە.

(42) Article Section 8 From the American Constitution.

(43) Article Section z From the American Constitution.

(٤٤) مادده یەک بڕگەی (١٠) لە دەستووری ئەمەریکی دەڵێت بەبێ ڕەزامەندی کۆنگرس رسوم و باج ناسەپێنێت لەسەر داهاتەکان و دەرچووەکان (الوردات والصادرات) تەنها ئەوە نەبێت کە پێویستییێکی بەهێزی پێی ئەبێت بۆ جێبەجێکردنی یاساکانی پشکنین و داهاتی کۆکردنەوەی باج و رسومەکان کەوا ویلایەت دەیسەپێنێت لەسەر داهات و دەرچووەکان دەنێردرێت بۆ گەنجینەی ویلایەتە یەکگرتووەکان و هەموو ئەو جۆرە یاسایانە دەبێت ملکەچی هەموارکردن بێت لە لایەن کۆنگرس و چاودێریشی.

No State Shall, Without the Consent of the Congress Layany imposts or duties on imports or exports, except what may be absoluteiy necessary For executing its inspection law, and the Net Produce of all duties and imposts Laid by any state on importsor exports or exports, shall be For the treasury of the united states, and all such these laws Artic l Section lo From the American Constitution.

(45) James Bryce, Op. Cit Page 357- 359.

(٤٦) لە بارەی ئەو بۆچوونە سەیری دکتۆر سموحی فوق العادە- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٢ بکە

(47) K. C. Wheare, Op. Cit Page 111.

(48) Op. Cit Page 104.

(49) Op. Cit Page 106.

(50) Op. Cit Page 106.
(51) Op. Cit Pages 111, 117- 118.
(52) Wallace S. Sayre, Op. Cit Page 184.
(53) K. C. Wheare, Op. Cit Page 109.
(54) Op. Cit Page 111.
(55) Mangal Chandra Jain Kagzi, the Constitution of india
Metropolitan Book Co. Private ltd, Delhi Secaond edition 1967 Page, 254.
G. N. Joshi, Op. Cit Page 290.
Charles Henry Alexandrowiz, Op. Cit Page 193.
(56) Mangal Chandra Jain Kagzi, Op. Cit Page 254.
G. N. Joshi, Op. Cit Page 302.
Charles Henry Alaxandrowiz, Op. Cit Page 195.
(57) Mangal Chandra Jain Kagzi, Op. Cit Page 267.
(58) K. C. Wheare, Op. Cit Page 119.
(59) Arnold J, Heidenheimer, the Government Of Germany.
university Pager backs, Methuen London first Published 1965 Page 128- 129
(60) Nevil Jahnsonm Government of the federal Republic of Germany, excutive at
Work Pergamon Press, Oxford New York Toronto, sydnry, Braunsch weig
1973, Page 120.
Arnold J. Heidenheimer, Op. Cit Page129
(61) John H. Herz, the Government of Germany, Harcourt Brace Jovanovich inc U.
S. A. second edition 1972 Page 133.
(62) Op. Cit Page 133.
(63) Nevil Johnson, Op. Cit Page 122.
(64) John H. Herz, Op. Cit Page 133
Nevl Johnson, Op. Cit Page 122.
(65) Nevil Johnson, Op. Cit Page 123.
(٦٦) مادده ٧٣ برگەی (٦) لە دەستووری یەکیەتی کۆمارە سوشیالستەکانی سۆڤیێتی ساڵی ١٩٧٧.
(٦٧) دکتۆر عوسام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢.
دکتۆر ئەحمەد سەرحان- القانون الدستوری والانظمە السیاسیە- النظریە العامە- أهم الانظمە السیاسیە العالم- خانەی سەردەمانە- بەیروت چاپی یەکەم ١٩٨٠ ل ٤٦.
(٦٨) دکتۆر کەمال غالی- سەرچاوەی پێشوو ل ٩٥.
(٦٩) دکتۆر کەمال غالی- سەرچاوەی پێشوول ٩٥.

(٧٠) پێویسته بڵێین که ئەنجوومەنەکەی دیکه بەئەنجوومەنی خواروو یاخود ئەنجوومەنی نوێنەران ناو دەبرێت و ئەویش بەشداربوونی دەوڵەته ئەندامەکان ویلایەتەکان یاخود هەرێمەکان- ی لێ دەکەوێتەوە بەشێوەیێکی ناڕاستەوخۆ نوێنەرایەتییان و بەپێی قەبارەی دانیشتوانیان.

(٧١) بەهەمان بۆچوون سەیری دکتۆر محەمەد کامل لیله- الانظمه السیاسیه- سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٠بکە.

(72) Nevil Johnson, Op. Cit Page 106.

و هەندێک دەڵێن که ئەنجوومەنی باڵای ئەڵمانی شتێکی بێ وێنەیه لەبەر ئەوەی تاکه ئەنجوومەنێکه بەکۆنگرەیێکی بەردەوام دادەندرێت بۆ وەزیرەکانی ویلایەتەکان کەوا ئەوانیش کە بەپێی ڕێنمایی حکوومەتەکانیان دەنگی تێدا دەدەن.

Arnold J. Heidenheimer, Op. Cit Page 119.

(73) K. C. Wheare, Op. Cit Page 88.

(74) Op. Cit Page 88.

(75) James Bryce, the American Commonwealth, A bridged edition New York the Macmillan Company London Macmillan & Co ltd 1944 Page 33.

(76) K. C. Wheare, Op. Cit Page 88.

(٧٧) یاسازان بوردۆ Burdeau ئەو بۆچوونەی هەیه بۆ ئەوە بڕوانه دکتۆر کەمال غالی سەرچاوەی پێشوو ل٩٥ پەراوێز.

(78) K. C. Wheare Op. Cit Page 88.

(79) Op. Cit Page 88.

(٨٠) لە دکتۆر حەمید ساعیدی- مبادئ القانون الدستوری وتطورات النظام السیاسی فی العراق- خانەی حیکمەت بۆ چاپ و دابەشکردن- مووسڵ ١٩٩٠ ل٤٩ گوازراوەتەوە.

(٨١) مادده (٥١) لە یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی ١٩٤٩.

(82) K. C. Wheare, Op. Cit Page 89.

(83) Op. Cit Page 89.

(84) Op. Cit Page 89.

(85) Op. Cit Page 89.

(86) Article 82 From the swiss Federal Constitution.

(87) K. C. Wheare, Op. Cit Page 89.

(88) Op. Cit Page 89- 90.

(89) Op. Cit Page 90.

(90) Article 5 From the American Constitution.

(91) K. C. Wheare, Op. Cit Page 56.

## سروشتی یاسایی دەوڵەتی فیدراڵی

لەو ئاخافتنە باس لە مەسەلەی سەروەری لە دەوڵەتی فیدراڵی دەکەین، شتێکی شاراوەش نییە ئەو بابەتە بەیەکێک لە بابەتەکانی فەلسەفەی یاسا دادەندرێت و وەکو اوپنهایم Op-penheim دەڵێت: سەروەری مانای (دەسەڵاتی باڵا)یە کە سەربەخۆ دەبێت بەرامبەر هەر دەسەڵاتێکی دیکە لە ڕووی زەمین. سەروەری بەواتایەکی تەسکتر و وردتری وشەکە مانای سەربەخۆییە لە هەموو شتێکی دەوروبەری لە ناوەوە و دەرەوەی وڵاتدا.

Sovereignty is supreme , sovereignty in the authority is indiependent of any other(1) earthily authority in strict and narrowest sense of the term implies there

independent all round within and without the borders of the country.

ئەو بیرۆکەیە بووە بابەتی مشتومڕێکی زۆر و ناکۆکییێکی فقهی دوور و درێژ لەوەتەی کەوتووەتە بواری زانستی سیاسی لەلایەن (بۆدین Bodin) لە کتێبە بەناوبانگەکەی کۆمارەکە (الجمهورية de le Republique) کە لە ساڵی ١٥٧٧ دەرچووە(٢).

بەم شێوەیەش بیرۆکەی سەروەری لەسەر واتایێکی وا جێگیر نەبووە کە ببێتە جێگای ڕەزامەندی تێکڕای فقیهەکان.

وە لەبەر ئەوەی فەلسەفەی یاسا و ناکۆکییە فقهییەکان کە وا لە نێوان پرۆفیسۆرانی یاسای گشتی لەم بوارەدا بەشێوەیەکی بنەڕەتی ناکەونەوە ناو بابەتی ئەو دکتۆرانامەیە لەبەر ئەوە ناچینە ناو وردەکارییەکانی ئەو مشتومڕانەی کە لەم بوارە دا کران، بەڵکو اکتفاء دەکەین بەخستنە ڕووی ئەو تیوریانەی کە لە بارەی سەروەری دەوڵەتی یەکگرتوو خرانە ڕوو و بەو مەودایەی کە پەیوەندی بەبابەتەکەمان هەبێت و، سێ تیوری لەم کۆڕەپانە بەدەرکەوتن و یەکەمیان بۆ ئەوەچوو کە سەروەری قابلی لەت لەت بوون و دابەشکردنە لە نێوان دەوڵەتی یەکگرتوو و دەوڵەتە ئەندامەکان لە کاتێکدا هەردوو تیوریەکەی دیکە بۆچوونێکی پێچەوانەیان هەبوو کە وتیان سەروەری یەکەو قابلی لەت لەت کردن و دابەشکردن نییە بەڵام بۆچوونی جیاوازیان هەبوو سەبارەت بەو لایەنە کە سەروەری لا جێگیر دەبێت و بەبۆچوونی یەکەمیان سەروەری لای دەوڵەتە ئەندامەکان بەتەنها جێگیر

دەبێت لە کـاتێکدا کـە تیـوری دووەم بۆ ئەوە چوو کـە دەوڵەتی یەکگرتوو بەتەنهـا نەک دەوڵەتە ئەندامەکان خـاوەن سـەروەری دەبێت. ئێسـتـاش پەیتا پەیتا بـاس لەو تیوریانە و ڕاوبۆچوونی خاوەنەکانیان دەکەین:

**یەکەم: تیوری لەت لەت کردنی سەروەری:**

ئەو تیوریە بەدێرینترین تیوری دادەندرێت لە بواری ڕاڤەکردنی سروشتی یاسایی دەوڵەتی فیـدراڵی و بۆ یەکەم جـار لە ئەمەریکا بەدەرکەوت و دانەرانی کـتـێبی فیـدرالست (the federalist) الکســـــاندر هاملتـــــون Alexander Hamilton و جـــیــــــمس مـادیسـون James madieson و جـون جـەی John Jay کـە لە سـاڵی ١٧٨٨ دەرچووە بانگەشـەیان بۆ ئەو تیـوریە کردووە و زانـای فـەڕەنسی الکسـی دی توکـفـیل Alexis de Tocyueville Tocyueville لە ڕێگای کـتـێبەکەی کە بەناوی دیموکراسی لە ئەمەریکا Democratio en America لە ســـاڵی ١٨٣٥ دەرچووە ئەو تیــــوریەی بۆ ئەوروپا گـواسـتـەوە و لە ئەڵمـانیـا فـیـتـز Waits لە سـاڵی ١٨٦٢[٣] لایەنگیـری لێکرد، و لە ئەمەریکا دانیال ویبستر Danial Webster لە میانی جەنگی جیابوونەوەی ئەمەریکا کە لە نێـوان سـاڵانی ١٨٦١-١٨٦٥ ڕووی دا لایەنگیـری و داکـۆکی لەو تیـوریە کـرد و هێشتـانیش هەندێک لە هزرڤانان لایەنگیری لەو تیوریە دەکەن وە لەوانە زانای سویسری سـولنبـرجـرە Sollenberger و ئەو تیـوریە لەم تازانە ش گـرنگی پی درا لە لایەن ڕووس Ross لە ساڵی ١٩٤٧[٤]. هەروەها لایەنێکی زۆر لە هزرڤانانی عـەرەبی لایەنگیری لێ دەکەن کە لە پاشان باسی لیوە دەکەین و دانەرانی ئەو تیوریە بیروڕای خۆیان لەسەر ئەوە دادەمەزرێنن کە دەوڵەتی فیدراڵی لەسەر بنچینەیەکی یاسایی پێک دێت ئەویش دەستوری فیدراڵییە کە بەپێی ئەو دەستورە دەوڵەتە ئەندامەکان واز لە لایەنێکی کەم و دیاریکراوی دەسـەڵات و تایبـەتمەندییـەکـانیـان دێنن بۆ حکوومـەتی نـاوەندی دامـەزراو (حکوومـەتی یەکیەتی) بەڵام لایەنێکی ترو گەورەتر لە دەسەڵاتەکان بۆ خۆیان دەهێڵنەوە و ئەو دانەرانە لەم بوارە ئاماژە بۆ دەستوری ئەمەریکی ساڵی ١٧٨٧ و دەستوری سویسری ساڵی ١٨٤٨ و دەسـتـوری ئەڵمـانی سـاڵی ١٨٧١ دەکەن. وە بەپێی ئەو تیـوریە سەروەری بە شـتـێکی وەک دەسـەڵات دادەندرێت بەواتایەکی دیکە بەپێی ئەو تیـوریە مـەبەست لە سـەروەری کـۆمـەڵێک دەسـەڵات و تایبـەتمەندیە بۆیێ ئەو قـابلی لەت لەت کـردنە و ئەمـەش لەگەڵ ڕێکخـسـتنی دەوڵەتی فـیـدراڵی دەگـونجـێت کـە لەسەر بنەمـای دابەشکردنی دەسـەڵات و

تایبەتمەندیەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان پێک دێت و بەو پێیەش سەروەری لەت لەت ئەبێت لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان. و جیمس مادیسون James madison لەم بوارە دەڵێت: (بیرۆکەی حکوومەتی نەتەوەیی (مەبەستی حکوومەتی یەکگرتووە) پێویست دەکات ئەو حکوومەتە دەسەڵاتی هەبێت نەک هەر لەسەر هاولاتیان (تاکەکان) بەڵکو دەسەڵاتێکی رەهای هەبێت لەسەر هەموو کەسەکان و شتەکان بەو پێیەی کە سەر بەحکوومەتێکی شەرعیین. لە نێوان میللەتێکی یەکگرتوو لەناو یەک وڵاتدا (مەخسەدی دەوڵەتی یەکبووە) ئەو دەسەڵاتە دەدرێتە یاسا دانەرانی نیشتمانی، و لەناو ئەو کۆمەڵانەی یەک دەگرن بۆ چەند مەبەستیکی تایبەت ئەو سەروەریە بەشێکی دراوەتە یاسا دانەرانی نەتەوەیی و بەشێکی دراوەتە یاسا دانەرانی هەرێمەکان.

لە حاڵەتی یەکەم هەموو دەزگاکانی هەرێمی سەر بەلایەنی خاوەن سەروەری دەبن کە دەتوانی کونترۆڵ و رێنماییان بکات و هەروەها بەبڕیاری خۆی پووچەڵیان بکاتەوە. لە حاڵەتی دووەم دەزگا هەرێمییەکان دەبنە بەشێکی جیا وەسەر بەخۆیی سەروەری وەئەو دەزگایانە لەبوارەکانی تایبەت بەخویان ملکەچی دەزگا گشتییەکان (حکوومەتی یەکیەتی) نابن زیاتر لە ملکەچ بوونی دەزگا گشتییەکان لە بواری تایبەتی خۆیان بۆ دەزگا هەرێمییەکان)[٥].

The idea of government involves in not only an authority over individual citizens, but an indefinite supremacy over all persons and things, so far as they are objects of lawful government, among a people consolidated into one nation, this supremacy is Campletly Vested in the national Legislature. Among communities united for particular purposes,.

itis Vested partly in the general and partly in the municipal legislatures in the former case, all local authorities are Subordinate to the supreme, and may be controlled, directed or abolished by it at pleasure In the letter the local or municipal authorities.

Form distinct and independent portions of the supremacy, no more Subject within their respective spheres to the general authority, than the general authority is subject to them.

وە لە هەمان رێرەودا الکسی دی توکفیل Alexis dl جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە

(سەروەری لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دابەش کراوە لە نێوان یەکێتی و ویلایەتەکان)[٦]
لەگەڵ ئەوەی کە توکفیل مەسەلەی لەت لەت کردنی سەروەری تەنها لە دەستوری ئەمەریکی حەسر نەکرد بەڵکو جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە هەموو فیدراڵییەکان پەیوەستن بەو پرنسیپە[٧]. لەم بوارە زانا اوپنهایم بۆ ئەوە دەچێت کە (ئێستا ئەگەر دان نرا بەدەوڵەتی فیدراڵی وەک ئەوەی کە دەوڵەتێکە شان بەشانی دەوڵەتە ئەندامەکان ڕوون ئەبێتەوە کە سەروەری دەبێت دابەش بکرێت لە نێوان دەوڵەتی فیدراڵی لە دەستێک و دەوڵەتە ئەندامەکان لە دەستەکەی دیکە.

Now is as itself a state, side by side with its member- states, it is evident that sovereignty must be divided between the federal state on the other, the member- states.and on the [٨]one hand,

هەروەها دادوەر تانی Taney تانەرۆکی دادگای باڵای ئەمەریکی لە دوای ساڵی ١٨٣٥ بۆ ئەوە دەچوو کە سیستەمی یەکگرتن لە ئەمەریکا لەسەر بنەمای دووانەیی دەزگا حوکمڕانە خاوەن سەروەریەکان لەناو هەمان ولات پێک دێت واتە هەر یەک لە دەزگاکانی یەکیەتییەکە و حکومەتەکانی ویلایەتەکان بەدەزگای خاوەن سەروەری لە بواری ئەو دەسەڵاتانەی پێیان دراوە دادەندرێن بەپێی دەستوری فیدراڵی و ئەوەش لە دواییدا بەفیدراڵیەتی دوانەیی (Dual Federalism)[٩] ناوی لێنراو بەکارهات و گەشەی پێدرا لە لایەن دادگای باڵای ئەمەریکی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و ئەوەش یەک دەگرێتەوە و دەگونجێت لەگەڵ تیوری لەت لەت کردنی دەسەڵات[١٠].

ئەو تیوریە پشتگیرو لایەنگیرێکی زۆری پەیدا کرد لە نێوان هزری یاسای دەستوری عەرەبی و د. حەسەن چەلەبی پشتگیری لە تیوری لەت لەت کردنی سەروەری دەکات کە دەڵێت: (فیدراڵییەت بەواتای تایبەت بریتییە لە دروست بوونی ڕێکەوتن لە نێوان یەکە سیاسییەکان بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان بەشێکی دەبێت لە سەروەری دەوڵەت لە ڕووی هەرێمی و سیاسیەوە کە خەسڵەتی سەربەخۆی ناوەکی دەداتێ و لەو کاتەی کە بەشداریش دەکات لە پێکهێنانی و بەڕێوەبردنی سەروەریە گشتییەکە کە وا یەکە)[١١].

هەروەها هەر یەکە لە د. عوسمان خەلیل عوسمان و د. سلێمان محەمەد تەماوی دەڵێن: (یەکیەتی ناوەندی سەروەری دەرەوە لە دەست دەوڵەتە ئەندامەکان یا نیمچە دەوڵەتەکان ناهێڵێت. بەڵام سەبارەت بەسەروەری ناوەوە دەبینین کە دابەش کراوە لە نێوان نیمچە

دەوڵەتەکان و دەوڵەتی ناوەندی بەجۆرێک کە وا هەر نیمچە دەوڵەتێک یاخود ناوچە یا ویلایەتێک سەربەخۆیی دەستوری و یاسا دانان و دادوەری خۆی هەبێت(١٢).

هەروەها ڕیاز ئەزهاری Ryad Azhari بۆ هەمان ئەنجام دەچێت لە کاتی جەخت کردنی لەسەر ئەوەی کە سەروەری قابلی دابەشکردنە بەتایبەتی لە دەوڵەتی فیدراڵی بەڵام ئەو دەڵێت: کە سەروەری دەوڵەتە ئەندامەکان سنوورداره لە لایەن یەکیەتییەکە لەبەر ئەوەی ناتوانێت تەعبیر لە خۆی بکات لە دەرەوەی ئەو سنوورانەی کە بەپێی دەستوری فیدراڵی بۆی دیاری کراوە(١٣).

هەروەها لایەنێکی دیکەی مامۆستایانی عەرەبی یاسای دەستوری(١٤) لایەنگیری ئەو تیوریەیان کرد و داکۆکییان لێکرد بەو پێیەی کە دەوڵەتی یەکیەتی ممارەسەی سەروەرییێکی بەتەنها لەسەر ئاستی دەرەوە دەکات لە کاتێکدا لە نێوان خۆی و دەوڵەتە ئەندامەکان سەروەری ناوەوە دابەش دەکات.

## دووەم: تیوری پووچەڵ کردنەوە:

بەو تیوریە لە کاتی جەنگی جیابوونەوەی ویلایەتە باشووریەکان لە دژی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە نێوان ساڵانی ١٨٦١-١٨٦٤ بەدەرکەوت. و جون کالهون John Calhoun کە سەر بەویلایەتە باشووریەکان بوو بەداهێنەر و دادکۆکیکەری سەرەکی ئەم تیوریە دادەندرێت(١٥) و قسەکەری فەرمی بوو بەناوی باشوور لەم بوارەدا لە کاتێکدا کە زانای ئەڵمانی ماکس سایدل Max Sydel پشتگیری لێ کرد لە داکۆکی کردن لەو تیوریە کە بەتیوری پووچەڵ کردنەوە Nullification ناوبانگی وەرگرتەوە. وە جون کالهون بۆچوونەکانی تیوری لەت لەت کردنی سەروەری ڕەت کردەوە لەوەی کە دەڵێت: ئەم تیوریە سەروەری بچووک دەکاتەوە بۆ چەند دەسەڵات و تایبەتمەندییێک و جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە سەروەری لە دیدی ئەو سیفەتێکی کاکڵەیی و لێکنەبووی دەوڵەتە کە تەمسیلی بەرزترین کۆمەڵەی بەشەری دەکات(١٦). هەروەها سایدل دەڵێت: ناتواندرێت تەسەوری دەوڵەت بکرێت بەبێ سەروەری کەوا جیای دەکاتەوە لە هەموو کۆمەڵەکانی یاسایی دیکە و لەسەر ئەو بنچینەیەش کالهون و سایدل گەیشتنە ئەو پرنسیپە کە دەڵێت: (سەروەری یەک شتە و لەت لەت نابێت و یەکبوونەکەی لە یەکبوونی دەوڵەت کە خاوەن یەک کەسایەتییە کە قابلی لەت لەت کردن نییە هەڵدەقوڵێت لەبەر ئەوەی لەت لەت کردنی ئەو

کەسایەتییە دەبێتە هۆی نەمانی دەوڵەت بەخۆی. وە ئەو تیوریەی کە بڕوای بەلەت لەت کردنی سەروەری لە نێوان دوو دەوڵەت لەسەر یەک هەرێم و یەک میللەت هەیە تیورێکی دژ بەبیرۆکەی سەروەری و بیرۆکەی دەوڵەت دادەندرێت[١٧].

سەبارەت بەو لایەنەی کە سەروەری تیایدا جێگیر دەبێت کالهون و سایدل دەڵێن لەسەر ئەو بنەمایەی پێشەوە ناکرێت لەسەر یەک هەرێم کەوا یەک میللەتی لەسەر دەژیێت بەلام دوو دەوڵەتی خاوەن سەروەری هەبێت.

سەروەری یان دەبێت بۆ دەوڵەتە ئەندامەکان بێت و ئەو وەختیش دەکەوینە پێش هاوپەیمانیەتی دەوڵەتەکان یاخود هی دەوڵەتی ناوەندی دەبێت کە ئەو کات دەکەوینە پێش دەوڵەتێکی یەکبوو[١٨]. وە دەوڵەتی یەکیەتی هەڵبەستراو لە دیدی کالهون و سایدل لە دەوڵەتێکی ناوەندی یەکبوو زیاتر نییەو پێکهاتەکانی لە یەکە کارگێڕییەکان سەروەری و سیفەتی دەوڵەت لە دەست دەدەن[١٩]. لەبەر ئەوەی دەستوری دەوڵەتە فیدراڵیەکان بەڕاوبۆچوونی کالهون و سایدل سەرچاوە لە پەیمانی نێو دەوڵەتی وەردەگرن هەر وەکو یەکیەتی کۆنفدراڵی بۆیە بەدەستور داناندرێت بەڵکو بەپاکتیکی (میثاق) فیدراڵی لە قەڵەم دەدرێت و لە دوایيدا ئەو پەیماننامەیە لە نێوان چەند دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری گرێ دەدرێت و دەوڵەتە ئەندامەکان بەپێی ئەو پەیماننامەیە سەروەری خۆیان دەپارێزن و لە ئاستێکی بەرزترن لەو دەستەڵاتە ناوەندییە کەوا دروستیان کردووە و لە کۆتاییدا خاوەنانی ئەو تیوریە دەگەنە ئەو ئەنجامە کە ناتواندرێت سەروەری بوونی دەوڵەتێکی یەککرتوو (فیدراڵی) یاخود دەستورێکی فیدراڵی قبوڵ بکەن[٢٠].

لەسەر ئەو بنەمایە کالهون و سایدل دەزگا ناوەندییەکانی دەوڵەتی یەکیەتی بەدەزگای کۆکردنەوەی ئیرادەی دەوڵەتە ئەندامەکان دادەنێن و بەو بۆچوونەش دەوڵەتی یەکیەتی کەسایەتی یاسایی (الشخصية القانونية- المعنوية) نابێت هەروەها خاوەنی هیچ مافێک نابێت و بواری کارکردنی بەرامبەر بەدەوڵەتە ئەندامەکان نابێت.

بێگومان ئەو تیوریە چەند هەڵەیێکی گەورەی کرد بەوەی کە وتی یەکیەتی فیدراڵی لە ڕێگای پەیماننامە دروست دەبێت بەپێچەوانەی واقیع لەبەر ئەوەی دەبینین کە یەکیەتییە فیدراڵییەکان بەپێی دەستوور ناوەکی دروست دەبن، وە سەرباری ئەوەش ئاماژە بۆ ئەو یەکیەتییە فیدراڵییەکان ناکات کە لە ڕێگای لەت لەت کردنی دەوڵەتێکی یەکبوو بۆ دەوڵەتێکی یەککرتوو دروست دەبن. وە لەگەڵ ئەوانە ڕێکدەکەوین[٢١] کە دەڵێن ئەو

تیوریە تیوریێکی سیاسییە لە کاکڵە و ڕاستیدا بۆیە لێکدانەوەییێکی (تفسیر) یاسایی هەڵەی کرد بۆ گەیشتنی بەئامانجە سیاسییەکانی دانەرانی و لە پێش هەموویان دانان بەمافی پووچەڵ کردنەوە و جیابوونە (حق الابطال والانفصال) بۆ ویلایەتە باشوورییەکانی ئەمەریکا لەبەر ئەوەش ئەو تیوریە قەبوڵ نەکرا لە لایەن پرۆفیسۆرەکانی دیکەی یاسای گشتی[٢٢].

**سێیەم: تیوری کلاسیکی:**

ئەو تیوریە لە میانی ئەو ڕەخنانەی کە لەلایەن دانەرانی ئاراستەی هەر دوو تیوری لەت لەت کردنی سەروەری و پوچەڵ کردنەوە سەری هەڵدا، وە لایەنگیرانی قوتابخانەی کلاسیکی هەمان بۆچوونی دانەرانی تیوری پوچەڵ کردنەوە دووپات دەکەنەوە لەوەی کە سەروەری یەکە و قابلی لەت لەت کردن نیە. وە سەبارەت بەمەحاڵ بوونی دوو لایەنی خاوەن سەروەری لەناو دەوڵەتێک بوریل دەلیت(لەت لەت کردنی سەروەری کە بوونی دوو دەوڵەتی خاوەن سەروەری لەسەر یەک هەرێم دەگەینێت شتێکی بەلوجێک مەحاڵە، لەبەر ئەوەی سەروەری وەکو موڵکداری وایە و هەر وەکو ئەوەی کە نابێت زیاتر لە مافێکی موڵکداری لەسەر شتێک هەبێت نابێت دوو دەسەڵاتی خاوەن سەروەری لە وڵاتێکدا هەبێت)[٢٣].

بەڵام دانەرانی تیوری کلاسیکی بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەگەڵ دانەرانی تیوری پوچەڵ کردنەوە لە دەست نیشانکردنی ئەو لایەنەی کە سەروەری تیایدا جێگیر دەبێت، وە لە کاتێکدا کە لە پێشتر بینیمان دانەرانی تیوری پوچەڵ کردنەوە سەروەری لە نێوان دەوڵەتە ئەندامەکان بەتەنها دەهێڵنەوە دەبینین کە تیوری کلاسیکی دەوڵەتی یەکیەتی ناوەندی بەقەبارەییێکی (کیان) یاسایی و مەعنەوی سەربەخۆ و جیا لە پێکهاتەکانی کە دەوڵەتە ئەندامەکانن دادەنێت و هەروەها ماف و بواری کارکردنی تایبەت بەخۆی هەیە و لەسەر ئەو بنەمایە دانەرانی قوتابخانەی کلاسیکی دەگەنە ئەنجامێکی کۆتایی ئەویش ناسینی دەوڵەتی ناوەندی یەکیەتی فیدراڵی نەک دەوڵەتە ئەندامەکان بەدەوڵەت بەواتای تەواوی وشەکە و لە کۆتاییدا ناسینی ئەو بەتەنها بەدەوڵەتی خاوەن سەروەری[٢٤]. بۆیە هزرڤانانی تیوری کلاسیکی دەڵێن دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی فیدراڵی چ لە بواری یاسادانان یا جێبەجێ کردن یاخود دادوەری بریتی نییە لە کۆکردنەوەی دەسەڵاتەکانی دەوڵەتە

ئەندامەکان و دەزگاکانیان بەڵکو بەدەسەڵاتی دەوڵەتی ناوەندی کە قەبارەییەکی مەعنەوی سەربەخۆیە و خاوەن سیفەتی سەروەریە دادەندرێت. وە ئەو تیوریە چەندەها لایەنگیری لە نێوان پرۆفیسۆرە عەرەبەکانی یاسای گشتی پەیاکرد(٢٥). وە هەر چەندە دانەرانی ئەو تیوریە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە سەروەری بەشێوەیەکی تەنهایی بدەنە دەوڵەتی یەکیەتی و نەدرێت بەدەوڵەتە ئەندامەکان بەڵام ناکۆک بوون لەمەڕ سروشتی یاسایی ئەو دەوڵەتە ئەندامانە، ولابەند و جیلنیک و کارە دی مالبرج Care De Malberg و جیریک سیفەتی دەوڵەت دەپۆشنە سەر ویلایەتەکان یا ناوچەکان یاخود کانتۆنە ئەندامەکانی یەکیەتی فیدراڵی.

لابەند Laband دەوڵەتی فیدراڵی بەدەوڵەتی دەوڵەتەکان دادەنێت کە دەڵێت: (جۆری یەکەم لە دەوڵەتەکان کە دەوڵەتی فیدراڵییە بەخۆی کیانێکی دانپیانراو پێکناهێنێت ئەگەر لە ڕێگای جۆرە ڕێکخستنێکی جیاواز نەبێت کە بریتییە لە بەشدارکردنی دەوڵەتە تایبەتەکان لە دروست کردنی ئیرادەی تێکڕایی(٢٦).

بەڵام لابەند بیرۆکەی نێوانکاری داهێنا کە لە ڕێگای ئەوەش هەموو پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی لە نێوان دەوڵەتی یەکیەتی و هاولاتیانی یەکیەتییەکە ڕەت کردەوە و بەپێی ئەو بیرۆکەیە ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی بەدیدی لابەند بەدەوڵەتێکی ڕاستەوخۆ دامەزراو لە لایەن میللەتی ئەڵمانی داناندرێت بەڵکو بەپێی ڕای دەوڵەتە وەکو گومەتێکە لەسەر دەوڵەتە تایبەتەکان کەوا پێکی دەهێنن ڕادەوەستێت بۆیە دەوڵەتی ئەڵمانی میللەتی نییە بەواتای ئاسایی وشەکە و هەروەها هاولاتیشی نییە زیاتر لە دەوڵەتە ئەندامەکان(٢٧). ئەو دەڵێت: لەکاتی دامەزراندنی کۆنفدرالیەتی ئەڵمانیای باکور و ئیمبراتۆریەتی ئەڵمانی میللەتی ئەڵمانیا جەماوەرێکی بەبێ ڕێکخستنی سیاسی نەبووە و گەلێکی لێکچوو نەبووە، هەروەها کۆمەڵێکی سروشتی ئادەمیزاد نەبووە بەڵکو گەلێکی دابەشکراو بوو بەسەر چەند دەوڵەتێک وە کە هەر یەکێکیان ڕێکخستنی دەستور و کەسایەتی یاسایی تایبەت بەخۆی هەبووە. وە ئەو کەسایەتییە هەڵنەوەشاوەتەوە بۆ ئەوەی کۆمەڵێکی یاسایی هاوبەش لە شوێنی دابمەزرێت(٢٨).

هەروەها لە هەمان ڕێڕەو لەسەری دەڕوا و دەڵێت: (هاوولاتی ئەڵمانی ناتوانێت ببێتە هاوولاتی ئیمپراتۆریەت ئەگەر سەر بەیەکێک لە دەوڵەتە ئەڵمانییە تایبەتەکان نەبێت، لەبەر ئەوەی ئیمپراتۆریەت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە دەوڵەتە ئەڵمانییە تایبەتەکان پێک

دێت نەک گەلی ئەلمانیا)[29]. وە دەوڵەتی یەکگرتوو بەدیدو بۆچوونی لابەند وەکو تەلارێکی دوو نهۆمە و نهۆمی یەکەم لە دەوڵەتە ئەندامەکان و هاوڵاتییەکانیان پێک دێت و نهۆمێکی تری لەسەرە کە بریتییە لە دەوڵەتی یەکیەتی.

لەبەر ئەوەی تیوری لابەند لەمەڕ نێوانکاری (توسط) دژ بەسروشتی دەوڵەتی فیدراڵییە کەوا خاوەن دەسەڵاتێکی ڕاستەوخۆیە لەسەر هاووڵاتیانی کە بەشێکی زۆری یاساکانی جێبەجێ دەکەن دەبینین کە دانەرانی دیکەی تیوری کلاسیکی کۆکن لە ڕەتکردنەوەی ئەو بیرۆکەیە لەبەر ئەوەی بەدیدی ئەوان ئەو بیرۆکەی لە یەک حاڵەت بەڕاست دەزانرێت ئەگەر دەوڵەتی فیدراڵی لەسەر یەک هۆکار یاخود ڕەگەز بوەستێت ئەویش دەوڵەتە ئەندامەکانە لە کاتێکدا یەکیەتی فیدراڵی و بەهۆی خەسڵەتی دوانەییەکەی لەسەر دوو ڕەگەز دەوەستێت و ئەوانیش ڕەگەزی فیدراڵی و ڕەگەزی دەوڵەت لەبەر ئەوە دەڵێن هیچ دەرفەتێک نییە بۆ قبوڵکردنی بیرۆکەی نێوانکاری کە لابەند دایهێنا دەبینین کە یەکێکیان ئەویش لۆفورە دەڵێت: (کاتێک کە دەوڵەت هیچ کاریگەرییێکی نەما لەسەر تاکەکان قەرزاری دەوڵەتە ئەندامەکان دەبێت بۆ هەر کارێک کە داوا لە تاکەکان دەکرێت ئەو کارە بکەن یا ئەوەی تر نەکەن، لەبەر ئەوەی دەوڵەتە تایبەتەکان نێوانکارێکی پێویستن لە نێوان ئەو و میللەت[30]. هەروەها لۆفور لەسەری دەڕوات و دەڵێت: (ناتواندرێت بەتیوری لابەند وەربگیرێت لەمەڕ ڕێکخستنی دەسەڵاتە گشتییەکان لە دەوڵەتی فیدراڵی و سەبارەت بەوەی کە دەوڵەتی فیدراڵی لە سەرووی ئەندامەکانە وەکو ئەوەی گومەت بالاترە لەو خانووانەی کە دەکەوێتە سەریان و ئەمە هیچ لە وەزعەکە ناگۆڕێت بەڵکو هەیکەلی ئەو خانووانە پارێزگاری لەسەر ئەوەی کە لە ناوی هەیە دەکات، لە کاتێکدا ئەوەی کە ڕوو دەدات بەپێچەوانەیە چونکە کە دەوڵەتی فیدراڵی دروست دەبێت ڕێکخستنی دەوڵەتە تایبەتەکان هەڵدەوەشێت و ئەو ئەساسانەی کە لەسەری دەوەستا دەکەون و دەوڵەتی فیدراڵی بەپێکهاتەکانی خانووەکان و هیچیشی لە دیوارە کەونەکان ناهێڵێت تەنها ئەوە نەبێت کە بینایە تازەکە پێویست بەگۆڕینی ناکات[31].

هەروەها دەبینین کەوا یەکێک لە دانەرانی ئەو قوتابخانەیە ئەویش (جیلینیک)ە کە سفەتی دەوڵەت دەپۆشێتە سەر دەوڵەتە ئەندامەکان هەر چەندە کە سەروەرییان نییە بەڕای ئەو، و دەوڵەتی فیدراڵی پێناسە کرد بەوەی (کە دەوڵەتێکی سەروەرە (سید) لە چەند دەوڵەتێکی بێ سەروەری (غیر سید) پێکدێت و دەسەڵاتەکەی لەو دەوڵەتانە سەرچاوە دەگرێت کە لێیان پێک دێت و کە پەیوەندییێکی توندوتۆڵیان لە نێوان هەیە بەشێوەیەک کە

دەیانکاتە یەک یەکەی سیاسی)[٣٢]. کارە دی مالبرج Care De Malberg لەسەر هەمان ڕەوت دەڕوات لە پێناسە کردنی دەوڵەتی فیدراڵی کە دەڵێت: (دەوڵەتی فیدراڵی بەهەمووی دەوڵەتیشە و یەکگرتووی دەوڵەتانە و لە لایەک دەشوبهێتە دەوڵەتی یەکبوو لێرەشدا لە کۆنفدراڵیەتی دەوڵەتەکان جیا دەکرێتەوە و لە لایەکی دیکەوە لە چەند دەوڵەتێک پێک دێت کە پەیوەندییێکی فیدراڵی لە نێواندا هەیە بەوەش لە دەوڵەتی یەکبوو جیا دەکرێتەوە[٣٣]. بەڵام مالبرج لەسەر ڕێڕەوی هاوبیرەکانی ڕۆیشت لەمەڕ ڕەت کردنەوەی سیفەتی سەروەری لە دەوڵەتی تایبەت کە وتی: (چونکە دەسەڵاتی دەوڵەتی تایبەت سنووردارە بەدەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵی بۆیە شتێکی سروشتییە کە دەوڵەتی تایبەت سەروەر (سید) نەبێت[٣٤].

بەڵام بۆچوونێکی دیکە لە نێو قوتابخانەی کلاسیکی هەیە ئەویش بۆچوونی بوریل و لۆفور و دوران کە زیاتر لە ڕەوتی هاوبۆچوونانی پێشووتریان دەڕۆن بەوەی کە سیفەتی دەوڵەت نادەنە دەوڵەتە تایبەتەکان کە دەوڵەتی فیدراڵی لێیان پێک دێت، دەبینین بوریل دەڵێت: (لە دوای ورد بوونەوە لەو مشت و مڕەی هاتە پێش سەبارەت بەو بابەتە و لە دوای لێکدانەوەیەکی یاسایی ڕووداوە (وقائع) هەست پێکراوەکان هیچ دوودڵییێکمان نییە لە جەخت کردن کە سەروەری یەکێکە لە ڕەگەزەکانی چەمکی یاسایی دەوڵەت وە لەوەی کە دەوڵەتی بێ سەروەری دەوڵەت نییە بەچەمکی یاسایی وشەکە و خۆمان بەناچار دەزانین کە ئەو ئەنجامە قبوڵ بکەین چونکە بەبێ سەروەری هیچ پێوەرێکمان نییە بۆ جیاکردنەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵە گشتییەکانی دیکە وەکو شارەوانییەکان و هەرێمەکان[٣٥]. و لۆفور Lefur جەختی لەسەر هەمان ڕەوت کردووە کە وتی: (لە بنچینەی دەوڵەتی فیدراڵی هەر وەکو لە بنچینەی دەوڵەتی یەکبوو چەمکی سەرەکی هەیە ئەویش چەمکی سەروەرییە، وە دەبێت بەوردی ئەو چەمکە دراسەت بکەین چونکە ئەو بەتەنیا دەرفەتمان بۆ دەڕەخسێنێت جیاوازی لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵە گشتییەکانی دیکە بکەین)[٣٦]. دوران (Durand)یش دەچێتە پاڵیان کە دەڵێت: (دەبێت لەگەڵ بوریل Borel و لۆفور Lefur بڵێین کە سەروەری خەسڵەتێکی پێویستە بۆ دەوڵەت. وە هەموو دەوڵەتێک پێویستە سەروەر بێت[٣٧]. وە خاوەنانی ئەو بۆچوونەی دوایی جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە سەروەری تەنها پێوەرە بۆ دەوڵەت و لە سەریشی دەڕۆن و دەڵێن دەوڵەتی ناسەروەر بوونی نییە بەو بنچینەیەی کە بڕیاردان بەبوونی دەوڵەتی ناسەروەر مانای ڕووخاندنی هەموو سنوورێک لە نێوان دەوڵەت و شارەوانییەکان دەگەیێنێت بەو بەڵگەی

کە هەموو ئەو هەولانەی دران بۆ مانەوەی سنوور لە نێوانیان بێجگە لە سەروەری نوشستیان هێنا بەڕای خاوەنانی ئەو بۆچوونە. بەلام لەگەڵ ڕەتکردنەوەی سیفەتی دەوڵەت لەو دەوڵەتە تایبەتانە ناگەنە ئەو ئاستەی کە بەکۆمەڵەی ئاسایی وەکو شارەوانییەکانیان دابنێین، و بوریل Borel جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە دەڵێت: (دەوڵەتی فیدراڵی ئەو دەوڵەتەیە کە تیایدا کۆمەڵە گشتییە خوارترەکان دەرفەتی بەشداریکردنیان لە ممارەسەی دەسەلاتی سەروەری دەدرێتێ. ئەو کۆمەلانە دەوڵەت نین بەواتای وردی وشەکە لەبەر ئەوەی سەروەرییان نییە، بەلام بەشداری کردنیان لە ممارسەکردنی دەسەلاتی بالا جیایان دەکاتەوە لە شارەوانیەکان و لە هەموو کەسیەتییەکانی یاسای گشتی و ئەمەش بیرۆکەیەکی یەکلاکەرەوەیە بۆ زانینی خەسڵەتە یاساییەکەیان. کۆمەڵە گشتییەکان لە دەوڵەتی فیدراڵی تەنها ناوەندی هەڵبژاردن نین بەڵکو ئەوانە کۆمەڵەیەکن هەر یەکێکیان کەسایەتی جیاوازی خۆی هەیە و هەروەها هەستێکی تایبەت بەهاوسۆزی هەیە کە بەرهەمی پێکەوە بوونی مێژووییە کە چەند سەدە بەردەوام بووە. بەوشەیەکی کورت ئەو کۆمەلانە چەند دەزگایەکن و ئەندامێکن و بەو سیفەتە بەشداری دەکەن لە دروست کردن و جێبەجێکردنی ئیرادەی دەوڵەتی سەروەر. ئەمەیە کە دەوڵەتە ئەندامەکان لە یەکگرتووی فیدراڵی جیادەکاتەوە لە شارەوانییەکان و ناوەندەکانی هەڵبژاردن لە دەوڵەتێکی یەکبوو[٣٨]. بوریل Borel لەسەری دەڕوات بۆ ئەوەی (دەوڵەتی فیدراڵی دەوڵەتێکە کەوا کۆمەڵە گشتیە خوارترەکان بەشداری تێدا دەکەن بەشێوەیەک یا شێوەیەکی دیکە لە دروستکردنی ئیرادەی دەوڵەتی سەروەر.

بەو جۆرەش ئەو کۆمەلانە لە شارەوانیەکان و ناوچە کارگێڕیەکان لە دەوڵەتی سادە جیا دەکرێنەوە، وە ئەو بەشداری کردنە سیفەتی ئەندام لە دەوڵەتی فیدراڵی دەداتە ئەو کۆمەلانە[٣٩] و لۆفور Lefur لە هەمان ڕێڕەو بۆ ئەوە دەچێت کە کۆمەڵە گشتییە سەربەخۆییەکان (دەوڵەتە ئەندامەکان) لە نێو دەوڵەتی فیدراڵی بەوە لە کۆمەڵە تایبەتە بێ سەروەرییەکان جیا دەکرێنەوە کە بەشداری لە دروست کردنی ئیرادەی دەوڵەتی فیدراڵی و کاکڵەی سەروەری فیدراڵی دەکەن[٤٠].

بەلام لە کاتێکدا هەر یەک لە بوریل Borel و لۆفور هەوڵ دەدەن پێوەرێک بۆ دەوڵەتی فیدراڵی ببیننەوە لە میانی بەشداری کردنی کۆمەڵە گشتییەکان (دەوڵەتە ئەندامەکان) لە دروست کردن و جێبەجێکردنی ئیرادەی دەوڵەتی سەورەر لای بوریل Borel یاخود لە کاکڵە سەروەری لای لۆفورLefur دەبینن دۆران Durand هەوڵ دەدا لە میانی سەربەخۆیی

دەوڵەتە ئەندامەکان ببینیتەوە و بیرۆکەی سەربەخۆیی بەڕای دۆران Durand لە دوو ڕەگەز پێک دێت یەکەمیان بریتییە لە بوونی چەندەها دەسەلات و تایبەتمەندی لە دەست دەوڵەتە ئەندامەکان و تەنها خۆیان دەتوانن بەکاریان بهێنن بەرامبەر هەموو دەزگاکانی دەوڵەتی فیدراڵی لە کاتێکدا کە ڕەگەزی دووەم بریتییە لەو دەسەلاتانەی کە دەزگاکانی دەوڵەتی ئەندام هەیانە بەرامبەر بەدەزگا فیدراڵییەکان(٤١). لە دوای ئاماژە کردنی دۆران Durand بۆ خەتەرناکی پێشهاتەکانی ئەم بوارە کە بریتین لە فراوان بوونی دەسەلاتەکانی دەوڵەتی یەکیەتی لەسەر حسابی دەوڵەتە ئەندامەکان و بەتایبەت لە بواری دەسەلاتە هاوبەشەکان یا تێکەلاوەکان و کاریگەریەتی لەسەر سەربەخۆیی دەوڵەتە ئەندامەکان کەوا بیرۆکەی دەوڵەتی فیدراڵی لەسەر بیناکرا دەبینین ئەو بەدوای پێوەرێک دەگەڕێت کە وردتر و ڕاستتر بێت لە جیاکردنەوە لە نێوان دەوڵەتی فیدراڵی و دەوڵەتی سادە کە بشگونجێت لەگەڵ پێشهاتەکان و دەڵێت: (لە باتی پێوەرەکانی پێشوو بەباشتر ئەزانین پەنا بۆ پێوەرێک ببرێت کە ئەو دوو مەرجە کۆبکاتەوە: نا مەرکەزیەتێک کە دەستور دروستی بکات و داینێت و سنوورەکانی دەستنیشان بکات، و نا مەرکەزیەتێکی وا کە ئیجاب بکات چەندەها دەسەلات لە هەندێک بابەت بەتەنها لە لایەن دەزگاکانی تایبەت بەدەوڵەتە ئەندامەکان بەکار بێت(٤٢).

**دوا بۆچوونمان لەو بابەتە:**

بڕوامان وایە کە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی کلاسیکی و تیوری پووچەڵ کردنەوە کە بانگەشەیان بۆ یەکپارچەیی سەروەری و قابیل نەبوونی لەت لەت کردنی لە خاڵێکی تیورییانەوە دەستپێکیان کرد ئەویش سەروەری لەسەر بالایی و سنووردار نەکراوی بەهیچ ئیرادەیەکی دیکە دەوەستێت و بەوەی کە دەوڵەت دەسەلاتێکی سەربەخۆی لە هەموو دەسەلاتێکی دیکەی هەیە، و هەروەها بالاتریشە لە هەموو دەسەلاتێکی دیکە لە ممارسە کردنی چالاکییەکانی، بێگومان ئەو چەمکەی سەروەری دروست بوو و گەشەی کرد لە ژێر سێبەری دەوڵەتی یەکبووی سادە کە ناتواندرێت لە بواریدا دەست لە کاروباری سیاسی بالا وەردرێت چونکە دەبێتە دەستدرێژی لەسەر سەرووەری. وە دەتوانین بڵێین کە ئەو چەمکە کلاسیکیەی سەروەری تووشی گۆڕانکاری کاکڵەیی بوو لە ئەنجامی سەرهەڵدانی دەوڵەتی فیدراڵی خاوەن سروشتی ئاڵۆز (مركب) ئەمە لە لایەک و لە لایەکی دیکە لە بەر ئەوەی خودی چەمکی سەورەری لە بواری ڕێکخستنی نێودەوڵەتی و بەتێپەڕ بوونی کات

و بەتایبەت لە چارەگی دوایی سەدەی بیستەم سیفەتی ڕەهایی کەوا بەخۆیەوەی گرتبوو لە دەست دا، چونکە حاڵەتێکی زۆر دەبینین کە تیایدا دەست لە کاروباری نێوخۆیی دەوڵەتەکان دەدرێت و سەروەریشی پێشێل دەکرێت بەبیانووی بەرگری کردن لە مافی مرۆڤ یاخود ڕووبەڕوو بوونەوەی تیرۆر ئەمەش پاڵمان پێوە دەنێت کە بڵێین بیرۆکەی سەروەری مەسەلەیەکی ڕێژەییە و بەرەهایی نەماوەتەوە، هەروەها ئەوانەی کە بەیەکپارچەیی سەروەری وەردەگرن و داوای پیادەکردنی ئەو پرنسیپە لە دەوڵەتی فیدراڵی دەکەن خۆیان لە سروشتی ئەو دەوڵەتە سالۆس کرد هەروەها ئەو دەستورە فیدراڵییانەی کە ئەو جۆرە دەوڵەتە لەسەر بنەمایان دادەمەزرێت پشت گوێ خست.

وە لەبەر ڕێکنەکەوتنی لۆجیکی قوتابخانەی کلاسیک لەگەڵ سروشتی دەوڵەتی فیدراڵی و دەستورە فیدراڵییەکان دانەرانی ئەو قوتابخانەیە هەوڵی ئەوەیان دا دەروازەیێک بییننەوە بۆ گونجاندن لە نێوان یەکپارچەیی سەروەری و سروشتی دەوڵەتی فیدراڵی کە لەگەڵ ئەو یەکپارچەییە ناگونجێت. وە دەبینین کە لابەند و جیلینیک و کارە دی مالبرج سیفەتی دەوڵەت دەپۆشنە سەر دەوڵەتە ئەندامەکان بەڵام سیفەتی سەروەرییان لێ ڕەت دەکەنەوە و هەندێکی دیکەیان وەکو هینیل Heanel و جیریک دەڵێن کە نە دەوڵەتی ناوەندی و نە دەوڵەتە ئەندامەکان بەتەنیا دەوڵەت پێکناهێنن بەواتای وردی وشەکە، و دەوڵەت بەبۆچوونی ئەوان لە ئەنجامی کۆکردنەوەی هەردوولایەن پێک دێت. و هینیل دەڵێت: (نە دەوڵەتی تایبەت و نە دەوڵەتی کۆمەڵەیی (الدولة الجماعية) دەوڵەت پێکناهێنن بەواتای ڕاستەقینەی وشەکە، لێرەدا دەوڵەتی ڕاستەقینە تەنها دەوڵەتی فیدراڵییە چونکە ئەنجامی کۆکردنەوەی ئەوە و ئەوانە)[٤٣]. و جیریک لە هەمان ڕێڕەو دەڵێت: (نە دەوڵەتی تایبەت و نە دەوڵەتە کۆمەڵییەکان دەوڵەتی بەواتای ڕاستەقینەی وشەکە پێک ناهێنن. هیچ کامێکیان لە کۆمەڵەیێکی ڕێکخراو کە لەسەر شێوەی دەوڵەت کار دەکات تێناپەڕن. دەوڵەتی فیدراڵی دەوڵەت نییە بەو مەرجە نەبێت ئەویش ئەنجامی کۆی کۆکردنەوەی هەردوولا نەبێت[٤٤]. وە لە کاتێکدا کە جیریک Gierke بیرۆکەی لەت لەت کردنی سەروەری ڕەت دەکاتەوە لە سەری دەڕوات و دەڵێت کە سەروەری لە لایەن یەک کەس لە دەوڵەتی یەکبوو ممارەسە دەکرێت بەڵام لە لایەن چەند کەسێک لە دەوڵەتی فیدراڵی ممارەسە دەکرێت کە بریتین لە دەوڵەتی فیدراڵی و ئەندامەکانی وە هەروەها دەڵێت: دەوڵەتی فیدراڵی لەگەڵ ئەندامەکانی یەککگرتوویێک پێکدێنن کە بەشداری کردنی کاکڵەی سەروەری لێ دەکەویتەوە، هەروەها بوریل Borel وای بۆ دەچێت کە پێوەری

جیاکردنەوەی دەوڵەتی تایبەت لە کۆمەڵە گشتییەکانی دیکە بریتییە لە بەشداری کردنی ئەو دەوڵەتە لە دروست کردنی ئیرادەی یەکیەتی، لە کاتێکدا کە لۆفور Lefur لەو دوورتر دەڕوات و دەڵێت: ئەو پێوەرە لە بەشداری کردنی دەوڵەتی تایبەت لە کاکڵەی سەروەری سەرچاوە دەگرێت.

وە لە بەردەم ئەو هەڵوێستە فقهیانە بۆمان هەیە ئەو پرسیارە بورووژێنین: مادامەکێ دەوڵەتی تایبەت بەشداری لە دروست کردنی ئیرادەی دەوڵەت دەکات و بەشداری لە کاکڵەی سەروەری و ممارەسە کردنی لە دەوڵەتی فیدراڵی دەکات چۆن دەتوانین گونجاندن بکەین لە نێوان چەند لایەنی ئیرادەی گشتی و کاکڵەی سەروەری و ئەو چەند لایەنی کە ممارەسەی سەروەری دەکەن لە لایێک و قابل نەبوونی لەت لەت کردنی سەروەری و نەبوونی سەروەری لە دەوڵەتە ئەندامەکان لە لایێکی دیکە؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێین زۆر ئەستەمە گونجاندن بکەین لە نێوان ئەو دوو هەڵوێستە دژ بەیەکەدا وە ئەو دژ بەیەکبوونە هۆیەکەی بۆ نەگونجانی بیرۆکەی یەکپارچەیی سەروەری لەگەڵ سروشتی ئاڵۆزی دەوڵەتی فیدراڵی دەگەڕێتەوە.

وە لەسەر بنەماکانی پێشوو بڕوامان بەڕاستی تیوری لەت لەت کردنی سەروەری لە دەوڵەتی یەکگرتوو هەیە لەبەر ئەوەی لەگەڵ واقع و سروشتی ئەو دەوڵەتە کە خاوەن پێکهاتێکی ئاڵۆزە دەگونجێت نەخاسمە کە دەقەکانی دەستوری یەکیەتی دەسەڵاتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکانی دیار کردووە ئەو دەسەڵاتانەی کە حکوومەتی یەکیەتی ناتوانێت دەستدرێژی بکاتە سەریان. و کاتێک کە دەوڵەتە ئەندامەکان واز لە هەندێک لایەنی سەروەری دەرەوەیان دێنن بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتی یەکیەتی ئەوە ناگەیەنێت کە وازیان لە هەموو سەروەری خۆیان هێنابێت بەڵکو لایەنێکی زۆر سەروەری ناوەوە لە دەست خۆیان دەمینێتەوە بەبەڵگەی ئەوەی کە بوار دەدرێتە ئەو دەوڵەتانە واتە دەوڵەتە ئەندامەکان کە دەسەڵاتەکانی دامەزرێنەر و یاسا دانان و جێبەجێ کردن و دادوەری خۆیان هەبێت لە چوارچێوەی دەستوری فیدراڵی بۆیە ئەو دەوڵەتانە تەنها یەکەیەکی هەرێمی نین کە تەنها ممارەسەی فەرمانبەریەتی کارگێری لامەرکەزی بکەن لە ژێر چاودێری و ڕاوێژکردنی حکوومەتی ناوەندی وەک ئەوەی لە دەوڵەتی یەکبوو هەیە، بەڵکو ئەو دەوڵەتە ئەندامانە لە هەندێک بوار بەیەکسانی لەگەڵ حکوومەتی یەکیەتی دەوەستن سەرباری ئەوەی کە لایەنێکی گرنگی سەربەخۆیی دەستوری و ڕێکخستنی خودی بەدەست خۆیانەوە دەگرن، هەروەها بەشداری دەکەن لە دروست کردنی ئیرادەی گشتی و سەروەری و ممارەسە کردنی لە

چوارچێوەی دەوڵەتی یەکیەتی لە ڕێگای نوێنەرایەتی کردن بەشێوەیەکی یەکسان لە ئەنجومەنی باڵا (ئەنجومەنی دەوڵەتەکان یا پیران) وە هەروەها لە ڕێگای بەشداری کردنیان لە هەموار کردنی دەستوری یەکیەتی (فیدراڵی) و هەندێک دەوڵەتی فیدراڵی زیاتر ڕۆیشتن کە دەرفەتیان بەهەندێک لە دەوڵەتە ئەندامەکان داوە کەوا نوێنەرایەتی دیبلۆماتی سەربەخۆیان هەبێت لەسەر ئاستی دەرەوە وەکو ڕوسیای سپی و ئۆکرانیا لە یەکیەتی سۆڤێتی پێشوو یاخود هەندێک ڕێکەوتنی بازرگانی مۆر کەن وەکو کانتۆنە سویسریەکان و هەرێمە کەنەدییەکان و ویلایەتە ئەمریکییەکان. وە باشترین بەڵگە بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەمان ئەو دەقەیە کە لە دەستوری سویسرا لەم بوارەدا هاتووە کە دەڵێت: (کانتۆنەکان خاوەن سەروەرین هەتا ئەو ڕادەیەی کە سەروەرییەکەیان سنووردار نابێت لە لایەن دەستوری فیدراڵی[٤٥].

The canton are Sovereign in so far as their sovereignty is not Limited by the constitution.

هەروەها دەستوری یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو دەڵێت: (یەکیەتی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤێت پارێزگاری لە مافەکانی کۆمارە یەکگرتووەکان دەکات)[٤٦].

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی دووەم

(1) L. Op Penheim, Op. Cit Page 118- 119.

(2) Op. Cit Page 120.

بەڵام أوینهایم Oppenheim دەڵێت دەستەواژەی سەروەری لە پێش ئەو مێژووە بەکار دەهات و لە کۆتایی سەدەکانی ناوەندی لە فەرەنسا بەکار دەهات بۆ ئاماژەکردن بۆ هەر دەسەڵاتێک سیاسی بێت یاخود غەیرە سیاسی- کە هیچ دەسەڵاتێکی دیکە لە سەرووی ئەو نەبێت.

(3) Ivan Bernir, international legal aspects of Federalism Long man Group Limied Girst Published 1973 Page 18.

(٤) ئەوە لە کتێبی Ross هاتووە کە بەناوی کتێبی قوتابخانەیی بۆ یاسایی نێو دەوڵەتی ناوزەد کراوە وە لە ١٩٤٧ بڵاوکراوەتەوە.

A text book of international law

Ivan Bernier, Op. Cit Page 18.

(5) Alexander Hamilton and James Madison and John Jay Op. Cit No 39 Page 284-285.

(٦) له دكتور ميشال رياشي- سەرچاوەی پێشوو ل ٨ گوازراوەتەوە.

(٧) سەرچاوەی پێشوو ل ٨- ٩.

(8) L. Oppenheim, Op. Cit Page 175.

(٩) مەبەست له فدراڵیەی دوانەیی Dual Fedralism ئەوەیه كه دەستوور سیستەمێكی حكوومی خاوەن چەند بوارێكی سیاسی وەكو یەكی دروست كردووه Collaterall Political Spheres و حكوومەتی ناوەندی و حكوومەتی ولایەت دوو سەنتەری دەسەڵاتی جیاواز له یەكتری پێكدەهێنن و هەریەكێكیان ئەوەی دیكه ڕادەگرێت و بوارێک هەیه له نێوان هەردووكیان بۆیان نییه داخلی ئەو بواره ببن و هەر یەكێک لەو دوو توخمە حكوومەته خاوەن سەروەرییه له بواری تایبەتی خۆی ئەمەش مەسەلەیێكی كاكڵەییيه بۆ یەكسانی له نێوانیاندا.

.Richard H. Leach, American Federalism, w. w. Norton & Company inc Newyork 1973 Page 13- 14

(١٠) دكتور أحمد كمال أبو المجد- الرقابة على دستورية القوانين. سەرچاوەی پێشوو ل ٨٦.

Richard H. Leach, Op. Cit Page 13- 14.

(١١) دكتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالية- سەرچاوەی پێشوو ل ٢.

(١٢) دكتۆر عوسمان خەلیل عوسمان/ القانون الدستوری والمبادئ الدستورية العامة والنظام الدستوري المصري- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٥.

دكتۆر سليمان طماوي- النظم السياسية والقانون الدستوري- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣.

(13) Ryads Azhari, Op. Cit Page.

(١٤) دكتۆر زوهير شوكر- الوسيط في القانون الدستوري- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٩.

دكتۆر فؤاد عەتار- النظم السياسية والقانون الدستوري- سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٣.

دكتور موحسن خەلیل- النظم السياسية والدستور اللبنانی- سەرچاوەی پێشوو ل ٨٨.

دكتۆر سيد خليل هيكل- القانون الدستوري والانظمة السياسية- ١٩٨٣- ١٩٨٤ ل ٢٤٥.

(١٥) بۆ ئەوە سەیری ئەم دكتۆرانامەیە بكە.

(١٦) دكتۆ میشال ریاشی- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠.

(١٧) له سەرچاوەی پێشوو ل ٢١ گوازراوەتەوە.

(18) Ivan Bernier, Op. Cit Page 19.

(١٩) دكتۆر میشال ریاسی- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥.

(٢٠) سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩- ٣٠.

(٢١) دكتۆر خالید قەبانی- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٤.

(22) Ivan Bernier, Op. cit Page 19.

(٢٣) له میشال رياشی- سەرچاوەی پێشوو ل ٩٨ گوازراوەتەوە.

(٢٤) سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٩.

(٢٥) دكتۆر شافعی محەمەد بەشیر- القانون الدستوري والنظم السیاسیة السودانیة- سەرچاوەی پێشوو ل١١٨- ١٢١.

دكتور سموحي فوق العادة- سەرچاوەی پێشوو ل ١٤٦.

دكتور محمد عبدالمعز نصر- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٧٦.

أنور خطيب- المجموعة الدستورية- البحث الأول- الدولة والنظم السياسية- الجزء الأول- بەیروت- چاپی یەكەم ١٩٧٠ ل ٧٢- ٧٣.

(٢٦) له دكتور میشال رياشی- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٠ گوازراوەتەوە.

(٢٧) بۆ ئەوە سەیری- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠١ بكە.

(٢٨) له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠١ گوازراوەتەوە.

(٢٩) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٢.

(٣٠) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٩.

(٣١) گوازراوەتەوە لەسەرچاوەی پێشوو ل ٢١١.

(٣٢) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤٩.

(٣٣) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٤.

(٣٤) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٦.

(٣٥) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩٩.

(٣٦) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩٩.

(٣٧) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٩٩.

(٣٨) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٣٢٤.

(٣٩) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٣٢٤.

(٤٠) سەرچاوەی پێشوو ل ٣٣٠.

(٤١) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٣٤٩.

(٤٢) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٣٥١.

(٤٣) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢١٧.

(٤٤) گوازراوەتەوە له سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٢.

(45) Article 3from the federal Constitution of the Swiss Confederation.

(٤٦) مادده ٨١ له دەستووری یەكیەتی كۆمارەكانی سوشیالستی سۆڤیێتی ساڵی ١٩٧٧.

# سیماکانی یەکیەتی لە سیستەمی فیدراڵی

دەوڵەتی یەکگرتوو هەر وەکو دەوڵەتی یەکبووی سادە لەسەر سێ کۆڵەگە ڕادەوەستێت ئەویش گەلە (الشعب) کە لە هاووڵاتیانی دەوڵەتە ئەندامەکان پێک دێت و هەرێم کە لە هەموو هەرێمەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان پێک دێت و دەسەڵاتی سیاسیی ئەویش حکوومەتی یەکیەتییە کە لە دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن پێک دێت.

دەوڵەتی یەکگرتوو خۆی وەک یەک دەوڵەت لە بواری پێوەندییە نێو دەوڵەتییەکان پیشان دەدات و بەشێوەیێکی تەنها بەخۆی سەروەری لەسەر ئاستی دەرەوە بەکاردێنێت لە کاتێکدا کە ئەو سەروەریە لەگەڵ دەوڵەتە ئەندامەکان دابەش دەکات لەسەر ئاستی ناوەوە.

لەو ئاخافتنە باس لە سیماکانی یەکگرتن لە دەوڵەتی فیدراڵی لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی لە بڕگەی یەکەم دەکەین وە لە دواییدا لە بڕگەی دووەم باس لە سیماکانی یەکگرتن لە بواری نێوخۆیی دەکەین.

## یەکەم: سیماکانی یەکگرتن لە بواری نێو دەوڵەتی:

سیماکانی یەکگرتن لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی لە چەند لایەنێکی سەرەکی خۆی دەگرێتەوە و هەموشیان ڕەنگی یەک دەوڵەتی یەکگرتووی فیدراڵی پیشان دەدەن و دەتوانرێت ئەو ڕووانە دەستنیشان بکەین لە خوارەوە:

١- دەوڵەتی یەکگرتوو یەک دەوڵەتە لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی.

٢- یەکبوونی ناسنامە.

٣- یەکبوونی هەرێم.

### ١ - دەوڵەتی یەکگرتوو یەک دەوڵەتە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی:

وەکو پێشتر باسمان لێوە کرد دەوڵەتی فیدراڵی یا بەیەکگرتنەوەی چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ و بەمەبەستی دامەزراندنی یەکیەتییێکی فیدراڵی دێتەدی یاخود بەگۆڕینی شێوەی دەوڵەتێکی سادەی یەکبوو بۆ دەوڵەتێکی یەکگرتوو، و بەهەرشێوەیێک دەوڵەتی فیدراڵی دروست بێت ئەنجامەکەی هاتنەدی یەک دەوڵەتە لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی نەک

چەند دەوڵەتێک وەکو ئەوەی لە حاڵەتی یەکیەتی کۆنفدراڵی Confedration ڕوودەدات. بەڵام بەرامبەر ئەوە دەوڵەتە ئەندامەکان قەوارەی سیاسیی و مۆرکی خۆیان لە بواری نێوخۆیی لە دەست نادەن بۆیێ لەگەڵ ئەوانە[١] ڕێک ناکەوین کە دەڵێن دەوڵەتی یەکگرتوو لە دوو جۆرە هاولاتی پێک دێت یەکێکیان دانیشتوانی وڵاتە و دووەمیان ئەو ولایەتانەیە کە یەکیەتییەکە پێک دێنن بەبیانووی ئەوە کە دەسەلاتی یاسا دانانی یەکگرتوو لە دوو ئەنجوومەن پێک دێت یەکێکیان بۆ خەڵکی وڵاتە و دووەم بۆ ولایەتەکان و لە ئەنجامدا یەکسانیکردن لە نێوان هاولاتییان و دەوڵەتە ئەندامەکان بەڵام ئەو یەکسانییە نایێتەدی و هاشاکردنە لە واقعی حاڵ کە بریتییە لەوەی کە دەوڵەتە ئەندامەکان قەوارەی سیاسین و سەروەری دابەش دەکەن لەگەڵ حکوومەتی یەکیەتی لەسەر ئاستی نێوخۆیی و بۆ جەختکردن لەسەر ئەو تایبەتمەندییە لە سروشتی دەوڵەتی فیدراڵی دەبینین کە ئەندریە هوریو دەڵێت کە دەوڵەتی فیدراڵی کۆمپانیای دەوڵەتەکانە[٢] هەروەها مارسیل بریلو Marcd Prelot و لە هەمان بۆچوون دەڵێت دەوڵەتی فیدراڵی کۆبوونەوەی دەوڵەتانە (تجمع دول)[٣].

دکتۆر حسن چەلەبی هەر لەم ڕێڕەوە دەڵێت «یەکگرتووی فیدراڵی دەوڵەتە ئەندامەکان ڕووت ناکاتەوە لە کەسیەتی نێو دەوڵەتی هەرچەندە کە لە پلەی دەوڵەتییان مەحروم دەکات»[٤].

لەسەر ئەو وتانەی سەرەوە هەرچەندە کە یەکیەتی فیدراڵی وەکو پێشتر باسمان لێوە کرد دەبێتە هۆی دروست بوونی یەک دەوڵەت لەسەر ئاستی دەرەوە ئەویش دەوڵەتی یەکگرتووەکەیە کە دەبێتە خاوەن کەسایەتی نێو دەوڵەتی تەواو بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتە ئەندامەکان پلەی دەوڵەت لە دەست بدەن لە بواری نێو دەوڵەتی و دەست هەڵگرتنی ئەو دەوڵەتانە لە ڕووەکانی سەروەری دەرەوەیان دەبێتە هۆی نەتوانینیان کە وەکو کەسی یاسایی لە بواری یاسای گشتی نێو دەوڵەتی و پێوەندییە نێو دەوڵەتییەکان دەربکەون[٥]، و بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە ئەندریە هوریو Andre Haurio وای بۆ دەچێت کە «لە هەر دەوڵەتێکی فیدراڵی هێزێکی ناوەندی هەیە کە دەوڵەتە بەشداربووەکان کەم دەتوانن لە ڕووی ڕاوەستن بێجگە لەوەش لە چاوی بێگانە لە دەوڵەتی فیدراڵی یەک پارچەیی لە خاک و کاروباری ئابووری و دەسەلاتی سیاسی هەیە»[٦] و دەرهاوێشتەکەی ئەوەیە کە دەوڵەتی یەکگرتووەکە بەشێوەیێکی تاکڕەوی بەهەموو مەسەلە پێوەندەکان بەکاروباری دەرەوە هەڵدەستێت وەکو پەسەندکردنی پەیماننامەکان و گرێدانی

ڕێکەوتنە نێو دەوڵەتییەکان و جێبەجێکردنیان و جاڕدانی جەنگ و پەستانی ئاشتی و بەرپاکردنی پێوەندییە دبلۆماسییەکان و لە ئەستۆگرتنی لێپرسراویەتی نێو دەوڵەتی.

**٢- یەکبوونی وڵاتنامە (ڕەگەزنامە):**

هەموو هاوڵاتیانی یەکگرتووی فیدراڵی لە دەوڵەتە ئەندامە جیاجیاکان یەک وڵاتنامەیان دەبێت ئەویش وڵاتنامەی دەوڵەتە یەکگرتووەکە دەبێت و بۆ نموونە هاوڵاتیانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەرچەندە لە ویلایەتی جیاجیا دادەنیشن بەڵام یەک وڵاتنامەیان هەیە ئەویش وڵاتنامەی ئەمریکییە و هەمان بنەما لە دەوڵەتە فیدراڵییەکانی دیکە پێڕەو دەکرێت و هەندێک دەڵێن[٧] کە مەسەلەی بوونی یەک وڵاتنامە لە دەوڵەتی یەکگرتوو بەیەکێک لە دەرهاویشتەکانی تاکڕەوی حکوومەتی یەکیەتی لە بەکارهێنانی سەروەری لەسەر ئاستی دەرەوە و ناوەوە دادەندرێت بەڵام لەگەڵ ئەو بۆچوونە ڕێک ناکەوین لەبەرئەوەی حکوومەتی یەکیەتی تاکڕەو نییە بەشێوەییەکی ڕەها لە بەکارهێنانی سەروەری هەر وەکو پێشتر باسمان لێوەکرد[٨]، ئەمە لە لایێک و لە لایێکی دیکە ناکرێت سەروەری ڕەهای حکوومەتی یەکیەتی ببەسترێتەوە بەیەکبوونی وڵاتنامە چونکە بابەتی یەکبوونی وڵاتنامە بەیەکێک لە سیماکانی یەکبوون دادەنرێت کە لە یەکگرتووی فیدراڵی دەکەوێتەوە و دەشگونجێت لەگەڵ سروشتی دەوڵەتی فیدراڵی.

و هەندێک یاسا زان[٩] وای بۆ دەچن کە هاوڵاتیانی یەکگرتوو دوو وڵاتنامەیان هەیە یەکێکیان وڵاتنامەی یەکیەتییە و ئەوی تریش وڵاتنامەی ئەو ولایەتەیە کە تیایدا دادەنیشن و بەشێوەییەکی هەڵە وا تێدەگەن کە ئەمە لە جیاکەرەوەکانی سیستەمی فیدراڵییە[١٠] ئەوانە تێکەڵیێک لە نێوان وڵاتنامە و جێی دانیشتن (توطن) دەکەن چونکە لە دەوڵەتە جیاجیاکانی خاوەن سیستەمی فیدراڵی بەولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە تەنها یەک وڵاتنامە هەیە بەڵام لە پاڵ ئەوە چەند جێی دانیشتن (توطن) هەیە بەقەدەر ژمارەی ولایەتەکان یا کانتونەکان یا هەرێمەکان یاخود کۆمارەکان و لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هاووڵاتی ولایەتی ئوهایوو یاخود فەرجینیا یا نیڤادا یا جورجیا یا بنسلفانیا یاخود کارولینای باشوور یاخود باکوور یا نیویورک هەن بەڵام لە یەک وڵاتنامە زیاتریان نییە ئەویش وڵاتنامەی ئەمەریکییە و هەمان شێوە لە سویسرا و کەنەدا و ئوستراليا پێڕەو کراوە بۆیە وا وردترە کە بڵێین لە دەوڵەتی یەکگرتوو یەک وڵاتنامە هەیە نەک دوو وڵاتنامە (جنسية مزدوجة) بەڵام چەند جێی دانیشتن (توطن) هەیە

بەقەدەر ژمارەی دەوڵەتە ئەندامەکان بۆیە یاسا زانان بایەخیان داوە بەجیاوازی لە نێوان زاراوەی ولاتنامە بەواتای پێوەندی بوونی هاولاتی کە سەر بەدەوڵەتێکە دەگەینێت و ناسنامەی دانیشتن بەواتای پێوەندی هاوولاتی بەولایەتێک بەهۆی دانیشتنی لەو ولایەتە[11] و لە هەموارکردنی چواردەمین لە دەستووری ئەمەریکی (هەموارکردنی ساڵی ١٨٦٨) کە بۆ سنوور دانان بۆ ئەو کێشەیە هات چونکە وتی هەموو ئەو کەسانەی کە لە ولایەتە یەکگرتووەکان لە دایک بوونە یا ولاتنامەیان تیایدا بەدەست کەوتووە و لەبەر دەسەلاتی ئەون بەهاوولاتی ولایەتە یەکگرتووەکان و ئەو ولایەتەی کە تیایدا دادەنیشن دادەندرێن، بەم شێوەیەش ئەو دەقە دەستوورییە دان بەدوو جۆرە هاولاتییەتی یا جێی دانیشتن دەنێت ئەوانیش هاولاتیەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و هەڵگری ئەو ولاتنامەیە بەشێوەییێکی ئوتوماتیکی بەهاوولاتی ئەو ولایەتە دادەندرێت کە ئارەزووی دانیشتنی تیایدا ڕادەگەینێت یاخود لە بنەڕەتدا تیای دانیشتبوو ئەمەو ئەبێت بزانین کە هاوولاتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەمان ئەو ماف و جیاو و کاتەی هەیە کە بۆ هەموو هاوولاتیان بڕیاری لەسەر دراوە ئەمجا لە هەر ولایەتێک دانیشتبێت بەڵکو هەمان مافی هەیە هەتا ئەگەر هات و دانیشتووی هیچ ولایەتێک نەبێت هەر وەکو دانیشتوانی هەرێمی کولومبیا کە بەولایەت دانادرێت و ناتواندرێت کۆبکرێتەوە بەشێوەییێکی ڕەها لە نێوان هاوولاتییەتی کەسێک بۆ ولایەتێک و بۆ ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە هەمان کاتدا چونکە لەوانەیە کەسێک ببێت بەهاوولاتی یەکێک لە ولایەتەکان بەلام ئەو کەسە هاوولاتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نییە لەبەر ئەوەی ولایەت دەتوانێت هەموو ماف و جیاوکەکان کە بۆ هاوولاتیانی خۆی بڕیاری لەسەر دراوە بداتە کەسێکی بێگانە بەم جۆرەش مافی دەنگدان و دامەزراندن لە پۆستە ڕەسمییەکانی دەبێت و هەروەها مافی موڵکداریی دەبێت لەو ولایەتە بەلام لەگەڵ ئەوەش بەهاوولاتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دانادرێت چونکە لە توانای ولایەت نییە کە ولاتنامەی ئەمەریکی بداتە بێگانەکان[12] بێجگە لەوەش ناسنامەی دانیشتن لە ولایەتێک هیچ پلەو پایەییێک بەهاوولاتی نابەخشێت لە بواری یاسایی نێو دەوڵەتی و لە مەسەلەییێکی نێوخۆیی زیاتر نییە.

لەسەر ئەو بنچینەیە دەوڵەتە یەکگرتووەکان بەپێی بۆچوونی زۆرینەی زانایانی[13] ئەو بوارە تەنها یەک ولاتنامە دەدەنە هاوولاتیانی خۆیان ئەویش ولاتنامەی دەوڵەتە یەکگرتووەکەیە و چەندایەتی لە ولاتنامە (الجنسیة المزدوجة) بوونی نییە بەپێچەوانەی

ناسنامەی دانیشتن (التوطن) کە چەندایەتی (ازدواج) تێدا دەبێت. و مادە ٣٣ لە دەستووری سۆڤیێتی ساڵی ١٩٧٧دەڵێت « لە یەکیەتی سۆڤییێت دان بەیەک هاوولاتیەتی یەکگرتووی نرا و هەموو هاوولاتییێکی کۆمارێکی یەکگرتوو هاوولاتی یەکیەتی سۆڤییتە». هەروەها مادە ١١٨ لە دەستووری کۆماری یوغوسلافیای سوشیالستی فیدراڵی کە لە ساڵی ١٩٦٣ دەرچووە دەڵێت «هاوولاتیانی یوغوسلافیا یەک ولاتنامەی یوغوسلافییان هەیە و هەموو هاوولاتییێکی کۆمارەکان لە هەمان کات هاوولاتییێکی یوغسلافییە»

هەروەها دەستووری فیدراڵی دەوڵەتی هند کە لە ساڵی ١٩٥٠ دەرچووە پرنسیپی یەکبوونی ولاتنامەی پێڕەوکردووە بەلام بەیەک ناسنامەی دانیشتن (توطن)ی وەرگرتووە و ئەوەش یەکێکە لەو هۆیانە کە پاڵیان بەهەندێک نا کە بلێین یەکگرتووی فیدراڵی لە هەندێ نیمچە فیدراڵییە Quasi Federation[١٤].

٣- یەک پارچەیی هەرێم:

شتێکی ئاشکرایە کە هەرێم یەکێکە لە سێ کۆڵەگەکەی دەوڵەت هەروەها یەک پارچەیی هەرێمی دەوڵەتی فیدراڵی یەکێکە لە کۆڵەگە بنەڕەتییەکانی ئەو دەوڵەتە بەبێ سەیرکردنی لایەنی دابەشکردنی ئەو هەرێمە بۆ چەند بەشێکی خاوەن قەبارەی دەستووری ناوخۆ. بۆیە دەستدرێژی بۆ سەر هەر بەشێک یا ناوچەیێک یاخود ولایەتێکی ئەو دەوڵەتە بە دەستدرێژی بۆ سەر دەوڵەتی یەکیەتی فیدراڵی دادەندرێت.

بەواتایێکی دیکە دەوڵەتی یەکیەتی فیدراڵی لە دەرەوە وەکو یەک دەوڵەتی خاوەن یەک هەرێم سەیر دەکرێت بەبێ سەیرکردنی دابەشکردنە هەرێمییەکانی ناوخۆی بۆ چەند کۆمارێکی یەکگرتوو یاخود چەند ولایەتێک یا چەند کانتونێک.

## دووەم: سیماکانی یەکیەتی لەسەر ئاستی ناوخۆ:

بوونی دەسەلاتێکی سیاسی بالا کە خۆی لە حکوومەتی یەکیەتی دەنوێنێت لە یەکێک لە کۆڵەگەکان بەڵکو بەکۆڵەکەی بنەڕەتی دامەزراندنی دەوڵەتی یەکگرتوو دادەندرێت. و حکوومەتی یەکیەتی لە دەسەلاتی یاسا دانانی یەکگرتوو (پەرلەمانی یەکگرتوو) و دەسەلاتی جێبەجێکردنی یەکگرتوو پێک دێت کە لە دوای یەکدا باسیان لێوە دەکەین بەو پێیەی کە هەر دوو قۆڵی حکوومەتن. بەلام دەسەلاتی دادوەری بەبۆچوونی ئێمە نابێت

بەیەکێک لە دەسگاکانی دەسەلاتی یەکگرتوو دابندرێت بەڵکو ڕۆڵی ڕاستەقینە و جێگای شیاوی ئەو دەسەلاتە لەوە بەرجەستەتر دەبێت کە دەسگایێکی بێ لایەن و بڕوا پێکراو بێت بۆ ئەوەی بتوانێت بڕیار لەسەر ناکۆکییە دەستووری و یاساییەکان بدات کە لە نێوان دەسەلاتەکانی یەکیەتی و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان ڕوو دەدات هەر وەکو پێشتر باسمان لێوە کردبوو.

## ١- دەسەڵاتی یاسا دانانی یەکگرتوو:

وەکو پێشتر باسمان لێوەکرد دەوڵەتی فیدراڵی بەدوانەیی دەسەلاتی یاسا دانان ناسراوە واتە لە دوو ئەنجوومەن پێک دێت کە یەکێکیان نوێنەرایەتی دەوڵەتە ئەندامەکانی دەکات و بەئەنجوومەنی باڵا (Upper house) دەناسرێت و چەندەها ناوی جیاجیای لێ نراوە وەکو پێشتر باسمان لێوە کرد، و ئەنجوومەنی دووەم ئەنجوومەنی نەویە (Lower house) و نوێنەرایەتی هاووڵاتیانی وڵات دەکات هەر وەکو پەرلەمانەکانی دەوڵەتە یەکبووەکان.

و لە کاتێکدا ئەندامانی ئەنجوومەنی خواروو (ئەنجوومەنی نوێنەران) لە لایەن دانیشتوانی دەوڵەتە ئەندامەکان و بەپێی قەبارەی دانیشتوانیان هەڵدەبژێردرێن کە دەبێتە هۆی جیاوازبوونی ژمارەی نوێنەرانی دەوڵەتێکی ئەندام لەگەڵ دەوڵەتێکی ئەندامی دیکە بەڵام ئەم دەوڵەتە ئەندامانە لە زۆربەی زۆری یەکیەتییە فیدراڵییەکان بەشێوەیێکی یەکسان لە ئەنجوومەنی باڵا نوێنەرایەتی دەکرێن هەر وەکو پێشتر بەدیارمان خست[١٥].

و ئەو ڕێکخستنە دوانەییە لە دەسەلاتی یاسادانان بۆ ئەوە هاتووە کە دەرفەتێکی گونجاو بۆ دەوڵەتە ئەندامە گچکەکان لە ڕووی قەبارە یان دەوڵەمەندی یاخود دانیشتوان بڕەخسێنێت بۆ ئەوەی بەرژەوەندی و ئامانجەکانی خۆیان بەشێوەیێکی کاریگەرتر بخەنە ڕوو و بۆ ئەوەی نەبنە قوربانی دەسەلاتداریەتی و دەست بەسەراگرتنی دەوڵەتە ئەندامە گەورەکان بەتایبەتی لەو حاڵەتانەی کە جیاوازی دەکەوێتە نێوان بەرژەوەندییە هەرێمییەکان لە مەسەلەکانی سەروەری دەرەوە و بەرژەوەندییە ئابوورییەکان و هاوشێوەکانیان. و هەندێک دەڵێن بوونی ئەنجوومەنی باڵا کە نوێنەرایەتی دەوڵەتە ئەندامەکان دەکات لەسەر بنچینەی یەکسانی لە یەکیەتی فیدراڵی بەرێچکەیێک یاخود ئامرازێک دادەندرێت بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە هەرێمییەکان و پیادەکردنی شتێکی باشە بەڵام ئەوەش ناگەیێنیت کە حکوومەتی فیدراڵی بەبێ ئەو پرنسیپە لە کارەکانی خراپ بێت[١٦].

پەرلەمانی یەکگرتوو ممارسەی دەسەلاتی یاسا دانان لە بواری کاروباری یەکگرتوو دەکات و هەڵدەستێت بەدانانی یاسا لە هەموو ئەو لایەنانەی کە دەکەوێتە بواری دەوڵەتی یەکگرتوو وەکو ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بەپەسەندکردنی پەیماننامەکان و کاروباری بەرگری و جەنگ و پرچەک بوون و ئاشتی و پیشەسازی نیشتمانی و کاروباری گومرگ و کێشەکانی دراو و ڕەگەزنامە و کاروباری گەیاندن بەهەموو جۆرەکانی، بەڵام سەبارەت بەدەسەلاتی هەر یەکێک لە دوو ئەنجوومەنەکە لە ممارەسەی دەسەلاتی یاسا دانان وادیار دەکەوێت کە زۆربەی زۆری دەستووری دەوڵەتە فیدراڵییەکان لە یەک پلەی یەکسانیان دادەنێن لە بواری تایبەتمەندی (اختصاصی) یاسا دانان واتە پێویستە هەردووکیان ڕەزامەندی نیشان بدەن لەسەر هەر یاسایێکی یەکگرتوو و ئەگەر ئەو یاسایە ڕەزامەندی یەکێکیانی بەخۆوە نەگرت ئەوە بەنەبوو حسابە و ناشبێت وەکو یاسا دەربچێت(١٧). و سویسرا و کەنەدا و یەکیەتی سۆڤێتی پێشوو وە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و مەکسیک و فەنزەویلا و ئەرجەنتین و بەرازیل و یوغوسلافیای پێشوو لەو دەوڵەتانەن کە بەو پرنسیپەیان وەرگرتووە(١٨). بەڵام هەندێک لە دەوڵەتەکان جیاوازییان لە نێوان هەردوو ئەنجوومەنەکە کردووە بەوەی کە گرنگییێکی زیاتریان داوەتە ئەنجوومەنی خواروو (ئەنجوومەنی گەل) هەر وەکو لە دەستووری ئەڵمانی ساڵی ١٩١٩ کە بەدەستووری ڤایمار Weimar ناسراوە هاتووە کە ئەگەر ئەنجوومەنی خواروو بەزۆرینەیێکی تایبەت یاسایێکی پەسەند کرد ئەو کاتە ئەبێت ئەنجوومەنی باڵا مل بۆ ئەو زۆرینەیە و ئەو یاسایە کەچ کات. و دەستووری ئەڵمانی تازەی ساڵی ١٩٤٩ لەسەر هەمان ڕێڕەو ڕۆیشت کە دەڵێت «ئەگەر هات و ئەنجوومەنی ویلایەتەکان بەزۆرینەی دەنگ ڕەخنەیان لەسەر یاسایێک گرت ئەوا ئەنجوومەنی نوێنەران دەتوانیت بەبڕیارێک کە بەزۆرینەی دەنگی ئەندامەکانی ئەو ڕەخنەیە ڕەت کاتەوە. بەڵام ئەگەر هات ئەنجوومەنی ویلایەتەکان بڕیاری دا بەزۆرینەی دوو لەسەر سێی ئەندامەکانی بەلای کەمەوە ڕەخنە بگرێت ئەوە ئەبێت بڕیاری ئەنجوومەنی نوێنەران سەبارەت بەڕەتکردنەوەی ڕەخنەکە بەزۆرینەی دوو لەسەر سێی یاخود زۆرینەی ئەندامەکانی بەلای کەمەوە دەربچێت.»(١٩). هەروەها دەستووری ئوستراليا کە بەپێویستی دائەنێت هەردوو ئەنجوومەن ڕەزامەندی پیشان بدەن لەسەر هەر یاسایێکی یەکگرتوو بەڵام لە کۆتاییدا هەر گرنگییێکی گەورەتر بەئەنجوومەنی خوار و ئەدات و لەو کاتەی کە ئەنجوومەنی ویلایەتەکان پرۆژەی یاسایێکی ئامادەکراو لە لایەن ئەنجوومەنی خواروو ڕەت دەکرێتەوە و هەردووکیان مکوڕ ئەبن لەسەر هەڵوێستی پێشینەی خۆیان بۆ

جاری دووەم لە ماوەی سێ مانگدا ئەوا حاکمی گشتی (سەرۆکی وڵات) بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی هەردوو ئەنجوومەنەکە دەردەکات و ئەگەر هات و ناکۆکی دیسان سەری هەڵداوە لە دوای هەڵبژاردنی دوو ئەنجوومەنی تازە ئەو کاتی پێویستە لەسەریان کە پێکەوە کۆببنەوە بەشێوەی کۆنگرە لەسەر فەرمانی حاکمی گشتی و ئەو کۆنگرەیە بڕیاری پێویست بەزۆرینەی ڕەهای ئەندامانی ئەدات لەسەر ئەو کێشەیەی کە بابەتی ناکۆکییەکەیە، شتێکی شاراوە نییە کە ئەم چارەسەرییە ئەبێتە هۆی لاوازکردنی ڕۆڵی ئەنجوومەنی باڵا لەبەرئەوەی ژمارەی ئەندامانی زۆر کەمترن لە ئەندامانی ئەنجوومەنی خواروو[٢٠]. بەڵام سەبارەت بەیەکسانی لە نێوان هەردوو ئەنجوومەن لەو لایەنانەی کە ناکەونە ناو تایبەتمەندی یاسا دانان ئەوا دەبینین کە دەستووری سویسری یەکسانی لە نێوانیاندا نەکردووە لە بواری دەرکردنی هەندێک بڕیاری گرنگ چونکە لە دەقەکەی هاتووە کە هەردوو ئەنجوومەن بەشێوەی کۆنگرە (کۆمەڵەی فیدراڵی کۆببنەوە بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی جێبەجێکردن (دەسەڵاتی جێبەجێکردنی یەکگرتوو) و دادگای فیدراڵی و چەندەها پلەو پایەی گرنگی دیکە، و هەروەها دەست نیشانکردنی لایەنی تایبەت بەحاڵەتی ناکۆکی تایبەتمەندی لە نێوان دەسگاکانی یەکیەتی و شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە ئەمە نیشانەی نایەکسانییە لە نێوان دوو ئەنجومەنەکە لەبەرئەوەی ئەنجوومەنی باڵا دەکەوێتە ژێر زۆر دەستی ئەنجوومەنی خواروو بەهۆی زیاتر بوونی ژمارەی ئەندامەکانی و بەپێچەوانەی ئەوەی پێشوو دەبینین کە هەندێک لە دەوڵەتە فیدراڵییەکان گرنگییێکی زیاتریان داوەتە ئەنجوومەنی باڵا و لەم بارەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەندێک دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی گرنگ دراوەتە ئەنجوومەنی پیران سەرباری دەسەڵاتە یەکسانەکانی لەگەڵ ئەنجوومەنی نوێنەران لە بواری یاسا دانان.

### ٢- دەسەڵاتی جێبەجێکردنی یەکگرتوو:

دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە سەرۆکی دەوڵەت و ئەو دەستەی جێبەجێکردنە پێک دێت کە پێی دەڵێن ئەنجوومەنی وەزیران هەر وەکو لە یەکیەتی سۆڤییەتی پێشوو و هند و کەنەدا و ئوستراليا پێڕەو کراوە یا لە ئەنجوومەنێکی جێبەجێکردن وەک سویسرا یاخود لە کۆمەڵێک لە سکرتێر کە یارمەتی سەرۆک دەدەن وەک ئەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە بەسیستەمی سەرۆکایەتی وەردەگرێت پێڕەوکراوە، و ئەوەی تێبینیش دەکرێت زۆربەی زۆری دەوڵەتە فیدراڵییەکان سیستەمی کۆماری پێڕەو دەکەن[٢١]:

و سیستەمی پێڕەو کراو لە لایەن ئەو دەوڵەتە فیدراڵیانە لە سێ شێوە دەرناچێت کە ئەوانیش سیستەمی پەرلەمانی و سیستەمی سەرۆکایەتی و سیستەمی حکوومەتی کۆمەڵەن.

و هەڵبژاردنی سەرۆک کۆمار لەو دەوڵەتانەی کە سیستەمی فیدراڵی پێڕەو دەکەن یا بەشێوەیێکی ڕاستەوخۆ ئەنجام دەدرێت وەکو لە مەکسیک و بەڕازیل و هەروەها ئەڵمانیا لە ژێر سێبەری دەستووری ڤایاری (Weimar) ساڵی ١٩١٩، یاخود بەشێوەیێکی ناڕاستەوخۆ و بەدوو قۆناغ کە لە قۆناغی یەکەم نوێنەرەکان (مندوبین) هەڵدەبژێردرێن و لە قۆناغی دووەم سەرۆک هەڵدەبژێردرێت لە لایەن ئەو نوێنەرانە هەر وەکو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئەرجەنتین پێڕەو دەکرێت کە بەسیستەمی کۆلیجی هەڵبژاردن (Electoral College System) ناسراوە[٢٢]. و هەندێک دەڵێن هەڵبژاردنی سەرۆک کۆمار ڕاستەوخۆ لە لایەن میللەتەوە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی پێگەو دەسەلاتی سەرۆک[٢٣] و سیستەمی پیادە کراو لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەگرنگترین پراکتیکی سیستەمی سەرۆکایەتی دادەندرێت کە دەسەلاتی جێبەجێکردن تیایدا لە سەرۆکی کۆمار پێک دێت کە سەرۆکی بەرزی وڵاتە و لەبەر سروشتی ئەو سیستەمە سەرۆک نفوزێکی بەهێزی هەیە و جێگرەکەی کەوا لەگەڵی لەسەر هەمان کارتی هەڵبژاردن هەڵدەبژێردرێت یارمەتی دەدات لە کارەکانی هەروەها چەند سکرتێرێک (وەزیر) یارمەتی دەدەن هەر ئەویش واتە سەرۆک وەزیرەکان و گەورە لێپرسراوانی دەوڵەت و دادوەرانی دادگای باڵا دادەمەزرێنێت بەڵام لە دوای ڕاوێژکردن و ڕەزامەندی وەرگرتنی ئەنجوومەنی پیران[٢٤].

و سویسرا سیستەمی حکوومەتی کۆمەڵە پێڕەو دەکات کە دەسەلاتی جێبەجێکردن بریتییە لە حەفت ئەندام کەوا ئەنجوومەنی جێبەجێکردن (المجلس التنفیذی) پێک دێن و لە لایەن کۆمەڵەی فیدراڵی بۆ ماوەی (٤) چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێن، و ئەو ئەنجوومەنە یەکێک لە ئەندامانی هەڵدەبژێردرێت بۆ پۆستی سەرۆکایەتی بۆ ماوەی ساڵێک بەشێوەیێکی دەوری، بەڵام دەسەلاتی سەرۆک یەکسانە لەگەڵ دەسەلاتی ئەندامەکان و بڕیارەکان بەزۆرینەی دەنگ وەردەگیرێن.

بەڵام سەبارەت بەسیستەمی پەرلەمانی ئەوە یەکێک لە ئەزموونەکانی لە ئەڵمانیا وە لە ژێر سێبەری دەستووری ساڵی ١٩٤٩ دەبینین کە سەرۆکی دەوڵەت دەسەلاتی

جێبەجێکردن دەگرێتە ئەستۆ و سەرۆک و ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران یارمەتی دەدەن، و سەرۆک لە رێگای ئەنجوومەنی یەکگرتوو کەوا لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی یەکگرتوو Re-ichstag و ژمارەییێکی بەقەدەر ئەوان کەوا ئەنجوومەنی یاسا دانانی ویلایەتەکان هەڵیان دەبژێرن پێک دێت[٢٥]. و پەرلەمانی فیدراڵی بەهەردوو ئەنجوومەنەکەی هەڵدەستێت بەهەڵبژاردنی سەرۆکی حکوومەتی فیدراڵی کە بەڕاوێژکاری یەکگرتوو ناوزەد دەکرێ[٢٦]، لە کاتێکدا سەرۆکی دەوڵەت هەڵدەستێت بەدامەزراندنی وەزیرەکان لەسەر پێشنیاری سەرۆک حکوومەت[٢٧].

و دەسەڵاتی جێبەجێکردن تایبەتمەندە بەجێبەجێکردنی یاسا و بڕیارەکانی یەکیەتی لە هەموو هەرێمەکانی دەوڵەت بەڵام لە سنووری دەستووری فیدراڵی واتە هەڵدەستێت بەئەرکی فەرمانبەرایەتی کارگێڕی لە گشت یەکیەتییەکە و ئەمەش جەختکردنە لەسەر سیمای یەکگرتن لە دەوڵەتی فیدراڵی بەڵام ئەو دەسەڵاتە چەند ڕێچکەییێکی جیاجیا دەگرێتە بەر بۆ ئەنجامدانی فەرمانبەریەتی کارگێڕیەکەی و لە سێ ڕێچکە دەرناچێت کە ئەمانەن:

أ- ڕێچکەی جێبەجێکردنی ڕاستەوخۆ: دەسەڵاتی جێبەجێکردنی یەکگرتوو بەپێی ئەو ڕێچکەیە هەڵدەستێت بەدامەزراندنی چەند فەرمانگەییێکی کارگێڕی تایبەت بەخۆی لە دەوڵەتە ئەندامەکان (هەرێمەکان) و ئەو فەرمانگانە سەر بەئەو دەبن و ملکەچی ڕێنماییەکانی ئەو دەبن هەر بۆیە سەربەخۆ دەبن بەرامبەر حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان و ئەو ڕێچکەیە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پیادە کراوە[٢٨]. و ئەو ڕێچکە بەوە دەناسرێت کە دەبێتە هۆی جێبەجێکردنی یاساکان بەشێوەییێکی ڕێکوپێک هەروەها دەبێتە هۆی خێرایی و باشی جێبەجێکردن لەبەرئەوەی ئەوانەی کە ئەم کارە دەکەن بەشێوەییێکی ڕاستەوخۆ سەر بەحکوومەتی یەکگرتوون[٢٩]. بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەو ڕێچکەیە ڕزگار نەبوو لە ڕەخنە و لەم بارەش دەڵێین کە ئەرکێکی زۆر و بڕە پارەییێکی زیاتر دەخاتە سەر بووجەی دەوڵەت، هەروەها دەبێتە هۆی ئاڵۆزبوونی دەزگای کارگێڕی و دروست بوونی ناکۆکی لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان و لە دواییشدا دەبێتە هۆی ڕاگرتنی جێبەجێکردنی یاساکان[٣٠].

ب- ڕێچکەی جێبەجێکردنی ناڕاستەوخۆ: بەپێی ئەو ڕێچکەیە جێبەجێکردنی یاسا و بڕیار و ڕێنماییەکانی یەکیەتی دەخرێتە ئەستۆی دەوڵەتە ئەندامەکان و ڕۆڵی حکوومەتی

یەکگرتوو لە بواری چاودێری دەوڵەتە ئەندامەکان سنووردار دەبێت بۆ ئەوەی بزانێت هەتا چەند یاساکان جێبەجێ دەکرێن[٣١] و ئەڵمانیای یەکگرتوو لە ژێر سێبەری ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی لە ساڵی ١٨٧١ و هەروەها بەپێی دەستووری فایمار Weimar ئەو ڕێچکەیەی پیادەکردبوو[٣٢]. و هەروەها یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساڵی ١٩٤٩ هەمان ڕێڕەوی وەرگرتووە[٣٣]. و هەندێک[٣٤] ڕەخنەیان لەو ڕێچکەیە گرت بەوەی کە دەبێتە هۆی فراوان بوونی دەسەڵاتی سەرپەرشتی و چاودێری ناوەندی لەسەر حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان و کەمکردنەوەی سەربەخۆییان، و لە دواییدا دروستکردنی حاڵەتێکی پەشۆکی و دواکەوتن لە جێبەجێکردن هەروەها دەبێتە هۆی زیادبوونی دەسگاکانی دەوڵەتە ئەندامەکان و ئەرکەکانی و لە دواییدا زیادبوونی خەرجییەکانی، بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو ڕەخنانە لایەنی زۆری فقە[٣٥] پشتگیری و داکۆکی لەو ڕێچکەیە دەکەن بەوەی کە دەبێتە هۆی دروست بوونی هەماهەنگی و لێک تێگەیشتن لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتەکانی ویلایەتەکان و هەروەها خەرجییەکان کەم دەکاتەوە بەڵام ئەوەش ڕێگای لە خاوەنانی ئەو بۆچوونە نەگرت کە دان بنێن بەوەی ئەو ڕێچکەیە دەبێتە هۆی سست بوونی دەوڵەتە ئەندامەکان لە بواری جێبەجێکردن.

ج- ڕێچکەی کارگێڕی تێکەڵاو: مەسەلەی جێبەجێکردنی یاساکان بەپێی ئەو ڕێچکەیە دەکەوێتە ئەستۆی دەوڵەتە ئەندامەکان بەڵام بەهاوبەشی لەگەڵ فەرمانبەرەکانی حکوومەتی یەکگرتوو و ئەو فەرمانبەرانەی کە سەر بەحکوومەتی فیدراڵین هەڵدەستن بەجێبەجێکردنی یاسایە خێراکان لە کاتێکدا کە مەسەلەی جێبەجێکردنی یاساکانی دیکە بۆ دەسەڵاتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان بەجێ دەهێڵدرێت، و سویسرا ئەو ڕێچکەیەی وەرگرت هەروەها نەمسا لەو کاتەی کە سیستەمی فیدراڵی بەپێی دەستووری ساڵی ١٩٢٠[٣٦] پێڕەو دەکرد ئەو ڕێچکەیەی وەرگرتبوو.

و هەندێک داکۆکی لەو ڕێچکەیە دەکەن بەو پێیەی کە لایەنە باشەکانی هەر دوو ڕێچکەکەی پێشوو دەگرێتە خۆو و لە هەمان کاتیشدا کەم و کوڕییەکانی هەردووکیان بەلاوە دەنێت و بێجگە لەوەش ئەو ڕێچکەیە بەرهەمی هێناو بووە هۆی ئەنجامدانی چەند سەرکەوتنێکی دیار لە بواری خزمەتگوزارییەکانی پۆلیس لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا[٣٧].

### پەراوێزەکانی ئاخافتنی سێیەم

(١) دکتور شافعی محمد بشیر- القانون الدولي العام في السلم والحرب- سەرچاوەی پێشوو ل ١٢١.

(٢) اندریە هوریو- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٢.

(٣) دکتور زهیر شکر لە سەرچاوەی پێشوو ل ٦١ ئاماژەی بۆ کردووە.

(٤) دکتۆر حەسەن چەلەبی- القانون الدولي العام- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٣٥.

(٥) بەڵام لە هەندێک جاردا بوار دەدرێتە دەوڵەتە ئەندامەکان کە نوێنەرایەتی تەواویان هەبێت لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی وەکو هەردوو کۆماری ئوکراونیا و رووسیای سپی لە یەکیەتی سۆڤییێت و هەروەها بواردان بەکانتونەکانی سویسرا و هەرێمەکانی کەنەدا بۆ بەستنی هەندێک رێکەوتننامەی بازرگانی لەگەڵ دەوڵەتە بێگانەکان.

(٦) اندریە هوریو- سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٢.

(٧) لەو بیرورِایە سەیری دکتۆر شافعی محمد بشیر- القانون الدستوري والنظم السیاسیة السودانیة- سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٠- ١٢١بکە.

(٨) بۆ زانینی بیرورِامان سەبارەت بەسەروەری لە دەوڵەتی یەکگرتوو سەیری دکتۆرا نامەکەم بکە.

(٩) Scelle دکتۆر شافعی محمد بشیر- سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٢ ئاماژەی بۆ کردووە.

(١٠) یەکێک لە شیکەرەوە هندیەکانی یاسا لە هەمان رێرەوی هەڵە دەڵێت «بەپێی دەستووری هندی دەبێت رەگەزنامە گشتی و شامل و یەکبوو لە هەموو پارچەکانی وڵات بەکاربێت و بیرۆکەی دوو رەگەزنامەکە یەکێکە لە خەسڵەتەکانی دەوڵەتی فیدراڵی بەدوور دەخاتەوە. و لە لایەنی یەکەم دەبینین سیستەمی فیدراڵی لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دان بەدوو پلە لە هاووڵاتیەتی دەنێت یەکێکیان بۆ ولایەت و دووەمیان رەگەزنامەی ئەمریکییە- بەڵام دەستووری هندی یەک دەوڵەت و یەک رەگەزنامە پێرەو دەکات».

فەتحی رەزوان- سەرچاوەی پێشوو ل ٥٣ ئاماژەی بۆ کرد.

(١١) دکتۆر شافعی محمد بشیر- سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٢.

(١٢) سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٢.

(١٣) دکتۆر ئیسماعیل غەزال- سەرچاوەی پێشوو ل ١١.

دکتور ثروت بدوي- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٠.

أبراهيم عبدالعزیز شیحا- الوحیز النظم السیاسیة والقانون الدستوري- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٦.

دکتور حامد سلطان- القانون الدولی العام فی وقت السلم- کتێبخانەی النهضة العربیة لە قاهیرە- ١٩٦٥ چاپی دووەم ل ١٣٣.

دکتور الشافعی محمد بشیر- سەرچاوەی پێشوو ل ١٢١.

دکتور طعیمة الجرف- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٣.

دکتور خالد قباني- سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٣.

انور الخطيب- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٥- ٧٦.

(14) Clarles Henry Alexandrowciz, op. Cit Page 159- 169.

(١٥) دەربارەی ئەم بابەتە بڕوانە لەم دکتۆرا نامەیە

(16) K. C. whe are, Op. Ci Page 90.

(١٧) دکتۆر محەمەد کامل لیله- النظم السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٨.

(١٨) دکتۆر سەعد عەسفور- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٥.

(١٩) ماددەی (٧٧) برگە (٤) لە یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوو بۆ ساڵی ١٩٤٩.

(٢٠) دکتۆر سەعد عسفور- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٥.

(٢١) ئیمپراتۆریەتی ئەلمانی کە لە ساڵی ١٨٧١ دامەزرا وە سیستەمی فیدراڵی پێڕەوکرد بەنموونەی کلاسیکی دەوڵەتی فیدراڵی خاوەن سیستەمی پاشایەتی دادەندرێت - بۆ ئەوە بڕوانە د. سەعد عەسفور- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٦١.

(٢٢) بۆ ئەم مەبەستە سەیری دکتۆر محەمەد کامل لیلة النظم السیاسیة سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٩- ١٤٠ بکە.

(٢٣) دکتۆر عەبدولحەمید متولی- القانون الدستوري والانظمة السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو ٢٦٧.

(24) Arficle 2 Section 2 from the American Federal Constitution.

(٢٦) ماددەی (٦٣) لە یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوو بۆ ساڵی ١٩٤٩.

(٢٧) ماددەی (٦٤) لە یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووی ساتی ١٩٤٩.

(٢٨) دکتۆر مستەفا کامل- شرح القانون الدستوری والقانون الاساسي العراقي- چاپخانەی سەلام، بەغدا چاپی پێنجەم ١٩٤٧- ١٩٤٨ ل ٣٤.

د. زهدی یکن- القانون الدستوري والنظم السیاسیة- چاپخانەکانی جوزف سلیم صقیلی بیروت ١٩٥٥- ١٩٥٦ ل ٩٦.

(٢٩) د. سەعد عەسفور- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٦٣.

د. محەمەد کامل لیله- النظم السیاسیة سەرچاوەی پێشوو ل ١٤١.

(٣٠) د. سەعد عەسفور- سەرچاوەی پێشوو ل ١٤١.

(٣١) د. مستەفا کامل- سەرچاوەی پێشوو ل ٣٨.

(٣٢) د. طعیمة الجرف- نظریة الدولة والاسس العامة للتنظیم السیاسي. سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٥.

د. محەمەد کامل لیله- النظم السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو ل ١٤١- ١٤٢.

(٣٣) ماددەکانی ٨٣، ٨٤ لە یاسا بنەڕەتی المانیای یەکگرتووی ساڵی ١٩٤٩.

(٣٤) دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحکم الذاتی والنظم اللامرکزیة الاداریة والسیاسیة سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٣.

(٣٥) دكتور طعيمة الجرف- نظرية الدولة والاسس العامة للتنظيم السياسى- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٥.

دکتۆر سەعد عەسفور- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٦٣.

دکتۆر محەمەد کامل لیله- النظم السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو ل ١٤١- ١٤٢.

(٣٦) د. سەعد عەسفور- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٦٣.

د. طعيمة الجرف- نظرية الدولة والاسس العامة للتنظيم السياسي- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٥- ٢٢٦.

د. محەمەد کامل لیله- النظم السیاسیه- سەرچاوەی پێشوو ل ١٤٢.

زهدی یکن- سەرچاوەی پێشوو ل ٩٦.

(٣٧) د، محمود محمد حافظ- موجز القانون الدستوری- المبادئ العامة والدستورالمصري- خانەی هزری عەرەبی- چاپخانەی لیژنەی بەیانی عەرەبی- القاهره ١٩٥٦ ل ٤١.

د. محەمەد کامل لیله- النظم السیاسیة سەرچاوەی پێشوو ل ١٤٢.

زهدی یکن- سەرچاوەی پێشوول ٩٧.

## بەشی سێیەم

# فیدراڵیزم و سیستەمە هاوشێوەکانی

دەوڵەتی فیدراڵی بەسیمایەکی فرە ئاڵۆزەوە لە دەوڵەتی یەکبووی سادە جودا دەکرێتەوە، چونکە دەوڵەتی فیدراڵی لەسەر بنەمای لامەرکەزی سیاسی پێک دێت ئەمە وا دەکات چەند قەوارەیەکی دەستووری لەنێو ئەو دەوڵەتەدا هەبن، کە هەریەکیان مافی ئەوەیان هەیە بنەمای یاسایی تایبەت بەخۆیان لە چوارچێوەیەکی جوگرافی دیاریکراودا هەبێ و بەسەر کۆمەڵە مرۆیەکی جودا و تا ڕادەیەک سەربەخۆ لەوانی دی پیادە بکەن[١]، بەمەش لەنێو دەوڵەتێکدا پتر لە دەسەڵاتێکی سیاسی تێدا پەیدا دەبێ و هەموویان بەشدار دەبن بۆ پێکەوەنانی دەوڵەتی یەکگرتوو، هەر ئەمەش هانی (لابەند Laband) و (ئەندرێ هۆریۆ Andre Haurio)ی دا بەدەوڵەتی دەوڵەتانی ناوبنێن[٢] ناکرێ ئەو ئاڵۆزییە لە دوو تویی دەوڵەتی سادەدا مەزەندە بکرێ، کە سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی دەگرێتەخۆ، با لەمەش دوورتر بڕوا کاتێک ئۆتۆنۆمی دەداتە هەندێ ناوچەی دیاریکراو کە لە ژێر سەرپەرشتی و چاودێری دەسەڵاتی ناوەندی هەندێ تایبەتمەندێتی یاسا دانانی سنوورداری هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕێگە نادات پتر لە قەوارەیەکی سیاسی لە چوارچێوەکەیدا کە قەوارەی دەوڵەتی ناوەندییە سەرهەڵبدا.

کەواتە دەوڵەتی فیدراڵی شێوەیەکی دیکەی دەوڵەتە، کە ئەویش دەوڵەتی ئاوێتەیی یان پێکهاتەیە، بەڵام دەوڵەتە ئەندامەکان لە یەکێتی فیدراڵیدا کەسایەتی دەوڵەتییان نییە و ئەو کەسایەتییە تەنیا بۆ دەوڵەتی یەکگرتوو دەبێت، ئەمە لە یەکێتی کۆنفیدراڵیش جودایە کە بریتییە لە پێکەوە بوونی چەند دەوڵەتی خودان سەروەری تەواوی نێو دەوڵەتی لە ڕوانگەی ئەمەوەش لێکۆڵینەوە لە لایەنە جۆراو جۆرەکانەوە خۆی بەسەرماندا دەسەپێنی و هەوڵدەدەین بیانخەینە ڕوو و لە میانی جوداکردنەوەی یەکێتی فیدراڵی لە سیستەمە

هاوشێوەکانی وەک کۆنفدراڵی و ئۆتۆنۆمیی و لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی و سیستەمی ولایەتەکان لە ئیسلام و فیدراڵی کەسایەتی، پەیوەندی نێوانیان باس بکەین.

بەپێی ئەو قسانەی سەرەوە لە سەرەتادا لە دەرگەی ئاخافتنی (المبحث)ی یەکەم دەدەین کە تایبەتە بەجیاوازی نێوان فیدراڵی و کۆنفیدراڵی، پاشان دەپەڕینەوە بۆ ئاخافتنی دووەم و تێیدا لە مەڕ جیاوازی نێوان فیدراڵی و ئۆتۆنۆمیی ناخۆ دەدوێین، بەڵام لە ئاخافتنی سێیەمدا دەچینە نێو فیدراڵیزم و سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی، بەو پێیەش هەندێ بیروڕا هەن سەبارەت بەپێکچوونی سیستەمی ویلایات لە ئیسلامدا لەگەڵ سیستەمی فیدراڵی... لە ئاخافتنی چوارەمدا باسی فیدراڵیزم و سیستەمی ویلایات لە ئیسلامدا دەکەین تا ئاخافتنی پێنجەم و کۆتایی کە تایبەتە بە لێدوان لە مەڕ بابەتی فیدراڵیزمی ناوچەیەیی و فیدراڵیزمی کەسایەتی.

**پەراوێزەکان:**

١- د. خالد القباني، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٤

٢- سەبارەت بەڕای لابەند بڕوانە د. میشال الریاشي- سەرچاوەی پێشوو ل١١٩، بڕوانە د. ئەندریی هۆریۆ- سەرچاوەی پێشوو ل١٥٤.

# فیدرالّی و کۆنفیدرالّی

یەکێتی کۆنفیدرالّی[١] Cofederation بەپێی پەیماننامەیەک لە نێوان ژمارەیەک دەوڵەتی خودان سەروەری تەواو پێک دێت، کە لە نێوان خۆیاندا دەستەیەکی هەمیشەیی دادەنێن و پێی دەگوترێ کۆمەڵە، یان کۆنگرە، یان کۆنگریس و هەندێ دەسەڵاتی هاوبەشی دەخرێتە ئەستۆ جا بەتەنیا بێ، یان بەهاوبەشی لەگەڵ باقی دەوڵەتە ئەندامەکاندا ئەمە لە کاتێکدایە ئەو دەوڵەتانە سەروەری و بەشێکی گەورەی تایبەتمەندییەکانی خۆیان دەپارێزن... وەک مافی سەربەخۆیی سیاسی، مافی ڕاستەوخۆی پەیمانبەستن و مامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتانی بیانی، جگە لە هەندێ مەسەلەی دیاریکراوی دی کە دیکۆمێنتی یەکێتییەکە بەخۆیەوەی دەگرێ[٢]، هەروەها دەسەڵاتێکی سنووردار بەپێی ئەوەی لە پەیماننامەی یەکگرتنەکەدا لەسەری ڕێککەوتوون دەدرێتە دەسەڵاتی یەکگرتوو، ئەو تایبەتمەندیانەش بەڕەزامەندی تەواوی دەوڵەتە ئەندامەکانی ئەو یەکێتییە نەبێ، هەموار ناکرێن.

لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا هەندێ دەوڵەت پەنا دەبەنە بەر ئەم جۆرە سیستەمە نێودەوڵەتییە، کە زادەی ئەو قۆناغە دیارەن لە قۆناغەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و سیاسی نێو دەوڵەتیدا، کەچی لە قۆناغی پەرینەوەدا کۆتایی پێهاتووە، جا چ بووبێتە هۆی لێک جودابوونەوەی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان... وەک ئەوەی بەسەر یەکێتی جەرمانی داهات کە لە ساڵی ١٨١٥دا دامەزرا و پاشان لە ساڵی ١٨٦٦دا لێک هەڵوەشایەوە[٣] هەروەها وەک ئەوەی لە ساڵی ١٨٩٨دا بەسەر یەکێتی کۆمارەکانی ئەمریکای ناڤیندا هات و هندۆراس و نیکاراگوا و سلڤادۆری لێکەوتەوە... دەشکرێ ئەمە شێوەیەکی بەهێزتر و پتەوتری لێ بکەوێتەوە.. وەک ئەو یەکێتییە فیدرالّییەی (یەکێتی ئەلمانیای باکوور) کە لە نێوان ساڵانی ١٨٦٧- ١٨٧١ بەردەوام بوو، یان یەکێتی پەیمانسازی ئەمریکایی لە نێوان ساڵانی ١٧٧٨- ١٧٨٧[٤] بەڵام یەکێتی کۆنفیدرالّی لە زۆرلایەنەوە لە یەکێتی فیدرالّی جودایە لەوانەش:

١- لەبەر ئەوەی یەکێتی کۆنفیدرالّی بەپێی پەیماننامەیەک پێکدێت، بەسیستەمێکی نێودەوڵەتی دادەنرێ و دەکەوێتە نێو چوارچێوەی یاسای گشتی نێو دەوڵەتییەوە، بەڵام

یەکێتی فیدراڵی بەپێی دەستوور پێکدێت، ئەمەش وا دەکات بەسیستەمێکی نێوخۆیی دابنرێ و دەکەوێتە نێو چوارچێوەی یاسای گشتی نێوخۆوە[٥].

٢- دەستەی باڵا لە یەکێتی کۆنفیدراڵیدا کە پێی دەگوترێ کۆمەڵە، یان کۆنگرە، یان کۆنگریس، پتر بەکۆنگرە دیبلۆماتییەکان دەچێ، کە لەو ئەندامانە پێکدێت کە نوێنەری دەوڵەتی خۆیانن و لە جیاتی ئەوان دەدوێن، بڕیار بەناوی ئەوەوە وەردەگرن و لەبەر ڕۆشنایی ڕاسپاردەکانی دەوڵەتی خۆیان کاردەکەن.

بۆیە ناکرێ بەدەوڵەتێکی سەرووی دەوڵەتە ئەندامەکان دابنرێ، ئیرادەی یەکێتی کۆنفیدراڵی لە هیچ بارێکدا لە ئیرادەی دەستەکانی یەکێتییەکە پێکنایەت، بەڵکو لە تەواوی ئیرادەی دەوڵەتە ئەندامەکان پێکدێت، ئەمەش بەپێچەوانەی یەکێتی فیدراڵیزمە، کە دەبێتە هۆی ئەوەی لە سەرووی دەوڵەتە ئەندامەکان دەوڵەتی ناوەندی پێکبێت کە دەوڵەتی یەکێتییەکەیەو حکوومەتی فیدراڵیش- نەک حکوومەتی هەریەک لە دەوڵەتە ئەندامەکان- دەربڕی ئیرادەی یەکێتییەکەیە.

٣- دەوڵەتە بەشدارەکانی یەکێتی کۆنفیدراڵی سەروەری دەرەوە و نێوخۆیی خۆیان دەپارێزن، چونکە یەکێتییەکە ئەم سەروەرییەی لێ ناسێنێتەوە، بەپێچەوانەی یەکێتی فیدراڵی کە دەوڵەتانی ئەندام واز لە سەروەری دێنن لەسەر ئاستی دەرەوە بۆ دەوڵەتی نوێ کە دەوڵەتی یەکێتی فیدراڵە، لەو بوارەدا یەکێتی کۆنفیدراڵی تەنیا دەستەیەکی هاوبەش لە دەوڵەتانی هاوپەیمان پێکدەهێنێ و هەندێ تایبەتمەندی دیاریکراوی دەداتێ، ئەو دەستەیەش لەگەڵ ئەوەی لە هەموو کارێک لە کارەکانیدا بێ گەڕانەوە بۆ ڕەزامەندی بەکۆمەڵگیری ئەو دەوڵەتانەی هاوپەیمانن تایبەتمەندێتی خۆی پیادە دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتێک نییە لە سەرووی دەوڵەتە ئەندامەکانەوە، بەمەش خودان سەروەری نابێ[٦].

٤ - یاسا زانانی قوتابخانەی کلاسیکی هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە چەمکی کەسایەتی مەعنەوی (یاسایی) کۆڵەگەی سەرەکی دەوڵەتی فیدراڵییە وەک هەر دەوڵەتێکی یەکگرتوو[٧]، کەچی زۆربەی یاسا زانانی ئەو قوتابخانەیە... وەک (لابەند- Laband) و (جیلینیک Jellinek) و (کارە دی مالبێرگ Carre De Malberg) و (بۆریل Borel) وای دەبینن، کە کۆنفیدراڵی دەوڵەتان ئەو کەسایەتییە مەعنەوییەی نییە، چونکە نەبۆتە دەوڵەت[٨]، لابەند دەڵێ:

«کۆنفیدرالی دەوڵەتان پەیوەندییەکی یاسایی نێوان چەند دەوڵەتێکە نەک سوبێکتی یاسایی، دەوڵەت لەمە جودایە و یەکەیەکی ڕێکخراوە، واتە سوبێکتی یاسایی، نەک پەیوەندی یاسایی»[٩].

٥- دەقی هەموو ئەو پەیماننامانەی کە یەکێتییە کۆنفیدرالییە جۆراوجۆرەکانیان پێکهێناوە، ئەمە دووپات دەکەنەوە کە دەبێ هەموو دەوڵەتانی ئەندام بۆ دەستکاری بەڵگەنامەکە (میثاق)، یان لە کاتی هاتنە ڕیزی ئەندامێکی نوێ بۆ یەکێتییەکە کۆکبن، چونکە دەوڵەتانی ئەندام، دەوڵەتی خودان سەروەرین و ناتوانن پابەندی شتێک بن ئەگەر لە بەڵگەنامەی یەکێتییەکەدا ڕەزامەندییان لەسەر نەدابێ، بۆیە دەبێ ڕەزامەندی نوێ و دەستە جەمعی هەموو دەوڵەتانی ئەندامی بۆ وەربگیرێ[١٠]، لەمەدا لەگەڵ یەکێتی فیدرالیدا جودایە، چونکە فیدرالی مەرجی ئەوەی تێدانییە بەدەستە جەمعی دەستکاری، یان هەمواری بەڵگەنامەی یەکێتی (دەستووری فیدرالی) بکەن بەڵکە لە ئەوپەڕی تەنیا ڕەزامەندی سێ لە چواری دەوڵەتە ئەندامەکانی گەرەکە.

٦- دەستەکانی یەکێتی کۆنفیدرالی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆیان بەسەر هەرێمەکانی دەوڵەتی ئەندام، یان خەڵکی ئەو دەوڵەتانەدا ناشکێ[١١]، ئەمەش لەوەوە هاتووە کە دەوڵەتانی ئەندام لە هاوپەیمانیەتی قەڵەمڕەوی خۆیان هەیە، بۆیە ئەو دەسەڵاتە بەدەستەکان نەدراوە یاسای وا دابنێ ڕاستەوخۆ هێزی سەپاندن و بڕیاردەری بەسەر یاسادانانی دەوڵەتەوە هەبێ لە چوارچێوەی هەرێمی خۆیدا[١٢]، کەچی دەبێ بەهۆی بڕیارەکانی پەیمانەکەوە بێت و بدرێتە دەوڵەتی ئەندام تا لە شێوەی یاسا خۆی دەری بکا، ئەمەش شێوەی یاسادانانی نێوخۆیی وەردەگرێ، نەک یەککگرتوانە بەواتایێکی دیکە، یاساکانی یەکیەتی سیفەتێکی شەرعی وەرناگرن، ئەگەر لە ڕێگەی دەوڵەتی ئەندامەوە نەبێ، بۆیە لە تایبەتمەندییە جودایەکانی پەیمانبەستن تایبەتمەندی نێوانکاریە (خاصیة التوسط)، کە دەسەڵاتی دەستەکانی یەکێتی کۆنفیدرالی ڕاستەوخۆ بەسەر خەڵکیدا ناسەپێنێ، لە ڕێگەی حکوومەتەکانی خۆیانەوە نەبێ[١٣] پەیوەندیان پێوە ناکات، ئەمەش بەپێچەوانەی حاڵەتی فیدرالیزمە کە حکوومەتی یەکێتی فیدرالی، نەک هەر ڕاستەوخۆ، دەسەڵاتی بەسەر دەوڵەتە ئەندامەکاندا دەڕوا، بگرە دەسەڵاتی بەسەر هاوڵاتیانی ئەو دەوڵەتانەشدا هەیە، کە پێویستە گوێڕایەڵ و پابەندی یاسا و سیستەم و ڕێنماییەکانی هەریەک لە حکوومەتی یەکێتی فیدرالی و حکوومەتەکانی دەوڵەتی ئەندام بن لەو چوارچێوەیەی کە بەپێی دەستووری یەکێتییەکە دیاریکراوە[١٤].

٧- لە میانی دەستەکانی (هیئات) یەکێتی کۆنفیدراڵیدا دادگەیەکی باڵا نییە بۆ سەیرکردن و بڕیاردان (الفصل) لەمەڕ ئەو ناکۆکییانەی لە نێوان دەوڵەتە ئەندامەکاندا ڕوو دەدەن کەچی لە یەکێتی فیدراڵیدا دادگەیەکی باڵای دەستووری هەیە بۆ حوکمدان لەسەر ئەو ناکۆکییانەی کە دێنە پێش، لە نێوان حکوومەتی ناوەندی (یەکێتی) و حکوومەتانی ئەندام، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە لە یەکێتی کۆنفیدراڵیدا هیچ وەسیلەیەکی چارەسەری ناکۆکی نێوان دەوڵەتە ئەندامەکان نییە، بەڵکو دەستەکانی تایبەتکارن کە بەڕێگەیەکی ئاشتییانە چارەسەری ناکۆکی نێوان دەوڵەتە ئەندامەکان بکەن، ئەمەش بەگوێرەی بەڵگەنامەی یەکێتییەکە، دەوڵەتەکان ئاگادار دەکاتەوە نابێ بۆ چارەسەری ناکۆکی پەنا ببەنە بەر هێز، بەڵکو پابەندیان دەکا پەنا ببنە بەر دەستەی ناوەندی پەیمانبەستنەکە کە کۆمەڵەیە، یان کۆنگرەیە، یاخود کۆنگریسە بۆ ئەوەی لە ڕێگەی بەرەڤانی، یان پەنابردنە بەر دادوەرەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان تا حوکم لەسەر ناکۆکییەکان بدەن و چارەسەر بکرێن.

٨- پووچەڵکردن و لێکبوونەوە: لە یەکێتی کۆنفیدراڵیدا، چونکە هەموو دەوڵەتێکی ئەندام سەروەری خۆی دەپارێزێ، بۆیە مافی ئەوەی هەیە پابەند نەبێ بەهەر کارێک، یان بڕیارێک، یاخود ڕەفتارێک کە لە لایەن دەسەڵاتی کۆنفیدراڵییەوە، ئەنجام دەدرێ، ئەگەر ئەو دەوڵەتە وای بینی ئەو کار و بڕیار و ڕەفتارانە لە بەندەکانی بەڵگەنامەی یەکێتی کۆنفیدراڵی چۆتە دەرێ، هەروەها مافی ئەوەشی هەیە لەو یەکێتییە جودا بێتەوە ئەگەر بینی مانەوە و بەردەوامبوونی لە ئەندامێتی زیان بەسەروەری و مافی ناوچەیی دەگەیەنێ[١٥]، ئەمەش بەپێچەوانەی یەکێتی فیدراڵییە کە- زۆربەی جاران- بڕیار نادات دەوڵەتانی ئەندام پەنا ببەنە بەر پووچەڵکردن، یان جودابوونەوە، لەسەر ئەو بناغەیەی کە ئەمە لەگەڵ سەروەری دەوڵەتی فیدراڵی یەک ناگرێتەوە.

٩- ژمارەی ڕەگەزنامەکان (الجنسية) بەپێی ژمارەی دەوڵەتانی ئەندامی کۆنفیدراڵی دەبن، هاووڵاتیانی هەر دەوڵەتێک لە دەوڵەتانی ئەندام لە دەوڵەتەکەی دیدا بەبیانی دادەنرێ، چونکە وەک دەزانین یەکێتی کۆنفیدراڵی نابێتە هۆی پێکەوەنانی حکوومەتێکی هاوبەش لە سەرووی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان، ئەمەش نابێتە هۆی پێکەوەنانی یەک گەل، بەڵکە لە چەندین گەلی دەوڵەتە ئەندامەکان پێکدێ، بۆیە وەک دەرەنجامێکی مەنتیقی هاووڵاتی هەر دەوڵەتێکی ئەندام لە دەوڵەتەکەی دیدا ئەندامێکی بیانییە[١٦]، لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان ئەو دەوڵەتانە پەیوەندییەکی نێو دەوڵەتییە و لە سایەی بەندەکانی یاسای گشتی نێودەوڵەتیدایە، هەروەها ژمارەی ڕەگەزەکان بەگوێرەی ژمارەی

دەوڵەتە ئەندامەکان دەبن و ڕەگەزنامەییەکی هاوبەش لەو شێوە ڕێکخستنەی یەکێتی کۆنفیدراڵییەکەدا نییە، ئەمەش جیاوازییەکی جەوهەری لەگەڵ یەکێتی فیدراڵیدا هەیە، وەک پێشتر بینیمان[١٧] هەموو خەڵکی دەوڵەتانی یەکێتی فیدراڵی بەیەک ڕەگەزنامە دادەنرێت بازێد و جێگەی دانیشتنیان لێک جوداش بێ.

١٠- لەبەرئەوەی دەوڵەتە ئەندامەکان لە یەکێتی کۆنفیدراڵیدا سەروەری و کەسایەتییە نێودەوڵەتییەکەی خۆیان دەپارێزن، بۆیە ئەگەر شەڕ لە نێوانیان قەوما بەشەڕی نێودەوڵەتی یان (نێوان دوو دەوڵەت) دادەنرێ و بەپێی بەڵگەنامەو نەریتی نێودەوڵەتیش دەرەنجامی ئەو یاسایانەیان بەسەر دەسەپێ، کە پەیوەندی هەیە بەماف و ئەرکەکانی دەوڵەتی شەڕکەر، ئەمە لە کاتێکدا ئەو شەڕەی لە نێوان دوو دەوڵەتی ئەندام لە یەکێتی فیدراڵیدا ڕوودەدا بەشەڕی نێوخۆ (براکوژی- ئەهلی- Civil war) دادەنرێ[١٨].

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی یەکەم:

(١) ئەم جۆرە یەکێتییە زۆر ناوی جیاوازی بۆ دانراوە، د. حەسەن چەلەبی ناوی لێناوە یەکێتی دەوڵەتان یان یەکێتی کۆنفیدراڵی، بڕوانە د. حسن الجلبي القانون الدولي العام- سەرچاوەی پێشوو ل٢٢١ هەروەها د. اسماعيل الغزال ناوی لێناوە یەکێتی بەعەقد یان سەربەخۆیی بڕوانە د. اسماعيل الغزال سەرچاوەی پێشوو ل ٩٩، د. مستەفا کامل یش ناوی لێناوە یەکێتی سەربەخۆیی: بڕوانە د. مصطفى كامل سەرچاوەی پێشوو ل ٢٦، هەروەها د. عەبدولحەمید عەباس پێی دەڵێ یەکێتی دەوڵە گرێبەستەکان، بڕوانە د. عەبدولمەجید عەباس- القانون الدولي العام- مطبعة النجاح/ بغداد/ الطبعة الثانية ١٩٤٧- ل ١٠٦.

هەندێکی دیش پێی دەڵێن یەکێتی سەربەخۆیی یان هاوپەیمانی. بڕوانە «د. ثروت البدوي» سەرچاوەی پێشوو ل٦١، د. ابراهيم عبدالعزيز الشيحا- الوجيز في النظم السياسة والقانون الدستوري- سەرچاوەی پێشوو ل٦٥- ٧٠، حسن الحسن- القانون الدستوري والدستور في لبنان- منشورات دار مكتبة الحياة- بيروت- الطبعة الثانية ل٤٦، هەروەها ژمارەیەکی دی ناویان لێناوە یەکێتی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان، بڕوانە د. الشافعي محمد بشير- القانون الدولي العام في السلم والحرب- سەرچاوەی پێشوو ل١٦٩، د. علي صادق ابوهيف- سەرچاوەی پێشوو ل١٣٠، د. محمود سامي جنينة- سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٨- ٢٠٣.

(٢) د. الشافعي محمد بشير- القانون الدولي العام في السلم والحرب- سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٨- ٢٠٣.

(٣) د. ثروت بدوي، سەرچاوەی پێشوو ل ٦٧.

(٤) د. الشافعي محمد بشير- القانون الدولي العام في السلم والحرب-سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٨-

٢٠٣. هەندێ لە یاسازانەکانی یاسای گشتی وایان داناوە، کە یەکێتی هۆڵەندی یان یەکێتی زەوییە نزمەکان The Nether Iands confederacy کە لە ساڵی ١٥٨٠ وەتا ١٧٨٠ بەردەوام بوو، یەکێتییەکی کۆنفیدراڵی بوو، بڕوانە:

Alexander Hamilton, James Madison and John Jay, Op Cit- page 185.

(٥) د. میشال ریاشی نووسیویەتی یاسا زانانی قوتابخانەی کلاسیکی ڕێککەوتوون کە دەکرێ هەموو یەکێتییەکی دەوڵەتان بۆ یەکێک لەم دوو جۆرە بگێڕینەوە:
یەکەم لەسەر بناغەی پەیماننامەکان و دووەمیش لەسەر بناغەی دەستوورەکە بەیەکەمیان دەگوترێ کۆنفیدراڵی دەوڵەتان بەدووەمیش دەگوترێ دەوڵەتی فیدراڵی، بڕوانە د. میشال ریاشي، سەرچاوەی پێشوو ل ١٦.

(٦) د. الشافعي محمد بشیر- القانون الدولي العام في السلم والحرب- سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٠ و د. مصطفى کامل- سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦.

(٧) د. میشال الریاشي- سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٨.

(٨) سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٠.

(٩) سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٩.

(١٠) شایانی باسە هەرچەندە بەڵگەنامەی یەکێتی مەرجی دەستە جەمعی دادەنێ بۆ هەموارکردنی میساق، بەڵام لە زۆر کاروباری دیکەی پەیوەندیدار بەیەکێتییەوەش ئەو مەرجە بەپەسند نازانێ.

(١١) د. مصطفى کامل- سەرچاوەی پێشوو ل ٣٦.

(١٢) لەگەڵ ئەو بناغە گشتییەدا، دەبینین لە هەندێ باردا دەستەکانی یەکێتی بەپێی تایبەتکاری بەزۆر دەرفەتی گوشار دەخاتە سەر دەوڵەتانی ئەندام بۆ ئەوەی ڕێز بۆ بڕیارەکانی یەکێتی دابنێن وەک لە یەکێتی کۆنفیدراڵی ئەڵمانی و کۆنفیدراڵی سویسراییدا هەیە، کە کۆنفیدراڵی سویسرایی دژ بە هەرێمی نیوچاتل New Chattel لە ساڵی ١٨٣١ و دژبە بازل Bazel لە ساڵی ١٨٣٢ خستییە ناوەوە، هەروەها بەهێز سوندەربۆندی Sunder Bund ی هەڵوەشاندەوە کە لە ساڵی ١٨٤٧ دامەزرا، بڕوانەک د. حسن الچلبی- القانون الدولي العام- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٤.

(13) L. Opperheim, op. page 173.

(14) Gerhard Van Clahn, op. cit page 70.

J. G Starke, Op . Cit Page 104.

L. Opperheim, Op. Cit Page 175.

(١٥) هەندێ یەکێتی کۆنفیدراڵی جودابوونەوە قەدەغە دەکا، وەک یەکێتی کۆنفیدراڵی ئەڵمانیا کە لە ماددەی (٥) بڕیاری داوە «ئەم پەیمانبەستنە وەک یەکێتییەک دامەزراوە قابیلی لێکهەڵوەشانەوە نییە، بەپێی ئەمەش نابێ هیچ لە ئەندامەکانی لێی دەربچن» بەوە دەوڵەتە ئەندامەکانی نێو

یەکێتییەکە لە مافی جودابوونەوە بێبەش دەکات، نەخۆ بەبیانووی سەروەری داوای ئەم مافە بکەن، چونکە لە کاتی مۆرکردن لەسەر بەڵگەنامەی یەکێتییەکە لەو مافە تەنازولیان کردووە، بڕوانە الشافعي محمد بشير- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٤.

(١٦) لەگەڵ ئەوەی ئەمە بناغەی گشتی سیستەمی کۆنفیدراڵییە و دەرەنجامێکی لۆژیکی زادەی ئەو سیستەمەیە، بەڵام واقیعی ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان دەوڵەتە هاوپەیمانییە کۆنفیدراڵییەکەدا هەبوو، وای کردبوو هەر یەکێک لە دەوڵەتانی ئەندام وەک هاووڵاتیانی دەوڵەتێکی بیانی سەیری هاووڵاتیانی دەوڵەتانی دیکەی ئەندام نەکەن و وەک هاووڵاتیانی خۆیان هەندێ مافیان دەستەبەر بکەن و بەو ئەرک و کۆت و پێوەندەی بۆ هاووڵاتیانی بیانی دانراوە باریان گران نەکەن، لەم ڕووەوە یەکێتی کۆنفیدراڵی سویسرایی یەکسانی خستە نێوان هاووڵاتیانی هەموو دەوڵەتانی ئەندام و مافی گواستنەوە و کڕینی کەلوپەل و بەروبووم و ماڵاتی پێدان بێ ئەوەی باریان گران بکات و لەوە زێتریان بەسەردا بسەپێنێ کە بۆ هاووڵاتیانی خودی ئەو دەوڵەتە دانراوە، هەروەها کۆنفیدراڵی ئەمریکایی مافەکانی هاووڵاتیانی فراوانتر کرد و بڕیاریدا جگە لە سواڵکەر و سەرگەردان و تاوانبارەکان خەڵکی لە هەموو دەوڵەتانی ئەندام ئازادن و گشت حەسانەو ئیمتیازاتێکی ئەو هاووڵاتیانەیان هەیە کە لە هەر دەوڵەتێک لە دەوڵەتە ئەندامەکاندا هەیە، هەروەها هەر هاووڵاتییەک مافی ئەوەی هەیە بچێتە هەر دەوڵەتێک لە دەوڵەتە ئەندامەکان یان لێی دەربچێ هەمان مافی ئەوەی هەیە مۆڵەتی پیشەسازی و بازرگانی وەربگرێ لە هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتە ئەندامەی هەیانە، دەبێت ملکەچی هەمان یاسا و باج و کۆت و پێوەندی ئەو دەوڵەتەش بێ.

هەروەها یەکێتی کۆنفیدراڵی جەرمانی بڕیاریدا هاووڵاتیانی دەوڵەتانی ئەندام مافی ئەوەیان هەیە زەوی وزار و موڵکیان لە هەر دەوڵەتێکی دیکەی ئەندام هەبێ، بێ ئەوەی ئەو دەوڵەتە ئەندامی موڵکەکانیانی تێدایە باج و سەرانەیەکی پتریان بخاتە سەر، سەرەڕای ئازادی هاتووچۆی هاووڵاتیان و گواستنەوەی سامانەکانیان لە دەوڵەتێک بۆ دەوڵەتێکی دی نێو یەکێتییەکە، هەروەها بۆ دابینکردنی مافی نووسەر و چاپکاران بەدایتی ڕاگەیاند یاسایەکی یەکگرتوو هەبێ بۆ ئەو ڕێوشوێنانەی کە پێویست دەکا دابنرێن و ڕێگە لە لاسایی کردنەوەی دانراوەکانیان بگرێ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هاووڵاتیانی دەوڵەتە ئەندامەکان یەک ڕەگەزنامەیان نەدرابێ! بڕوانە د. الشافعي محمد بشير سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٢- ٢٠٣

(١٧) لەمبارەوە بڕوانە ل ٢٥٥- ٢٥٧ی ئەم دکتۆرانامەیە کە بەزمانی عەرەبی پێشکەش کراوە.

(١٨) د. حامد سلطان سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٣

## ئاخافتنی دووەم

# فیدرالّیزم و ئۆتۆنۆمیی نێوخۆیی

پێشتر سەبارەت بەسیستەمی ئۆتۆنۆمیی ناوچەی دواین کە چوارچێوەی سیستەمێکی بڕیار لەسەر دراوی یاساییە ئێستا لە عێراق، هەر لەو بوارەشدا چووینە نێو باسی زۆر لایەنی جەوهەری ئەو سیستەمە، لە ڕوانگەی ئەمەوەش کە سیستەمی ئۆتۆنۆمیی و فیدرالّی لەسەر هەمان ئەو حیکمەت و ئامانجە دادەمەزرێن کە دوو وەسیلەی چارەسەری کێشەی ناتەواوی و نایەکسانی نێو خەلّکن و بەهۆی فرەنەتەوەیی، یان فرە ئایینی، یاخود فرە زمانی هاتوونەتە ئاراوە، بۆیە خالّی هاوبەش و یەکدیگرەوەیان هەر دەبێ، هەردوو سیستەم لەسەر لامەرکەزی پێکدێن، جا لامەرکەزی سیاسی بێ یان کارگێڕی، تەوەر و سنووری هەر یەکێکیشیان لە بوونی پارچە زەمینەیەکی جیۆگرافی دیاریکراو یان هەرێمێکی دیاریکراودا دەبێ، کە مەرجێکە بۆ پێکەوەنانی فیدرالّیزم یان ئۆتۆنۆمیی. ئەو دوو سیستەمە بەو پێیەی لە دەقی دەستووری دەولّەتدا باسیان لێوە دەکرێ، هاوبەشن، واتە هەردووکیان شەرعییەت و هێزی یاسایی لە دەستوورەوە وەردەگرن، هەروەها فیدرالّی و ئۆتۆنۆمیی لەوەدا یەکدی دەگرنەوە کە سنووری هەریەکەیان لە بواری یاسای نێوخۆدا تێناپەڕێ و ناگەنە بواری دەرەوە و نێودەولّەتی، بەشێوەیەکی دی... ڕەنگدانەوەیان تەنیا لە بواری دەسەلاّتداریّتی نێوخۆی دەولّەت دایە و ئەو ڕەنگدانەوەیە ناگاتە بواری دەسەلاّتداریّتی دەرەوە و یەکبوونی دەرەکیانەی دەولّەت.

بەلاّم لەگەلّ بوونی خالّی یەکدیگرتنەوە و پێکچوونی نێوانیان، ئەو دوو سیستەمە لە زۆر خالّ و لایەنیش لێکدی جودان و جیاوازییەکانیش سروشتێکی جەوهەرییان هەیە کە ئەمانەن:

١- گرنگترین پێوەر کە هەردوو سیستەمی لەسەر پێکدێ سەربەخۆییە، بەلاّم لە سروشتی ئەو سەربەخۆییەی کە دەدرێتە هەریەکەیان جیاوازییەکی جەوهەری هەیە، لە هەمان کاتدا دەبینین مەودای ئەو سەربەخۆییە لە چوارچێوەی فیدرالّیدا مەودایەکی بەرجەستە و جەوهەرییە، هەرچەندیش دەسەلاّتی حکوومەتی یەکێتی فیدرالّی فراوان و زۆربێ، کەچی هەندێ تایبەتمەندی کە بەپێی دەستوور بەحکوومەتی دەولّەتە ئەندامەکانی ئەو یەکێتییە دراوە، بێ چاودێری و ملکەچکردنێک پیڕەوی لێ دەکات:

ویێر Wheare سەبارەت بەمەرجەکانی یەکێتی فیدرالی دەڵێ: «ئارەزوومەندی بۆ ئەوەی لە سایەی حکومەتێکی سەربەخۆ بیت بەس نییە، پێویستە لە هەمان کاتدا ئارەزووی ئەوەش هەبێ حکوومەتی هەرێمی سەربەخۆ پێکەوە بنێ، یان پارێزگاری لێ بکات، ئەگەر بەلایەنی کەم ئەمە تەنیا بۆ هەندێ کێشەش بێت... بێ ئەو ئارەزوومەندییەش کە دەبێ لە هەندێ شت جودابێ، دەکرێ ئەو کۆمەڵانە حکوومەتێکی یەکبوو لەگەڵ ڕادەیەکی گونجاو لە لامەرکەزی پێکەوە بنێن[1] پاشان لەسەری دەڕواو دەڵێ... مەبەست یان واتای پرەنسیپی فیدرالی بەرنامەی دابەشکردنی دەسەڵاتە، واتە حکوومەتی گشتی و حکوومەتی هەرێم، هەریەکەیان لە میانی بوارێکی هاوکاری و سەربەخۆدا دەبن[2].

ئەوەی پەیوەندی بەسەروەرییەوە هەیە، هەرچەندە دەوڵەتی فیدرالی لە بواری دەرەکیدا بەرواڵەت سەروەری خۆیان دەپارێزن و لە چوارچێوەی نێو دەوڵەتیدا وەک دەوڵەتێک دیارە، بەڵام لە ئاستی نێوان خۆیاندا سەروەری دابەش دەکەن[3] سەرەڕای ئەمەش یەکێک لە ڕووخسارەکانی سەربەخۆیی دەوڵەتە ئەندامەکان بریتییە لەوەی هەریەکە دەستووری تایبەتی خۆی هەبێ.

بەڵام لە سایەی سیستەمی ئۆتۆنۆمییدا سەربەخۆیی سنووردارە. چونکە زۆرجاران لە سایەی دەوڵەتی یەکبوودا (سادە) پیادە دەکرێ، دەسەڵاتی سەرپەشتی و چاودێری ناوەندیش بەسەر دەستە و دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمییدا زۆرە، ئەمەش وادەکات هەرێمەکانی ئۆتۆنۆمیی ببنە پاشکۆی حکوومەتی ناوەندی و لایەنەکانی ئەو سەربەخۆییە زۆر تەسک دەکاتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هیچ سیستەمێکی ئۆتۆنۆمیی هیچ لایەنێک لە لایەنەکانی سەروەری ناگرێتەوە، تەنانەت ئەو سیستەمە سەرەکییانەی کە لە ناوچە سیاسییەکانی ئیتالیا و ئیسپانیاش پیادەکراون، پێویستە ملکەچی ڕەزامەندی پەرلەمانی ناوەندی بن[4].

٢- سیستەمی فیدرالی لەسەر بناغەی پرەنسیپی یەکێتی پێکدێ و دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەت شێوەیەکی پێکهاتەیی (ئاوێتەیی) وەربگرێ، بەڵام ئۆتۆنۆمیی- زۆرجاران- لە چوارچێوەی دەوڵەتی یەکبووی سادەدا پێ پێڕەودەکرێ، لەو کاتەی فیدرالی شێوەی دەوڵەت بۆ دەوڵەتێکی پێکهاتەیی دەگۆڕێ کە ئۆتۆنۆمیی ئەم کاریگەرەی نییە، بەڵام بەشێوەیەکی ئاسایی وەک پێشتر ڕوونمانکردەوە لە ئامێزی یەکبوونی یاسایی و سیاسی

دەوڵەت پێکدێ، لەم بوارەشدا لەگەڵ ڕای هەندێک ڕێکناکەوین[٥] کە دەڵێ: فیدراڵی و ئۆتۆنۆمیی هەردووکیان لەسەر ئیعتیباری یەکبوون پێکدێن، چونکە ئەگەر پارێزگاریکردن لەو شێوە یەکبوونەی دەوڵەت ئەو ئامانجە سەرەکی و جەوهەرییە بێت کە پێکەوەنانی سیستەمی ئۆتۆنۆمیی هیوای بۆ دەخوازێ، بەڵام ئەو فیدراڵییەی کە بەتایبەتی لە ڕێگەی پێکەوە ڕێککەوتنی ئیرادەی چەند دەوڵەتێک پێکەوە دەنرێ ئامانجێکی دیکەی تەواو جودای هەیە کە بریتییە لە پێکەوەنانی سیستەمێکی یەکگرتووی وا لە هەندێ کاروباردا پێکەوەنانی حکوومەتێکی یەکگرتوو دەگرێتەخۆ، لە هەندێ کاروباریشدا دەوڵەتە ئەندامەکانی ئەو یەکێتییە سەربەخۆ دەمیننەوە پرەنسیپی فیدراڵی پێویستی بەهاریکاری نێوان حکوومەتی یەکێتییەکەو حکوومەتی دەوڵەتە ئەندامەکان هەیە، هەروەها پێویستیشە ئەو جیاوازییە دیارەی نێوان زاراوەی یەکێتی (الاتحاد) و یەکبوون (الوحدە) پشتگوێ نەخرێ، ئەگەر یەکێتی یان یەکگرتن ئەوەبوو کە پێشتر باسمان کرد، کەچی یەکبوون بریتییە لە جەوهەری سیستەمی یەکبوونی دەسەڵات، لەم بارەوە ویێر Wheare دەڵێ: ئەو کاتە یەکێتی فیدراڵی دێتە دی... کە دەوڵەتە ئەندامەکان بڕوایان بەوە هەبێ، کە پێویستە ئارەزووی یەکگرتنیان هەبێ، نەک ببنە یەک.

(They must desire to united but no to be unit ary)[٦] هەروەها دایسی Di-cey پێی وایە بۆ پێکەوەنانی یەکێتی فیدراڵی پێویستە لە پلەی یەکەمدا هاووڵاتیانی دەوڵەتە ئەندامەکان ئارەزووی یەکگرتنیان هەبێ، نەک ئارەزووی یەکبوونیان هەبێ[٧] جوشی Joshiیش وای دادەنێ کە فیدراڵی بناغەیەکی فەرمانڕەواییە لە ڕێگەی یەکگرتنی ژمارەیەک ویلایات یان هەرێم، یاخود دەوڵەت کە بێ لێکجودابوونەوە و بێ یەکبوونیش پێکەوە دەژین[٨].

بەڵام لە سیستەمی ئۆتۆنۆمییدا ئەو ئیعتیبارانەی باسکران لە گۆڕێدانین، ئەو سیستەمە لە هەموو ڕوویێکەوە لەسەر بنەمای یەکبووی دەوڵەتدا دادەمەزرێ، چونکە ئەو سیستەمە وەک لە کاتی خۆشیدا خستمانە ڕوو لە شێوازێکی پێشکەوتوانەی لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی پتر نییە، لەمبارەوەش د. سەعد عەلوش نووسیویەتی کە یاسا دانەری عێراقی شێوازێکی ڕێک و وردی داناوە و خاڵێکی پتەوی هاوسەنگی لە نێوان پێداویستییەکانی سەربەخۆیی نامەرکەزی لە فەرمانڕەوایی و کارگێڕی لە لایەک و هەقیقەتی بنەڕەتی یەکپارچەیی خاک کە قابیلی دابەش بوون نییە و یەک گەل کە ناکرێ لێک ببنەوە لە لایەکی دیکەوە داناوە[٩].

٣- لەمەڕ ڕێگەو شێوازی دامەزراندنییەوە فیدراڵی لە ئۆتۆنۆمیی جودایە، فیدراڵی بەدوو شێوە دادەمەزرێ... یەکەمیان لە ڕێگەی چوونە پاڵ یەکی چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ و پێکەوەنانی یەکێتییەکی فیدراڵی وەک ئەوەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و سویسرا و ئەڵمانیا و ئوسترالیا کراوە، دووەمیشیان لە ڕێگەی لێک هەڵوەشانەوەی دەوڵەتێکی یەکبووی سادە بۆ چەند دەوڵەتێکی ئەندام- کۆمار یان ویلایات، یاخود هەرێم- و هەریەکەیان سەربەخۆیی خۆی هەبێ وەک ئەوەی لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، هیندستان، بەرازیل، ئەرجەنتین، مەکسیک، فەنزویلا، مالیزیا، نایجیریا و تەنزانیادا ڕوویدا.

بەڵام لە ئۆتۆنۆمییدا... لە ڕێگەی بڕیاردانی حکومەتی ناوەندییەوە بۆ هەرێمێکی دیاریکراو دادەمەزرێ و نابێتە هۆی لە دایکبوونی دەوڵەتی تازەی ئەندام و پاش بڕیاردانەکەش هیچ گۆڕانێک لە قەوارە و شێوەی دەوڵەتەکە ڕوونادات.

٤- سیستەمی فیدراڵی لەسەر بناغەی دوانەیی (دوالیزم) دەسەڵاتی یاسا دانانی فیدراڵی دادەنرێ واتە ئەو دەسەڵاتە لە دوو ئەنجوومەن پێک دەهێندرێ کە یەکێکیان ئەنجوومەنی باڵایە (ئەنجوومەنی دەوڵەتە ئەندامەکان) کە زۆربەی جاران دەوڵەتەکان بەشێوەیەکی یەکسان تێیدا نوێنەرایەتی دەکەن، ئەوی دیش ئەنجوومەنی نوێنەران یان ئەنجوومەنی گەلە کە لە نوێنەری دانیشتوانی وڵات پێک دێ و بەپێی ڕێژەی دانیشتوان لە هەر ویلایەتێک یان هەرێمێک.

بەڵام ئەو دەوڵەتانەی پێڕەوی لە ئۆتۆنۆمیی دەکەن زۆربەیان دەوڵەتی یەکبوون و سیستەمی یەک ئەنجوومەنیان هەیە کە نوێنەری هەموو خەڵکی وڵات دەگرێتەخۆ و لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی ئازاد و نهێنی و ڕاستەوخۆوە هەڵدەبژێردرێن بێ ئەوەی هیچ حسابێک بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمیی بکرێ کە ئەویش وەک ئەو هەرێمانەی خودان ئۆتۆنۆمیی نین بەپێی ڕێژەی دانیشتوان نوێنەری خۆی لە ئەنجوومەنەکەدا دەبێ، بەدانیشتوان نوێنەری خۆی لە ئەنجوومەنەکەدا دەبێ، بەواتایەکی دی لە سایەی سیستەمی ئۆتۆنۆمییدا ئەنجوومەنی تایبەت بەهەرێمەکان نییە.

٥- هەردوو سیستەم لە ڕووی قەبارەی تایبەتمەندییە پێ سپێردراوەکان بەویلایەت و هەرێمەکان، هەروەها لە مەڕ چۆنیەتی سپاردنی ئەو تایبەتمەندییانە بەشێوەیەکی جەوهەری لێکدی جودان، لە سایەی فیدراڵیزمدا دەوڵەتە ئەندامەکان لە ڕووی تایبەتمەندییەکانی

یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادوەرییەوە سەربەخۆییەکی گەورەیان هەیە، بەڵکو هەندێ سیستەمی فیدراڵی لەم بوارەدا پتریش دەڕوا وەک ئەوەی لە دەستوورەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سویسرا، ئەلمانیا و ئوستوراڵیادا هەیە کە ئختیساسەکانی حکوومەتی یەکێتی دیاری دەکات و ئەو دەسەڵاتانەی نەنووسراونەتەوە یان پێی دەگوترێ دەسەڵاتە بەجێماوەکان Residuary Powers بۆ حکوومەتەکانی دەوڵەتە ئەندامەکان دادەندرێت و ئەو دەسەڵاتانە لە دەسەڵاتەکانی حکوومەتی یەکێتی فراوانتریشە، ئەمە لە لایەک لە لایەکی دیکەوە... دەسەڵاتەکان لە دوو توێی دەستووری فیدراڵیدا ڕێک دەخرێن و دابەش دەکرێن، بۆیە ناکرێ و گران دەوەستێ لەسەر حکوومەتی یەکێتی پێشێلی بکات، یان سنوورداری بکات، ئەمەش لەبەر دوو هۆ: یەکەمیان دەستووری دەوڵەتی فیدراڵی دەستوورێکی نەگور و جێگیرە و حکوومەتی یەکگرتوو ناتوانێ بەئاسانی هەمواری بکات، دووەمیش مەسەلەی هەموارکردنی ئەو دەقانەی کە لە دەستوور پەیوەندی بەدەسەڵاتی دەوڵەتی ئەندامەکانەوە هەیە بەڕەزامەندی ئەو دەوڵەتانە نەبێت، ناتوانرێ هەموار بکرێ، سەرەڕای ئەمەش دەوڵەتە ئەندامەکان بەشێوەیەک لە شێوەکان لەو بوارەدا بەشداری دەکەن.

بەڵام لە سێبەری ئۆتۆنۆمییدا، ئەو دەسەڵاتانە کە بۆ هەرێمی ئۆتۆنۆمیی جێ دەهێڵدرێن لاوەکین بە بەراورد لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەتە ئەندامەکان لە فیدراڵیدا، ئەمە لە لایەک... لە لایەکی دیکەوە ئەو دەسەڵاتانە زۆربەیان بەپێی یاسای ئاسایی دادەڕێژرێن، بۆیە لەگەڵ سادەییبیان و کەم بایەخییان، بەئاسانیش قابیلی هەموارکردنن، تەنانەت ئەگەر لە دەستووریش بڕیاریان لەسەر درابێ، هەر دەکرێ هەموار بکرێن چونکە ئەو دەوڵەتانەی پێڕەوی لە ئۆتۆنۆمیی دەکەن، زۆربەیان دەوڵەتی یەکبوون و دەستووری نەرمیان (مرن) هەیە، ئەمە سەرەڕای ئەوەش هەموارکردن یان لابردنی ئەو دەسەڵاتانە پێویستی بەوە نییە ڕەزامەندی هەرێمی ئۆتۆنۆمیی لە بارەوە وەربگیرێ، بەڵکە ئەو هەرێمانەو مافەکانیان کە بەپێی یاسای ئۆتۆنۆمیی بڕیاریان لەسەر دراوە لە ژێر ڕەحمەتی حکوومەتی ناوەندین وەک ئەوەی بینیمان کە چۆن ژەنراڵ فرانکۆ لە ساڵی ۱۹۳۹ سیستەمی ئۆتۆنۆمیی لە هەرێمی کاتالۆنیای ئیسپانیا لابردو ئەو هەموارکردنە یەک لەدوای یەکانەش کە (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) لە عێراق لە یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستان ژمارە ۳۳ی ساڵی ۱۹۷٤دا ئەنجامیدا.

٦- ناکرێ مەسەلەی ملکەچی دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی بۆ چاودێری و سەرپەرشتی

دەسەڵاتی ناوەندیش پشتگوێ بخەین و زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین ئەم سانسۆرەی لەسەر دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمییدا هەیە زۆر لە چاودێری کارگێڕی پترە کە حکوومەتی ناوەندی بەسەر یەکە کارگێڕییەکانی سیستەمی لامەرکەزیدا پیادەی دەکا، جا ئەمە لە ڕووی ژمارە و زۆری ئەو لایەنانە بێ کە ئەو چاودێرییە پیادە دەکەن، یان لە ڕووی فراوانی مەیدانی چاودێرییەکە دابێ، ئەمەش بەبیانووی ئەوەی گوایە پارێزگاری لە یەکبوونی نیشتمانی دەکەن و ڕێگە نادەن هیچ یاسایەک یان بڕیارێک دەربچێت کە هاندەر بێت بۆ خولیای جودابوونەوە، هەردەم حکوومەتی ناوەندی لە بارەی ئەم شتانەوە زێدەڕۆیی دەکات و دەبێتە هۆی ئەوەش کە نەک هەر چاودێری یاسایی پێڕە و بکات، بگرە پەنا دەباتە بەر سانسۆرێکی گونجاوی وا کە ببێتە چەکێکی ترسناک بەدەستی حکوومەتی ناوەندییەوە و بکارێ دامەزراوەکانی ئۆتۆنۆمیی لە کاربخاو نەهێڵێ هیچ ماف و دەستکەوتێک لەو ماف و دەستکەوتانەی کە لە ئۆتۆنۆمییدا هەن بەرجەستە بکەن.

بەڵام چاودێری لە سیستەمی فیدراڵیدا بەشێوەیەکی جەوهەری جودایە، جا چ لە ڕووی قەبارەی ئەو چاودێرییەوە بێ، یان لە ڕووی چۆنیەتی پیادەکردنی لەگەڵ ئەوەی بڕیار دەدرێ، ئەو چاودێرییە لە کاتی جێبەجێکردنی یاساکانی یەکێتی لە لایەن دەوڵەتە ئەندامەکانەوە هەندێ فراوان دەبێ، بەڵام دەکرێ بگوترێ لە حاڵەتەکانی دیکەدا چاودێری کردنەکە لە زۆربەیاندا تەنیا چاودێری دادوەری دەبێ و لە لایەن دادگەی باڵای یەکگرتووەوە پێڕەو دەکرێ.

٧- سەرباری ئەو سەربەخۆییەی کە دراوەتە دەوڵەتە ئەندامەکان، سیستەمی فیدراڵی پرەنسیپێکی دیکەش بەخۆوە دەگرێ کە پرەنسیپی بەشداریکردنە لە حکوومەتی یەکگرتوو و بەشداریکردنە لە هەموو ئەو بڕیارانەی کە پەیوەندییان هەیە بەتەواوی دەوڵەتی یەکگرتووەوە، ئەمەش لە ڕێگەی ئەنجوومەنی باڵاوە دەبێ کە لقێکی دەسەڵاتی یاسادانانی یەکگرتووە و هەموو دەوڵەتە ئەندامەکان زۆرجار بەشێوەیەکی یەکسان تێیدا بەشدار دەبن، ئەو ئەنجوومەنەش ڕۆڵێکی هاوتەریب بەڕۆڵی ئەنجوومەنی خواروو لە بواری تایبەتکاری یاسادانانەوە پیادە دەکات، کە دەبێ هەر یاسایەکی یەکگرتوو بەڕەزامەندی هەردوو ئەنجوومەنەکە بێت، بەڵام ئەنجوومەنی باڵا لە هەندێ سیستەمی فیدراڵیدا ڕۆڵێکی گرنگتر لە ڕۆڵی ئەنجوومەنی خوارووتر (الادنی)دا دەبینێ و هەندێ تایبەتمەندی جێبەجێ کردنیشی دەدەرێتێ، وەک چۆن ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکایی سەرەڕای تایبەتمەندییە یاسادانانەکەی لایەک لە دەسەڵاتی جێبەجێکردنیش پیادە دەکات[١٠]، هەروەها دەوڵەتە

ئەندامەکانی حکوومەتی یەکگرتوو بۆ دانانی دەستووری یەکگرتوو و ئەو هەموارکردنەی لە دەستووردا دەکرێ هاوبەشی دەکەن، چونکە زۆربەی سیستەمە فیدرالّییەکان، بەتایبەتی ئەوانەی ویێر Wheare بەفیدرالّی نموونەییان دادەنێ کە بریتین لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و سویسرا و کەنەدا و ئوسترالیا[١١] لەسەر ئەو پەرەنسیپە ڕاهاتوون کە بێ بەشداری دەولّەتە ئەندامەکان دەستووری یەکگرتوو هەموارنەکرێ، ئەم بەشداریکردنەش زەمانەتێکی پتر دەداتە دەولّەتە ئەندامەکان کە هیچ مافێکی بڕیار لەسەر دراویان پێشێل نەکرێ، جا ئەو مافانە لە دەستووری یەکگرتوودا هاتبن، یان لە یاسای یەکگرتوودا، سەرەڕای ئەمەش سەبارەت بەو کێشانەی کە پەیوەندیان بەدەولّەتی ئەندامەوە هەیە، دەبێ دەسەلاّتی ناوەندی پێش ئەوەی هیچ ئیجرائاتێک بکا، ڕەزامەندی ئەو دەولّەتە وەربگرێ.

لەم ڕوانگەیەوە... سیستەمی فیدرالّی بەشێوەیەکی جەوهەری لە ئۆتۆنۆمیی جودایە کە بەهیچ شێوەیەک لەو شێوانەی پێشتر باسمان کرد هەرێمەکان بەشداری لە پیادەکردنی دەسەلاّتی ناوەندیدا ناکەن، حکوومەتی ناوەندی دەستوور هەموار دەکاو بەتەنیا و بەئارەزووی خۆشی دەتوانێ یاسای پێوەندار بەئۆتۆنۆمیی هەموار بکا بێ ئەوەی هەرێمە خودان ئۆتۆنۆمییەکان بتوانن قسەیەک بکەن، هەروەها ئەو هەرێمانە هیچ زەمانەتێکی دەستووریان نییە نەهێلّن ئەو مافە دەستووری و یاساییانە پێشێل بکرێن کە بڕیاری لەسەر دراوە[١٢].

٨- بۆ دووپات کردنەوەی پرەنسیپی سەربەخۆیی ئەو دەولّەتە ئەندامانەی لە سایەی سیستەمی فیدرالّی دان، ئەو دەولّەتە دادوەری سەربەخۆ و جودا لە دادوەری یەکگرتوویان هەیە و هەر ویلایەتێک لە پالّ دادگەی بالاّی فیدرالّیدا، دادگایەکی بالاّی خۆی هەیە، لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لە هەر ویلایەتێک دوو جۆر دادگا هەن: دادگای فیدرالّی Federal Court و دادگای ویلایەت State Court، هەروەها زنجیرەیەکی هەرەمیش لە دادگاکانی ویلایەتدا هەیە کە بەدادگای بالاّی ویلایەت کۆتایی دێ، هەروەها هەندێ دەولّەتی فیدرالّی دی وەک سویسرا و ئەلّمانیا و یەکێتی سوڤییەتی پێشوو پرەنسیپی دادوەری سەربەخۆیان لە دەولّەتە ئەندامەکاندا پیادە کردووە لە هەر کانتۆنێک یان دەولّەتێکی ئەندامدا دادگایەکی بالاّ هەیە، بەلاّم لە کۆتاییدا دادگای بالاّی یەکگرتوو دەتوانی ڕەخنە لە هەندێ حوکمەکانی بگرێ، یان ڕەتی بکاتەوە.

بەلاّم لە سایەی ئۆتۆنۆمییدا دەولّەت دادوەری تێکەلّ یان سەربەخۆ پێڕەو ناکا و

دادوەری یەکبوو و ناوەندی دەبێ، ئەو دادگا و فەرمانگانەی داد کە لە هەرێمی ئۆتۆنۆمیدا هەن تەنیا لقێکی سەر بەدادوەری ناوەندی و وەزارەتی دادن وەک ئەو دادگایانەی لە یەکە ئیدارییەکانی لامەرکەزیدا هەن.

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی دووەم

(1) K.C. Wheare, Op. Ct page 36.

(2) Op. Cit page 10 .

٣- لەم بارەوە دانەر پشت بەلاپەڕە ٢٠٢- ٢٠٥ی دکتۆرانامەکەی خۆی کە بەزمانی عەرەبی نووسراوە دەبەستێ.

٤- د. منذر الشاوي- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٥- ٢٢٦.

٥- لە بارەی ئەم ڕایەوە بڕوانە: د. محمد هماوندي- الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الادارية والسياسية- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤١ - ٢٤٢

(6) K. C. Wheare, Op. Cit Page 36.

(7) A- V. Dicey, Op. Cit Page 141

(8) G. N. Goshi, Op. Cit Page 22- 23

٩- الدكتور سعد العلوش- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٩.

(10) J. S. Sutton, American Government Page 65- 66.

(11) K. C. Wheare, Op Cit Page 33.

١٢- لە ساڵی ١٩٨٠ هەمواركردنی دووەمی دەستووری سودانی دەرچوو کە سیستەمی لامەرکەزی هەرێمایەتی پێڕەوکرد و هەروەها بەپێی هەمواركردنی ساڵی ١٩٨٣ هەرێمی باشوور دابەش کرا بۆ سێ هەرێم بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ دەزگاکانی ئۆتۆنۆمی لە باشوور.
بۆ ئەوە بڕوانە د. محمد هماوندي- الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الادارية والسياسية- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤٧.

## ئاخافتنی سێیەم

# جیاوازی نێوان فیدرالیزم و سیستەمە کارگێڕییە لامەرکەزییەکان

هەندێ دەوڵەت ، بەتایبەتی دەوڵەتە یەکبووەکان (الموحدة) یان سادەکان بۆ پیادەکردنی وەزیفە کارگێڕییەکانی دەوڵەت پەنا دەبەنە بەر سیستەمی لامەرکەزی Decentral-isation، مەبەستیش لەو سیستەمە ئەوەیە کە لە ژێر سەرپەرشتی و سانسۆری دەسەڵاتی ناوەندیدا، دەستەی یەکەیەکی جیۆگرافی، یان یەکەیەکی ئابووریدا لە میانی بازنەیەکی ناوچەیی یان ئابووریدا لە هەندێ تایبەتمەندی کارگێڕیدا سەربەخۆ دەکرێن، بەواتایەکی دی لامەرکەزی کارگێڕی واتە گواستنەوەی دەسەڵاتی بڕیار وەرگرتن بۆ دامودەزگایەکی دی جیا لە کارمەندانی (عمال)ی دەسەڵاتی ناوەندی[١]ی سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕی شێوازێکی ڕێکخستنی کارگێڕییە لەسەر ئەو بناغەیەی کە لایەنێک لە وەزیفەی کارگێڕی بەدەستەکانی لامەرکەزی ناوچەیی و ئابووری و پیشەیی دەسپێردرێ ئەو دەستانە سەربەخۆییەکی پێویستیان پێ دەدرێ بۆ بەڕێوەبردنی فەرمانی کارگێڕی خۆیان، بەڵام لە چوارچێوەی پەیوەندییەکی یاسایی دیاریکراو لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی کە تەبەعییەتێکی ڕێژەییان لە ڕێگەی چاودێری کارگێڕییەوە بەدەسەڵاتی ناوەندییەوە هەیە[٢].

کەسایەتی مەعنەوی سەربەخۆ پێک دەهێندرێ و هەندێ تایبەتمەندی کارگێڕی پێ دەدرێ جا یان لەسەر بناغەی ناوچەیی دەبێ کە یەکەی کارگێڕی خۆجێین وەک پارێزگاو قەزاو ناحیە، کە ئەم ڕێکخستنە پێی دەگوترێ لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی، یاخود لەسەر بناغەی ڕێکخستنی ئابووری دەبێ، کە کەسایەتییەکی یاسایییە دامەزراوی گشتی و ئابووری دەدرێ و ڕێگەی پێ دەدرێ هەندێ تایبەتمەندی کارگێڕی و چالاکی نواندن بەپلەیەک لە سەربەخۆیی پیادە بکات، بەمەش دەگوترێ لامەرکەزی بەرژەوەندیی (المرفقية) یان دامەزراوەیی دەوڵەت، هەروەها شێواز، یان ڕێکخستنی سێیەمیش هەیە بۆ دابەشکردنی تایبەتمەندییەکان وەک ئەوەی پێی دەڵێن دامەزراوە پیشەییەکانی، وەک سانديکا.

ئەوەی لە بواری ئەم تۆژینەوەیەدا لای ئێمە گرنگە... شێوازی یەکەمە واتە لامەرکەزی ناوچەیی[٣] ، کە بەیەکێک لە ڕوخسارەکانی دیموکراسی کارگێڕی دادەنرێ و مەبەست تێیدا دابەشکردنی وەزیفەی کارگێڕییە لە نێوان دەوڵەت کە حکومەتی ناوەندی

نوێنەرایەتی دەکات لە لایەک و یەکەی کارگێڕی خۆجێیی لە لایەکی دیکەوە، بەجۆرێک دەسەڵاتی ناوەندی ئەرکی دابینکردنی گشت پێداویستییەکانی میللەت دەگرێتە ئەستۆ و تەواوی ڕۆڵەکانی گەل لە سەرتاسەری وڵات سوودی لێ وەردەگرن، ئەرکی دابینکردنی پێداویستە خۆجێییەکانیش دەخاتە ملی دامەزراوە کارگێڕییە خۆجێییەکان، واتە تەنیا خەڵکی ناوچەیەکی جیۆگرافی دیارکراو سوودی لێ وەردەگرن[٤]، سیستەمی لامەرکەزی دوو لایەن بەخۆوە دەگرێ، یەکەمیان یاساییە و بریتییە لە پارچە پارچەکردنی دیاردەی ناوەندیەتی (الترکیز) لە پیادەکردنی دەسەڵاتی گشتی لە دەوڵەتی تازەدا، دووەمیش لایەنی سیاسییە کە خۆی لە ئامانجی لامەرکەزی ناوچەییدا دەنوێنێ و بریتییە لە فراوانکردنی چەمکی دیموکراسی بەو پێیەی کە دەسەڵاتی بڕیار وەرگرتن لە ناوەندەوە دەگوازێتەوە بۆ ئەنجوومەنی خۆجێیی ئەو ئەنجوومەنانەی کە لە لایەن دانیشتوانی ناوچەکان خۆیانەوە هەڵدەبژێردرێن، بەمەش پرەنسیپی بەشداریکردنی گەل لە پیادەکردنی دەسەڵات بەشێوەیەکی عەمەلی بەرجەستە دەبێت، هەروەها بەشداریکردن لە ئەنجوومەنە خۆجێییەکان بەمەشقێکی باش و شارەزا بوون دادەنرێ تا ئامادە بۆ ئەندامێتی لە ئەنجوومەنەکانی یاسادانانندا[٥].

بەڵام ئەم شێوازەی پیادەکردنی کارگێڕی لە لامەرکەزی ناوچەییدا خۆدەنوێنی، پێویستە زیان بەپێگەو یەک پارچەیی یاسایی و سیاسی دەوڵەت نەگەیەنێ[٦]، بۆیە نابێ سەربەخۆیی یەکەکانی کارگێڕی خۆجێیی سەربەخۆییەکی تەواو، یان گشتی، یان فرە بێ، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی لەنێو سنووری ئەو دەوڵەتەی پێڕەوی لە سیستەمی لامەرکەزی دەکا دەوڵەتانی نوێ نەشونما بکەن، ئەمەش لەگەڵ پرەنسیپی یەکبوویی و سەروەری دەوڵەتدا یەکدی ناگرێتەوە، بۆیە پێویستە سەربەخۆیی ئەو دامەزراوانە لە چوارچێوەیەکی یاساییدا پابەندبن و لە ژێر سانسۆر و سەرپەرشتی حکوومەتی ناوەندیدا تایبەتمەندییە کارگێڕییەکانی خۆیان پیادە بکەن، بەڵام بەمەرجێک ئەو سەرپەرشتی و سانسۆرکردنە سنووری پێویست نەبەزێنێ، ئەمەش بۆ ئەوەیە پارێزگاری لە بوون و سەربەخۆیی ئەو یەکە ناوچەییانە بکرێ.

**یەکەم: ڕەگەزەکانی لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی:**

مەبەست لە لامەرکەزی ناوچەیی ئەو کۆڵەگە، یان بنەمایانەن کە پێویستن بۆ دانانی ئەم سیستەمە و دەشکرێ بگوترێ سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕی لەسەر سێ ڕەگەزی سەرەکی بنیات دەنرێ[٧] کە ئەمانەن:

١- بوونی بەرژەوەندی خۆجێی جیاواز.

٢- سەربەخۆیی دەستەکانی لامەرکەزی لە ڕووی کارگێڕی و داراییەوە لە دەسەڵاتی ناوەندییەوە.

٣- سانسۆری کارگێڕی.

**١- بوونی بەرژەوەندی خۆجێی جیاواز**

لە هەر دەوڵەتێکدا دوو جۆر بەرژەوەندی هەیە یان ئەوەتا گشتییە و بێ جیاوازی لە نێوان ناوچەیەک و ناوچەیەکی دیکەدا هەموو هاوولاتیان دەگرێتەوە، یانیش بەرژەوەندی خۆجێییەو پەیوەندیدارە بەدانیشتوانی هەرێمێک یان ناوچەیەکی دیاریکراوەوە، هەرگیز ناکرێ بڵێین لە وڵاتێکدا تەنیا یەک بەرژەوەندی هەیە و فرە لایەنی تێدا نییە وەک ئەوەی ئەو دەوڵەتە تەنیا یەک نەتەوە و یەک ئایین و یەک زمان و یەک ڕۆشنبیری هەبێ، چونکە لەبەر ڕۆشنایی پێکهاتەی ئاڵۆزی دانیشتوان لە دەوڵەتە جیاجیاکان ئەمە بەدەگمەن دەبێ- هەروەها مەزندە ناکرێ لە هەموو شوێنەکانی وڵات هاوولاتیان گرنگی بەیەک جۆرە بەرژەوەندی بدەن، کە پەرژەوەندی گشتی نیشتمانییە، چونکە ئەو خەڵکە بەسەر چەند هەرێمێکی لێکجودا دابەشدەبن، هەڵبەتە ئەو دابەشبوونە ناوچەییە جیۆگرافییەش وا دەکات لە پاڵ بەرژەوەندی گشتی یان نیشتمانییان کە هەموو دانیشتوانی وڵات تێیدا هاوبەشن، بەرژەوەندی خۆجێیش لای دانیشتوانی هەرێمە جیاجیاکان نەشونما بکات.

داننانی یاسادانەر بەو بەرژەوەندییە خۆجێیانە دەبێتە هاندەرێک کە ڕۆڵەکانی ئەو هەرێمە، یان ناوچە جیاجیایانە ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەو بەرژەوەندییانە بگرنە ئەستۆ و بەخۆیان پێداویستییەکانی هەرێمی خۆیان دابین بکەن، ئەو بڕیاردانەش لە دەستوور یان بەهۆی یاساوەوە دەبێ[٨]، بۆیە دیارکردنی بەرژەوەندییەکان و مەزندەکردنی ئەو شێوازە کارگێڕییەی گەرەکیەتی... دەسەڵاتی ناوەندی یان دەستە خۆجێیەکان دیاریان ناکەن، بەڵکە لە ڕێگەی ڕێکخستنکاری بەپێی یاسا و یاسادانەر ئەم بەرژەوەندییانە دیاری

دەکات و دەستووریش هەندێ هێڵی گشتی دەگرێتەخۆ، تا یاسادانەر لەم بوارەدا ڕەچاویان بکا[٩].

**٢- دەستەکانی لامەرکەزی ناوچەیی لە ڕووی کارگێڕی و داراییەوە سەربەخۆ دەبن**

دانپیانانی یاسا دانەر بۆ بەرژەوەندییە خۆجێیەکان بەس نییە بۆ پێکەوەنانی لامەرکەزی ناوچەیی، بەڵکە ئەمە بەرایییەکە بۆ ڕەگەزێکی گرنگتر ئەویش ڕێکخستنی ئەنجوومەن و دەستەی کارگێڕی سەربەخۆیە لە ڕووی کارگێڕی و داراییەوە، کە وەک ئیرادەیەکی پێویست بۆ تەعبیرکردن لەو بەرژەوەندییانە و پیادەکردنی ئەرکەکانی بۆ دابینکردنی پێداویستی خۆجێی خۆی دەنوێنێ[١٠]. پێویستە ڕۆڵەکانی ئەو ناوچەیەی کە یەکەیەکی کارگێڕی لێ پێکدێ ئەرکی بەڕێوەبردن و بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکان بگرنە ئەستۆ، بەمەش هەر ناوچەیە دەسەڵاتێکی خۆجیی سەربەخۆ و تایبەتمەندی لە ڕووی پیادەکردنی لایەنێکی لە فەرمانی کارگێڕیدا دەبێ و دەبێتە هۆی دابینکردنی پێویستییەکانی ئەو ناوچەیە[١١]، بۆ نموونە دەبینین مادەی(٨)، بڕگەی (ب)ی دەستووری کاتی عێراق لە ساڵی ١٩٧٠دا دەڵێ (کۆماری عێراق دابەش دەکرێتە سەر چەند یەکەی کارگێڕی و لەسەر شێوەی کارگێڕی لامەرکەزی ڕێکدەخرێ) هەروەها یاسای پارێزگاکانی ژمارە ١٥٩ی ساڵی ١٩٦٩ لە عێراق سەبارەت بەدەستنیشانکردنی یەکە کارگێڕییەکان نووسیویەتی کە ئەمانەن:-

١- ناوچە.

٢- پارێزگا.

٣- قەزا.

٤- ناحیە[١٢].

یاسا دانەر (المشرع) کەسایەتی مەعنەوی دەداتە یەکە خۆجێیەکان، چونکە لە ڕێگەی ئەو کەسایەتییەدا دەیەوێ سەربەخۆیی خۆی بهێنێتە دی و کەسایەتی یاسایی نوێ لە پاڵ دەوڵەتدا دێنە گۆڕێ هەرچەندەش تەنیا لە نێو سنووری خۆجێی خۆیاندا کاردەکەن[١٣] بۆ نموونە دەبینین یاسای پارێزگاکان کە ئاماژەمان بۆ کرد، کەسایەتی مەعنەوی دەداتە یەکە کارگێڕییەکان لە عێراقدا[١٤] هەروەها یاسای کارگێڕی شارەوانییەکان ژمارە ١٦٥ی ساڵی ١٩٦٤ لە عێراقد کەسایەتی مەعنەوی دەداتە ئەنجوومەنی شارەوانی[١٥] وەک لە هۆیە پێویستەکان (الأسباب الموجبة) هاتووە (پێویستە یاسای کارگێڕی شارەوانییەکان

ژمارە ٨٤ی ساڵی ١٩٣١ بەیاسایەکی دی وا بگۆڕدرێ کە لەگەڵ بارودۆخی شۆڕش و ئامانجەکانیدا بگونجێ بۆ ئەوەی بوار بدرێتە هاووڵاتیان لە بەڕێوەبردن و پەرەپێدان و ڕابوونی دامەزراوە خۆجێیەکانی خۆیاندا بەشداری بکەن و سەربەست و ئازادبن و کاری خزمەتگوزاری شارەوانی ڕاپەڕێنن هەروەها بۆ ئەوەیە کاروبار و بەرژەوەندی خۆجێیی هاووڵاتیان ئاسانتر ڕاپەڕێندرێ و ئامادە بکرێن تا بەشداری ئەرک و بەرپرسێتی فراوانتر بکەن، جگە لەمەش ئەنجوومەنەکانی شارەوانی سەربەخۆیی خۆیان دەدرێتێ و دەسەڵاتێکی فراوانتریان دەبێ بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شارەوانییەکان، ئەم یاسایەی دانراوە گرنگترین پرەنسیپەکانی کە یاسادانەری نوێ لە دەوڵەتە دیموکراتییەکان لە خۆی دەگری ڕەچاودەکا و ئەمەش لە ڕێگەی بەشداری پێکردنی هاووڵاتیان بۆ بەڕێوەبردنی شارەوانییەکان و دەسەڵاتی ناوەندیش تەنیا بڕیارەکانی جێبەجێ دەکا).

بەڵام بابەتی چۆنیەتی پێکەوەنانی دەستە خۆجێیەکان، کە ئاخۆ کامیان باشترە، لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە پێکبهێندرێن، یان لە ڕێگەی دامەزراندنەوە؟ یاخود هەردووکیان پێکەوە، هێشتا مایەی ناکۆکی نێوان یاسا زانەکانی کارگێڕییە.

هەندێک لە یاسازانەکان وای بۆ دەچن بەبێ گرتنەبەری ڕێگەی هەڵبژاردن، سەربەخۆیی یەکە لامەرکەزییەکان نایەتەدی، د. شاب تۆما مەنسور لەم بارەیەوە دەڵێ: «ئەگەر تێکڕا وای بۆ دەچن کە سەربەخۆبوونی ئەندامانی دەسەڵاتی لامەرکەزی مەرجێکی بنەڕەتی پێکەوەنانی لامەرکەزی کارگێڕییە، ئێمە لایەنگیری ئەوانەین کە دەڵێن ئەو سەربەخۆییە ڕاستەقینە نابێ، ئەگەر ئەندامانی دەسەڵاتی لامەرکەزی هەڵنەبژێردرێن، هەر قسەیەکیش پێچەوانەی ئەمە بێ، دەبێتە هۆی بەفیرۆدانی بیرۆکەی دیموکراسی لە کارگێڕی و ڕماندنی ئەو بیرۆکە سەرەکییەی کە دەستە خۆجێیەکان لە پێناویاندا دانراون[١٦] هەروەها د. مونزیر شاوی لایەنگری ڕێگەی هەڵبژاردنی دەسەڵاتە خۆجێیەکانەو دەڵێ: (پەیوەندی بنەڕەتی ئەو بابەتە لە ڕاستیدا پەیوەندی خەڵکی ناوچەکەیە بەفەرمانڕەوایی خۆیان، بۆ ئەوەی ناوچەکەش کاروباری خۆی بەڕێوە ببات، پێویستە ئەمە لە لایەن دەستەیەکەوە بێ کە لە ناوچەکە هەڵدەبژێردرێن، نەک لە لایەن کەسانێکەوە بەسەریاندا بسەپێندرێ با ئەو کەسانەش خەڵکی ناوچەکەبن)[١٧].

هەر لەم بارەیەوە د. ئیبراهی عەبدولعەزیز شەیحا دەڵێ: (سەبارەت بەپێکەوەنانی هەر یەک لە ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەنجوومەنی خۆجێیەکان ڕاستییەکی سیاسی هەیە و دەبێ

وەکو یەک پشتی پێ ببەسترێ، ئەویش پێویستی بەبەشداریکردنی گەلە لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیدا، جا ئەمە لە بواری جێبەجێکردن و کارگێڕیدا.

ئەم ڕاستییەش پێویستی بەپابەندبوون بەدیموکراسییەوە هەیە بەزادەکی و بەواتاکەیەوە بەرجەستە دەبێ، ئەمەش بەسەرماندا دەسەپێنێ بۆ پێکەوەنانی دەستە خۆجێییەکان شێوازی هەڵبژاردن بگرینە بەر![18].

فیدایش وای بۆ دەچێ کە (هەڵبژاردن وەسیلەیەکی هونەری بێ وێنەیە بۆ زامنکردنی سەربەخۆیی ئەو دەزگایانەی ڕاسپێردراون بەرژەوەندییەکان بەڕێوەببەن[19].

د. خالد قەبانی لەم بوارەوە دەڵێ (ئەگەر دەرفەت بدرێ خەڵکی ناوچە خۆجێیەکان لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە نوێنەری خۆیان دیاری بکەن، ئەمە ڕوخسارێکی دیموکراسییە لەسەر ئاستی خۆجێیی و بەدەنگەوە هاتنی هەستی ئەو ئازادییە کە لەگەڵیدا دەبێ[20]، ئەم ڕایە لە لایەن یاسازانەکانی ئینگلیزیشەوە لایەنگیرییەکی گەورەی لێ دەکرێ بەو پێیەی کە سیستەمی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ بناغەو سەرچاوەی لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەییە، هامپتۆن Hampton وای دەبینێ کە پەنا بردنە بەر شێوازی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ بۆ دامەزراندنی دەزگا خۆجێیەکان، بەڵگە و نیشانەی سەربەخۆبوونی دەستەکانیەتی، هەروەها ستیورات Stewartیش بوونی فەرمانڕەوایی خۆجێیی بەشێوازی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ دەبەستێتەوە[21].

بەڵام ڕایەکی دی هەیە لایەنگیری لە ڕێگەی دامەزراندنی (تعیین) ئەندامانی دەستە خۆجێیەکان دەکات و دەڵێ: (هیچ لەمپەرێک نییە ڕێ لەوە بگرێ کە سیستەمی لامەرکەزی بێتە دی ئەگەر ئەو ئەندامانە لە لایەن دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنەوە دابمەزرێن بەمەرجێ لە خەڵکی ناوچەکەبن)[22]. بەڵام ئەم ڕایەش بەتەواوی ڕێگەی هەڵبژاردن ڕەت ناکاتەوە، لەگەڵ ئەوەی پێی وایە لە هەموو کات و شوێنێکدا وەک وەسیلەیەکی پێکەوەنانی دەستە خۆجێیەکان بەکەڵکی پێڕەوکردن نایە، چونکە وای بۆ دەچن کە ئەگەر گەل گەیشتە ڕادەیەکی باشی تێگەیشتنی گشتی و لە کاروباری گشتی خۆی گەیشت ئەو کات ڕێگەی هەڵبژاردن دەگرێتە بەر، ئەگەر گەلیش هێشتا پێ نەگەیشتبوو، ئەوا وەسیلەی پێکەوە کۆکردنەوەی هەڵبژاردن و دامەزراندن پێڕەو دەکا، کەچی دەتوانین بڵێین لە گۆڕەپانی پراکتیکیدا سەخت و گرانە ئەم ڕێڕەوە پیادە بکرێ، ئایا چۆن پێگەیشتنی گەل دەپێورێ و ئەو پێوەرەش چییە لەم بوارەدا پشتی پێ دەبەسترێ؟

کەچی ڕۆجیە پۆنار وای بۆ دەچێ کە دەکرێ مەزەندەی پێکهێنانی ئەو لامەرکەزییە بکرێ کە هەڵبژاردن ناکاتە بناغەو لەسەر بناغەی دامەزراندن دەبێ، بەڵام دامەزراندنەکە لە نێو خەڵکی ناوچەکە دیاری دەکرێن، نەک فەرمانبەرانی دەوڵەت، لەگەڵ ئەوەشدا پۆنار ناوی لەم جۆرە ناوە: لامەرکەزی ئۆتۆریتایری Autoritairi ئەمەش بەپێچەوانەی لامەرکەزی دیموکراسی دادەنرێ[٢٣]. هەندێ ڕا هەن دەیانەوێ ڕێگەی کۆکردنەوەی نێوان هەڵبژاردن و دامەزراندن بگرنە بەر، بەپێی ئەو ڕایەش گوایە دەکرێ لە نێوان ئەندامانی دەستەی کارگێڕی خۆجێیی ئەندامی دامەزراویش لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە هەبێ، گوایە ئەم تێکەڵکردنەش ناهێڵێ وەزیفەی کارگێڕی بەتەواوی لێک هەڵبوەشێ، هەروەها دەوڵەت لە ڕێگەی ئەندام و دامەزراوەکانی خۆی لەو دەستانەدا دەتوانێ پارێزگاری لە یەکبووی شێواز و بنەماکانی پیادەکردنی کارگێڕی لە هەموو دەستە سەربەخۆکان بکات کە خودان کەسایەتییەکی مەعنەوین، هەروەها ئەوەشی دەخرێتە سەر کە دامەزراندنی بەشێک لە هونەرکار و پسپۆڕەکان، ئەوانەی کە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە نەگەیشتوونەتە ئەو ئەنجوومەنانە بەشێک لە کەم و کورتییەکان پڕ دەکاتەوە[٢٤].

پشتی ئەوەی بیروڕا جوداجوداکانمان لەم بارەوە خستە ڕوو لەگەڵ ئەوەی دان بەوەدا دەنێین کە بۆ پێکهێنانی ئەنجوومەنە خۆجێیەکان بەهەڵبژاردن پیادەکردنێکی پێویستی دیموکراسییە، کەچی ئێمە لایەنگری دوا ڕا دەکەین کە دەڵێ هەردوو ڕێگەی هەڵبژاردن و دامەزراندن تێکەڵ یەکتر بکرێن، چونکە ئەم وادەکات سوود لە هەردوو ڕێگە وەربگیرێ و ئەو کەموکورتیانەش کەم دەکاتەوە کە بەهۆی گرتنەبەری ڕێگەیەکیان دروست دەبێ، چونکە ڕێگەی هەڵبژاردن، لەگەڵ ئەوەی وەسیلەیەکە لەسەر ئاستی وەزیفەی کارگێڕیدا ڕەنگ لە هزری دیموکراسی دەداتەوە و دەبێتە هۆی ئەوەی ڕۆڵەکانی ئەو ناوچەیە بەشداری لە فەرمانڕەوایی خۆجێیی بکەن، بەڵام لە کەموکورتی بەدەر نییە، لە پێشانەوەش ڕەنگە لە ڕووی وەزیفەی کارگێڕییەوە خەڵکانێک هەڵبژێردرێن شارەزاییان نەبێ و کاردانەوەیەکی خراپ بکاتە سەر قەبارە و چۆنیەتی کاری کارگێڕی، لە بەرامبەر ئەمەشدا ئەگەر بەتەنیا پەنا ببردرێتە بەر دامەزراندن، دەبێتە هۆی ئەوەی بیرۆکەی دیموکراسی لە بەڕێوەبردندا دابڕمێ و هەموو بەهایەکی سەربەخۆبوونی دەسەڵاتی خۆجێییش بەفیڕۆ بڕوات، بەمەش ئەو هیوایەی لە دوای پێکهێنانی لامەرکەزی کارگێڕی چاوەڕوان دەکرا لە بەین دەچێ، بۆیە پێکەوە کۆکردنەوەی هەردوو ڕێگەکە چارەسەرییەکی مامناوەندییە و خۆ لەو کەموکورتیانە دەپارێزێ کە لە پێڕەوکردنی یەکێک لەو دوو شێوازەدا هەیە، بەڵام

گرتنەبەری شێوازی پێکڤە کۆکردنەوە... بەڕای ئێمە دەبێ مەرجدار بێت بەوەی کە ژمارەی هەڵبژێردراوەکان زێتر بێ و بەشێوەیەک ژمارەی ئەندامە دامەزراوەکان نابێ لە ٢٥٪ پتربێ، واتە نابێ لە چواریەکی ژمارەی ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنانە پتربن، بۆ ئەوەی ڕێگەنەدەن دەوڵەت دەستیان بەسەردا بگرێ.

٣- سانسۆری کارگێڕی:[٢٥].

ئەگەر دیموکراسی کارگێڕی بەپێی دەستوور یان یاسا پێویستی بەوە کرد بڕیار بدرێ دەستە لامەرکەزییەکان سەربەخۆییەکی تەواو ئەسیلییان هەبێ و سەربەخۆیی ڕەها بدرێتە ئەو دەستانە بۆ بەڕێوەبردنی دەزگا گشتی و کاروبارە خۆجێکان، ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی هەڕەشە لە یەک پارچەیی سیاسی و یاسایی دەوڵەت بکا و دەوڵەتۆکەی نوێش لەناو دەوڵەت دروست بکا[٢٦] ئەوەش وا پێویست دەکا کە سەربەخۆیی ئەو دەستانە سەربەخۆییەکی ڕێژەیی بێ و جۆرێک لە سەرپەرشتی و سانسۆری ناوەندی بەسەر دەستە لامەرکەزییە ناوچەییەکانەوە هەبێ، ئەمەش لە لایەک پێداویستییەکانی بەڕێوەچوونی کارگێڕی و کاری سیاسی لە دەوڵەت دابین دەکا و باشترین بەڕێوەبردنی دەزگا گشتییەکانی لامەرکەزی زامن دەکات، لە لایەکی دیکەشەوە یەکبوونی دەوڵەتی یاسایی و یەک شێوازی کارگێڕییەکە دەپارێزێ[٢٧]، کەچی دەبێ جیاوازی لە نێوان ئەم سانسۆرە کارگێڕییە و لە نێوان دەسەڵاتی سەرۆکایەتی (زنجیرەیی) بکەین کە لە سایەی سیستەمی (کۆنەکراوەی) کارگێڕی یان ناوەندی نەکردنی کارگێڕی Deconcentration[٢٨]دا هەیە، چونکە لەو کاتەی کە سانسۆری کارگێڕی لە سایەی سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕیدا پیادەدەکرێ، چوارچێوەکەی سنووردارە، کەچی پرەنسیپی دەسەڵاتی زنجیرەیی (سەرۆکایەتی) لە سایەی سیستەمی (کۆنەکراوەی - اللاحصري) کارگێڕیدا باو و زاڵە، (کۆنەکراوەی) کارگێڕی... کە شێوەیەکە لە شێوەکانی ناوەندی کارگێڕی بریتییە لەوەی کە فەرمانبەران بەشێوەیەکی هەرەمی (قوچەکی) دابەش دەکات و پایەی کارگێڕی هەیە، بەجۆرێک کە ئەو فەرمانبەرەیی پلە و پایەی بەرزی هەیە دەسەڵاتی بەسەر فەرمانبەرانی خوارووی خۆیدا دەبێ و پێی دەڵێن دەسەڵاتی سەرۆکایەتی و زنجیرەیی، کە سەرۆکی فەرمانگە دەتوانێ فەرمان بدا و دەبێ فەرمانبەرانیش پابەندی فەرمان و ئاراستەکردنی ئەوبن[٢٩] چونکە وەک ئەرکی سەرەکییان دەبێ پابەند و گوێڕایەڵی سەرۆکەکان بن هەروەها سەرۆکی فەرمانگە مافی ئەوەشی هەیە ئەگەر فەرمانبەرەکانی پابەندی

فەرمانەکانی ئەو نەبن سزایان بدات، ئەمەش وا دەکات چەند فەرمانبەر پلەو پایەکەی نزم بێ، زێتر دەبێ گوێڕایەڵ و پابەندی سەرۆک بێ.

کەچی لە سایەی لامەرکەزی کارگێڕیدا... لەگەڵ ئەوەی دەستەکانی لامەرکەزی دەبێ ملکەچی سەرپەرشتی و سانسۆری دەسەڵاتی ناوەندی بن. بەڵام پەیوەندی نێوانیان پەیوەندییەکی واتە پاشکۆیی نییە وەک ئەوەی لە (للاحصري)ی کارگێڕیدا باسمان کرد، ئەمە لە لایەک لە لایەکی دیکەوە دەسەڵاتی سەرۆکایەتی بێ ئەوەی پێویستی بەدەقی یاسایی دیاریکراو هەبێ کاری خۆی پیادە دەکات و ئەمەش بەرێسایەکی گشتی سیستەمی کارگێڕی ناوەندی دادەنرێ کە داوا دەکات کاروباری گشتی بەچاکی بەڕێوە بڕوات، هەروەها دەسەڵاتێکی فراوانە و وا لە سەرۆک دەکات دەسەڵاتێکی نیمچە ڕەهای بەرانبەر بەفەرمانبەرانی خۆی هەبێ، لە بەرامبەر ئەمەدا دەسەڵاتی سانسۆری کارگێڕی بەسەر دەستە خۆجێیەکان سنووردار وابەستەیە... بەمەش دەبێتە دەسەڵاتێکی ڕیزپەڕ (ئیستثنائی)[٣٠] چونکە ئەوەی بەخیلافی پێوانەکە (مقیاس) سەلمێنرا لە سنووری دەقێکی یاساییشدا نەبێ، پیادە ناکرێ، لەگەڵ ئەوەی دەستە لامەرکەزییەکان بۆیان هەیە سەبارەت بەو کارانەی کە پێیان وایە بەپێچەوانەی یاسایە لە دەسەڵاتی ناوەندی بپرسنەوە، کەچی لە چوارچێوەی (کۆنەکراوەی) کارگێڕیدا... زنجیرەکانی خوارەوە ناتوانن لە زنجیرەکانی سەرووی کارگێڕی بپرسنەوە[٣١] لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەی خستمانە ڕوو مانای وانییە فەرمانبەر هیچ مافێکی نییە بەرامبەر زوڵمی ئەو بڕیارانەی لە لایەن سەرۆکی کارگێڕییەوە دژی دەرکراون، بەڵکو دەتوانێ لە لای سەرۆکی باڵاتر یان دادگەی تایبەتی کارگێڕی تانە (طعن) یان لێ بگرێت[٣٢] هەر چییەک گوتراوە سەبارەت بەو شێوە و شێوازانەی بۆ سانسۆری کارگێڕی لەم بوارەدا پەنای بۆ دەبەن[٣٣] و هەرچەندە جۆری سیستەمە سیاسییەکانی فەرمانڕەوایی لە دەوڵەتە جۆراوجۆرەکانیشدا دەگۆڕێ و شێوەی دی وەردەگرێ، بەڵام ئەو سانسۆرە لە دوو تەوەری بنەڕەتی دەخولێتەوە کە ئەمانەن:

أ- سانسۆری سەر دەستە خۆجێییەکان.

ب- سانسۆری سەر کاری دەستە خۆجێییەکان.

أ/ سانسۆری سەر دەستە خۆجێییەکان:

ئەم سانسۆرە بەدوو ڕێگە پیادە دەکرێ کە دامەزراندن و هەڵوەشاندنەوەیە... لەمەودواش لێیان دەدوێین:

**یەکەم- دامەزراندن (التعیین):**

وەک ئاساییە دەسەڵاتی ناوەندی مافی ئەوەی هەیە، سەرۆکی یەکە کارگێڕییەکان و هەندێ ئەندامی دەستەکانی خۆجێیی دابمەزرێنێ، ئەمەش دیارترین وەسیلەیە لە میانییەوە دەسەڵاتی ناوەندی سانسۆری کاریگەری خۆی بەسەر ئەنجوومەنە ناوچەییەکاندا دەسەپێنێ، ئەمەش بەهۆی ئەو دەسەڵاتە سەرۆکایەتییەی بەسەر ئەندامە دامەزراوەکاندا پیادەی دەکات و کە دەبنە ئەندامی سەر بەحکوومەتی ناوەندی و لەمیانەی پایەی وەزیفەی کارگێڕیشدا فەرمانبەرانی خۆی سەر بەدەسەڵاتی سەرۆکایەتین و، مافی دەسەڵاتی سەرۆکایەتیشە فەرمانبەرانی خۆی ئاراستە بکات و سەرپەرشتییان بکاو سزاشیان بدات، تا دەگاتە لە کارخستن و دەرکردنیان لە وەزیفە[٣٤] لەم بوارەدا هەندێک نووسیویانە کە (دەسەڵاتی ناوەندی مافی ئەوەی هەیە ئەو کەسە دابمەزرێنێ کە سەرۆکایەتی دەستە دەکات، یان هەندێ ئەندامی دەستەکە دابمەزرێنێ، ئەمەش وەک گوتمان دژ بەسەربەخۆیی کەسە لامەرکەزییەکان نییە[٣٥] و دژ بەچەمکی پرەنسیپی دیموکراسی کارگێڕی نییە، مادام ئەندامانی هەڵبژێردراو لە ئەندامە دامەزراوەکان زۆرترن).

یاسای پارێزگاکان ژمارە ١٥٩ی ساڵی ١٩٦٩ لە عێراق بەم جۆرە سانسۆرەی وەرگرتووە و مافی دامەزراندنی سەرۆکی یەکە کارگێڕییەکانی داوەتە سەرۆکی کۆمار، سەرەڕای ئەوەی کە سەرۆکی ئەو یەکە کارگێڕییانە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنە خۆجێیەکانیش دەکەن، هەروەها لە یاسای عێراقیدا هەیە کە هەندێ ئەندامی دەستە خۆجێیەکان لەنێو فەرمانبەرانی دەسەڵاتی ناوەندی لە ناوچەکە و بەپێی وەزیفەیان لە ڕێگەی دامەزراندنەوە دادەنرێن، لە هەمان کاتدا پلەو شوێنەکەی خۆیان لە پایەی کارگێڕی دەپارێزن و ملکەچی دەسەڵاتی سەرۆکەکانی خۆیان دەبن کە ئەو سەرۆکانە دەشێن سزایان بدەن و لە کاریان بخەن و دەریان بکەن.

**هەڵوەشاندنەوە:**

ڕەنگە سانسۆری سەر دەستە لامەرکەزییە خۆجێییەکان بگاتە سنوورێکی ترسناک کاتێک ماف دەدرێتە دەسەڵاتی ناوەندی ئەنجوومەنە خۆجێییەکان هەڵبوەشێننەوە، یان بە بەشێوەیەکی کاتی لە کاری بخەن و لەبەر ترسناکی کاری هەڵوەشاندنەوە کە دەبینین حکوومەتی ناوەندی لە هەندێ دەوڵەتدا ناتوانن پەنای ببەنەبەر وەک ئینگلتەرا، بەڵکو لە جیاتی ئەمە مافی ئەوەیان هەیە لە بەرامبەر دادگەدا دژایەتی یەکە خۆجێیەکان بکەن،

لەگەڵ ئەمەشدا ئەو دەوڵەتانەی پەناش دەبەنە بەر هەڵوەشاندنەوە لەکاتی پیادەکردندا هەندێ کۆتیان داناوە، لە میسردا یاسا دانەر مەسەلەی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنە خۆجێیەکانی خستۆتە ئەستۆی ئەنجوومەنی وەزیران پاش ئەوەی پارێزگار پێشنیاری دەکا، بەڵام یاسای فەرەنسایی مافی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی پارێزگای بەسەرۆک کۆمار و مافی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی خۆجێیشی بەئەنجوومەنی وەزیران سپارد[٣٦] بەڵام لە عێراقدا لە یاسای پارێزگاکاندا هاتووە کە هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی کارگێڕییە خۆجێییەکان لە دەسەڵاتی سەرۆک کۆمارە، ئەمەش پاش ئەوەی لە لایەن وەزیری نێوخۆوە، پێشنیار دەکرێ، هەروەها لەسەر پێشنیاری وەزیری شارەوانیش دەسەڵاتی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی شارەوانییەکانی دراوە بەئەنجوومەنی وەزیران[٣٧] وا تێبینی دەکرێ هەندێک هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنە خۆجێییەکان و سڕینەوەی بەیەکجارییان تێکەڵ بەیەکدی کردووە[٣٨] لە ڕاستیدا هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئەنجوومەنانە هەرچەندە ترسناکیشن، بەڵام هێشتا ناگاتە پلەی سڕینەوەیان (پووچەڵکردنەوەیان) (إلغاء)، چونکە تەنها بەکێشانەوەی ئەو کەسایەتییە مەعنەوییەی کە بەو ناوچانە دراوە دەکرێ ئەو ئەنجوومەنانە پووچەڵ بکرێنەوە، یان نەمێنن، ئەمەش دەبێ بەپێی یاسا بێ و یاسایەکی تایبەت لەم بارەوە دەربچێ[٣٩].

د. شاب تۆما مەنسور لە میانی ڕەخنەگرتنی لەو هەڵوەشاندنەوەیەی کە یاسای پارێزگاکان ژمارە ١٥٩ی ساڵی ١٩٦٩ بڕیاری لێداوە دەڵێ (دەسەڵاتی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی خۆجێیەکان، بەتوندترین شێوەی سانسۆر دادەنرێ کە دەسەڵاتی ناوەندی بەسەر دەستە خۆجێیەکاندا پیادەی دەکات، بۆیە پێویستە ئەو حاڵەتانە دەستنیشان بکرێن کە تیایدا ئەنجوومەنی یەکە کارگێڕییەکان هەڵدەوەشێنرێنەوە، نەک دەسەڵاتی ناوەندی دەستی کراوەبێ و هەر کاتێ خۆی وای دانا کە مانەوەی ئەو ئەنجوومەنە خۆجێییانە زیان بە بەرژەوەندی گشتی دەگەیەنن، مۆڵەتی پێدراوە پەنا بباتە بەر هەڵوەشاندنەوەیان[٤٠].

**ب- سانسۆری سەر کاری دەستە خۆجێییەکان:**

یاسادانەر لە دەوڵەتە جۆربەجۆرەکاندا مافی بەحکوومەتی ناوەندی داوە، سانسۆر بخاتە سەر کاری دەستە لامەرکەزییەکان، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا دڵنیا بێ کە دەستەکان کاری خۆیان بەچاکی بەڕێوە دەبەن، بەو پێیەش ئەو کارانە شەرعیین و بەپێی یاسایە لە لایەک و لە لایەکی دیکەشەوە لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی نیشتمانی و ناوچەییدا گونجاو و ڕێکەو

دژ بەیەک پارچەیی یاسایی و سیاسی دەوڵەت ناکەوێتەوە، ئەم سانسۆرە لە چەند شێوەیەک خۆی دەنوێنێ کە ئەمانەن:

١- دانپیانان (الاقرار)

٢- پووچەڵکردن (الالغاء).

٣- جێ گرتنەوە (الحلول).

## ١- دانپیانان: (الاقرار)

کاتێک یاسادانەر تا ڕادەیەکی دیاریکراو سەربەخۆیی دەداتە دەستە خۆجێییەکان، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ دەسەڵات و سەلاحییەتیان بۆ بەڕێوەبردنی بەرژەوەندی و کاروباری خۆجێیی ڕەهایە و لێپرسینەوەیان لەسەر نییە، چونکە دەسەڵات هەردەم بەپێی پێویستی کارگێڕی دەدرێ، وەک دەڵێین تا ئەو ئاستەی کە لەگەڵ بەرژەوەندی باڵای دەوڵەت ناکۆک نابێ، پێویستی ڕادەو سنووری دەسەڵاتەکان دیاری دەکا، پێویستە لەسەر یەکە خۆجێییەکان لە زۆربەی هەرە زۆری ئەو سەلاحییەت و تایبەتمەندییانەی کە پێیان سپێردراوە و ڕێگەیان پێدراوە پیادەی بکەن، ڕەزامەندی دەسەڵاتی ناوەندی وەربگرن جا لە ڕێگەی ئیزن وەرگرتن بێ، یان پەسەندکردن، بۆیە ئەو ڕەزامەندی وەرگرتنە یان پێشەکی دەست بەکارکردنەکەی دەستەی خۆجێیی دەبێ کە پێی دەگوترێ ئیزن وەرگرتن، یاخود دوای دەستپێکردنە کارەکە دێت کە پێی دەگوترێ پەسندکردن، ئیزن و ڕوخسەت وەرگرتن دەبێ ڕاشکاوانە بێت، کەچی ئەمە بۆ پەسندکردن مەرج نییە کە دەکرێ (ضمنی) بێ[٤١].

## ٢- پووچەڵکردن(الالغاء)

لە هەندێ حاڵەتدا دەستە لامەرکەزییە ناوچەییەکان تایبەتمەندی دیاریکراوی خۆیان کە بەپێی یاسا دیاری کراوە دەبەزێنن، یان بڕیاری وا وەردەگرن لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا ناکۆک دەبێ، بۆیە تا کاری وا ڕوونەدات ماف دەدرێتە دەسەڵاتی ناوەندی ئەو یاسایانە پووچەڵ بکاتەوە، یان ڕەت بکاتەوە کە یاسایی نین، بەمەش دەگوترێ سانسۆری مەشروعییەت، هەروەها مافی هەیە ئەو بڕیارانە ڕەت بکاتەوە کە بە بەرژەوەندی گشتی و باڵای وڵات ناکۆکن، بەمەش دەگوترێ سانسۆری گونجاندن[٤٢].

جێگرتنەوە

هەندێ ئەرک و پرس بەدەستە خۆجێییەکان دەسپێردرێن، بەڵام وا دەبێ دەستەکان

کەمتەرخەمی دەکەن، یان ئەو ئەرکانە بەپێی یاسا بەجێ ناگەیەنن، بۆیە یاسادانەر ماف دەداتە دەسەڵاتی ناوەندی لە جیاتی دەستە خۆجێییەکان ئەو ئەرکانە ڕاپەڕێنێ، بەمەش دەگوترێ جێگرتنەوە (الحلول)، ئەو تایبەتمەندییەی دەسەڵاتی ناوەندی جێبەجێی دەکات ترسناک و لە باری ئاسایی بەدەرە، بۆیە پێویست دەکا بەپێی دەقێکی یاسایی بێت و نابێ دەسەڵاتی ناوەندی بێ ئەم دەقە یاساییە هیچ بکات، بەڵام کە دەقی یاسایی هەبێت داوا لە دەستەکان دەکرێ ئەو ئەرکانە جێبەجێ بکەن، کاتێک نەکرا، دەسەڵاتی ناوەندی، بەو پێیەی ئەرکی ڕاپەڕاندنی یاسایە، بۆ بەجێگەیاندنی ئەو کارە جێگەی دەستەی خۆجێیی دەگرێتەوە، بەواتایەکی دی پەنا بردنە بەر ئەو ڕەفتارە پێویستی بەڕوخسەتی ڕاشکاوانەی یاسایی هەیە و دەبێ ئیسپاتیش بێ کە دەستە خۆجێییەکان کەمتەرخەم بووینە(٤٣).

هەندێک دەڵێن «جێگرتنەوە» لەگەڵ هەردوو پرەنسیپی بنەڕەتی سیستەمی لامەرکەزی ناوچەیی هاودژە کە یەکەمیان مافی دەستپێشخەری خۆجێییە و دووەمیش دەسەڵاتە ناوچەییەکان باشتر بەگرفت و پێداویستییەکانی یەکە خۆجێیەکانی خۆیان دەزانن و ئاگادارن(٤٤) بەڵام دەکرێ بێژین ئەم ڕەخنەیە لە جێی خۆی نییە، چونکە لە پاڵ ئەوەی باوەڕمان بەوە هەیە کە دەسەڵاتی ناوچەیی مافی دەستپێشخەری هەیە و ئەویش لە خەڵکی دی باشتر لە کاروباری ناوچەکەی شارەزایە و ئەم دوو پرەنسیپەش بناغەی بیرۆکەی لامەرکەزی ناوچەیین، کەچی ئەگەر دەسەڵاتی ناوچەیی وەزیفە و ئەرکی خۆی بەپێی یاسای دیاریکراوی خۆی بەجێ نەگەیەنێ و کەمتەرخەمی و کەموکورتییەکانی لەو بوارەدا ئیسپات بێ دەبێ چارە چی بێ؟ ئایا پێداویستە ناوچەییەکان بمێننەوە نەهێنرێنە دی؟ لێرەدا هیچ گومانی تێدا نییە لە لایەک جێگرتنەوەی لەو حاڵەتەدا دەبێتە باشترین ڕێگە بۆ هێنانەدی و تێرکردنی پێداویستەکانی خەڵکی ناوچە و لە لایەکی دیکەش هانی دەستە خۆجێییەکان دەدات لە بەجێگەیاندنی ئەرکە بەپێی یاسا دەستنیشانکراوەکانیان دوانەکەون.

## دووەم- جیاوازی نێوان فیدرالی و لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی:

لەمیانەی ئەوەی دەربارەی سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی پێشکەشمان کرد، ڕوون دەبێتەوە کە ژمارەیەک خاڵی هاوبەش لە نێوان لامەرکەزی و فیدرالیدا هەیە و هەردووکیان لەسەر بناغەی بوونی یەکەی ناوچەیی پێکدەهێنرێن و دەسەڵاتێکی

دیاریکراو بەخۆیان پیادە دەکەن، لە هەمان کاتیشدا ژمارەیەک خاڵی جەوهەری هەن هەردوو سیستەمەکە لێک دوور دەخەنەوە لەوانە:

١- ئەو دەوڵەتانەی لە دەوڵەتی فیدراڵیدا ئەندامن یەکەیەکی سیاسی سەربەخۆن، کەچی ئەو ناوچانەی کە لامەرکەزییان هەیە، تەنیا بەشێک، یان یەکەیەکی کارگێڕی سەر بەدەوڵەتی یەکبوون.

٢- هەر دەوڵەتێک لە دەوڵەتانی ئەندام لە یەکێتی فیدراڵیدا دەستووری تایبەتی خۆی هەیە، واتە ڕێکخستنی خۆی و سەربەخۆیی دەستووری خۆی هەیە و مەودای ئەمەش لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی دی جودایە[٤٥]، بۆیە لە دەوڵەتی فیدراڵیدا بەپێی ژمارەی دەوڵەتە ئەندامەکان دەستووری جیاجیاش هەیە، کەچی لە دەوڵەتی لامەرکەزی تەنها یەک دەستوور هەیە.

٣- دەوڵەتە ئەندامەکان لە پێکەوەنانی ئیرادەی دەوڵەتی فیدراڵی و پیادەکردنی دەسەڵاتی یەکێتییەکە لە ڕێگەی نوێنەرەکانیان لە ئەنجوومەنی باڵا کە بەشێوەیەکی یەکسان هەموو لا بەشداری دەکەن، بەڵام لە سیستەمی لامەرکەزیدا یەکە خۆجێییەکان لە دەسەڵاتی ناوەندیدا بەشدارنین.

٤- هەڵبژاردنی ئەندامانی دەستە خۆجێییەکان گرنگترین بناغە و کۆڵەگەی لامەرکەزییە، بەڵام لە فیدراڵیدا سەبارەت بەدەستە کارگێڕییە خۆجێییەکانی دەوڵەتانی ئەندام ئەم مەرجە نییە، بەڵکە دەوڵەتی یەکگرتوو لە پاڵ سیستەمی فیدراڵیدا لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیش لە بواری وەزیفەی کارگێڕیدا پیادە دەکات و هیچ بەربەستێکی یاسایی نییە هەردوو سیستەم پێکەوە لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا کۆبکاتەوە.

٥- بەپێی دەستووری یەکێتییەکە تایبەتمەندییەکان لە نێوان حکوومەتی یەکگرتوو و حکوومەتی ئەندامەکانی دەوڵەتی فیدراڵی دابەش دەکرێن، بۆیە دەبینین دەسەڵاتی دەوڵەتە ئەندامەکان لەو دەستوورە گشتییەدا سەرچاوە دەگرێ و بەرەزامەندی دەوڵەتە ئەندامەکان نەبێ هەموار ناکرێ وەک زانایانی یاسای گشتی پێی دەڵێن دەستووری نەگۆڕ، بەڵام لەو دەوڵەتانەی کە پێڕەوی لە لامەرکەزی دەکەن، دەسەڵاتی ناوەندی دەشێ تایبەتمەندییەکانی دەستە لامەرکەزییەکان بەئاسانی و بێ گەڕانەوە بۆ ڕای دەستەکان هەموار بکات، یان هەر پووچەڵ بکاتەوە.

٦- لە سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕیدا دەسەڵاتی ناوەندی سانسۆرێکی فراوان و

هەمەجۆر دەخاتە سەر دەستە لامەرکەزییەکان، ئەمەش بۆ ئەوەیە، لە لایەک یەکێتی یاسایی و سیاسی دەوڵەت بپارێزێ و لە لایەکی دیکەشەوە لە یەکبوونی بنەماو شێوازەکانی وەزیفەی کارگێڕیی دڵنیا بێ و چاک بەڕێوەبردنی دامەزراو و پرۆژە گشتییەکان و خۆجێییەکان زامن بکات وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە بەڵام دەوڵەتە ئەندامەکانی سیستەمی فیدراڵی ئەو تایبەتمەندییانەی کە بەپێی دەستووری یەکگرتووری یەکیەتی پێیان دراوە پیادە دەکەن بەبێ ئەوەی دەسەڵاتی یەکیەتی کە هیچ سانسۆرێکی بەسەریان بسەپێنێ، لە هەمان کاتدا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دەوڵەتە ئەندامەکان ملکەچی هیچ جۆرە سانسۆرێک نابن، بەڵکو لە حاڵەتی جێبەجێکردنی یاساکانی یەکێتی لە لایەن دەوڵەتە ئەندامەکانەوە، ئەم سانسۆرە بەڕێژەیەک دیار دەکرێ، بەڵام لە حاڵەتەکانی دیدا سانسۆری ناوەندی بەرتەسک دەبێت و مۆرکێکی دادوەری بەخۆوە دەگرێ، بەشێوەیەک تەنیا لە لایەن دادگەی باڵای یەکێتییەوە ئەرکی سانسۆر لە مەڕ دەستووریەتیی یاساکان جێبەجێ دەکا تا پێڕەوی لێ بکرێ[٤٦].

٧- لە سیستەمی فیدراڵیدا سەروەری دەوڵەت لە بواری نێوخۆدا لە نێوان دەوڵەتی یەکگرتوو و دەوڵەتە ئەندامەکاندا دابەش دەکرێ، بەڵام لە سیستەمی لامەرکەزی ناوچەییدا... سەروەری دەوڵەت لە هەردوو بواری دەرەکی و نێوخۆدا تەنها لە دەستی دەسەڵاتی ناوەندی دایە. لە لایەکی دیکەوە لە فیدراڵیدا لایەنێکی زۆر تایبەتمەندییەکانی یاسا دانان و ڕاپەڕاندن و دادوەری لە دەوڵەت لە نێوان دەوڵەتی یەکگرتوو و دەوڵەتە ئەندامەکاندا دابەش دەکرێ، کەچی لە لامەرکەزیدا تایبەتمەندییەکان تەنها لە بواری وەزیفەی کارگێڕییەوە لە نێوان دەسەڵاتی ناوەندی و دەستە لامەرکەزییەکاندا دابەش دەبێ، بەپێی ئەمە و بەو هۆیەی خۆڕێکخستن لە دەوڵەتی فیدراڵیدا کاریگەرییەکی قووڵ و جەوهەری هەیە و شێوەی دەوڵەت وەردەگیرێ لە دەوڵەتی یەکبوو سادەوە دەکاتە دەوڵەتێکی ئاوێتەی ئاڵۆز ئەو ئەم کێشەیەش هۆکاری ئەو ناکۆکییەیە کە کەوتۆتە نێو زانایانی یاسای گشتی سەبارەت بەوەی ئەو جیاوازییەی لە نێوان لامەرکەزی سیاسی- کە لە فیدراڵی بەرجەستە دەبێ و لە نێوان لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەییدا هەیە ئایا جیاوازییەکی جەوهەرییە یان تەنیا جیاوازییەکی ڕووکار و لاوەکییە، لەم بارەیەوە هەندێک لە یاسا زانان لە سەروویانەوە هانس کلسن[٤٧] و مۆریس دۆڤیرجیە[٤٨] دەڵێن هەردوو سیستەمی ناوبراو یەک سروشتیان هەیە، جیاوازی نێوانیشیان تەنها لە مەودا و لە پلە

دایه[٤٩]، ئەگەر سەربەخۆیی دەستە لامەرکەزییەکان تەنیا وەزیفەی کارگێڕی بگرێتەوە، بە لامەرکەزی کارگێڕی دادەنرێ، کەچی ئەگەر ئەو سەربەخۆییە درێژ ببێتەوە و هەردوو وەزیفەی یاسادانان و دادوەریش بگرێتەوە، دەبێتە لامەرکەزی سیاسی بەلاّم ڕای زۆربەی یاسازانان[٥٠] وایە کە ئەو جیاوازییەی لە نێوان هەردوو سیستەمدا هەیە، تەنیا جیاوازییەکی ڕووکار یان لاوەکی نییە، بەڵکو جیاوازیەکی قوڵە و سروشت و جەوهەریش دەگرێتەوە.

دەکرێ بڵێین ڕای دوایی لەگەڵ لۆجیکی کاروبارەکاندا دەگونجێ و هەریەک لەو دوو سیستەمەش لە یەک سروشت هەڵنەقولاون، بەڵکو هەریەکەیان سروشتی تایبەت بەخۆیان هەیە، لامەرکەزی سیاسی فیدراڵییە- کە لە نێوان حکوومەتی دەوڵەتی یەکێتییەکەو حکوومەتی دەوڵەتە ئەندامەکاندا لە ڕووی لایەنی نێوخۆوە سەروەری تێدا دابەش دەکرێ هەروەها دەسەڵاتەکانی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادوەریش دابەش دەکرێن- کاریگەری ئەمەش تا شێوەی دەوڵەت درێژ دەبێتەوە و دەبێتە دەوڵەتی پێکهاتە (ئاوێتە) بەلاّم سیستەمی لامەرکەزی کارگێڕی- کە لە لایەنێکی تایبەتمەندیی وەزیفەی کارگێڕی پتر ناداتە یەکە خۆجێیەکان سەرەڕای ئەوەی کە سەروەری دەوڵەت هەر بەدەستی حکوومەتی ناوەندییەوە دەمێنێ- ئەمەش بەهیچ شێوەیەک کار ناکاتە سەر شێوەی دەوڵەت و جیاوازییەکەش ڕووکار نییە کە بوەستێتە سەر ماوەو پلەی لامەرکەزی، بەڵکو جیاوازی نێوان دوو سیستەمە دوو سروشتی جیاوازییان هەیە لە جەوهەرەوە، بۆیە لە بابەتەکانی یاسای دەستووری دادەنرێ. کەچی لامەرکەزی کارگێڕی تەنها بواری دابەشکردنی وەزیفەی کارگێڕی دەگرێتەوە و بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە بابەتەکانی یاسای کارگێڕی دەژمێردرێ[٥١].

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی سێیەم

١- د. شاب توما منصور- القانون الاداري، الكتاب الاول، مطبعة دار العراق للطباعة والنشر، بغداد، الطبعة الاولى ١٩٧٩- ١٩٨٠ ل ٨٦.
- الدكتور ابراهيم عبدالعزيز الشيحا، مبادئ الانظمة السياسية، سەرچاوەی پێشوو ل ٧١.
- د. فؤاد العطار، النظم السياسية والقانون الدستوري، سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٧.

٢- د. محمد الهماوندی- سەرچاوەی پێشوو ل ١٩٦.

٣- هەروەها پێی دەگوترێ حوکمی خۆجێی یان کارگێڕی خۆجێیی.

٤- د. طعيمة الجرف- القانون الاداري، مكتبة القاهرة الحديثة- القاهرة ١٩٦٣- ١٩٦٤ ل ٨٩.

٥- بەهەمان واتا بڕوانە د، ابراهيم عبدالعزيز الشيحا- الوسيط في القانون الاداري، الدار الجامعية، بيروت ١٩٩٦ل ٢١٠.

٦- د. ماهر صالح علاوي الجبوري- القانون الاداري، مطبعة التعليم العالي، الموصل ١٩٨٩ بدون رقم طبعة ل ٨٧.

٧- د، طعيمة جەرف ڕەگەزەکانی لامەرکەزی کارگێڕی ناوچەیی بەم شێوەیە دیاری دەکات:

١- بوونی بەرژەوەندی خۆجێیی

٢- ڕێکخستنی ئەنجوومەنی کارگێڕی خۆجێی سەربەخۆ

٣- سانسۆری کارگێڕی

لەگەڵ ئەوەی لێکۆڵیەر بەم شێوەیان دیاری دەکا:

١- بوونی بەرژەوەندی خۆجێیی.

٢- بوونی دەسەڵاتی خۆجێیی

٣- سەربەخۆیی دارایی

٤- دان نان بەکەسایەتی مەعنەوی کۆمەڵەی ناوچەیی کەچی ولیام هامپتۆن ڕەگەزەکان بەم شێوەیە دەستنیشان دەکات:

١- بوونی هەرێم (ناوچەیەکی) جیوگرافی دیاریکراو

٢- بوونی بەرژوەندی ناوچەیی

٣- سەربەخۆیی حوکمەتی ناوچەیی

٤- لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆوە ئەنجوومەنی باڵا پێکبهێندرێ

بۆ ئەمانەش بڕوانە:

د. طعيمة الجرف، القانون الاداري، ل ١١٤- ١١٦.

د. محمد الهماوندي. سەرچاوەی پێشوو ل٢٠٠- ٢٠١.

٨- د. ماهر صالح علاوي الجبوري- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٧- ٧٨.

٩- د. طعيمة الجرف- سەرچاوەی پێشوو ل ١١٤.

١٠- سەرچاوەی پێشوو ل ١١٥.

١١- د. محمد الهماوندي- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٦.

١٢- المادة الاولى/ الفقرة الثالثة من قانون المحافظات رقم ٥٩ لسنة ١٩٦٩ المعدل في العراق.

١٣- د. محمد الهماوندي- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٢.

١٤- المادة الثانية من قانون المحافظات رقم ١٥٩ السنة ١٩٦٩ المعدل في العراق.

١٥- المادة الاولى من قانون ادارة البلديات رقم ١٦٥ السنة ١٩٦٤ المعدل في العراق.

١٦- د. شاب توما منصور، سەرچاوەی پێشوو ل ٨٨.

١٧- د. منذر الشاوي، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٤.

١٨- د. ابراهيم عبدالعزيز الشيحا، سەرچاوەی پێشوو ل.

١٩- د. شاب توما منصور، سەرچاوەی پێشوو ل ٨٩.
٢٠- د. خالد قباني، سەرچاوەی پێشوو ل ١١١.
٢١- د. محمد الهماوندی- سەرچاوەی پێشوو ل.
٢٢- د. فؤادالعطار، النظم السياسية والقانون الدستوري ل ١٩٣- ١٩٧.
٢٣- نقلا عن د. منذر الشاوي، سەرچاوەی پێشوو ل ١٢١- ١٢٣.
٢٤- د. طعيمة الجرف- القانون الاداري، سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٦و د. ماهر صالح علاوي الجبوري- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٨.
٢٥- لە فەرەنسا و میسر ناویان لێناوە ویسایەی کارگێڕی، بەڵام ئەم ناوە لە شوێن خۆی نییە چونکە ویسایە بەمانای چاودێریی بەرژەوەندی نەقوستان (قاصر) دێت، بەڵام سانسۆر خستنە سەر دەستە لامەرکەزییەکان دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو دەستانە پیادەکردنی تایبەتمەندی خۆیان لە سنووری یاسا و بەرژەوەندی گشتی دەوڵەت زامن بکەن، بۆیە لەم دواییەدا ناوی بوو بە سانسۆری کارگێڕی. لە بارەی هەمان ئەو ڕایە بڕوانە: د. منذر الشاوي سەرچاوەی پێشوو ل٢١٥، د. محمد يعقوب السعيدي- مبادىء القانون الاداري، ج١، مطبعة الجامعة، بغداد، بدون رقم طبعة وتاريخ، ص١٠٥ و د. ماهر صالح علاوي الجبوري، سەرچاوەی پێشوو ل ٧٨.
٢٦- د. طعيمة الجرف، سەرچاوەی پێشوو ل ١١٦- ١١٧، و د. ماهر الجبوري سەرچاوەی پێشوو ل ٧٨.
٢٧- د. محمد يعقوب السعيدي، سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٢- ١٠٣، و د. شاب توما منصور سەرچاوەی پێشوو ل ٩١.
٢٨- د. عوسمان خەلیل عوسمان ناوی لێناوە نا وەزارەتی کارگێڕی، یان ناوەندی میانڕۆ، بەڵام د. مونزیر شاوی پێی دەڵێ (مەرکەزی) و سیستەمی لامەرکەزی حەسری، یەکێکە لە شێوازەکانی ڕێکخستنی کارگێڕی، ئەوکاتەش پێڕەوی لێکرا کە ڕوون بۆوە ناوەندی کارگێڕی لەگەڵ پێویستییەکانی سەردەم و قەبارەی ئەو بەرپرسێتییە گەورەیەی بەدەوڵەت سپێردراوە ناگونجێ کە بریتییە لە سیستەمی (لاحصري) کارگێڕی و دابەشکردنی سەلاحییەت و تایبەتمەندییەکان لە نێوان دەزگا ناوەندییەکانی دەوڵەت و دەزگا کارگێڕییە خۆجێیەکان، کە دەتوانرێ بێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ناوەند بڕیاری پێویستی لە مەڕ وەربگیرێ، بەڵام ئەمە دەزگاکانی کە بەشێوەیەکی هەرەمی و زنجیرەیی سەر بەناوەندن هەر دەهێڵێ و مافیش بەناوەند دەدات هەموو دەسەڵاتێکی سەرۆکایەتی بەرانبەر بەو دەزگا خۆجێیانە پیادە بکات، لەوانەش مافی ئاراستەکردن و سانسۆر و سزا چونکە اللاحصرية ڕوویێکی ناوەندی کارگێڕییە.
٢٩- د. شاب توما منصور- سەرچاوەی پێشوو ل ٨٥.
٣٠- د. خالد قباني، سەرچاوەی پێشوو ل ٩٨.
٣١- سەرچاوەی پێشوو ل ٩٨- ٩٩.
٣٢- د. طعيمة الجرف، سەرچاوەی پێشوو ل ٩٨.
٣٣- زۆر لە مامۆستایانی یاسای کارگێڕی ئاماژەیان بەدوو جۆری باو لە سانسۆری کارگێڕی داوە،

ئەوانیش شێوازی ئینگلیزی و شێوازی فەرەنسایین، لەم بارەیەوە بڕوانە: د. طعیمة الجرف، القانون الاداري ص١١٧- ١١٩، و د. خالد قباني، سەرچاوەی پێشوو ٩٩- ١٠٠، بەڵام واقیع دووپاتی دەکاتەوە جگە لەم دوو شێوازەی خستمانە ڕوو، شێوازی دیکەش هەن، بۆ درێژەی ئەمە بڕوانە: د. محمد الهماوندي سەرچاوەی پێشوو ل ٢١٨- ٢١٩.

٣٤- د. طعیمة الجرف، سەرچاوەی پێشوو ل ١١٢٠، د. محمد الهماوندي، سەرچاوەی پێشوو ل٨٠، د. ابراهیم عبدالعزیز الشیحا، الوسیط في القاون الاداري، سەرچاوەی پێشوو ل ٢١٨.

٣٥- د. أبراهیم عبدالعزیز شیحا- الوسیط في القانون الأداري- سەرچاوەی پێشوو ل ٢١٨

٣٦- د. محمد الهماوندي، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢١.

٣٧- المادة (٧١) من قانون ادارة البلدیات رقم ١٦٥ لسنة ١٩٦٤ العراقي.

٣٨- د. محمد الهماوندي، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢١.

٣٩- د. طعیمة الجرف، القانون الاداري، سەرچاوەی پێشوو ل١٢٠.

٤٠- د. شاب توما منصور، سەرچاوەی پێشوو ل ١٤٥.

٤١- د.خالد قباني، سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٤.

٤٢- د. ئیبراهیم عەبدولعەزیز شیحا نووسیویەتی: کە یاسادانەر مافی سانسۆری گونجاو بەدەسەڵاتی ناوەندی نادا، لە حاڵاتی دەگمەن نەبێ، چونکە ئەمە دەستە خۆجێیەکان ئیفلیج دەکا، بڕوانە د. ابراهیم عبدالعزیز الشیحا، الوسیط في القانون الاداري، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢١- ٢٢٢.

٤٣- د. خالد قباني، سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٥- ١٠٦، د. شاب توما منصور، سەرچاوەی پێشوو ل ٩٣، و د. طعیمة الجرف، القانون الاداري، سەرچاوەی پێشوو ل ١٢١.

٤٤- د. محمد الهماوندی- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٣.

٤٥- د. کمال الغالي، سەرچاوەی پێشوو ل ١١٠.

٤٦- شایانی ئاماژەیە لە هەندێ سیستەمی فیدراڵی وەک کەنەدا، دەوڵەتی یەکێتییەکە سانسۆرێکی فراوانتر دەخاتە سەر دەوڵەتە ئەندامەکان.

٤٧- د. ثروت بدوي، النظم السیاسیة، سەرچاوەی پێشوو ل ٨١، ئاماژەی پێدراوە.

٤٨- طعیمة الجرف، نظریة الدولة والاسس العامة للتنظیم السیاسي، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٣، ئاماژەی پێداوە.

٤٩- د. منذر الشاوي، سسەرچاوەی پێشوو ل٢٥٠- ٢١٥، ئەویش لەگەڵ ئەم ڕایەیە.

٥٠- د. ثروت بدوي النظم السیاسیة، سەرچاوەی پێشوو ل ٨١، و د. فؤاد العطار، النظم السیاسیة والقانون الدستوري، سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٧- ١٨٩. و د. طعیمة الجرف، نظریة الدول والاسس العامة للتنظیم السیاسي، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٣، و د. سلیمان محمد الطماوي، الوجیز في القانون الاداري- دار الفکر العربي، ١٩٧٥، ل ٨١.

٥١- بەهەمان واتا بڕوانە: د. محسن خلیل، النظم السیاسة والدستور اللبنانی، سەرچاوەی پێشوو ل ٩٧.

## فیدرالّیزم و سیستەمی ویلایەت لە ئیسلامدا[١]

دەوڵەتی ئیسلامی بەشێوەیەکی بچووک و سادە لە چوارچێوەی سنووری جیۆگرافی شاری (مەدینە) و بەسەرۆکایەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) بەپێی ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆز کە بەهۆی جوبریلەوە (سلاوی خوای لەسەر بێت) بۆی دەهاتە خوارێ فەرمانڕەوایی دەکرد و (والنجم إذا هوى ماضل صابكم وما غوى وما ينطق عن الهوى ان هو الا وحي يوحى)[٢] کۆمەڵێک دەسەڵاتی جیاجیای لەبن دەستان دابوو وەک فەرماندەیی کردنی سوپا، بەڕێوەبردنی کاروباری دارایی، کەچی لەگەڵ پەرەسەندنی ئەو دەوڵەتە و فراوانبوونی، پێویستی بەوەبوو لە ڕووی کارگێڕییەوە هەندێ دابەشکردن بکرێ، چونکە یەکێک لە دەرەنجامە سروشتییەکانی فراوانبوونی قەوارە و ڕووبەری هەر دەوڵەتێک ئەوەیە، دەبێ لە ڕووی کارگێڕییەوە خۆی ڕێک بخاو و وڵات بکاتە چەند ناوچەیەک، یان ولایات، یاخود هەرێم و بەڕێوەبردنی هەریەکێکیش بەفەرمانڕەوایەک، یان میرێک، یاخود والییەک بسپێردرێ و کاروبارەکەی بەڕێوە ببات[٣] لەم ڕوانگەیە میر، یان والی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ویلایەت و هەرێمە دوورەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دانران و بۆ هەر ویلایەتێک یان هەرێمێک ئەمیرێک لە لایەن خەلیفەوە دادەنرا[٤] ئەمەو میرنشینیش لە ئیسلامدا دوو جۆر بوو...

گشتی و تایبەتی... ئەگەر میرنشینەکە گشتی بوایە میر بۆی هەبوو ئەم چەند دەسەڵاتەی خوارەوە پیادە بکات:

١- بەسەروبەردا چوونی سوپاو مەزەندەکردنی ئازووقەیان، ئەگەر خەلیفە بەخۆی مەزەندەی بۆ نەکردبایە.

٢- لە ئەحکام ڕوانین و دانانی قازی و دادوەرەکان.

٣- باج و سەرانە و خێرات وەرگرتن و جیاکردنەوەی ئەوەی پێویستە و دامەزراندنی کارمەندان.

٤- پاراستنی ئافرەت و داکۆکی لە وڵات و ڕەچاوکردنی ئایین لە هەر گۆڕانکارییەک.

٥- جێبەجێکردنی مەرمانی خوا و مافی ئادەمییەکان لە حەد لێ دەرکردن.

٦- ڕێبەریکردن لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان.

٧- سەرپەرشتیکردنی ناردنی خەڵک بۆ حەج تا بەسەلامەتی بڕۆن و بگەڕێنەوە.

ئەگەر هەرێمەکە لەسەر سنووری دوژمن بووایە، ئەرکێکی دیکەش بۆ میر زێدە دەبوو کە جیهاد لە دژی دوژمنان بکاو دابەشکردنی دەستکەوتەکان و پێنج یەک وەرگرتن بۆ خەڵکی، پێنجانە (الخمس)[٥].

بەڵام میرنشینی تایبەتی... تایبەتکارییەکانی میر تیایدا بریتی بوو لە بەسەرو بەرداهاتنی سوپاو سیاسەتی ڕەعیەت و پاراستنی (وڵات و داکۆکیکردن لە ئافرەت)، بەڵام بەلای دادوەری و دادگەری و باج و سەرانەو خێراتەوە دانەدەچوو[٦].

لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین، سیستەمی کارگێڕی سادەبوو، ئاڵۆزنەبوو، میر و والییەکان لە جیاتی خەلیفە کاروبارە جۆراوجۆرەکانی ویلایەتی خۆیان بەڕێوەدەبردو دەسەڵاتەکان هەمووی لەبن دەستی میربوون، دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی ئەبوبەکری سەدیق (خوا لێی ڕازی بێ) بۆ چەند ویلایەتێک دابەش کرابوو کە مەکە و مەدینە و تائیف و سەنعاء و ڕەقع نەجران و جوند و بەحرێن بوون[٧].

یەکەمین فرانبوونی گەورەی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێ) بوو، کە هێزەکانی ئیسلام گەیشتنە عێراق و وڵاتی فارس و کوردستان و زەمینەی دەوڵەتی ئیسلام فراوان بوو، ئەمەش زیاتر وای پێویست دەکرد سیستەمی سادەی ڕابردوو پەرە پێ بدەن و دەوڵەت بەسەر چەندان ویلایەتدا دابەش کرا تا کاروباری بەڕێوەبردنەکەی ئاسانتربێ، عێراق کرایە دوو هەرێم کە یەکێکیان پایتەختەکەی (کوفە) بوو و ئەوەی دیش پایتەختەکەی شاری بەسرا بوو، هەروەها ویلایەتەکانی ئەهواز و بەحرێن و تەبەرستان و خۆراسان پێکەوەنران، وڵاتی فارس کرایە سێ ویلایات، وڵاتی شام کرایە دووبەش، یەکەمیان پایتەختەکەی حەمس و ئەوەی دیش پایتەختی دیمەشق بوو هەروەها فەلەستینیش بەتەنیا بۆ خۆی بەشێک بوو، لە ئەفریقیاش سێ ویلایات دانرا کە میسری ژووری و میسری ژێری و ڕۆژئاوای میسر و بیابانی لیبیا بوون[٨].

ئەمارەت لە سەرەتای دەوڵەتی ئیسلامدا گشتی و فراوان بوو، میرگشت دەسەڵاتەکانی خەلیفەی بەدەستەوە بوو چونکە جێگری ئەوبوو لەو ناوچەیە، بەم شێوەیە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێ) هەریەک لە؛ عومەری کوڕی عاس کرایە والی میسر، معاویە کوڕی ئەبی سوفیان کرایە والی شام، چونکە سیستەمی باوی ئەوکات

ئەوەبوو کە دەسەڵات لە دەستی یەک کەس دادەبوو، جا ئەگەر خەلیفە بوایە یان والییەکان بوایەن لە ویلایەتی خۆیاندا.[9] چونکە دەبوو خەلیفە هەردوو دەسەڵاتی دادوەری و راپەراندنی لەبن دەستدا بوایە واتە دەیتوانی هەردووکیان پیادە بکات یان بیخاتە ئەستۆی یەکێکی دی، ئەوەش گرنگترین رەخنەیەک (مأخذ) بوو کە هەندێک رووبەرووی فەرمانرەوایی ئیسلامیان دەکردەوە بەوەی کە سیستەمی لێکدی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانیان پێرەو نەکردووە. زانایانی یاسای دەستووری، بەتایبەتی لە خۆرئاوا ئەو لێکدی جودانەکردنەوەیە بەزامنێکی بنەرەتی راستی و دروستی حوکم و پاراستنی ئازادییە بنەرەتییەکانی دادەنێن لەگەڵ دانانیش بەگرنگی پرەنسیپی لێکدی جوداکردنەوەی دەسەڵاتەکان، کە بەداهێنانی سیستەمە سیاسییە تازەکان دادەنرێ، بەڵام ناکرێ تەسلیمی ئەو رەخنانەش بین کە باسمان کرد، چونکە محەمەد پێغەبەر (د.خ) پشتی ئەویش خەلیفەکانی راشیدین، بەئارەزووی خۆیان فەرمانرەواییان نەکردووە، بەڵکو پابەندی قورئانی پیرۆز و سونەتی پێغەمبەربوون کە دوو کۆڵەگەی یاسای ئیسلامن، بەواتایەکی دی ئەو یاسا و شەرعە خۆیان دایان نەنابوو، بەڵکو لە ئاسمانەوە نێردرابوو، سەرپێچییان لێ نەدەکرا، چونکە شەریعەتی خوا بوو، بۆیە لە لایەک پێویستییان بە دەسەڵاتی یاسادانان نەدەماو لە لایەکی دیکەشەوە واقیعی فەرمانرەوایی خەلیفە لە سەرەتای ئیسلامدا، بەتایبەتی لە سەردەمی ئەبوبەکر و عومەر (خوا لێیان رازی بێ) سەلماندنی کە خەلیفە... هەرچەندە هەردوو دەسەڵاتی راپەراندن و دادوەری لە دەستدابوو، بەڵام هەرگیز بەخراپە بەکاری نەدەهێنا، چونکە وازعی ئایینی و جێگیربوونی بیروباوەری ئایینی بوونە هۆی خۆکێشانەوە لە لەزەتەکانی دنیا و دیاردەی خۆشگوزەرانی و دەسەڵاتداری... بەرەو ئاخیرەت روانین و ترسان لە سزای ئاقیبەت پاڵی پێوەدەنان، ئەمەش باشترین زەمانەتی بۆ ئازادییە بنەرەتییەکان و دادپەروەری فەرمانرەوایی و راست و دروستی دەسەڵاتداران پێکەوە نابوو[10] بەشێوەیەک لە عومەری کوری خەتاب (خوا لێی رازی بێ) دەگێرنەوە کە لە یەکێ لە خوتبەکانیدا گوتوویەتی: «ئەی خەڵکینە ئەگەر یەکێک لە ئێوە خوارییەکی لە من بینی با راستی بکاتەوە، پیاوێک هەستاو گوتی، بەخوا خواریت لێ ببینین بەشیرەکانمان راستت دەکەینەوە، عومەر گوتی؛ حەمد و سەنا بۆ خوا کە لەو ئومەتەدا هی وای دروست کردووە بە شیر عومەریش راست بکاتەوە»[11]

لە سەرەتای ئیسلامدا خەلیفە لێ نەدەگەرا میرو والییەکانی بەحەز و ئارەزووی خۆیان فەرمانرەوایی بکەن، جارێکیان هەر عومەری کوری خەتاب (خوا لێی رازی بێ) وتاری بۆ

خەڵکی دەدا و گوتی: «إني والله ما ارسل عمالا ليضربوا ابشاركم ولا لياخذوا اعشاركم ولكن ارسلهم ليعلموكم دينكم وسنتكم فمن فعل بة شئ سوى ذلك فليرفعة الي فوالذي نفسي بيدة لاقصنه له منه»(١٢)

بەڵام کە دەوڵەتی ئیسلام فراوان بوو، گرفتەکانی ئاڵۆز و زۆربوون، بووە هۆی ئەوەی دەسەڵاتی میر یان والی دەستنیشان بکرێ و جۆرێکیش لە ئەرک و تایبەتکاریی و دابەشکردنی دەسەڵاتەکانیش بێنە گۆڕێ... بەشێوەیەک ئەرکی والی بووە سەرپەرشتیکردنی کاروباری سوپاو هەڵسووڕاندنی ڕەعیەت و بەلای دادوەری و باج وەرگرتنەوەدا نەدەچوو، خەلیفە خۆی دادوەرێکی بۆ کاروباری داد دادەنا و یەکێکیشی دادەمەزراند بەرپرسی بەیتولمال و دەستکەوت بێت و هەریەکە تایبەتمەندی و وەزیفەی خۆی هەبوو(١٣) بەم شێوەیە پرەنسیپی کۆکردنەوەی دەسەڵات لە دەستی یەک کەسدا، بەرە بەرە نەما و جۆرێک لە تایبەتکاری و دابەشکردنی دەسەڵاتەکان جێگەی گرتەوە.

کەچی لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا دەوڵەتی ئیسلام فراوانتریش بوو، بووە دەوڵەتێکی گەورەی هەمەلایەنە(١٤)، دەسەڵاتی گەیشتە ولاتی ئەندەلوس، بۆیە عەبدولمەلیک کوڕی مەروانی خەلیفەی ئەمەوی لە ڕووی کارگێڕییەوە دەوڵەتی ئیسلامی کردە پێنج ویلایات کە ئەمانە بوون(١٥).

١- میسر

٢- حیجاز و یەمەن و ناوەڕاستی ولاتی عارەبان.

٣- ولاتی جەزیرە کە ئەرمینیا و ئازەربایجان و هەندێ خاکی ئاسیای بچووکیش سەر بەجەزیرە بوون.

٤- عێراقی عەرەبی کە ولاتانی بابل و ئاشووری کۆنی دەگرتەوە، لەگەڵ عێراقی عەجەمیش کە ولاتانی فارسی دەگرتەوە.

٥- ئەفریقای باکوور لە خۆرئاوای میسرەوە هەتا ولاتی مەغریب و ئەندەلوس و دوورگەکانی دەریای سپی ناوەڕاست.

لەو ماوەیەدا دەسەڵاتی والی زۆر فراوان بوو، تەنانەت هەندێکی وەک عەبدولعەزیزی کوڕی مەروان لە میسر و حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفی لە عێراق دەسەڵاتێکی نیمچە ڕەهایان هەبوو(١٦) بەڵام کاتێک هەندێ فەرمانڕەوا ئەو دەسەڵاتەی پێیان درابوو بەخراپیان بەکارهێنا، خەلیفەکان دەسەڵاتیان دیاری کردن، وەکو خەلیفە سولەیمان کوڕی

عەبدولمەلیک کاتێک لە ساڵی ٩٦- ٩٩ی کۆچی بووە خەلیفە لەگەڵ حەجاج کوڕی یوسفی سەقەفیدا کردی، هەروەها کاتێک عومەری کوڕی عەبدوعەزیز لە ساڵی ٩٩ی کۆچی بووە خەلیفە ڕێبازی ئەوانی پێشەخۆی گرتەوەبەرو کەوتە لێپرسینەوە و سزادانی والییەکان و دیاریکردنی دەسەڵاتیان[١٧].

سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسی، بەتایبەتی لە سەد ساڵی بەراییدا لاوازییەکی زۆر لە دەسەڵاتی میرنشینیدا هەبوو، چونکە ئەو دەوڵەتە لە سەرەتای دامەزراندنیدا بەهێزبوو، دەسەڵاتی خەلیفە یەکدیگیر و ناوەندی بوو، بەشێوەیەک میر و والییەکان لەو ماوەیەدا دەسەڵاتێکی کەمیان لەبن دەست بوو، ئەرکی سەرەکییان فەرماندەیی سوپاو پێش نوێژی خەڵک بوو، لەو سەردەمەدا دەسەڵاتەکان دابەش کران و کاروباری دارایی خرایە ئەستۆی خاوەنی بەیتولمال و کاروباری دادوەری خرایە ئەستۆی قازی[١٨] لە سەردەمی ئەبوجەعفەری مەنسور ئەرکی میر لە هەموو بارێکدا لە وەزیفەیەکی ڕەمزی پتر نەبوو، دەسەڵاتی دادوەری لە دەستی قازی ئەو ویلایەتە بوو و ژمارەیەک قازی دیکەش لە شارەکان یاریدەیان دەدا[١٩] دەوڵەتی عەباسی زۆر لە سیستەمی فەرمانڕەوایی و کارگێڕیی لە وڵاتی فارس وەرگرت، لەوانەش سیستەمی وەزارەت[٢٠] کە لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ ئەم سیستەمە بۆتە نەریتێکی چەسپاو لە دەوڵەتی ئیسلامیدا[٢١] و یاسا ناسانی موسڵمانیش حوکمەکانیان داڕشت و دابەشیان کردە سەر دوو جۆر، یەک وەزارەتی پێ سپاردن (التفویض) کە سروشتێکی گشتی هەیە دووەمیش وەزارەتی جێبەجێکردن کە سروشتێکی تایبەتی هەیە[٢٢] بەڵام ناکرێ لەگەڵ د. سلیمان محەمەد تەماوی ڕێک بکەوین کە دەڵێ وەزیری پێ سپاردن تا ڕادەیەک لە وەزیفەی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی سیستەمی پەرلەمانی هاوچەرخ دەچێ[٢٣] چونکە جیاوازییەکانی نێوان هەردوو وەزیفە زۆر و گەورەن، وەزیری ڕاسپاردن (وزیر التفویض) لە ڕێگەی دامەزراندن لە لایەن خەلیفەوە دەگەیشتە ئەو پایەیە، کەچی سەرۆکی وەزیران لە سیستەمی پەرلەمانیدا لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی و ڕاستەوخۆ لە لایەن خەڵکی وڵاتەوە دەگاتە ئەو پایەیە، سەرەڕای ئەوەش کە سەرکردەی زۆرینەی نێو پەرلەمانە. هەروەها ئەو جیاوازییە بەوەندەش ناوەستێ و دەگاتە زۆر بواری دیکەی وەک بوارەکانی تایبەتمەندی و ئەرک و بەرپرسێتی و هتد... کە بواری ئەوەمان نییە لەم باسەدا بیانخەینە ڕوو.

ئەو پرسیارەی کە لەم بوارەدا خۆی ڕەپێش دەکات ئەوەیە ئایا دەکرێ بڵێین سیستەمی ویلایات لە دەوڵەتی ئیسلامیدا شێوەیەک بووە لە پێڕەوکردنی سیستەمی فیدراڵی؟ یان

بەواتایەکی دی ئایا دەوڵەتی ئیسلامی بەدەوڵەتی فیدراڵی دابنرێ؟

دیارە هەندێک، دەوڵەتی ئیسلامی بەدەوڵەتی فیدراڵی دادەنێن بەو گوتەیەی لەسەر بناغەی دەسەلاتی ناوەندی دامەزراوە و بێ جیاوازی لە نێوان نەتەوەکان و فراوانی هەوارگەیان وەزیفەی خۆی بەسەر هەموو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا پیادە دەکا، لەبەر ئەوەش کە دەوڵەتی فیدراڵی عارەبی هاوبەندی یەکبوونی ئایینی لە نێوان هەرێمەکاندا هەیە، بۆیە جیهانی کردۆتە دوو بەش کە خانەی ئاشتی (دار السلام) و خانەی جەنگ (دار الحرب)ە. گرنگترین ڕوخساری سیستەمی فیدراڵیش لە دەوڵەتی ئیسلامیدا دەسەلاتی ناوەندییە کە خۆی لە خەلیفەی موسڵمانانداا دەنوێنی و وەک ئیبن خەلدون دەڵێ... پایەی خەلیفە لە نێو ئوممەتدا وەک پایەی پێغەمبەرە (د.خ) لای باوەڕداران کە وەلامی گشتی و تاعەی تەواویان بۆی هەیە، چۆن مافی سەرپەرشتی کردنی ئاینی ئەوانی هەیە ئاواش مافی سەرپەرشتیکردنی بەسەر دنیایاندا هەیە، لەسەر ئەمە لە دەوڵەتی ئیسلامدا هەرێمەکان زۆر دەبن و خاکی دەوڵەتی ئیسلامیش فراوان دەبێ، بەلام شەریعەتەکەی یەکە فەرمانڕەواش خوایە، سەرۆکی بالاش کەسێکە گەل هەڵی دەبژێرێ کە خەلیفەیەو دەسەلاتی ناوەندیش لە دەستی ئەو خەلیفەیە دایە کە خۆی فەرمانڕەواکان لە هەرێمان دادەنێ و لە دەسەلاتیشیان دەخات[٢٤]

مایەی ئاماژە پێکردنە... ئەو ڕایە، کە دەوڵەتی ئیسلامی بەدەوڵەتی فیدراڵی دادەنێ، هەندێ پێشێلکردنی هەقیقەتی تێدایە و دیقەتی پێویستی تێدا نییە، بەلام سەبارەت بە وەلامدانەوەی ئەو پرسیارەی خرایە ڕوو دەکرێ بگوترێ: ئەگەرچی سیستەمی یەکگرتن لە کۆنەوە ڕەگی داکوتاوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پێنجەمی پێش زایین، کاتێک لە یۆنانی کۆندا پێڕەو کراوە، بەلام فیدراڵیش بەمەرج و ئەرک و تایبەتمەندییەکانی ئێستایەوە کە بریتییە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەکگرتوو بەپێی دەستووری فیدراڵی کە دەسەلات لە نێوان دوو جۆر حکوومەتدا دابەش دەکا و هیچ یەکێکیان ناتوانێ دەسەلات و تایبەتمەندی ئەوەی دی ببەزێنێ و دەوڵەتە ئەندامەکان لە پیادەکردنی دەسەلاتی یەکێتییەکە بەشدار دەبن و لە پاڵ دەستووری هاوبەشی یەکێتییەکەش دەستووری ناوچەیی هەیە... دەوڵەتی فیدراڵی بەم شێوەیەی باسمان کرد تا ساڵی ١٧٨٧ نەبووە و هەر لەم ساڵەدابوو بۆ یەکەمین جار لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە پێڕەوی لێ کراوە.

ئەمە لە لایەک... لە لایەکی دیکەوە کاتێک دەوڵەتی ئیسلامی پەرەی سەند و فراوان بوو، سیستەمی دابەشکردنی کارگێڕی و ویلایاتی لە پێناوی بەڕێوەبردنی کاروباری

ڕەعییەت لە شوێنە جۆراوجۆرەکاندا گرتە بەر. سیستەمی ویلایاتیش لە ئیسلامدا... بێ گومان بەشێوەیەک لە شێوەکانی بەسیستەمی لامەرکەزی کارگێڕی دادەنرێ کە پێویستییەکانی ئەوکات دۆزییەوە و دایهێناو زادەی چاخی خۆیەتی لەبەر ڕۆشنایی ئەو پەرەسەندنە مێژووییەشدا هات کە مرۆڤایەتی و سادەیی ژیان و نەبوونی ئالۆزییەکانی لەو سەردەمەدا پێی گەیشتبوو. د. شاب تۆما مەنسور لەم بارەوە دەڵێ: «لە سەردەمی ڕاشدینەکانەوە لە عێراق سیستەمی کارگێڕی خۆجێیی هەبووە و لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسییەکانیشدا درێژەی هەبووە، وەک مێژوونووسانیش دەڵێن سیستەمی بەڕێوەبردنی هەرێمە ئیسلامییەکان، لە کاروباری کارگێڕییەوە سیستەمێکی لامەرکەزی تەواوبووە، کە ڕێگە بە والی دراوە ئازادانە ڕەفتار لەگەڵ کاروباری ویلایەتی خۆی بکات و سەرۆکی دیوانە جۆربەجۆرەکانیش یارمەتییان داوە... ویلایەت دەسەڵاتێکی خۆجێیەتی سەربەخۆ بووە و پێکهاتەی کارگێڕی تەواوی هەبووە، بەیتولمالی سەربەخۆی هەبووە، بۆیە سیستەمی کارگێڕی خۆجێیی لە ئیسلامدا بایەخی بەلامەرکەزی لە کاروباری کارگێڕی داوە.[٢٥]

لە کەس شاراوە نییە کە خەلیفە سەرۆکی باڵای دەوڵەتی ئیسلامی بووە، هەموو کاروبارێکی کارگێڕی ویلایەتی بێ جیاوازی خستۆتە ئەستۆی میر یان والی جا ئەمە بەشێوەیەکی تاکە کەسی بووبێ یان دەستە جەمعی بووبێ بە بەشداری سەرۆکی دیوانەکانیش کە کاروباری ویلایەتیان هەڵدەسووڕاند بەڵام سەبارەت بەدەسەڵاتی یاسادانان، پرەنسیپی یەکبوونی یاسادانان کە زۆربەیان لە قورئانی پیرۆز و سونەتی پێغەمبەر (د.خ)[٢٦] پێک دێت لە هەموو دەوڵەتی ئیسلامی بەبێ جیاوازی لە نێوان مەڵبەندی خەلافەت و ویلایەتەکان پیادە کراوە، ئەمەش نەیهێشتووە هیچ جۆرە نارێکی و ناکۆکییەک بکەوێتە نێوان یاساکانی مەڵبەند و یاساکانی ویلایەتەکان، بۆیە ئەو پێ سپاردنەی لە لایەن خەلیفەوە دەرچووە یاساکانی نەگرتۆتەوە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئیعتیبارانە دەتوانین بڵێین کە لە ڕووی یاساییەوە، نابێ سیستەمی ویلایات لە ئیسلامدا بەشێوەیەک لە شێوەکانی سیستەمی فیدراڵی دابنێین، هەروەها ناکرێ دەوڵەتی ئیسلامی بەدەوڵەتێکی یەکگرتوو دابنرێ، بەڵام ئەمە ڕێگەی ئەوەمان لێ ناگرێ بڵێین هەندێ خەسڵەتی سیستەمی فیدراڵی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا هەبووە، بەتایبەتی لە بارەی دابەشکردنی دەوڵەت بۆ ویلایات، یان هەرێم و سەربەخۆیی دان بەوانەی لە ڕێگەی پیادەکردنی دەسەڵاتی ناوچەییەوە کاروباری ویلایەتەکەیان لە دەست گرتووە.

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی چوارەم

(١) ویلایەت چەند مانایەکی هەیە وەک (تەولیە) یان میرنشین، واتە خەلیفە یان ئیمام میرێک بۆ ناوچەیەک، یان بۆ وەزیفەیەکی دیاریکراو دادەنێ هەروەها مانایەکی جیۆگرافیشی هەیە کە بەهەرێم یان ناوچەیەکی جیۆگرافی دیار دەگوترێ، لەبەر ئەوەی کە ویلایەت بەوەزیفەیەک دادەنرێ، زاناکان بۆ چواربەش دابەشیان کردووە:

١- ویلایەتی گشتی لە کارە گشتییەکان کە وەزیرەکانن.

٢- ویلایەتی گشتی لە کارە تایبەتییەکان وەک میری هەرێم و ولاتان.

٣- ویلایەتی تایبەتی لە کارە گشتییەکان وەک قازی قازییەکان و نەقیبی سوپاکان.

٤- ویلایەتی تایبەتی لە کارە تایبەتییەکان وەک قازی ولات و نەقیبی سوپا بۆ ئەمە بڕوانە:

٥- الاحكام السلطانية للقاضي ابي يعلي محمد بن الحسين الغراء الحنبلي، شركة مكتبة ومطبعة مصطفى البابى الحلبي واولادة بمصر، اللطبعة الثانية،١٩٦٦، ص ٢٨.

(٢) القرآن الكريم، سورة النجم، الآية رقم١

(٣) سیستەمی ویلایات بەر لە دیارکەوتنی ئیسلامدا هەبووە، ولاتانی شام یەکێک بوو لە ویلایەتەکانی ڕۆم، ئەو ویلایەتەش کە پێیان دەگوت ویلایەتی خۆرهەلات بۆ پازدە هەرێم دابەش کرابوو، هەر هەرێمەش چەند ناوچەیەکی بەخۆوە گرتبوو، هەر هەرێمێک لە لایەن پەترپارکێکەوە حوکم دەکرا، کە یەکێک بوو لە تاکەکانی چینی ئەشراف خودان دەسەلات لە مەملەکەتی ڕۆمانی بۆ ئەمە بڕوانە: محمد فاروق النبهان، نظام الحكم في الاسلام. مطبوعات جامعة الكويت ١٩٨٧، ل ٥٦٨.

(٤) لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین بەمیریشیان دەگوت (عامیل) ئیشکەر تا لە لایەک ئەمە بەسەر ئەو کارەدا پێڕەو بکرێ کە پێی دەسپێردرا، لە لایەکی دیکەشەوە تا لە دیاردەکانی خۆشی و ڕابواردن دوور بکەوێتەوە و خۆی لە ڕەعیەت بەرزتر نەزانێ و نەیان چەوسێنێتەوە و مافەکانیان پێشێل نەکات، بۆ ئەمە بڕوانە: د. محمد فاروق النبهان- سەرچاوەی پێشوو ل ٥٧٠.

(٥) الاحكام السلطانية للقاضي ابي يعلي محمد بن الحسين الغراء الحنبلي، سەرچاوەی پێشوو ل٣٤، والاحكام السلطانية والولايات الدينية لابي الحسن الماوردي، تاليف د، خالد رشيد الجميلي، منشورات المكتبة العالمية، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٨٩، ل٥١

(٦) الاحكام السلطانية للقاضي ابي يعلي محمد بن الحسين الغراء الحنبلي، سەرچاوەی پێشوو ل٣٦

(٧) د. محمد فاروق النبهان، سەرچاوەی پێشوو ل٥٧٠

(٨) د. حسن ابراهيم حسن و د. علي ابراهيم حسن، النظم الاسلامية، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، مطبعة الرابعة، ١٩٧٠ ل ١٦٩- ١٧٠ و د. سليمان الطماوي التطور السياسى للمجتمع العربي، دار الفكر العربي، القاهرة، الطبعة الاولي ١٩٦١-، ل ٩١- ٩٢.

(٩) د. عبدالحميد متولي، مبادئ نظام الحكم في الاسلام مع مقارنة بالمبادئ الدستورية الحديثة، منشأة دار المعارف بالاسكندرية، الطبعة الثالثة، ١٩٧٧، ل ٢٢٤.

(١٠) بەلام پێویستە چاویش لەوە نەپۆشین کە لە سەردەمی معاویەی کوڕی سوفیانەوە خەلافەت بووە دەسەلاتێکی پاشایی بەمیرات کە ئەو خراپ بەکارهێنان و زۆرداربیەی لێ کەوتەوە.

(١١) د. عبدالحميد متولی، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٨٤

(١٢) لە د. محمد فاروق النبهان، سەرچاوەی پێشوو ل ٥٧١. گواستراوەتەوە.

(١٣) د. عبدالحميد متولي، سەرچاوەی پێشوو ل٢٢٤ و د. محمد فاروق النبهان، سەرچاوەی پێشوو ل ٥٨٠.

(١٤) د. سليمان محمد الطماوي، التطور السياسي للمجتمع العربي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٢.

(١٥) د. حسن ابراهيم حسن و د. علي ابراهيم حسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٥- ١٧٦. وسليمان الطماوي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٢- ٩٣.

(١٦) د. عبدالحميد متولي، مبادئ نظام الحكم في الاسلام مع مقارنة بالمبادئ الدستورية الحديثة، سەرچاوەی پێشوو، ص ٢٢٤و د. محمد فاروق النبهان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٧٢.

(١٧) د. عبدالحميد متولي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٤.

(١٨) د. حسن ابراهيم حسن و د. علي ابراهيم حسن- سەرچاوەی پێشوو ل ٥٧٣.

(١٩) د. حسن ابراهيم حسن، د. علي ابراهيم حسن- سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٠.

(٢٠) د. سليمان محمد الطماوی، السلطات الثلاث في الدساتير العربية المعاصرة وفي الفكر السياسي الاسلامي، مطبعة جامعة عين الشمس، الطبعة الخامسة ١٩٨٦، ل ٤٦٨.

(٢١) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦٨.

(٢٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦٨- ٤٦٩.

(٢٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦٩.

(٢٤) د. محمد فتوح محمد عثمان، رئيس الدولة في النظام الفدرالي، الهيئة المصرية للكتاب ١٩٩٧، ل ١٥.

(٢٥) د. شاب توما منصور، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٤.

(٢٦) د. محمد فاروق النبهان، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦١.

## ئاخافتنی پێنجەم

# فیدراڵیزمی هەرێمی و فیدڕالیزمی کەسی

ئەو نموونەیە یان شێوازە باوەی فیدراڵی کە بابەتی لێتۆژینەوەی ئێمەیە، فیدراڵی هەرێمییە Ferderalism Territorial، فیدڕالی هەرێمی بریتییە لەوەی چەند یەکەیەکی جیۆگرافی کە پێیان دەڵێن ویلایات، یان ناوچە، یان هەرێم، یاخود کانتۆن پێکەوە یەکێتییەکی فیدراڵی پێکەوە دەنێن و دەبنە دەوڵەتی ئەندام لەو یەکێتییەو بەو پێیەی لە دامەزراوەکانی یەکێتییەکەشدا نوێنەریان هەیە، لە پیادەکردنی دەسەڵاتی فیدراڵیدا بەشداری دەکەن، لە لایەکی دیکەشەوە بڕێکی زۆری سەربەخۆییان هەیە و دەتوانن تایبەتمەندییە نەتەوەیی و زمانەوانی و ئایینییەکانی کۆمەڵە لێکجوداکان دابین بکەن، بەڵام ئەم شێوە فیدراڵییە ئەوکاتە پێڕەوی لێ دەکرێ و گونجاو و لەباریشە کە ئەو کۆمەڵانەی تایبەتمەندێتی لێک جودایان هەیە، لە ناوچەیەکی جیۆگرافی دیاریکراودا بژین، بۆ نموونە لە سایەی فیدراڵیدا یەکێتی سۆڤیەتی پێشان لەسەر بناغەیەکی نەتەوەیی دابەش بوو بوو، هەتا دەیانگوت شێوازی یەکگرتنی ئەو دەوڵەتە لەسەر دەسەڵاتی دەوڵەتە ئەندامەکان دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر دەسەڵاتی ئەو نەتەوانەیە، کە دەوڵەتە ئەندامەکانیان پێکەوەناوە[١]، هەروەها کەنەداش پێڕەوی فیدراڵی هەرێمی دەکات، چونکە بەپێی دابەشبوونی جیۆگرافی نەتەوەیی دانیشتوانەکەی پەنای بردۆتە بەر ئەم جۆرە فیدراڵییە، زۆربەی ئەو هاووڵاتییانەی لە هەرێمی کیوبیک نیشتەجێن، ئەوانەن کە بەفەرەنسایی دەدوێن[٢] بەڵام لە هەرێمی ئۆنتاریۆ Ontrio، زۆربەی دانیشتوانەکەی بەئینگلیزی دەدوێن، لە یەکێتی فیدراڵی هیندستانیش سنووری زۆر لە ویلایەتە ئەندامەکان لەسەر بناغەی زمانەوانییەوە گۆڕانکاری تێدا کراوە[٣]. ڕەنگەو دەبێ کۆمەڵەی خودان تایبەتمەندی جیاوازی نەتەوەیی، یان زمانەوانی یاخود ئایینی لە شوێنێکی جیۆگرافی دیاریکراودا نیشتەجێ نەبن و لە ناوچەی جۆراوجۆر دابن و تێکەڵ بەخەڵکی دی بووبن، لێرەدا ئەو دەوڵەتانەی کە بەشێوەیەکی تێکەڵاو کۆمەڵەی جیاجیای نەتەوەیی و یان ئایینی، یا زمانەوانی تێدا دەژی پێڕەوی جۆرێکی دی فیدراڵی دەکەن، کە فیدراڵی کەسایەتییە Personal federalis، یان وەک دەڵێن فیدراڵی تایفەکان، بۆ ئەوەی چارەسەری گرفتی فرەیی و هەمەچەشنی و جیاوازی تایفەکان بکات و داخوازی

هەموولایان بهێنێتەدی، مامۆستا د. عسام سلێمان نووسیویەتی «فیدراڵی کەسیی ڕێکخستنێکی دەستوورییە لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی یەکبووی خودان فرە فەلسەفەیی داو پوختەکەی ئەوەیە کە کۆمەڵگە سیاسییەکانی هەر تەنها لە خەڵکی ئاسایی پێک نەهاتوون، بەڵکە لە کۆمەڵەی مرۆیی وا پێک هاتوون، تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بۆیە دەبێ لە ڕووی دەستووری و سیاسییەوە دانیان پێیدا بنرێ، ئەم تێڕوانینەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو کۆمەڵانە هەندێ مافیان پێ بدرێ و هەندێ زەمانەتیان بۆ دابین بکرێ، یاسا کەسایەتی یاساییان پێ دەداو دەبنە قەوارەیەک لە نێوان دەسەڵاتی سیاسی باڵا لە دەوڵەتی یەکبوو و لە نێوان هاوڵاتیدا[٤]، بۆ پشتگیری کردن لە هەمەچەشنی و جیاوازی نەتەوەیی و زمانەوانی و ئایینی نێوکۆمەڵگەو بۆ ئەوەی ئەوانیش ببنە هۆکارێکی هێز لە نێوکۆمەڵدا، دەبینین ڕژێمی سیاسی دان بەو چالاکییە جۆراوجۆرانەدا دەهێنێ کە نوێنەرایەتی ئەم هەمەڕەنگییە دەکات و کەسایەتی یاسایی پێویستی پێ دەبەخشێ، تەنانەت بەپێی یاساش هەندێ ماف و تایبەتمەندی و دەسەڵاتی دەداتێ، لە سێبەری ئەم جۆرە فیدراڵییە، هاووڵاتی دەتوانێ ئنتیمای نەتەوەیی یان زمانەوانی، یان ئایینی خۆی بپارێزێ، هەروەها بەشداریکردنی لە دەسەڵاتی سیاسیدا بۆ دابین دەکات، بۆ نموونە لە لوبنان یاسای نیشتمانی سەربەخۆیی داوەتە تایفە جۆراوجۆرەکان کاروباری ئایینی و کۆمەڵایەتی و کارگێڕی و دارایی خۆیان بەڕێوەببەن، هەروەها هەمەچەشنی و فرەیی لە یاساکانی کاروباری کەسیی دابین کردووە و ئەرکی پیادەکردنی ئەم تایبەتمەندییەی بەدەستەی تایبەت بەتایفە جۆراوجۆرەکان سپاردووە و زۆربەی تایفەکانیش یاساو دادگەی تایبەتی خۆیان لە بواری کاروباری کەسییدا هەیە[٥].

ئەوەش کە پەیوەندی بەفێرکردنەوە هەیە، فیدراڵی کەسیی مافی فێرکردنی تایبەت بۆ تایفەکان دابین دەکات، مادەی دەیەم لە دەستووری لوبنان کە لە ساڵی ١٩٢٦دا دەرچووە مافی داوەتە تایفە جۆراوجۆرەکان قوتابخانەی تایبەت بەخۆیان دابمەزرێنن، وێڕای مافی ڕۆشنبیری و بڕیاردان بەوەی هەر تایەفە مافی ئەوەی هەیە زمانی خۆی بەکاربهێنێ و ڕۆشنبیری خۆی پەرەپێبدات، کە ئەمەش ڕوویێکی دیکەی فیدراڵی کەسییە.

هەروا لە فیدراڵی کەسیدا تایفەکان دەسەڵاتی جێبەجێکردن پیادە دەکەن. لە قوبروس بەپێی دەستووری ساڵی ١٩٦٣ دەبێ سەرۆک کۆمار یۆنانی بێ، لەو کاتەی جێگرەکەی دەبێ تورک بێت، بەپێی میساقی نیشتمانی و شێوازی ساڵی ١٩٤٣ لە لوبناندا سەرۆک کۆمار مەسیحی مارۆنی دەبێ، لەو کاتەی سەرۆک ئەنجوومەنی وەزیران موسڵمانی سونە

دەبێ، پایەی سەرۆکی پەرلەمانیش دەدرێتە موسڵمانی شیعە.

لە دەسەڵاتی یاسادانانیشدا تایفەکان بەشداردەبن، ئەمەش ئەو سیستەمە دێنێتە پێشەوە کە بۆ پێکەوەنانی پەرلەمان دەبێ ڕەچاو بکرێ و نوێنەرانی هەموو تایفەکان بگرێتەوە، بۆ ئەمەش شێواز و ڕێگەی جۆراوجۆر هەن دەکرێ بۆ سیستەمی فرە ئەنجوومەنی پەنای بۆ ببردرێ وەک ئەوەی لە قوبرسدا پێش دابەشبوونی پێڕەوی لێ دەکرا، کە دەستووری ساڵی ۱۹٦۳ بڕیاری لەسەر داوە ئەنجوومەنێک بۆ نوێنەرانی گەل هەبێ و ۷۰٪ی کورسییەکانی تەرخان کراوە بۆ زۆرینەی یۆنانی و ۳۰٪یشی بۆ تورکە کەمینەکانە ئەوە سەرەڕای دوو ئەنجوومەنی تایفەیی لێک جودا کە یەکێکیان بۆ یۆنانیەکان و ئەوی دیش بۆ تورکەکانە[٦] هەروەها سیستەمی یەک ئەنجوومەنیش هەیە کە کورسییەکانی بەپێی ڕێژەی دانیشتوانی هەر تایفەیەک دابەش دەکرێ، وەک ئەوەی لە لوبنان پێڕەو دەکرێ[۷].

ئەمە لە لایەک... لە لایەکی دیکەوە زۆر سیستەمی دیکە هەن پێڕەوی دەکرێ بۆ ئەوەی نوێنەری تایفەکان بگەیەنێتە پەرلەمان، لەوانە سیستەمی یەک دەستەیی هەڵبژاردنەکە هەموو خەڵک بێ ڕەچاوکردنی ئینتیمای تایفییان بەشداری دەکەن بۆ هەڵبژاردنی نوێنەری تایفە جۆراوجۆرەکان، ئەم ڕێگەیەش تا ئێستا لە لوبنان پێڕەوی لێ دەکرێ و گەیشتنی کەسانێکی میانڕۆش بۆ پەرلەمان ئاسان دەکات، چونکە کەسانێکی وا دەنگی خەڵکی تایفەکانی دیش بۆ خۆی وەدەست دێنێ، بەڵام نابێتە هۆی ئەوەی کەسانی دیاری تایفەکان سەربکەون، چونکە دیارە ئەوان لە دەنگی خەڵکانی تایفەکەیان پتر وەدەست ناهێنن.

جگە لەمانەش سیستەمێکی دی هەیە کە خەڵکی هەر تایفە بەتەنیا نوێنەری تایفەکەی خۆی هەڵدەبژێرێ، ئەم ڕێگەیەش لە نیمچە دوورگەی قوبرس پێش دابەشکردنی باو بووە و[۸] بەپێچەوانەی شێوازی پێشوو دەبێتە یارمەتیدەرێک تا کەسانی دیاری تایفەکە لە هەڵبژاردندا سەربکەون.

بەڕای ئێمە ڕێگای یەکەم باشترین ڕێگەیە، چونکە دەبێتە هاندەر بۆ ئەوەی هەڵبژاردنەکە لەسەر بناغەیەکی پتر نیشتیمانیدا بکرێ و دەبێتە یارمەتیدەرێک تا کەسانی بەتوانا و دڵسۆز و نیشتمانپەروەر دەربچن، نەک پشت بەبناغەی تایفەگەری تەسک ببەسترێ.

**هەڵسەنگاندنی فیدراڵی کەسی:**

لە میانی ئەوەی پێشکەشمان کرد، ڕوون دەبێتەوە کە هەریەکە لە فیدراڵی کەسیی و فیدراڵی ناوچەیی لەوە سەرچاوە هەڵدەگرن، کە کۆمەڵەی خودان تایبەتمەندێتی نەتەوەیی و زمانەوانی و ئایینی ئەو مافانەیان بدرێتێ و شایانی ئەوانە و دەبێتە هۆکاری پاراستنی پێناسەی تایبەتی خۆیان، دوایش ئەم هەمەچەشنییەی کۆمەڵەکان دەبێتە هۆکارێکی هێز و بەرەو دەستکەوت و داهێنان و بەشداریکردن لە دەسەڵاتی سیاسی پاڵی پێوەدەنێ، بەڵام لەگەڵ ئەو پێکچوونەی کە لە پرەنسیپ و ئامانجەکانی ئەو دوو شێوە فیدراڵییەدا هەیە، کەچی جیاوازی گەورە و جەوهەریشیان لە نێواندا هەیە.

فیدراڵی هەرێمی لە دەوڵەتی یەکێتی فیدراڵیدا پێڕەو دەکرێ، واتە دەبێتە هۆی گۆڕینی شێوەی دەوڵەت لە شێوەی یەکبووی سادە بۆ شێوەی یەکگرتووی پێکهاتە (مرکب)، لە هەمان کاتدا فیدراڵی کەسی ئەو کاریگەرییەی نییە و لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی یەکبوو پێڕەو دەکرێ، تەنیا بڕیاردەدرێ تایفە جۆراوجۆرەکان مافی ئەوەیان هەبێ لە هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو بەشداری بکەن و مافە نەتەوەیی و ئایینی و زمانەوانییەکانیشیان بێتەدی، کەچی نابێتە هۆی پێکەوەنانی حکوومەتی هەرێمی هاوکار لەگەڵ حکوومەتی یەکێتی فیدراڵی هەروەها ئەو ئەنجوومەنە بەخۆوە ناگرێ کە بۆ نوێنەرانی هەرێمەکان بەشێوەیەکی یەکسان و بۆ تەواوی خەڵکی پێکدەهێنرێ، سەرەڕای ئەمانەش فیدراڵی کەسیی وەک لە ڕووی دەقەوە سەبارەت بەدابەشکردنی دەسەڵاتەکان و تایبەتمەندییەکان لە دەستووری یەکێتی فیدراڵی لەگەڵ فیدراڵی هەرێمیدا جودایە، بەشێوەیەک فیدراڵی کەسی بەپێی یاسای ئاسایی بەرجەستە دەکرێ، ئەمەش هەردەم قابیلی ئەوەیە بەیاسایەکی دی ئاسایی هەموار (تعدیل) بکرێ، یان تەنانەت پووچەڵ بکرێتەوە و نەمێنێ، لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەوەی ناوی لێ نراوە فیدراڵی کەسی، هەرگیز ناگاتە ئاستی فیدراڵی هەرێمی، چونکە فیدراڵی هەرێمی ڕەگی داکوتاوە و توانا و سوودمەندی خۆی سەلماندووە، بەو دەلیلەی کە زۆربەی دەوڵەتە گەورەکانی جیهان پێڕەوی دەکەن.

کاتێک باس لە زاراوەی فیدراڵیش دەکرێ، بەشێوەیەکی ئاسایی مەبەست فیدراڵی هەرێمە بەو پێیەی سیستەمێکی ناسراوە و لە لایەن پتر لە دوو لەسەر سێی خەڵکی سەر زەمین پێڕەو کراوە. بەپێچەوانەوە فیدراڵی کەسیی باش نەناسراوە و ڕەگی دانەکوتاوە،

سەرەڕای ئەوەی لەو چەند تەجرەبە کەمەی پێڕەویش کراوە وەک تەجرەبەی لوبنانی، بەڵام هێشتا سەرکەوتنی خۆی لە گۆڕەپانی پێڕەوکردنی بەکردەوەدا نەسەلماندووە، ئەمەش هانمان دەدات بڵێین هیچ ڕوویێکی بەراوردکردن لە نێوان ئەو دوو سیستەمەدا نییە.

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی پێنجەم

(١) عارف الحمصاني- سەرچاوەی پێشوو ل، ٢١٩.

(2) Daniei J. Elazer, Fedral system of the world, Hand book of fedral, confederland Autonomy Arrangement, Published by longman Group U K limited Westgate Hous United Kingdom 1991, Page 64- 65.

(٣) نورمان د. بالمر، النظام السياسي في الهند. ترجمة. د. محمد فتح الله الخطيب. مكتبة الانجلو- مصرية ١٩٦٥، ل ١٥٢- ١٥٥.

(٤) د. عصام سليمان- سەرچاوەی پێشوو ل ٧٤.

(٥) سەرچاوەی پێشوو ل ٤٨.

(٦) د. عصام سليمان، سەرچاوەی پێشوو ل ٤٨.

(٧) کورسییەکانی پەرلەمان لە لوبنان بەپێی یاسای هەڵبژاردنی لوبنانی ساڵی ١٩٦٠ بۆ(٥٤) نائیبی مەسیحی دابەش دەکران، کە(٣٠) کەسیان مارۆنی و(١١) یان ڕۆمی ئەرسەدۆکسی و (٦) کورسیش بۆ ڕۆمی کاسۆلیک و(٤) نائیبیش بۆ ئەرمەنی ئەرسەدۆکس و (١) نائیب بۆ ئەرمەنی کاسۆلیک،(١) نائیب بۆ ئینجیلییەکان و(٤٥) نائیبیش بۆ موسڵمانان دانراو بوو(٢٠) بۆ سونییەکان،(١٩) بۆ شیعە،(٦) نائیبیش بۆ دورزیەکان. لە عصام سليمان، سەرچاوەی پێشوو ص١٥٠ وەرگیراوە، بەڵام دابەشکردنی کورسییەکانی پەرلەمان بەپێی هەموارکردنی دەستوور لە ساڵی ١٩٩٠دا لە نێوان موسڵمان و مەسیحییەکان وەکو یەکی لێهات.

(٨) د. عصام سليمان. سەرچاوەی پێشوو ل ٤٨.

له زۆر لەو کۆمەڵگایانەی کە خاوەنی فرەلایەنین، سیستمی فیدراڵی وەکو سیستمێکی حوکم پیادەکراوە و لە میانەی جێبەجێکردنیشیدا سەرکەوتنێکی بەرچاوی وەدەست هێناوە، بۆیە پێویستە ئاماژە بەفیدراڵی بکرێ وەکو ڕێگەچارەیەک بۆ ئیشکالیەتی پێکەوە ژیان لە کۆمەڵگا فرەلایەنەکان و ڕوونکردنەوەی مەبەست لەو جۆرە کۆمەڵگایانەو دیارکردنی ئەو هۆکارانەی دەبنە هاندەر بۆ گرتنە بەری فیدراڵی وەکو شێوازێک بۆ حوکم، دواتر دیارکردنی ئەو فاکتەرانەی کە دەبنە مایەی سەرخستنی ئەزموونی فیدراڵی. وەک دەبینین لەو بوارەدا مەسەلەی باسکردن لە هەندێک ئەزموونی فیدراڵی بابەتێکی دیکەیەو خۆی دەسەپێنێ، زیاتریش بەمەبەستی شارەزابوون دەربارەی ئاستی سەرکەوتنی فیدراڵی لەو کۆمەڵگایانەدا و ناسینی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەو ئەزموونانە، ئەوانیش ئەزموونی ئەمریکی و سویسرین. ئەمە هەمووی وەکو پێشەکییەک بۆ چوونە ناو کرۆکی بابەتی ئەو تێزە کە زانینی ئاستی گونجانی فیدراڵییە بۆ عێراق لە میانەی دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی پێکهێنانی سیستمی فیدراڵی لە عێراق و هەوڵی خستنە ڕووی ئەو فاکتەرانەی کە دەبنە مایەی سەرخستنی فیدراڵی لەو وڵاتەداو پاشان دەرخستنی هەندێک لە سیماکانی سیستمی دەستووری لە عێراقی فیدراڵ، بۆیە بەشی یەکەم تایبەت دەبێ بەفیدراڵی وەکو چارەیەک بۆ کێشەی کۆمەڵگا فرە لایەنەکان، لە بەشی دووەمیشدا باس لە هەردوو ئەزموونی ئەمریکی و سویسری دەکەین، ئینجا لە بەشی سێیەم و کۆتاییدا دەچینە سەر ئاستی گونجانی فیدراڵی بۆ عێراق.

## بەشی یەکەم

# فیدراڵی وەک ڕێگە چارەیەک بۆ کێشەی کۆمەڵگا فرەلایەنەکان

سەرهەڵدانی سیستمی فیدراڵی لە کۆتایی سەدەی هەژدەم و بڵاوبوونەوەی بەرفراوانی لە هەردوو سەدەی نۆزدە و بیست و تۆکمەبوون و پەرەسەندنیشی لە ئەنجامی پیادەکردنی پراکتیکیدا لە ژمارەیەک دەوڵەتی خاوەن قەبارە و قورسایی نێودەوڵەتی کاریگەری وەک وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت و سویسرا و کەنەدا و ئەڵمانیا و ئوسترالیا، بووە هۆی گەشانەوەی ئەستێرەی ئەو سیستمە، زیاتریش لە ئەنجامی ئەو سیما و خەسڵەتە گرنگانەی کە پێیانەوە دەناسرێتەوە. ئەمەش گەیشتە ئاستی بانگەشەکردن بۆی وەکو شێوازێکی نموونەیی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دەوڵەتە خاوەن نەتەوە و ئینتیماو تایەفە جۆراوجۆرەکان و لەبەرئەوەی سیستمێکی لەو جۆرە دەبێتە مایەی دامەزرانی یەکیەتییێکی بەهێز و شان و شکۆدار، لە لایەکی دیکەشەوە ئەو ویلایەت و دەوڵەتانەی کە تیایدا دەبن بەئەندام، بەلایەنێکی بنەڕەتی و گەورەی سەربەخۆیی خودی بەهرەمەند دەبن.

هەر لەو ڕوانگەیەوە دەبوایە ئەو بەشە بۆ بابەتی فیدراڵی وەکو ڕێگە چارەیەک بۆ کێشەی کۆمەڵگا فرەلایەنەکان تەرخان بکەین، ئەمەش دەخوازێ کە لە ئاخافتنی یەکەمدا چەمکی کۆمەڵگا فرەلایەنەکان ڕوون بکەینەوە دواتریش بەشی دووەمی بۆ دیراسەکردنی فیدراڵی وەکو ڕێگە چارەیەکی نموونەیی بۆ کۆمەڵگا فرەلایەنەکان تەرخان دەکەین و لە برگەی یەکەمیدا باس لەو فاکتەرانە دەکەین کە دەبنە هاندەر بۆ دروستبوونی فیدراڵی، پاشانیش لە برگەی دووەمدا دەپرژێینە سەر ئەو هۆکارانەی دەبنە مایەی سەرخستنی سیستمی فیدراڵی.

## ئاخافتنی یەکەم

# چەمکی کۆمەڵگا فرەلایەنەکان

دەکرێ بوترێ کۆمەڵگا فرەلایەنەکان ئەو کۆمەڵگایانەن کە لە زیاتر لە نەتەوە یان تایەفە یان کەمینەیەکی ئەتنۆلۆژی پێک دێن و لە ڕووی زمان و ئایین و تایەفە و نەتەوە و کلتوورییەوە لە یەک جیاوازن، بگرە کۆمەڵگەی پێکهاتە ئاڵۆزن بەڵام پلەی ئاڵۆزییەکەیان بەپێی قەبارەی ئەو هەمەڕەنگییەی کە تیایاندایەو بەپێی جیاوازی پلەی پابەندبوونی ئەندامانیان بەتایبەتمەندییەکانیان دەگۆڕێ.

لەکاتی وردبوونەوەشدا لە واقیعی کۆمەڵگەی دەوڵەتە جیاوازەکاندا دەبینین کە زۆربەی هەرەزۆریان کۆمەڵگەی فرەلایەن و پێکهاتە ئاڵۆزن.

دکتۆر عصام سلێمان ڕوودەکاتە دیارکردنی سروشتی کۆمەڵگەی فرەلایەن و دەڵێت: (کۆمەڵگەی فرەلایەن پێچەوانەی کۆمەڵگەی نیشتمانیی تواوەیە، کۆمەڵگەیەکە لە چەند تایەفەیەک پێکدێ لە یەک چوارچێوەی سیاسیدا و لە نێوانیاندا پرۆسەی توانەوەیەکی کردەوەیی ڕووی نەداوە)(١).

لە کاتێکدا ئەگەر لە پاشکۆی کۆمەڵگا فرەلایەنەکاندا قووڵ بینەوە دەبینین کە پێکهاتە ئاڵۆزەکانیان دەگەڕێتەوە یان بۆ کەڵەکە بوونە مرۆییەکان کە لە ئەنجامی کۆڕەوە یەک لەدوایەکەکان دروست بوون، پێکهاتەی کۆمەڵگەش لە زۆر لە دەوڵەتانی وەک وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئوسترالیا و لوبنان و قوبرس و یوگسلافیا نموونەی بەهێز و هەست پێکراون لەسەر ئەمە، یاخود بۆ ئەو سیاسەتە ئیستیعمارییانە دەگەڕێتەوە کە پلانیان بۆ داناو وێنەیان کێشاو دەوڵەتە زلهێزەکانیش جێبەجێیان کرد، ئەوەبوو دەستیان کرد بەکێشانی سنووری زۆر لە دەوڵەتانی جیهان بەبێ ئەوەی ڕەچاوی بوونی جیاوازی لە ئینتیمای نەتەوەیی و ویست و خواستەکانی ئەو نەتەوانە بکەن، دابەشکردنی کوردیش لە نێوان چەند وڵاتێکدا نموونەیەکی ئاشکرایە بەڵام تاکە نموونە نییە بۆ ئەو سیاسەتانە.

بەو پێیەی باسمان لەوە کردووە کە کۆمەڵگە فرەلایەنەکان چەند نەتەوە یان تایەفە یان کەمینەی جیاواز دەگرنە خۆیان، بۆیە پێویست دەکات ڕوونی بکەینەوە کە مەبەست چییە لەو گرووپە جیاوازانە کە نەتەوە و تایەفەو کەمینەن.

**یەکەم: نەتەوە**

نەتەوە بەیەکێک لە کۆمەڵە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا فرەلایەنەکان دادەنرێ و هەندێک کەس وای پێناسە دەکەن کە:-

«هەستکردنە بەبوونی ئینتیما بۆ گەل یان گرووپ یان میللەت، پەیوەست بوونیش بەو میللەتە پتەو و توند دەبێ» (٢).

دەردەکەوێ کە ئەو پێناسەیە جەختی لەسەر ڕەگەزی دەروونی و مەعنەوی کردۆتەوە.

هەندێکی دیکە وای بۆ چوون کە نەتەوە بریتییە لە:

(کۆمەڵێک سیماو خەسڵەت و دابونەریت و سیستمی کۆمەڵایەتی، هەموویان پێکەوە، نەوە لە دوای نەوە و بەپلەی جیاواز لە دەروونی گرووپێکدا دەچەسپێت کە یەکەیەکی زمانەوانی و ئەدەبی و مێژوویی و پەیوەندی هاوبەش و هیوا و ئاوات و بەرژەوەندی و کاریگەرێتی هەرێمی تەواوکەری یەکتر کۆیان دەکاتەوە نەوەک بەبوونی مەرجی ئەوەی کە یەک ڕەگەزیی ئەندامانی کۆمەڵ پێکەوە گرێ بدات) (٣).

مانشینیی:Mancini مامۆستای ئیتاڵی لە زانکۆی تۆرینۆ بەو وتەیە پێناسەی دەکات: «میللەت کۆمەڵگەیەکی سروشتی مرۆڤە، یەکبوونی خاک و ڕەچەڵەک و دابونەریت و زمان پێکەوە دەیانبەستێتەوە لە ئەنجامی بەشداربوون لە ژیان و هەستی کۆمەڵایەتییدا» (٤)

نەتەوەش زیاتر لە ماناو دەلالەتێک دەگرێتە خۆی، ئەوەتا مانایەکی کەسێتی یان مەعنەوی خودی دەبەخشێ کاتێک مەبەست لەدوایەوە دڵسۆزیی کەس بێ بۆ نەتەوەکەی Loyalty، لە ڕووی بابەتیشەوە بریتییە لە ژمارەیەک سیماو پەیوەندی کە کۆمەڵگە پێیانەوە دەبەستێتەوە، بەجۆرێک ئەو کۆمەڵگەیە کۆمەڵگەیەکی نەتەوەیی دەبێ ئەگەر ئەو سیماو پەیوەندییانەی تیادا بەدی بکرێ.

پشتی ئەو کەسانە دەگرین کە بەیەکسانی دەڕواننە نێوان هەردوو چەمکی نەتەوە و میللەت و دەڵێن:-

«نەتەوە لە پێگەیشتن و بنەماکانیدا پشت بەهەمان ئەو فاکتەرانە دەبەستێ کە میللەت پێکدێنن» (٥).

هزری نەتەوایەتی لە ئەورووپا لە کۆتایی چارەگی یەکەمی سەدەی نۆزدە، واتە لە سەرەتای ساڵی ١٨٢١ پەرەی سەند و سەدەیەکی تەواو بەردەوام بوو، واتە تا ساڵی

١٩٢١، ئەو ماوەیەش بەسەردەمی نەتەوەکان ناودەبرێ. ئامانجەکانیشی لە چوارچێوەی ئەوەدا دەخولانەوە کە دەوڵەتان دەبێ لەسەر ئەساسی نەتەوەکان دابمەزرێن، چونکە هەموو میللەتێک یەکەیەکی کۆمەڵایەتی سروشتی خاوەن قەوارەیەکی مەعنەوی تایبەتە، بۆیە مافی هەیە کە سەربەخۆبێ لەوەی کاروبارەکانی خۆی بەڕێوەببات بەبێ ئەوەی مل بۆ ویستی هیچ میللەتێکی دیکە کەچ بکات، هەروەها مافی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ و تایبەت و جیاواز لە هی تری هەبێ، بەڵام کەسانێک بەرەو ڕووی ئەو هزرە تازەیە وەستان و ڕایانگەیاند کە بیرۆکەیەکی لەوجۆرە مەترسی بۆ سەر دەوڵەتە ئستیعمارییەکان و کەش و هەوا و سنوورەکانی ئەوکاتەوە هەیە، لە سەرووشیانەوە سیاسەتمەداری نەمساوی مترنیخ Meternich کە وای لە قەڵەم دا نەتەوە مەترسییە بۆ سەر ئیمپراتۆریەتی نەمساوی، ناوبراو لە میانەی بڵاوکراوەیەکی خۆیدا کە ئاراستەی نوێنەری نەمسای لە دەوڵەتە جۆراوجۆرەکان کردبوو دەڵێت:-

«بانگەشەکردن بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی تازە بەپێی سنوورە نەتەوەییەکان یەکێکە لە مەترسیدارترین پرۆژە خەیاڵییەکان»[٦] بەڵام سەرەڕای ئەو ناڕەزاییانە، ئەو مەزهەبە بەتوندی و کاریگەی بڵاوەی کرد و بووە هۆی گۆڕینی سنووری زۆر لە دەوڵەتان و بوونیادنانی زۆر دەوڵەتی دیکە لەسەر ئەو بنەمایە.

چەندین پەیوەندیش بۆ نەتەوە خراونەتە ڕوو لەوانە: زمان و ڕەگەز و خاک «هەرێم» و ئایین و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان، واتە مێژووی هاوبەش.

بەڵام زۆرکەم ڕێک دەکەوێ نەتەوەیەک نێوانی ئەو هەموو پەیوەندییانە کۆبکاتەوە یان بیانگرێتە خۆی بۆیە بۆ دروستبوونی نەتەوە، بوونی یەک پەیوەندی یان زیاتر لەوانەی باسمان کردن کیفایەتە، لەبەر ئەمە دەبینین چەندین تیۆری سەبارەت بەبەیانکردنی ئەو بنەمایە وتراون کە نەتەوەی لەسەر بونیاد دەنرێ، تیۆری ئەڵمانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە سەری هەڵداو فیختەی زانا بەناوبانگترین ئەوانەن کە دەریان بڕیوە، ئەو تیۆرە پێی وایە فاکتەری زمان بنەمای یەکەمە لە پێکهێنانی میللەت و دروستبوونی نەتەوەدا، لە کاتێکدا تیۆری فەرەنسی دەگاتە ئاستی ئەوەی کە نەتەوە لە دروستبوونیدا جەخت لەسەر ئیرادەی تاکەکان و ویستی هاوبەشییان لە پێکەوە ژیان دەکاتەوە، ئارنست دینانی فەیلەسوفی فەرەنیش یەکێکە لە بەناوبانگترین لایەنگرو بانگەشەکەرانی ئەو تیۆرییە.

تیۆری سێیەمیش دەرکەوت و وای دانا کە یەکێتی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان فاکتەری سەرەکیە لە دروستبوونی نەتەوە و میللەتدا تیۆری ناوبراو دەڵێت: هیچ میللەتێک بەبێ ژیانێکی ئابووری هاوبەش بوونی نابێ. ئەمە و تیۆری چوارەم کە زیاتر تیۆرێکی میانگیرە، جەخت دەکاتەوە کە بنەمای سەرهەڵدانی نەتەوە دوو فاکتەر دەگەڕێتەوە کە یەکێتی زمان و یەکێتی مێژوو (مێژووی هاوبەش)ن[٧].

هەستکردنیش بەئینتیما بۆ نەتەوە بەشێوەیەکی لاوەکی لە ناخی تاکەکانی کۆمەڵ دروست دەبێ دوور لە شێوازە ناسروشتییەکانی وەک پڕوپاگەندە یان فێرکردن یان یاسا، بەڵکو وەکو هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە خۆوە دروست دەبێ و لە ناو دەروونی ڕۆڵەکانی ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەدا دەچەسپێ کە تیایدا ژیاون لە میانەی کارلێککردنیان لەگەڵ ئەو ژینگەیە و فێربوون و وەرگرتنیان بۆ بنەما کلتووری و شارستانییەکان کە مۆرکی نەتەوەیی و سیماکانی خۆیانی پێ دەبەخشێ و لە بەرامبەریشدا ئەوان هەست بەدڵسۆزی دەکەن. لەو چوارچێوەیەشدا فیختەی زانای بەناوبانگی ئەڵمانی بەرگری لە بیرۆکەی نەتەوە دەکات و بەئیسرافیلی شبهاندووە، واتە مردووان زیندوو دەکاتەوە[٨].

ماکس نورداوی هزرمەندی ئەڵمانیش بەهەمان ئاراستەدا ڕۆیشتووە و ڕایگەیاندووە کە ئەوانەی بینینیان لە دەست داوە، هەرخۆیانن بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە هزری نەتەوەیی لە بۆچوونە لە ناکاوەکانە[٩].

## دووەم: تایەفە

تایەفەش گرووپێکە لەو تاکانەی کە هاوبەش دەبن لە یەک ڕەگەز یاخود بەیەک زمان دەئاخڤن یان ئاینێکی دیاریکراویان هەیە یان ئەوەتا پابەندن بەدابونەریتێکی تایبەت، ئەمەش پاڵیان پێوە دەنێ هەست بەو تایبەتمەندییانە بکەن و پەیوەست بن پێیانەوە و بگرە پەرەشیان پێ بدەن، دادگای دادی نێودەوڵەتیش پێناسەی تایەفەی بەو وتەیە دیارکردووە:-

«پێوەری هەموو تایەفەیەک بریتییە لە بوونی گرووپێک لەو کەسانەی کە لە وڵات یان گەرەکێکی دیاریکراودا دەژین و سەر بەرەگەز یان ئاین یان زمان یان دابونەریتی تایبەت بەخۆیانن و بەهۆی ئەو ڕەگەز و ئاین و زمان و دابونەریتانەشەوە یەکگرتوودەبن و هەست بەپشت بەستن بەیەکتر دەکەن لە پێناوی پاراستنی دابونەریت و عیبادەتەکەیان و

زامنکردنی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانیان بەپێی ویست و خواستەکانی خۆیان»[١٠]
لە بنەڕەتدا تایەفە لەسەر چەند جیاوازییەکەوە سەردەگرێ کە لەکاتی لە دایکبوونەوە دیار دەکرێن، ئەو جیاوازییانە نە بەدەسکەوتە فەردییەکان لە ڕووی ئابووری و پیشەیی و سیاسییەوە دەگۆڕێن نە بەهیچ شێوازێکی دیکە، بەم پێیە دەردەکەوێ کە دابەشبوون و بەربەستە سولالی و ئەتنۆلۆژییەکان[١١] کە بریتین لە بەربەست و تاکەکان بۆیان نییە بیانبەزێنن چونکە بەسەریاندا سەپێنراون و لە دەرەوەی ویست و ئیرادەیانە- لە هەمان کاتدا دەربڕی بونیادی تایەفیین لە کۆمەڵگادا[١٢] تایەفە لە چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراویشدا بەشداردەبێ و هەر ئەمەش لە تایەفەکانی تر جیای دەکاتەوە، وێڕای پابەندبوونی بەجۆرێک پەیوەندی هاوبەش کە لە نێوان ئەندامانیدا بەدی دەکرێ، ئەو تایەفانە لە ڕوانگەی بەرگریکردن و پاراستنی قەوارەی خۆیانەوە پەنا دەبەنە بەر گرنگی و بایەخدان بەدابونەریتەکانیان، بەڵکو ئەو دابونەریتانە پتەو و قوڵتر دەکەن.

لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا و بەتێپەڕبوونی کات ئەو پەیوەندییانە سیمای پیرۆزی وەردەگرن، گونجاوترین نموونەش بۆ ئەمە پیادەکردنی شوێنکەوتووانی تایەفەی یەزیدییە لە عێراق بۆ دابونەریت و ڕێوڕەسمە تایبەتەکان لەو جەژن و بۆنانەدا کە تایبەتن بەخۆیان.

لوبنان یەکێکە لە نموونە بەرچاوەکانی کۆمەڵگەی فرەتایەفی و ژمارەیەکی گەورەی تایەفەی ئایینی دەگرێتە خۆی زیاتر لەهەر وڵاتێکی عەرەبی دیکە. لەو وڵاتەدا هەژدە تایەفەی ئایینی بەڕەسمی دان پێدانراو هەن و بەپێی دەستووری ساڵی ١٩٢٦ و میساقی ١٩٤٣ش سیستەمی حوکم تیایدا پشتی بەئەساسی تایەفی بەستووە بۆ دەسەڵات، و بەم جۆرە سەرۆک کۆمار مەسیحی دەبێ لە تایەفەی مارۆنییەکان و سەرۆک وەزیرانیش موسڵمان لە تایەفەی سوننە، واش باو بووە کە پایەی سەرۆکی پەرلەمان بەموسڵمانێکی سەر بەتایەفەی شیعە بسپێردرێ، دابەشکردنی کورسییەکانی پەرلەمانیش بەپێی ئاستی چڕی دانیشتوانیان بەسەر تایەفە جۆراوجۆرەکاندا دابەش کراوە.[١٣] ر. م. ماکیفر و چارلس بیدج باس لەوە دەکەن گرنگترین سیستەم کە دەربڕی ڕێکخستنی تایەفی بێ سیستمی چینایەتیی پیادەکرا لە هیندە، هەرهیندییەک سەر بەتایەفەی دایک و باوکیەتی و دەبێ تیایدا بمێنێتەوە بگرە هەرجۆرە دەوڵەمەندی و داهێنانێک نابێ بیانگەیێنێتە ئاستی گۆڕانی تایەفەکەیان[١٤]، لە ناو کۆمەڵگەی هیندۆسیشدا چەند چینێک هەن باڵاترینیان چینی براهمایە کە زانا و پیاوە ئایینییەکانی هیندۆسی دەگرێتەخۆی، ئینجا چینی کشتیری کە خەڵکی ئەرستۆکرات و شەڕکەر و زۆربەی دەسەڵات بەدەستانی شانشین

و دەوڵەتۆچکە بچووکەکانی تیادا کۆبوونەتەوە، فایزیاش چینێکی دیکەیەو لە دوای ئەوانی تر دێ و بریتییە لە چینی بازرگانەکان، ئینجا چینی سودرا کە چینی کرێکارانە لە نزمترین پایەکانی پلیکانەی کۆمەڵایەتیشدا پەڕاگەندە و فەرامۆشکراوان دێن (المنبوذین) کە سەر بەهیچ چینێک نین و ئەوانە لە هیند نوێنەرایەتی «گەورەترین گرووپی ڕەگەزیی بێ دەسەڵات لە جیهان» دەکەن و دووچاری هەموو جۆرەکانی چەوساندنەوە و ستەم بوونەتەوە لە جیاوازی و پەرتەوازەیی، تەنانەت ڕێگەی مامەڵەکردنیان لەگەڵ هیندییەکانی سەر بەتایەفەکانی دیکە لێ قەدەغەکراوە تەنیا لە بەرتەسکترین سنوور نەبێ. ئەگەر چیش لەسەر ئاستی ڕەسمیدا کاری ئەمانە بەنامەشروع دادەنرێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لە ژیانی پراکتیکی هیندیدا پیادە دەکرێ و تا ئەمڕۆش(٦٠) ملیۆن کەسی پەرتەوازەی هیندی هەن و زۆربەیان لە ناوچەی دوورەپەرێز و تایبەت دەژین و کاروباری نابەجێ ئەنجام دەدەن[١٥].

### سێیەم کەمینە

مەبەست لە کەمینە ئەو گرووپەیە کە لە نێوان دانیشتوانی دەوڵەتدا هەیە و لە ڕووی ڕەگەز یان زمان یان ئایینەوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕەچەڵەکی دیکە کە لەگەڵ زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگادا جیاوازن.

شایەنی باسە مەسەلەی کەمینەکان نادیاری و ئاڵۆزیەکی پێوە دیارە چونکە سەرەڕای ئەو هەوڵانەدی کە لە لایەن شارەزاو لایەنە پەیوەندار و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە لە ئارادان بۆ دەستنیشانکردنی چەمکی کەمینەو پێناسەکردنی بەشێوەیەکی ورد، بەڵام ئەو هەوڵانە نەبوونەتە مایەی دیارکردنێکی وردبینانە بۆ ئەوگرووپە مرۆییە چونکە چەمکی کەمینە چەند ڕەگەزێکی سیاسی و سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی و کلتووریی تێکەڵاو بەیەک دەگرێتەخۆی[١٦]، هەروەها پێوەری ژمارەی تاکەکانی گرووپ لە دانانی وەکو کەمینە یاخود نا یەکێکە لەو کێشانەی تا ئێستا چارەیەکی گونجاوی نەدۆزیوەتەوە چونکە وەک ئاشکرایە گرووپی مرۆیی سیفەتی کەمینە وەرناگرێ ئەگەر ژمارەی ئەندامانی زۆرکەم یان زۆربێ.

دکتۆر عصام سلێمان ڕەخنە لەو وەسفکردنە دەگرێ کە دادگای دادی نێودەوڵەتی کەمینەی پێ دیارکردووە بەوەی کە بریتییە: «لەو کەسانەی کە بەڕەگەز و ئایین و کلتوور لە زۆرینەی دانیشتوان جیاوازن» سەبارەت بەمە دەڵێت ئەو پێناسەیە نا ئاشکرایی پێوە

دیاره و کرۆکی کێشەکەش چارەسەر ناکات[17]، دواتر بنەما سەرەکییەکانی کەمینە دەخاتە ڕوو و بەپێویستیشیان دەزانی بۆ هەر گرووپێکی مرۆیی بۆ ئەوەی ببنە خاوەنی سیفەتی کەمینە، ئینجا ئەو گرووپە مرۆییە چ کەمینەیەکی ئەتنێکی یان ئایینی یان زمانەوانی یاخود نەتەوەیی بێت. ئەو بنەمایانەی لەوەی خوارەوەدا کورت دەکاتەوە:-

* ڕەگەزی تایەفی: چەمکی کەمینە دەبێ بوونی گرووپێک بگرێتەوە خۆی کە خاوەنی چەند سیفەتێک بێ و لە باقی کۆمەڵگەی نیشتمانی جیایان بکاتەوە.

* ڕەگەزی نەوعی: بۆ ئەوەی گرووپێک کەمینەیەک پێک بهێنێ، دەبێ ژمارەی ئەندامانی بگاتە ئاستێک کە بەهۆیەوە لەسەر ئاستی نیشتمانیدا ببێتە خاوەن پایەیەک، لە هەمان کاتدا دەبێ ژمارەی ئەندامانی زۆر کەمتر بێ لە ژمارەی باقی دانیشتوان، بۆ ئەوەی لە حاڵەتی تەبەعییەتدا بێ.

* ڕەگەزی دەروونی: بۆ ئەوەی تایەفەیەک کەمینەیەک پێک بهێنێ دەبێ وەکو کەمینە هەست بەبوونی خۆی بکات و زۆرینەش لەسەر ئەو ئەساسەوە مامەڵەی لەگەڵ بکات.

* ڕەگەزی چەوسانەوە: ئەو ڕەگەزە لەگەڵ هەموو دیاردەیەکی کەمینەییدا هاوشانە، هیچ کاتێک کەمینە بەکەمینە دانانرێ ئەگەر نەچەوسێتەوە چونکە بەنەبوونی ئەو سیفەتە کەمینە دەبێتە گرووپێکی خاوەن سەربەخۆیی خودی[18].

ئەمەو ڕێساکانی یاسای گشتی نێو دەوڵەتی تەقلیدی ڕێگەیان بەڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان نەدەدا دەخاڵەتی پەیوەندی نێوان دەوڵەت و ڕەعیەتەکانی بکەن، بەمەش ئەو ڕێکخراوانە توانای پاراستن و بەرگریکردنیان لەو کەمینانە نەبوو، بەوپێیەی کە ئەو مەسەلانە پەیوەندییان بەخودی سەروەریی دەوڵەتەوە هەیە و ناکرێ دەستکارییان بکرێ تەنیا ئەو کاتە نەبێ کە دەوڵەتی پەیوەندار بەپێی پەیماننامەیەکی نێودەوڵەتییەوە پابەندکرابێ بەوەی مامەڵەیەکی تایبەت لەگەڵ ڕەعیەتەکانیدا بکات و لە بەرامبەریشدا ئەو دەوڵەتە سەرپێچی کردبێ.

لە سەدەی نۆزدەمەوە هەندێک دەوڵەت ژمارەیەک پەیماننامەیان سەبارەت بەو مافانە مۆرکردووە کە بەچەند کەمینەیەک دەدرێن، لە نێوانیاندا پابەندبوونی دەوڵەتی عوسمانی بەپێی پەیماننامەی پاریسی ساڵی ١٨٥٦ و پەیماننامەی بەرلینی ساڵی ١٨٧٨بەیەکسانی لە نێوان ڕەعیەتەکانی و پاراستنی مەسیحییەکان لەهەر دەستدرێژییەک.

لە پەیماننامەکانی ئاشتبوونەوەشدا کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان لەگەڵ هەریەکە

لە نەمساو مەجەر و بولگاریا و تورکیادا مۆر کران، هەروەها لە پەیماننامەکانی کەمینەکاندا کە لەگەڵ وڵاتە تازە دروستبووەکانی وەک پۆلۆنیا و چیکۆسلۆڤاکیا و یوگسلافیا و ڕۆمانیا و یۆناندا مۆر کران، جگە لەمە لە ڕاگەیاندنە تایبەتەکاندا لە وڵاتانی دیکەی وەک فنلەندا و ئەلبانیا و لیتونیا و ئستۆنیا[١٩] لە بەردەمی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلاندا پێشکەشیان کرد، بەپێی هەموو ئەو پەیماننامانە سیستمێکی تایبەت بەپاراستنی کەمینەکان دانرا.

ئەمەو ئەو سیستمەی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان بۆ پاراستنی کەمینەکان نرا، ژمارەیەک ئیلتیزاماتی گرتبووە خۆی کە لە سیستمی ناوبراودا خرابوونە ئەستۆی وڵاتانی بەشدار بوو، هەروەها دەسەڵاتی چاودێریکردنی جێبەجێکردنی ئەو ئیلتیزاماتانە لە لایەن وڵاتانی بەشدار بەئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان سپێردرا، بەڵام ئەو سیستمە لەکاتی جێبەجێکردندا و بەهۆی ئیعتیباراتی سیاسییەوە دووچاری کێشەی جیدی بووەوە.

نەتەوە یەکگرتووەکانیش کە لەگەڵ تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهان دامەزرا، سیستمێکی تایبەت بەپاراستنی کەمینەکانی دانەنا، سەرەڕای ئەوەی ئەو پەیماننامانەی کە لەگەڵ ئەڵمانیا و هاوپەیمانانیدا مۆر کرا بوو جەختیان لەسەر ئەوە کردبوو کە دەبێ ئەڵمانیا پابەند بێ بەدابینکردنی هەموو مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ[٢٠] بۆ ڕەعیەتەکانی خۆی بەبێ جیاوازیکردن بەهۆی ڕەچەڵەک یان زمان یان ئایین و ڕەگەز[٢١].

بەڵام دواتر دەستەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لیژنەیەکی تایبەتی بەمەسەلەی پاراستنی کەمینەکان پێکهێنا.

شایانی باسکردنە لەمساڵانەی دواییدا و پاش دەرکەوتنی ئەوەی کە بەسیستمی تازەی جیهان ناودەبرێ، تێبینی دەکرێ کە نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو ڕێکخراوانەش کە تایبەتن بەمافەکانی مرۆڤ، لەو بوارەوە هەوڵ و کۆششی زیاتریان خستۆتە گەڕ.

**پەراوێزەکانی ئاخافتنی یەکەم:**

(١) دکتۆر عصام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢١.

(٢) دکتۆر زێدان عەبدولباقی- القومية العربية والمجتمع العربي- مكتبة النهضة المصرية- ١٩٧٤- ل ١٨٨.

(٣) دکتۆر محەمەد کامیل لیلە- المجتمع العربي والقومية العربية- دار الفكر العربي- قاهیرە ١٩٦٦- ل ٥٤٢.

(٤) له ئەبو خەلدوون ساتع ئەلحوسەری- ماهی القومیة؟ ابحاث و دراسات علی ضوء إلأحداث والنظريات- مرکز دراسات الوحده العربیه- زنجیرەی التراث القومي- کاره نەتەوەییيەکانی ساتع ئەلحوسەری- چاپی دووەم- بەیروت ١٩٨٥ وەرگیراوە.

(٥) دکتۆر محەمەد کامیل لیله- المجتمع العربی والقومیة العربیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٣٢ پەراوێز.

(٦) دکتۆر زێدان عەبدولباقی ئاماژەی پێ داوە- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٨٨- ١٨٩.

(٧) له درێژەی تیۆرەکان و ئەو ڕەخنانەی ئاراستەیان کراون بڕوانە:-

دکتۆر محەمەد کامیل لیله- المجتمع العربي والقومیة العربیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ٥٥٠- ٥٧٨.

(٨) له ئەبو خەلدوون ساطع حوسەری- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢ وەرگیراوە.

(٩) له: سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢ وەرگیراوە.

(١٠) له: دکتۆر عصام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٩ وەرگیراوە.

(١١) وەکو گرووپێکی جیاوازو دیاریکراو دەڕوانرێته سولالەکه، بەوپێیەی که خاوەنی سیفەتی بۆماوەیی دیاریکراو و هاوبەشه گرووپی ئەتنۆلۆجیش «گرووپێکه ئەندامی له دابونەریتی کۆمەڵایەتی و کلتووریی دیاریکراودا هاوبەش دەبن، ئەو دابونەریتانەش له نەوەیەکەوە بۆ یەکێکی تر دەمێننەوە، ئینجا چ ئەو گرووپه بەشێک بێ له کۆمەڵگەیەکی ئاڵۆز یان بەتەنیا بێ».

- لەو بارەوە بڕوانە: ر. م. ماکیفر و چارلس بیدج- کۆمەڵگا- بەشی دووەم- وەرگێڕانی د. محەمەد عەزاوی و هەڤاڵانی- مکتبة النهضة المصرية- ١٩٧١- ل ٦٩٩- ٧٠٢.

(١٢) ر. م. ماکیڤر و چارلس بیدوج- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢- ٧.

(١٣) له درێژەی ئەمه بڕوانە: دکتۆر عصام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٤٨- ١٥٠.

(١٤) ر. م. ماکیفرو چارلس بیدج- سەرچاوەی پێشوو- ل ٦٥١.

(١٥) نۆرەمان د. پالمەر- سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٢.

(١٦) دکتۆر عصام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٣.

(١٧) سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٣.

(١٨) دکتۆر عصام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٣.

(١٩) دکتۆر محەمەد حافز غانم- مبادئ القانون الدولي العام- چاپخانەی النهضة الجديدة ١٩٦٧- ل ٥١٤- ٥١٥.

(٢٠) سەرچاوەی پێشوو- ل ٥١٥- ٥١٦.

(٢١) سەرچاوەی پێشوو- ل ٥١٦.

## فیدراڵی وەکو ڕێگەچارەیەکی نموونەیی بۆ کۆمەڵگا فرە لایەنەکان

سیستمی فیدراڵی بەو فرەلایەنییەی کە لە بواری ناوخۆییەوە دەیگرێتە خۆی، ئینجا ئەو فرە لایەنییە چ لە دەستوور یان لە حکوومەت یاخود لە دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکاندا بێ، بەڕێگەچارەیەکی نموونەیی بۆ ئیشکالیەتی فرەلایەنی دادەنرێ لە کۆمەڵگا فرە نەتەوەیی و تایەفییەکاندا و لە زۆر وڵاتیشدا سەرکەوتنی بەرچاوی وەدەست هێناوە.

بوونی هەندێک ئەزموونی سەرنەکەوتووی فیدراڵیش مانای ئەوە نییە کە شکستەکە بۆ خودی ئەو سیستمە دەگەڕێتەوە بەڵکو مەسەلەکە پەیوەندی بەو کۆمەڵگەو دەوڵەتانەوە هەیە کە پیادەیان کردووە چونکە فیدراڵی چارەسەرێکی ئامادەکراوی قابیل بەوە نییە کە لە هەموو کات و شوێنێکدا جێبەجێ بکرێ بەڵکو ڕێکخستنێکی سیاسی و دەستوورییەو دەوەستێتە سەر ئاستی سەرکەوتنی جێبەجێکردنی لە بارودۆخە بابەتی و شارستانییەکانی کۆمەڵگە.

لەمیانەی دیراسەکردنی ئەزموونە هەمەجۆرەکانی فیدراڵیشدا دەردەکەوێ کە ژمارەیەک فاکتەری دیاریکراو هەن هانی دروستبوونی فیدراڵی دەدەن هەروەها فاکتەری واش هەن دوای دروستبوونی دەبنە یارمەتیدەر بۆ سەرکەوتنی ئەو سیستمە. بۆیە لەبڕگەی یەکەمدا باس لەو هۆکارانە دەکەین کە دەبنە هاندەر بۆ دروستبوونی فیدراڵی پاشان لە بڕگەی دووەمدا دەچینە سەر باسکردن لە هۆکارە یارمەتیدەرەکانی سەرکەوتنی ئەو سیستمە.

### یەکەم: هۆکارە هاندەرەکانی دروستبوونی فیدراڵی:

لەمیانەی دیراسەکردنی فیدراڵی بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو و هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە لە شارە کۆنەکانی یۆنان و ئەو فیدراڵیانەش کە لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا بونیاد نراون تا دەگەینە سیستمە تازەکان، کۆمەڵێک فاکتەر بەدی دەکەین کە بوونەتە هاندەر بۆ پێکهێنانی سیستمی فیدراڵی، دەکرێ ئەو هۆکارانە لە خوارەوە دەستنیشان بکەین:-

### ١ - ویستی دامەزراندنی سیستمی فیدراڵی

یەکێک لەو هۆکارانەی کە لە دوای بونیادنانی سیستمی فیدراڵی دەوەستن ویستی کۆمەڵگا و دەوڵەتانە لە پێکهێنانی حکومەتێکی گشتی و سەربەخۆ بۆ هەندێک مەبەست و ویستی ئەوانیشە بۆ ملکەچکردن بۆی، لە کاتێکدا ئەگەر ئەو کۆمەڵگایانە خاوەنی ئەو جۆرە ویستە نەبن بگرە بەپێچەوانەوە بەنیازی هێشتنەوەی دەسەلاتی گشتی بن بۆخۆیان، ئەو کاتە داواکاریی یەکەمی پێکهێنانی فیدراڵی لە ئارادا نابێت و لە حاڵەتی واشدا کۆمەڵە یان هاوپەیمانێتی یاخود سیستمی کۆنفیدراڵی گونجاو و لەبارتر دەبێ بۆیان، بۆ نموونە دەبینین ئەندامانی کۆمنوێلسی بەریتانی سیستمی فیدراڵییان دروست نەکردووە چونکە حەزیان لەوە نەبووە تەنازول لە دەسەلاتەکانیان بکەن بۆ حکومەتێکی گشتی و سەربەخۆ و بۆ چەند مەبەستێکیش ملی بۆ کەچ بکەن، وێڕای ئەوەی پێشتر باسی لێوەکرا دەبێ ئەوان حەز و ئارەزوویان لە دروستکردنی حکومەتی هەرێمیی سەربەخۆی بێ و بەبێ بوونی ئەو ویستەش دەکەوینە بەرامبەر دەوڵەتێکی یەکبووی ساکار لەگەڵ پلەیەکی لامەرکەزیدا و ئەو کاتە هۆکارێک نابێ بۆ تەبەنناکردنی بنەمای فیدراڵی.

ویبیر Wheareی پسپۆڕ پێی وایە ئەو سیستمەی کە لە ساڵی ١٩٠٩ لە باشووری ئەفریقیا بوونیادنرا بەڵگەیەکی زیندووە بۆ ئەمە، چونکە موستەعمەرە کۆنەکانی کە:- ترانسڤال Transval و ئۆرانج ڕایڤر Orang River و کاپ Cape و ناتال Natal بوون، ویستیان مل بۆ حکوومەتێکی گشتی دانەوێنن و لە هەمان کاتدا خواستی دروستکردنی حکوومەتی هەرێمی سەربەخۆیان بۆ هەندێک مەبەستی دیکە نەبوو، ئەوەبوو ئەو هەرێمانە قەناعەتیان بەو دەسەلاتانە هێنا کە بەپێی سیستمی لامەرکەزیی هەرێمی پێیان درابوو، ئەگەرچیش ئەو دەسەلاتانە تەواو و وەکو پێویست وان بەلام هێشتا تەبەعیەتیان پێوە دیارە[1].

بوونی ویستی دامەزراندنی حکوومەتی هەرێمیی سەربەخۆش لە ئارەزووی هێنانەدی سەربەخۆیی خودییەوە سەردەگرێ لە ناو ئیتیحاد دا، ئەو ویستەش کە لە تایبەتمەندییە کۆمەلایەتییەکانی هەرێمانی ئەندام لە ئیتیحادا هەڵدەقوڵێن، وەک ئەوە وان بێن بەتایبەتمەندیی زمانەوانی یان ئایینی یان ڕەگەزی یان نەتەوەیی. بەم جۆرە تایەفەو نەتەوە جیاوازەکان لە ڕێگەی حکوومەتە هەرێمییە سەربەخۆکانەوە دەتوانن هیواو ئاواتە نەتەوەییەکانیان وەدەست بهێنن و هەر لەو ڕێگەیەشەوە توانای پاراستنی تایبەتمەندییە

کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان دەبێ. جگە لەمە ئەو تایەفە و نەتەوانە لە ڕێگەی یەکگرتن کە حکوومەتێکی گشتی سەربەخۆی بەهێز و هەیبەت و کاریگەرەوە دەتوانن ئامانجە بەرفراوانترەکانیان دەستەبەر بکەن. بەم پێیەش کۆمەڵگا یان دەوڵەتان ئەوکاتە دەکەونە سەر ڕێڕەوی بونیادنانی سیستمی فیدراڵی کە نیازی یەکبوون هەبێ نەوەک یەکبوون، بەواتایەکی دیکە: دەبێ نیازی یەکگرتنیان هەبێ نەوەک یەکبوون[٢].

لە کاتێکیشدا ئەگەر ویستی یەکگرتن یان دروستکردنی دوو جۆر حکوومەت وا لە کۆمەڵگە و دەوڵەتانە بکات سیستمی فیدراڵی بونیاد بنێن، کەواتە ئەو فاکتەرانە چین کە دەبنە هۆی دەرکەوتنی ویستێکی لەو جۆرە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێین:- کۆمەڵێک هۆکار هەن ویستی یەکگرتنیان لەلای چەندین کۆمەڵگە و دەوڵەتەوە خولقاندووە و دەخولقێنن کە ئەمانەن

**٢- مەترسی سەربازی یان ویستی سەربەخۆبوون لە هێزە دەرەکییەکان**

ترسی کۆمەڵگاو دەوڵەتە بچووکەکان لە زلهێزە تەماعکارە دراوسێکانیان و هەستکردن بەمەترسی داگیرکاریی سەربازی و ئەوەی لێی دەکەوێتەوە لە زەروورەتی دروستکردنی سیستمێکی بەرگری هاوبەش هۆکارێکی گرنگ بووە بۆ بونیادنانی فیدراڵی لە سویسرا. لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش ئەو مەسەلەیە شێوازی ترسی لە شەڕی سیاسەتە ئەورووپییەکان وەرگرتووە[٣]، چونکە لەوە دەترسا کە ولاتێکی تازە و لاواز و دابەشکراو لەسایەی بڕگەکانی یەکێتی کۆنفیدراڵیدا ببێتە قوربانیی تەماعکاری و هێرشە نزیک وەختە سەربازییەکانی ئەورووپا[٤]. لە کەنەداش ترس و لەرزی پەیوەندار بە ئاسایشی نیشتمانی ڕووی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد، واتە کەنەدا لەکاتی بونیادنانی سیستمی فیدراڵیدا ترسی لە شەڕی ولاتە یەکگرتووەکان هەبوو کە ئەودەمە خەریک بوو لە شەڕێکی توندی ناوخۆیی لە نێوان باکورو باشوور دەهاتە دەرەوە، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی پێشتر دوو هێرشی ئەمریکی کرابووە سەرو مەترسی شەڕ لەسەر سنوورەکانی ئۆریجۆن بوو Oregon[٥].

هەروەها هەستێکی گشتی لە نێو کەنەدییەکاندا چەکەرەی کردبوو سەبارەت بەوەی کە یەکێتی فیدراڵی بەتەنیا لە دوژمنکاریی ئەمریکی نایانپارێزێ بەڵکو خزمەتی ڕکابەرێتی کەنەداش دەکات لەگەڵ پێشکەوتنی خێراو ئەو بەرفراوانی و گەشەسەندنەی کە ئەمریکا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا بەخۆیەوە دیت[٦].

سەرەڕای ئەوەش کە پێشتر باسی لێوەکرا، دەوڵەتە بچووکەکان زۆرجار هەست دەکەن کە لە تەماعکارییە دەرەکییەکان دوور نامێننەوە، لە کاتێکدا ئەگەر بەهەڵوەشاو و گۆشەگیر و لاوازی بمێننەوە. بۆیە ئەو دەوڵەتانە لە ڕوانگەی بەرگریکردن لە خۆ و پاراستنی خودەوە خۆیان لە حاڵەتی تۆپەڵ و یەکگرتن و بونیادنانی سیستمی فیدراڵیدا دەبیننەوە، چونکە ئەو یەکێتییە لە تەماع و دوژمنکاریی هێزە دەرەکییەکان کەم دەکاتەوە[٧] و دەبێتە هۆی دامرکاندنەوەی شۆڕشە ناوخۆییەکان[٨]، بەوپێیەی دەبێتە مایەی دروستبوونی حکوومەتێکی گشتی هاوبەش و توند، بەجۆرێک بونیادنانی دەوڵەتێکی بەهێز و بەشان و شەوکەت و خاوەنی توانای سەربازی و بەڕێوەبردنی کاروباری دەرەکی و پەیوەندییەکان لەگەڵ دەوڵەتانی بیانی لە سەرووی ئەولەویاتی ئەو دەوڵەتەوە بێت، ئەمەش بێگومان وای لێ دەکات کە لە کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتیدا حیسابی ناوەندێکی پایەداری بۆ بکرێ.

### ٣ - ئارەزووی هێنانەدی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان

مەسەلەی ئارەزوو و ئومێدی هێنانەدی بەرژەوەندییە ئابوورییەکان هیچ کاتێک لە خەیاڵی ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگایانە دوور ناکەوێتەوە کە دەیانەوێ یەکێتی فیدراڵی پێکەوە بنێن[٩]. لە ڕابردووشدا بونیادنانی فیدراڵی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەدا و ئوسترالیا مانای کۆنترۆڵکردنی ئابووری و کەمکردنەوەی بەربەستە سنوورییەکان لەسەر بازرگانی نێوان ویلایەت و کەرتەکان و دامەزراندنی سیستمێکی نەتەوەیی بۆ پەیوەندییەکانی دەگەیاند[١٠]. لە زۆربەی حاڵەتەکانیشدا بونیادنانی یەکێتییەکی لەو جۆرە پەیوەند بووە بەهێنانەدی پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئابووری، کە ڕەنگدانەوەیەکی ئیجابییانەی بۆ سەر تەواوی دەوڵەتانی ئەندام لێ کەوتۆتەوە، بۆ نموونە دامەزراندنی یەکێتی فیدراڵی ئەمریکی لە ساڵی ١٧٨٧ لە چەند ویلایەتێک کە بەشێکیان کشتوکاڵی بوون وەک ویلایەتەکانی باشوور و بەشێکی دیکەی پیشەسازی وەک ویلایەتەکانی باکوور بووە مایەی بووژانەوەی ئابووری پێشخستنی بازرگانی لە نێوان ویلایەتەکاندا، لە هەمان کاتیشدا ئەمە کاریگەرییەکی ئیجابییانەی بۆ تەواوی ویلایەتەکانی ئەندام لێ کەوتەوە.

ئەو دەرئەنجامە پۆزەتیڤانەش بەتەنیا بەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەکەوتن بەڵکو بونیادنانی سیستمی فیدراڵی لە هەریەکە لە سویسرا و کەنەدا و ئوسترالیا و ئەڵمانیا و هیندیش بووە هۆی بووژانەوەیەکی گەورە و دەستەبەرکردنی ئەنجامی ئیجابی گرنگ لە

بواری ئابووریدا، دیارترین بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو گەشەسەندنە ئابوورییە گەورەیە کە بەئاشکرا لەو وڵاتانەدا بەرچاو دەکەوێ.

٤- بەشداربوون یان پەیوەندی سیاسی پێشوو:

یەکێک لەو هۆکارانەی کە لە بواری پراکتیکیدا بوونە مایەی دامەزراندنی یەکێتی فیدراڵی، پابەندبوونی کۆمەڵگا یان دەوڵەتانە بەو پێوەندییە سیاسییانەی کە پێش ئەو یەکگرتنە هەیانبووە[١١]، وەک ئەوەی پێکەوە لە یەکێتییەکی کۆنفیدراڵی پێشوودا ئەندام بووبن، وەک ئەو(١٣) موستەعمەرە ئەمریکییەی کە لە کۆنفیدراڵی ئەمریکیدا ئەندام بوون لە دوای سەربەخۆبوونیانەوە لە ساڵی ١٧٧٨ تا کاتی جاڕدانی سیستمی فیدراڵی لە ساڵی ١٧٨٧. هەروەها کانتۆنە سویسرییەکانیش هەر لە ساڵی ١٨١٥ەوە تا ساڵی ١٨٤٨ کە مێژووی دروستبوونی فیدراڵی سویسرییە، بەشدارییان لە یەکێتییەکی کۆنفیدراڵیدا کردووە. یان وەکو ئەو دەوڵەتە ئەندامانەی کە لە ساڵی ١٨٧١دا ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی خاوەن سیستمی فیدراڵییان دروست کرد، ئەوانە هەر لە ساڵی ١٨١٥ تا ساڵی ١٨٦٦ لە یەکێتییەکی فیدراڵیدا کۆبووبوونەوە کە بەیەکێتی جەرمانی ناودەبرا.

یان ئەو دەوڵەتە ئەندامانە پێشتر پێکەوە وەکو چەند بەشێک لە یەک ئیمپراتۆریەتدا ژیابن وەکو موستەعمەرە کەنەدی و ئوستڕالی ویلایەتە هیندییەکان کە لە ڕابردوودا لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیدا بوون.

لەوبارەوە ئارسەر مەکماهۆن Arthur W. Macmahon دەڵێت:

ڕێژەیەکی بەرچاوی حکوومەتە فیدراڵییەکان لە بەشێکی سیفەتی فیدراڵیاندا قەرداری بارودۆخی پێشکەوتنیانن وەکو چەند موستەعمەرەیەک:

A stricking proportion of federal governments owe their (12) pederal at least, to the conditions ofcolonial devalopment. character, in part

ئەمە و لە حاڵەتی دروستبوونی یەکێتی فیدراڵیدا، واتە لە هەڵوەشانەوەو بەش بەشبوونی دەوڵەتێکی یەکبوودا، ئەو هەرێمانە بریتی دەبن لەو بەشە ئیدارییانەی کە پێشتر لە ناو ئەو دەوڵەتەدا بوون و بەر لە بونیادنانی سیستمی فیدراڵیشدا چەند شێوازێکی لامەرکەزی ئیدارییان پیادەکردووە.

### ٥- هۆکاره جوگرافییەکان:

دووربوونی جوگرافی هۆکارێکی گرنگە بۆ دروستبوونی فیدراڵی،چونکە زۆربەی ئەو فیدراڵییانەی کە لە سەردەمی تازەدا سەریان هەڵداوە پێشتر کانتۆن یان ویلایەت یاخود کەرتی دوور لە یەک بوون، وەک ئەو دوورییەی کە لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ویلایەتەکانی ئوسترالی و کەرتە کەنەدییەکاندا هەیە، هەروەها دەبینین کە چۆن سنووره شاخاوییەکان سویسرایان بۆ سەر چەند کانتۆنێکی جیاواز دابەش کردووە[١٣].

ئەمەش لەبەرئەوەی یەکێتی فیدراڵی دەوەستێتە سەر ئارەزووی ئەندامانی لە یەکگرتن بۆ هەندێک مەبەست و جیابوونەوە بۆ هەندێک مەبەستی دیکە.

کەواتە ئەو کۆمەڵگە و هەرێمانەی کە یەکێتی پێکدێنن لەبەرئەوەی تا ڕادەیەک لەڕووی جوگرافییەوە لە یەک دوورن، بۆیە ئەمە ئارەزوویان زیاتر دەکات بۆ پێکهێنانی یەکێتی فیدراڵی، چونکە یەکێتییەکی لەوجۆرە دەبێتە مایەی ئەوەی کە هەستی هەرێمیی و ویستی سەربەخۆیی خودییان بەهێزتر بکات[١٤].

ئەگەرچیش بوونی بڕێک دووریی جوگرافی لە نێوان هەرێمەکاندا تا ڕادەیەک پێویستە بەڵام دەبێ ئەو دوورییە بەرفراوان نەبێ و جۆرە پەیوەندی و هاوسێیەکیش لە نێوانیاندا بەدی بکرێ دوورکەوتنەوە و گۆشەگیربوونیان لە یەکتر دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی یەکێتی و بەردەوام نەبوونی، وەک ئەوەی لە یەکێتی فیدراڵی پاکستانیدا ڕووی دا کە بەنگلادشی دەگرتە خۆی و تا بەر لەسەربەخۆ بوونیشی لەساڵی ١٩٧٠دا بەهەرێمی بەنگال دەناسراو هەرێمێکی دەوڵەتی پاکستانی خاوەن دەستووری فیدراڵی بوو و دەوڵەتی هیند دەکەوتە نێوان ئەو هەرێمە و دەوڵەتی پاکستان بەڵام لەبەر چەند هۆکارێک مانەوەی ئەو هەرێمە لە ڕیزی یەکێتی پاکستاندا درێژەی نەکێشا، لە نێوانیاندا بوونی دوورییەکی جوگرافی بەرفراوان لەگەڵ بەشەکانی تری یەکێتییەکەدا، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە ئەگەر وای دابنێین یەکێتییەک لە نێوان چەند هەرێمێکدا دروست ببێ کە لە ڕووی جوگرافییەوە لە یەک دوور و جیاوازبن، ئەو کاتە دەوڵەتی یەکێتی چۆن بەرگری لە ویلایەتەکانی دەکات و لە ڕووی سەربازییەوە پشتگیرییان لێ بکات لە کاتێکدا ئەگەر دووچاری دوژمنکاری سەربازی دەرەکی بوونەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە بوونی دووریی بەرفراوان دەبێتە هۆی گوێ نەدان یان هەست گرانیی لە لایەن حکوومەتە ناوەندی و هەرێمییەکانەوە. بەم جۆرە تا دووری نێوان گەلان

زیاتربێ، ئەوەندەش وەدیهاتنی یەکێتی نەتەوەیی زەحمەت دەبێ.

لە پێکهێنانی فیدراڵیدا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هۆکارە جوگرافییەکان ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە، لەو بارەوە چارلس بیرد دەڵێ:

«تێبینی ئەوەی کە ئەمریکای سەربەخۆ هەرگیز لە هەرێمی جیاواز و دوور لەیەک پێک نەدەهات هەمیشە خۆشحاڵیم پێ دەبەخشن، بەڵام ئەو وڵاتە یەکگرتوو و بەپیت و بەرەکەتە و بەرفراوانە بەشی ڕۆڵە ڕۆژئاواییەکانمان بووە لە ئازادی.

(It has often given me pleasure to observe that independent com-
posed of detached and distant territories, but that one American was
wide- sproading country was the portion (15) not connected, Fertile,
of our western sons of liberty)

## ٦- وێکچوونی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان[١٦]:

وێکچوونی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان بەیەکێک لە فاکتەرە یارمەتیدەرەکانی بونیادنانی سیستەمی فیدراڵی دادەنرێ، زیاتر بەهۆی ئەو کاریگەرییەی کە لە نزیککردنەوەی دەوڵەتانی ئەندام و تێگەیشتنیان لە یەکتر هەیەتی، بەڵام دەکرێ ئەوەش بگوترێ کە وێکچوونی ڕەها پێویست نییەو سیستەمە فیدراڵییە دامەزراوەکان ڕێگا بەبوونی هەندێک جیاوازی دەدەن بەڵکو ئەو جیاوازییانە دەبنە یەکێک لەو هۆکارانەی پاڵ بەدەوڵەتانی ئەندامەوە دەنێن کە سیستەمی فیدراڵی هەڵبژێرن و لە سیستەمی دەوڵەتی یەکبووی بەباشتر بزانن، چونکە سیستەمێکی لەو جۆرە پاراستنی ناسنامە و دامودەزگا تایبەتەکان بۆ کۆمەڵگا ئەندامەکان زامن دەکات لە ڕێگەی ئەو سەربەخۆییە خودییەی کە لە لایەن دەستووری فیدراڵییەوە پێیان دەبەخشرێ، بەوپێیەش کە فیدراڵی ڕێز لە تایبەتمەندی فرەلایەنی دەگرێ کاتێک ئەو تایبەتمەندی فرەلایەنییە ڕەوابن، هەروەها جەختیش لەسەر یەکگرتن و ڕێزگرتنی بنەماکانی و قوربانیدان لە پێناویدا دەکاتەوە، بەواتایەکی تر سەرکەوتنی دڵسۆزی نیشتمانی بەسەر دڵسۆزییەکانی دیکەدا. بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەو جیاوازییە دەبێ زۆر گەورە نەبێ ئەگینا دەبێتە کۆسپێک لە بەردەمی یەکێتیدا.

## ٧- وێکچوونی سیستەمە سیاسییەکان:

لە میانەی ئەزموونە جۆراوجۆر و تازەکانی فیدراڵیدا دەرکەوتووە کە وێکچوونی

سیستـمه سیاسییـەکان بەیەکێک لەو هۆکـارانە دادەنرێ کە دەبنە مـایەی دروستـبوونی سیستـمی فـیدراڵی[17] بوونی جیاوازیش لە سیستـمە سیاسییـەکـاندا لەوانەیە ببێـتە بەربەستـێـک لەبەردەم یەکـێـتـییـەکی لەو جۆرەدا، ئەوەتا بەر لە هاتنەکـایەی یەکـێـتی فیدراڵیدا، کانتۆنە سویسرییەکان لە ڕووی سیستمی سیاسییەوە جیاوازبوون، هەندێکیان ئەرستـۆکـرات و هەندێکی دیکەش ئۆلیـجـارکی و بەشـێکیش دیموکـراسی و یەکـێکیـان (نیوشاتل) پادشایەتی بوون، بەڵام بەرلەوەی ڕێگە بەدروستـبوونی سیستـمی فـیدراڵی بدرێ لە ساڵی ١٨٤٨، دەست کرا بەیەکخستـنی سیستـمە سیاسییەکانی ئەو کـانتۆناتانە و گۆڕینیان بۆ سیستمی کۆماریی دیموکراسی.

هەروەها ئەو جیاوازییەی کە لە سیستـمە سیاسییەکانی نێوان هیندی بەریتانی و ئەو ویلایەتانەدا هەبوون کە لە لایەن میرە ئۆتۆکراتەکانەوە لە هیند بەڕێوە دەبران، هۆکارێکی گـرنگ بـوو بۆ نەبوونی توانای پیـادەکـردنی یاسـای سـاڵی ١٩٣٥ی خـاوەن سـروشـتی فیدراڵیی حکوومەتی هیند[18].

گـرنگی وێکچـوونی سـیـسـتـمـە سـیـاسـیـیـەکـانی لەوەشـدا دەردەکـەوێ کـە دانەرانی دەستوورەکان هەمیشە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هەموو گرووپ- دەوڵەتانی ئەندام- دەبێ هەمـان شـێـواز لە بەڕێوەبردن بگرنەبەر، هەروەها چەندین دەسـتـووری وەک دەستـوورەکـانی سـویسرا و یەکـێتی سۆڤـیەتی پێشـوو و وڵاتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکا دووپاتی دەکەنەوە کە حکوومەتە ئەندامەکـان دەبێ لە حوکمداریدا شێوازی کۆماری بگرنە بەر.

### ٨- نەتەوە و ئایین و زمان:

بەشـداربوون لە نەتەوە یان ئاین یاخـود زمـاندا لەوانەیە یەکـێک بن لە هۆکـارە بەرچاوەکانی بونیـادنانی سیستـمی فـیدراڵی، چونکە بەبوونی ئەو پەیوەندییـانە ئەگەری پێکەوە کـارکردن ئاسانتـر دەبێ، لەو بارەوە (ویبر)ی پسپۆڕ باس لەوە دەکـات کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرەڕای بوونی چەندین هۆکاری جیاوازی و جیابوونەوەی وەک جیـاوازی ڕەگەزی کۆیلایەتی و دووری جوگرافی و بوونی سەربەخۆی پێشـوو و شـتی تر بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ئەمریکا لە دۆزینەوەی ئەگـەری یەکگرتندا قەرداری توانای پێکەوە کارکردنە کە لە ئەنجامی هاوبەشی لە ڕەگەز و ئایین و زمانەوە وەدی هاتووە[19].

سەبارەت بەهەمان مانا چارلس بیرد دەڵێ:

«بەشداربوون لە زمان و ئايين و دابونەريتەكاندا هۆكارێكی گرنگ بوو لە دروستبوونی يەكێتی فيدراڵی ئەمريكی[٢٠].

٩- سەركردايەتی

ئەزموونە نوێيەكانی فيدراڵی دەريانخستووە كە فاكتەری سەركردايەتی لە بونيادنانی سيستمی فيدراڵيدا ڕۆڵ و بايەخی بەرچاوی هەيە، ئەگەر چيش لەوانەيە ئەو هۆكارانەی پێشتر باسيان لێوەكراوە پێشتر هەبووبن بەڵام وەكو پێويست نەبوون بەمايەی سەرهەڵدانی يەكێتی فيدراڵی و لە بەرامبەريشدا بەرپرسياريەتی گەورە دەكەوێتە ئەستۆی ڕۆڵی سەركردايەتی و زەروورەتی دەركەوتنی لە كاتی پێويستدا بۆ وەديهێنانی ئەو ئامانجە، بۆ نموونە دەبينين ماوەيەكی دوورودرێژ بەر لە ساڵی ١٧٨٧ ئەو فاكتەرانە لە وڵاتە يەكگرتووەكانی ئەمريكادا هەبوون بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بوونە مايەی دروستبوونی يەكێتييەكی كۆنفيدراڵی لاواز، بەهۆی نەبوونی سەركردايەتييەكی كاريگەر لەو كاتەدا، هەروەها كۆنگرەی فيلادلفيای ساڵی ١٧٨٧يش بەهۆی ئەو بەش بەشييەی كە ڕووبەڕووی بووەوە گەيشتە لێواری شكستهێنان، ئەگەر سەركردايەتی و ڕۆڵی بەرچاو و يەكلاكەرەوەی هەريەكە لە جۆرج واشنتۆن و ئەلكسەندەر هاملۆن و جيمس ماديسۆن و جۆن جی و بەنجامين و فرانكلين و جيمس ويلسۆنيش نەبوايە يەكێتی فيدراڵی ئەمريكی سەری نەدەگرت وەك چۆن لە بەرپابوونی ئيمپراتۆريەتی فيدراڵی ئەڵمانی لە ساڵی ١٨٧١ بسمارك ڕۆڵی كاريگەری بينی و سەركردايەتی جۆن ماكدۆنالد و ئەلكسەندەر جالت و جۆرج ئيتين لە هێنانەدی فيدراڵی كەنەديدا دەوری بنەڕەتی هەبوو.

هەروەها بەرپابوون و پێگەيشتنی يەكێتی فيدراڵی كۆمنوێلسی ئوستراليا لە ساڵی ١٩٠١دا بۆ سەركردايەتی باركس و بارتۆن و ديكن دەگەڕێتەوە[٢١].

وەك چۆن ڕۆڵی كاريگەر لە بەرپابوونی فيدراڵی بۆ سەركردايەتی دەگەڕێتەوە، بەهەمان شێوە سەركردايەتی دەتوانێ ڕۆڵی سەرەكی لە ڕێگەگرتن لەبەرپابوونی ئەو سيستمە ببينێ وەك ئەوەی لە باشووری ئەفريقيا بەدی دەكرێ لەو بارەشەوە (ويير)ی پسپۆڕ دەڵێ:

«بەم جۆرە لە باشووری ئەفريقيا هەموو ئەو فاكتەرانە هەبوون كە يەكێتی فيدراڵييان لە كەنەدا بەرپاكرد- بوونی سەربەخۆ وەك چەند موستەعمەرەيەكی ديار، جياوازی لە سيستمە كۆمەڵايەتييەكان... بەڵام بەهۆی ئارەزووی دەوڵەتی يەكبوو زاڵ كرا بەسەر ويستی يەكگرتن- بەڵام بەلامەركەزييەكی باڵا- ئەمەش بەكردەوەی هێزی سەركردايەتی ئەنجام درا

که له لایەن چەند کەسێکی دیاریکراوی وەک سموتس و میریمان و دی ڤالیری پیادەکرا، ئەوانە ئەگەرچی بڕیاریان دا کە دەبێ یەکێتییەک بەرپابکرێ بەڵام یەکێتی فیدراڵی گونجاو نییە چونکە زۆری تێدەچێ و زۆر یاساییشە، واتە لە ناوەندەوە زۆر لاوازە و لە دەوروبەریشدا زۆر بەهێزە[٢٢] لە لایەن خۆیەوە ئارسەر مەکماهۆن وای بۆ دەچێ کە سەرکردە بوەیرییەکان لە باشووری ئەفریقیا چەندین هۆکاریان هەبوو بۆ ڕەتکردنەوەی فیدراڵی و بونیادنانی یەکێتییەکی یەکبوو[٢٣].

دەبێ ئەوەش بزانرێ کە ئەم ناوە لە ڕووی یاساییەوە زۆر وردنییە چونکە یەکێتی بەسروشتی خۆی فرەلایەنی دەگرێتە خۆی نەوەک یەکبوون.

**١٠- فاکتەری تەقلید و لەچاوکردنەوە**

دەکرێ بوترێ ئەزموونی فیدراڵی ساڵی ١٧٨٧ی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەزموونێکی ڕەسەنەو دەرئەنجامی شارەزایی سەدەکانی ڕابردووی ئەو وڵاتەیە[٢٤].

بێجگە لە ئەزموونی ناوبراو لە هەموو ئەزموونەکانی دیکەدا هۆکاری تەقلید و لە چاوکردنەوە ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە بەرهەمهێنانی ئارەزووی بونیادنانی سیستمی فیدراڵی.

بەواتایەکی دیکە، دەکرێ بوترێ دانەرانی دەستوور لەو دەوڵەتە جۆراوجۆرانەدا کە پەنایان بردۆتە بەر شێوازی فیدراڵی تا ڕادەیەک کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەزموونی ئەمریکی و بەشێوەیەک لە شێوەکانیش چاویان لە سیستمی فیدراڵی ئەمریکی کردووە.[٢٥]

بەڵام هەندێک لەو دەوڵەتانە وەک سویسرا و کەنەدا و ئوستراليا ئەگەرچی کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەزموونی ئەمریکی لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی هۆکارەکانی تر بوون کە دەبنە مایەی بەرهەمهێنانی ویستی پێکهێنانی فیدراڵی، هەروەها بەبێ بەرنامەیی لەچاو سیستمی سیاسی ئەمریکیان نەکردۆتەوە، بەڵکو ئەوەیان وەرگرتووە کە لەگەڵ بارودۆخەکانیاندا دەگونجێ و ئەوەی تریشیان بەجێ هێشتووە، لەبەر ئەمەشە ئەزموونە فیدراڵییەکان تیایاندا سەرکەوتووبوون بەپێچەوانەی هەندێک دەوڵەتی وەک کۆمارەکانی ئەمریکای باشوور و ناوەندی کە بەبێ لێکۆڵینەوە و بوونی بەرنامە و دڵنیابوون لە بوونی فاکتەرەکانی دیکە لەچاو ئەزموونی ئەمریکییان کردۆتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هۆکارەکانی نەتوانینی فیدراڵی لە داکوتینی ڕەگەکانی لە کۆمارەکانی ئەمریکای باشوور و

ناوەندی شی دەکاتەوە، چونکە هۆکارەکانی دیکە کە بەرهەمهێنی ویستی فیدراڵین لەو دەوڵەتانەدا بوونی نەبوو[٢٦].

## دووەم: هۆکارەکانی سەرکەوتنی سیستمی فیدراڵی:

دوای ئەوەی باسمان لەو هۆکارانە کرد کە لەوانەیە بنە مایەی بونیادنانی سیستمی فیدراڵی ئەوەبوو لە میانەی یەک بەدوایەکدا هاتنیان لە سیستمە فیدراڵییەکاندا دیارکران، ئەو سیستمانەی لە ساڵی ١٧٨٧ەوە پێکهێنراون وا باشترە بەجیا باس لەو هۆکارانە بکەین کە دەبنە مایەی بەردەوامی و سەرکەوتنی سیستمی فیدراڵی، ئەوەش کە لە هیچ لایەکمان ناشاردرێتەوە هەموو ئەزموونە فیدراڵییەکان چارەنووسیان سەرکەوتن نەبووە، هەندێکیان سەرکەوتن و پێشکەوتنیان بەخۆوە دیتووە و هەندێکی دیکەش دووچاری شکەست و دارِمان بوونەوە.

لەمیانەی تیشک خستنە سەر ئەو هۆکارانەی کە بەشدارییان لە سەرخستنی ئەزموونە ئیجابییەکانی فیدراڵیدا کردووە، لە هەمان کاتدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش ئەو هۆکارە نێگەتیڤانە دەخەینە ڕوو کە بوونە هۆی گلان و شکست هێنانی ئەزموونەکانی دیکە، ئەمانەی خوارەوەش گرنگترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی سیستمی فیدراڵین:

### ١ - مەرجی شارستانی - کلتووری:

پیادەکردنی سیستمی فیدراڵی لە وڵاتێکدا دەوەستێتە سەر ئاستی پێشکەوتنی شارستانی و کلتووری کە کۆمەڵگاکانی وڵاتانی ئەندام پێی گەیشتوون بەتایبەتیش ئاستی هەستی مەدەنی و باوەڕهێنان بەبنەماو بەهاکانی دیموکراسیی بەم جۆرە سیستمی فیدراڵی بەوەی دەیگرێتە خۆی لە بوونی دوو جۆر حکوومەت و دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوانیاندا و سەربەخۆیی هەریەکەیان لە ئەوەی تر لەو بوارەدا کە دەستوور بۆی دیارکردووە لەگەڵ زەرووڕەتی دەستێوەرنەدانی هیچ لایەک لە چوارچێوەی ئەوەی بۆ لایەکەی دیکە دیارکراوە، ئەمە هەرگیز نابێتە چارەسەرێکی گونجاو و سەرکەوتوو بۆ ئەو کۆمەڵگا دواکەوتووانەی کە هێشتا نەگەیشتوونەتە ئاستێکی وای شارستانی و کلتووری، ئەمەش ئەوەمان بۆ شی دەکاتەوە کە چۆن هەندێک لەو ئەزموونە فیدراڵییانەی کە لە ژمارەیەک وڵاتدا پێکهێنراون- ئەوانەی کۆمەڵگاکانیان نەگەیشتبوونە قۆناغێکی گونجاو لە پێشکەوتنی شارستانی و کلتووری- چەقیون و نەیانتوانی خۆیان ڕابگرن دواتر

هەرەسیان هێنا وەکو کۆمارەکانی ئەمریکای باشوور و ناوەندی(٢٧).

لە بەرامبەریشدا سەرکەوتنی ئەزموونە فیدراڵییەکان لەو وڵاتانەدا بەدی دەکەین کە گەیشتوونەتە پلەیەکی گونجاو لە پێشکەوتنی شارستانی و کلتووری وەکو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو سویسرا و کەنەدا و ئوسترالیا و ئەڵمانیا.

دکتۆر عصام سلێمان پێی وایە کە تایەفە جۆراوجۆرەکانی لە وڵاتە فیدراڵییەکاندا دەبێ لە رووی دەروونییەوە ئامادەبن بۆ قبوولکردنی فیدراڵی، واتە دەبێ زۆرینەی هەرە زۆری ئەندامانی تایەفەکانی خاوەنی هەستێکی مەدەنی فیدراڵی بن سەرەڕای بوونی گیانی هاوکاری و بوونیادنەری ڕاستگۆیانە بەمەبەستی بونیادنانی سیستەمی فیدراڵی، بەپێچەوانەی ئەمەو لەگەڵ نەبوونی ئەوانەی باس کران و بڵاوەکردنی ناکۆکی و خۆویستی و هەوڵدانی هەر لایەک بۆ هێنانەدیی بەرژەوەندییە تەسکەکانیان لەسەر حیسابی بەرژەوەندی گشتی، ئەوکاتە لە ناوەڕۆکی بنەمای فیدراڵی دوور دەکەوینەوە و بارودۆخەکەش دەگاتە ئاستی ئاڵۆزی کاری دامودەزگا فیدراڵییەکان و دواتر کۆتایی خودی سیستەمی فیدراڵی(٢٨).

## ٢- سیستەمی دیموکراسی

لەوەی پێشتر باسی لێوە کرا دەردەکەوێ کە سیستەمی فیدراڵی لەسەر بنەماکانی هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، هەروەها دابەشکردنی لە نێوان دوو حکوومەتدا سەردەگرێ، بەمەرجێک هەردووکیان لەگەڵ یەکتر گونجاوبن و دەخالەتی دەسەڵات و تایبەتمەندییەکانی یەکتر نەکەن. جگە لەمە ئەو سیستەمە پێویستی بەبوونی دەسەڵاتی تەشریعیی فیدراڵی دوولایەن Bicameral و دەسەڵاتی دادوەریی بێ لایەن و کاریگەر هەیە. بێگومان پیادەکردنی ئەو بنەمایانەو پێشخستنیان پێویستی بەبوونی چەند شێوازێکی حوکم هەیە خاوەنی سیفەت و خەسڵەتی تایبەت بێ بەمەرجێک پەیوەندییان بەدیموکراسی و حکوومەتی ئازادەوە هەبێ. ئەگەرچیش درێژەی شێوازی ئەو حکوومەتە گرنگییەکی ئەوتۆی نییە بەڵام گرنگ ئەوەیە پشت بەهەڵبژاردنە گشتییەکان و سیستەمی فرە حزبی و زامنکردنی ئۆپۆزسیۆنی بەرپرس ببەستێ(٢٩).

سیستەمی فیدراڵی هەرگیز ناتوانی لە سایەی سیستەمە ئۆتۆکرات و دیکتاتۆرییەکاندا گەشە بکات و وەکو پێویست کار بکات چونکە ئۆتۆکرات و دیکتاتۆری چ لە حکوومەتی فیدراڵ یان لە حکوومەتە هەرێمییەکاندا خۆیان بنوێنن، ئەوکاتە زوو یان درەنگ دەبنە

مایەی تێکدانی یەکسانی لە بنکەی یاسایی و وێرانکردنی ئەو سەربەخۆیییەی کە دەبێ ئەو حکوومەتانە هەریەکە و لە بواری خۆیدا و بەپێی سیستمی فیدراڵی پێی بەهرەمەندبن[٣٠].

وییری پسپۆڕ دەری دەخات کە ئەگەر هەموو یان هەندێک حکوومەتی هەرێمیمان بەدیکتاتۆری دانا، ئەوکاتە چ جۆرە ئالیەتێک بدۆزرێتەوە بۆ دەستنیشانکردنی حکوومەتی گشتی کە دەبێ لە حکوومەتە هەرێمییەکان جیاواز و سەربەخۆبێ، ئەمە لەکاتێکدا کە لە هەرێمە ئۆتۆکراتەکاندا چاوەڕێی ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی ئازاد لە لایەن هاووڵاتییانەوە ناکرێ؟

ناوبراو بەم جۆرە وەڵامی پرسیارەکە دەداتەوە و دەڵێ: گومان نییە کە لەو حاڵەتەدا حکوومەتی گشتی لە نوێنەرانی ئۆتۆکرات لە هەرێمەکاندا پێک دەهێنرێ[٣١].

لە کاتێکیشدا ئەگەر حکوومەتی فیدراڵی دیکتاتۆری بێت، ئایا چاوەڕێ دەکرێ رێگەی بەرفراوانکردنی دەسەڵاتی لە ناو ویلایەت و هەرێمەکاندا لێ بگیرێ؟

لە هیچ حاڵەتێکدا ناکرێ وەڵامی ئەو پرسیارە ئیجابییانە بێت چونکە بێگومان تا پێی بکرێ پەنا دەباتە بەر فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆی لەسەر حیسابی ویلایەت و هەرێمەکان، بگرە بەچاوی کەم و تەبەعییەتەوە سەیریان دەکات، هەر ئەمەش لە وڵاتانی ئەمەریکای باشوور ڕوویدا کە تیایاندا پشت بەدەستوورە فیدراڵییەکان بەسترابوو. ئەوە بوو سەرۆکەکانی ئەم وڵاتە پشت بەستووانە بەسیستمی خاوەن ئاراستەی دیکتاتۆری هەوڵیاندا لە ڕێگەی تێوەگلاندن و پاڵ پێوەنانی لایەنگرانیان بۆ ناو ئەو حکوومەتانە، حکوومەتە هەرێمییەکان پەلکێش بکەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

هەروەها لە دوای کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات لە لایەن ڕژێمی نازییەوە لە ئەڵمانیا، ڕژێمی ناوبراو هەموو بنەماکانی دەسەڵاتی سەربەخۆی پێ بەخشراوی لە دەوڵەتانی ئەندامی سەندەوە و خستییە چوارچێوەی دەسەڵاتەکانی خۆیەوە[٣٢].

وییر باس لەوە دەکات کە لە ڕووی تیۆرییەوە دەکرێ چاوەڕێی حکوومەتە گشتی و هەرێمە دیکتاتۆرییەکان و مانەوەی هەریەکەیان لە ئەنجوومەنە تایبەتییەکانیان بکرێ، بەڵام لە بواری سیاسەتە پراکتیکییەکاندا زەحمەتە حکوومەتێکی فیدراڵی لەو جۆرە بێتە وجود یان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بمێنێتەوە.

لەگەڵ ناوبراوەکاندا ڕێک دەکەوین کاتێک دووپاتی دەکاتەوە کە دیکتاتۆرییەت

بەحکوومەتی تاکە حزبی و ڕەتکردنەوەی هەڵبژاردنی ئازاد ناگونجێت و ناڕێکە لەگەڵ سروشتی بنەمای فیدراڵیدا(٣٣).

### ٣ – وێکچوونی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان

وێکچوونی سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان بەوێکچوونی سیستەمە سیاسییەکانیشەوە تەنیا هۆکارێک نین بۆ پێکهێنانی یەکێتی فیدراڵی، بگرە هۆکارێکیشن بۆ سەرکەوتن و بەردەوامی ئەو سیستەمە لە کۆمەڵگاکانی دەوڵەتانی ئەندامیشدا سیستەمە کۆمەڵایەتییەکان تا چەند لە یەک بچن ئەوەندە کاری یەکێتی ئاسان دەبێ و فیدراڵیش پتەو و سەقامگیر دەبێ، پێچەوانەی ئەمەش ڕاستە، چونکە بوونی جیاوازی لەو ڕووەوە دەبێتە مایەی کۆتبەندکردنی کاری یەکێتی بگرە هەڵوەشانەوەشی و دواتر کۆتایی و لە ناوچوونی.

لەکاتی پێکهێنانی یەکێتی فیدراڵی ئەمەریکیدا جیاوازییەکی بنەڕەتی دەربارەی مەسەلەی کۆیلایەتی لە ئارادابوو، ئەوەبوو ویلایەتەکانی باشوور وەکو ڕێکخستنێکی یاسایی پابەندبوون بەپاراستنی سیستەمی کۆیلایەتی، لەکاتێکدا ویلایەتەکانی باکوور بەپێچەوانەی ئەمە ئازاد بوون و ئەو سیستەمەیان پیادە نەدەکرد بگرە لە ڕووی یاساییەوە دواتر لەکاتی پێکهێنانی یەکێتیدا لە ساڵی ١٧٨٧ ئەو جیاوازییە بنەڕەتییەوە بەلاوە نرا ئەگەرچی هێشتا ڕێگە چارەی گونجاوی بۆ نەدۆزرابووەوە، بەمەش جیاوازی ناوبراو وەکو ئاگری ژێرکا بۆ ماوەیەک لەژێرەوە کاری دەکرد، تاوەکو دوای حەفتا ساڵ سەری هەڵدا و گەیشتە قۆناغێکی مەترسیدار و لە ئەنجامیشدا ویلایەتەکانی باشوور لە یەکێتی جیابوونەوە، ئەمەش وای لە سەرۆک ئیبراهام لنکۆلن کرد کە لە ساڵی ١٨٥٨دا وتە بەناوبانگەکەی ڕابگەیەنێ:-

(ماڵی دابەش بوو لە دژی خۆیدا ناتوانێ بەپێوە بوەستێ، لەو باوەڕەدام ئەو حکوومەتە ناتوانێ بەشێوەیەکی هەمیشەیی، نیوەی کۆیلە و نیوەکەی تری ئازاد بمێنی، یان دەبێ هەمووی وەکو یەک شت وابێ یاخود هەمووی ببیتە شتێکی تر(٣٤)).

A house divided againstit self cannot stand, I believe this govern ment cannot endure permanently half slave and have Free,..... it will become all one thing or all the other.

بۆیە لە دوای تەواوبوونی شەڕی ناوخۆ کە لە ساڵی ١٨٦١ تا ١٨٦٥ بەردەوام بوو چەند هەمووارکردنێک خرایە دەستووری ئەمەریکی، ئەو هەمووارکردنانە بەجۆرێک

داڕێژرابوون کە بنە مایەی لادانی هەموو ئاسەوارە یاساییەکان کە ئەو جیاوازییە تایبەتانە لە سیستمە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان ویلایەتێک و یەکێکی تری یەکێتی فیدراڵی ئەمەریکی دەگرنە خۆیان، بەڵام وێکچوونی سیستمە کۆمەڵایەتییەکان مەرج نییە وێکچوونێکی تەواو و ڕەها بێت بەڵکو دەکرێ لە نێوان دەوڵەتانی ئەندامدا هەندێک جیاوازی لەو سیستمانەدا هەبێ، بۆ نموونە لە کەنەدا ئەگەرچی بەشێوەیەکی گشتی یەکبوون و وێکچوون پێویستە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگە بەبوونی هەندێک جیاوازی دراوە، کیوبیک خاوەنی یاسای مەدەنی تایبەت بەخۆی بوو بەڵام بۆ سەرتاپای کەنەدا یەک یاسای تاوانکاری هەبوو. بەڵام پێویستە ئەوە دووپات بکرێتەوە کە توانای ویلایەت یان دەوڵەتانی ئەندام لە دامەزراندن و پێکهێنانی یەکێتی فیدراڵی دەوەستێتە سەر بڕێک ڕێککەوتن لەسەر جیاوازی بەمەرجێک ئەو جیاوازییە زۆرنەبێ[٣٥].

ئەوەی لە سەرەوە سەبارەت بەسیستمە کۆمەڵایەتییەکان خرایە ڕوو، هەمان شتیش بەسەر سیستمە سیاسییەکاندا پیادە دەکرێ، وێکچوونی ئەو سیستمانە دەبێتە مایەی سەقامگیربوونی یەکێتی و پێشکەوتنی بەپێچەوانەی جیاوازی لە سیستمە سیاسییەکاندا کە دەبێتە هۆی وەستان و شکست و داڕمانی فیدراڵی، وێڕای ئەمەش وبیر پێی وایە کە یەکگرتنی نێوان دەوڵەتانی خاوەن سیستمی جۆراوجۆر ئەوە نییە کە هەرگیز نەهێنرێتە دی، چونکە ئەمە دەوەستێتە سەر سروشتی ئەو سیستمە، ئەوەتا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەرتەکانی کەنەدا لە سیستمە سیاسییەکاندا جیاوازن، یەکەمیان سیستمێکی سەرۆکایەتی پیادە دەکات لە کاتێکدا دووەمیان سیستمی پەرلەمانی گرتۆتە بەر، بەڵام سەرەڕای ئەوەش دەکرێ وای بینینە بەرچاو کە هەردوو سیستەم شوێنی خۆیان لەناو یەک یەکێتیدا ببیننەوە، چونکە هەردووکیان بەشێوەیەکی وا دامەزرێنراون کە لە بنەڕەتدا پشت بەبنەماکانی دیموکراسی، هەڵبژاردن و ڕەخنەی ئازاد و سیستمی نوێنەرایەتی دەبەستن.

بەڵام ئەوەی لەو بوارەدا زەحمەتە تێکەڵ بەیەک بکرێن، سیستمە فاشستی و ئولیجارکییەکانە لەگەڵ سیستمە دیموکراتییەکان، لە کاتی زانینی ئەو ڕاستییانەشدا، هۆکاری سەرنەکەوتن و پیادەنەکردنی یاسای ساڵی ١٩٣٥ی حکوومەتی هیندمان بۆ دەردەکەوێ، ئەو یاسایەی کە تەبەننای سیستمی فیدراڵی لە نێوان ئەو ویلایەتانەدا کرد کە لە لایەن میرە ئۆتۆکراتەکانەوە بەڕێوە دەبران لەگەڵ ئەو کەرتانەی کە سەر بەهیندی بەریتانی بوون و لە ڕێگادا بوون بەرەو حکوومەتێکی نوێنەرایەتی بەرپرس[٣٦].

### ٤- هۆکاری ئابووری

یەکێک لەو ڕەگەزە گرنگانەی کە سەرکەوتنی سیستمی فیدراڵی دەوەستێتە سەر بوونی سەرچاوەی ئابووری پێویستە بۆ کۆمەککردنی حکوومەتی فیدراڵی و حکوومەتە هەرێمییەکان، گرنگ نییە حکوومەتی فیدراڵی بەتەنها توانای کۆمەککردنی خۆی هەبێ ، بەڵکو گرنگ ئەوەیە حکوومەتە هەرێمییەکان توانای هەمان شتیان هەبێ، یەکێک لەو ڕەخنانەش کە پسپۆڕان ئاراستەی ئەو سیستمەی دەکەن ئەوەیە کە خەرجییەکی زۆر دەخاتە سەر خەزێنەی دەوڵەت(٣٧). لە کاتێکدا ئەگەر ویسترا یەکێتی فیدراڵی دابمەزرێنرێ، ئەو کاتە پێویستە ئەم پرسیارە بکرێ: ئایا سەرچاوەی دارایی پێویست هەن بۆ پشتگیریکردن لە حکوومەتە هەرێمییە خاوەن سەربەخۆ خودییەکان؟

ئەگەر سەرچاوەی پێویست نەبێ بۆ ئەو مەبەستە، ئەوکاتە گرنگ نییە تا چ ئاستێک ویلایەت یان گرووپە ئەندامەکان ئارەزوویان لە یەکێتی فیدراڵییە، هەروەها گرنگیش نییە ئاخۆ دەستووری فیدراڵی دەرچووە یان نا، چونکە لە بواری کردەییدا دروستکردنی حکوومەتی فیدراڵی مومکین نابێت، بەوپێیەی کە حکوومەتە هەرێمییەکان توانای جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان نابێ، ئەگەر توانای ئەمەشیان هەبێ بەڵام لەسەر حیسابی سەربەخۆیی دارایی خۆیانە، واتە لە کۆمەککردندا پشت بەحکوومەتی فیدراڵی دەبەستن و ئەمەش ئاسەواری نێگەتیڤانەی بۆ سەر بنەمای فیدراڵی بەدواوە دەبێ.

وییر وای بۆ دەچێ کە هۆکاری ئابووری یەکێک بوو لەو فاکتەرانەی کە بوونە مایەی ڕەتکردنەوەی یەکێتی فیدراڵی لە لایەن سەرکردەکانی باشووری ئەفریقیا، چونکە ئەوان پێیان وابوو سەرچاوە داراییەکان بەشێوەیێکی ناگونجاو کۆدەکرێنەوە ئەگەر پێویست بوو سەرچاوەی دارایی بۆ حکوومەتی گشتی دابین بکرێت.

هەروەها لەبەرئەوەی فیدراڵی پێویستی بەخەرجی دارایی زۆر هەیە وەک وییر دەڵێ- لێرەدا پرسیار ئەوە دەبێ: ئاخۆ ئەو سەربەخۆییەی ئەو سیستمە بەحکوومەتە ئەندامەکانی دەبەخشێ شایەنی ئەو نرخەیە کە لە پێناوی هێنانەدیدا دەدرێ(٣٨).

لە ئوستورالیا بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ڕەخنەی زۆر ئاراستەی فیدراڵی کرا بەو پێیەی ئەو سیستمە گونجاو نییە چونکە بارگرانی زیاتر دەخاتە ئەستۆی میللەت لە دابینکردنی پێداویستی تەواو بۆ حکوومەکانی شەش ویلایەت و حکوومەتی کۆمنوێلس بەگشتی(٣٩).

ئەو پرسیارە گرنگەش کە سەبارەت بەوبابەتەوە لە ئارادایە پەیوەندی بەگرنگی سەرچاوە ئابوورییە بەردەستەکانەوە دابەشکردنیان لە نێوان حکوومەتی گشتی و حکوومەتە هەرێمییەکاندا هەیە بەجۆرێک نەبێتە هۆی تەبەعییەتی حکوومەتە هەرێمیەکان و پشت بەستنیان بەحکوومەتی گشتی، بۆیە زۆر شت دەوەستێتە سەر سیستمی دووبارە دابەشکردنەوەی ئەو سەرچاوانە بۆ هەڵگرتنی بارگرانی لەسەر ئەندامە هەژار و بێ دەرامەتەکان کە لە هەموو لایەک زیاتر پێویستییان بەو سەرچاوانە هەیە، ئەوە وێڕای کۆمەککردنی ئەو ئەندامانە لە پشکی ئەندامە دەوڵەمەندەکان بەمەبەستی هێنانەدی یەکسانی و هاوسەنگیی دارایی.

## ٥- نزیکی قەبارەی دەوڵەتانی ئەندام

توانای دەوڵەتانی ئەندام لە بونیادنانی سیستمی فیدراڵی دەکەوێتە ژێر کاریگەری قەبارەکانیانەوە، بەو پێیەش کە لە ڕووی پراکتیکییەوە هەرگیز ناکرێ وێکچوونێکی تەواو لە قەبارەی ویلایەتە ئەندامەکاندا هەبێ، ئینجا چ لە ڕووی دەوڵەمەندی یان ڕووبەر یاخود چڕیی دانیشتوان بێ، بۆیە ڕێگە بەبوونی هەندێک جیاوازی ساکار دەدرێ، دەبێ ئەوەش بزانرێ کە لەوانەیە ئەو جیاوازییە ڕێگە پێدراوانە هۆکارێک بن لە دوای ویستی پێکهێنانی یەکێتی فیدراڵیدا، چونکە ئەو جیاوازییانەن وا لەو دەوڵەتە ئەندامانە دەکەن کە هەژارن و خاوەنی چڕی دانیشتوانی کەمترن ئارەزوویان لە یەکێتی فیدراڵی هەبێ، بەمەش ئەوان دەتوانن ئامانجەکانیان دەستەبەر بکەن لەگەڵ بوونی گرەنتی پێویست بۆ سەربەخۆیی خودییان، ئەمەش ئەو شتەیە کە ناتوانرێ لە دەوڵەتی یەکبووی ساکاردا وەدی بهێنرێ.

بۆ نموونە دەبینین ویلایەتە کشتوکاڵییەکانی ڕۆژئاوای ئەمریکا بەو چڕییە کەمەی دانیشتوانیشیانەوە وایان بەباشتر زانی کە شێوازی یەکێتی فیدراڵی زامنکردنێکە بۆ خۆیان لە دژی ویلایەتە دەوڵەمەند و پڕ دانیشتوانەکانی ڕۆژهەڵاتی وەک نیویۆرک. هەروەها کەرتە دەریایی و دەشتانییەکانی کەنەداش بەدوای خۆپاراستن لە کیوبیک و ئۆنتار یودا گەڕان.

بەڵام ئەوەی نەویستراوە ئەوەیە کە یەکێک یان دوو لە دەوڵەتانی ئەندام تا پلەیەک بەهێزبن کە بیانەوێ دەسەڵات بەسەر ئەوانی دیکەشدا بسەپێنن یاخود ئیرادەی یەکێتی فیدراڵی بۆ خۆیان ڕابکێشن، لەو بارەوە جۆن ستیوارت John stuart mill دەڵێت:

(نابێ هیچ دەوڵەتێک لەوانی تر بەهێزتر بێ بۆ ئەوەی هەموویان نەگەنە ئاستی ململانێی هێز لەگەڵ یەکتردا، ئەگەر دەوڵەتێکی واش بەدی کراو بەتەنیا بوو، ئەوکاتە سوور دەبێ لەسەر ئەوەی کە بەتەنیا ببێتە خاوەنی گفتوگۆ هاوبەشەکان، لە کاتێکیشدا ئەگەر دوو دەوڵەتی لەو جۆرە هەبوون ئەوە لەکاتی ڕێککەوتنیاندا هیچ لایەک ناتوانێ ڕووبەڕوویان بێتەوە، کە ناکۆکیش بکەوێتە نێوانیان، هەموو شتێک لە ڕێگەی ململانێ لەسەر دەسەڵات بڕیاری لەسەر دەدرێ)[٤٠].

سەبارەت بەزاڵبوونی دەوڵەتێکی ئەندام بۆ سەر یەکێتی فیدراڵی، نموونەیەکی پراکتیکی هەیە ئەویش پروسیایە کە ئیمپڕاتۆریەتی فیدراڵی ئەڵمانیی کۆنترۆڵ کرد.

ژمارەی دانیشتوانی ئەو دەوڵەتە (٣٣) ملیۆن کەس بووە، لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتوانی یەکێک لە ئەندامان (شامبۆرگ لیپ) تەنیا (٤٢) هەزار کەس بووە، لە ئەنجوومەنی کۆنفیدراڵیشدا لە کۆی ٥٨ ئەندام (١٧) یان ئەندامی پروسیا بوون و (٤١) ئەندامەکەی تر نوێنەری وڵاتانی دیکە بوون. بەمەش ویست و ئیرادەی یەکێتی پشتی بەیەک دەوڵەتی ئەندام بەستووە کە پروسیا بووە و باڵی بەسەر کاروباری یەکێتیدا کێشاوە.

جگە لەمە پادشای پروسیا ئیمپڕاتۆریش بووە و سەرۆک وەزیرانیشی ڕاوێژکاری ئیمپڕاتۆریەت بووە. بۆیە قەبارەی وڵاتانی ئەندام لە ڕووی دەوڵەمەندی و ڕووبەڕووی چڕی دانیشتوان گرنگییەکی زۆری هەیە و دەبێ جۆرە هاوسەنگییەکی گونجاو هەبێ بۆ ئەوەی هەموو ویلایەتە ئەندامەکان بتوانن لە ناو ئەو چوارچێوەیەدا کە بۆیان دیار دەکرێ، سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن و هیچ یەکێکیان دەسەڵات بەسەر ئەوانی تردا نەسەپێنێ.

لەو ڕووەوە ویبر دەڵێت:

(ئەرکی ئەوانەی حکوومەتی فیدراڵی دادەڕێژن و کاری تێدا دەکەن ئەوەیە تێبینی بکەن کە هیچ یەکەیەکی زۆر قەبارە گەورە نییە، بەهەمان شێوەش یەکەیەکی قەبارە زۆر بچووک نییە، ئەمەش هەمان گرنگیی هەیە)[٤١].

٦- سیستمی فرە حزبی:

لەبەرئەوەی یەکێتی فیدراڵی یان لامەرکەزی سیاسی لەسەر فرە ناوەندی سیاسی و دەسەڵاتە سیاسییەکانەوە سەردەگرێ، بۆیە لەسەر ئاستی یەکێتی پێویست بەفرە حزبی

هەیە، بەواتایەکی دیکە: سیستمی تاکە حزب لەگەڵ ئالییەت و ناوەڕۆکی حکوومەتی فیدراڵی خاوەن سروشتی فرە لایەندا ناگونجێ، واقیعی پراکتیکی ئەزموونە فیدراڵییە بەراوردکارەکانیش ئەمەیان دەرخستووە ، لەو بارەشەوە وییر دەڵێت:

(لە ڕێکخستنی حکوومەتی فیدراڵیدا فاکتەرێکی گرنگ و بنەڕەتی هەیە کە ناکرێ لە دەستووردا دووپات بکرێتەوە یان باسی لێوە بکرێ، ئەویش سیستمی حزبیی باشە).

Here is factor in the organi zation of federal government, which is of primary importance but which cannot be ensured ors provided for in a constitution- a good party system.(42)

بەڵام دەربارەی ئەوەی کە پەیوەندی بەواقیعی پراکتیکییەوە هەیە، لەکاتی دامەزرانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دانانی دەستووری فیدراڵی ساڵی ١٧٨٧دا هیچ حزبێکی سیاسی نەبووە، بگرە دامەزرێنەرانی ئەو وڵاتە حەزیان لە سەرهەڵدانی حزبە سیاسییەکان نەبووە لە ئەمەریکا، چونکە پێیان وابوو ئەمە کاریگەرییەکی نێگەتیفانەی بۆ سەر سیستمی فیدراڵی دەبێ[٤٣].

بەڵام بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕێ دەکرا، دروستبوون و سەرهەڵدانی حزبە سیاسییە ئەمەریکییەکان ئاسەواری ئیجابییان بۆ سیستمی فیدراڵی ئەمەریکی لێ کەوتەوە چونکە بووە مایەی قووڵکردنی لامەرکەزی سیاسی و دواتر پاراستنی فیدراڵی تیایدا[٤٤]

مۆرتۆن گرو دزنس باس لەو مەسەلەیە دەکات و دەڵێ:

(ئەوەی دامەزرێنەران داوای وەلاوەنانیان کرد (واتە حزبەکان)، بوو بەمایەی قازانج بۆ هێنانەدی ئەوەی دامەزرێنەران بەدوای وەدیهێنانیدا دەگەڕان (مەبەستی داشبوونی دەسەڵاتە).

(what the fathers sought to avoid, namely parties has served to achieve what the father sought to accom plish, namely the fragmentation of power).

هەروەها دەرکەوتنی حزبە سیاسییەکان کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان لە گۆڕینی شێوازی هەڵبژاردنی سەرۆک کۆماردا هەبوو کە حاڵی حازر سەرۆک سەرکردەی یەکێکە لە دوو پارتە سەرەکییەکەیە کە کۆماری و دیموکراتین.

لە لایەکی دیکەوە دەرکەوتنی ڕێکخستنی حزبی ڕۆڵی هەبوو لە وەرچەرخاندنی

جیابوونەوەی ڕەقی نێوان هەردوو دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی کە لە دەستووردا هاتووە- بۆ هاوکاریکردن، چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا وا باوە سەرۆک سەرکردەی ئەو حزبە بێ کە خاوەنی زۆرینەیە لە کۆنگرێسدا[٤٥]، شایەنی باسە لە زۆربەی مێژووی سیاسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا دا سیستەمی دوو حزبی باو بووە[٤٦]، لەکاتێکدا لە هەندێک سیستەمی فیدراڵی دیکەی وەک ئوستراليا و ئەڵمانیا و هیند دەبینین کە سیستەمی فرە حزبییان پیادە کردووە، چونکە ئەوانە کار بەسیستەمی کابینەی وەزاری دەکەن کە لە سیستەمی پەرلەمانیدا کاری پێ دەکرێ و لە سایەیدا دەکرێ ئەو هاوپەیمانییە پێک بهێنرێ کە زۆرینەی پەرلەمانی مسۆگەر دەکات و ڕێگەی پێکهێنانی کابینەی وەزاری پێ دەدات.

سویسراش لە لایەن خۆیەوە سیستەمی فرە حزبی پیادە کردووە بەو پێیەی کە لەگەڵ سیستەمی حکوومەتی کۆمەڵی کارپێکراو لەو دەوڵەتەدا دەگونجێ، لەو حکوومەتەشدا ئەنجوومەنی تەنفیزی لە یەکگرتنی ئەو حزبانە پێک دێ کە لە ئەنجوومەنی فیدراڵیدا زۆرینەیان وەدەست هێناوە.

بەڵام لەنێو سیستەمە فیدراڵییە بەراوردکارییەکاندا دەبینین کە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو سیستەمی تاکە حزبی پیادەکردووە. ئەوەبوو لەماوەی بەرپابوونی شۆڕشی بەلشەڤییەوە لەساڵی ١٩١٧ تا دارمانی سیستەمی شیوعی لە کۆتایی هەشتاکاندا حزبی شیوعی بەتەنیا ئەو وڵاتەی بەڕێوەبرد، ئاشکراشە کە سیستەمی فیدراڵی سۆڤیەتی چەندین خاڵی لاوازی پێوە دیاربوو گرنگترینیان مانەوەی دەسەڵات بوو لە دەستی سەرکردایەتی حزبی شیوعیدا کە خۆی لە خۆیدا پێچەوانەی سروشت و ناوەڕۆکی فیدراڵییە.

گومانیشمان نییە لەوەی کە ئەمە لەنێو ئەو هۆکارانەدا بووە کە وایان لە هەندێک شارەزایانی یاسای گشتی کردووە[٤٧] ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ یەکیەتی سۆڤیێتی پێشوو بەسیستەمی فیدراڵی دانەنێن.

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی دووەم:

(1) K. C. Wheare, Op. Cit page 36.
A. V. Diceg, Op. Cit Page 36.
(2) K. C. Wheare, Op. Cit Page 36.
(3) Valerie Earle, Federalism, infinite variety in variety in theory and Practice, F. E. peacock publishers Inc., Itasca Illionois1968- Page 97- 98.
(4) William H. Riker, Federalism, Op. Cit Page 17.
vai erie Earle, Op. Cit Page 98.
(5) William H. Riker, Federalism, Op. Cit Page 27.
(6) Valerie Earle, Op. Cit Page 98.
(7) Charles A. Beard, The Enduring Federalist Frederick Ungar, Publishing Co. Newyork, Second Printing 1964 Page 46- 49.
(8) Op. Cit Page 64 - 68.
(9) K. C. Wheare, Op. Cit Page 37.
(10) Valerie Earle, Op. Cit Page 99.
Wheare, Op. Cit Page 44 - 45 (11) K. C. W
(11) Charles A. Beard, Op. Cit Page 39.
(12) Op. Cit Page 40.
(13) K. C.Wheare, Op. Cit Page 42 .
(14) Arthur W. Mac Mahon, Op. Cit Page 29.
(15) Valere Earle, Op. Cit Page 99.213
(16) K. C. Wheare, Op. Cit Page 43.
(17) Valerie Earle, Op. Cit Page 99- 102 .

(١٨) لە ساڵی ١٨٢٣دا دەست کرا بەدامەزراندنی کەرتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای ناوەندی وەکو دەوڵەتێک کە سیستەمی فیدراڵی پیادە بکات، بەڵام شکستی هێناو لە ساڵی ١٨٣٨دا هەڵوەشایەوە بۆ پێنج دەوڵەتی سەربەخۆ کە گواتیمالا، سلڤادۆر، هیندۆراس، کۆستاریکا، نیکاراگوا بوون، هەروەها ئەزموونە فیدراڵییەکانی دیکەش کە کۆمارەکانی ئەمریکای باشووری وەک: مەکسیک و بەرازیل و ئەرجەنتین و ڤەنزوێلا بەهەمان شێوە گەشەیان نەسەند.
لەو بارەوە بروانە:
K. C. Wheare, Op. Cit Page 36.

(١٩) دکتۆر عصام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٥.

(20) K. C. Wheare, Op. Cit Page 47.

(21) Op. Cit Page 46.

(22) Op. Cit Page 47.

(23) Op. Cit Page 47.

(24) Op.Cit Page 47.

(25) Ouoted from K. C. Wheare, Op. Cit Page 47.

(26) Op. Cit Page 47.

(27) Op. Cit Page 47.

(٢٨) دکتۆر حوسێن عوسمان محەمەد عوسمان- سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٨.

(29) K. C. Wheare, Op. Cit Page 51.

(30) Op. Cit Page 51- 52 .

(31) J ohn stuat mill, guoted from Op. 50- 51.

(32) Op. Cit Page 51.

(33) K. C. wheare, Op. Cit Page 82 .

(34) Valerie Earle, Op. Cit Page 135.

(35) Op. Cit Page 135- 136.

(٣٦) دکتۆر عەبدولحەمید متوەلی- القانون الدستوري والانظمة السیاسیة- بەشی یەکەم- چاپی یەکەم ١٩٦٤ ل ٢٧٨- ٢٧٩.

(37) K. C. Wheare, Op. Cit. Page 82.

(٣٨) دکتۆر حەسەن چەلەبی- القانون الدولي العام- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٣٤- ٢٤٦.

- دکتۆر محەمەد کامیل لیله- النظم السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٥٣ پەراوێز.

K. C. Wheare, Op. Cit Page 25- 26

## بەشی دووەم

# هەندێ ئەزموونی فیدراڵی لە جیهان

لەبەر ئەوەی ئێمە لە میانی باسکردنی سیستەمی فیدراڵی و مەودای لە باربوونی دەرفەت بۆ پیادەکردنی لە عێراقداین، بۆیە لێکۆڵینەوە لەسەر هەندێ ئەزموونی فیدراڵی بەراوردکراوی سەرکەوتوو شتێکی پێویستە بۆ لە نزیک ناسینی میکانیزمی ئیشکردنی سیستەمی فیدراڵی لەو ئەزموونانە وردەکارییەکانی دەزگا سیاسییەکانیان و جۆری ئەو پەیوەندییەی کە هەیە لە نێوان ئەو دەزگایانە چ لەسەر ئاستی پەیوەندی لە نێوان دەزگاکانی یەکیەتی و دەزگاکانی دەوڵەتە ئەندامەکان یاخود لە نێوان دەزگاکانی یەکیەتی بەخۆیان. حەزمان دەکرد کە باس لە ژمارەییێکی زۆری ئەزموونی فیدراڵی لە جیهان بکەین بەڵام ئەو ئاستەنگ و کۆتانەی کە پەیوەندن بەقەبارەی لێتوێژینەوە کە ئەو دەرفەتەیان پێنەداین بۆیە لەم بوارە هەر تەنها باس لە هەردوو ئەزموونی ئەمریکی و سویسری دەکەین بەو پێیەی کە هەردووکیان کۆنترین و گرنگترین ئەزموونن لە بواری پێڕەوکردنی سیستەمی فیدراڵی سەرباری ئەوەی کە گرنگترین سیماو خەسڵەتەکانی سیستەمی فیدراڵی کە لە دەروازەی دووەم باسمان لێوەکردن تیایاندا بەرجەستە بووە، هەروەها لێکۆڵینەوە لەو دوو ئەزموونە لەوانەیە سوودێکی باشی هەبێت لە بواری مەودای گونجاوی فیدراڵییەت بۆ عێراق بۆیە لە ئاخافتنی یەکەم باس لە ئەزموونی ئەمریکی دەکەین دوایی دەچینە سەر ئەزموونی سویسری لە ئاخافتنی دووەم.

## ئاخافتنی یەکەم

# ئەزموونی ئەمەریکی

بەرەچاوکردنی ئەوە کە فیدرالّییەتی ئەمەریکی بە یەکەمین ئەزموونی سەردەم دادەنرێت لەبەر ئەوەی کە ئەم یەکیەتییە بە یەکێک لە تاقیکردنەوە نموونەییەکان دەژمێردرێت لەم بوارەدا، وا پێویست بوو کە باسی لێوە بکرێت و بچینە ناو وردەکارییەکانی یەکیەتی فیدرالّی ئەمەریکی بۆ ئاشنابوون بە ڕوخسارە سەرەکییەکانی بەهیوای سوود وەرگرتن لەمە کاتێک کە دەچینە سەر باسی ڕادەی گونجانی فیدرالییەت بۆ عێراق لە بەشی سێیەم لەم دەروازەیە لەم بوارەدا باسی کۆنگرەی فیلادلفیا دەکەین کە لە مانگی مایسی ساڵی ١٧٨٧ بەسترا کە یەکیەتی فیدرالّی ئەمەریکی لێ کەوتەوە و پاش ئەمە دەچینە سەر باسی دابەشکردنی دەستەڵاتەکان لە نێوان حکوومەتی یەکیەتی و حکوومەتەکانی ولایەتەکان، هەروەها باس لە دەزگاکانی یەکگرتوو دەکەین کە بریتین لە کۆنگریس و هەروەها لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن کە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پەیڕەوی دەکات، پاشان لە کۆتاییدا باسی دەزگای چاودێری لەسەر هەردوو دەسەڵاتەکە دەکەین کە ئەویش دەسەڵاتی دادوەری یەکگرتووە کە بریتییە لە دادگای باڵا Superme Court.

### یەکەم: کۆنگرەی فیلادلفیا و هاتنە کایەی یەکیەتی فیدرالّی

ئەو یەکیەتییە کۆنفدرالّییەی کە لە لایەن سێزدە ولایەتی ئەمەریکی ساڵی ١٧٧٨ بنیات نرا پاش ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە داگیرکەری بەریتانی دەینالاند بەدەست بێهێزی و نەبوونی میکانیزمی جێبەجێکردنی پێویست بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەو ئەرکانەی کە دەبوایە ئەنجامیان بدات، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی کۆکردنەوەی باج و ڕێکخستنی بازرگانی نەبوو هێزێکی نەبوو بۆ سەپاندنی بڕیارەکانی و بێ توانایی ئەو یەکیەتییە بەئاشکرا لە کاتی شەڕی سەربەخۆیی و پاش شەڕیش دەرکەوت[١].

ئەم تاقیکردنەوە تاڵ و پڕ لە ئێش و ئازارە لە سیستمی کۆنفدرالّی پالّی بە ئەمریکییەکانەوە نا بۆ گەڕان بە دوای یەکیەتییەکی پتەوتر و توندوتۆڵتر و بە خێرایی بیرۆکەی هەموارکردنی مادەکانی یەکیەتی کۆنفدرالّی دەرکەوت لە ڕێگای بانگێشتە کردن بۆ دانی دەسەڵاتی زیاتر بە حکوومەتی ناوەندی کە هەر یەک لە ئەلکساندەر هاملتۆن و

جۆرج واشنتۆن و جیمس مادیسون و جون جی پێشنیاری بەهێزکردنی یەکیەتییەکەیان کرد ئەویش لە ساڵی ١٧٨٠ بوو بەڵام لە ساڵی ١٧٨٢ کۆمەڵەی یاسادانانی نیویۆرک پشتگیری لە بیرۆکەی بەستنی کۆنگرەیێک کرد بەمەبەستی هەموارکردن و کۆنگرێس ئەم بابەتەی چەند جارێک تاوتۆ کرد، دانوستانی ساڵی ١٧٨٦ لە نێوان هەردوو ولایەتی ماریلاند و فرجینیا لەسەر کێشە سنوورییەکان بووە مایەی دروستبوونی پێشنیارێک بۆ بانگێشتە کردن بۆ کۆنگرەیەکی نیشتمانی[٢] ئەوەبوو کە کۆنگرەی ئەنابولس An-napolis بۆ بازرگانی لە هەمان ساڵ گرێدرا کە هەندێ وای بۆ دەچن[٣] کە بنچینەی دەستووری ساڵی ١٧٨٧ دەگەڕێتەوە بۆ کۆنگرەی ئەنا بولس کە سەرجەم دەوڵەتە ئەندامەکان بۆی بانگێشتە کرابوون کە نوێنەری پێنج ولایەت کە ئەوانیش نیویورک و نیوجرسی و بنسلفانیا و دیلاوەرد و فرجینا تیایدا ئامادەبوون لە ژێر سەرکردایەتی جۆرج واشنتۆن و جیمس مادیسون[٤] بۆ گفتوگۆ کردن لەمەڕ بەرژەوەندیە بازرگانییەکان ئەو بەرژەوەندییانەی کە دەیانگوت دەبێتە مایەی پتەوکردنی یەکیەتی و بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی، لەم کۆنگرەیەدا پێشنیاری هەموارکردنی ماددەکانی یەکیەتی کۆنفدراڵی کرا کە کۆبوونەوەیەک بۆ ئەم مەبەستە ببەسترێت لە فلادلفیا لە مایسی ساڵی ١٧٨٧[٥] وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد کە ئەو دەوڵەتانەی کە پەیمانیان بەستبوو دڵنیابوون لەوە کە پێویستییان بە دەسەڵاتێکی ناوەندی بەهێز هەیە، بەڵام ئەمەش بە دی نایەت بە رێکخراوێکی لاواز و ناسەقامگیر وەکو یەکیەتی کۆنفدراڵی بەڵکو بە رێکخراوێکی یەکگرتووتر کە ببێتە مایەی دامەزراندنی حکوومەتێکی ناوەندی بەهێز لەسەرووی دەوڵەتە ئەندامەکان، بەڵام دەوڵەتە بچووکەکان ئارەزووی ئەم جۆرە رێکخراوە توندو ناوەندییەیان نەبوو لە بەر ئەوە رازی نەبوون کە بەشێک لە سەروەرییەکانیان بخەنە ژێر دەستی ئەو دەسەڵاتە ناوەندییەی یەکیەتی ئەمەریکا کەوا چاوەڕوان دەکرا بنیات بنرێت[٦] لە ژێر رۆشنایی ئەم پێشهات و رووبەڕووبوونەوانەدا کۆنگرەی فیلادلفیا لەساڵی ١٧٨٧ بەسترا کە (٥٥) پەنجاو پێنج ئەندامی لەخۆگرتبوو کە نوێنەرایەتی سێزدە ولایەتیان دەکرد تەنیا ولایەتی Rhodelsland نەبێت کە لە کۆنگرەکە ئامادە نەبوو پاش تەواوبوونی رێژەی یاسای کۆنگرە یەکەم کۆبوونەوەی لە ٢٥ی مایسی ١٧٨٧ بەست سەرەڕای کاریگەری شێوازی حکوومەتە جۆراوجۆرەکان وەکو حکوومەتی یەکیەتی کۆنفدراڵی وە هەروەها حکوومەتەکانی چەند ولایەتێک و بە شێوەیەکی تایبەتی ولایەتی نیویوزک کە زۆربەی کاتی خۆی تەرخان کرد بۆ پێداچوونەوەی ئەو پلانانەی کە پێشکەشی

کرابوون لە لایەن نوێنەرە جۆراوجۆرەکانەوە. پلانی فرجینیا[٧] کە ناوزەد کرابوو بە پلانی دەوڵەتی گەورە Large state plan لە گرنگترین ئەو پلانانە بوو کە پێشکەشی کۆنگرە کرابوون کە تیایدا پێشنیار کرابوو بە دامەزرادنی دەسەڵاتی یاسادانانی یەکگرتوو (کۆنگریس) کە پێک دێت لە دوو ئەنجوومەن کە خەڵکی ولایەتەکان هەڵسن بە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی یەکەم کە ئەویش هەڵسێت بە هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی دووەم لە نێوان ئەو کەسانەی کە ناوزەد دەکرێن لە لایەن یاسادانەرانی ولایەتەکان، هەروەها تێدا هاتبوو کە کۆنگرێس هەستێت بە دەستنیشانکردنی هەریەک لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دادوەری بۆ یەکیەتیەکە لەپاڵ ئەمەش لەم پلانەدا هاتبوو کە پێشنیاری فراوانکردن و زیادکردنی دەسەڵاتەکانی کۆنگرێس دەکات، تاکو بتوانێت کە مافی ڤیتۆ بەکاربهێنێت لە دژی یاسای ولایەتەکان[٨] هەروەها تێیدا هاتبوو کە کۆنگرێس سەرپشک بکرێت بە دەسەڵاتی ئامادەکردنی هێز و بەکارهێنانی لە دژی هەر ئەندامێک کە سەرکەوتوو نەبێت لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی لە ژێر سایەی ماددەکانی ئەم دەستوورە[٩].

پرۆژەی جۆراوجۆر لە لایەن هەندێک ولایەتی ترەوە پێشکەش بە کۆنگرە کران و پاش سازشکردنێکی پڕ ماندووبوون و ئاڵۆز لە نێوان لایەنگرانی فیدرالیەت و حکوومەتی ناوەندی بەهێز لایەنگرانی یەکیەتی کۆنفدراڵی و هەرێمایەتی و پاش ئەوەی کۆنگرە لەسەر لێواری نووشستن بوو پێکهاتنێکی سەرتاسەری لێ بەرپا بوو "Great Compromise"[١٠] لایەنگرانی باڵی فیدراڵی The federalists گفتوگۆیان لەسەر جەختکردنەوە بوو لە پێویستی یەکییەتی تاکو ڕێگا لە کارەسات بگرێت کە دروست دەبێت لە ئەنجامی پلەو پایەی سیاسی و ئابووری لە ژێر سایەی یەکیەتیەکی لاواز وەکو کۆنفدراڵی ١٧٨١ داوای پێکەوە کارکردنیان کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسییەکانی ناوخۆ و دەرەوە ئەمە بە بۆچوونی ئەوان بە دی نایەت تەنیا بە پێکهێنانی یەکیەتییەکی بەهێزتر لە ژێر سایەی حکوومەتێکی نیشتمانی چالاک نەبێت کە بتوانێت ئاسایشێکی باشتریان بۆ دابین بکات کە دەتوانرێت سوودی لێ وەربگرێت دژی ناکۆکییە دەرەکییەکان[١١]. پاش ئەم هەموو سازشکردنە ڕەزامەندی لەسەر دەستووری نوێ درا بە زۆرینەی ٣٩ دەنگ لە کۆی ٥٥ دەنگ و بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە ڕەزامەندی کردن لەسەر دەستوور بەئاسانی نەبوو بەڵکو تووشی کۆسپ و تەگەرەی تر بووە کاتێک کە خرایە بەردەم دەوڵەتە ئەندامەکان بۆ پەسەندکردن و دانپێدانانی هەموو دەوڵەتە ئەندامەکان پەسندیان نەکرد تاکو ساڵی ١٧٨٩ پاش ئەوەی بۆ ئەوانەی کە دوودڵ بوون هەندێ

(تنازلات) و بەڵێن درا بە هەمـوارکـردنی هەندێ لە دەقـەکـانی ئەوە بوو کـۆنگرێس دە هەموارکردنی لەسەر دەستوور کرد لە ٢٥ و سیبتەمبەری ساڵی ١٧٨٩ بەڵام بە شێوەیەکی فەرمی پەسەند نەکرا تاکو ساڵی ١٧٩١[١٢].

## دووەم: دابەشکـردنی دەســتــەڵاتەکـان لە نـێـوان دەوڵەتـی یەکگرتوو و ولایـەتەکـان لە دەستووری ئەمەریکی

سیستەمی سیاسی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پرنسیپی فیدراڵی fedral principle پێـڕەو دەکـات کـە ئەویـش بە دابەشکـردنی دەسـەڵاتەکـان وەردەگرێت لە نـێـوان دوو تایفە لە حکومەتەکان ئەوانیش حکومەتی یەکگرتوو و حکومەتی ولایەتەکان وە هەریەک لەمانە بەسەربەخۆیی لەوەیی تر ئەو دەسەڵاتەی کە بەپێی دەستوور پێدراوە پیادە دەکات کە لە هەمـوارکردنی دەیەم لە دەستووری ئەمـەریکی کە لە ساڵی ١٧٩١دەرچووە هاتووە کە ئەو دەسـەڵاتانەی نەدراوەتە ولایـەتە یەکگرتوەکـان لە لایەن دەسـتـوورەوە قـەدەغـەش نین لە لایەن ئەوەوە لەسـەر ولایەتەکـان، پارێزراون بـۆ ولایەتەکـان بە شـێـوەیەکی تایبـەتی یان بۆ گەل.

the powers not delegated to the united states by the constitution,nor prohibited by it to the states. are reserved to the states respectively, or to the people state.

تاکـو ئەو کـاتەی کـە بوارو چوار چێـوەی هەریەک لەم دوو حکومـەتە دیاریکراوبێت وە دەسەڵاتە بەجێماوەکـان بۆ حکوومەتی ولایەتەکان ببێت هەر یەکێکیـان بە ڕێگای خۆیدا دەڕوات بە بێ ئەوەی ئەوی تریان بتـوانێت زیادەڕۆیی لەسەر بکات وە بە چاکی ڕۆیشتن و ڕێکوپێکی لە پیـادەکـردن لە لایەن هەردوولا بە ئازادی نەبوونی دەسـتـێـوەرادان زامن دەکرێت[١٣].

هەندێک وا دەبینن کە جیاوازی ڕوونادات لە نێوان ئەم دوو جۆرە حکومەتە لەبەر ئەوەی حکومـەتی یەکگرتوو پشت بە حکومـەتی ولایەتەکـان نابەسـتـێت لە پیـادەکـردنی دەسەڵاتەکانی یان بە جێـهێنانـی مەبەستەکانی وە یاساکانیشی لە لایەن فەرمانبەرەکانی دادەڕێژرێن و دەسەپێنرێن[١٤] بەڵام ئەمـەش ئەوە ناگـەیەنێت کـە ناکـۆکی نەبێت وەکـو لە هەندێ حاڵەتدا دەردەکەوێ.

وەکو پێشـتـر باسـمان کـرد دەسـتوری ئەمەریکی پرنسیپی دیاریکردنی دەسەڵاتەکـانی

حکوومەتی یەکگرتوو پێڕەوکردووەو بەشێوەیەکی دیاریکراو هاتووە وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەزگاکانی یەکیەتی ناتوانن هیچ دەسەلاتێک پیادەبکەن کە ڕێیان پێ نەدرابێت . بەراستەوخۆ یاخود نا راستەوخۆ - لە لایەن دەستورەوە، وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو دەسەلاتانەی دراونەتە یەکیەتی سنووردار و بەڕێژە کەمن ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئەو دەسەلاتانەی کە پێشکەش بە ولایەتەکان کرابوون.

شایانی باسە ئەو دەسەلاتانەی کە دراونەتە یەکیەتی هەرچەندە سنووردارن، بەلام لە هەمان کاث گرنگییەکی هاوبەشیان هەیە یان هەست دەکرێت بەوەی کە یەکیەتی تەنها لایەنکە دەتوانێت جێبەجێیان بکات بە شێوەیەکی وا کە ببێتە مایەی ڕەزامەندی[١٥].

١ - دەسەلاتەکانی یەکیەتی:

ئەو دەسەلاتانەی کە دراونەتە حکومەتی یەکگرتوو ئەمانەن:

أ- کاروباری دەرەوە:

هەموو بابەتەکانی پەیوەندی دەرەوە کە گرنگی گشتییان هەبوو خرانە ژێر دەستی حکومەتی یەکگرتوو، دەستوری ئەمەریکی ئەو دەسەلاتانەی دایە سەرۆکی ولایەتە یەکگرتوەکان- پاش راوێژکردن و ڕەزامەندی ئەنجومەنی پیران- کە بریتین لە بەستنی بەڵێننامەکان و دەسەلاتی دیاریکردنی باڵیۆزەکان[١٦] وە هەروەها هەڵدەستێت بەوەرگرتنی باڵیۆزی دەوڵەتەکانی دیکە و دانان بەحکوومەتەکانی تر. ئەمەو بۆ هیچ ولایەتێک نییە کە لایەنێک بێت لە بەڵێننامەیەک یان لە عوسبەتێک یان لە پەیمانێک[١٧].

هەروەها بۆی نیە کە هیچ ڕێککەوتننامەیەک مۆر بکات لەگەڵ لایەنە بێگانەکان بە بێ ڕەزامەندی دەسەلاتی یەکگرتوو[١٨] وەلەسەر ئەم بنچینەیە دەسەلاتی یەکگرتوو لە ساڵی ١٨٦١ بۆ ئەوە چوو کە دروستکردن و ڕاگەیاندنی کۆنفدرالی هەرێمەکانی باشوور لە کاتی شەڕی ناوخۆ پێویستی بە بەڵگەیەکی دەستووری هەبوو لە بەر ئەوەی کە دژی ئەو قەدەغەکردنە بوو کە لەسەرەوە هاتووە، هەروەها بەڵێننامەکانی دیاریکردنی سنوورەکانی لە نێوان ولایەتەکانی شێوەی یاسایی پێویستی وەرناگرێت بە بێ ڕەزامەندی کۆنگرێس لە سەری[١٩].

ب- کاروباری بەرگری لەوەش دەسەلاتی ڕاگەیاندنی جەنگ و گرێدانی ڕێککەوتن:

بەشێوەیەکی گشتی دەستوور دەسەلات و تایبەتمەندییە سەربازییەکانی بەدەستەکانی

یەکیەتی سپارد بەڵام دەسەڵاتی ڕاگەیاندنی شەڕو وەڵامدانەوەی دەستدرێژی بۆ سەر پاپۆر و تۆڵەسەندنەوە وە دانانی بنکەی تایبەتی دەستبەسەراگرتن لە زەوی و دەریا[٢٠] بە پێی دەستوور داوەتە کۆنگرێس هەر ئەویش دەسەڵاتی بنیاتنانی لەشکرو هێزی دەریاوانی و پەرەپێدانیانی هەیە[٢١] و دەتوانێت داوا لە چەکدارەکان بکات بۆ جێبەجێکردنی یاساکانی یەکیەتی و سەرکوتکردنی ئاژاوەگێری و بەرپەرچدانەوەی داگیرکاری و ڕێکخستن و پڕ چەککردن و مەشقکردن و بەڕێوەبردنی چەکدراەکان[٢٢] وە لە هەمان دەستووردا هاتووە کە سەرۆکی ئەمەریکی سەرکردەی گشتی لەشکری ولایەتە یەکگرتوەکانەو هەروەها سەرکردەی هێزی دەریاوانی و چەکدارەکانی هەموو ولایەتەکانە لە کاتی بانگێشتە کردن بۆ خزمەتی یەکیەتی[٢٣] وە بەپێی ئەو دەسەڵاتەی کە دەستوور پێی بەخشیوە سەرۆکی ئەمەریکی Ibrahim lincolin توانی کە شەڕ لە دژی جوداخوازەکان لە باشوور لە ساڵی ١٨٦١ بەرپا بکات بەبێ ئەوەی کە چاوەڕوانی ڕاگەیاندنی جەنگ بکات لە لایەن کۆنگرێس و دادگای باڵاش supreme court پشتگیری لە هەڵوێستی سەرۆک کرد بەزۆرینەی یەک دەنگ[٢٤].

وە هەموو ولایەتەکان وەکو یەک پارچە دەبن لە شەڕدا وە بابەتی بەرگریکردن لە هەموو ولایەتەکان دەستەبەرکراوە لە لایەن یەکیەتییەوە، ئەمەو هیچ ولایەتێک بۆی نییە کە بەشداری لە جەنگ بکات پێش ئەوەی کە ڕەزامەندی کۆنگرێس بەدەست بهێنێت تەنیا لەو کاتانە نەبێت کە تووشی داگیرکردن ببێت یان مەترسییەکی وا ڕووی تێبکات کە هی ئەوە نەبێت دوا بخرێت[٢٥].

ئەمەو جگە لە هەندێک تایبەتمەندی دیاریکراوی ناوخۆی نەبێت بۆ ولایەتەکان وەکو دامەزراندنی سەربازە بچووکەکانی چەکدارەکان و مەشق پێکردنیان هەموو تایبەتمەندی و دەسەڵاتە سەربازییەکانی تر تایبەتە بە یەکیەتی[٢٦].

ج- کاروباری دارایی:

دەسەڵات و تایبەتمەندییە داراییەکان بەیەکێک لە شتە دیار و گرنگەکانی هەر حکومەتێک دادەنرێت ئەگەر ئەو بیەوێت بەهێز وکاریگەر بێت. یەکێک لەو هۆکارانەی کە بووە هۆی لاوازی دەستەکانی یەکیەتی لەژێر سایەی ماددەکانی کۆنفدراڵی پێویستی بوو بەدەسەڵاتی دارایی. لێدانی دراو و دەرکردنی لە کارە نیشتمانییەکانە کە گرنگییەکی هاوبەشی هەیە و بەپێی دەستووری فیدراڵی تایبەتە بە حکوومەتی یەکگرتوو هەروەها

تایبەتمەندە بە خەملاددن و دانانی نرخی دراوی بێگانە و دراوی یاسایی و هەروەها ڕێکخستنی کێش و پێوانە و مافی چاپکردن و بەڵگەنامەی داهێنان و حوکمەکانی پەرپووت بوون قەرزە دڵنیاکەرەکان(٢٧).

لە هەمان دەستووردا هاتووە کە یەکیەتی تایبەتمەندە بە دەسەڵاتی سەپاندنی باج و پێبژاردن و ڕەسم و مەکوس و کۆکردنەوە بۆی هەیە کە قەرز بکات لەسەر حیسابی ولایەتە یەکگرتووەکان و لەسەریەتی کە قەرزەکان بداتەوە(٢٨).

دەستوور ئەوەی لەسەر ولایەتەکان قەدەغە کردووە کە پارە لێبدەن یان مۆڵەتی دارایی دەربکەن(٢٩) هەروەها ئەوەشی لێ قەدەغە کردوون کە ڕەسم و باج بسەپێنن لەسەر هاتوو و دەرچوو تەنیا پاش ڕەزامەندی کۆنگرێس نەبێت جگە لەوەی کە زۆر پێویستە بۆ جێبەجێکردنی یاساکانی پشکنین، دەبێت تەواوی ئەو باج و ڕەسمەی کە دەسەپێنرێن لە لایەن ولایەتەکانەوە لەم بوارەدا بنێردرێن بۆ گەنجینەی ولایەتە یەکگرتووەکان(٣٠) بەڵام بابەتی بانک و بازرگانی بانکەکان بەتایبەتمەندییە هاوبەشەکان دادەنرێن لە نێوان یەکیەتی و ولایەتەکان.

د- کاروباری بازرگانی:

لە دەستووری فیدراڵی ئەمەریکی هاتووە کە دەسەڵاتی یەکگرتوو تایبەتمەندە بەکاروباری بازرگانی لەگەڵ وڵاتە بێگانەکان بەو بازرگانیەی کە لە ئارادایە لە نێوان ولایەتەکان و ئەمەش بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو ولایەتێک تایبەتمەندە بەو کاروبارە بازرگانییەی کە هەیە لە ناو سنووری خۆی.

## ٢- دەسەڵاتی ولایەتەکان:

پێویستە یەکەم باسی ئەوە بکەین کە دەوڵەتە ئەندامەکان لە یەکیەتی فیدراڵی ئەمەریکی واتە ولایەتەکان بریتین لە پێکهاتەی دەستووری تەواو کە لەیەکیەتی دەچن لە ڕووی ڕێکخستنی دەستووری هەر ولایەتێک دەستووری تایبەتی خۆی هەیە و ئەو دەستوورە پێنج بەندی لە خۆگرتووە(٣١) یەکەمیان دیاریکردنی سنووری ولایەتە و دووەمیان "لائحة الحقوق" بەڵگەنامەی مافەکان کە پەیوەندی بەئازادی مرۆڤەوە هەیە. بەڵام بەندی سێیەم بریتییە لە چوارچێوەی دەستووری دەزگا جۆراوجۆرەکانی ولایەت لە بوارەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەری و دیاریکردنی ناوەکانیان و ئەرکەکانیان و

دەسەلاتەکانیان. بەلام بەندی چوارەم پێکهاتووە لەو دەقانەی کە پەیوەندییان بە یاسای کارگێڕییەوە هەیە، کە تیایدا ئەو ماددانەی کە پەیوەندییان بە پەروەردە و چەکدارەکان و باج و داهاتەکان و قەرزە گشتییەکان و فەرمانڕەوایەتی ناوخۆ و نەخۆشخانەکان و بەندیخانەکانی ولایەت و کشتوکاڵ و کار و هەروەها ئەو دەقانەی کە پەیوەندییان بە تۆمەتبارکردنەوە هەیە Impeachment و ڕێگاکانی هەموارکردنی دەستوور خۆی. لەکۆتایی بەندی پێنجەم پێکهاتووە لەو خشتەیان ئەو بەرنامەیەی کە پەیوەندی بە چۆنیەتی دەنگدان لەسەر دەستوور لە لایەن هاوولاتیانی ولایەت و ئامادەکاری گواستنەوە لە دەستووری پێشوو بۆ ئەو دەستوورەی کە دەنگی لەسەردرا. و لەبەر سروشتی کاتی ئەم خشتەیە لە رووی یاساییەوە بە بەشێک لە دەستوور دانانرێت[٣٢].

حکوومەتی ولایەت بە زۆری لەم لقانەی خوارەوە پێکدێت:

أ- دەسەلاتی یاسادانان:

جگە لە ولایەتی بنراسکا کە لەیەک ئەنجوومەن پێکدێت، دەسەلاتی یاسادانانی ولایەتەکان لە دوو ئەنجوومەن پێک دێت ئەوانیش ئەنجوومەنی پیران Senate و بەزۆری ژمارەی ئەندامەکانی کەمن[٣٣] و ئەنجوومەنی نوێنەران Houseof Representative کە ژمارەیان زۆرە.

ب- دەسەلاتی جێبەجێکردن:

کە پێکهاتووە لە حوکمڕانی ولایەت «حاکم Governor» کە هەڵدەبژێردرێت لە لایەن دانیشتوانی ولایەت و لە زۆربەی ولایەتەکان لە جێگرێک کە ناودەبرێت بە Lieutenant-governor و هەروەها دەزگای جێبەجێکردن لە ژمارەیەک لە فەرمانبەران پێک دێت.

ج- دەسەلاتی دادوەری:

کە پێکدێت لە سێ بەش ئەوانیش دادگا ناوخۆییەکان Localcourts و دادگای بالای دیکۆمێنتەکان و تۆمارەکان Superior Courtsof Record و لە کۆتایی دادگای بالای ولایەت Supreme Court و دەسەلاتی دادوەری ولایەت پلەیەکی گەورەی لەسەربەخۆیی هەیە لە دەسەلاتی دادوەری یەکیەتی.

وەکو پێشتر باسمان کرد کە دەستووری فیدرالی تایبەتمەندی یەکیەتی دیاری کردووە، بەلام هەندێ ئەو تایبەتمەندی و دەسەلاتانەی کە ماونەتەوە Residuary powerso واز

لیّ هێناوه بۆ حکوومـهتی ولایهتهکـان ئهمـهش به پێی ههمـوارکردنی دهیهم له دهسـتووری ئهمریکی.

شـایانی باسـه ولایهتهکـان لێپـرسـراو دهبن له پهروهردهی گـشـتی له قـۆناغی باخـچهی منداڵان تاوهکو قـۆناغی دهرچوون له زانکۆ[٣٤]. ههروهها لێپـرسراو دهبن له خزمهتگوزاری تهندروسـتی گـشـتی له نهخـۆشخـانهکـان و هاوشـێوهکـانیـان[٣٥] ههروهها تایبـهتمهندن به جێبـهجێکردنی یاسـاکانی کـاروباری گـواستنهوه و رێگاوبانی گـشـتی و خزمـهتگوزاری کۆمهڵایهتی[٣٦].

دهتوانین گرنگترین تایبهتمهندییهکانی ولایهتهکان ئاشکرا بکهین له باسی ئهو بوارانهی که پهرلهمانه ههرێمایهتییهکان دهتوانن یاسای پێویست لهبارهیانهوه دابڕێژن ئهم بوارانهش ئهمانهن[٣٧].

یاسای تایبهتی:

کـه بریتـییـه له گـرێبـهست و زیان و مـیـرات و پهیوهندی خـێـزان و تاوان و کـارڕایی شارستانی و سزایی.

یاسای کارگێڕی:

پێکدێت له رێکخـسـتنی حکوومـهته شـارسـتـانی و لادێیـهکـان و کـاروباری گـشـتی و پهروهرده و بازرگانی خواردنهوه کحولییهکان و بابهتی تهندروستی لهمـهش کۆتان و دهزگا سزاییهکان و خێرخوازهکان و پشکنینی کانهکان و کارگهکان وهدهرکردنی یاسای گشـتی کۆمپـانیـاکان و یاسـای کارو یاسـای هێڵـی ئاسنین و بهڕێوهبردنی قـهرزه گـشـتـییـهکـان و بابهتی باج و گهر هاتوو له چوارچێوهی ههرێمایهتی بێت یان ناوخۆی.

ئهمـهش لهگـهڵ زانیـنی ئهوهی کـه دهسـهڵاتی سـهپاندنی باج دهسـهڵاتێکی هاوبهشـه له نێـوان یهکـیـهتی و ولایهتهکـان[٣٨] و ولایهتـهکـان دهسـهڵاتێکی باشـیـان ههیه له بواری سهپاندنی باج بهڵام ناتوانن رهسمی گومرگی بسهپێنن لهسهر هاتوو و دهرچوو که لێی بێ بهش کـراون بهپێی دهسـتـوور[٣٩]. دهتوانرێت ئهوه بگوترێت کـه باجی راسـتـهوخـۆ بهسـهرچاوهی سـهرهکی باج دادهنرێت له ولایهتهکان بهتایبـهتی باجی کـهلوپهل Property Tax[٤٠].

کارڕاییبیهکانی خاوهن سروشتی ناوخۆیی و تایبهتی:

وەکو دەرچوونی یاسای تایبەتی بە بنیاتنان و مۆڵەتپێدانی کۆمپانیای غاز و تراموای و هێڵی ئاسنین و بنیاتنانی شار و کۆمەڵگای بچووک و بەڕێوەبردنی کاروباریان.

**سێیەم: دامودەزگا دەستوورییەکانی یەکێتی**

١- کۆنگرێس: دەسەڵاتی یاسادانانی ئەمەریکی لە دوو ئەنجوومەن پێکدێت ، ئەوانیش ئەنجوومەنی پیران Senateو ئەنجوومەنی نوێنەرانن House of Representative و یەک لە دوای یەک ئامـاژەیان پێـدەکـەین پاش ئەوە تایبـەتمەندی و دەسـەڵاتەکـانی کۆنگرێس دەخەینەڕوو.

أ- ئەنجوومەنی پیران Sentae:

ئەنجوومەنی پیران بە یەکێک لە لقەکانی دەسەڵاتی یاسادانانی یەکێتی و بە یەکێک لە دەزگا گرنگەکانی سیستەمی ئەمەریکی دادەندرێت و جیاوازی لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ هاوشێوەکانی لە شوێنەکانی تری جیهان هەیە[٤١] ئەویش لە دوو ئەندام پێک دێت بۆ هەر ویلایەتێک بەبێ ڕەچاوکردنی قەبارەی ویلایەتەکەیان یاخود ڕێژەی دانیشتووانی بۆنموونە هەریەک لە ویلایەتی نیفادا کە ژمارەی دانیشتووانی دەگاتە (١٦٠) سەد و شەست هەزار بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٠ و ویلایەتی ئەلاسکا کە ژمارەی دانیشتووانی (٣٠٢) سێ سەد و دوو هەزار هاووڵاتییە بە دوو نوێنەر لە ئەنجوومەنی پیران نوێنەرایەتی دەکرێن و هەروەها ویلایەتی نیویۆرک بە هەمان ژمارە نوێنەرایەتی دەکرێت لەگەڵ ئەوەی ژمارەی دانیشتووانی دەگاتە (١٥) پازدە ملیۆن دانیشتوو و ویلایەتی کالیفۆرنیا کە ژمارەی دانیشتووانی دەگاتە (١٩٩٥٣٠٠٠) نۆزدە ملیۆن و نۆسەد و پەنجا و سێ هەزار هاووڵاتی دوو نوێنەری هەیە لەو ئەنجوومەنە[٤٢].

بەمەش ئەندامێکی ئەنجوومەنی پیران نوێنەرایەتی (٨٠٠٠٠) هەشتا هەزار هاووڵاتی دەکات لە ویلایەتی نیفادا و (١٥١٠٠٠) و سەد و پەنجا و یەک هەزار لە ویلایەتی ئەلاسکا ، بەڵام دەبینین کە نوێنەرایەتی (٧,٥) حەوت ملیۆن و نیو دەکات لە ویلایەتی نیۆیۆرک و زیاتر لە (٩,٥) نۆ ملیۆن و نیو هاووڵاتی لە کالیفۆرنیا.

مەرجی ئەندامێتی ئەنجوومەنی پیران دەبێت کە تەمەنی گەیشتبێتە سی ساڵ و دەبێت هاووڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بووبێت بۆ ماوەی نۆ ساڵ بەلای کەمەوە و هەروەها پێویستە کە دانیشتووی ئەو ویلایەتە بێت کە نوێنەرایەتی دەکات وە لەو کات و ڕێچکەیە

هەڵدەبژێردرێن کە لە لایەن دەستەی یاسادانانی هەر ویلایەتێک دیاری دەکرێت.

ماوەی ئەندامیەتی لەم ئەنجوومەنەدا شەش ساڵە کە بەشێوەیەک رێکخراوە کە یەک لەسەر سێی ئەندامەکانی خانەنشین دەکرێن لە هەردوو ساڵ جارێک. مێژووی وەرگرتنی پۆستەکە و مێژووی وازهێنانیان دەبێت لە سێی کانوونی دووەمی هەموو ساڵێک بێت و ئەو کورسییە بەتاڵانەی بەهۆی مردن و دەست لە کارکێشانەوە لە لایەن حاکمی ویلایەتەکە پڕ دەکرێتەوە تاکو بەرواری سازدانی هەڵبژاردن بۆ پڕکردنەوەی ئەو کورسییە بەتاڵانە لەژێر سەرکردایەتی و سەرپەرشتی دەسەڵاتی یاسادانانی ئەو ویلایەتەوە.[٤٣]

هەموو ئەندامەکانی ئەنجوومەنی پیران چەند حەسانەتێکی گرنگیان هەیە کە سوودی لێ وەردەگرن لە گرتن لە کاتی دانیشتنەکانی ئەنجوومەن یان لە کاتی ڕۆیشتنیان بۆ ئەو دانیشتنانە یان گەڕانەوەیان جگە لە تاوانەکانی خیانەت و دزی و پێشێلکردنی ئاشتی[٤٤]. لەبەردەم هیچ لایەنێک تووشی لێپرسینەوە نابن جگە لە ئەنجوومەنی پیران نەبێت لەسەر هەر گوتەیەک یان هەر بەیانێک کە لەوانەوە دەربچێت لە هۆڵی دانیشتنەکان یان لە لیژنەکان لە بڵاوکراوەی فەرمی، بەڵام ئەم حەسانەیە ناتوانن بەکاربهێنن لە گوتەیەک یان بەیانێک لە دەرەوەی ئەنجوومەن، و دەکرێت ئەو ئەندامە سزا بدرێ لە لایەن ئەنجوومەنەوە و ئەم سزایەش دەگاتە دەرکردن کە پێویستی بە ڕەزامەندی دوو لەسەر سێی ئەندامەکان هەیە[٤٥].

ئەنجوومەنی پیران و ئەنجوومەنی نوێنەران بەیەکسانی کاری یاسادانان پیادە دەکەن[٤٦] و هەروەها جگە لەمانە ئەنجوومەنی پیران تایبەتمەندە بە سێ دەسەڵاتی تر کە ئەوانیش دەسەڵاتی پیادەکردنی مافی تاوانبارکردن Impeachment و دەسەڵاتی پەسەندکردنی بەڵێننامەکان و لە دواییدا دەسەڵاتی پەسندکردن لەسەر زۆر لەو دامەزراندنانەی کە سەرۆک پێیان هەڵدەستێت لە بواری فەرمانبەرایەتی جێبەجێکردن و دادوەری گرنگ.

هەندێک دەڵێن[٤٧] کە ئەم دەسەڵاتانە هیچ سوودێکی وایان نییە بۆ ئەنجوومەنی پیران لە پراکتیکدا لەبەر ئەوەی مافی تاوانبارکردن Impeachment چەکێکی کاریگەر نییە و چونکە بەشێوەیەکی زۆر دەگمەن بەکارهێنراوە. وەهەروەها دەسەڵاتی پەسەندکردنی بەڵێننامەکان بەشێوەیەکی زۆر بەکارنەهێنرا، هەرچەندە لە ساڵی ١٩٢١ بەشێوەیەکی توند بەکارهێنراوە[٤٨] و سەرکردە نوێیەکان چەند ڕێگایەکی تریان دۆزییەوە بۆ گەمارۆدانی کارایی ئەنجوومەنی پیران و تەنیا بابەتی دامەزراندن ڕۆڵی ئەو ئەنجوومەنە بەشێوەیەکی کاریگەر و نەگۆڕ مایەوە.

دەسـەڵاتی ئەنجـوومـەنی پیـران لە ڕەتکردنەوەی پاڵێـوراوانی سـەرۆک بووە هۆی سەرهەڵدانی چاولێکەری یان دابێک کە پێی دەگوترا موجامەلەی سیناتۆری Senatorial Courtesy و J.S.sutton دەڵێت کـە دەسـەڵاتی ئەنجـوومـەن لە ڕەتکردنەوە لەوانەیە بەکارهێنرابێت بۆ مەبەستی سیاسی لەسەر بەرزترین ئاست و ئەنجوومەن زۆر بە دەگمەن دەسەڵاتی خۆی بەکارهێناوە لە ڕەتکردنەوەی ئەو ئەندامانەی کە سەرۆک دەستنیشانی دەکردن بۆ کابینەکەی لەبەرئەوەی پێویستی سەرۆکی ڕەچاو دەکرد لە دیاریکردنی تیمی تایبەتی خۆی، بەڵام لە هەندێ حاڵەتی تردا مافی ڕەتکردنەوەی بەکاردەهێنا(٤٩).

ب- ئەنجوومەنی نوێنەران House of Representaive:

هەروەها پێشی دەگوترێت ئەنجوومەنی خواروو کە هەشتا و شەشەمین ئەنجوومەن پێکهاتبوو لە (٤٣٥) چوار سەد و سی و پێنج ئەندام(٥٠) لەگەڵ نوێنەری هاووڵاتیانی هەرێمەکانی ئەلاسکا و هاوایی و نیوە دوورگەی فلیپین و پۆرتۆریکۆ ئەوانەی کە مافیان هەبوو کە ڕۆڵی خۆیان ببینن لە گفتوگۆکان بەبێ ئەوەی کە مافی دەنگدانیان هەبێت(٥١) کە بەلای کەمەوە هەر ویلایەتێک بە ئەندامێک نوێنەرایەتی دەکرێت و کورسییەکان لەسەر ویلایەتەکان دابەش دەکران بەگوێرەی ژمارەی دانیشتووان. کە چڕی دانیشتووان لە ویلایەتێک بۆ ویلایەتێکی تر دەبێتە هۆی جیاوازبوون لە ژمارەی نوێنەرانی بە پێچەوانەی ژمارەی پیران کە یەکسانە لە نێوان ویلایەتەکان بەبێ گوێدانە ژمارەی دانیشتووان لەو ویلایەتانە.

دەبێت پاڵێوراو تەمەنی بگاتە بیست و پێنج ساڵ و دەبێت هاووڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بێت بۆ ماوەیەک کەمتر نەبێت لە حەوت ساڵ و هەروەها دەبێت هاووڵاتی ئەو ویلایەتە بێت کە نوێنەرایەتی دەکات و دەبێت سەرقاڵی هیچ کار و فەرمانێکی مەدەنی تر نەبێت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. ماوەی ئەندامیەتی لە ئەنجوومەنی نوێنەران دیاری کراوە بە دوو ساڵ و کورتی ماوەی ئەندامیەتی کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر هەڵسوکەوتی نوێنەر و نزیکی هەڵبژاردنی داهاتوو وا لە نوێنەر دەکات کە زۆر بە وردی ئاگاداریی ناوچەی هەڵبژاردنەکەی بێ کە دەبێت تێڕوانینێکی ناوخۆیی بەرتەسکی هەبێت بەرامبەر زۆر لە بابەتەکان و ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە ئەنجوومەن بەرەو ئەوە دەڕوات کە گرنگییەکی زیاتر لە گفتوگۆکانی و لیژنەکانی بدات و بەو بابەتانەی کە کاریگەرییەکی گەورە و ڕاستەوخۆیان هەیە لەسەر دەنگدەران وەکو

بابەتی باج و تێچوونە حکومییەکان و سیاسەتەکانی ناوخۆ و پێشخستنیان لە کاروباری دەرەوە و بابەتە نیشتمانییەکانی تر کە کاریگەری دووریان هەیە. پڕکردنەوەی کورسییە بەتاڵەکان کە بەهۆی مردن یان دەست لەکارکێشانەوە یان لە دەستدانی ئەهلیەت لە ڕێگای هەڵبژاردنی تەواوکەر کە حاکمی ویلایەتەکە بانگێشتەی بۆ دەکات ئەنجام دەدرێت کە ئەندامی هەڵبژێردراو لەم حاڵەتە ئەو ماوەی لە خولی ئەنجوومەن ماوە تەواو دەکات(٥٢).

لە سەرەتای پێکهاتنی فیدرالیەتی ئەمەریکی مافی دەنگدان والا نەبوو بۆ هاوولاتیان بەڵکو هەندێک کۆسپ هەبوون کە ئەم مافەیان سنووردار کردبوو کە مەرج بوو دەنگدەر چەند مەرجێکی دیاریکراوی هەبێت وەکو مەرجی خاوەنداریەتی، بەڵام ئەم مەرجە بەلاوە نرا تاوەکو بوار بدات بە بەخشینی مافی دەنگدان بۆ هەموو پیاوێکی پێگەیشتوو و بە تەنیا بەسترابووەوە بەو بنەمایانەی کە پەیوەندییان بە خوێندنەوە و نووسین و باجدان کە کاریگەری هەبوو هەتا ئەم سەردەمانەی دوایی لە قەدەغەکردنی زۆربەی زۆری ڕەشپێستەکان لە وەرگرتنی ئەم مافە(٥٣) و مافی دەنگدان درا بە ئافرەتان بەپێی هەموارکردنی نۆزدەهەم لە ساڵی ١٩٢٠.

نوێنەر حەسانەیەکی تەواوی هەیە لە کاتی ئامادەبوونی لە ئەنجوومەن هەروەها لە کاتی گفتوگۆکان و ئەنجوومەنی نوێنەران پێکەوە لەگەڵ ئەنجوومەنی پیران دەسەڵاتی پێشنیارکردن و یاسادانانیان هەیە بەڵام دەسەڵاتێکی تاکڕەوی هەیە لە بواری ئاسانکاری و پێشنیارکردنی یاسا داراییەکان و تاوانبارکردنی Impeachment فەرمانبەرانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن و ئەندامانی ئەنجوومەن هەڵدەستن بە هەڵبژاردنی گوتەبێژی فەرمی (speaker سەرۆک-) بە پێچەوانەی هاوشێوە بەریتانییەکەی - کە بەسومبولێکی سیاسی کاریگەر دادەندرێت و لێپرسراوە لە بەڕێوەچوونی گفتوگۆکان لەلایەک کە پابەند دەبێت بە گرتنەبەری ڕێبازێکی بێلایەن و پشتگیری نەکردنی لایەنێکی دیاریکراو(٥٤) و لەلایەکی تر ئەندامێکە زیاتر گرنگی هەیە بۆ پارتەکەی لە ئەنجوومەن کە ڕۆڵی خۆی دەبینێت لە بەرەو پێشەوەچوونی یاساکان و هەروەها سەرۆکایەتیکردنی ستراتیژیەتی پارتەکەی.

تاکو ساڵی ١٩١٠- کە تیادا چەند هەنگاوێک نرا بۆ دیاریکردنی ئەم پۆستە- گوتەبێژی فەرمی سەرکردەیەکی زۆر بەهێزبوو و تارادەیەک کە یەکێک لەو گوتەبێژە فەرمیانەی سەدی نۆزدەهەم ئەویش Tomas B.Read ناسراو بە قەیسەر czar، بەڵام

ئەمڕۆ بارودۆخ زۆر گۆڕاوە تاڕادەیەک کە گوتەبێژی فەرمی سەرۆکایەتی ئەنجوومەن دەدات لە ڕێگای بەکارهێنانی ئامرازی ڕازیکردن کە بەشێکی دروست بووە لەسەر بنچینەی تواناکانی لە ڕێپێشاندەری کارەکان و بەشێکی لەسەر بنچینەی ئیمتیازاتەکانی بەوەی کە ئەندامێکی پایەبەرزیی پارتەکەیەتی لە ئەنجوومەن[٥٥].

ج- دەسەڵاتەکانی کۆنگرێس:

کۆنگرێسی ئەمەریکی کە دادەنرێت بە دەسەڵاتی یاسادانانی یەکێتی تایبەتمەندی و دەسەڵاتێکی فراوان و زۆر گرنگی هەیە لە سیستەمی فیدراڵی ئەمەریکی و لە میانی بڕگەکانی رابوردوو ئاماژە بە هەندێ لایەنی ئەم دەسەڵاتانە کرا بەتایبەتی جێبەجێکردن و لێرەدا هەندێک لە گرنگترین ئەم دەسەڵاتانە دەخەینە ڕوو کە لەمانەی خوارەوە کۆدەبنەوە:

- دەسەڵاتی جاڕدانی جەنگ:

بەپێی حوکمەکانی بڕگەی دوو لە ماددەی یەکەم لە دەستووری ئەمەریکی کۆنگرێسی ئەمەریکی دەسەڵاتی جاڕدانی شەڕی هەیە، بەڵام ئەم دەسەڵاتە بەشێوەیەکی دیار و ئاشکرا بەکارنەهێنراوە و هەندێک دەڵێن[٥٦] کە تێبینی ئەوە کراوە کە لە کێشەی کۆریا کە لە ساڵی ١٩٥٠ تاکو ساڵی ١٩٥٣ درێژەی خایاند و هەروەها لە کێشەی ڤێتنام کە لە ساڵی ١٩٦٥ تاکو ساڵی ١٩٧٢ درێژەی هەبوو کە تاڕادەیەکی زۆر بە بارودۆخی جەنگ دەچوو، کۆنگرێس دەسەڵاتی خۆی پیادە نەکرد لە جاڕدانی جەنگ و ئەمەش دەشێت بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سەرۆک جڵەوی دەستپێشخەرییەکانی گرتبووە دەست لەم بوارەوە دەسەڵاتەکانی خۆی بەکارهێنا بەوەی کە سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئەمەریکایە، بەڵام کۆنگرێس لەم دواییەدا و لە ساڵی ١٩٧٣ یاسای دەسەڵاتەکانی جەنگی دەرکرد کە تیادا ئەو دەسەڵاتانەی دیاری کرد کە سەرۆک بۆی هەیە بەکاریان بهێنێت لەم جۆرە بارودۆخانەدا[٥٧].

- دەسەڵاتە داراییەکان:

دەکرێت کە دەسەڵاتە داراییەکان بە گرنگترین و ترسناکترین ئەو دەسەڵاتانە دابنرێت کە کۆنگرێسی ئەمەریکی هەیەتی کە دەسەڵاتی سەپاندنی باج و کۆکردنەوەی و سەپاندنی ڕەسمی گومرگی و مەکوس وە پێبژاردنی هەیە. هەروەها تایبەتمەندە بە قەرزکردنی پارە لەسەر حسابی یەکێتی و لەسەریەتی کە قەرزیش بداتەوە.

هەروەها دەسەڵاتی پارەلێدان و دەرکردنی و خەمڵاندنی نرخی دراوە بیانییەکان و هەروەها ڕێکخستنی پێوانە و کێش و مافی چاپ و حوکمەکانی پەرپووت بوون و بەڵگەنامەی داهێنانی هەیە.

وەک لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد کە ئەنجوومەنی نوێنەران بە تەنیا تایبەتمەندە بە دەستپێشخەری لە داڕشتنی ئەو یاسایانەی کە پەیوەندیان بە بەدەستهێنانی داهاتی دارایی هەیە کە بەرامبەر ئەو تایبەتمەندییە جێبەجێکارییانەیە کە دراوەتە ئەنجوومەنی پیران.

هەندێک وا بۆی دەچن(٥٨) لە بواری جەختکردنە سەر گرنگی ئەم دەسەڵاتانە کە باج گرنگترە لە بەدەستهێنانی داهاتی دارایی لەبەر خاڵێکی گرنگ ئەویش باج کاریگەرییەکی قووڵی هەیە لەسەر ئەوەی تاکەکان یاخود کۆمەڵەکان بە بەرهەمی دێن یاخود پێی هەڵدەستن و هەروەها لەسەر ئەوەی هانیان دەدات بۆ جێبەجێکردنی.

- دەسەڵاتە بازرگانییەکان:

لە دەستووری ئەمەریکیدا هاتووە کە کۆنگرێس تایبەتمەندە بەو کاروبارانەی کە پەیوەندییان بە بازرگانی هەیە لەگەڵ وڵاتە بیانییەکان و هەروەها بە بازرگانی لە نێوان ویلایەتەکان هەروەها دەڵێن(٥٩) کە سەرەڕای ڕاڤەکردنی فراوان و پێش وەخت لە لایەن قازی مارشاڵ بۆ دەسەڵاتەکانی حکومەتی فیدرالی لە بواری بازرگانی کۆنگرێس هەڵنەسا بە پەرەپێدانی دەسەڵاتەکانی بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەم بوارەدا تا سەرەتای سەدەی بیستەم(٦٠).

لە کۆتاییدا دەبێت ئەوە بڵێین کە کۆنگرێسی ئەمەریکی تایبەتمەندی و دەسەڵاتەکانی خۆی پیادە دەکات لە ڕێگای داڕشتنی یاسا پێویستەکان لەو بوارانەدا.

٢- سەرۆک و گرنگی کارەکەی لە سیستەمی سەرۆکایەتی ئەمەریکی:

هەندێک وا بۆی دەچن(٦١) کە لە نێوان سەرجەم دەزگاکان لە حکوومەتی ئەمەریکی وا دەردەکەوێت کە سەرۆکایەتی بەشێوەیەکی ئاشکرا زیاتر گورجوگۆڵ و چالاکتر بێت و هەندێکی تر سەرۆکایەتی ئەمەریکی وا دادەنێن کە یەکێکە لە پۆستە هەرە بەهێزەکان لە جیهان(٦٢) و بەشێکی ئەم بیرۆکەیەش بونیات نراوە لە ڕێگەی بەراوردکردنی بەپۆستی سەرۆکی وەزیران یان سەرۆکی دەوڵەتانی تر کە سومبولن و لە بەشێکی تریەوە ئەو

وردەکارییانەی کە پەیوەندییان بەسەرۆکایەتییەوە هەیە گرێدراون بە کەسایەتی ئەو پیاوانەی کە ئەم پۆستەیان وەرگرتووە.

لای کەس شاراوە نییە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە سیستەمی سەرۆکایەتی وەرگرتووە کە جیا دەکرێتەوە بەوەی کە سەرۆک کۆمار بەتەنیا سەرۆکی دەسەلاتی جێبەجێکردنە و ئەنجوومەنی وەزیران یان ئەوەی پێی دەگوترێت سیستەمی کابینەی وەزاری نییە و سەرۆک کۆمار ڕۆڵی سەرۆک وەزیران دەبینێت بەدەستەواژەیەکی تر پێسپاردنی دەسەلاتی جێبەجێکردن لە دەستی تەنیا کەسێکی هەڵبژێردراو لە لایەن میللەتەوە و کۆنگرێس بۆی نییە کە متمانەی خۆی لێ وەرگرێتەوە و لەم لایەنەوە ئەم سیستەمە جیاوازە لەگەڵ سیستەمەکانی دیموکراتی ڕۆژئاوا وەک سیستەمی پەرلەمانی و سیستمی حکوومەتی کۆمەڵ.

دەستووری ئەمەریکی دەسەلاتێکی فراوان و سەنگ و کاریگەرییەکی گەورەی دایە دەست تەنیا کەسێک بەشێوەیەک کە دامەزرێنەرانی دەستوور ئەم مەبەستەیان لە هزر نەبووە کاتێک کە ئەو دەقانەیان دارشت کە پەیوەندی بە پۆستی سەرۆکایەتییەوە بوو و ئەوان تووشی ترس و سام بوون کاتێک کە بینییان ئەم کارە گەشە دەستێنێت و پێش دەکەوێت بە پلەیەکی گەورە بەبێ ئەنجامدانی هەموارکردنی ناوەڕۆکی دەقە ڕەسەنەکان[٦٣].

J.S.sutton دەڵێت ئەوانەی کە دەستووریان دامەزراند بە تەواوی سڵیان دەکردەوە لە حکوومەتێک کە کۆمەڵەی یاسادانانی هەبێت وەکو ئەوەی کە پەیوەندی بەهاوچەرخەکانیانەوە هەبێت لە فەرمانگەی داگیرکەرەکان لە لەندەن. وایان بە چاک زانی کە شوێن پێی مونتسکیو بگرنە بەر و دەسەلاتێکی جێبەجێکردن دابمەزرێنن کە بە تەواوی جیابێت لە یاسادانەر (کۆنگرێس)، بەلام پشتی پێ ببەستێت لە ڕێگای ڕێنماییکردن لە شێوەی ئەو یاسایانەی کە جێبەجێیان دەکات و دەستکەوتنی داهات لە شێوەی یارمەتی دارایی لەبەرئەوەی ئەوان وا ڕاهاتبوون لەسەر ئەو بیرۆکەیەی کە پێڕەویان دەکرد لە میراتی بەریتانی ئەوان بڕیاریان دا بە سپاردنی دەسەلاتی جێبەجێکردن بە دەستی تاکە کەسێک نەک کۆمەڵێک[٦٤].

ئەوانەی دەستووریان دانا هەستیان بە مەترسی سپاردنی ئەم دەسەلاتە کرد بە دەستی تەنیا کەسێک بۆیە ئەوەی لە توانایاندا هەبوو کردیان بۆ دیاریکردنی سنوورەکانی و مەرج دانان بۆ هەڵبژاردنی بەرێگەی ناڕاستەوخۆ بۆ دوورکەوتنەوە لە خۆ سەپاندنی خۆی و بۆ

بەدەستهێنانی هەمان ئامانج ماوەی پۆستەکەیان بۆ چوار ساڵ دیاری کرد. هەڵبژاردنی سەرۆک لەو ڕێگەی کە ناو دەبرێت بە سیستمی کۆلیژی هەڵبژاردنەکان Electoral col-legeئەنجام دەدرێت کە ئەویش ئەوەیە کە هەر ویلایەتێک بەپێی یاسای خۆی بۆی هەیە کە ژمارەیەک پاڵێوراو هەڵبژێرێت کە یەکسان بێ بە ژمارەی پیران و نوێنەرانی ویلایەتەکە لە پەرلەمانی یەکێتی «کۆنگرێس» و ئەم پاڵێوراوە هەڵبژێردراوانە لە لایەن هەموو ویلایەتەکان هەڵدەستن بە هەڵبژاردنی سەرۆک و پەیدابوونی پارتە سیاسییەکان بووە مایەی ئەوەی کە مەحاڵ بێت ڕێگەی دەستنیشانکردنی سەرۆک تەنیا بە ڕێگەی شێوازی فەرمی ناڕاستەوخۆ بێت(٦٥) و لەو کاتەی کە پارتە سیاسییەکان بڕیاریان دا بە بەدەستهێنانی بەرزترین پۆست لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕاهاتن لەسەر ناونانی پاڵێوراوەکانیان لە کۆنگرەیەکی حزبی گشتی کە پێش کاتی ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی دەبەسترێت(٦٦) و هۆکاری هەڵبژاردنی سەرۆکی سێیەمی ویلایەتە یەکگرتووەکان. کە (تۆماس جیفرسون)ە Tomas Jefferson دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵ و کۆششی یەکێک لە پارتە سیاسییەکان(٦٧) و ئیتر بەم شێوەی دەستنیشانکردنی سەرۆک لە لایەنی کردارەوە گۆڕا بۆ هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ.

تایبەتمەندی و دەسەڵاتەکانی سەرۆک:-

أ- سەرۆکایەتی وڵات(٦٨)

ب- سەرۆکایەتی دەسەڵاتی جێبەجێکردن(٦٩).

ج- بەڕێوەبردنی کاروباری دەرەوە(٧٠).

د- سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکان(٧١).

ه- تایبەتمەندییەکانی یاسادانان:(٧٢)

٣- دەسەڵاتی دادوەری یەکگرتوو:

وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە سیستەمی دادگای دوو لایەنی وەرگرتووە ئەوانیش دادگای فیدرالیی Federal courts ، و دادگاکانی ویلایەتەکان states courts و دادگاکانی فیدرالی دابەش دەکرێنە سەر سێ جۆر(٧٣) یەکەمیان دادگای هەرێمەکان (کەرتەکان) District courtsو دووەمیان دادگاکانی تێهەڵچوونەوە Court of Appeal و لە کۆتایی دادگای باڵا supreme

court و لەبەر گرنگی ئەم دادگایەی دوایی بەتایبەتی لەوەی کە ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە بواری چاودێریکردن لەسەر بەدەستووری بوونی یاساکان تەنها گوتەکانمان لەم بوارەدا بۆ باسی ئەو وە بەکورتی تەرخان دەکەین

أ- دادگای باڵا supreme court :

دادگای باڵا بە بەرزترین دەسەڵاتی دادوەری دادەنرێت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و لەسەر ترۆپکی پەیکەری دادوەری ئەمەریکییە و ئەو دادگایەیە کە گەورەترین ناوبانگی هەیە لە جیهاندا[٧٤].

دادگای باڵا لە نۆ دادوەر Justice پێکدێت بەسەرۆکی دادوەرانەوە chief of Justice ئەوانیش لە لایەن سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بە پەسەندکردنی ئەنجوومەنی پیران دادەمەزرێن و ئەمانە لە خزمەت لانادرێن گەر هاتوو بە باشی خزمەت بکەن During Good Behaviour= تەنیا لە حاڵەتی تۆمەتبارکردنیان نەبێت بە خراپی هەڵسوکەوتیانExcept for Impeachable Behaviour[٧٥] و لەسەر ئەمە پەندێکی ئەمەریکی هەیە کە دەڵێت: ئەندامانی دادگای باڵا لەو کەسانەن کە زۆر بە کەمی دەمرن و هەرگیز دەست لەکار ناکێشنەوە[٧٦].

هەروەها مووچەی دادوەرانی دادگای باڵا کەم ناکرێتەوە تەنیا لە حاڵەتی باج و هەڵاوسان نەبێت[٧٧] و ئەوان زیاتر سەربەخۆن لە هاوشێوەکانیان لە ئەوروپا لەبەر ئەوەی شێوازی دروستبوونی دادگای باڵای ئەمەریکی جیاوازی هەیە لەگەڵ شێوازی دروستبوونی سەرجەم هاوشێوە ئەوروپییەکانی[٧٨].

بەڵام تایبەتمەندییەکانی ئەم دادگایەیان ڕەسەنە کە ئەویش ئەو داوایانە دەگرێتەوە کە تایبەتمەندە بە تەماشاکردنیان لە سەرەتاوە بەهۆی سروشتی کێشەکەوە یان سیفەتی لایەنەکانی داواکە[٧٩]. یاخود تایبەتمەندی پێداچوونەوە (تێهەڵچوونەوە) ئەویش ئەو داوایانە دەگرێتەوە کە دادگا بەشێوەی پێداچوونەوە تەماشایان دەکات لەسەر حوکمەکانی دادگاکانی تر.

هەندێک دەڵێن[٨٠] کە دادگای باڵا تایبەتمەندییە ڕەسەنەکانی لەسەر چەند کێشەیەکی کەم پیادە دەکات ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو کێشانەی کە تەماشا دەکرێن لە لایەن ئەم دادگایە بەشێوەی پێداچوونەوە بەپێی ئەرکەکانی لە چاودێریکردنی دادوەری. بۆ نموونە ژمارەی تەواوی ئەو کێشانەی کە خرانە بەردەم دادگای ناوبراو لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٦

تاوەکو تەمووزی ١٩٥٧ گەیشتنە (٢٠٥٢) کێشەکە لە نێوانیاندا (١٤) کێشە کە دادگا بە تەنیا بە سیفەتی ڕەسەن تەماشای کردبوون بەرامبەر (١١٦٠) کێشە کە بە پێداچوونەوە تەماشا دەکرا و (٨٧٨) کێشەی جۆراوجۆر[٨١].

دادگای باڵا تایبەتمەندە بە تەماشاکردنی ئەو داوایانەی کە پەیوەندییان بە چەسپاندنی دەستووری یەکێتی و یاسادانراوەکانی یەکێتی وەکو ئەو یاسا و بەڵێنانەی کە لە لایەن کۆنگرێس دەردەچن و دەبەسترێن، هەروەها تەماشای ئەو داوایانە دەکات کە تیایدا داوالێکراو باڵیۆزی وڵاتێکی بێگانەیە یان وەزیرێکی ڕێپێدراوە یان کونسوڵێکە یان جێگری کونسوڵێکە[٨٢]، بەڵام ئەگەر هاتوو یەکێک لەمانە داواکاربوو بۆی هەیە کە داواکەی بخاتە بەردەم دادگای باڵا یان یەکێک لە دادگاکانی تر لە ولایەتەکان.

هەروەها تایبەتمەندی ئەو دادگایە دیاری کراوە لە تەماشاکردنی کێشە دادوەرییەکان لە نێوان ویلایەتەکان و ئەو داوایانە بەرز دەکرێنەوە دژ بە یەکێتی ئەگەر هاتوو ئەوەی دوایی وازی هێنا لەو پاراستەیەی «حصانە» کە بۆی تەرخان کراوە لەبەر ئەوەی کە وڵاتێکی خاوەن سەروەرییە[٨٣].

هەروەها ئەم دادگایە تایبەتمەندە بە تەماشاکردنی هەندێک داوای تاوانکاری کە وای لە کۆنگرێس کردووە کە دەسەڵاتی سەپاندنی سزاکان بکاتە تایبەتمەندییەکی دادگای باڵا بەهۆی گرنگییان[٨٤].

دادگای باڵا تەنیا دادگایە لە نێوان دادگاکانی ئەمەریکا بەوەی کە ئازادییەکی گەورەی هەیە لە دیاریکردنی چوارچێوەی کارەکەی.

چەند یاسایەکی زۆر کەم هەن کە مافی تان لێدان دەدەن لە بەردەم دادگای باڵا وە ئەمەی دواییش تەماشای ژمارەیەکی کەم لەو کێشانە دەکات وەک تایبەتمدییەک کە پێشتر ئاماژەی پێکراوە، بەڵام دەبینین کە ڕێژەیەکی زۆر لەو داوایانە دەهێنرێتە پێش دادگا بەڕێگای فەرمانی دادوەری Right of certiorare کە دادگای ناوبراو دەری دەکات[٨٥].

سوتون sutton دەڵێت لە کۆمەڵگەیەکی ڕێکخراودا دەبێت دادوەر دوو فەرمان جێبەجێ بکات کە تەنیا ئەوە نەبێت کە بڕیار بدات بەدیاریکردنی جۆری کردارەکان لەسەر پێشێلکەرانی یاسا بەڵکو لەسەریەتی کە لە ژمارەیەک لەو بۆنانەدا بڕیار بدات کە واتای یاساوە پەیوەندار چییە وە ئەم فەرمانانە کەکلەیین لە هەر سیستمێکی حکوومی بەڵام لەسەریەتی کە گرنگییەکی تایبەتی پێوە دیاربێت کاتێک کە دەسەڵاتی دادوەری فراوان

دەبێت تاوەکو یاسایەکی یاسایەکی شکۆدار شی بکاتەوە بۆ وڵات کە ئەویش دەستوور خۆیەتی[٨٦].
لێرەوە گرنگی دادگای باڵا دەردەکەوێت بەوەی کە تایبەتمەندییەکانی تەنیا لەسەر چەسپاندنی دەستوور و ئەو یاسایانەی کە بەپێی ئەو دەردەچن نییە بەڵکو لەوەش زیاتر بە شیکردنەوەیان و ئەمەش ئاماژەی پێدەکەین لەبڕگەکانی داهاتوو.

ب- دادگای باڵا و چاودێری دادوەری Judicial Review:

ئەوەی شایانی باسکردن بێت کە دەستووری ئەمەریکی بەشێوەیەک کە هیچ گومانێکی تێدانییە دەسەڵاتێکی تەواوی داوەتە دادگای باڵا لە هەموو ئەو کێشانەی کە پەیوەندییان بە یاسای فیدراڵی و دەستوور خۆیەوە هەیە، وە تێیدا هاتووە کە دەسەڵاتی دادوەری درێژ دەبێتەوە بۆ هەموو کێشەکان لە یاسا و لە دادپەروەری کە لە ژێر سایەی دەستوور دروست دەبێت. The Judicial power shall extend to all cases in law and equity, arisin under The constitution [٨٧] بەڵام ئەم دەستوورە درێژەی زیاتری تێدا نەبوو بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتەکانی پێشێلکردنی یاساکانی فیدراڵی[٨٨] وە بە مانایەکی تر ئامـاژەی بە مافی دادگای باڵا نەکردبوو لە چاودێریکردن لەسەر بەدەستووری بوونی یاساکان، بەڵام ئەم دادگایە لەسەردەمی سەرۆکەکەی قازی مارشال marshall ئەم پرەنسیپەی جێگیرکرد[٨٩].

وە ئەمەش لە کێشەکەی ماربوری دژی مادیسۆن mardury v. madison دەستی پێکرد کە بۆ یەکەم جار دادگای باڵا یاسایەکی هەڵوەشاندەوە کە لە کۆنگرێسەوە دەرچوو بوو[٩٠]. کە سەرۆکی قازیەکان مارشال لە پاساو هێنانەوە بۆ پرەنسیپی چاودێری دادگا لەسەر بەدەستووری بوونی یاساکان وە لە ڕێڕەوی بڕیاری دەرچوو لەم کێشەیە ساڵی ١٨٠٣ گوتی شێوازی گوزارشتکردنی تایبەتی لە دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەو پرەنسیپە بەهێز دەکات کەوا پێویست دەکات کە ناوەڕۆکی هەموو دەستوورە نووسراوەکان بێت- بەوەی کە هەر یاسایەک هاو دژ بێت لەگەڵ دەستوور بەهەڵوەشاوە دادەنرێت، و دادگاکان و بەشەکانی تر دەبێت پابەندبن بەم ئامرازە.

The patticular phraseology of The constitution of The united states confirm and strengthens the principle, supposed to be essential to all written constitutions, that a law repugnant to the constitution is void are bound by that in- and that courts as well as other de (91)partment, strument.

ئەندرێ هوریو دەڵێت کە دوو هۆکار هەن بۆ بۆچوونەکانی قازی مارشال یەکەمیان

چەمکی ئەو گرێبەستەی سیستەمی فیدراڵی کە لەسەدەی نۆزدەهەم لە ئارادابوو، دووەم سروشتی شتەکان کە دەستوور ئاماژەی بەڕێککارییەک نەکردبوو بۆ سەرکوتکردنی پێشێلکاری لەسەر فیدراڵیزم کە داهێنانی ئەم ڕێککارییە زۆر پێویست بوو و لە ئەنجامدا هەموویان رازی بوون لەسەر پرەنسیپی قبوڵکردن کە دەسەڵاتی دادوەری چاودێربێت لەسەر دەستووریەتی یاساکان.(٩٢) وە بەپێی ئەم بڕیارە دادگای باڵا لە ڕاستیدا خۆی بە باڵی سێیەم لە حکوومەت دانا و پروپاگەندەی ئەوەی دەکرد کە دەسەڵاتی ئاشکراکردنی ئەو کارانەی هەیە کە لە سەرۆکەوە دەردەچن یان ئەو کارانە دادەڕێژرێن لە لایەن کۆنگرێسەوە و واژوو دەکرێن لە لایەن سەرۆکەوە، کە کاری بەتاڵن و ئەو دەسەڵاتە- بەکۆ لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەی کە پێی دراوە لە لایەن دەستووری فیدراڵی بۆ چەسپاندنی ئەوەی دوایی لە کاتی دژ بەیەک بوون لە نێوان دەستوور و یاسای ویلایەتەکان- وە ناسرابوو بەچاودێری داوەری دادگای باڵا ڕێوشوێن و دەسەڵاتی بێ هاوتای خۆی وەردەگرێت(٩٣).

لەگەڵ ئەوانە ڕێک دەکەوین کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ترسناکترین داهێنان کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دۆزییەوە لە بواری یاسای دەستووری ئەویش هێنانەکایەی بیرۆکەی چاودێری لەسەر بەدەستووریبوونی یاساکان ئەویش لە پێدانی چەند دەسەڵاتێک بەدادگاکان بەشێوەیەکی گشتی و دادگای باڵا بەشێوەیەکی تایبەتی لە پشکنین و وردبوونەوە لە ڕێکەوتنی ئەو یاسایانەی کە لە کۆنگرێس دەردەچن و ئەو کارانەی کە لە سەرۆکەوە دەردەچن لەگەڵ دەقەکانی دەستوور وەکو خۆی و ئەو ڕێگەیەی کە دادگای باڵا ئەم دەسەڵاتەی تێدا پیادە دەکرد لە رابووردوو ئەوەی تێدا نەبوو کە یاسا و کارەکانی سەرۆک ئاشکرا بکات بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کە هەڵوەشاوەن بەڵکو ئاشکراکردنی هەڵوەشاندنەکە تەنیا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بوو، و لە میانی تەماشاکردنی ئەو داوایانەی کە تەماشای دەکردن کاتێک کە بڕیاری ئەوەی دەدا کە یاسایەک یان کارێک دەستووری نییە وە پووچەڵە بەوەی کە لەگەڵ دەستوور ڕێک ناکەوێت، و لەسەر داکۆکیکردنی یەک لە لایەنەکان وە ئەو ڕێچکەیە بەڕێچکەی پاڵ «الدفع» Exception، ناوزەدکراوە بەڵام لەساڵانی دوایی دوو ڕێگای تر دۆزرایەوە بۆ جاڕدانی ئەو یاسایانەی کە دەستووری نین بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ وە ئەم دوو ڕێگایەش ئەوەی پەیڕەویان بکات دەتوانێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ داوا بەرزبکاتەوە بەمەبەستی دەرچوونی بڕیارێک بۆ یاسایەک کە دەستووری نییە و ڕێگەی یەکەم پێی دەگوترێت «قەدەغەکردن» Inojoction بەڵام دووەمیان پێی دەگوترێت فەرمان «ناچارکردن» -man

damus و ئەم دوو ڕێگایەش باون لە کێشە ئابوورییەکان وەک کاردانەوەیەک بۆ سیاسەتی سەوداگەری نوێ new deal کە سەرۆک فرانکلین روزفلت پەیڕەوی دەکرد[٩٥].

وە هەندێک دەڵێن[٩٦] کە دەسەڵاتی دادگای باڵا لە چاودێری دادوەری ڕۆڵێکی یاسادانانی گرنگی داوەتە دادگا لەبەرئەوەی سەرەڕای مانەوەی دەقەکانی دەستوور وەک خۆی شیکردنەوەی ئەم دەقانە گۆڕا لە ژێر ڕۆشنایی گۆڕانی کۆمەڵگا، و لەم دواییەدا ئاسانترین نموونە لەسەر ئەمە ئەوەیە کە لە پارێزنامەی مافەکان هاتووە لە هەموارکردنی هەشتەم کە ڕێگە نادات بە بەکارهێنانی سزای نامرۆڤانە یان نا ئاسایی وە ئەمەش لە ساڵی «١٧٩١» وە کە مێژووی پەسەندکردنی هەموارکردنە- زۆربەی تاوانبارەکان بەشێوەیەکی یاسایی هەڵواسران یان لە سێدارە دران یان بەلێدانی کارەبا، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٢ وە لە میانی شیکردنەوەی هەمان دەق دادگای باڵا ڕایگەیاند کە سزای مردن- لە سێدارەدان- دەستووری نییە وە هەر یاسایەکی فیدراڵی یان یاسایەکی تایبەتی لە ویلایەتەکان فەرمان بەم سزایە بدات لە ئێستا بەسەرەوە بە پووچەڵ دادەنرێت و زۆربەی هەموارکردنە یاساییەکان وروژێنران و دانران لەسەر بڕیارەکانی دادگای باڵا[٩٧] هەروەکو قازی هیوز سەرۆکی دادگا لە ساڵی ١٩١٧ جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە قازییەکان یاسا دادەنێن وە پێویستە کە یاسا دابنێن[٩٨] و لەبەرئەوە جون دی ویفر Jhon D. weaver دەڵێت کە هیچ دادگایەک لەسەر ڕووی زەوی نییە بەهێز بێت وەکو بەهێزی دادگای باڵای ویلایەتە یەکگرتووەکان[٩٩].

ج- ڕۆڵی سیاسیی دادگای باڵا:

لەگەڵ زۆربەی زانایانی یاسای دەستووری ڕێک دەکەوین[١٠٠] لەوەی کە دادگای باڵا لە پاڵ ئەوەی کە دەزگایەکی دادوەرییە لە هەمان کاتدا بە بەشێک لەو پرۆسە سیاسییە political process دادەنرێت کە لەویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئارادایە کە ڕۆڵێکی باڵای بینیوە لە مێژووی سیاسی ئەم وڵاتە و زۆر جار داوای لێ کراوە کە بڕیارێک بدات خۆی بە شیاوی بزانێت دەربارەی ئەوکێشە گشتییانەی کە ناکۆکی لەسەرە و گرنگییەکی سیاسیی زۆری هەیە.

ئەم دادگایە پشتی بەستبوو بە لەبەرچاوگرتنی بارە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان هەتا فەلسەفیش لە چوارچێوەی یاساو هێنانەوە بۆ بڕیارە جۆراوجۆرەکانی.

و له‌ به‌رئه‌وه‌ دادگای بالا له‌ پێگه‌ی پێشه‌وه‌ بوو له‌ سیسته‌می سیاسی ئه‌مه‌ریكی و سه‌رۆكی دادگا به‌ڕێز هیوز له‌م باره‌یه‌وه‌ ده‌ڵێت «ئێمه‌ ده‌ستوور فه‌رمانی پێكردووین، به‌ڵام ئه‌م ده‌ستووره‌ ئه‌وه‌یه‌ كه‌ قازییه‌كان ده‌یڵێن»[١٠١].

هه‌روه‌ها جاكسون له‌كتێبه‌ به‌ناوبانگه‌كه‌ی «دادپه‌روه‌ری» به‌راوردی كردووه‌ له‌نێوان دادگای بالاو كۆنگره‌ی ده‌ستووری هه‌میشه‌یی كه‌ده‌توانێت ده‌ستوور بگۆڕێت به‌بێ ئه‌وه‌ی كه‌ كاره‌كانی پێویستیان به‌ په‌سه‌ندكردن هه‌بێت[١٠٢]. هه‌روه‌ها ئه‌و ده‌سه‌ڵاته‌ گه‌وره‌یه‌ی كه‌ دادگای بالا هه‌یه‌تی له‌ ئه‌نجامدانی چاودێری كردن له‌سه‌ر هه‌ر یاسایه‌ك له‌ یاساكانی كۆنگرێس و ئه‌نجوومه‌نه‌كانی یاسا دانانی ویلایه‌ته‌كان یان هه‌ر كارێك له‌كاره‌كانی سه‌رۆك یان بڕیاره‌ دادوه‌رییه‌كانی ویلایه‌ته‌كان كه‌ ده‌بێت ده‌ر ئه‌نجامێكی سیاسی لێ بكه‌وێته‌وه‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی سه‌رۆك و ئه‌ندامانی ئه‌م دادگایه‌ ئه‌وانیش هاووڵاتی ئه‌مه‌ریكان وه‌ هه‌روه‌ها ئه‌و بیرۆكه‌ سیاسییه‌ جۆراوجۆرانه‌ی كه‌ له‌ ئارادان له‌وێ، كاریگه‌رییان ده‌بێ له‌سه‌ریان و شیكردنه‌وه‌یان بۆ ئه‌و كێشانه‌ی كه‌ پێشنیار ده‌كرێنه‌ پێشیان پێویسته‌ بگۆڕێت به‌ گۆڕانی ئه‌و بیرۆكه‌ سیاسییه‌ی كه‌ باوه‌ڕیان پێی هه‌یه‌ به‌تایبه‌تی كه‌ زۆرجار دادگا جۆراوجۆره‌كان په‌نای بۆ ده‌به‌ن به‌تایبه‌تی دادگای بالا له‌بۆچوونه‌ دادوه‌رییه‌كان كه‌ تیایدا پشت ده‌به‌ستێت به‌ هه‌موو جۆره‌ له‌به‌رچاوگرتنێك هه‌تا فه‌لسه‌فیش وه‌كو پێشتر ئاماژه‌مان پێكرد، وه‌ پاڵپشت به‌وه‌ی كه‌ یاسا ئاوێنه‌ی ده‌ربڕینی پێشكه‌وتنی كۆمه‌ڵگایه‌ له‌ قۆناغێكی مێژوویی دیاریكراو كاتێك كه‌ ده‌بێت دادوه‌ره‌كان رۆڵێكی گه‌وره‌یان هه‌بێت له‌ شیكردنه‌وه‌ی وه‌ ئه‌مه‌ش ده‌رئه‌نجامی گه‌وره‌ی لێ ده‌كه‌وێته‌وه‌ ئه‌گه‌ر هاتوو زۆرینه‌ له‌ دادگا بیروبۆچوونی پارێزگارانه‌یان هه‌بوو ئه‌وا شیكردنه‌وه‌كه‌ شێوازێكی ته‌سك و كۆنه‌په‌رستی ده‌بێت سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌م یاسایه‌ پێشكه‌وتنخوازه‌ به‌ڵام ئه‌گه‌ر هاتوو ئه‌م زۆرینه‌یه‌ لیبراڵی بوو ئه‌وا شیكردنه‌وه‌ یاساییه‌كه‌ی شیكردنه‌وه‌یه‌كی پێشكه‌وتووخواز و به‌رفراوانه‌ ده‌بێت ئه‌گه‌ر چی ئه‌م یاسایه‌ كۆنه‌په‌رستانه‌ش بێت.

وه‌ له‌سه‌ر بنچینه‌ی ئه‌م ڕاستییه‌ ده‌كرێت چه‌ند وێستگه‌یه‌ك لێك جیابكرێته‌وه‌ له‌ گه‌شته‌ مێژووییه‌كه‌ی دادگای بالا، ده‌كرێت بڵێین پاش ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌م دادگایه‌ ناسرابوو به‌تێڕوانینی لیبراڵییانه‌ له‌ژێر سایه‌ی سه‌رۆكه‌كه‌ی قازی مارشال وه‌ به‌كاریگه‌رییه‌كی گه‌وره‌ له‌وه‌وه‌، وه‌ به‌ری ئه‌م تێڕوانینه‌ش جه‌ختكردن بوو له‌سه‌ر مافی دادگا له‌ چاودێریكردن له‌سه‌ر به‌ده‌ستووریبوونی یاساكان و ئه‌مه‌ش بووه‌ هۆی ئه‌وه‌ی كه‌ بكه‌وێته‌ ژێر هێرشێكی توند له‌ لایه‌ن پارێزگاره‌كان له‌به‌ر ئه‌و هه‌ڵوێسته‌ی كه‌ پێشتر باس كرا،

دەبینین کە دادگا خۆی دەگۆڕێت بۆ چەمکی پارێزگار لە پاش ساڵی ١٨٨٠ بەناوی پارێزگاریکردن لە پرەنسیپە کلاسیکییەکانی ئازادی گرێبەستەکان وە هەروەها پارێزگاریکردن لە مافی دەوڵەتانی ئەندام وە سەروەرییەکانیان لەبەرامبەر حکوومەتی یەکێتی و ئەو دادگایە بۆ ماوەی نیوسەدە ئەو چەمکەی پێڕەوکرد وە ئەمەش بووە مایەی سەرهەڵدانی زاراوەی «حکوومەتی دادوەرەکان[١٠٣] کە گوزارشتە لە دەسڕۆیی ئەم دادگایە و ڕاوەستانی بە ڕووی گۆڕانکارییەکان کە لەسەرەتادا ڕاوەستابوو لە ڕووی ئەو هەموارکردنە ئابوورییانەی کە داڕێژرابوون لەسەر بناغەی پێشنیاری سەرۆک ڕۆزفلت کە ناسراوە بە مامەڵەی نوێ newDeal کە ئەو هەموارکردنانەی بە دەستووری دانەدەنا بەڵام دادگای ناوبراو لە بیروڕای خۆی پاشگەز بووەوە و دانی نا بەدەستووربوونی ئەو هەموارکردنانە پاش ئەوەی کە سەرۆک روزفلت توانی پێکهاتەکەی بگۆڕێت[١٠٤]

بەڵام دادگای ناوبراو جارێکی تر تێگەیشتنە پارێزگارەکەی خۆی گۆڕی بۆ ئەرەی تر کە لیبراڵییە لە ئەنجامی دامەزراندنی دادوەر Earl warrem بەسەرۆک لە ساڵی ١٩٥٣ کە جێ پەنجەی خۆی لەسەر ئەم دادگایە دیاربوو زیاتر لەهەر سەرۆکێکی پێش خۆی بەتایبەتی لە سەدەی بیستەم[١٠٥] وە ئەمەش بووە هۆی بە دەستهێنانی دادپەروەرییەکی زیاتر لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەک و سنووردارکردنی دەسەڵاتی زۆرینە بۆ بەرژەوەندی تاک و کەمینە لەلایەکی تر[١٠٦]

وە ئەم هەڵوێستەی دادگای باڵا بووە هۆی دابەشبوونی پیاوانی یاسای ئەمەریکی بۆ دوو بەش لە نێوان رەخنەگر و پشتگیریکەر و سام جیی ئیفرینج کە رەخنە لە هەڵوێستی دادگای ئیریل وارین Earle warren دەگرێت و دەڵێت بەدرێژایی هەموو مێژوومان دادوەرەکانی دادگای باڵا باوەڕیان بەخەوی باو و باپیرانی دامەزرێنەر هێنابوو وەرازی بوون بە دەستوور وەک پێوەرێک بۆ حوکمەکانیان بەڵام لەبەر بەدبەختی ئەم حاڵەتە وەک خۆی نەمایەوە لەماوەی ئەم ساڵانەی دوایی، و لە پێش ساڵی ١٩٥٣ ئەو دادوەرانە بیروبۆچوونی خۆیان پیادە دەکرد، لەجیاتی بەندەکانی دەستوور لەژێر پەردەی شیکردنەوە... وە لەماوەی دادگای وارین ئەم چالاکییە ڕوو لەزیادبوون بوو بە زیادبوونێکی بەرچاو کە بڕیارەکانی دادگای باڵا هەرگیز لەگەڵ دەستوور ڕێک ناکەوێت چونکە وارین لە ژێر پەردەی شیکردنەوە واتای پێچەوانەی دەدایە دەق و روحەکان بەمەش ئەم دادگایە تەگەرەی لەپێش کارەکانی سەرۆک جێگرەکانی دادەنا کە دەبووە هۆی ئەوەی هەندێ جار لە دەسەڵاتە دەستوورییەکانی کۆنگرێس تێدەپەڕی و شیکردنەوەی وای دەدا کە

لەگەڵ وشەکانی دەستوور ڕێک نەدەکەوت... وە دادگای وارین چەند هەنگاوێکی هاویشت لەڕێگای زەوتکردن، ئەگەر دادگا لەڕێڕەوی خۆی پاشگەز نەبێتەوە ئەوا خەوی باو و باپیرانی دامەزرێنەر بە تەواوی تێک دەچێ و ئازادی ڕاستەقینەی میللەت کە مافی خۆیەتی لە حکوومەتێکی دەستووری بە تەواوی لەناو دەچێ[١٠٧] بەڵام ڕامزیی کلارک داواکاری گشتی ئەمەریکی پێشوو لەکاتی پشتگیریکردن و بەرگریکردن لە هەڵوێستی پێشووی دادگای باڵا دەڵێت: « ئەوەی کە دەستوور بەهێز و دەوڵەمەند دەکات و وای لێدەکات کە زیاتر چالاک بێت بە دواداچوونی دەق و ناوەڕۆک و کارکردنە بۆ بەستنەوەی بەسەردەمی ئێستا و تێگەیشتنی مێژوو تێگەیشتنی ڕۆڵی یاسایە لەهەر کۆمەڵگەیەک، بەڵام ترسان لە گۆڕان هیچ ئەنجامێکی نابێت جگە لە لاوازکردن و مانەوەی وەک بەڵگەنامەیەکی کۆن کە هیچ سوودێکی نییە... دادگای باڵا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەزگایەکی پارێزگارە بەڵکو پارێزگارترین دەزگایە لە سیستەمەکەمان بەڵام هەوڵ دەدات کە بگونجێت لەگەڵ ئێستا و داهاتوو زیاتر لەوەی کە دەزگایەکی تر دەیکات وە لە ماوەی بیست ساڵی دوایی توانی پێویستییە گرنگەکانی سەردەممان بناسێت ئەویش لەو کێشانەی کە ڕێگە چارەی دۆزییەوە و یەک کێشەیان باس بکەین کە کێشەی بێکەر دژی کار «١٩٦٢» وە ئەم کێشەیەش حکوومەتی ئازاد کرد لە کۆت و بەندەکانی سەدەی نۆزدەهەم... و لە زۆر کێشەی جۆراوجۆری تر کە دادگای باڵای گیروگرفتێکی چارەسەرکرد کە گەورەترین گیروگرفتی ئەمەریکا بوو ئەویش گیروگرفتی ڕەگەز پەرستییە کە وای لێ کردین هەست بکەین بە گرنگی کارکردن بەشێوەیەک کە وامان لێ بکات ڕێز لە خۆمان بگرین وە هەست بە دادپەروەری بکەین کە ناوەڕۆکی دەستوور ئاشکرابوو لەم بابەتە...یان دەبێت گلەیی لە دادگا بکەین کە بە شوێن دەستوور کەوتووە و ئەمەش وا دەگەیەنێت کە ئێمە ڕێزی ئەم بەڵگەنامەیە ناگرین و کار ناکەین بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی کە تێیدا هاتووە[١٠٨]

بەڵام ئەم ئاڕاستە پێشکەوتنخوازییە کۆتایی پێ هات لە ئەنجامی گۆڕانی سەرۆکی دادگا «Earl warren» و سێ دادوەری تر لە ئەنجامی دەسەلات گرتنە دەست لە لایەن پارتی کۆماری پاش ساڵی ١٩٧١ و لە سەردەمی سەرۆک ڕیتشارد نیسکون.[١٠٩]

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی یەکەم

(١) الدکتور عبدالحمید متولي القانون الدستوري و النظم السیاسیة- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٦ .

دکتۆر «احمد کمال ابوالمجد»- مێژووی دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا- توێژینەوەی بڵاوکراوە لە گۆڤاری یاسا و ئابووری میسری- چاپخانەی زانکۆی قاهیرە ژمارە چواری ساڵی ١٩٦١ ل ٦٣٢ .

(2) Wallace S. Sayer, Op. Cit Page 17.

(3) Ryad azahari, Op. Cit Page 15-16.

(4) Wallace S. Sayer, Op . Cit Page 17.

(5) Ryad Azhari, Op. Cit Page 16.

(٦) «الدکتور عبدالحمید متولي- القانون الدستوري و النظام السیاسي»- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٧

(٧) هەندێک دەڵێن کە نەخشەی فەرجینیا لە لایەن جیمس مادیسۆن ئامادەکراوە بە پاڵپشتی جۆرج واشنتۆن.

سەیری ئەو رایە بکە لە William h. riker, federalism, Op. Cit Page 20 هەندێکی تر دەڵێن کە ئەم نەخشەیە لە لایەن ئەدموند راندولف Edmund Randolph ئامادەکراوە. بڕوانە لە Wallace .S. Sayar, Op. Cit Page 19

دکتور احمد کمال ابو المجد- التاریخ الدستوري للولایات المتحدة الامریکیة- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٤٠.

الدکتور «حسن الجلبي- العراق و الفدرالیة»- سەرچاوەی پێشوو ل ٤

(8)Wallace S. Sayer,Op. Cit Page 19-20.

(9)William H.Riker, Federalism, Op. Cit Page 21.

(١٠) «الدکتور احمد کمال ابوالمجد- التاریخ الدستوري للولایات المتحدة الامریکیة» سەرچاوەی پێشوو ل ٦٤٦

(11)Alexander Hamilton and James madison John jay Op. Cit. no 3 Page 97.

(١٢) «الدکتور احمد کمال ابوالمجد - التاریخ الدستوري للولایات المتحدة الامریکیة»- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٥٨- ٦٥٩.

(13)James bryce,Op, Cit Page 16-17.

(14)Ryad Azhari, Op. Cit Page 19.

(15)James bryce, Op. Cit Page 17.

(16)Article 2 Section 2 From the American Constitution.

(17)Article 1 Section 10 From the American Constitution.

(18)Article 1 Section 10 From the American Constitution.

(19)Article 1 Section 10 From the American Constitution.

(20)Article 1 Section 8 From the American Constitution.
(21)Article 1 Section 8 From the American Constitution.
(22)Article 1 Section 8 From the American Constitution.
(23)Article 2 Section 2 From the American Constitution.
(24)Article 4 Section 4 From the American Constitution.
(25)Article 1 Section 10 From the American Constitution.
(26)Article 1 Section 8 From the American Constitution.
(27)Article 1 Section 8 From the American Constitution.
(28)Article 1 Section 8 From the American Constitution.
(29)Article 1 Section 10 From the American Constitution.
(30)Article 1 Section 10 From the American Constitution.

(٣١) لەم بارەیەوە تەماشای James Bryce, Op. Cit Page 306-307 بەڵام وەکو جوزیف زیرمان Joseph F. Zemmerman دەستووری ویلایەتەکان پێنج بەش لەخۆ دەگرێت بەڵام باس دەکات کە ئەم بەشانە ئەمانەن یەکەمیان پێشەکی preamable دووەمیان پارێزنامەی مافەکان Bill of right و سێیەمیان دەقی دەستوور Body و چوارەمیان ئەو دەقانەی کە تایبەتن بە هەموارکردن Amen ding و پێنجەمیان پێیدەگوترێت Schedule کە پێک دێت لە رێگا و شوێن و کاتی دامەزراندنی حکوومەت کە لە دەستوور ئاماژەی پێکراوە.

Joseph F. Zemmerman, State and local Government, branes & noble inc. newyork Second printing 1962 Page 44 -45. Op. Cit Page 307
(32) Op. Cit Page 301.

(٣٣) ئەم ئەنجوومەنە لە شەش ویلایەت پێیدەگوترێت کۆمەڵە Assembly بەڵام لە سێ ویلایەتی تر پێیدەگوترێت ئەنجوومەنی نوێنەران یان رێپێدراوان House of Delegates
تەماشای ئەوە بکە لە Op. Cit Page 331

peter woll and Sidney E. Zimmerman, American Govern ment mcgraw-hill, inc, Secnd edition, 1992 Page 69.
(34)Op. Cit Page 69.
(35)Op. Cit Page 69.
(36)Op. Page 371.
(37)Op. Page 371.
(38)Charles A.beard, Op. Cit Page 127-128.
(39)Op, Cit Page 127-128.

(٤٠) بڕوانە سەرەتای ئەم دکتۆرا نامەیە.

(41)Frederic. J. Hoskin, the American Governmernt Washington D.C 1923,Page 31

(42)J.S.Sutton, Op Cit Page 64.

(43)Seven teenth amendment of the Constitutuion.

(44)Wallace S.sayre, Op. Sit Page 68 -69.

(45)Wallace S. Sayre, Op Cit Page 69.

(46)Section 1 Article 1 From the Constitution.

(47)J .S. sutton, Op. Cit Page 66.

(٤٨) مەبەست پەسەند نەکردنی ڕێککەوتنامەی فرسای لە لایەن ئەنجوومەنی پیران لەسەردەمی سەرۆک ودرۆ ولسون.

(٤٩) بۆنەیەک کە لەهەموو بۆنەکان سەرنج ڕاکێشتر ئەوەبوو کە ئەنجوومەنی پیران پاڵێوراوی سەرۆک نیکسۆن Nixonی ڕەتکردەوە بۆ دادگای باڵا بۆ جاری دووەم ئەم ڕەتکردنەوەیە لە جاری سێیەم هەستی پێکرا لە ڕێگەی کێشانەوەی دادوەرە پاڵێوراوەکە بۆ خۆپاڵاوتن.

(50)Frederic J.Haskion, Op. Cit Page 303.

(51)Op. Cit Page 303.

(52)Wallace S. Syer, Op. Cit Page 67.

(53)J.S Sutton, Op . Cit Page 57.

(٥٤) ئەندریە هوریو دەڵێت کە سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەمەریکی بێلایەن نییە وەک سەرۆکی (Speaker) ئەنجوومەنی گشتی بەریتانی.

بڕوانە: ئەندریە هۆریۆ- سەرچاوەی پێشوو لە ٤٠٨

(55)J.S.Sutton, Op. Cit Page 61.

(56)Kenneth Prewitt and Siney Verba and Robert H. Salisbury.
an introduction to American Government, Hrper Collins Publishers united States sixth edition 1991 Page 318 -319

(57)Op. Cit Page 319.

(58)Op. Cit Page 319.

(59)Rocco J.tresolini, American Constitutional law, the macmillan Company, newyork, Second Printing 1693 Page 162.

(٦٠) دەتوانرێت بگوترێت کە کۆنگرێس شتێکی نەکرد کە باس بکرێت لە بواری ڕێکخستنی بازرگانی لە ماوەی سەد ساڵی یەکەم لە تەمەنی یەکیەتی. بەڵام لە ساڵی ١٨٨٧ یاسای بازرگانی دەرکرد لە نێوان ویلایەتەکان و لەوکاتەوە ڕۆڵێکی زیاتر پیادە دەکات لەم بوارە کە دەسەڵاتەکانی بەکارهێنا لە دەرکردنی یاسای شیرمان کە گردبوونەوەی سەرمایەگوزاری گەورە قەدەغە دەکات سزا دەسەپێنێت بەسەر ئەوانەی کە پیلان دەگێرن بۆ پاوانکردنی بازرگانی لە نێوان ویلایەتەکان یان لەگەڵ وڵاتانی تر.

(61)Emest S.Griffith, the Americon System of government, Studerit Edition, New York, Woshington, Fourth Edition 1966 Page 67.

(62)James. Q. wilson and john J.dilulio, American Govern ment.

Institution and Policies D.C Heat and compan, lexingtion massachuse ttes Toronto Sixth Edtion 1995 Page 344.

(63)J. S. Sutton. Op. Cit Page 30.

(64)Op. Cit Page 350.

(٦٥) «الدكتور عبدالحميد متولي- القانون الدستوري و الانظمة السياسية»- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٨٧.

(٦٦) «اندريه هوريو»- سەرچاوەی پێشوو ل ٤١٣.

(٦٧) «الدكتور عبدالحميد متولي- القانون الدستوري و الانظمة السياسية»- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٧٩. پەراوێز.

(٦٨) هەندێک دەڵێن کە سەرۆک بە پاشای هەڵبژێردراو Elected Monarchی ولایەتە یەکگرتووەکان دادەنرێت کە ئەویش هاوولاتی یەکەم و نوێنەری فەرمی میللەتە لە بەر ئەوە ئەویش هەڵدەستێت بە بەجێهێنانی هەموو ئەو شتانەی کە ئەم پلەیە دەیەوێت بە پێی پرۆتۆکۆڵە فەرمییەکان وەکو پێشوازی نێردراوە دیبلۆماسییەکان وە کردنەوەی نوێنەرایەتییە گەورەکان و پرۆژە گەورەکان و پێشوازی شاندی جەنگاوەرە کۆنەکان و رێگەدان بە دەستپێکردنی رێورەسمی جەژنی سوپاسگوزاری. سەرۆک هەوڵ دەدات بۆ سووککردنی ئەم پاڵەپەستۆ پرۆتۆکۆڵییانە بەسپاردنی هەندێکیان بەجێگرەکەی. سەرۆک دەتوانێت لێبووردن دەربکات و جێبەجێکردنی سزا رابگرێت لەسەر هەر کەسێک و لە هەر تاوانێک دژ بە یاسا تەنیا لە حاڵەتی تۆمەتبارکردن نەبێت بە دڵسۆزی Impeachment کاتێک کە لێبووردنێک بۆ کۆمەڵە کەسێک دەردەکات ئەو کاتە ئەو لێبووردنە بە گشتی دادەنرێت. بڕوانە:

J.s Sutton, Op, Cit Page 31-32

Kennth, Prewitt and sidney verbaand Robert H.Salisbur Op .Cit Page 368

James Q. Willson and hohn Dilulio Op. Cit Page 354.

Wallaces. Sayer. Op Cit Page.34

(٦٩) سەرۆک بەو پێیەی کە سەرۆکی دەسەلاتی جێبەجێکردنە دەسەلاتی جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەشی هەیە کە کۆنگرێس دەری دەکات کە ئەوانیش بەڵێنامە و یاسا دادوەرییەکان و هەموو قەواڵەکان کە هێزێکی یاساییان هەیە بەپێی دەستوور هەروەها هەڵدەستێت بە بەڕێوەبردن و هەڵسووڕاندنی کاروباری رۆژانەی حکومەتی فیدراڵی و لەم حاڵەتەشدا هەڵدەستێ بەئەرکەکانی سەرۆک و وەزیران لە ولاتانی تر کە بەرپرسیاریەتی سەرۆک زۆر فرەوانترە لە بەرپرسیاریەتی سەرۆک وەزیران کە هەرچەندە بەوەزیری یەکەم دادەنرێت، بەلام بەیەکێک لە ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران دادەنرێت کە بەرپرسیارن بەهەموو ئەندامەکانییەوە بەرپرسیاریەتێکی هاو ئەرک لەبەردەم پەرلەمان لە

هەر کارێک لە کارەکانی ئەندامەکان بەسەرۆک وەزیرانیشەوە جگە لەمەش ئەو بەرپرسیاریەتە بەش دەکات لەگەڵ وەزیرەکان بەڵام سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەیەکەم بەرپرسیار دادەنرێت لە کارەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن و هەستانی وەزیرەکان بەکارەکانیان دەبێت لە جیاتی سەرۆک بێت و لەسەر بەرپرسیاریەتی ئەوەی دوایی بێت.

سەرۆک هەڵدەسێت بەدامەزراندنی ئەوانەی کە ئاستی بەرزیان هەیە و کەوتوونەتە ترۆپکی هەرەمی حکوومی وەکو وەزیرەکان و باڵیۆزەکان و قازی دادگای باڵا و هی تریش بەڵام هەندێک کۆت هەن لە رێگەگرتن لە دەسەڵاتی سەرۆک لەم بوارەدا پوختەی ئەمەش ئەوەیە کە پێویستە رەزامەندی ئەنجوومەنی پیران وەربگیرێت لەسەر ئەو دامەزراندنانە.

کاری سەرۆک بەرێوەبردنی دەزگای راژەی شارستانی فیدراڵیش دەگرێتەوە کە ژمارەی کارمەندەکانی دەگاتە نزیکەی سێ ملیۆن فەرمانبەر و کۆنگرێس کارگێرایەتییەکانی (دەزگاکانی) جێبەجێکردنی سەرەکی دامەزراندووە و سەرۆک بەپێچەوانەی سەرۆک وەزیران لە بەریتانیا ناتوانێت کە گۆرانکاری و شتێکی نوێ زیاد بکات بۆ ئەم رێکخراوە کارگێرییە ئەگەر نەتوانێت کۆنگرێس رازی بکات بەدارشتنی یاسایەکی گونجاو کارگێرایەتی جێبەجێکردنی ئەمەریکی (وەزارەتەکان) لەمانە پێکدێت کارگێرایەتی کاروباری دەرەوە و دارایی و بەرگری و داد و ناوخۆ و بازرگانی و کار و تەندروستی و (پەروەردە و خۆشگوزەرانی) و (نیشتەجێکردن و پەرەپێدانی شوێنە شارستانییەکان) و گواستنەوە و سکرتێری ئەم کارگێرییانە- وەکو لە ئەمەریکا پێی دەگوترێت- کە وەزیرەکانن کە ئێستا ئەوە پێک دێنن کە بەکابینە ناسراوە، بەڵام ناکرێت بەراورد بکرێت لەگەڵ کابینەی بەریتانی لە بەربوونی جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیان چونکە ئەندامانی کابینەی ئەمەریکی ئەندام نین لە کۆنگرێس و بەرپرسیار نین لە بەرامبەری تەنیا بەرپرسیارن لەبەردەم سەرۆک، جگەلەوەش رۆڵی ئەم کابینەیەش کەم بووەوە بۆ تەنیا بەشێکی بچووک لە کۆی میکانیزمی گفتوگۆکردن و دارشتنی بریارە سیاسییەکانی ئەمەریکا و سەرۆک هەموو هەفتەیەک وەزیرەکان کۆدەکاتەوە بۆ زانینی بیروراکانیان بەڵام مەرج نییە ئەم بیرورایانە وەربگرێت ئەگەر هاتوو هەمووشیان یەک بیرورایان هەبێت کە نەگونجێت لەگەڵ بیرورای ئەو ئەوە خۆی بریاردەدات بەڵام لە هەندێک بریار کە گرنگییەکی زۆری هەیە نایدات بەبێ راوێژکردن لەگەڵ وەزیری تایبەتمەند.

Wallace S.Sayer, Op, Cit Page 33 :بروانە

Frderic J.Haskon, Op. Cit Page 54

Kenneth Prewitt and sidney Verba and Robert H.Salisbury, Op. Cit Page 375-376

J.S. Sutton, Op. Sit Page 33-34

«الدكتور عبدالحميد متولي- القانون الدستوري والنظم السياسية» سەرچاوەی پێشوو ل ٢٦٥

(٧٠) بەپێی حوکمەکانی دەستووری فیدراڵی سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی دەسەڵاتێکی فراوانی هەیە لە دارشتنی سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان و سەرۆکی ئەمەریکی بە نێوانکاری

یەکـەم دادەنرێت، کـە لە ڕێگای ئەوەوە پەیوەندی لەگـەڵ وڵاتە بێگانەکـان پیـادە دەکـرێت و ئەو سیاسەتی دەرەوە بەتەواوی بەڕێوە دەبات و ناکەوێتە ژێر هیچ فشارێک تەنیا فشاری ڕای گشتی و سەرچاوە داراییـیـەکان نەبێت کـە لە لایەن کـۆنگرێسـەوە دەسـتـەبەر دەکرێت و ئەو هەڵدەسـتێت بە پێشـوازیکردن لە باڵیـۆز و نێردراوە دیبلۆمـاسییـەکـانی دەوڵەتانی بێگانە هەروەها هەڵدەسـتێت بە ڕاوێژکردن و ڕەزامەندی ئەنجوومەنی پیـران بەدامەزراندنی باڵیـۆز و نوێنەرانی دیبلۆمـاسی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەروەها هەڵدەستێت بە دانپێدانان بەحکوومەتە بێگانەکـان و هەروەها دەسەڵاتی دەستپێشـخەری هەیە لە بەستنی بەڵێننامەکان لەگەڵ وڵاتانی بێگانە کە دەبێت ڕەزامەندی دوو لە سەر سێی ئەندامـانی ئەنجـوومـەنی پیرانی لەسەر بێت. بەڵام ئەم ڕەزامەندییە بەکۆسپێک دادەنرێت لە ڕێگای بەکـارهێنانی سـەرۆک بۆ ئەم دەسـەڵاتە و سـەرنەکـەوتنی سـەرۆک ودر ولـسن لە سـاڵی ١٩٢١ لە دەسـتـەبەرکـردنی پەسندکـردنی ئەم ئەنجـوومـەنە لەسـەردەمی کـۆمـەڵەی نەتەوەکـان (عـصـبـة الامم) لەگـەڵ هەمـوو ئەو دەرەنجـامـە خـراپانە لە کـاروباری دەرەوە بە نموونەیەکی بەرچاو دادەنرێت لەم بوارە.

لەبەر ئەوە بۆ دوورکـەوتن لەم کـۆسـپـانە سـەرۆک هەڵدەسـتـێت بە گـرێدانی ڕێککەوتننامـەی جێبەجێکاری Excutive agreement کە بە شێوەیەکی بەرفراوان پەنای بۆ برا لە ساڵی (١٩٤٥) وە بۆ بەدەسـتـهێنانی پشـتیـوانی و یارمـەتیدانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ هاوپەیمانەکانی، دەوڵەتە بێگانەکـان بەچاوی بەڵێننامەکـان سەیری ئەم ڕێکەوتننامـانە دەکەن لە ڕووی هێـزی ناچارکردنیـەوە چونکە ئەم دەوڵەتانە بەچاکی کـۆسـپی دەسـتـووری ئەمـەریکیـان دەزانی کـە دێنە بەردەم بەسـتنی بەڵێننامەکان. ئەمەو دەکرێت پەنا ببرێت بۆ بەڵێننامەکان لە بەڵگەنامە گەورە و درێژخایەنەکان بەڵام جگە لەمە دەکرێت خۆی بە دوور بگرێت لە خۆتێوەردانی ئەنجـوومەنی پیران بەشێوەیەکی کاریگەر لە ڕێگای بەستنی بەڵێننامە جێبەجێکارییەکـان. سکرتاریەتی وڵات (وەزارەتی دەرەوە) هەڵدەستێت بە یاریدەدانی سـەرۆک لە پیـادەکـردنی کـاروبـاری دیپلۆمـاسی بەڵام هەمـوو سـەرۆکـەکـان لە چەرخی نوێ جگە لە سـەرۆک ئیزنهـاوەر کە بەشێوەیەکی گەورە پشـتی دەبەست بەوەزیری دەرەوەی خۆی مسـتـەر فـوسـتر دالاس- خۆیان ئەم دەست پێشـخـەرییـەیـان کـرد لەم بوارە بەبڕیـار وەرگرتن لەسـەر ئەوەی کە پێویسـتـە بۆ گـونجـان لەگەڵ ئەو سـیـاسـەتەی کە پەیڕەو دەکرێت و جێی ئاماژە پێکردنە کـە کۆشکی سپی- نەک وەزارەتی دەرەوە پەیـوەندی بەکرملینەوە هەبوو و لە ڕێگەی هێـڵی گەرم Hot line کە بەهۆیەوە دەتوانرا پەیوەندی خێـرا بکرێت لە نێـوان فـەرمـاندەکـان بۆ دوورکـەوتنەوە لە بەکـارهێنانی چەکی ئەتۆمی کە دەبێتە مایەی کاولکارییەکی تەواو. بڕوانە:

Kenneth Prewitt and sidneverba and Robert H. Salisbur, Op Cit Page 368-369

Emest.S.Griffith, Op. Cit Page 76

الدکتور احمد سرحان- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٥.

J.S.Sutton, Op. Cit Page 35

(٧١) ئەمەریكییەكان بەمیرات لە بەریتانییە پێشینەكانیانەوە گومان و دوودڵییەک كە لە بنچینەوە لە گەڵیانە بۆیان ماوەتەوە لەبەرئەوە بڕیاریان دا كە دەستبەسەراگرتنی شارستانی بخەنە سەر هێزە چەكدارەكان كاتێک كە لە دەستوور هاتوو كە دەبێت سەرۆک فەرماندەی گشتی هێزە چەكدارەكان بێت.

بەو پێیەی كە فەرماندەی گشتییە Commander in chief سەرۆک لەگەڵ كۆنگرێس دەسەڵاتە گرنگەكان بەش دەكات لە بواری بەرگری ئەو دەسەڵاتێكی تەواوی هەیە بەسەر هێز و كەشتییەكان و بۆی هەیە كە فەرمانیان پێبدات بۆ دەستێوەردان لە دەوڵەتانی تر بۆ چارەسەركردنی ناكۆكییەكان لە كاتی ئاشتی هەروەها سەرپەرشتی كردارەكان دەكات لەكاتی جەنگ و دەتوانێت حكوومەتی سەربازی دابمەزرێنێت و گەرەنتییە دەستوورییەكان لەلایەک دابنێت و هێزە چەكدارەكان بەكاربێنێت بۆ جێبەجێكردنی یاساكان بەزۆر و كوژاندنەوە و سەركوتكردنی خۆپیشاندانەكان و كرداری توندوتیژی ناوخۆ و ئەو دەسەڵاتی هەیە لە دامەزراندن و مەشقپێدانی ئەم هێزانەو دەسەڵاتی دەركردنی هەر تاكێكی هەیە لە بچووكترین سەرباز تا دەگاتە ژەنەراڵ كە پێنج ئەستێرەی هەیە.

لەگەڵ ئەوەی كە دەستوور دەسەڵاتی جاڕدانی جەنگی داوەتە كۆنگرێس بەڵام سەرۆک بەپێی ئەو دەسەڵاتەی لە بڵاوكردنەوەی سەربازەكان و ئاراستەكردنیان بۆ خزمەتی ویلایەتە یەكگرتووەكان بۆ هەر لایەک كە ببینێت ئەگەری دەستپێكردنی شەڕی هەیە بەبێ چاوەڕوانیكردنی جاڕدانی لە لایەن كۆنگرێسەوە بەم شێوەیە سەرۆک Ibraham lincolin پۆستی خۆی بەكارهێنا وەک فەرماندەیەكی گشتی بۆ پاساو هێنانەوە بۆ جەنگی دژ بە ویلایەتە جوداخوازەكانی باشوور لە ساڵی ١٨٦١ و شەڕی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا كە هەمیشە شەڕێكی سەرۆكایەتی بوو بەو واتایە كە كۆنگرێس جاڕی جەنگی نەدابوو دژ بە ڤێتنامی رۆژهەڵات یان «الفیتكونک» لەگەڵ ئەوە كۆنگرێس بەردەوام بوو لەگەڵ بوونی بەرهەڵستی هەندێ كات لە پشتیوانی سەرۆک بە شتومەكی پێویست بۆ بەردەوامی كردارەكان و فەرمانی دا بەهێزەكانی ئەمەریكا بەجەنگكردن لە كۆریا بەبێ جاڕدانی جەنگ لە لایەن كۆنگرێسەوە وەک كردارێكی پۆلیسی بۆ جێبەجێكردنی ئەركەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكان بەپێی بەڵگەنامەی نەتەوە یەكگرتووەكان. گرنگترین ئاكامەكانی فەرماندەی گشتی كۆنترۆڵكردنی چەكی ئەتۆمییە كە سەرۆک ترومان خۆی رێگەی دا بەخستنە خوارەوەی بۆمبی ئەتۆمی لەسەر هیرۆشیما و ناكازاكی ساڵی ١٩٤٥ ئەمەو سیستەمی بەرگری هاوچەرخ وا دەخوازێت كە بەبێ رەزامەندی سەرۆک چەكی ئەتۆمی بەكارنەهێنرێت.

بڕوانە:

J. S. Sutton, Op Cit Page 36 -38

Kenneth Prewitt and Sidney Verbaand Robert Salisbur. Op. Cit Page 370 -371

Articl 2 Secton 2 from the American Constrtution. Emest s Griffith, Op. Cit Page 78

الدكتور احمد سرحان- سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٦

(٧٢) نامەی ساڵانەی سەرۆک ئەمانە دەگریتە خۆی بریتین لە باری یەکیەتی و مافی سەرۆک لە بەکارهێنانی مافی رەتکردنەوەی ڤیتۆ دژی ئەو یاسایانەی ک رازی نییە لەسەریان و لەکاتی بەکارهێنانی ڤیتۆ لە لایەن سەرۆکەوە دەبێت ئەو یاسایە بگەرێندرێتەوە بۆ کۆنگرێس کە ناکرێت دابرێژرێت تاوەکو رەزامەندی دوو لەسەر سێی ئەندامانی هەریەک لە ئەنجوومەنی پیران و ئەنجوومەنی نوێنەرانی لەسەر نەدرێت.

(٧٣) سەیری درێژەی ئەوە بکە Jak w.pe ltason, Federal Cours in the Political Process, RanDom Huse, New York, thirteen Printing 1966 Page 13-19 Rocco J.Tresolion, Op. Cit Page 27-350

الدکتور عبدالعزیز محمد سالمان- الرقابة علی دستوریة القوانین- خانەی بیری عەرەبی- قاهیرە چاپی یەکەم ١٩٩٥ ل ١٦٠-١٦٧.

بەڵام جون روج John P. roche دەڵێت کە جۆرێکی تر لە دادگای فیدراڵی هەیە ئەویش دادگای یاسادانانە Ligis lative Courts مەبەستی لەو دادگایانەیە کە لە لایەن کۆنگرسەوە دانرابوون بەپێی ئەو دەسەڵاتانەی کە لە دەستوور هاتبوون لە ماددەی یەکەم نەک ماددەی سێیەم لە دەستوور کە تایبەتە بەدەسەڵاتی دادوەری و کاری ئەم دادگایانە تەماشاکردنی هەندێک کێشەی کارگێرییە کە خۆی لە دادگای ماف و Courtof Clam دادگای گومرک Customs Court. دەنوێنێت.

John P. Roche .Courts and rights, the american Judiciary house, New York, Second Edition 1996 Page 49 -48

(74)Jack W. Peltason, Op Cit Page 17.

(75)Robert B.Mcka, an American Constitutionallaw Reader.

Docket Series Volume 12. Oceana Publications New York City 1958 Page 35.

(٧٦) «اندریە هوریو »سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣٤.

(77)Robert B.mckay, Op. Cit Page 35.

(78)Op. Cit Page 34 -35

(79)Rocco J.treso lini, Op. Cit Page 26-27.

(80)Robert B.mcka, Op. Cit Page 30.

(81)Quoted From Op. Cit Page 30.

(82)Rocco J.tersolini, Op, Cit Page 26.

(83)Op. Cit Page 26.

(٨٤) «الدکتور ادموند رباط- الوسیط في القانون الدستوري العام الجزء الاول- الدولة في الماضي والحاضر»- خانەی زانستی بۆ ملیۆنەها - بیروت ١٩٦٤-ل ٦٠٨- ٦٠٩

(85)Jack w> Peltason, Op Cit Page 18.

(86)J.S Sutton , Op. Cit Page 101.

(87)Article 3 Section 2 of the American Contitution.

(88)J.S Sutton, Op Cit Page 108.

(89)James Bryce, Op Cit Page 263.

«الدكتور عبدالعزيز سالمان» سەرچاوەی پێشوو ل ١٧٢

(90)K.C Wheare, Op. Cit Page 62.

«الدكتور احمد كمال ابوالمجد- الرقابة علي دستورية القوانين في الولايات المتحدة الامريكية واقليم مصر»- كتێبخانەی هەستانەوەی عەرەبی قاهیره ١٩٦٠ ل ٣١

(91)William g. Andrews, American national Political institutions Dvan Nostrand Company 1in. princetion, nwe jersey, New York 1962 Page 164.

(٩٢) «اندريه هوريو» سەرچاوەی پێشوو ل ٩٢٥

(93)J. S Sutton, Op. Cit Page 108-109.

(٩٤) «الدكتور ادموند رباط»- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٠٩

(٩٥) سەرچاوەی پێشوو ل ٦١٢- ٦١٣

(96)J. S Sutton, Op. Cit Page 109.

(97)Op. Cit Page 110.

(٩٨) «اندريه هوريو»- ئاماژەی پێکردووە- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢٧

(99)Quoted From J. S Sutton, Op. Cit Page 110.

(١٠٠) الدكتور ادموند رباط - سەرچاوەی پێشوو ل ٦١٦-٦١٨

«اندريه هوريو»- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢٧

«الدكتور عبدالعزيز محمد سالمان»- سەرچاوەی پێشوو ل ١٨٥

Jock W. Peltason, Op. Cit Page 3

John P. Roche, Op. Cit Page 26

بەڵام هەندێک هەن کە نکۆڵی لە پیادەکردنی رۆڵی سیاسی دادگای باڵا دەکەن و دەڵێن ئەو قسانە تەنها تاوان خستنە پاڵی دادگای باڵایە.

بڕوانە:

Alan f. westion, Op. Cit Page 153

(١٠١) اندريه هوريو ئاماژەی پێکردووە، سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢٧.

(١٠٢) سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢٧.

(١٠٣) بۆ یەکەم جار ئەم زاراوەیە لە لایەن زانای فەرەنسی ئەدوار لامیرییە بەکارهێنراوە. «ادموند رباط» ئاماژەی پێکردووە، سەرچاوەی پێشوو ل ٦١٧.

(١٠٤) «اندريه هوريو»- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢٩.

(١٠٥) سەیری درێژەی ئەوە بکە J.S.sutton, Op. Cit Page 110

(١٠٦) «اندریه هوریو»- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٢٩.

(١٠٧) روبرت دیکلبریکو والان هاموک - اراء في الحكومة والسياسة الامريكية- وەرگێرانی «تماضر توفيق»- خانەی زانین لە قاهیرە ل ٤٠٦-٤١٠.

(١٠٨) سەرچاوەی پێشووەوە ل٤١٠- ٤١٧.

(١٠٩) سەیری درێژەی ئەوە بکە لە J. S. Sutton, Op. Cit Page 111-112

ئاخافتنی دووەم

## ئەزموونی سویسری

لەبەر ئەوەی سویسرا لە کۆمەڵگا فرەییەکان دادەنرێت کە سیستەمی فیدراڵیان پێرەو کردووە بەڵکو ئەو سیستەمە گەورەترین سەرکەوتنی خۆی لەویؒ تۆمار کردووە چونکە ئێمە لە بواری گونجاو بوونی فیدراڵیەت لەگەڵ کۆمەڵگا فرەییەکانین بۆیە دراسەتکردنی ئەزموونی بێ وێنەی سویسرا خۆی لەم میانەدا خۆی دەسەپێنێت لەبەر ئەوە باسی ئەو ئەزموونە ئەکەین لە رێگەی پێشاندانی گرنگترین خەسڵەتەکانی سیستەمی فیدراڵی سویسرا کە لەو وڵاتە دامەزرا لە رێگای دەستووری ساڵی ١٨٤٨ و لە دواییدا دەستووری ساڵی ١٨٧٤. پەیتا پەیتا باس لە هۆیەکانی هەڵبژاردنی سیستەمی فیدراڵی لە سویسرا و خەسڵەتەکانی حکومەتی کۆمەڵە لەو وڵاتەدا دەکەین. دوای ئەوە دەچینە سەر چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان یەکیەتی و کانتۆنەکان. ئەوجا باس لە دەزگاکانی یەکیەتی دەکەین کە کۆمەڵەی فیدراڵیەیە (الجمعیة الفدرالیة) وگرنگیەتی لە نێوان تیوری و پراکتیکدا و هەروەها ئەنجوومەنی فیدراڵی (المجلس الفدرالي) و مەودای زیاد بوونی گرنگییەتی لە بواری پراکتیکدا و باسیش لە دادگای فیدراڵی و سنووری تایبەتمەندییەکانی دەکەین و لە دواییشدا دەچینە برگەی دوایین ئەویش دەسەڵاتەکان و تایبەتمەندیەکانی کانتۆنەکان.

### یەکەم: هۆیەکانی هەڵبژاردنی سیستەمی فیدراڵی لە سویسرا

سویسرا بەیەکێک لەو دەوڵەتانە دادەنرێت کە بەشانازییەوە ئاماژەی بۆ دەکرێت سەبارەت بەسەرکەوتنی سیستەمی فیدراڵی چونکە بەباشترین زەویی فیدراڵیەت (الارض المفضلة للفدرالیة) دادەنرێت[١]. سیستەمەکەشی بەکۆنترین و گونجاوترین سیستەم بۆ فیدراڵیەت دادەنرێت لەنێوان سیستەمەکانی تر[٢] و دەتوانین بڵێین کە هەڵبژاردنی سیستەمی فیدراڵی لە لایەن سویسرا بەشێوەیەکی هەرەمەکی نەبوو بەڵکو لەبەر هەندێک هۆ و تایبەتمەندی بوو کە پەیوەندی بەو میللەتە هەیە. بۆیە لە سویسرا سیستەمێکی فیدراڵی رەسەن هاتە کایەوە کە لە حەز و ویست و تایبەتمەندییەکان و پێویستییەکانی ئەو میللەتە هەڵقولا بوو.

شتێکی ئاشکرایە کە سویسرا بەخاڵی پێک گەیشتنی ژمارەیێک ڕەگەزو زمان و ئایین دادەنرێت[٣] چونکە میللەتەکەی لە ڕەگەزەکانی ئەڵمانی و فەرەنسی و ئیتاڵی پێک دێت و هەروەها قسە بەزمانەکانی ئەڵمانی و فەرەنسی و ئیتاڵی و ڕۆمانشی دەکرێت ئەبێت بشزانین کە دەستووری فیدراڵی دانی بەهەموو زمانەکانی باس لێوەکراو هێناوە وەکو زمانی نیشتمانی بەڵام سێ زمانی یەکەم بەپێی ئەو دەستوورە بەزمانی ڕەسمی لە وڵات دادەنرێن، ئەمەش بوار بۆ هاوڵاتیان دەڕەخسێنێت کە هەر کامێکیان ویست بەکاری بێنن بۆ نووسینی داواکاری و تکاکارییەکان بۆ دەزگا ڕەسمییە جیاجیاکان، ئەوەش ماف دەداتە ئەندامانی کۆمەڵەی فیدراڵی هەر کامێک لەم زمانانە بەکار بێنن لەگەڵ هاوتاکانی خۆیان و هەروەها هاووڵاتییان سەرپشکن لە بەکار هێنانی هەر کامێکیان لەو دادبینییانەی کە لە پێش دادگاکان بەڕێوە دەچن و هەر سێ زمانیش ئەبێت نوێنەرایەتی بکرێت لە دادگای فیدراڵی[٤]. ئەمە و زمانی ڕۆمانشی پێگەیەکی تایبەتی پێی درا بەبێ ئەوەی دەق لەسەر ئەوە بکرێت کە ئەبێت بەشێوەیەکی ڕەسمی بەکار بهێندرێت. و ئەوەی کە سەرنجی سەردانکەرانی سویسرا ڕادەکێشێت زیاتر لە جوانییە سروشتییەکەی کە دەورەی لە هەموو جێگاییێکی ئەو وڵاتە داوە ئەو جیاوازییە یاخود ئەو چەندایەتییە زمانەوانییە کە هەندێک کات سەریان لێ دەشێوێنێت[٥] و ئەڵمانی لە هەموو زمانەکانی تر بڵاوترە لە سویسرا. بەپێی ئاماری ساڵی ١٩٥٠ بەدیار کەوت کە ڕێژەی ٧٤,١ ٠/٠ ی دانیشتوان و لە نێوانیشیاندا دانیشتووە بێگانەکان بەزمانی ئەڵمانی قسەیان دەکرد لە کاتێکدا کە ڕێژەی ٢٠,٦ ٠/٠ بەزمانی فەرەنسی قسەیان دەکرد و ڕێژەی ٤ ٠/٠ بەزمانی ئیتاڵی قسەیان دەکرد بەرامبەر ١,١ ٠/٠ کە زمانی ڕۆمانشییان بەکار دەهێنا و ڕێژەی ئەو کەسانەی کە بەزمانەکانی تر قسەیان دەکرد ٠,٢ ٠/٠ ی هەموو دانیشتوان بوو[٦].

لە پاڵ ئەو دابەشکردنە زمانەوانییە کە باسمان لێوە کرد دابەشکردنێکی ئایینی ئاڵۆزتر لە کۆمەڵگای سویسری هەیە و لە ئاماری ساڵی ١٩٥٠ بەدەردەکەوێت ڕێژەی ئەو هاوڵاتییانەی کە مەزهەبی پرۆتستانتی پێڕەو دەکەن ٥٨,٥ ٠/٠ لە کۆی دانیشتوانی وڵاتە لە کاتێکدا ڕێژەی ٤٠,٣ ٠/٠ لە کۆی دانیشتوانی مەزهەبی کاسولیکی پێڕەو دەکەن، ئەمەو ڕێژەی ١,٢٪ کۆی دانیشتوان کە دەمێنێتەوە یا ئایینی دیکە پێڕەو دەکەن یاخود هیچ ئاینێکیان نییە[٧].

لە کاتێکدا کە هۆکارە جوغرافییەکان ڕۆڵی گرنگتریان هەبوو لە پاڵپێوەنانی گەلانی ئەو وڵاتە کە لەتەک یەکتری بژین لە دۆڵەکانی ئەلپ کە بەنیشتمانی خۆیان دادەنێن، و

ئەو سنووره جوغرافییانه نەدەگونجان لەگەڵ اعتباراتی ڕەگەزی و زمانەوانی و ئایینی لەو وڵاتەدا[٨]، لەبەر ئەوەی لەناو ئەو ناوچە جوغرافییە بەرێژە بچووکە دابەشکردن و هەمەڕەنگێکی زۆر و جیاجیای تێدایە لە ڕووی ڕەگەزی و زمانەوانی و ئایینی و ئەو بەسەرهاتە دڵخۆشکەرە وەکو هەندێک ناوی لێ دەنێن[٩] ڕۆڵی خۆی هەبوو لە پێڕەو کردن و دامەزراندنی سیستەمی فیدراڵی لە سویسرا لە جیاتی دامەزراندنی چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ و لاواز. بەڵام نابێت ڕۆڵی هۆکارەکانی دیکە کە گرنگییێکی کەمتریان هەیە فەرامۆش بکەین کە بریتین لە هۆکاری مەترسی سەربازی (الهاجس العسكری) یاخود بەواتاییێکی دیکە مەترسی لە زلهێزەکانی دەوروپشت ئەوانیش نەمسا و ئیمپراتۆریەتی جەرمانی. بەم جۆرەش پێویستی پەیا کردنی هێزی سەربازی و دیبلۆماسی باش پاڵی بەکانتۆنە جیاجیاکان نا بۆ دامەزراندنی یەکیەتی فیدراڵی[١٠] بۆ ئەوەی نەبنە پاروییێکی ئاسان بۆ جیرانە بەهێز و تەماعکارەکان.

لەپاڵ ئەوەی سەرەوەش هۆکارە ئابووری و ڕۆشنبیری و شارستانی و دەروونییەکان ڕۆڵێکی وایان بینی کە کەم نەبوو لە پەیا بوونی ئەو سیستەمەو جێگیربوونی.

***

## دووەم سیستەمی حکوومەتی کۆمەڵە لە سویسرا

سیستەمی حکوومەتی کۆمەڵە بەسیستەمێکی جیاکراوە (متميز) بۆ حوکمکردن دادەنرێت ڕووی ئەم سیستەمە لەگەڵ سیستەمەکانی سەرۆکایەتی و پەرلەمانی جیاوازە کە ئێستا پێڕەو دەکرێن لە وڵاتە دیموکراتییەکان، وە کرۆکی جیاوازییەکە ئەوەیە کە ئەو سیستەمە لەسەر بیرۆکەیەک دامەزراوە. کە دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن یەکسان نین چ لە تێڕوانینی دەستوورەوە و چ لە ڕووی واقعدا، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمە: پەرلەمان یان کۆمەڵەی فیدراڵی (دەسەڵاتی یاسادانان) کە هەڵقوڵاوی ئەوەیە کە دەستەیەکی هەڵبژێردراوە لە لایەن گەلەوە بۆیە دەبێ ڕای کۆتایی و یەکلاکەرەوە (الحاسم) لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات هەر بۆ ئەوبێ.

دکتور (محمد كامل ليلە) لەم ڕووەوە باس دەکات کە ئەم جۆرە حکوومەتانە لەسەر بیرۆکەیەک دامەزراون کە پەرلەمان و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن نابێ یەکسان بن، چ لە ڕووی یاساوە چ لە ڕووی (واقع)ەوە، پەرلەمان پێویستە لەڕیزی پێشەوە بێت لە دەوڵەت و

بەهەموو دەسەڵاتێک هەڵبستی و کەس نابێ قسە لە قسەی بکات لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، چونکە نوێنەری گەلە و سەروەری گەلیش دابەشبوون قبووڵ ناکات، بۆیە ناتوانرێ ئەم سەروەرییە جێبەجێ بکرێ بەهەموو ڕواڵەتەکانی و هەموو توخمەکانی (عناصر) تەنها لە لایەن ئەو پەرلەمانە نەبێت کە نوێنەری ڕاستەقینەی میللەتە و تەعبیر لە ئیرادە و ویستی دەکات و جێبەجێکەری ویستی گەلە و هۆی جێبەجێ کردنی بەرژەوەندییەکانیەتی[١١]. بەڵام دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن لەم سیستەمەدا لەوە تێناپەڕێ کە دەستەیەکە دەستنیشان دەکرێن و کارە تایبەتییەکانی دیاری دەکرێت لەگەڵ دەست ڕۆیشتنەکانی (صلاحیات) دیاری دەکرێت لە لایەن پەرلەمان واتە کۆمەڵەی فیدراڵی (الجمعیة النیابیة) بەم جۆرەش دەسەڵاتی یاسادانان کۆنترۆڵێکی تەواوی دەسەڵاتی دەستەی ڕاپەڕاندن دەکات کە ئەمە وای کردووە هەندێ وا دەبینن کەوا دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن تەنها لیژنەیەکە پەرلەمان دایدەمەزرێنێ بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەت وگوێڕایەڵی فەرمان و ڕێنمایی (التعلیمات) یەکانی پەرلەمان[١٢].

جا هەر چەندە دەستووری ئەم وڵاتانە کە ئەم سیستەمە پیادە دەکەن جیاواز بن لە هەندێک کاروبارو ڕوو وهەڵوێستدا ئەوا لە کرۆک (الجوهر)دا هیچ جیاوازییەکیان نییە کە بریتییە لە دەست بەسەراگرتنی دەسەڵات لە لایەن پەرلەمانەوە.

وە دەتوانین گرنگترین ڕووەکانی حکوومەتی کۆمەڵە لەم خاڵانەدا دیاری بکەین:

١- دەست بەسەراگرتنی دەسەڵاتی یاسادانان (پەرلەمان، کۆمەڵەی جێگرەکان - الجمعیة النیابیة) بەسەر کاروباری حوکم کردندا[١٣].

٢- پەرلەمان، دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن دەداتە کۆمەڵە کەسێک کە لە ژێر چاودێری و ڕێنماییەکانی ئەو مومارەسەی حوکم دەکەن وە لە نێوان خۆیاندا یەکێک هەڵدەبژێرن کە ببێتە سەرۆک (بۆ دەستەی ڕاپەڕاندن)[١٤].

٣- دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن تابعی پەرلەمان (الجمعیة النیابیة)ەوە ئەمەش[١٥] ئەم خاڵانەی لێ دەبێتەوە:

أ - ئەندامانی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بەرپرسیارن لە ڕووی سیاسییەوە لە لایەن پەرلەمان، چونکە پەرلەمان دەتوانێ لەسەر کار لایان ببات ئەگەر اسبات بوو کە دەسەڵاتی خۆیان بەشێوەیەکی خراپ بەکار هێناوە، بەڵام (کۆمەڵەی فیدراڵی) ناتوانێ - سحب الثقة - دان پیانانی خۆی بەئەنجوومەنی فیدراڵی (دەسەڵاتی ڕاپەراندن) بکێشێتەوە تا

وای لێ بکات کەوا دەست لە کار بکێشێتەوە ئەمەش، هەڵقولاوی ئەوەیە کە سویسرا سیستەمی کابینەی پەرلەمانی پیادە ناکات[١٦].

ب – دەسەلاتی ڕاپەڕاندن هیچ ڕێگە پاڵەپەستۆیەکی نییە لەسەر دەسەلاتی یاسادانان وەکو نارەزایی دەربڕین بەرامبەر یاساکانی پەرلەمان یاخود هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان هەر وەکو لە سیستەمی سەرۆکایەتی و پەرلەمان کاری پێدەکرێت.

بەم جۆرەش ڕاشکاوانە زاڵبوونی پەرلەمان نەک لایەنێکی دیکە لەسەر دەسەلات بەدەردەکەوێت و ئەو پرنسیپە لەسەر سویسرا پیادە دەبێت کە سیستەمی حکومەتی کۆمەڵە پێڕەو دەکات و لەو وڵاتە کۆمەڵەی فیدراڵی زاڵە لەسەر دەسەلات بۆیە دەبینین کە دەقی مادده ٧١ی دەستووری فیدراڵی لەسەر ئەوە هاتووە بەبێ زەرەر گەیاندن بەمافەکانی کەسەکان یاخود کانتۆنەکان مادده (٨٩، ١٢١) بەرزترین دەسەلات لە لایەن کۆمەڵەی فیدراڵی مومارەسە دەکرێت کە لە دوو بەش پێک دێت ئەوانیش ئەنجوومەنی نیشتمانی counsil national و ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان states counsil of.

### سێیەم: دابەشکردنی دەسەلاتەکان لە نێوان حکوومەتی یەکیەتی و کانتۆنەکان:

ئەوەی شایانی باسە دەستوری فیدراڵی سویسرای ساڵی ١٨٤٨ز دەقەکانی لە دەستووری ئەمریکی وەرگرتووە بۆیە دەقەکانی سەبارەت بەدەسەلاتەکانی یەکیەتی بەشێوەیەکی دەست نیشان کراو و سنوردار هاتوون لە کاتێکدا کە دەسەلاتە بەجێماوەکان Residual Power دراوەتە دەوڵەتە ئەندامەکان (کانتۆنەکان). هەروەها ئەو دەستوورە ئاوەڵناوی دەوڵەتی هێشتەوە بۆ کانتۆنەکان کە بەردەوامبوون لەسەر مومارەسە کردنی دەسەلاتێکی فراوان و سەربەخۆیەکی زۆریان هەبوو لە بوارەکانی تایبەتمەندییەکانی یاسا دانان و ڕاپەڕاندن و دادوەری. وە دەسەلاتەکانی حکوومەتی یەکیەتی بەشێوەیەکی تەسک سنووردار بەو بڕگانەی کە لە دەقەکانی دەستوور هاتوون و بریتین لە جاڕدانی جەنگ و گرێدانی ئاشتی و نوێنەرایەتی دەرەوە و گرێدانی پەیماننامەکان و هەروەها لە کاروباری ئابووری کە پێویستی بەڕێکخستنێکی یەکبوو هەیە وەک کاروباری دراوو گومرگ و پۆستە و سەنگەکان (الاوزان) و پێوەرەکان (المقاييس) و چاودێری گشتی لەسەر ڕێگاو بان و پردەکان.

بەلام ئەو ڕووداوانەی کە دوای ئەوە بەسەر ئەوروپا هاتن کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی یەکەی سیاسی گەورە وەکو ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی و پاشایەتی ئیتاڵی و ئیمپراتۆریەتی

ئەمسا و مەجەر پاڵیان بەسویسرا نا کە فکر لە ئاستێکی زیاتر لە یەکبوون و ناوەندییەتی بکات هەتا گەیشتە ئەوەی کە دەستوری ساڵی ١٨٧٤ز دەرکا کە هەر چەندە لەسەر ڕێڕەوی دەستوری پێشوو ڕێچکەی فیدراڵی پەیڕەو کرد بەڵام زۆر دەقی تێدا هات کە لە بەرژەوەندی یەکیەتی بوو لەسەر حسێبی سەربەخۆی و دەسەڵاتی دەوڵەتە ئەندامەکان (کانتۆنەکان) وەک پووچەڵ کردنەوەی ئەو کۆسپانەی کە ڕێگر بوون لە پێش هاتوچۆ کردنی کەسەکان لە نێوان کانتۆنەکاندا و هەروەها بوار ڕەخساندن بۆ دەسەڵاتی یاسا دانان (کۆمەڵەی فیدراڵی) بۆ یەکخستنی ژمارەیەک لە یاسا گرنگەکان بەتایبەتی لە بواری ئابووری و کار، وە هەروەها ڕێگای بەدەزگاکانی یەکیەتی دا بۆ ئەگەری دەست تێوەردان (التدخل) بۆ پاراستنی بەرهەمی نیشتمانی و ئاڵوگۆڕی بازرگانی لە ناوەوە و دەرەوە و پارێزگاریکردن لە کانزا سروشتییەکان[١٧].

وە پێشەکی باس لە گرنگترین دەسەڵاتەکانی یەکیەتی دەکەین دوا بەدوای ئەوەشدا باس لە دەسەڵاتەکانی کانتۆنەکان دەکەین:

١- تایبەتمەندییەکانی یەکیەتی:

دەتوانین بڵێین کە گرنگترین دەسەڵاتەکانی یەکیەتی بریتین لەو بوارانەی خوارەوە:

أ- تایبەتمەندییەکانی دەرەوە:

و ئەوانە بریتین لە:

- دەسەلاتی جاڕدانی جەنگ و گرێدانی ئاشتی

هیچ بەپێچەوانە نییە ئەگەر بڵێین کە ئەو دەسەڵاتە بەگرنگترین تایبەتمەندییەکانی یەکیەتی دادەندرێت ئەمەش لەگەڵ سەروەری دەوڵەتی یەکیەتی لە ئاستی دەرەوە دەگونجێت کە پێویستە لەسەر بنەمایەک دەوڵەت مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتەکانی دیکە بکات لەسەر ئاستی باس لێکراو. وە لەو چوارچێوەیەدا دەبینین دەستوری فیدراڵی سویسرا بەتاکە دەسەڵات داناوە بۆ جاڕدانی جەنگ و بەستنی ئاشتی[١٨].

- نوێنەرایەتی دەرەوە:

ئەوەش پێشوازی لە باڵوێز و نێردراوە باوەڕ پێکراوەکانی (المبعوثين المعتمدين) دەوڵەتە بیانییەکان دەگرێتەوە وە هەروەها ناردنی باڵوێز و نێردراوە باوەڕ پێکراوەکانی سویسرا بۆ ئەو دەوڵەتانە و ئامادە بوون لە کۆبوونەوەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە

یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان و نوێنەرایەتی سویسرا لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکان. وە ئەو ئەرکانە لە نێوان تایبەتمەندییەکانی دەزگاکانی یەکیەتین. هەندێک[١٩] دەڵێن خۆشبەختانە سویسرا سیاسەتێکی دەرەوەی ئاسانی هەیە بۆ پارێزگاریکردن لەسەر خاک و بەرژەوەندییەکانی، ئەمەش بەبۆتەی هەڵوێستی بێ لایەنی (Neturality) لە پێوەندی و ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان هاتووە.

- دەسەڵاتی گرێدانی پەیماننامەکان:

دەستوری فیدراڵی بەتەنها دەسەڵاتی گرێدانی هاوپەیمانیەتی و پەیماننامەکان لەگەڵ دەوڵەتە بیانییەکانی بەدەزگاکانی یەکیەتی داوەو بەتایبەتی لەو پەیماننامانەی کە پێوەندن بەرەسمەکانی گومرگ و بازرگانی. بەڵام ئەو پەیماننامانەی کە لە لایەن یەکیەتی گرێ دەدرێن و سویسرا پابەند دەکەن بەهەندێ ئەرک بۆ ماوەیەکی نادیار یاخود زیاتر لە پانزە ساڵ دەبێت بدرێنە ڕیفراندۆم Refenendum لەسەر داواکاری (٣٠٠٠٠) دانیشتووی دەنگدەر یاخود (٨) کانتۆن[٢٠].

ب- تایبەتمەندییە ناوەکییەکان:

دەتوانین گرنگترین تایبەتمەندیە ناوەکییەکان لەوانەی خوارەوە دەستنیشان بکەین:

- کاروباری دراو:

لەبەر ئەوەی مەسەلەکانی لێدان و دەرکردنی دراو بەهەردوو جۆرەکەی یاخود کاغەز و هەروەها دەستنیشان کردنی بەهاکانیان لەو مەسەلانەن کە پەیوەندن بەسەروەری دەوڵەت سەرباری پەیوەندبونیان بەبەرژەوەندی هاوبەشی یەکیەتی بۆیە دەستور خستیە ئەستۆی یەکیەتی.

- کاروباری بەرگری نیشتمانی و هێزە چەکدارەکان:

شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە سویسرا یەکێکە لەو دەوڵەتانەی کە بێ لایەنی خۆی لە ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان ڕاگەیاندووە و ئەو بێ لایەنییەشی هەتا ساتی ئێستا پاراستووە. بەڵام هێزی چەکداری خۆی هەیە بۆ کاتی تەنگانە و جەنگە جیهانییەکان کە لە کاتێک بۆ کاتێکی تر ڕوو دەدەن بۆیە دەستور مەسەلەکانی کاروباری بەرگری نیشتمانی و هێزە چەکدارەکانی خستۆتە ئەستۆی یەکیەتی.

- پارێزگاریکردن لە ئاسایشی ناوەخۆ:

ئەوەی شایانی باسە کە لە کاتێکدا مەسەلەی پارێزگاریکردن لە ئاسایشی ناوەخۆ دەگەڕێتەوە بۆ خودی هەر کانتۆنێک بەڵام یەکیەتیش مافی ئەوەی هەیە کە بەهێزە چەکدارەکانی بچێتە هەر کانتۆنێک لەسەر داواکاری ئەو کانتۆنە بۆ پاراستنی لە هەر دەستدرێژییەک چ دەرەکی بێ یاخود ناوەکی[٢١]. هەروەها بۆ یەکیەتی هەیە کە بەهێزە چەکدارەکانی بچێتە هەر کانتۆنێک ئەگەر هاتوو ئەو کانتۆنە لە هەل و مەرجێکدا بوو کە نەتوانێت داوای یارمەتی فیدراڵی بکات[٢٢]. بەڵام کانتۆنەکان قەدەغە کراون کە پەنا بۆ بەکارهێنانی هێز ببەن وەکو ئامرازێک بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکییەکانی نێوانیان[٢٣].

- باجە دراوییەکان و بەرژەوەندییە ئابوورییەکان:

دەزگاکانی یەکیەتی تایبەتمەندن لە دەست بەسەرا گرتنی باجە دراوییەکان و بەرژەوەندییە ئابوورییەکان لە لایەنی دروست کردنیان و وەرگرتنیان و بەکارهێنانیان ئەوانیش بریتین لە گومرگ و کحول و پۆستە و بەرق و تەلەفۆن و ئەو دەسەڵاتانە بەدەستوری ساڵی ١٨٤٨ و لە دوای ئەوە بەدەستوریَ ساڵی ١٨٧٤ وە هەروەها بەپێی هەموارکردنەکانی دەستوری دوایی دراونەتە یەکیەتی[٢٤].

### ٢- دەسەڵاتی کانتۆنەکان و تایبەتمەندییەکانیان:

هەندێک[٢٥] بۆ ئەوە دەچن کە لەگەڵ ئەوەی دەردەکەوێت سەروەری کانتۆنەکان چوارچێوەکراوە لەسەر سنوورێکی تەسکتر بەبەراورد لەگەڵ هاوتاکانی ئەمریکایان، وە لەگەڵ ئەوەی سەربەخۆیی ئەو کانتۆنانە هەتا لەو بوارانەی کە بۆیان تەرخان کراوە وا دەردەکەوێت کە لە ڕاستی کەمترە و گەرەنتی نییە بۆ شێوەیەک کە جێی ڕەزامەندی بێت لەبەر ئەوەی ئەو کانتۆنانە کراونەتەوە بۆ دەست تێوەردانی ڕاستەوخۆ لە لایەن دەزگا فیدراڵییەکان لە زۆر بواردا کە هەتا ئێستا داخراون لەبەردەم دەست تێوەردانی فیدراڵی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بەڵام لەگەڵ ئەوەش نابێت بگەینە ئەو ئەنجامە کە کانتۆنەکان تەنها یەکەی کارگێڕی خۆجەیین، بەڵکو بەپێچەوانە ئەو کانتۆنانە خاوەنی ژیانێکی سیاسی سەربەخۆن و بوارێکی فراوانیان هەیە لە ئازادی ناوەکی هەروەها بەردەوام بوون لە ڕاکێشانی پێوەندی هاوڵاتییەتی کۆن و بەهێزی هاوڵاتیان بۆ لای خۆیان. بۆ بەرجەستە کردنی پێگەی سیاسی کانتۆنە یەکگرتووەکان دەستوری سویسری و

لە دەقی ماددەی یەکەمی ئاشکرای کرد کە یەکیەتی لە (٢٢) بیست و دوو کانتۆنی خاوەن سەروەری هەروەها بەشێوەیەکی لاسایی کردنەوە هەموارکردنی دەیەم لە دەستوری ئەمریکی لە دەستوری سویسری هاتووە کە کانتۆنەکان خاوەن سەروەرین هەتا ئەو تخوبەی کە ئەو سەروەرییە سنووردار نەکراوە لە لایەن دەستوری فیدراڵی هەروەها بۆیان هەیە هەموو ئەو دەسەلاتانە بەکاربهێنن کە نەدراونەتە دەزگا فیدراڵیەکان[٢٦]. دەستوری فیدراڵی وەعدەی زامن کردنی سنوور و سەروەری - لە چوارچێوەی ماددەی سێی ئەو دەستورە- وە هەروەها دەستورو ماف و ئازادی دانیشتوانی کانتۆنەکانی داوە لەگەڵ زامن کردنی مافە دەستورییەکانی هاولاتییان و ئەو ماف و دەسەلاتانەی کە کەسەکان داویانەتە دەزگا حوکمڕانەکان[٢٧].

هەروەها هەر یەکێک لە دەوڵەتە ئەندامەکانی لە یەکیەتی سویسرا دەستوری تایبەتی خۆی هەیە کە بەخۆی دایدەڕێژێت و بۆی هەیە کە هەرچی دەیەوێت لە بنەما و دەق بیخاتە ناوی بەمەرجێک کە ڕەچاوی ئەو سێ خاڵە بکات کە لە دەستوری فیدراڵی هاتوون کە بریتین لە[٢٨]:

١- هیچ دەقێکی تێدا نەبێت کە پێچەوانەی دەستوری فیدراڵی بێت.

٢- دەبێت زامنی بەکارهێنانی مافە سیاسییەکان بێت بەپێی سیستەمی حوکمی کۆماری و دیموکراسی.

٣- دەبێت ڕەزامەندی لەسەر کرا بێت لە لایەن زۆرینەی ڕەهای هاولاتییانی کانتۆن، هەروەها دەبێت ملکەچی هەموارکردن بێت لە لایەن زۆرینەی ناوبراو.

بەلام لە بواری تایبەتمەندییەکانی کانتۆنەکان دەتوانین بلێین کە دەسەلاتەکانی کانتۆنەکان لە بوارەکانی دەرەوە دەسەلاتی کەمن ئەگەر بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئەو دەسەلاتی کانتۆنەکان لە پێش دەرچوونی دەستوری ١٨٤٨[٢٩]. وە لە دوای ئەوەی کە کانتۆنەکان لە پێشتر خاوەن سەروەری تەواو بوون ئێستا هیچ ئیعتبارێک یا کەسایەتییەکیان بۆ نەما لە بواری نێو دەوڵەتی بۆیە هیچ مافێکیان نییە لەم بوارە تەنها لە گرێدانی ڕێکەوتنی نێودەوڵەتی کە پێوەندن بەمەسائلی لاوەکی وەکو بوارەکانی گەیاندن و کێشەکانی پۆلیس و ئەو لایەنانەی کە مۆرکی بازرگانی و کارگێڕییان پێوەیەو ئەوانەش بەتەواوی بابەتی ناوەکین[٣٠]، پێویستە دانوستان سەبارەت بەو ڕێکەوتنانە لە ڕێگای ئەنجوومەنی فیدراڵی بێت[٣١]. نابێت ئەو ڕێکەوتنانە دژ بەتایبەتمەندییەکانی یەکیەتی و

مافی کانتۆنەکانی دیکە بن، وە ئەمەش سنووردار بوونی دەسەڵاتەکانی کانتۆنەکان لەسەر ئاستی دەرەوە پیشان دەدات و ئەو دەسەڵاتانە لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی یەکیەتی مومارەسە دەکەن[٣٢].

لە کاتێکدا کە قەدەغەیە بۆ کانتۆنەکان پەیماننامەی سیاسی یاخود هاوپەیمانیەتی سەربازی لە نێوان خۆیان ببەستن[٣٣] لەبەر مەترسی دەرەنجامی خراپ ئەو جۆرە پەیماننامەو هاوپەیمانیەتیان بەڵام بۆیان هەیە ڕێکەوتن لە نێوان خۆیان ببەستن لە لایەنەکانی یاسا دانان و کارگێڕی و دادوەری کە دەکەوێتە تایبەتمەندی خۆیان[٣٤].

هەروەها کانتۆنەکان پەرلەمانی تایبەتی خۆیان هەیە[٣٥] کە دەتوانن یاسا دابڕێژێت لەو مەسەلانەی دەکەوێتە تایبەتمەندییان وەکو بواری پەروەردە و فێرکردن و پێوەندییەکان لە نێوان ئایینەکان و ئاسایشی گشتی[٣٦] ئەبێ بشزانین کە ئەو پەرلەمانانە لە یەک ئەنجوومەن پێک دێن.

ئەوەی شایانی باسە هەر کانتۆنێک دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆی هەیە و لەبەرئەوەی سویسرا بەسیستەمی دادوەری دوو لایەنی (مزدوج) وەرناگرێت کانتۆنەکان دادگای فیدراڵییان تێدا نییە، وە دادگاکانی کانتۆنەکانی بەئەرکی جێبەجێ کردنی دەستوری فیدراڵی هەڵدەستن شان بەشانی جێبەجێ کردنی یاساکانی کانتۆنەکان.

لەبەرئەوەی چەند یاسایەکی یەکبوو لە سویسرا داڕێژرا لە بوارەکانی یاساکانی شارستانی و بازرگانی و سزادان بۆیە یاسای کارپێکراو لە هەموو کانتۆنەکان یەکبووە (موحد) هەتا ڕادەیەکی زۆر[٣٧].

**(دەزگا یەککگرتووەکانی سویسرا):**

دەزگا یەککگرتووەکانی سویسرا بریتین لە کۆمەڵەی فیدراڵی (Federal Assembly) و دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی یەکگرتوو واتە ئەنجوومەنی فیدراڵی (Federal Council) و دەسەڵاتی دادوەری فیدراڵی واتە دادگای فیدراڵی (Federal Tribunal).

١- کۆمەڵی فیدراڵی (Federal Assembly)

لەبەر ئەوەی سویسرا بەسیستەمی حکوومەتی کۆمەڵە وەردەگرێت بۆیە کۆمەڵەی فیدراڵی (Federal Assembly) بەبەرزترین دەسەڵاتی وڵات دادەندرێت، و بەپێی ئەو پرنسیپە هیچ لایەنێکی دیکە نییە کە بتوانێت کارەکانی ئەو پووچەڵ بکاتەوە یاخود

کۆسپیان لەبەردەم دابنێت، و لێپرسراویەتی کۆتایی سەبارەت بەکاروباری سویسرا دەکەوێتە ئەستۆی نوێنەرانی میللەت و کانتونەکانی سویسرا[٣٨] لەبەر ئەوەی ئەو دەزگایە ئەو ئامرازانەی هەیە کە بتوانێت دەست بەسەر کاروباری یەکیەتی بگرێت[٣٩] وە بۆ زیاتر رۆشنایی خستنە سەر ئەو دەزگایە کە گرنگترین دەزگایە لە سیستەمی سیاسی سویسرا بەپێویستی ئەزانین کە باس لە پێکهاتەکەی هەروەها لە تایبەتمەندییەکانی بکەین.

أ- پێکهاتەی کۆمەڵەی فیدراڵی:

کۆمەڵەی فیدراڵی سویسرا لە دوو ئەنجوومەن پێکدێت ئەوانیش ئەنجوومەنی نیشتمانی و ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان.

ئەنجوومەنی نیشتمانی (Council National):

ئەم ئەنجوومەنە هاوتای ئەنجوومەنی نوێنەران -مجلس النواب-ی ئەمەریکایە و لە نوێنەرانی گەلی سویسری پێک دێت هەڵبژاردنی ئەندامەکانی کە لە (٢٠٠) ئەندام پێک دێ ئێستا[٤٠] بەگوێرەی دانیشتوان دەبێت کە هەر نوێنەرێک- (نائب) نوێنەرایەتی (٢٤,٠٠٠) کەس دەنگدەر دەکات[٤١].

پێویستە بۆ هەر کانتۆنێک یان نیو کانتۆن بەلایەنی کەمەوە یەک نوێنەریان هەبێ[٤٢] هەڵبژاردنەکەش بەرێگەی (هەڵبژاردنی رێژەی راستە وخۆ - الانتخاب النسبي المباشر) ئەنجام دەدرێت و هەر کانتۆنێک یان نیو کانتۆن بەناوچەییکی (منطقە)ی هەڵبژاردن دادەنرێ[٤٣] هەر هاوولاتییەک توانای هەڵبژاردنی هەبێت دەتوانێ خۆی بپاڵێوی و هەڵبژێردرێ بۆ ئەندامییەتی (ئەنجوومەنی نیشتمانی)، بۆ زانیاریش تەمەنی هەڵبژاردن لە سویسرا بە(٢٠) ساڵ دیاری کراوە[٤٤] بەلام لە واقیعدا هیچ پاڵێوراوێک ناتوانی ئەندامییەتی ئەنجوومەنی نیشتمانی وە دەست بێنی ئەگەر لەگەڵ لیستێک لە پارتە سیاسییەکان نەبێت[٤٥].

وە لە چوار ساڵدا جارێک هەڵبژاردن ئەنجام دەدرێ[٤٦]، پاشان ئەنجوومەن خۆی لە نێوان ئەندامەکانیدا سەرۆکی ئەنجوومەن هەڵدەبژێرێ. جا ئەگەر دەنگەکانی نێو ئەم ئەنجوومەنە یەکسان بوون ئەوا ئەم لایەنە کە دەنگی سەرۆکی لەگەڵ دایە وەردەگیرێت[٤٧].

ئەندامانی ئەنجوومەنی نیشتمانی مووچەیەکی دیاریکراویان نییە بەلام: برە پارەیێک وەک قەرەبوو (التعويضات) لە خەزێنەی فیدراڵی وەردەگرن[٤٨] و هەروەها هیچ

ئەندامێکی ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان یاخود ئەنجوومەنی فیدراڵی یان فەرمانبەرەکانی تری دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بۆیان نییە ببنە ئەندام لە ئەنجوومەنی نیشتمانی[٤٩].

- ئەنجووومەنی دەوڵەتەکان (Council of states):

ئەو ئەنجوومەنە لە نوێنەرانی دەوڵەتە ئەندامەکان (کانتۆنەکان) لە یەکیەتی پێکدێت لەسەر بنەمای دوو نوێنەر بۆ هەر کانتۆنێک و یەک نوێنەر بۆ هەر نیوە کانتۆن، وە ئێستا ئەو ئەنجوومەنە لە (٤٦) چل و شەش ئەندام پێکدێت[٥٢]. کانتۆنەکان بەخۆیان جیاووک و ماوەی ئەندامیەتی نوێنەرەکانیان دەستنیشان دەکەن وە هەروەها چۆنیەتی هەڵبژاردنیان بۆ ئەو ئەنجوومەنە[٥١] بۆیە ڕێچکەی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان جیاوازن لە کانتۆنێک بۆ کانتۆنێکی تر و هەندێک لەو کانتۆنانە پەنا بۆ هەڵبژاردنی گشتی ڕاستەوخۆ دەبەن لە کاتێکدا هەندێکی دیکەیان لە ڕێگای ئەنجوومەنی یاسا دانان هەڵیاندەبژێرن. وە ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنە بڕە پارەی قەرەبووی مەسرەفیان لە کانتۆنەکانی خۆیان وەردەگرن. ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان ناگاتە ئاستی ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکی سەبارەت بەو کاریگەرییە گەورەیەی کە ئەنجوومەنی پیران ئەنجامی داوە لە ژیانی سیاسی ئەمریکی ئەمەش بەبێ گومان دەگەڕێتەوە بۆ زۆر هۆ و لە نێوانیان جیاوازی ڕێچکە و ماوەی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی سویسری لە کانتۆنێک بۆ کانتۆنێکی دیکە بەپێچەوانەی ڕێچکە یەکبووی ئەمریکی کە هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران بۆ ماوەی شەش ساڵ هەڵدەبژێردرێن. سەرباری ئەوەش ئەندامانی ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان لە سویسرا بەشێوەیەکی سەربەخۆ هیچ دەسەڵاتێکی ڕاپەڕاندنیان نییە لەو دەسەڵاتانەی کە دراونەتە ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکی، لەبەر ئەوەی هەر دوو ئەنجوومەنی پەرلەمان پێکەوە دەسەڵاتەکانی ڕاپەڕاندن مومارەسە دەکەن لە سویسرا[٥٢]. ئەمەو لە کێشە گرنگەکان دەنگدانِ لە کۆمەڵەی فیدراڵی لە دوای پێکەوە دانشتنی هەردوو ئەنجوومەن لە ژێر سەرۆکایەتی سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتمانی ئەنجام دەدرێت و ئەمەش لە گرنگی ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان کەم دەکاتەوە لەبەر کەمی ڕێژەی ژمارەی ئەندامانی بەبەراورد لەگەڵ ڕێژەی ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی نیشتمانی، بۆیە هەندێک[٥٣] وا دەبینن کە لەگەڵ یەکسانی بوونی هەردوو ئەنجوومەن لە لایەنی ڕواڵەتی یاسایی بەڵام لە پیادەکردن و پراکتیکدا لەوانەیە ئەنجوومەنی نیشتمانی بەدەسەڵاتتر بێت لە ئەنجوومەنی دەوڵەتەکان.

***

تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵەی فیدراڵی

دەتوانین کارەکانی کۆمەڵەی فیدراڵی لەم چەند ئەرکە تایبەتییانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١- تایبەتمەندیە سیاسیە باڵاکان: (الاختصاصات السیاسیە العلیا)

کۆمەڵەی فیدراڵی دەسەڵاتێکی بنەڕەتی هەرە گرنگی هەیە کە پێوەستە بە سیاسەتی باڵای سویسرا،تەنها خۆی خاوەنی دەسەڵاتە لە ڕاگەیاندنی شەڕ و گرێبەندی ئاشتی (عقد الصلح)و دەست تێوەردان لە کاروباری لەشکری و ئەنجامدانی چەند بێنە و بەردە (اجراءات) یەکی پێویست بۆ ئەوەی سەلامەتی و سەربەخۆیی و بێلایەنی سویسرا بپارێزێ.

هەروەها هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتە لە بارەی پەسەندکردن و بەستنی پەیمان و بەڵێننامەکان.

٢- تایبەتمەندییەکانی یاسادانان:

کۆمەڵەی فیدراڵی بەپێی دەستووری یەکێتی بۆی هەیە کە هەموو دەسەڵاتێکی ئاسایی یاسادانان دەزگای پەرلەمانی مومارەسە بکات[٥٤].

لە هەموو ئەو کێشە و مەسەلانەی کە کانتۆنەکان دەسەڵاتی یاسادانانی تیایدا بەدەستەوەیە[٥٥]. هەر ئەویش یاسا و بڕیارە دەرچووەکان کە لە سویسرا بە(arêtes) ناونراوە دادەڕێژێ. هەندێ لە مامۆستایانی یاسای دەستووری[٥٦] یاسا و بڕیارەکانی (arretes) یان لە یەکتری جوێ کردۆتەوە و دەڵێن: جیاوازییەکە لە ڕووی ناوەڕۆک و کاکڵەوە نییە بەڵکو لە ڕووی چەند مەسەلەیەکی ڕواڵەتی و ڕوخساریدایە چونکە یاساکان دەخرێنە بەر ڕاپرسێکی (ریفراندۆم) ئازادانەی میللی ئەگەر (٣٠,٠٠٠) هەزار هاووڵاتی دەنگدەر یان هەشت کانتۆن ناڕەزاییان دەربارەی دەربڕی. لە کاتێکدا بڕیارەکان (arretes) ناخرێنە بەر ئەم ڕاپرسە (ریفراندۆم) ئەگەر گشتی و سەپێنراو و (عمومیة الالزام) بوون یان جاڕدرا کە پەلە و پێویستن، وە بۆ ئەوەی کار و کاروباری ڕۆژانەی حکوومەت لە دەست تێوەردانی خەڵک دوور بێ، کۆمەڵەی فیدراڵی وا ڕاهاتووە کەوا پەنا بباتە بەر داڕشتنی یاسا (سنة التشریع) زۆربەی یاساکان کە لە لایەن ئەم کۆمەڵە دەردەچێت لە شێوەی (بڕیارە گەل ئامێزەکانن) تەنانەت تێکڕای ساڵانە بۆ دەرکردنی ئەم

بڕیارانە بەگوێرەی یاساکان لە ساڵی (١٩٠٠-١٩٥٠) گەیشتۆتە (٦) بۆ (١)[٥٧] هەروەها کۆمەڵەی فیدراڵی دەتوانی پێشنیاران ڕابنوێنی بۆ گۆڕانکاری دەستووری فیدراڵی[٥٨].

***

٣- تایبەتمەندییەکانی ڕاپەراندن:

هەندێ تایبەت هەیە کە کۆمەڵەی فیدراڵی مومارەسەیان دەکات دەکرێ وەک ئەرکە تایبەتی ڕاپەراندنەکان (التنفیذیە) پۆلێن بکرێن، کە ئەندامەکانی هەردوو ئەنجوومەنی کۆمەڵەی فیدراڵی لە دانیشتنێکی هاوبەشدا کۆدەبنەوە و ئەم بێنە و بەردانە (الاجراءات)ی خوارەوە بەدەنگدانی (زۆرینەی ڕەها) دەردەکەن، زۆرینەی ڕەها واتە (١+٥٠).

١- هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی فیدراڵی

٢- هەڵبژاردنی سەرۆک و جێگری یەکیەتی لە نێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی فیدراڵی.

٣- هەڵبژاردنی ڕاوێژکاری یەکیەتی.

٤- هەڵبژاردنی ئەندامانی دادگای فیدراڵی.

٥- هەڵبژاردنی دادگای تەئمیناتی فیدراڵی.

٦- هەڵبژاردنی فەرماندەی گشتی سوپا لە کاتی نا ئاساییدا (الطوارئ).

٧- هەڵبژاردنی سەرۆک و جێگری سەرۆک بۆ دادگای فیدراڵی.

٨- داڕشتنی پیشە هەمیشەییەکانی تری فیدراڵی و دیاریکردنی مووچەی مانگانە بۆ ئەندامەکانیان.

٩- دیاریکردنی مووچەی هەموو ئەندامەکانی لقە گرنگەکانی فیدراڵی.

- تایبەتمەندییە دادوەریەکان:

کۆمەڵەی فیدراڵی پێشان چەندین ئەرکی تایبەتی دادوەری فراوانی بەدەستەوە بوو بەڵام ئەم ئەرکە تایبەتییانە پاشان پووکانەوە و کەمتر بوونەوە بەهۆی زیاد بوونی ئەرکە تایبەتییەکانی دادگای فیدراڵی[٥٩]، بەڵام ئێستاش کۆمەڵەی فیدراڵی بەردەوام مومارەسەی هەندێ لە ئەرکە تایبەتییەکانی دادوەری دەکات کە ئەمانەن:

نەهێشتن و بەئەنجام گەیاندنی دوو بەرەکییەکان نێوان دەسەڵاتە فیدراڵییە جیاوازەکان کە بریتین لە دەزگای: یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادگای فیدراڵی(٦٠).

دەتوانین چاو بەوتێهەڵچوونەوە - الاستئناف - پێشکەشکراوانەدا بخشێنیتەوە کە لە بارەی یاسا کارگێڕییەکانەوە دژ بەئەنجوومەنی فیدراڵی خراونەتە ڕوو(٦١)، بۆیان هەیە چاو بەو تۆمەتانەدا بخشێننەوە کە لە لایەن کانتۆنەکانەوە دژ بەئەندامانی لقە گرنگەکانی هەر سێ لایەنە فیدراڵییەکان بەرز دەکرێتەوە، کە ئەوەش لە بارەی چەند تاوانێکی دیاریکراو، هەروەها دەسەڵاتی لێبووردنی بەدەستەوەیە بۆ ئەوانەی کەوا لە لایەن هەر سێ لایەنی فیدراڵی تۆمەتبار کراون هەروەها بۆ ئەوانەش کە حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرکراوە لە ژێر سایەی یاسای سەربازی.

***

ئەنجوومەنی فیدراڵی (المجلس الفدرالی) federal council:

ئەو کەسە لەسەر حەقە کە دەڵێت (دەزگای بێ هاوتا لە وڵات بچووکەو بێ هاوتایە ئەنجوومەنی فیدراڵییە)(٦٢) ئەم ئەنجوومەنە بەم دەزگایە دەژمێردرێ لە سویسرا کە ئەرکی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنی پێسپێراوە(٦٣) و لە حەوت کەس پێک دێ کە لە لایەن کۆمەڵەی فیدراڵییەوە هەڵدەبژێرێن کە هەردوو ئەنجوومەنەکە لە دانیشتنێکی هاوبەشدا کۆ دەبنەوە و هەر کانتۆنێک-یش نابێ لە ئەندامێکی زیاتری هەبێ(٦٤)، عورفیش (دابونەرێت) وا ڕۆیشتووە کە یەک ئەندام لە هەردوو شاری بێرن (beren) و زیورینخ (zurch) بۆیان هەبێ بێنە ناو ئەنجوومەن چونکە دوو شاری زۆر چڕن لەڕووی دانیشتوانەوە وەیەک ئەندامیش لە فۆد (voud) هەبێ کە گەورەترین کانتۆنە بەزمانی فەرەنسایی بدوێن(٦٥).

هەڵبژارنەکە لەساڵی ١٩٥٩ پێشکەوتنێکی بەخۆوە بینی ئەویش ئەوە بوو کەوا نەریتێک پەیدا بوو کە تا بکرێ هەموو حزبە سیاسییە سەرەکییەکان لە ئەنجوومەنی فیدراڵیدا بەشداربن(٦٦). لە جێبەجێ کردنی کرداریدا (پراکتیک) عورفێکی نەگۆڕ هەیە بۆ دیاریکردنی ئەو کەسانەی کەوا خاوەن ئەزموونن لە بواری کاروباری گشتیدا. ئەمەش مانای وایە پاڵێوراوەکان لە نێو ئەندامانی ئەنجوومەنی نیشتمانی و ئەنجوومەنی وڵاتدا هەڵدەبژێردرێن.

هەروەها ئەوانەی کە لە دەزگا گرنگەکانی کانتۆن-ەکان کاریان کردووە ئەوانیش بۆ ئەندامیەتی ئەنجوومەنی ناوبراو گەڵاڵە دەبن(٦٧). کاروانی ئەنجوومەنی فیدراڵی کە تەنها

له دوو بۆنه (مناسبه)دا نەبێ کە لە ساڵانی ١٨٥٤ و١٨٧٢ ڕوویان دا، دەری خستووە هەر ئەندامانی فیدراڵی هەڵبژێردراونەتەوە مادەم مەیلیان لەسەر بوو درێژە بەخزمەتەکەیان بدەن زۆربەی ئەندامەکانی بۆ دوو ماوە (فترە) یان سێ ماوە هەڵبژاردراونەتەوە لە هەندێ حاڵەتدا خزمەتی هەندێ ئەندام لەم ئەنجوومەنە گەیشتۆتە (٢٥ - ٣٠) ساڵ[٦٨].
ئەنجوومەنی فیدراڵی ناتوانێ کارەکانی خۆی جێبەجێ بکات مەگەر بەئازاد کردنی چوار لە ئەندامەکانی نەبێت[٦٩]، و کۆمەڵە کارەکانی خۆی لە شێوەیەکی کۆمەڵە (جماعیە) ئەنجام دەدات و بڕیارەکانیش دەردەکات بەزۆرینەی دەنگ، جا بۆ دەرچوونی هەر بڕیارێک لەم ئەنجوومەنە دەبێ ڕەزامەندی (٣) لە ئەندامەکانی لەسەر بێت بەلای کەمی[٧٠]، ئەندامانی ئەنجوومەنی فیدراڵی دەتوانن لە کۆبوونەوەکانی هەردوو ئەنجوومەنی کۆمەڵەی فیدراڵی بەشدار بن و ڕاوێژ پێشکەش بکەن و هەروەها مافی پێشنیاریان هەیە بۆ هەر بابەتێک کە پەرلەمان دەیخاتە بەر گفتوگۆکردن[٧١] کۆمەڵەی فیدراڵی سەرۆکێک بۆ ئەنجوومەنی فیدراڵی هەڵدەبژێرێ کەوا بریتییە (لە سەرۆکی سویسری) واتە سەرۆکی یەکیەتی سویسرییە و جێگری سەرۆکیش لە نێوان ئەندامانی فیدراڵیدا هەڵدەبژێرێ.
بەڵام دەستوور ڕێگەی نەداوە کەوا سەرۆک و جێگرەکەی بۆ هەمان پلە و پایە (منصب) خۆیان پاڵێون بۆ هەڵبژاردن بۆ دوو ساڵ لە دوای یەک[٧٢].

دابونەرێت وا باوە کەوا جێگری سەرۆک جێگای سەرۆکی کۆمەڵە بگرێتەوە و ئەم پلە و پایە دەسووڕێتەوە بەسەر هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی فیدراڵی.

دەسەڵاتەکانی سەرۆکی یەکیەتی سویسری چەند دەسەڵاتێکی پرۆتۆکۆڵین (ناوداری) پیشەکانیش ئەمانەن:

سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی فیدراڵی و کارکردنی وەک سەرۆکێکی ڕەمزی (سیمبولی) وڵات جا چ لە ئاستی ناوەوە یان چ لە ئاستی دەرەوەدا بێ. هەروەها چەند دەستڕۆیشتن - صلاحیة-یکی سنووورداری تری هەیە لە کاتی نا ئاساییدا سەرپشکە (مخول) لە دەرکردنی بڕیار لەچەند مەسەلەیەکی دیاریکراو بەڵام دەبێ بڕیارەکانی خۆی لە سەرەتا بنرێت لای ئەنجوومەنی فیدراڵی بۆ مەبەستی ڕەزامەندی نواندن لەسەریان. هەروەها مومارەسەی دەسەڵاتی سەرپەرشتی گشتی دەکات لەسەر ئەنجوومەنی فیدراڵییەوە بەرپرسی بەشی ڕاوێژکاری فیدراڵییە، لەمە بترازێ هیچ جیاوازییەکی تری لەگەڵ ئەندامانی تری ناو هەر دوو ئەنجوومەنی فیدراڵی نییە. وەک سویسرییەکان دەڵێن:

سەرۆک لە نێو یەکسانەکان یەکەم یەکسانە (the first among equel)[٧٣] وە ئەنجوومەن لە حەوت بەش پێک دێت هەر ئەندامێکی ئەنجوومەن لەسەرووی یەک بەشەکانی (واتە سەرۆکی بەشێکە). بەشەکانیش ئەمانەن.

١- بەشی سیاسەتی دەرەوە.

٢- بەشی ناوەخۆ.

٣- بەشی داد و پۆلیس.

٤- بەشی کاروباری سەربازی.

٥- بەشی باج و دارایی.

٦- بەشی پیشەسازی و بازرگانی و کشتووکاڵ.

٧- بەشی پۆستە و هێڵی شەمەندەفەر.

***

دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی فیدراڵی

دەتوانین دەسەڵاتە جیاجیاکانی ئەنجوومەنی فیدراڵی لەو خاڵانەی خوارەوە دەستنیشان بکەین:

١- دەسەڵاتەکانی یاسادانان بۆ ئەنجوومەنی فیدراڵی:

ڕەنگە جێگەی سەرسوڕمان بێ کە دەڵێین: ئەنجوومەنی فیدراڵی هەندێ ئەرکی تایبەتی هەیە لەبەر ئەوەیە چونکە دەسەڵاتێکی ڕاپەڕاندنە. بەڵام ئەم قسەیە دەبێ جێگای سەرسوڕمان نەبێ چونکە سویسرا پەیڕەوی لە بنەما (پرنسیپ)ی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان ناکات کە پەیڕەو دەکرێت لە سیستەمە دیموکراتییەکان بەتایبەتی (سیستەمی ئەمەریکی) بەم جۆرە لە دەستووری سویسریدا دەقی وا هاتووە کە ئەنجوومەنی فیدرالی پابەند کردووە بەناردنی پرۆژەی یاسا و بڕیارەکان (arêtes) بۆ کۆمەڵی فیدراڵی وە ڕاپۆرتی ڕێوشەکی ئامێزیش گەلالە بکات لە مەڕ ئەو پرۆژە یاسا و بڕیارانەی کە ئەنجوومەنی فیدراڵی و کانتۆنەکان ڕەوانەی دەکەن[٧٤]. بەگوێرەی ئەو دەقەی کە باسمان کرد ئەنجوومەنی فیدراڵی وەکو هەندێک دەڵێین[٧٥] خۆی سەرپەرشت و ئاراستەکەری سەر پرۆسەی یاسادانانە. هەر یاسایەکی تازە دەرچووش لە بنەڕەتدا هەر بۆ ئەم ئەنجوومەنە دەگەڕێتەوە، چونکە کۆمەڵەی فیدراڵی دەستپێشخەری بۆ هیچ کاروبارێک ناکات کە

پەیوەندی بەیاسادانانەوە هەبێ، تەنانەت لە کاتی پێویستیش بۆ یاسایەک کۆمەڵەی فیدراڵی داوای لە ئەنجوومەنی فیدراڵی دەکات کە ڕەشنووسێک (مسودە) بۆ پرۆژە یاساییە پێشنیاری کراوەکان ئامادە بکات، ئەمەش هەڵدەستێ لە ڕێگەی شارەزا پسپۆڕەکان ئەم بوارە گەلاڵەی پرۆژە یاساییەکان دەکات وە چەند ڕاپۆرتێک دەربارەی هۆکاری پێویستییەکانی ئەم یاسایە یان پێویست نەبوونی ئەم یاسایە ئامادە دەکا و دەینێرێ بۆ کۆمەڵەی فیدراڵی، ئەمە و ئەرکی گرنگی ئەنجوومەنی فیدراڵی لەوەندە کۆتایی نایە بەڵکو وەکو بناغەیەکی گشتی (قاعدة عامة) ئەوا ئەندامی ئەنجوومەنی فیدراڵی پەیوەنددار سەرپشک دەکرێ کە چاودێری پرۆژەی یاساکە بکات لە هەموو قۆناغەکانی کە پێیدا دەڕۆن لە کاتی دەرچوونی لە پەرلەمان. هەر وەکو ئەم چاودێرییە ئەوەش دەگرێتەوە کە چاوی بەلێژنەی تاوتۆکردنی پرۆژەکە بکەوێت کە سەرپەرشتی پرۆژەکە دەکەن و ئەم لێژنەیەش بەئامادە بوونی ئەم پەیوەنددار یاساکە دەخاتە ڕوو ئەویش تێبینی و ڕای خۆی دەخاتە ڕوو هەر وەکو ڕابارد Rappard دەڵێت «زۆر زەروور نییە کە لە و کۆبوونەوانە ئامادەبن بۆ ئەوەی بزانین کە یاریزانە سەرەکییەکان زۆر کەم ئەندامانی دەسەڵاتی یاسا دانان دەبن»[٧٦]. هەروەها لە کاتی پێشاندانی یاساکە بەرامبەر بەهەر یەک لە دوو ئەنجوومەنەکە کۆمەڵەی فیدراڵی ئامادە دەبێ بۆ باسکردنی پرۆژەکە و ئامانجەکانی و بەرگریکردن لێی ئەگەر وای خواست، جا پاش ئەم هەموو بێنەوبەردەیە (اجراءات) ئەنجوومەنی فیدراڵی هەڵدەستێ بەچاپکردنی یاساکە و کاتێک دیاری دەکرێت بۆ جێبەجێ کردنی ئەگەر کۆمەڵەی فیدراڵی کاتی جێبەجێ کردنەکەی دیاری نەکردبێت.

٢- دەسەڵاتەکانی ڕاپەراندن:

بەو سیفەتەی کە ئەنجوومەنی فیدراڵی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی فیدراڵییە ئەوا مومارەسەی ئەو ئەرکە - ڕاپەڕاندنانە دەکات کە هاوشێوەکەی لە (کابینەی وەزاری لە سیستەمی پەرلەمانی و سەرۆک لە سیستەمی (سەرۆکایەتی)- النظام الرئاسي) جێبەجێ دەکەن. جا دەتوانین گرنگترین ئەم ئەرکانە لە خوارەوە دیاری بکەین:

١- کاروباری دەرەوە:

ئەنجوومەنی فیدراڵی وا دادەنرێ کە بەرپرسی ڕواڵەتی کاروباری دەرەوەی سویسرایە لە ڕێگەی سەرۆکی یەکێتی بەقسەکەری ڕەسمی سویسرا دادەنرێ و پێشوازی لە نێرراو و

(سفیر) و وەزیر و باوەڕ پێکراوەکانی ولاَتانی بێگانە دەکات هەر وەکو:نێرراو وەزیرەکان بەناوی سویسراوە دەنێرێتە ولاَتانی بێگانە هەر وەکو هەڵدەستێ بەکاروباری بەدانوستان کردن دەربارەی پەیماننامەکان و بەستنیان و پەسەندکردنیان پاش ئەوەی کە کۆمەڵەی فیدراڵی رێگەی پێدەدا(٧٧).

٢- کاروباری بەرگری:

دەستووری سویسری ئەرکی پاراستنی ئاسایشی دەرەوە و ناوەخۆیی سویسرا و پاراستنی سەربەخۆیی و بێلایەنی خستۆتە ئەستۆی.(٧٨)

ئەم ئەنجوومەنە ئەم ئەرکە تایبەتە لە کاتی ئاشتی رێکخستنی هێزی سەربازی سویسرا دەگرێتەوە و لە کاتی نا ئاساییدا ئەنجوومەنی فیدراڵی بۆی هەیە ئەم هێزانە بەکار بێنی ئەگەر بەپەسەندی زانی بۆ دامرکانەوەی ئاژاوە و بەرگریکردن لە ولاَت لە دەستدرێژی دەرەوە. بەلاَم ئەگەر زیاتر لە (٢٠٠٠) دوو هەزار پیاوی ویست ئەم کارە یاخود ماوەی کارەکە لە سێ هەفتە زیاتر بوو ئەوا لەسەر ئەنجوومەنی فیدراڵی پێویستە کە داوا لە کۆمەڵەی فیدراڵی بکات بۆ کۆبوونەوەیەکی نا ئاسایی بۆ رازی بوون لەسەر ئەم بێنە و بەردە (اجراءات) انەی کە لە لای خۆیەوە دەری کردووە(٧٩).

جێبەجێ کردنی یاسا فیدراڵییەکان:

دەستووری یەکێتی دەسەلاَتی راپەراندنی یاسا و بڕیارە تەشریعییەکانی فیدراڵی Arretes خستۆتە سەر شانی ئەنجوومەنی فیدراڵی(٨٠) بەلاَم ئەنجوومەنی ناوبراویش باری خۆی سووک کردووە بەوەی هەندێ لە یاسا و بڕیارەکانی حەواڵەی کانتۆنەکان (هەرێمە فیدراڵییەکان) کردووە بەلاَم دەسەلاَتی سەرپەرشتی کردنی شێوازی راپەراندنی ئەم یاسا و بڕیارانەی کە کانتۆنەکان رایدەپەرێنن بۆ خۆی هێشتۆتەوە، هەروەها بڕیارەکانی دادگا فیدراڵییەکانیش، جا کاری ئەنجوومەنی فیدراڵی لەم بوارەدا تەنها ئەمانە ناگرێتەوە کە باس کران، بەڵکو دەگاتە ئەو بڕیارە ناوبژیوانانەی کە پەیوەستن بەکێشەی نێوان کانتۆنەکانەوە.

ئەنجوومەن هەڵدەستێ بەکاری پشکنین ولێوردبوونەوە و رەزامەندی دەربڕین لەسەر بڕیار و فەرمانە دەرچووەکانی کانتۆنەکان. جا ئەگەر کانتۆن شکستی هێنا لە بەجێ گەیاندنی ئەرکەکانی (التزاماته) وە پێشنیاری ئەنجوومەنی فیدراڵی رەت کردەوە، ئەوا ئەنجوومەنی فیدراڵی دەتوانی ئەم مەسەلەیە بخاتە بەر دەستی دادگای فیدراڵی یاخود کۆمەڵەی فیدراڵی و ئەنجوومەن دەتوانێ پەنا بباتە بەر هێزی فیدراڵی کە بەکاریان بێنێ وەکو دوا

چەکی پێویست بۆ ڕاپەڕاندنی یاسا و بڕیارە فیدراڵییەکان و لە بواری پراکتیکدا گرنگی ئەنجوومەنی فیدراڵی زۆر زیادی کرد لەسەر حسێبی کۆمەڵەی فیدراڵی تا ئەو ڕادەی کە پاڵی بەهەندێک نا[٨١] کە سیستەمی سویسری بە«حوکمڕانی بەڕێوەبەرایەتی» «الحكم المديري» ناوببەن لە جیاتی ناوەکەی جارانی کە بە«حوکمڕانی ئەنجوومەن» «الحكم المديري» ناسرابوو وە هۆی سەرەکی زیادبوونی گرنگی ئەو ئەنجوومەنە لەسەر حسێبی کۆمەڵەی فیدراڵی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەندامانی ئەنجوومەنی ناوبراو بریتین لە سەرکردەکانی زۆرینەی پەرلەمانی لە کۆمەڵەی فیدراڵی[٨٢] بەڵام ئەو سیستەمە سیمایەکی دیاری هەیە کە بریتییە لە جێگیربوونی ڕووحی هاوکاری لە نێوان کۆمەڵە و ئەنجوومەندا[٨٣] بەڵام گریمان ناکۆکی پەیابوو لە نێوان ئەو دوو دەزگایە ئەوکاتی دەبێت ئەنجوومەنی فیدراڵی ملکەچ بکات[٨٤].

***

٣- دادگای فیدراڵی (federal tribunal):

دەسەڵاتی دادوەری فیدراڵی لە دادگای فیدراڵیدا بەرجەستە دەبێ[٨٥] کە دادوەرەکانی لە «٩» دادوەر لە ساڵی ١٨٧٤ زیادبوو تا گەیشتە «٣٠» دادوەر لە حاڵی حازر[٨٦]. لێرەدا پێویستە ئەو جیاوازییە بنەڕەتییە دەستنیشان بکەین کە لە نێوان هەردوو سیستەمی دادوەری (ئەمەریکی و سویسری)دا هەیە کە لە سیستەمی سویسریدا بەپێچەوانەی سیستەمی ئەمەریکی پەیڕەو لە (دادوەری ئاوێتە)یی - القضاء المزدوج - ناکات، هەروەها دەستڕۆیشتن- صلاحية-ی دادگای فیدراڵی سویسری ناگاتە دەست ڕۆیشتنی دادگای باڵای ئەمەریکی[٨٧].

***

کارە تایبەتمەندییەکانی دادگای فیدراڵی:

دادگای فیدراڵی گەلێک لە کارە تایبەتییەکانی دادوەری مومارەسە دەکات بەسیفەتی بنەڕەتی (ئەصلی) یان بەتێهەڵچوونەوە (تمیز) لە کێشە یاساییەکان دەڕوانی... لە بواری یاسای مەدەنی (شارستانی): دادگای فیدراڵی بەسیفەتی بنەڕەت لە هەندێک کێشە دەڕوانی کە دەکرێت لەو کێشانە کورت بکرێنەوە وە لە نێوان یەکیەتی و کانتۆنەکان یان لە نێوان خودی کانتۆنەکانەوە ڕوو دەدەن. جا نرخی کێشەکان (نرخی داواکان) هەر چەندێ بن[٨٨].

هەروەها ئەم کارەش تایبەتی خۆیەتی کە لە کێشەکانی نێوان تاکەکان لە لایەکەوە و لەگەڵ یەکیەتی یان کانتۆنەکان لەلایەکی ترەوە بڕوانی بەو مەرجەی ئەو نرخەی کەوا کێشەکەی لەسەری دەکرێت ژ هەشت هەزار فرەنکا سویسری زیاتربێت[٨٩]. هەروەها دادگای ناوبراو بەسیفەتی بنەڕەتی لەو کێشانەش دەڕوانی کە لە نێوان تاکەکاندا ڕوو دەدات لە کاتێکدا کەوا یەک لە دوولایەنە ناکۆکەکە داوای ئەم تێڕوانینە بکەن بەمەرجێ کێشەکە لە (١٠) دە هەزار فرەنکی سویسری زیاتربێت[٩٠].

هەروەها ئەم دادگایە بەسیفەتی تێهەڵچوونەوە (الاستئناف) لە بڕیارەکانی دادگاکانی کانتۆنەکان دەڕوانێ، بەڵام بۆ ئەوەی لەم بوارەوە باری شارستانی دادگای فیدراڵی سووک بکرێت ئەوا دادگای باڵاکانی نێو کانتۆنەکان سەر پشک کردوون کە ئەوان لە بڕیارەکانی دادگا نزمەکان بڕوانن ئەگەر هاتوو نرخی کێشەکە لە هەشت هەزار فرەنکی تێنەپەڕی[٩١].

لە گۆرەپانی یاسای تاواندا دادگای فیدراڵی وا دادەنرێ کە ئەو خاوەنی پسپۆڕیەتی بنەڕەتییە خۆی تاقانەیە لە زنجیرەیەکی گەورەی تاوانە جینائییەکاندا وەکو: تاوانی خیانەتی هەرە گەورە (الخيانة العظمي) دژی یەکیەتی، وە یاخیبوون وشۆڕشکردن[٩٢] یان تاوانەکانی تایبەت بەیاسای نێو دەوڵەتی[٩٣] و ئەو کردەوانەی دەبنە هۆی خۆ تێهەڵقورتاندنی سەربازی لە لایەن دەسەڵاتە فیدراڵییەکانەوە[٩٤]، ئەو تۆمەتە ڕەسمییانەی کە دژی فەرمانبەرە ڕەسمییە دامەزراوەکان کە ئەگەر هەواڵەی ئەم دادگایە بکرێ[٩٥] هەروەها دادگەی فیدراڵی دەستڕۆیشتنێکی هەیە کە بەسیفەتێکی بنەڕەتی لەم کێشانە بڕوانێ کە پەیوەستن بەتەزویر و فرۆفێڵ کردن لە هەڵبژاردنەکان[٩٦].

بەڵام لە بواری یاسای دەستووری و کارگێڕیدا: دادگای فیدراڵی دەسەڵاتی چاو پێداخشاندنەوەی تەنها لە دەست خۆیدا نەهێشتۆتەوە بەڵکو لەم بوارەدا دەسەڵاتی دادوەری لەگەڵ کۆمەڵەی فیدراڵی و ئەنجوومەنی فیدراڵی دابەش دەکات.

ئەوەی شایانی باسە و لەسەر بنەمای مادده (١٢٤) لە یاسای دەسەڵاتی دادوەری ئەنجوومەنی فیدراڵی بەڕاژەیێکی زیاتر لە دادگای فیدراڵی سەیری ئەو بڕیارانە دەکات کە لە لایەنە کارگێڕییەکان دەردەچن وەکو بەشەکانی ئەنجوومەنی فیدراڵی و دەزگای باڵای سکەی ئاسنی فیدراڵی و ڕاژەیێکی دیکە لە دەسەڵاتە کارگێڕییە فیدراڵییەکان. هەروەها مادده[٩٦] لە هەمان یاسا دەڵێت کە پێویستە ئەنجوومەنی فیدراڵی و دادگای فیدراڵی پێکەوە کۆببنەوە بۆ وتوویژ لەسەر کێشەکان ئەگەر هات گومان پەیابوو لەسەر

تایبەتمەندییەکانیان لەم بوارەدا. بەڵام دادگای فیدراڵی ئەرکێکی زۆر گرنگ جێبەجێ دەکات سەبارەت بەدابینکردنی مافە دەستوورییەکان بۆ کەسانی کۆمەڵ و بوار نەدان بۆ پێشێلکردنی ئەو مافانە چ ئەگەر لە دەستووری فیدراڵی هاتبوون یاخود لە دەستووری کانتونەکان بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەو پاراستنە بەشێوەیێکی بنچینەیی دابین دەکرێت لە دژی دەستدرێژی حکوومەتەکانی کانتونەکان نەک دژی حکوومەتی فیدراڵی لەبەر ئەوەی ئەو دادگایە تەنها دەتوانێت یاساکانی کانتونەکان پووچەڵ بکاتەوە بەڵام ناتوانێت یاساکانی یەکیەتی پووچەڵ بکات، و لە بواری پراکتیکدا ئەو دەقە پێڕەو و پیادە دەکرێت بەشێوەیێکی بەردەوام و ساڵانە چەندەها داوای لەم جۆرە پێشکەش بەدادگای فیدراڵی دەکرێن و زۆرینەیان پێوەستن بەپرنسیپی یەکسانی لە بەرامبەر یاسا کە لە مادده چواری دەستووری فیدراڵی دەقی لەسەر کراوە[٩٧].

هەروەها ئەو دادگایە تایبەتمەندە بەسەیرکردنی ئەو ناکۆکیيانەی کە پێوەندییان بەتایبەتمەندی (اختصاصي) هەیە لە نێوان دەسەڵاتە فیدراڵییەکان لە لایێک و دەسەڵاتەکانی کانتونەکان لە لایێکی دیکە و، هەروەها ناکۆکییەکانی پێوەند بەیاسای گشتی لە نێوانی کانتونەکان[٩٨].

دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کە دادگای فیدراڵی سویسری- و بەپێچەوانەی دادگای باڵای ئەمریکی- هەڵناستێت بەئەرکی چاودێری دادوەری لەسەر بەدەستووری بوونی یاسا و پەیماننامە فیدراڵییەکان.

## پەراوێزەکانی ئاخافتنی دووەم

(١) دکتۆر «ئەندریە هۆریۆ»- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣٧.

(2) Daniel Ale zar. Op. Cit Page 252.

(٣) دکتۆر «ئەندریە هۆریۆ»- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣٧.

(4) Article 17 from the Swiss Federal Constitution .

(5) George Arthur Cooding. The Federal Constitution of Switzer land.
Houghton mifflin Company Boston, under the Editorship of Dayton D, Mckean Page 8.

(6) Op. Cit Page 8.

(7) Op. cit page 9.

(٨) دکتور« ئەندریە هۆریۆ»- سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣٧.

(٩) سەرچاوەی پێشوو ل ٤٣٧- ٤٣٨.

(10) William H. Riker, Federalism, Op . Cit Page 35.

(١١) دكتۆر محەمەد كامل ليله «الانظمة السياسية» دەوڵەت و حكوومەت - كتێبخانەی «النهضة العربية» بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە. بيروت ١٩٦٩ ل ١٠٤٥.

(١٢) سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٤٥.

(١٣) دكتور «عبدالغني بسيوني عبدالله» سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٣.

(١٤) هەندێ جار پەرلەمان دەسەڵاتی جێ بەجێكردن دەداتە يەک کەس و ئەوەش لە کاتی باری ناهەموار و بارودۆخی لە ناکاو کە پێویستی بە خێرایی دەستداری هەبێ بۆ یەکلاکردنەوەی چارەسەرکردنی کێشەکان بۆ ئەم مەبەستە سەیری« دکتور محەمەد کامل» «الانظمة السياسية»

- سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٤٧-١٠٤٨ بکە.

(١٥) سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٤.

(16) Christopher Huges, The parliament of Switzrland Op . Cit Paqe 98.

دكتور «يحيى الجمل» - سەرچاوەی پێشوو ل ١٦٨.

دكتور «عبدالغني بسيوني عبدالله» - سەرچاوەی پێشوو ل ٢٥٧.

(١٧) دكتور «ئەدمون رباط»- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٤٧.

(18) Article 8 from The Swiss Federal Constitution.

(19) K. C .Whear, O. P. Cit Page 189.

(20) O. P . Cit Page 185.

(21) O. P. Cit Page 191.

(22) O. P. Cit Page 191.

(23) O. P. Cit Page 191.

(24) O. P. Cit Page 128.

(25) Ryad Azhari, Op. Cit Page.

(26) Article 3 from The Swiss Federal Constiution .

(27) Article 5 from The Swiss Federal Constiution .

(28) Article 6from The Swiss Federal Constiution.

(٢٩) دكتور «ئەدمون رباط» - سەرچاوەی پێشوو ل ٦٥٦.

(30) Articl 9 From The Swiss Federal Constitution.

(31) Articl 9 From The Swiss Federal Constituiom.

(٣٢) دكتور «ئەدمون رباط» سەرچاوەی پێشوو ل ٦٥٦.

(33) Articl 7 From The Swiss Federal Constittion.

(34) Articr 7 From The Swiss Federal Constitution.

(٣٥) جگە لەم کانتۆنانەی کە سیستەمی دیموکراتی راستەوخۆ بەکار دەهێنن ئەوان ئەم ئەنجوومەنانەیان نییە.

(٣٦) دکتور «ئەدمون رباط »- سەرچاوەی پێشوو ل ٦٥٦.

(37) Geoge Arthur Cooding Op, Cit Page llo.

(38) George Arthur, op. cit page 69.

(39) Christopher Hughes, The Federal Constitution of Switzer land.The clarendon Press. Oxford 7954 Page 18.

(40) Daniel Alazar, Op. Cit Paqe 254.

(41) Article 72 From The Swiss Federal Constitution.

(42) Article 74 From The Swiss Federal Constituion.

(43) Article 73 From The Swiss Federal Constituion.

سالّی ١٩١٩ کار بەسیستەمی هەڵبژاردنی رێژەیی راستەوخۆ کرا کە لەمەوپێش کار بەسیستەمی زۆرینەیی دەکرا کە بریتی بوو لە دوو قۆناغ.

(44) Article 74 From The Swiss Federal Constitution.

(45) Christopher Hughes, The parliament of Switzerland, Op. Cit Paqe 21-33.

(46) Article 75 From The Swiss Federal Constituion .

(47) Article 78 From The Swiss Federal Constituion.

(48) Article 79 From The Swiss Federal Constituion.

(49) Article 77 From The Swiss Federal Constituion.

(٥٠) ژمارەکە لە ٤٤ ئەندام کرا بە ٤٦ ئەندام بە هۆی دامەزراندنی کانتۆنێکی نوێ ساڵی ١٩٧٨ و ئەویش کانتۆنی جۆری Jura بیست و سێیەم.

(51) Christopher hughes, the parliment of Switerland Op. Cit Page 40.

(52) Article 82 from the Swiss Federal Constitutio.

(53) Christopher hughes,the federal constitution of swizerland, Op. Cit Page 91.

(54) George Arthure cooding, op. cit page 69.

(55) Article 85 section 1 from the swiss federal constitutil

(56) George Arthure cooding, op. page 69-70
christopher hughes, the federal constitution of switzerland, op. cit page 93,100

(57) George Arthure cooding, op. cit page 70

(58) Article 85 section 1 from the swiss federal constitution.

(59) George Arthure cooding, op. page 71.

(60) Article 85 section 13 from the swiss federal constitution.

(61) Article 85 section 12 from the swiss federal constitution.

(62) George Arthure cooding, op. cit page 87

(63) Arthure 95 from the swiss federal constitution of 1874.

(64) Article 96 from the swiss federal consititution of 1874.

(65) George Arthure cooding ,op.cit page 88

بەڵام دکتور ئەندریێیە هۆریۆ دەڵێت کە لە ساڵی ١٩٤٤وە وازیان لەم نەریتە هێنا بۆ ئەم مەبەستە بروانە- دکتۆر ئەندریێیە هۆریۆ- سەرچاوەی پێشوو ل٤٤٥

(66) op. cit page 89

(67) op. cit page 89

(68) op. cit page 89

دکتۆر «یحی الجمل » دەڵێت کەوا خزمەتی هەندێ لە ئەندامەکان بەردەوام بوو ماوەی ٣٢ ساڵ بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە- دکتور « یحی الجمل» - سەرچاوەی پێشوو ل١٦٨

(69) Article 100 from the swiss federal consititution of 1874.

(70) George Arthure cooding ,op.cit page 91

(71) Article 101 from the swiss federal consititution of 1874.

(72) Article 98 from the swiss fedral constitution of 1874

(73) George Arthur cooding, op. cit page 92

(74) Article 102 section 4 from the swiss fedral constitution of 1874

(75) George Arthur cooding, op. cit page 92

(76) Quoted from op. cit page 93

(77) Article 102 section 8 from swiss fedral constitution of 1874

(78) Article 102section 9810 from the swiss fedral constitution of 1874

(79) Article 102 section 14 from the swiss fedral constitution

(80) Article 102 section 5 from the swiss fedral constitution

(٨١) ئەندرێیە هوریو - سەرچاوەی پیشوو ل٤٤٩

(٨٢) دکتور - یحیی الجمل - سەرچاوەی پیشوو ل١٦٨- ١٦٩

(83) christopher hughes, the parlimanet of switzerland op. cit page 148

(٨٤) ئەندرێە هۆریۆ - سەرچاوەی پێشوو ل٤٤٩

(٨٥) لە گەڵ دادگای فیدرال دوو دادگای تر هەیە لە سەر ئاستی یەکیتی و ئەوانیش دادگای تەئمیناتی فیدرالی و دادگای تێهەڵچوونەوە سەربازی و ئەوانە دادگای تایبەت و جودان لە دادگای فیدرالی

(86) Daneil Elazer, op. cit page 254

(87) Ryad Azheri, op. cit page 55

(88) Article 110 section 183 from the swiss fedral conistitution of 1874

(89) George Arhtur cooding, op. cit page 105

(90) op. cit page 105

(91) op. cit page 104 - 105

(92) Article 112 section 1 from the swiss fedral constitution of 1874

(93) Article 112 Section 2 From the Swiss Federal Constitution of 1874

(94) Article 112 section 3 from the swiss fedral constitution of 1874

(95) Article 112 section 4 from the swiss constitution of 1874

(96) George Arthur cooding, op. cit page 105

(97) op. cit page 106

(98) Article 113 section 1 and 2 from the swiss fedral constitution of 1874

## بەشی سێیەم

# گونجانی فیدراڵی بۆ عێراق

لە دەروازەی یەکەمدا پرژانییە سەر بارودۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی عێراقی تازە، هەروەها باسیشمان لەوە کرد کە عێراق کۆمەڵگایەکە لەسەر فرەنەتەوەیی و ئایینی و تایەفییەوە سەردەگرێ و بەدەستی کێشەی کوردیشەوە دەناڵێنێ و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش ماندووی کردووە، بگرە لە زۆربەی کاتەکاندا بۆتە مایەی ڕێگەگرتن لە پێشکەوتنی، بەڵکو لە دواخستنی لە هێنانەدی پێشکەوتنی پێویست بەهۆی بارودۆخی شەڕی ناوخۆوە کە گیان وماڵێکی زۆری وڵاتی بەهەدەر دا.

ئەوەشمان بۆ دەرکەوت کە هەموو ڕێگە چارە پێشکەشکراوەکان بۆ ئەو کێشەیە سەریان نەگرتووە و شکستیان هێناوە، هەر لە لامەرکەزی ئیدارییەوە تا ئۆتۆنۆمیی کە بەپێی ڕێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ بڕیاری لەسەر درا. دواتر لایەنە هەمە جۆرەکانی فیدراڵیشمان ڕوون کردنەوە بەو پێیەی ڕێگەچارەیەکی گونجاوە و لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەو کۆمەڵگایانە پەنایان بۆ بردووە کە ئەوانیش فرەلایەنییان گرتۆتە خۆیان، وەک چۆن لە ڕابردووشدا بۆمان دەرکەوت کە فیدراڵی مەترسی ئەو جیابوونەوەیەی لێ بەدی ناکرێ کە بەشێکی کۆمەڵگەی عێراقی ترسیان لێی هەیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێتە مایەی پتەوکردنی پەیوەندی لە نێوان هەرێمە فیدراڵییە یەکگرتووەکاندا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بەشدار دەبێ لە خێراکردنی بزووتنەوەی پێشکەوتن لە عێراق چونکە دەبێتە هۆی لەناوبردنی توندوتیژی ناوخۆیی و لە هەمان کاتدا ئاستی دڵسۆزی دانیشتوانی هەرێمەکانیش بەرامبەر دەوڵەتی یەکگرتوو زیاد دەکات، بۆیە لەو بەشەدا هەوڵ دەدەین باس لە ئاستی بوونی هۆکارە پێویستەکان بکەین بۆ پێکهێنانی فیدراڵی لە عێراق، هەروەها ئەو فاکتەرانەش بەیان بکەین کە لەوانەیە ببنە مایەی سەرکەوتن و چەسپاندنی سیستمی فیدراڵی، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر لەو وڵاتەدا کاریان پێ بکرێ.

له پێناوی خستنە ڕووی وێنەیەکی تەواویش سەبارەت بەبابەتەکە، وا پێویست دەکات سیماکانی ڕێکخستنی دەستووریی عێراقی فیدراڵی بخەینە ڕوو.

هەر لە ئاخافتنی یەکەمی ئەو بەشەدا دەچینە سەر هۆیەکانی پێکهێنانی سیستمی فیدراڵی لە عێراق، ئینجا لە ئاخافتنی دووەمدا باس لە مەرجەکانی سەرکەوتنی فیدراڵی لە عێراق دەکەین.

سیماکانی ڕێکخستنی دەستووریی عێراقی فیدراڵیش بۆ ئاخافتنی سێیەم و کۆتایی جێ دەهێڵین.

ئاخافتنی بەشی یەکەم

## هۆکارەکانی پێکهێنانی فیدراڵی لە عێراق

بەبێ بوونی ئەو فاکتەرانەی کە داوای پیادەکردنی دەکەن، لە هیچ ولاتێکدا ناتوانرێ سیستمی فیدراڵی دابمەزرێنرێ، چونکە ئاشکرایە کە فیدراڵی سیستمێکی سیاسی و یاسایی ئاوێتەیە و بۆ پیادەکردنیشی دەبێ ژینگەیەکی لەبارو پێداویستی گونجاو دابین بکرێن، هەروەها سیستمی یاسایی ئەو چوارچێوەیە کە هۆکارە بابەتییەکانی کۆمەڵگایەکی سیاسی دیاریکراو دەڕژێنە ناوی، ئینجا ئەو هۆکارانە کۆمەلایەتی بن یان شارستانی یاخود ئابووری و دەروونی بن، یان وەک چۆن هەندێک کەس دەڵێن سیستمی یاسایی:

(ئەو پۆشاکەیە کە کۆمەڵگا دەیپۆشێ، لەوانەشە پان و بەرین بێت و کەسێتی کۆمەڵگای سیاسی تێدا ون ببێ، هەروەها دوورنییە بەرتەسک و خنکێنەربێ و تیایدا کۆمەڵگا هیچ بوارێکی هەناسەدانەوەی نەبێت. کەواتە پێکهاتەی کۆمەلایەتی سیاسی قەبارە و شێواز و ڕەنگەکانی ئەو پۆشاکە دیاردەکات بەجۆرێک لەگەڵ ئەو هۆکارانەدا بگونجێ و ڕەنگدانەوەی گیانی کۆمەڵگە و کراوەیی و ڕوانگەکەی بێ).[1]

ئەگەر واشمان دانا کە فیدراڵی ئەو پۆشاکەیە کە وەکو سیستمێکی یاسایی و سیاسی بۆ عێراقی ئایندە دەشێ، کەواتە ئەو هۆکارانە چین کە داوای پۆشینی دەکەن، ئەگەر دەربڕینەکە ڕاست بێ؟ لەو بارەوە دەکرێ بوترێ چەندین هۆکار هەن دەبنە مایەی ئەوەی کار بەسیستمی فیدراڵی بکرێ کە لەو خالانەی خوارەوەدا کۆیان دەکەینەوە:

### یەکەم: هۆکارە کۆمەلایەتییە فرە نەتەوەیی و ئایینی و تایفییەکان:

پێشتر ڕوونمان کردەوە[2] عێراقی تازە کە پێکهاتن و سنوورە هەنووکەییەکانی بۆ دوای جەنگی یەکەمی جیهان و چارەگی یەکەمی ئەو سەدەیە دەگەڕێتەوە، کۆمەڵگایەکی یەک ڕەنگ نییە، بگرە یەکێکە لە دەوڵەتە خاوەن تایبەتمەندییە جۆراوجۆرەکان و تیایدا عەرەب و کورد و تورکمان و ئاشووری و موسڵمان و یەزیدی و سابیئی هەروەها شیعە و سوننە دەژین.

بەبێ ڕەچاوکردنی ئەو هۆکارانەش کە بوونەتە مایەی دروستبوونی ئەو تێکەڵە مرۆییە

ئاڵۆزە، بێگومـان ئەو نەتەوە و گـرووپە ئەتنۆلۆژییـە جـۆراوجـۆرانە لە ڕێکخـستن و بەڕێوەبردنی خۆیاندا پەنا دەبەنە بەر لامەرکەزی، بەوجۆرەی کە ببێـتە مایەی پاراسـتنی تایبـەتمەندییە نەتەوەیی و ئایینی و تایفی و زمـانەوانی و کلتـوورییـەکانیـان، لێرەشـەوە لەوانەیە دڵسـۆزی ئەندامانی ئەو نەتەوە و تایفە هەمەڕەنگانە لە نێوان ئینتیمای تایبەتی خـۆیان و دڵسـۆزی بۆ نیشـتـمـان دابەش ببێ، بگرە زیادەڕۆیی نـیـیـە ئەگـەر بڵـێین ئەو تایبـەتمەندییـانە دڵسـۆزی بۆ ئینتـیـمـای ڕەگـەزی و ئـاییـنی و مـەزهەبی و زمـانەوانییـە تایبەتییەکان بەگرنگتر دادەنێن لە دڵسۆزی بۆ نیشـتمان، ئەمەش ڕاستییەکە و مایەی داخ و نائومێدییە.

هەروەها نـاکـرێ ئینکاری لەوەش بکەین کـە لـە کـۆمـەڵـگا فـرەلایەنەکـاندا جـیـاوازی لە نەتەوە یان ئایین یاخود مەزهەب و زمان و کلتوور دەبێـتە هۆکاری دوورخسـتنەوە و لەبەر یەک هەڵـوەشـانـدنەوەی کـۆمـەڵـگا نەوەک فـاکـتـەری یەکـخـستن یان کۆکـردنەوە و پێکەوە بەستنەوە، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر بەپێی گیانی سەردەم مامەڵە لەگەڵ ئەو فرەلایەنییانەدا نەکرێ، بەڵکو زۆر زەحـمەت ئەو تایبـەتمەندییە کۆمـەڵایەتییـە جیـاوازانە لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی یەکـبـوو و سـاکـاری بونیـادنـراو لەسـەر ناوەندیی تـونـد (المرکـزیة الشـدیدة) کـۆبکرێنەوە. هەرچەندیش ئـاسـتـی کـپکردنی تایبـەتمەندییـە جـۆراوجـۆرەکـانی نـاو ئەو کـۆمـەڵگایە زیاتـربێ، ئەوەندە فـاکـتـەرەکـانی لەبەریەک چوون و هەڵـوەشـانـەوە ڕوو لە زیادبوون دەکـەن، ئەمـەش دیاردەی ملـمـلانـێ و زاڵبـوون و تـاکـڕەویکردن لە دەسـەڵاتی لێ دەکـەوێتـەوە وێڕای پەرەسـەندنی کـاردانەوە لە ڕێگەی ڕەتکردنەوەی زاڵبـوون و مۆنۆپۆڵکردنی دەسەڵات لە لایەن هەندێک لەو تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییانەوە[٣] لەوانەیە ئەو ململانێیە مۆرکی توندوتیژی و توندوتیژی پێچەوانە بەخۆیەوە ببینێ، بگرە دوورنییە ململانێکە مۆرکی جموجۆڵی چەکداری و ئەو زەرەرمەندییە گیانی و داراییـیە گەورانە وەربگرێ کە بەر کۆمەڵگا دەکەون. بەم جۆرە دەردەکەوێ کە پۆشاکی یاسایی و دەستووریی دەوڵەتی یەکبوو وادیارە تەنگە و لەگەڵ فرەنەتەوەیی یان ئایینی و مەزهەبی و کلتووریدا ناگونجێ، بارودۆخی زیاتر لە حەفتا و پێنج ساڵەی عێراقی تازەش بەرچاوترین نموونەیە بۆ ئەو بۆچوونە، بۆیە هۆکـارە کـۆمـەڵایەتییـەکـان ئەوەمـان بەسـەردا دەسـەپێنن کـە بەدوای دۆزینەوەی ئەلتـەرناتیـڤێکی گونجاودا بگەڕێین، بەڵکو ئەمە حوکمی لۆژیکیشە بەرامبەر بەو هۆکارانەش دەکرێ بوترێ ئەو پۆشاکە یاسایی و سیاسییەی کە بەچاک دەزانرێ عێراق بیپۆشێ پۆشاکی فیدراڵی (دەوڵەتی یەکگرتوو)ە کە وای دەبینین لەگەڵ ئەو تایبـەتمەندییە

جۆراوجۆرانەدا دەگونجێ، ئەوکاتە ئەو فرەلایەنی و تایبەتمەندییانە دەبنە هۆکاری هێز لە قەوارەی کۆمەڵگەی عێراقیدا و پێگەو پایەشی پتەوتر و بەهێزتر دەکات.

لە لایەکی ترەوە دەبنە مایەی تێرکردنی ویست و خواستە تایبەتییەکانی نەتەوە و تایفە جیاوازەکان و دەرخستنی کەلەپوور و دابونەریتەکانیان و بەڕێوەبردنی بەشێکی گەورەی کاروباریان لە لایەن خۆیانەوە، کارێکی لەو جۆرەش پێویستی بەوە هەیە ئەو نەتەوە و تایفانە لەو کپی و نەبوونییە دەربچن کە ژیانی ماندوو کردوون، ئەمە وێڕای ئەو کاریگەرییە ئیجابییانەی لێی دەکەونەوە لە سووککردنی ناکۆکیی نەتەوەیی و ئایینی و نزیکبوونەوە و یەکگرتنی گرووپە هەمەجۆرەکان لەسەر بنەما نیشتمانی و پەیوەندییە هاوبەشەکان، کە دەبنە مایەی زیادکردنی ئاستی دڵسۆزی هەموو لایەک بەرامبەر بەنیشتمان و دواتریش بەخێر و خۆشی بۆ عێراق و سیستمە سیاسییەکەی دەگەڕێنەوە، هەروەها دەکرێ ئەزموونی دەوڵەتانی تری وەک سویسرا و کەنەدا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و هیند بکەین بەمەشخەڵێک بۆ ئەوەی لەو بوارەدا ڕێگەی ئایندەمان بۆ ڕووناک بکەنەوە.

**دووەم: هۆکارە ئابوورییەکان:**

هۆکاری ئابووری گرنگییەکی گەورەی هەیە لە ژیانی کۆمەڵگا و دەوڵەتاندا، لایەنە کۆمەلایەتی و سیاسی و یاساییەکانیش لە کۆمەڵگا دەوەستنە سەر ئەو فاکتەرە، مایەی ئاماژەپێکردنە کە لیژنەی لێکۆڵینەوەی پێکهێنراو لە لایەن کۆمەڵەی گەلانەوە لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٤ بەمەبەستی کۆڵینەوە لە چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ دوای ئەوەی دەری خست کە جیاکردنەوەی ویلایەتی مووسڵ لەو ناوچانەی کە لە ڕووی ئابوورییەوە پێیەوە بەستراونەتەوە شتێکی هەڵەو نادروستە، لیژنەی ناوبراو ڕایگەیاند کە لە دیدگای ئابوورییەوە، بەستنەوەی ئەو ویلایەتە بەعێراق گونجاوترین ڕێگەچارەیە چونکە بەشی زۆری بازرگانی و ویلایەتی مووسڵ کە کورد زۆربەی دانیشتوانی ئەو ویلایەتەیان پێک دەهێنا، لەگەڵ هەردوو شاری مووسڵ و بەغدا ئەنجام دەدرا و بازرگانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ تورکیا و ئێران و سوریاش ڕێژەیەکی کەمی پێک دەهێنا بەبەراورد لەگەڵ ئەو بازرگانییەی کە لەگەڵ عێراقدا هەیبوو. ئەمڕۆش دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە حەفتا ساڵ بەسەر ئەو ڕاپۆرتەدا و پاش ئەوەی ویلایەتی ناوبراو بەعێراق بەسترایەوە، لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەو

بازرگانییە ڕوویان لە زیادبوون کردووە، تەنانەت وای لێ هاتووە کە زۆر زەحمەتە یان ناکرێ لە ڕووی ئابوورییەوە هەرێمی کوردستان لە ناوچەکانی دیکەی عێراق جیابکرێتەوە، چونکە خەڵکی ئەو هەرێمە لە فرۆشتنی بەرهەمە کشتوکاڵی و ئاژەڵەکانیاندا پشت بەبەغدا و مووسڵ و ناوەندە بازرگانییەکانی دیکەی عێراق دەبەستن. لە بەرامبەریشدا دانیشتوانی ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق لە فرۆشتنی بەرهەمە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکانیاندا پشت بەبازارەکانی هەرێمی کوردستان دەبەستن و لەو ماوە تا ڕادەیەک دوورودرێژەشدا پەیوەندی ئابووری پتەو لە نێوان ناوچە جۆراوجۆرەکانی عێراقدا دروست بووە و هەر جۆرە دەستکاریکردنێکی ئەو پەیوەندییانەش دەبێتە مایەی گەیاندنی زەرەرمەندیی مادی گەورە بەجووتیار و بازرگانەکانی ناوچە جۆراوجۆرەکانی وڵات بەخودی دانیشتوانی کوردستانی عێراقیشەوە، واتە دەبێتە هۆی جیابوونەوە و دوورکەوتنەوەی بەروبووم و کەلوپەل لە بازارە سروشتییەکانیان. لە بەرامبەر ئەو ڕاستی و هۆکارە ئابوورییانەشدا پێکهێنانی یەکێتی فیدراڵی لە عێراق لەوانەیە ببێتە هۆی هێشتنەوەی قازانجە ئابوورییەکان بۆ زۆربەی ڕۆڵەکانی وڵات، بگرە دەبێتە مایەی بەهێزکردن و زیادکردنی ئەو قازانج و سوودانە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هێنانەدی ویست و خواستەکانی گەلی عێراقە بەعەرەب و کورد و کەمینەکانی تر.

### سێیەم: هۆکارە جوگرافییەکان:

پێشتر باسمان لە چۆنیەتی دروستبوونی عێراق کرد لە ڕێگەی پێکەوە بەستنەوەی ویلایەتەکانی بەغدا و بەسرا و مووسڵ. کوردی عێراقیش لە بەشی باشووری کوردستانی گەورە دەژین و لە ڕابردوودا زۆربەی زەوییەکانی ویلایەتی مووسڵی پێشووی پێک دەهێنا و ژمارەیان ٨/٥ دانیشتوانی ئەو ویلایەتە بووە[٤].

لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێونەتەوەیی پێکهێنراو بۆ کۆڵینەوە لە کێشەی ویلایەتی مووسڵ، لەو ڕاپۆرتەیدا کە خستبوویە بەردەم کۆمەڵەی گەلان باسی لەوە کردووە:

(ئەو تاکە گرووپە یەکگرتووانەی کە لە ناوچەی بەرفراواندا دەژین کورد و عەرەبن، ڕووباری دیجلەش هێڵی جیاکەرەوەی نێوان هەردوو ڕەگەزە تا دەگاتە زێی بچووک و ڕێگەی کەرکووک- کفری کە ڕوو لە باشوور دەکات).[٥]

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە کورد بەشێوەیەکی یەکگرتوو و جیاواز لە ناوچەیەکدا

دەژین کە لە زاخۆ لەسەر سنوورەکانی تورکیاوە درێژ دەبێتەوە تا خانەقین لە سنوورەکانی ئێران و زنجیرە بەرزاییەکانی حەمرین لە ناوچەکانی دیکەی عێراق جیایان دەکاتەوە. ئەمە جگە لە چەند گرووپێکی دیکە کە لە ناوچەکانی تری عێراق دەژین وەکو کوردە فەیلییەکان لە بەغدا و کوردی لوڕ لە کوت و عەمارە. بەم جۆرە بوونی کورد لە نیشتمانە یەک پارچە و جیاوازەکەیاندا هۆکارێکی بەهێزە بۆ پێکهێنانی فیدراڵی لە عێراق، چونکە ئەمە مانای بوونی هەرێمی یەک پارچە و جیاوازە کە مەرجێکی بنەڕەتی و پێویستە بۆ بونیادنانی فیدراڵی[٦] لەو بارەشەوە مایەی ئاماژەپێکردنە بەهێزترین بیانوو کە بەرهەڵستکارەکانی فیدراڵی پشتی پێ دەبەستن بوونی تێکهەڵبوونی دانیشتوانە لە ناوچەکانی لوبنان و نەبوونی ناوچەی جیاوازە کە تیایاندا زۆرینەی تایفە جیاوازەکان بژین[٧].

دکتۆر عوسام سلێمان بەو وتەیە ئەمە دووپات دەکاتەوە:

(لەو کۆمەڵگایانەدا کە تیایاندا گرووپ و تایفەکان تێکەڵی یەکتربوون، بەهۆی مۆرکی هەرێمییانەوە ناکرێ پشت بەفیدراڵی ببەسترێ)[٨]

**چوارەم: هۆکارە سەربازییەکان (بەرگرییەکان):**

هەرێمی کوردستان پێگەیەکی ستراتیژی گرنگ بۆ عێراق پێکدێنێ، بەتایبەتیش لە گۆڕەپانی ڕکابەری و ململانێی سیاسی و ئابووری و ستراتیژیدا لە پێناوی خۆ سەپاندن بەسەر ناوچەکەدا لە نێوان هەریەکە لە عێراق و تورکیا و ئێران.[٩]

بۆیە بەرژەوەندی عێراق وەک چۆن بەرژەوەندی هەرێمی کوردستانیشە، لەوەدایە کە وەکو یەک قەوارە بمێنێتەوە و سیستمی فیدراڵیش پیادە بکرێ کە دەبێتە مایەی پتەوکردنی پێگەو ڕۆڵی عێراق لە ناوچەکەدا و دەشیکات بەهێزێکی سەربازی و ستراتیژی پایەدار لە ناو جەرگەی ململانێی هەرێمی و نێودەوڵەتی هەنووکەییدا، هەروەها لە بەرژەوەندی هەرێمی کوردستاندایە کە لە چوارچێوەی عێراقی فیدراڵیدا بێ چونکە ئەمە دەبێتە قەڵغانێکی پارێزەر بۆی لە دژی تەماعکارییە هەرێمییەکان کە لەوانەیە لە باکور یان لە ڕۆژهەڵاتەوە سەرهەڵبدەن. بەواتایەکی تر جیابوونەوەی هەرێمی کوردستان لە عێراق دەبێتە مایەی لاوازکردنی پێگەی ستراتیژی عێراق و توانای بەرگریکردن لەخۆی.

لە لایەکی دیکە هەرێمی جیابووەوە دەکاتە قەوارەیەکی لاواز بەجۆرێک نەتوانێ بەرامبەر بەتەماع و هێزی دراوسێکانی بوەستێ و بەرگری لە خۆی بکات.

## پێنجەم: کلتووری هاوبەش:

بێگومان هاوسێیی و پێکەوەژیانی دوو میللەت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ و هاوبەش بوونیان لە خۆشی و ناخۆشییەکاندا دەبێتە مایەی سەرهەڵدان و دروستبوونی دابونەریت و بیرەوەری هاوبەش.

هەروەها ئەو هاوسێیییە بۆتە هۆی دروستبوونی تێکەڵی لە نێوان هەردوو میللەتدا لە ڕێگەی ژنهێنان و توانەوەدا. لەو ڕووەوە مونزر مووسڵی دەڵێت:

(خاڵی پێکگەیشتن و تێکەڵبوونی دیکە هەن هەردوو میللەت لە یەک نزیکتر دەکەنەوە لە سەرروویانەوە کلتووری هزری و ڕۆشنبیری و ئەدەبی و پەیوەندی خزمایەتی و توانەوەی بەردەوام، هەر لە کۆنەوە تا سەردەمی ئێستامان بەحوکمی پێکەوە ژیان و هاوسێیەتی و پەیوەندییە زۆرەکانی تر، لە ئەنجامی هەموو ئەمانەشدا تاکە کلتوورێک دروست بووە و هەر دوولایەنی عەرەبی و کوردیش لە ئاگاداربوون لە چۆنیەتی بەرز ڕاگرتن و ژیاندنەوەی و گەیاندنی بەنەوەکانیان بەیەک دەگەن).[١٠]

لە میانەی دیراسەکردنی هۆکارە مێژووییەکانی عێراقی تازەشدا، بەشداربوونی عەرەب و کوردمان لە زۆر شۆڕش و ڕاپەڕینی میللیی وەک شۆڕشی بیست بۆ دەرکەوت، ڕاپەڕینی ئیبراهیم خان لە ناوچەی کفری و هێرش بردنی هەندێک هۆزی کوردی بۆ سەر بنکەکانی داگیرکارانی بەریتانی لەبارترین نموونەیە بۆ ئەو بەشداریکردنە.[١١]

ڕیاز ڕەشید حەیدەری لە کتێبی (ئاشوورییەکان)دا دەڵێت:

(بەشێوەیەکی گشتی، ساڵی ١٩٢٠ ساڵی شۆڕش بوو لە عێراق، تیایدا هەموو چین و توێژەکانی گەلی عێراق بەشدارییان کرد، چ عەرەب و چ کورد، ئینگلیزەکانیش لەسەر دەستی شۆڕشگێڕان لە هەموو شوێنێکی خاکی عێراقدا وەکو گەڵای پایزان هەڵدەوەرین)[١٢]

وەک پێشتریش بینیمان کورد لە پاڵ برا عەرەبەکانیاندا بەشدارییان لە زۆربەی ڕاپەڕینەکانی گەلی عێراقدا کردووە. لە لایەکی دیکە کورد بەشدارییان لە پلاندانان بۆ شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ و جێبەجێکردنیدا کرد لە ڕێگەی بەشداربوونی ژمارەیەک ئەفسەری کورد لە ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازدا(١٣) لێرەوە دەکرێ بوترێ کە ئەو کلتوورە هاوبەش و پەیوەندییە هاوبەشانە هۆکاری بەهێزن بۆ پێکهێنانی سیستمی فیدراڵی لە عێراقدا.

**شەشەم: پەیوەندی ئایینی هاوبەش:**

دەکرێ بوتری پەیوەندی ئیسلام بەهێزترین پەیوەندییە کە عەرەب و کورد لە عێراق پێکەوە گرێ بدات، پیرۆزی ئەو پەیوەندییەش لەو کاتەدا دەردەکەوێ کاتێک دەرک بەو خۆشەویستی و گەورەیییەی کورد بکەین کە بەرامبەر بەئایینەکەیان هەیانە و ڕێژەی زیاتر لە ٩٥ ٪ی کوردی عێراقیش موسڵمانی سوننە مەزهەبن. دەبێ ئەوەش بزانین ئەو پایە گەورەیەی کە ئایین لەلای گەلی کورد هەیەتی بۆتە هۆی ئەوەی تەریقەتە سووفییە جۆراوجۆرەکانی وەک نەقشبەندی و قادری بەچڕی لە کوردستانی عێراقدا بڵاوببنەوە.

بەڵکو زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بوترێت کورد خزمەتی گەورە و بەرچاویان پێشکەش بەئایینی ئیسلامی پیرۆز کردووە، نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ کە قودسی پیرۆز لەسەر دەستی سەرکردەی گەورە سەلاحەدینی ئەیووبی لە دەستی داگیرکارە خاچپەرستەکانەوە ڕزگارکراوە، لە لایەکی دیکە کورد ژمارەیەکی بەرچاوی زانای وەک ئیبن خولەکان و ئیبن مستەوفی و زۆری دیکەشی لێ وەدەرکەوتوون کە خزمەتی گەورەی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبییان کردووە.

لەو ڕووەوە مونز مووسلی دەڵێت:

(ڕاستە وەک مێژوو باسی لێوە دەکات، ئیسلام عەرەبی لەگەڵ چەندین گەلی دیکەی جیهان پێکەوە گرێ داوە... بەڵام پەیوەندی لەگەڵ کورد تام و چێژی تایبەتی هەیە چونکە هەڵقولاوی شتی واقیعیی دیارە). (١٤)

**پەراوێزەکانی بەشی یەکەم**

(١) دکتۆر خالید قەبانی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٠١.

(٢) بڕوانە ل ٥٥- ٨٥ی ئەو تێزە.

(٣) دکتۆر خالید قەبانی، سەرچاوەی پێشوو ل ٢٠٤

(٤) بەپێی ڕاپۆرتی لیژنەی نێونەتەوەیی، لە دکتۆر فازیل حوسێن- سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٧ وەرگیراوە. لەگەڵ زانینی ئەوەی کە لیژنەکە یەزیدییەکانی بەکورد دانەناون، لە کاتێکدا بەشی زۆری مێژوونووسان لەسەر کوردبوونیان کۆک بوون.

(٥) دکتۆر فازیل حوسێن- سەرچاوەی پێشوو- ل ١٠٢.

(٦) دکتۆر عوسام سلێمان- سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٤.

(٧) سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٥.

(٨) سەرچاوەی پێشوو- ل ٤٧.

(٩) دکتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢.

(١٠) موقەدەم مونز مووسڵی- عرب واکراد - رؤیة عربیة للقضیة الکردیة- دار الغصون- بەیروت- چاپی یەکەم ١٩٨٦.

(١١) لە درێژەی ئەمە بڕوانە: دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد- دور الشعب الکردي في ثورة العشرین العراقیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ١١٥- ١٥٤- ٢٢٣.

(١٢) لە: دریە عەونی- عرب و أکراد- خصام أم وئام- دار الهلال، شوێنی چاپکردنی دیارنییە - ژمارەی چاپ یان ساڵی چاپکردنی دیارنییە- ل ٧٧ وەرگیراوە.

(١٣) لەیس حەسەن زوبێدی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٨٧.

(١٤) مقەدەم مونز مووسڵی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٢٣.

## مەرجەکانی سەرکەوتنی سیستمی فیدراڵی لە عێراق

ناکرێ فیدراڵی بەرێگەچارەیەکی ئامادەکراو و قابیل بەجێبەجێکردن دابنرێ بەبێ بوونی بارودۆخ و هۆکارە پێویستەکان بۆ سەرکەوتنی، پێشتر رووغان کردەوە کە زۆر حاڵەت هەن تیایاندا فیدراڵی وەکو سیستمی حوکم گیراوەتەبەر، بەڵام لە کاتی پەیرەوکردنیان لەگەڵ واقیعی ناگونجاو و نالەباردا، لەکاتی جێبەجێکردن شکستیان هێناوە. دەکرێ گرنگترین مەرجەکانی سەرکەوتنی سیستمی فیدراڵی لە عێراق لە مانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

### یەکەم: مەرجی شارستانی و دەروونی:

فیدراڵی سیستمێکی شارستانی پێشکەوتووی حوکمە و گرتنەبەر و جێبەجێکردنیشی پێویستی بەئاستێکی گونجاوی مامەڵەی شارستانی هەیە لە لایەن هەموانەوە، ئەمە چ لەسەر ئاستی هەرێمی فیدراڵی بێ یان لەسەر ئاستی کۆمەڵگەی پەیوەندار و چوارچێوەی یەکێتی بەشێوەیەکی گشتی، ئەزموونە سەرنەکەوتووە فیدراڵییەکانیش لە ئەمریکای باشوور و ناوەندی راستی ئەم بۆچوونە دەردەخەن. لە عێراقیش ئەگەرچی ماوەیەکی دوورودرێژ کورد بەسیستمی فیدراڵی رازی بوون و چاوەرێش دەکرێ دۆستە عەرەبەکان و کەمەنەتەوەکانی دیکە دەرفەتی پیادەکردنی ئەو جۆرە دەسەڵاتەیان پێ ببەخشن، لە پێناوی هێنانەدی ویست و خواستە رەواکانیان لە چوارچێوەی نیشتمانی عێراقی گەورەدا و زەروورەتی هاتنە کایەی قەناعەتی زۆرینەی رۆڵەکانی گەلی عێراق بەو مومارەسە یاسایی و سیاسییە، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی رێگە لە دابەشبوونی قەوارەی ئەو وڵاتە دەگرێ و یەکێتی خاک و گەلەکەشی دەپارێزێ، پیادەکردنیشی قازانجی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی زۆر بۆ هەموو رۆڵەکانی عێراق دەگرێتە خۆی، بەو پێیەی هەموو شێوازەکانی هەستکردن بەزوڵم و ستەم و نەبوونی ناهێڵێ و هەموو ئەو رێگایانەش دەبرێ کە دەبنە مایەی توندوتیژی و دژە توندوتیژی.

دەکرێ بوترێ کە یەکێک لە شێوازەکانی پێکهێنانی ئەو رۆشنبیرییەی کە بەرۆشنبیری فیدراڵی ناوی دەبەین بریتییە لە بەشداربوونی لایەنە رەسمییە پەیوەندارەکان لە رێگەی

شێوازەکانی ڕاگەیاندنی هەمەجۆرەوە لە ناساندنی سروشتی ئەو سیستەمە و سنوورەکانی و ئاسەوارە ئیجابییەکانی بەڕۆڵەکانی میللەت، بەو پێیەش کە لە دوو دەوڵەتی زلهێزی جیهاندا کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوون ئەو سیستەمە پیادە دەکرێ و لەهەمان کاتدا حوکمی نزیکەی سێ چارەگی دانیشتوانی گۆی زەوی دەکات. تێبینی ئەوەش دەکەین کە لە ناو تەواوی ڕۆڵەکانی گەلی عێراقدا دیمەنی فیدراڵی و سیماکانی دیار و ئاشکرانین، بگرە لەنێو زۆرینەی ڕۆشنبیر و سەرکردەی حزب و پیاوانی حوکمدا ئەو دیاردەیە هەیە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بۆتە مایەی ترس لە پیادەکردنی ئەو سیستەمە بەر لەوەی شارەزای ناوەڕۆکەکەی بن. دەکرێ بوترێ لە دوای بڵاوبوونەوەی ڕاستییەکان سەبارەت بەفیدراڵی لە شەقامی عێراقیدا، ویست و حەزی عێراقییەکان بۆ پیادەکردنی ئەو سیستەمە بەهێز و پتەو دەبێ، بەشێوەیەک کە بوار بەنەتەوە و تایفەکان دەدات کە لە چوارچێوەی وڵاتی یەکگرتوودا خۆیان حوکمی خۆیان بکەن بەبێ ئەوەی بگاتە ئاستی جیابوونەوە. لە کاتێکیشدا ئەگەر پلەیەکی گونجاوی هەستکردن بەبەهای سیستەمی فیدراڵی و سوودە جۆراوجۆرەکانی سەرهەڵبدات، ئەمە دەبێتە زەمانەتێکی بنەڕەتی بۆ سەرکەوتنی پیادەکردنی ئەو سیستەمە، بەپێچەوانەی ئەمەش شکستیی چاوەڕێی ئەو ئەزموونە دەکات وەکو تەواوی ئەزموونەکانی دیکە لە گۆڕەپانی چارەسەرکردنی مەسەلەی کورددا کە هەڵقوڵاوی قەناعەت و ویستی چارەسەرکردنی مەسەلەکە نەبوون بەقەد ئەوەی شێوازی تەکنیکی کاتیی بوون لە لایەن حکوومەتەکانی بەغداوە بەمەبەستی لە پشت سووڕانەوە لە بزووتنەوەی کوردی و لێدانی لە شوێنێکی دیکەوە.

**دووەم: سیستمی دیموکراسی**

زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین سیستمی فیدراڵی تەنیا لە سایەی سیستمی دیموکراسیدا نەبێ ناتوانێ گەشە بکات و بەردەوام بێ، چونکە دیکتاتۆریەت بەتاکە حزبەکەیەوە و بەرەتکردنەوەی هەڵبژاردنی ئازاد- وەک پێشتر باسمان کرد- لەگەڵ سروشتی بنەمای فیدراڵیدا گونجاو و ڕێک نییە. پێوەرە هەمیشەیی و هاوچەرخەکانی حکوومەتی دیموکراتیش دەکرێ لە چەند بناغە یان بنەمایێکدا دەربکەون، لە سەروویانەوە ئەوە دێت کە هەردوو دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی لەو حکوومەتەدا لەسەر ئەساسی هەڵبژاردنی ئازاد و نهێنی و ڕاستەوخۆ لە لایەن ڕۆڵەکانی گەلەوە بونیاد نرابن، چونکە ئەمە

دووپاتکردنەوەی ئەو بنەمایەیە کە میللەت بەسەرچاوەی دەسەڵاتەکانی دەزانێ و مانای ئەوەش دەبەخشێ کە هیچ کەسێک یان لایەنێک بۆی نەبێ حوکم بکات ئەگەر پێشتر ڕێگەی پێ نەدرابێ.

دەبێ بزانرێ هەڵبژاردن ئەو شێوازەیە کە ئەو سەرچاوەی دەسەڵاتە و دەتوانێ شەرعییەت بەدەسەڵاتداران ببەخشێ چونکە نوێنەرە شەرعییەکانی میللەت بەتەنیا مافی ئەوەیان هەیە کە بەوەکالەت ئەو دەسەڵات بگرنە دەست.[١]

سەرەڕای ئەوە حکوومەتی فیدراڵی لەسەر بناغەیەکی گرنگی دیکەشەوە سەردەگرێ ئەویش بنەمای جیاکردنەوەیە لە نێوان دەسەڵاتەکان The Separation of powers. هەمان ئەو بنەمایە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی و دادوەری نەخرێنە ژێر دەستی یەک دەزگای ناو دەوڵەت، بەڵکو ئەو دەسەڵاتە ناوبراوانە دەبێ بەشێوەیەک لە شێوەکان لە نێوان سێ دەزگای جیاوازدا دابەش بکرێن.

دەکرێ بوترێ کە بوار هەیە بۆ ئەوەی لە مەیدانی پراکتیکیدا چەمکی تیۆری ڕەهای ئەو بنەمایە سووک بکرێ لە ڕێگەی بەشداربوونی هەردوو دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی لە بەشێک لە تایبەتمەندییەکانی یەکتردا وەک چۆن لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەدی دەکرێ، بەڵکو هەندێک سیستەمی فیدراڵی وەک کەنەدا و ئوستralia و هیند کە سیستەمی پەرلەمانی پیادە دەکەن، پەنایان بردۆتە بەر سیستەمی کابینەی وەزاری کە نوێنەرایەتی حزب یان هاوپەیمانێتی زۆرینەی پەرلەمان دەکات، دەریشکەوتووە کە ئەمە پێچەوانەی بنەمای فیدراڵی نییە[٢] ویبر Wheare دووپاتی دەکاتەوە کە پیادەکردنی بنەمای جیاکردنەوە لە نێوان دەسەڵاتەکاندا باشتر یارمەتی کاری حکوومەتی فیدراڵی دەدات[٣].

لە لایەن خۆشمانەوە دەکرێ بڵێین کە پشتگوێ خستنی ئەو بنەمایە و ڕەچاونەکردنی سیستەمی پەرلەمانی یاخود ئەنجوومەنی کارپێکراو لە سویسرا لە لایەن حکوومەتی ئیتحادەوە مانای ئەوە دەبەخشێ کە ئەو حکوومەتە پایەیەکی گرنگی لە پایەکانی سیستەمی دیموکراتی لە دەست داوە، ئەمە ئەگەر بەڵگەیەک نەبێ بۆ ئەوەی ئەو حکوومەتە خاوەنی مۆرکێکی دیکتاتۆریانەیە بەهۆی ئەگەری مانەوەی دەسەڵات لەدەستی یەک دەزگا و تاکە کەسێکدا. گەلی عێراقیش بەعەرەب و کورد و کەمینەکانییەوە پێویستییەکی زۆری بەگرتنەبەری ئەو بنەمایە هەیە چونکە ترسی ئەوەمان لێ دوور دەخاتەوە کە دەزگا یان یەک لق یان تەنانەت یەک کەس هەموو دەسەڵاتەکانی بەدەست بێ و بیانکات بەئامێر

بەدەستی خۆیەوە و بەویستی خۆی ئاراستەیان بکات کە خۆی لەخۆیدا وڵات بەرەو کارەسات و مەینەتیی لەبن نەهاتوو دەبات.

سەبارەت بەئاستی جێبەجێکردنی ئەو بنەمایەش لە سیستەمە دەسەڵاتدارە یەک لەدوایەکەکانی عێراقی تازەدا، دەکرێ بوترێ کە لەسەردەمی پادشایەتیدا جیاکردنەوەیەکی هێمایی لە نێوان دەسەڵاتەکاندا بەدی کراوە لە ژێر سایەی یاسای بنەڕەتیی عێراقیدا کە لە ٢١ی ئاداری ساڵی ١٩٢٥ دەرچووە و تاڕادەیەکیش سیستەمی پەرلەمانی گرتەبەر[٤] کە لە هەندێک لە لایەنەکانیدا لە سیستەمی پەرلەمانی بەریتانی دەچوو، چونکە ئەوکاتە عێراق لە ژێر ئینتیدابی بەریتانیدا بوو. بەڵام دەکرێ بوترێ کە سیستەمی پەرلەمانیی کارپێکراو لە عێراق لە چەمکە ڕاستەقینەکەی خۆی لادا، لەو بارەوە دکتۆر فائز عەزیز ئەسعەد دووپاتی دەکاتەوە کە:

(ئەو لادان لە سیستەمە پەرلەمانییەی کە عێراق لە ساڵی ١٩٢٥ تا ساڵی ١٩٥٨ بەخۆیەوە دیت، لادانێکی دەستووری و کردەیی بوو، لە ڕێگەیەوەشا پادشا توانی هەژموون بەسەر وەزارەت و ئەنجوومەنی گەلدا بسەپێنی)[٥]

ئەمە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە حکوومەتە یەک لە دوایەکەکانی سەردەمی پادشایەتی دەستکاری هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەنجامەکانیان دەکرد بۆ ئەوەی بوار بۆ پاڵێوراوانی حکوومەت خۆش بێ کە کورسییەکانی ئەنجوومەن مسۆگەر بکەن[٦] جگە لەوە ئەندامانی ئەنجوومەنی ئەعیانیش لە لایەن پادشاوە هەڵدەبژێردران[٧].

سەبارەت بەبارودۆخیش لە سەردەمی کۆمارییدا، ئاشکرایە کە عێراقی کۆماری تا ئێستاش دەستوورێکی هەمیشەیی بەخۆیەوە نەدیتووە، بەڵکو تا ئەمڕۆ کار بەدەستوورە کاتییەکان دەکرێ، یەکەمیان ئەو دەستوورە کاتییە بوو کە لە ٢٧ی تەمووزی ١٩٥٨ و دواییینیان لە ١٦ی تەمووزی ١٩٧٠ دەرچوو کە دواتر ناوی بەدەستووری هەمیشەیی گۆڕدرا بەبێ هیچ گۆڕان یان هەمووارکردنێک لە بڕگەو دەقەکانیدا.

هەرچەندە لەسەردەمی پادشایەتیدا بەشێوەیەکی ناتەواو و نابەجێ بنەمای جیاکردنەوە لە نێوان دەسەڵاتەکاندا پیادەکرا، زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین سەردەمی کۆماری هیچ جۆرە پیادەکرنێکی لەو جۆرەی بەخۆوە نەدیت، هەروەها پێچەوانەی ڕاستییەکان نابین ئەگەر بڵێین کە پشتگوێ خستنی ئەو بنەمایە هاوکات لەگەڵ فەرامۆشکردنی بنەما دیموکراسییەکانی دیکە هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەو بارودۆخە سیاسییەی کە عێراق تێی

کەوت و ئەو مەینەتی و نەبوونی و قوربانییە گەورانەش کە دووچاری گەلەکەی بوونەوە. ئەو وێرانکارییە بێ شومارەی کە بەری کەوت بێگومان بۆ ماوەی دەیان ساڵ عێراق لە کاروانی شارستانییەتی هاوچەرخ دوادەخات، ئەمە وێڕای ئەو زەلیلی و مردنە زۆرەی کە لە ئەنجامی نەبوونی خۆراک و داوو دەرمانەوە ڕووبەڕووی ڕۆڵەکانی بووەوە، لەکاتێکدا کە وڵاتەکەیان بەیەکێک لە دەوڵەمەندترین دەوڵەتانی جیهان دەژمێردرێت.

**سێیەم: فرەحزبی:**

پێشتر باسمان لەوە کرد کە گرنگترین ئەو هۆکارانەی لە ڕێکخستن و ڕێڕەوی کاری حکوومەتی فیدراڵیدا خاوەنی ڕۆڵی سەرەکین، بوونی فرەحزبییە، واتە بوونی زیاتر لە حزبێکی خاوەن ڕۆڵی کاریگەر لە گۆڕەپانی نیشتمانیدا، بەواتایەکی دیکە، وازهێنان لە سیستمی تاکە حزب یان حزبی سەرکردە، چونکە ئەو سیستمە لەگەڵ سروشتی حکوومەتی فیدراڵی و بنەمای دابەشکردنی دەسەڵاتەکان تیایدا لە نێوان حکوومەتی ئیتیحاد و حکوومەتەکانی دەوڵەتانی ئەندامدا ناگونجێ، بینیشمان کە هەموو ئەزموونە فیدراڵییە سەرکەوتووەکان لەسەر ئاستی یەکێتیدا زیاتر لە حزبێکیان گرتۆتە خۆیان. ئەوەشمان ڕوون کردەوە کە لە یەکێتی سۆڤیەتدا سیستمی تاکە حزب گیرایە بەرو ئەمە هەر لە سەردەمی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ەوە تا کۆتایی هەشتاکانی خایاند و جەختکردنەوەیەکی توندی دەسەڵاتیشی بەخۆیەوە دیت، بەجۆرێک ئەو حزبە دەستی بەسەر هەموو دامودەزگاکانی حوکم و کەناڵەکانیدا گرتبوو، هەر ئەمەش بووە مایەی سەرهەڵدانی بانگەشەی بەهێز بۆ ئەوانەی ڕەتیانکردەوە کە سیستمی حوکمی سۆڤیەتی بەسیستمی فیدراڵی دابنێن، سەرەڕای دانانی ڕاشکاوانەی دەستووری یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییە سۆڤیەتییەکان بەفیدراڵیەت[٨].

لە عێراقیش ئەگەر بویسترێ یەکێتییەکی فیدراڵی سەرکەوتوو و زیندوو بونیاد بنرێ، دەبێ پەنا ببرێتە بەر فرەحزبی، لەو باوەڕەشداین کە دکتۆر حەسەن چەلەبی لەو بارەوە جەرگەی ڕاستییەکانی پێکاوە کاتێک وتوویەتی:

(دەبێ سیستمی تاکە حزبی یان حزبی سەرکردە وەلاوە بنرێ بەهۆی نەگونجانی تەواوی لەگەڵ ناوەڕۆک و مانای فیدراڵی و دانانان بەفرەلایەنی سیاسی و حزبیدا، ئینجا ئەمە چ لەسەر ئاستی یەکێتی بێ یان لەسەر ئاستی ئەو هەرێمانەی کە پێکی دێنن)[٩].

دەبێ ئەوەش بڵێین کە ڕێگەدان بەئازادییە سیاسییەکان لەوانەیە ببێتە مایەی بوار خۆشکردن بۆ حزبە سیاسییەکان لەوەی چالاکییە ئاشکراکانیان ئەنجام بدەن و حزبی تازەش دروست ببن و لەسەر ئاستی یەکێتی و هەرێمەکانیشدا و فرەحزبی سەر هەڵبدات، سەرەڕای کاریگەرییە سیاسییە دیموکراسییەکانیش دوورنییە ئەمە ببێتە مایەی پتەوکردنی پەیوەندییەکان لەنێوان یەکێتی و هەرێمەکاندا.

**چوارەم: سەربەخۆیی دارایی هەرێمە ئەندامەکان:**

بەهرەمەندبوونی دەوڵەتانی ئەندام بەسەربەخۆیی دارایی یەکێکە لەو بنەمایانەی کە لە سیستمی فیدراڵیدا بڕیاری لەسەر دراوە، بەجۆرێک ئەو هەرێمانە خاوەنی بودجەی تایبەت بەخۆیان بن کە بەپێی سیستمی فیدراڵی لە باجە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکان پێکدێت کە لە چوارچێوە و سنووری ویلایەتدا دەیانسەپێنێت، جگە لەو باجانەی کە دەخرێنە سەر ئەو مۆڵەت و ڕێ پێدانانەی بەهاوولاتیان دەبەخشرێن و داهاتەکانی موڵک و ماڵە گشتییەکان و کرێی ئەو خزمەتگوزارییانەی کە بەهاوولاتیانیان دەبەخشن و داهاتەکانی مامەڵە بازرگانی و بانکییەکان کە لە ناو سنووری هەرێمدا ئەنجامیان دەدەن، ئەو بودجەیە لەو بەخشش و یارمەتییە داراییانەش پێک دێ کە حکوومەتی ئیتحادی پێیان دەدات.

دەربارەی هەرێمە فیدراڵییەکانیش لە عێراق، پێمان وایە کە سەرکەوتنیان دەوەستێتە سەر ئاستی سەربەخۆیی دارایی و گونجانیان، ئەمەش دەکرێ وەدی بهێنرێ لە ڕێگەی بەخشینی توانای داڕشتنی بودجەی تایبەت بەهەرێمەکان و وەرگرتنی ڕەزامەندی کۆتایی لە بارەیانەوە بەئەنجوومەنە تەشریعییەکان لە هەرێمەکان، ئەمە سەرەڕای بەخشینی دەسەڵاتی سەپاندنی باجەکان و زیادکردن و لادانیان لە ناو هەرێمدا کە هاوکات لەگەڵ باجە ئیتیحادییەکان دەسەپێنرێن و لە هەموو دانیشتوانی ئیتحادیش وەردەگیرێن.

ئەو هەرێمانە دەبێ مافی دامەزراندنی بانکە خۆجێیەکانیشیان پێ بدرێ کە لە چوارچێوەی سنووری هەرێمدا مامەڵە دەکەن، بەمەبەستی وەدیهێنانی قازانجی دارایی لەو جۆرە کردەوە بازرگانییانەدا، ئەمە وێڕای بوونی مافی ئەو هەرێمانە لە داهاتی پڕۆژە پیشەسازی و کردەوە بازرگانی و پڕۆژە کشتوکاڵی و بەرهەمهێنانە ئاژەڵییەکان کە لە سنووری هەرێمدا کاردەکەن. لە لایەکی دیکەوە هەموو ئەو باج و گومرگ و کرێیانەی کە

لە ناو سنووری ئەو هەرێمانەدا وەردەگیرێن دەبێ داهاتێک بۆ خەزێنەی هەرێم پێک بێنن و بۆ بودجەی هەر هەرێمێکیش ۳۰٪ی کۆی داهاتی ئەو نەوت و غاز و کانزا و سامانە سروشتییانەی کە لە خاکەکەیدا دەردەهێنرێن، تەرخان بکرێ.

یەکێک لە گرنگترین مەرجەکانی سەربەخۆیی دارایی هەرێمە ئەندامەکان لە عێراقی فیدراڵی، داننانە بەمافی بەستنی رێککەوتنی خاوەن سروشتی بازرگانی لەگەڵ لایەنە بیانییەکان، بەمەرجی ئاگادارکردنەوەی لایەنە ئیتیحادییەکان و وەرگرتنی ڕەزامەندی لە بارەیانەوە بەر لە چوونیان بۆ قۆناغی جێبەجێکردن.

لە دابەشکردنی وەبەرهێنان و ئیتعتیمادات و داهاتە داراییەکانیشدا کە حکوومەتی ئیتیحادی لە تەواوی وڵاتدا پێی هەڵدەستێ، دەبێ ڕەچاوی قەبارە و ڕووبەرو چڕی دانیشتوانی هەرێمەکان بکرێ.

بەم جۆرە ئومێد دەکرێ بودجەی هەرێمی فیدراڵی لەمانەی خوارەوە پێک بێت:

١- باجی خانووبەرەی بنەڕەتی و زیادکراو و عەرەسات لە چوارچێوەی سنووری هەرێمدا.

٢- باجی داهات و میرات (تەرکە) لە ناو هەرێمدا.

٣- باجی زەوی کشتوکاڵی و پارەی بەکرێدانی ئەو زەوییانە.

٤- باجەکانی تۆماری خانووبەرەو باجی جۆرەکانی مۆڵەت و وەکالەت و ئەو خزمەتگوزارییانەی بەدانیشتوانی هەرێم پێشکەش دەکرێن و باجی تۆمارکردنی ئۆتۆمۆبێل و هۆکارەکانی دیکەی گواستنەوە.

٥- داهاتی شارەوانییەکان لە ناو هەرێمدا.

٦- داهاتی مامەڵە بانکی و بازرگانییەکان کە لە ناو سنووری هەرێمدا ئەنجام دەدرێن.

٧- داهاتی پرۆژە پیشەسازی و کشتوکاڵییەکان و بەرهەمهێنانی ئاژەڵی لە ناو هەرێمدا.

٨- ئەو داهاتانەی کە لە سنووری هەرێمدا لە موڵکە گشتییەکان دەست دەکەون.

٩- ۳۰٪ی داهاتەکانی نەوت و غاز و کانزا و سامانە سروشتییەکانی دیکە کە لە خاکی هەرێم دەردەهێنرێن.

## پەراوێزەكانی ئاخافتنی دووەم

(١) دكتۆر مونز- شاوی- سەرچاوەی پێشوو- ل ٩٤.

(2) K . C. wheare, op. cit page 82.

(3) Op. cit page 83.

(٤) دكتۆر فائز عەزیز ئەسعەد- انحراف النظام البرلماني في العراق- چاپخانەی سندباد- چاپی دووەم ١٩٨٤- ل ٢٩.

(٥) سەرچاوەی پێشوو- ل ٣٢.

(٦) لە درێژەی ئەمە بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو- ل ١٧٩- ٢٠٤.

(٧) مادەی ٢٦- بڕگەی شەشەم لە یاسای بنەڕەتیی عێراقی ساڵی ١٩٢٥.

(٨) دەربارەی ڕەتكردنەوەی وەسفكردنی سیستمی حوكمی سۆڤیەتی بەفیدراڵی بڕوانە: دكتۆر حەسەن چەلەبی- القانون الدولي العام- سەرچاوەی پێشوو- ٢٤٣- ٣٤٦.

- دكتۆر محەمەد كامیل لیلە- النظم السیاسیة- چاپی ١٩٦٧- ١٩٦٨- ل ١٥٣ پەراوێز.

K . C. wheare, op. cit page 25 -26

(٩) دكتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٦.

## ئاخافتنی سێیەم

# سیماکانی ڕێکخستنی دەستووریی عێراقی فیدراڵی

لەوەی پێشەوە دەردەکەوێ کە فیدراڵی سیستمێکی یاسایی سیاسیی ئاوێتەیە و بنەماو ڕێسای دیاریکراویش دەگرێتە خۆی سەبارەت بەوەی کە پەیوەندی بەدامودەزگا دەستوورییەکانەوە هەیە، ئینجا چ ئیتیحادی یاخود هەرێمی بن، هەروەها سەبارەت بەوەی پەیوەندی بەسنوور و دەسەڵات و تایبەتمەندییەکانی ئەو دامودەزگایانەوە هەیە کە دەبێ لە لایەن دەستووری ئیتیحادییەوە دەستنیشان بکرێ.

بڕیاردانیش لەسەر گرتنەبەری فیدراڵی لە عێراق پێویستی بەگۆڕینی شێوازی دەوڵەت هەیە لە دەوڵەتی یەکبووی ساکارەوە بۆ دەوڵەتی ئاوێتەی یەکگرتوو. ئاسەوارە گەورە و بنەڕەتییەکانی ئەو گۆڕانکارییەش بۆ سەر پەیکەری دەستووری دەوڵەتی عێراق لەکەس شاراوەنین، لە سەرووشیانەوە پێکەوەژیانی چەند قەوارەیەکی سیاسییە لە ناو ئەو دەوڵەتەدا لەجیاتی بوونی یەک قەوارەی سیاسی و ئەوەی لێی دەکەوێتەوە لە دابەشکردنی تایبەتمەندی و دەسەڵاتەکان لە نێوان ئەو قەوارانەدا بەپێی دەستووری فیدراڵی و ڕێزگرتنی حکوومەتی ئیتیحادی و حکوومەتە هەرێمییەکان بۆ ئەو دابەشکردنە، لەو باوەڕەداین کە دانانی پڕۆژەی دەستووری عێراقی فیدراڵی لە چوارچێوەی ئەرکی ئەو تێزە دەچێتە دەرەوە.

بەڵام لەجیاتی ئەوە دەبێ گرنگترین سیماکانی ڕێکخستنی دەستووری ڕوون بکەینەوە و دەربخەین لە کاتێکدا ئەگەر عێراق سیستمی فیدراڵی بگرێتە بەرو کاری پێ بکات، لەو بارەشەوە وای بەباش دەزانین باس لە دابەشکردنی هەرێمەکانی عێراقی فیدراڵی بکەین و ، هەروەها ئەو دەزگا ئیتیحادی و ئەرک و تایبەتمەندی و دامودەزگایانەش ڕوون بکەینەوە کە حکوومەتە هەرێمییەکان بەتایبەتی و سیستمی فیدراڵی بەگشتی پێویستییان پێیان هەیە، ئەمە سەرەڕای ڕوونکردنەوەی زەروورەتی بوونی دادگای باڵای دەستووری کە دەبێ ببێتە چاودێرێکی بێ لایەن بەسەر پیادەکردنی دەستووری ئیتیحادی. لە بڕگەکانی داهاتووشدا یەک لە دوای یەک ئەم بابەتانە دەخەینە ڕوو:

**یەکەم: هەرێمەکانی عێراقی فیدراڵی:**

بەو پێیەی کە بونیادنانی یەکێتی فیدراڵی- بەلای کەم- پێویستی بەبوونی زیاتر لە هەرێمێک هەیە، بۆیە عێراقی فیدراڵی دەبێ چەند هەرێمێکی یەکگرتوو بگرێتە خۆی. لەوانەشە مەسەلەی بوونی سێ هەرێم بخرێتە ڕوو کە ئەمانەن:

١- کوردستانی عێراق کە پارێزگاکانی: هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و دهۆک و هەموو قەزا کوردییەکانی مووسڵ و دیالەش دەگرێتەوە.

٢- ناوەڕاستی عێراق و بەشێک لە باکوری کە مووسڵ و تکریت و دیالە و حللە و ئەنبار و واست و بەغدای پایتەخت دەگرێتەوە.

٣- باشووری عێراق کە: دیوانییە و ناسریە و نەجەف و کەربەلا و سەماوە و عەمارە و بەسرا دەگرێتەوە، دوورنییە بیرۆکەی ئەوەش بخرێتە ڕوو کە عێراقی فیدراڵی زیاتر لە سێ هەرێم بگرێتە خۆی.

بەڵام بەوپێیەی کە حاڵی حازر مەبەستی سەرەکی لە دوای بونیادنانی فیدراڵی لە عێراق چارەسەرکردنی کێشەی کوردە لەو وڵاتەدا کە پێشتر باسمان لە هەندێک لە لایەنەکانی کرد- بۆیە لەگەڵ دکتۆر حەسەن چەلەبی ڕێک دەکەوین دەربارەی بوونی دوو هەرێمی فیدراڵی لە عێراق[١]، ئەوانیش:

١- هەرێمی عەرەبی کە جگە لە کوردستان هەموو ناوچەکانی عێراق بگرێتەوە.

٢- هەرێمی کوردستان کە هەموو ئەو پارێزگا و قەزایانەی- پێشتر ناویان هێنرا- بگرێتەوە کە بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن.

دەربارەی کەمینەکانی دیکەش، دەکرێ لە ڕێگەی بەخشینی مافە کلتووری و زمانەوانییەکانیان و پێکهێنانی سیستمی لامەرکەزی ئیداری هەرێمییەوە تایبەتمەندییە جۆراوجۆرەکانیان تێر بکرێن، چونکە لەیەک کاتدا هیچ پێچەوانەییەک لە پیادەکردنی سیستمی فیدراڵی و سیستمی لامەرکەزی هەرێمیدا بەدی ناکرێ. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە ئەو کەمینەو فرەلایەنانە دەبێ بەپێی چڕی و قەبارەی دانیشتوانیانەوە لە دامودەزگاکانی هەردوو هەرێمی پێشنیازکراودا نوێنەرایەتییان هەبێ، لەگەڵ زانینی ئەوەی کە ئەمە نابێتە مایەی ڕێگەگرتن لە پێکهێنانی هەرێمی دیکە، بەواتایەکی تر زیادکردنی ژمارەی هەرێمەکان لە ئایندەدا.

لەو بارەشەوە ئەزموونە فیدراڵییە بەراوردکراوەکان زۆر دەوڵەمەندن، ئەوەتا یەکێتی فیدراڵی سویسری بە سێ کانتۆن دەستی پێکرد پاشان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ژمارەیان زیادی کرد و ئەمڕۆ گەیشتوونەتە(٢٣) کانتۆن.

**دووەم: ڕێکخستنی دەستووریی یەکگرتوو:**

وەکو باوە سیستمی فیدراڵی بەپێی دەستووری یەکگرتوو بونیاد دەنرێ کە لە شێوەی گرێبەندی مۆرکراوی نێوان هەرێمە یەکگرتووەکاندایە. ئەو دەستوورە پێکهێنانی حکوومەتی ئیتیحادیش دەگرێتە خۆی کە بەشێوەی ئیتیحادیش دادەنرێ، ئینجا ئەمە چ لەسەر ئاستی دەرەکیی نێودەوڵەتی بێ یان لەسەر ئاستی ناوخۆیی. بۆیە لێرەوە دێینە سەر دەستووری فیدراڵی و حکوومەتی یەکگرتوو:

**١- دەستووری فیدراڵی:**

دەستووری فیدراڵی ئەو بناغە یاساییەیە کە دەوڵەتی یەکگرتووی لەسەر بونیاد دەنرێ و بریتییە لەو گرێبەند یان ڕێککەوتنەی لە نێوان ئەو هەرێمانە بەستراوە کە شێوەی فیدراڵییان وەرگرتووە و یەکیان گرتووە، هەر بۆیەش مافی و پابەندییەکانی هەریەکە لە حکوومەتی ئیتیحاد و حکوومەتی هەرێمەکان دەگرێتە خۆی.

لێرەشەوە پێمان وایە کە پێویستە داڕشتنی پرۆژەی دەستووری ئیتیحادی عێراق لە ڕێگەی لیژنەیەکی یاساییەوە بێ کە ژمارەیەک یاسا ناسی بەتوانا کەلە هەردوو هەرێمدا پێشنیاز دەکرێن بگرێتە خۆی و دواتر بخرێتە دەنگدانی دانیشتوانی هەردوو هەرێمەکەوە بۆ ئەوەی ببێتە مایەی ڕەزامەندی زۆرینەی دەنگەکان بەر لەوەی بچێتە قۆناغی کارپێکردنەوە.

ئەو دەستوورە دەبێ دامودەزگا دەستوورییە ئیتیحادییەکان و تایبەتمەندی و دەسەڵاتەکانیان بگرێتە خۆی سەرەڕای هەندێک سیمای ڕێکخستنی دەستووری لە چوارچێوەی هەرێم و تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی هەرێمەکان.

ئەمە وێڕای ماف و ئەرک و ئازادییە بنەڕەتییەکانی هاووڵاتیان و چەندین برگەو بابەتی دیکە کە دەستوورەکان دەیانگرنە خۆیان.

سەبارەت بەهەموارکردنی ئەو دەستوورەش، دەبێ ئەو هەموارکردنانە ڕەزامەندی زۆرینەی

دەنگەکانی هەردوو ئەنجوومەنی پەرلەمانی ئیتیحادی مسۆگەر بکەن لەگەڵ لایەنگری زۆرینە لە پەرلەمانی هەردوو هەرێم بەرلەوەی کاری پێ بکرێ.

٢- حکوومەتی یەکگرتوو:

بەشێوەیەکی سەرەکیی، سیستمی فیدراڵي هەوڵی دامەزراندنی حکوومەتی یەکگرتوو دەدات کە بریتییە لە ڕێکخستنی دەستووریی باڵا کە هەموو هەرێمەکان کۆدەکاتەوە و لەسەر ئاستی دەرەکی و ناوخۆییشدا دەربڕی یەکگرتنیان دەبێ، هەروەها ئەو ڕێکخستنە دەستووریە باڵایە- واتە حکوومەتی یەکگرتوو- لە هەردوو دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی و دادگای باڵای یەکگرتوو پێکدێت:

أ- دەسەڵاتی تەشریعیی یەکگرتوو:

ئەو دەسەڵاتە بەپێی سیستمی فیدراڵی بەراوردکار و لەسەر بناغەیەکی دوولایەنە پێک دێت، واتە بوونی دوو ئەنجوومەنی تەشریعی - وەک لەمەوبەر باسمان کرد- و لەسەر ڕۆشنایی ئەمەشەوە دەسەڵاتی تەشریعی یەکگرتوو لە عێراقی فیدراڵیدا دەبێ لەمانەی خوارەوە پێک بهێنرێ:

* ئەنجوومەنێک بۆ نوێنەرایەتیکردنی هەرێمە یەکگرتووەکان و بەئەنجوومەنی باڵا Upper House ناوزەد دەکرێ، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بەئەنجوومەنی پیران Senate و لە وڵاتانی وەک سویسرا و ئەڵمانیاش بەئەنجوومەنی دەوڵەتان Council of State ناودەبرێ.

دەکرێ لە عێراقیش ناوی ئەنجوومەنی هەرێمەکان Council of Regions ی لێ بنرێ. ئاشکرایە کە یەکێک لە مەرجەکانی بوونی ئەو ئەنجوومەنە نوێنەرایەتی یەکسانی هەرێمەکانە چونکە ئەنجوومەنی ناوبراو وەک زەمانەتێک وایە بۆ هەرێمی بچووک، ئینجا ئەو بچووکییە چ لەکەمی چڕی دانیشتوان یان بچووکی ڕووبەر یاخود لاوازی پێگەی ئابوورییەوە بێ. بەهۆی کەمی ژمارەی هەرێمە فیدراڵییە پێشنیازکراوەکانیش لە عێراق، وا باشترە هەریەکە لەو دوو هەرێمە ژمارەیەکی یەکسانی ئەندامیان هەبێ کە لە (٢٠) ئەندام کەمتر نەبێ. دەربارەی چۆنیەتی هەڵبژاردنیشیان، وا باشترە یان لە لایەن پەرلەمانی هەرێمییەوە بێ یاخود لەڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی نهێنی و ڕاستەوخۆی دانیشتوانی هەرێم، واش بەچاک دەزانرێ کە ماوەی ئەندامێتییان چوار ساڵ بێ.

* ئەنجوومەنێک کە لە یەکیەتیدا نوێنەرایەتی دانیشتوان بکات کە زیاتر بەئەنجوومەنی

نزمتر Lower House و له سویسرا بەئەنجوومەنی نیشتمانی National council ناو دەبرێ و له ئەمریکاش بەئەنجوومەنی نوێنەران Council of Representative. واباشتره له عێراق بەئەنجوومەنی نیشتمانی ناوبنرێ National council ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنەش بۆ ماوەی چوارساڵ لەسەر ئەساسی ڕێژەی دانیشتوان و له ڕێگەی دابەشکردنی عێراق بۆ ناوچەی هەڵبژاردنی ئاسایی هەڵبژێردرێن بەپێی یاسای هەڵبژاردن. ئاساییشه ژمارەی ئەندامان کە نوێنەرایەتی هەردوو هەرێم دەکەن جیاوازبێ بەهۆی جیاوازی چڕی دانیشتوانی هەریەکەیان.

دەبێ ئاماژه بەپێویستی یەکسانی دەسەڵاتەکانی هەردوو ئەنجوومەنی هەرێمەکان و نیشتمانیش بکەین، وێڕای گرنگی ئەوەی کە-دەبێ یاسا ئاساییەکان ڕەزامەندی زۆرینەی هەردوو ئەنجوومەن مسۆگەر بکەن. دەربارەی ئەوەش کە پەیوەندی بەو هەموارکردنانەوە هەیە کە له دەستووری فیدراڵیدا جێبەجێ دەکرێن، ئەوانە پێویستییان بەمسۆگەرکردنی زۆرینەی هەردوو ئەنجوومەنی یەکیەتی و ڕەزامەندی زۆرینەی پەرلەمانی هەردوو هەرێم هەیە.

ب- دەسەڵاتی تەنفیزی ئیتیحادی:

ئەو دەسەڵاتە لەمانەی خوارەوە پێکدێت:

* سەرۆک کۆمار:

تایبەتمەندی و دەسەڵاتەکانی سەرۆک کۆمار بەگوێرەی ئەو سیستەمە دەگۆڕێن کە له عێراقی فیدراڵیدا پیادە دەکرێ، ئەگەر بڕیاری گرتنەبەری سیستەمی سەرۆکایەتی بدرێ ئەوکاتە سەرۆک کۆمار سەرۆکی وەزیرانیش دەبێ، ئەنجوومەنی وەزیرانیش له ژمارەیەک وەزیری ناوەندی پێکدێت کە دەبێ بەپێی گرنگی و قەبارە نوێنەرایەتی هەردوو هەرێمی پێشنیازکراو بکەن و له لایەن سەرۆک کۆماریشەوە هەڵدەبژێردرێن و دەبێ متمانەی پەرلەمانی یەکگرتوو مسۆگەر بکەن، لەو حاڵەتەشدا ئەرک و تایبەتمەندییەکانی سەرۆک کۆمار گەورە و زۆر دەبن.

بەڵام ئەگەر سیستەمی بڕیار لەسەردراو بۆ عێراقی یەکگرتوو سیستەمێکی پەرلەمانی بێ، ئەوکاتە کار بەسیستەمی کابینەی وەزاری دەکرێ کە له لایەن ئەو هاوپەیمانێتییەوە دادەمەزرێنرێ کە زۆرینەی پەرلەمانی یەکگرتوو دەباتەوە، ئەوکاتە سەرۆک کۆمار دەبێتە تەنیا پایەیەکی هێمایی یاخود پرۆتۆکۆلی.

* ئەنجوومەنی وەزیران:

ئەنجوومەنی وەزیرانی یەکگرتوو لە ژمارەیەک لەو وەزیرانە پێکدێت کە بەپێی چڕی دانیشتوان نوێنەرایەتی هەردوو هەرێمی یەکگرتوو دەکەن، لە سیستمی سەرۆکایەتیشدا سەرۆکایەتی ئەو ئەنجوومەنە بۆ سەرۆک کۆمار دەبێ بەڵام لە سیستمی پەرلەمانیدا سەرۆک وەزیران یاخود ئەوەی کە بەوەزیری یەکەم ناودەبرێ دەبێت، وەک باویشە ئەو کەسە سەرۆکی حزب یان سەرۆکی هاوپەیمانییەتی زۆرینە لە پەرلەمانی یەکگرتوو دەبێ.

دەسەڵاتی تەنفیزی ئیتیحادیش ئەو دەستە ناوەندییەیە کە یاساکانی یەکیەتی و هەموو ئەو ئەرکانە جێبەجێ دەکات کە بەپێی دەستووری فیدراڵی خراونەتە ئەستۆی یەکیەتی.

سەبارەت بەو سیستمەش کە حکوومەتی یەکگرتوو لە عێراقی فیدراڵیدا دەیگرێتە بەر، لەو باوەڕەداین کە واباشترە سیستمێکی پەرلەمانی بێ، چونکە لە هێنانەدی گرنگترین ئامانجەکانی سیستمی فیدراڵیدا کە گەیشتنە بەژیانی دیموکراسی، لە سیستمی سەرۆکایەتی باشترە، هەروەها زۆر لە دەوڵەتە فیدراڵییەکان پەنایان بۆ سیستمی کابینەی وەزاری بردووە، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە سیستمی سەرۆکایەتی لەو فیدراڵییانەدا سەرکەوتنی وەدەست نەهێناوە کە لە دەرەوەی ئەمریکا پێکهێنراون. هەروەها سیستمی حکوومەتی بەکۆمەڵ، وا باشترە کاری پێ نەکرێ بەهۆی سەرنەکەوتنی لە دەرەوەی یەکێتی سویسریدا.

ج- تایبەتمەندییەکانی حکوومەتی یەکگرتوو:

بەو گوێرەی کە دەوڵەتی ئیتیحادی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی (دەرەکی)دا یەک دەوڵەتە و بەپێی ئەزموونی ئەو دەوڵەتانەش کە فیدراڵییان وەک سیستمێکی سیاسی بۆخۆیان گرتۆتە بەر، بۆ ئەوەش کە عێراق ببێتە خاوەنی حکوومەتێکی یەکگرتوو گونجاو ئەرکەکانی سەرشانیشی جێبەجێ بکات و ئەو هیواو ئومێدانەش بهێنرێنە دی کە پێیەوە بەستراونەتەوە، ئێمە پێمان وایە کە پێویستە دەستووری فیدراڵی ئەو تایبەتمەندییانەی خوارەوە چ بەپەرلەمانی یەکگرتوو یان بەدەسەڵاتی تەنفیزی یەکگرتوو بسپێرێ:

- جاڕدانی شەڕو مۆرکردنی ئاشتی.
- دانان و پیادەکردنی سیاسەتی بەرگری نیشتمانی یەکیەتییەکە بەسەرکردایەتی کردنی هێزە زەمینی و ئاسمانی و دەریاییەکان و پێشخستن و ڕاهێنانیان.

- داڕشتن و جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەکی بەگرێدانی پەیوەندیش لەگەڵ دەوڵەتە بیانی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و نوێنەرایەتی دیبلۆماسی و کونسولگەری و ناردن و پێشوازیکردن لە باڵیۆز و نێردراوە دیبلۆماسییەکان و داننان بەوڵاتان.
- مۆرکردنی ڕێککەوتن و پەیماننامە نێودەوڵەتییە هەمەجۆرەکان.
- داڕشتنی سیاسەتی ناوخۆی گشتی وڵات، بەکاروباری ئاسایشی گشتیشەوە.
- کاروباری ڕەگەزنامە و ئیقامە و بیانییەکان.
- دانانی بودجەی گشتی دەوڵەت.
- دانان و جێبەجێکردنی سیاسەتی دارایی یەکیەتییەکە، لە لێدان و دەرکردنی دراو و خەملاندنی نرخی سیاسەتە بانکییەکان و کاروباری گومرگ و مەکوس و قەردە نێودەوڵەتییەکان.
- دانانی پێوەر و بەهاو دیارکردنی سیاسەتی گشتی لە گۆڕەپانی بەکرێدان.
- داڕشتنی پلانە ئابوورییە گشتییەکان کە دەبنە مایەی گەشەسەندنی هەرێمەکان لە بواری پیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵدا.
- کاروباری نەوت و سامانی کانزایی و وزەی ئەتۆمی.
- کاروباری گەیاندن کە پۆست و تەلەفۆن و بەندەر و فڕۆکەخانە و هێڵەکانی شەمەندەفەر دەگرێتەوە.
- دانانی سیاسەتی گشتی لە گۆڕەپانی ڕاگەیاندندا.
- دەرکردنی یاسای یەکگرتوو لە مەیدانی یاسا شارستانی و تاوانکارییەکان.
- دەرکردنی لێبووردنی گشتی و تایبەت و ڕازیبوون لەسەر حوکمەکانی لە سێدارەدان.

د- دادگای دەستووریی باڵا:

بەمەبەستی دۆزینەوەی لایەنێکی دادوەریی بێ لایەن و ڕاستگۆ و دوور لە تۆمەتبارکردن بەلایەنگیری یان دوور لە نواندنی دڵسۆزی بۆ حکوومەتی یەکگرتوو یان حکوومەتی هەرێمەکان، وا بەباشتر دەزانرێ دادگایەکی باڵا بۆ یەکیەتییەکە پێکبهێنرێ و ژمارەیەک دادوەری زیرەک و شارەزا و مامۆستای یاسای بەناوبانگ بگرێتە خۆی، بەمەرجێک ژمارەیان لە ١٠ کەس تێپەڕ نەکات و هەریەکە لەو دوو هەرێمەش نیوەی ئەندامان دیار بکەن و ساڵانەش یەکێکیان ببێتە سەرۆک. هەروەها دەبێ ئەو دادگایە بڕیارەکانی

بەزۆرینەی دەنگ دەربکات و لە حاڵەتی یەکسان بوونی دەنگەکانیشدا ئەو لایەنە دەیباتەوە کە سەرۆک دەنگی لەگەڵ دەدات، دادگای ناوبراو تایبەت دەبێ بەجێبەجێکردنی ئەو مەسەلانەی خوارەوە:

١- شرۆڤەکردنی دەستووری فیدراڵی و دەستووری هەرێمەکان.

٢- چاوخشاندن بەدەستووریبەتی ئەو یاسایانەی کە لە لایەن پەرلەمانی یەکگرتوو دەرکراون و خەملاندنی ئاستی گونجانیان لەگەڵ دەستووری فیدراڵیدا.

٣- چاوخشاندن بەدەستووریبەتی ئەو یاسایانەی کە لە لایەن پەرلەمانە هەرێمییەکانەوە دەرکراون و ڕوونکردنەوەی ئاستی گونجانیان لەگەڵ هەردوو دەستووری فیدراڵی و هەرێمی و لەگەڵ یاسا ئیتیحادییەکاندا.

٤- چاوخشاندن بەمەسەلەکانی ناکۆکیی تایبەتمەندییەکان لە نێوان دەستە دادوەرییەکانی هەرێمدا.

٥- یەکلاکردنەوەی ئەو داوایانەی کە دەربارەی ڕاستی هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمانی یەکگرتوو و پەرلەمانە هەرێمییەکانەوە بەرزکراونەتەوە.

### سێیەم: ڕێکخستنی دەستووریی هەرێمی:

بەو پێیەی فیدراڵی دەوەستێتە سەر فرە قەوارەیی سیاسی و دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان ناوەند (یەکیەتی) و هەرێمەکاندا، بۆیە ئەو هەرێمانە بەقەوارەی سیاسی دادەنرێن و دەبێ هەر یەکەیان دەستووری تایبەت بەخۆیان هەبێ کە ماف و ئەرکە بنەڕەتییەکانی هاووڵاتیان و ڕێکخستنی یاسایی دەسەڵاتە هەرێمییەکان و پەیوەندی نێوانیان و دەسەڵاتەکانی یەکیەتی دەگرنە خۆیان، بەڵام بەمەرجی ئەوەی لەگەڵ دەستووری فیدراڵیدا پێچەوانە نەبن. ئەمە لە لایەک و لە لایەکی دیکە دەستووری فیدراڵی- وەک چۆن پێشتر ڕوونمان کردەوە- دەبێ جێبەجێکردنی هەندێک دەسەڵات بۆ هەرێم بهێڵێتەوە، واتە ئەوانەی کە ناکرێ حکوومەتی یەکگرتوو تێکەڵیان ببێت، ئەو تایبەتمەندییانەش ئەمانەن:

١- کاروبارە داراییەکان، لە دانانی بودجەی گشتی هەرێم و مافی دامەزراندنی بانکەکان لە ناو هەرێمدا.

٢- کاروباری ئاسایشی ناوخۆی هەرێم، لە هێشتنەوەی هێزی پێویست لە پیاوانی پۆلیس و ئاسایش و پۆلیسی هاتوچۆ و گومرگ و بەرگری میللی.

٣- كاروباره دادوەرییەکان، دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێم بەپێی یاسای رێکخستنی دادوەری دادەمەزرێنرێ و لە لایەن پەرلەمانی هەرێمەوە دەردەکرێ.
٤- کاروباری پەروەردە و فێرکردن بەفێرکردنی باڵاشەوە لە ناو هەرێمدا.
٥- کاروباری پیشەسازی و بازرگانی و دروستکردنی پرۆژەی پیشەسازی و کشتوکاڵی پێویست.
٦- کاروباری تەندروستی و کارو دەستەبەرکردنی کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان.
٧- کاروباری ئاوەدانکردنەوە و نیشتەجێکردن و شارەوانییەکان و گەشتوگوزار و ئاسەوار.
٨- کاروباری ئایینی و ئەوقاف.
٩- مافی مۆرکردنی رێککەوتنی خاوەن مۆرکی بازرگانی و ئابووری و کلتووری و زانستی لەگەڵ دەوڵەتە بیانییەکان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی یاخود زانکۆ و پەیمانگا زانستییەکان یان کۆمپانیا بیانییەکاندا، ئەمەش دوای وەرگرتنی رەزامەندیی دەسەڵاتە ئیتیحادییەکان.

دەزگا دەستوورییە هەرێمییەکانیش لەمانەی خوارەوە پێکدێن:

١- پەرلەمانی هەرێم:

دەسەڵاتی تەشریعی هەرێم لەیەک ئەنجوومەن پێکدێت، بەمەرجێک ژمارەی ئەندامانی لە (١٠٠) کەس تێپەڕ نەکات و لە رێگەی هەڵبژاردنی گشتی نهێنی و راستەوخۆشەوە بۆ ماوەی چوارساڵ هەڵدەبژێردرێن، ناشکرێ ئەندامێتی ئەو ئەنجوومەنە و ئەنجوومەنی نیشتمانی یان ئەنجوومەنی هەرێمەکانی یەکیەتی پێکەوە ببەسترێنەوە.

دەبێ ئەوەش بڵێین لەسەر ئاستی هەرێمیدا سیستمی تاکە ئەنجوومەن لە سیستمی دوو ئەنجوومەنی بەباشتر دەزانرێ، هەروەها باشترە ئەو تایبەتمەندییانەی خوارەوە بەئەنجوومەنی ناوبراو بسپێردرێن:

أ- دارشتنی دەستووری هەرێم و هەموارکردنی، بەجۆرێک لەگەڵ برگەکانی دەستووری فیدراڵیدا هاودژنەبن.
ب- دارشتنی یاسا هەرێمییەکان و هەموارکردن و لادانیان لە چوارچێوەی هەردوو

دەستووری ئیتیحادی و هەرێمی و یاساکانی یەکیەتی.

ج- دامەزراندنی بانکە بازرگانییەکان لە ناو سنووری هەرێمدا.

د- ڕازیبوون لەسەر بودجەی هەرێم.

هـ- بەخشینی ڕەزامەندی لەسەر ڕێککەوتنە بازرگانی و دارایی و ئابووری و کلتوورییەکان کە ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێم لەگەڵ دەوڵەت و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و زانکۆ و پەیمانگا زانستییەکان و کۆمپانیا بیانییەکاندا مۆریان دەکات.

و- سەپاندنی باجە خۆجێیەکان و هەموارکردن و لادانیان لە ناو سنوورەکانی هەرێمدا.

ز- ناونانی ئەو کەسەی پایەی سەرۆک وەزیرانی هەرێمی پێ دەبەخشرێ.

ح- بەخشینی متمانە بەکابینەی وەزاری لە دوای پێکهێنانیدا.

ط- چاودێریکردنی کارەکانی ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێم.

ی- کێشانەوەی متمانە لە وەزارەت لەسەر داوای (٢٠) نوێنەر بەلای کەم.

ک- دارشتنی پلانی دوورودرێژ بۆ بووژاندنەوەی ئابووری و کۆمەلایەتی و کلتووری لە هەرێمدا.

ل- پێکهێنانی لیژنە هەمیشەیی و کاتییەکان لە هەموو بوارە یاسایی و ئابووری و دارایی و فێرکاری و تەندروستی و...

م- دارشتنی سیستمی ناوخۆیی ئەنجوومەن و دیارکردنی میلاکات و بڕیاردان لەسەر بودجەی تایبەت و دامەزراندنی کارمەندانیان.

ن- دانانی ڕێساکانی تۆمەتبارکردن و دادگاییکردنی ئەندامانی بەرامبەر بەو پێشێلکارییانەی ئەنجامی دەدەن.

٢- دەسەڵاتی جێ بەجێکردنی هەرێم:

دەسەڵاتی جێ بەجێکردنی هەرێم لەمانەی خوارەوە پێکدێ:

أ- سەرۆکی هەرێم:

بەسەرۆکی باڵای هەرێم دادەنرێ و لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گشتی ئازاد و نهێنی و ڕاستەوخۆ لە لایەن دانیشتوانی هەرێم بۆ ماوەی چوارساڵ هەڵدەبژێردرێ و بەسیفەتێکی

بنەڕەتیش بازنەی گەیاندنی نێوان دەسەڵاتی یەکیەتی لە لایەک و دامودەزگا هەرێمییەکانە لە لایەکی تر، لە بۆنەو ڕێوڕەسمە پرۆتۆکۆلییەکانیشدا نوێنەرایەتی سەرۆک کۆمار دەکات.

سەرۆکی هەرێم ئەو ئەرکانەی خوارەوەش جێبەجێ دەکات:

١- دەرکردنی ئەو بڕیارانەی کە هێزی یاسایی هەرێمیان هەیە لەماوەی پشوودانی پەرلەمانی هەرێمیدا بەمەرجێ ئەوەی کە لە حاڵەتی دەستپێکردنەوەی دانیشتنەکانیدا بخرێنە بەردەمی ئەنجوومەن.

٢- دەرکردنی ئەو یاسا هەرێمییانەی کە پەرلەمانی هەرێم دایاندەڕێژێ.

٣- دەرکردنی بڕیارە هەرێمییەکان بەدامەزراندنی خاوەن پلە تایبەتەکان بەپێی پێشنیازێک لە لایەن ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێمەوە.

٤- بانگهێشتکردنی پەرلەمانی هەرێم بۆ کۆبوونەوە لە خولە ئاسایی و نا ئاساییەکاندا.

٥- سەرۆکایەتی کردنی دانیشتنەکانی پەرلەمانی هەرێم کە بەئامادەبوونی ئەو دەبەسترێن.

٦- سەرپەرشتیکردنی کارەکانی ئەنجوومەنی وەزیران لە ڕێگەی داواکردنی ڕاپۆرتی مانگانەو ساڵانە دەربارەی چالاکییەکانی.

٧- دەرکردنی سپاردن بەو کەسەی کە پەرلەمانی هەرێم بۆ پایەی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێم دیاری دەکات.

٨- دەرکردنی بڕیاری پێکهێنانی ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێم لە دوای وەرگرتنی متمانە لە پەرلەمانی هەرێمەوە.

٩- وەرگرتنی دەست لە کار کێشانەوەی وەزارەت یاخود دەست لەکا رکشاندنەوەی، کاتێک پەرلەمانی هەرێم متمانەی لێ وەردەگرێتەوە.

١٠- بانگەشەکردن بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی هەرێم لەماوەی ١٥ ڕۆژدا، بەر لە کۆتایی هاتنی خولەکەی یان هەڵوەشاندنەوەی.

١١- تەنسیقکردن لە نێوان ئەو کارانەی کە دەستە یەکگرتووەکان لە هەرێم ئەنجامی دەدەن لەگەڵ کارەکانی دەسەڵاتە هەرێمییەکاندا.

١٢- نوێنەرایەتی کردنی سەرۆک کۆماری یەکگرتوو لە بۆنەو ڕێوڕەسمە پرۆتۆکۆلییەکاندا.

ب- ئەنجوومەنی وەزیران:

لە سەرۆک وەزیرانی هەرێم و جێگر و ژمارەیەکی تەواوی وەزیران پێکدێت و هەریەکەیان سەرۆکایەتی یەکێک لەو وەزارەتانە دەکەن:

١- وەزارەتی داد.

٢- وەزارەتی ناوخۆ.

٣- وەزارەتی دارایی و ئابووری.

٤- وەزارەتی تەندروستی و کاروباری کۆمەڵایەتی.

٥- وەزارەتی پەروەردە.

٦- وەزارەتی رۆشنبیری و ڕاگەیاندن.

٧- وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی.

٨- وەزارەتی پیشەسازی.

٩- وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری.

١٠- وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە و گەشەپێدان.

١١- وەزارەتی ئەشغال و نیشتەجێکردن.

١٢- وەزارەتی شارەوانی و گەشتوگوزار.

١٣- وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن.

هەروەها دەکرێ کابینەی وەزاری ژمارەیەک لە وەزیرانی بێ وەزارەت بگرێتە خۆی.

ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێم ئەو تایبەتمەندیانەی خوارەوە جێبەجێ دەکات:

- دانانی سیاسەتی گشتی هەرێم لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری و فێرکاری و سەرپەرشتیکردنی جێبەجێکردنیان لە لایەن لایەنە پەیوەندارەکان بەگوێرەی یاسا کارپێکراوەکان.
- ئامادەکردنی بودجەی گشتی هەرێم و ناردنی بۆ پەرلەمانی هەرێم بەمەبەستی ڕازیبوون لەسەری.
- مۆرکردنی ڕێککەوتننامە بازرگانی و دارایی و ئابووری و رۆشنبیرییەکان لەگەڵ وڵاتانی دیکە و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و زانکۆ و پەیمانگا زانستییەکان و

کۆمپانیا بیانییەکان بەمەرجی ڕازیبوونی پەرلەمانی هەرێم و پەرلەمانی یەکگرتوو لەسەریان.

- هێشتنەوەی ژمارەیەکی تەواو لە هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆیی کە لە پیاوانی پۆلیس و ئاسایش و پۆلیسی هاتوچۆ پێک بێت، بۆ ئەوەی ئەرکی جێبەجێکردنی یاسا ئیتیحادی و هەرێمییەکان بگرنە ئەستۆ، بەگوێرەی ئەوەی کە مەسەلەکە پەیوەندی بەهەرێمەوە هەیە بەتایبەتیش لە بوارەکانی ئاسایشی ناوخۆیی پاراستنی ئاسایشی هاوولاتیان.
- پێشنیازکردنی پرۆژەی یاساکان و بەرزکردنەوەیان بۆ پەرلەمان بەمەبەستی دارشتنیان.
- دەرکردنی سیستم و ڕێنماییە هەرێمییەکان.
- دەرکردنی بڕیارە تەنفیزیيە پێویستەکان بەگوێرەی یاسا کارپێکراوەکان.
- سەرپەرشتیکردنی ئەرکی وەزارەتە جۆراوجۆرەکان و تەنسیقکردن لە نێوانیان بۆ ئەوەی کارەکانیان بەجوانترین شێوە جێبەجێ بکەن.
- دامەزراندنی کارمەندان و دیارکردنی مووچەیان و چاوخشاندن بەهەموو ئەو کاروبارانەی کە پەیوەندییان بەخزمەتکرنیانەوە هەیە.

٣- دەسەلاتی دادوەری لە هەرێم:

بەگوێرەی ئەزموونە بەراوردکارییەکانی زۆربەی دەوڵەتە فیدراڵییەکان، لەو باوەڕەداین کە دەبێ بواری دادوەری بدرێتە هەرێمەکان، بەجۆرێک لەسەر ئاستی هەر یەک لەدوو هەرێمی پێشنیازکراودا دەسەلاتێکی دادوەریی سەربەخۆ و تەواو بۆ تەواوی لقەکانی دادوەری و کەسیەتی و تاوان بونیاد بنرێ بەپێی یاسایەکی تایبەت بەڕێکخستنی دادوەری کە لە لایەن پەرلەمانی هەرێمەوە دەردەکرێ کاری ڕێکخستنی لقە جۆراوجۆرەکان دەگرێتە ئەستۆ، بەم جۆرەی خوارەوە:

أ- دادگا شارستانییەکان:

دابەش دەکرێن بۆ:

١- دادگاکانی بەرایی کە بەپلەی یەکەم دەڕواننە تەواوی داوا مەدەنییەکان.

٢- دادگاکانی تێ هەڵچوونەوە (أستئناف) کە بەسیفەتی تێ هەڵچوونەوە دەڕواننە بڕیارەکانی دادگا بەراییەکان کە قابیلی تێ هەڵچوونەوەن.

٣- دادگای تەمییزی هەرێم، تایبەتە بەچاوخشاندنەوە بەبڕیاری دادگا شارستانییە جۆراوجۆرەکان کە قابیلی چاوپێدا خشاندنەوەن.

ب- دادگا سزایی- تاوانییەکان:

لەمانەوەی خوارەوە پێکدێن:

١- دادگاکانی لێکۆڵینەوە کە تایبەتن بەکۆڵینەوە لە تەواوی تاوانە خاوەن مۆرکە تاوانییەکان.

٢- دادگاکانی سەرکێشی کردن: تایبەتن بەچاوخشاندن بەکێشەکانی لاساریکردن و دەرکردنی بڕیار تیایاندا.

٣- دادگا تاوانییەکان کە تایبەتن بەڕوانین لە تاوانەکان و دەرکردنی بڕیار تیایاندا هەروەها چاوخشاندن بەبڕیارەکانی لێکۆڵەرەواندا.

٤- دادگاکانی تێ هەڵچوونەوە: تایبەتن بەچاوخشاندن بەبڕیارەکانی دادگاکانی تاوان لە هەرێم.

٥- دادگای تەمییزی هەرێم: تایبەتە بەچاوخشاندنەوە بەبڕیارەکانی دادگاکانی تاوان و هەرزەکارەکان لە هەرێمدا.

ج- دادگا شەرعییەکان:

بریتین لە دادگاکانی باری کەسێتی و بڕیارەکانیشی ڕاستەوخۆ لە لایەن دادگای تەمییزی هەرێمەوە دەچنە ژێر باری تەمییزکردنەوە.

لە لایەکی دیکەوە ناکۆکی لەسەر تایبەتمەندی لە نێوان دادگاکانی هەرێمدا، لە لایەن دادگای تەمییزی هەرێمەوە سەیریان دەکرێ، بەڵام لە حاڵەتی سەرهەڵدانی ناکۆکی لەسەر تایبەتمەندی لە نێوان دەستە دادوەرییەکانی هەردوو هەرێمدا دەبێ ئاراستەی دادگای باڵای دەستووری بکرێ بەمەبەستی چاوخشاندنەوە و دیارکردنی لایەنی خاوەن تایبەتمەندی دادگا هەرێمییە جۆراوجۆرەکانیش دەبێ لەکاتی سەیرکردنی داوا هەمەجۆرەکاندا یاسا ئیتیحادی و هەرێمییەکان پیادە بکەن.

**پەراوێزەکانی ئاخافتنی سێیەم**

(١) دکتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالیة- سەرچاوەی پێشوو- ل ٢٥.

# کۆتایی

دوابەدوای ئەو گەشتە سەخت و درێژخایەنەی لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی دەستووریی عێراقی تازە، هەر لە سەرەتای پێکهاتنییەوە و خستنە ڕووی ڕووداوە جۆراوجۆرەکان کە ئەو وڵاتە پێیاندا تێپەڕیوە، هەروەها پاش ئەوەی پڕژاینە سەر هەموو ئەو بابەت و مەسەلانەی کە پێمان وایە لە چوارچێوەی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا گرنگ و پێویستن، ئەوەبوو باسمان لە یەکێتی فیدراڵی کرد وەکو سیستمێکی دەستووری کە بەدرێژایی زیاتر لە دوو سەدە دەبێ پیادەکراوە و لەو زۆر لە وڵاتانەشدا سەرکەوتووە کە بەفرە نەتەوەیی (ئەتنیکی) یان ئاینی یاخود زمانەوانی ناسراون، هەروەها لە ناو لێکۆڵینەوەکەدا ئاماژەمان بەچەند ئەزموونێکی بەراوردکراوی فیدراڵی کرد، ئینجا چ بەدووروودرێژی بووبێ وەک هەردوو ئەزموونی ئەمریکی و سویسری یاخود لە میانەی کۆڵینەوە لە تیۆری گشتی فیدراڵیدا باس لە هەندێکیان کراوە، وەک ئەزموونی فیدراڵی ئەڵمانی و کەنەدی و ئوستراڵی و سۆڤیەتی و هیندی و یوگسلافی، هەوڵیشمان داوە کاکڵەیەکیان لێ هەڵێنجین بەڵکو ببێتە مایەی سوودمەندی بۆ عێراق.

هەروەها هەوڵی دەستنیشانکردن و دیارکردنی ئەو هۆکارانەمان دا کە ڕێگە بۆ هاتنە کایەی فیدراڵی لە عێراق خۆش دەکەن، ئەمە سەرەڕای بەیانکردنی ئەو هۆکارانەی کە دەبنە مایەی سەرکەوتنی فیدراڵی دوای پێکهێنانی لەو وڵاتەدا.

دوای ئەمەش دەبێ لە کۆتاییدا کەمێک لە پێگە هەرە دیارەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیە بوەستین بۆ بەیانکردنی ئەو دەرئەنجامانەی کە لەو تێزەدا پێیان گەیشتووین وێستگەی هەرە دیاری ئەو لێکۆڵینەوەیەش خۆی لە دروستبوونی عێراقی تازەدا دەنوێنێ لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٢٠ و تیایدا ئەوە بەدی دەکەین کە دامەزرانی ئەو وڵاتە بەپێکهاتە دەستووری و ئیداری و سنوورە هەنووکەییەکانییەوە و گرتنە خۆی ویلایەتی مووسڵی خاوەن زۆرینەی کورد و پاڵاوتنی یەکێک لە ئەندامانی خانەوادەی هاشمی لە حیجاز و دانانی وەکو پادشایەک بۆ عێراق، ئەمە هەمووی دەستکردی سیاسەتی بەریتانی بووە و پشتگیری لە لایەن توێژێکی چوارچێوەداری ئەفسەرە پێشووەکانی سوپای عوسمانییەوە لێ کراوە، ئەوانەی لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهاندا لە ڕیزەکانی شۆڕشی عەرەبیدا کاریان کردبوو. بەواتایەکی دیکە پێکهێنانی عێراق بەم شێوەیە لەبەر ڕەشیی چاوی عێراقییەکان و تەنانەت عەرەبیش نەبووە، بگرە بۆ ئەوەبووە کە خزمەتی ئامانج و

بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بکات، کە ئەودەمە ڕۆڵێکی گەورەی بەتایبەتیش دەربارەی ئەوەی کە پەیوەندی بەمسۆگەرکردنی ماددەی نەوتی بایەخدارەوە هەبووە بۆ بەردەوامیی ڕۆیشتنی ڕەوڕەوەی ئەو دەوڵەتە ئیستیعمارییە هەژموون بەرفراوانەی ئەو کاتە.

لەپێناوی توندکردنی دەسەڵاتیش بەسەر وڵاتدا، فەرمانگە بەریتانییەکان دەستیان کرد بەداڕشتنی یەکەم دەستوور بۆ دەوڵەتی عێراق، کە یاسای بنەڕەتی ساڵی ١٩٢٥ی عێراق بوو کە ئەنجوومەنی دامەزرێنەری عێراقی دەسەڵاتی ڕەتکردنەوە بەڵکو هەمووارکردنی بڕگەکانیشی نەبوو.

بەم جۆرە دەستنیشانکردنی پۆشاکی سیاسی بۆ عێراقی تازە، بگرە دیارکردنی ڕەنگ و پێوانەکان و مەرجەکانیشی ئەرکی لایەنێکی دیکە بوو جگە لە لایەنی پەیوەندار بەمەسەلەکەوە، گەلی عێراقی سەرلێشێواویش سەرەڕای تەسکی و نەگونجانی بەڵام دەبوایە بیپۆشیبایە، مەسەلەکەش ئاڵۆزتر دەبێ کاتێک بزانین کە ئەو گەلە توانای ئەوەی نەبووە کە دەستبەرداری ئەو پۆشاکەبێ یاخود بیگۆڕێ بەڵکو دەبوایە تا کۆتایی پێی ڕازی بێ.

لێرەوە نابێ سەرمان لە نەگونجانی ئەو دەستوورە لەگەڵ ویست و خواستەکانی چین و توێژەکانی گەلی عێراق سوڕبێ، بەتایبەتیش ئەگەر بزانین کە سیاسەتی ئەوکاتەی بەریتانیا بەرامبەر بەعێراق کە بەشێوەیەکی پراکتیکی خۆی لەو دەستوورەدا نواند، هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ناوەندی دەدا بەبێ ڕەچاوکردنی حاڵەتی فرە نەتەوەیی و ئایینی و تایەفی کە لە وڵاتدا هەبوو، ئەمەش سەرەڕای بڕیاری کۆمەڵەی گەلان کە لە ١٦/کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ دەرچوو لە بڕگەی سێیەمدا حکوومەتی بەریتانی- بەوپێیەی کە دەوڵەتی مونتەدەبە لەسەر عێراق- ناچارکردبوو کە بەمەبەستی مسۆگەرکردنی زامنکاری بۆ کورد دەبێ ڕێو شوێنی ئیداری پێشکەشی ئەنجوومەن بکات. لەگەڵ زانینی ئەوەی کە سیاسەتی ئینتیدابی فەرەنسی لە سوریا و لوبناندا بەرەو هاندان لەسەر لامەرکەزی و تێرکردنی تایبەتمەندییە جۆراوجۆرەکان و ڕیزگرتن لە کەمینەکان و بەخشینی ڕۆڵی گونجاو پێیان دەرۆیشت. بۆیە ئەو ڕژێمە نەیتوانی تەکامول لە نێوان نەتەوە و تایەفە جیاوازەکانی عێراقدا دروست بکات و نامەی شا فەیسەڵ کە لە ١٥ی ئاداری ١٩٣٢دا نووسراوە و ئاراستەی حکوومەتەکەی خۆی کردووە، ڕاستگۆترین

دەربڕینە بۆ ئەو شکستە، بەتایبەتیش کاتێک دەڵێ: (گەلێک نییە بەناوی گەلی عێراق، بەڵکو بریتییە لە ژمارەیەک تۆپەڵی مرۆیی خەیاڵی کە پەیوەندی نیشتیمانی کۆیان ناکاتەوە). بەڵگەی دیکەش سەبارەت بەشکستی سیستمی سیاسی ئەو کاتە ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینە زۆرانەبوون کە گەلی عێراق بەعەرەب و کورد و کەمینەکانی تریەوە بەرپایان کرد کە بەشۆڕشی ٢٠ی عێراقی لە هاوینی ساڵی ١٩٢٠ دەستیان پێکرد و تا ئەمڕۆش تەواوی چین و توێژ و مەزهەبەکان بەیەکێک لە شتە پیرۆز و نیشتمانییە بەرچاوەکانی دەزانن، چونکە تیایدا سەرەڕای ساکاری چەکەکانیان بەڵام توانییان بەڕووی گەورەترین هێزی ئیستیعماری جیهانیی بوەستن. ئەمە و ئەو شۆڕشانە درێژەیان کێشاو تیایاندا گەلانی عێراق و ئەو سیستمە سیاسییەیان ڕەت کردەوە کە بەبێ ویستی ئەوان دامەزرێنرابوو، دواتر شۆڕشی مایسی ڕزگاریخواز لە ئەیاری ساڵی ١٩٤١ و دواتر شۆڕشی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ و ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٥٢ و پاشان ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٥٦- لەکاتی دوژمنکاریی سێ لایەنە بۆ سەر میسر بەرپابوون و تەقینەوە.

سەبارەت بەکوردی عێراقیش کە زیاتر لە دوو لەسەر سێی دانیشتوانی ویلایەتی مووسڵیان پێکدەهێنا، وا چاوەڕوان دەکرا- وەک پێشتر بۆمان دەرکەوت بچنە ناو دەوڵەتی کوردی کە بەپێی پەیماننامەی سیڤەری ١٠ی ئابی ١٩٢٠ بڕیاری لە بارەوە درابوو.

بەڵام ئەو خەونە کوردییەی کە بۆ ماوەیەکی کورت گەشایەوە، بەپەلەو بەرلەوەی ڕووناکی ببینێ لەبار چوو، ئەوەبوو پەیماننامەی لۆزان کە لە ٢٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٢٣ مۆر کرا، ئاماژەکردنی بەکورد و مافە ڕەواکانی پشتگوێ خست.

هەوڵە چڕوپڕەکانی بەریتانیا- عێراقیش گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵیان بۆ عێراق لێ کەوتەوە بەپێی بڕیارێکی کۆمەڵەی گەلان کە لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٥ دەرچوو. بەمەش کێشەی کورد لە کێشەیەکی نێودەوڵەتییەوە پاشەکشەی کرد و بوو بەکێشەیەکی ناوخۆیی ڕووت، شکستهێنانی پرۆژەی ناوبراوی کوردیش لە لایەن کوردی عێراقەوە کاردانەوەی زۆری لێ کەوتەوە لەوانە بەشداری نەکردنی زۆربەی ناوچە کوردییەکان لە پرۆسەی ڕیفراندۆمدا دەربارەی دانانی فەیسەڵی یەکەم وەکو پادشایەک بۆ عێراق، هەروەها بەشدار نەبوونیان لە هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکاندا کە دواتر ئەنجام دران، هەروەها ئەمە خۆی لە ڕاپەڕینە یەک لەدوایەکەکانی شێخ مەحموودی حەفید و ڕاپەڕینی

بارزانی ساڵەکانی ١٩٣١- ١٩٣٢ و شۆڕشی بارزان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٣-١٩٤٥دا نواند. لێرەشەوە مەسەلەیەکی گرنگ و بنەڕەتی هەیە کە دەبێ دووپاتی بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە کە کێشەی کورد لە عێراق لەگەڵ برا عەرەبەکانیدا نییە، بەڕای ئێمە هیچ گرفتێک لە نێوان عەرەب و کورد نییە لە عێراق بەبەڵگەی ئەوەی کە زۆر لە برا عەرەبەکان پشتگیرییان لە داواکارییەکانی کورد کردووە و بەداواکاری ڕەوایان لە قەڵەم داون، هەروەها پێشتر پشتگیری زۆر پارتی نیشتمانی و کەسایەتی سیاسی عێراقیمان بۆ داننان بەئۆتۆنۆمیی بۆ کوردی عێراق بینی، هەروەها کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی یەکگرتوو کە نوێنەرایەتی هەموو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی دەکات بەتەواوی ئاراستەی نەتەوەیی و ئیسلامی و مارکسییەکانییەوە، لە دانیشتنی تشرینی یەکەمی ١٩٩٢یدا کە لە سەلاحەدین لە کوردستانی عێراق سازی کرد، بڕیاری دا لەسەر پیادەکردنی فیدراڵی لە عێراقی ئایندەو سیستمی فیدراڵی بۆ کوردستانی عێراق دا، بەڵام کێشەی گەلی کورد لە عێراق هەمیشەو بەبەردەوامی لەگەڵ ڕژێم و حکوومەتە یەک لە دوای یەکەکان بووە کە دەکرێ بڵێین کورد و عەرەبیان وەکو یەک چەوساندۆتەوە.

لە یادیشمان نەچێ ئەو بیرو بۆچوونانەی کە لەسەر ئاستێکی بەرفراواندا پەرەی سەندووە دەربارەی ئەوەی بەریتانیا لە دوای سیاسەتی ڕێگەنەدان بەکورد بووە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆیان بەبیانووی ترسی کاریگەریی ڕووسیا لەسەریان، لەو پێناوەشدا لەسەردەمی پادشایەتیدا یارمەتی گەورەی دارایی و سەربازی پێشکەشی حکوومەتە عێراقییە یەک لەدوایەکەکان کردووە لە هەوڵەکانیاندا بۆ لەناوبردن و کپکردنەوەی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کورد، بەڵکو هەر جارێک کورد لە پێناوی داوا ڕەواکانیاندا لە ناو بەریتانی شان بەشانی سوپای عێراقی بەشدارییەکی کاریگەرانەی هەبووە.

سەبارەت بەناوچەکانی دیکەی عێراقیش، دەکرێ ئاماژە بەوە بکەین کە خەڵکی بەسرا بەهۆی گێڕانەوەی ویلایەتەکەیان بۆ عێراق لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی یەکگرتوو و خاوەن سیستمێکی ناوەندی توند هەستیان بەناڕەزایییەکی زۆر دەکرد، لەو بارەشەوە کەسایەتییەکانی بەسرا لەو یاداشتنامەیەدا کە ئاراستەی مەندوبی سامییان لە بەغدا کرد، ئەوەیان دەربڕیبوو کە دەخوازن پەیوەندییەکی دیاریکراو لە نێوان ویلایەتەکەیان و عێراق بدۆزێتەوە، بەجۆرێک بەهەردوو ویلایەتی بەسرا و عێراقی یەکگرتوو ناوزەد بکرێ. یاداشتنامەکە- کە پێشتر دەقەکەیمان بڵاوکردەوە- داواکاری زۆری گرتبووە خۆی، دەکرێ

بوترێ کە تیایدا داوای پێکهێنانی یەکێتییەکی فیدراڵی کرابوو بەمەرجێک بەسرا بکرێتە هەرێمێکی فیدراڵی و دەسەڵاتێکی بەرفراوانیشی پێ بدرێ.

لە ئەنجامی سەرنەکەوتنی سیستمی پادشایەتی و زیادبوونی نارەزایی جەماوەرییش لە دژیدا بەهۆی پەیوەندی و هاوپەیمانێتی بەهێزی لەگەڵ ئینگلیز، ئەو رژێمە لە لایەن شۆرشی ١٤ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ رووخێنرا، شۆرشی ناوبراو بۆ هەموو چین و توێژەکانی گەلی عێراق ئومێد و رۆشناییەکی گەورەبوو، هیواکانیش گەشانەوە لەوەی کە گۆرانی سیستمی دەستووری و ئیداری عێراق گۆرانێکی بنەرەتییەو بەجۆرێک کە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتەدا دەگونجێ.

بەڵام هەر زوو دەرکەوت ئەو بۆچوونەی عێراقییەکان بەگشتی و کورد بەتایبەتی لە شوێنی خۆی نەبووە، چونکە رژێمی تازە سەرەرای ئەوەی کە لەسەرەتادا و لە میانەی مادەی سێیەمی دەستووری کاتییدا کە لە ٢٧ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ دەرچوو دانی بەوە نا کە عەرەب و کورد هاوبەشن لەو وڵاتەدا بەڵام دوای توندکردنی مەچەکی بەسەر دەسەڵاتدا بەپەلە رووی خۆی وەرچەرخاند، بەڵکو هەمان بەرنامەی سیستمەکانی پادشایەتی لەناوچووی گرتەبەر لە بەکارهێنانی شێوازی سەربازیی پشت بەستوو بەبنبرکردن و هەوڵی لەناوبردنی بزووتنەوەی کوردی لەجیاتی رووبەرووبوونەوەی ئاشتییانە لەگەڵ ئەو کێشەیەدا. حکوومەتە کۆمارییە یەک لە دوای یەکەکانی دیکەش هەمان ئەو بەرنامەیان پەیرەو کردو بەر لە گەیشتنیان بۆ دەسەڵات بوونی پەیوەندییان لەگەڵ شۆرشی کورد دەنواند و واشیان پێشانی سەرکردایەتی کورد دەدا کە هەموو داواکارییە رەواکانی کورد جێبەجێ دەکەن بەڵام ئەو حکوومەتانە پاش ئەوەی دەگەیشتنە قەناعەت کە دەسەڵاتیان پتەو بووە دیسان پەنایان بۆ ئەو شێوازە بردۆتەوە کە بووە بەپرۆگرامێکی جێگیر لە سیاسەتی عێراقیدا بەرامبەر بەکێشەی کورد، سیاسەتی پشت بەستن بەهێز و پەنابردن بۆ شێوازی سەربازی. بگرە هەندێک لەو حکوومەتانە شانازییان بەبەکارهێنانی هێز لە دژی رۆڵەکانی گەلەکەیان دەکرد و پێشیان وابووە دانان بەمافەرەواکانی گەلی کورد تەنازولێکە بۆ خۆیان بۆیە بەهیچ شێوەیەک نابێ و رێگەشی پێ نادرێ.

زیادەرۆییش نییە ئەگەر بڵێین ئەو گیانەی باڵی بەسەر ئەو سیستمە سیاسییەدا کێشا بوو کە لەسەر ئەساسی یاسای بنەرەتیی عێراقی ساڵی ١٩٢٥بونیاد نرابوو سەبارەت بەناوەندیی توند و فەرامۆشکردنی فرەلایەنی، هەمان ئەو گیانە تا رۆژی ئەمرۆشمان باڵی

بەسەر سیستەمە دەسەڵاتدارە کۆمارییەکان لە عێراق کێشاوە و ئەو چەند دەقە دەستوورییەش کە خرانە نێو دەستوورە کاتییەکان یاخود ئەو چەند ڕێو شوێنە ئیدارییانەی لە لایەن ئەو حکوومەتانەوە گیراونەتە بەر نەبوونەتە مایەی گۆڕینی بەرنامەی پێشوویان کە ئاماژەی پێ کرا. لەو ڕووەوە تێبینی دەرچوونی ژمارەیەک دەستپێشخەریمان لە لایەن حکوومەتە یەک لەدوایەکەکان کرد، هەر لە بەیانی ١٠ی شوباتی ساڵی ١٩٦٤ی عەبدوسەلام عارف و بەیانی ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ کە بەیانی بەزاز- عەبدوڕەحمان بەزازی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتە- تا ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری مێژوویی.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە مێژوو ئەوە بۆ حکوومەتی دووەمی بەعس تۆمار دەکات کە خاوەنی زۆرترین هەوڵی بوێرانەبووە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئەو حکوومەتە لەسەر ئاستی ڕەسمیدا دانی بەئۆتۆنۆمیی بۆ کوردی عێراقدا نا بەپێی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠، جارِدانیشی گەورەترین ئاسەواری ئیجابییانەی لەسەر دڵ و دەروونی عێراقییەکان بەگشتی و کورد بەتایبەتی لێ کەوتەوە، ئەوانە دوای چەندین دەیە لە زوڵم و ستەم و نەبوونی هەستیان بەدڵنەوایی کرد، بەڵام ئەو قۆناغە دڵخۆشکەرە لە ژیانی عێراقییەکاندا زۆر درێژەی نەکێشا، دەکرێ بوترێ دواتر حکوومەتی عێراق لەو سیاسەتە پاشگەز بووەوە کە لە ساڵی ١٩٧٠دا پەیڕەوی کرد، ئەو پاشەکشەکردنەش لە بەرژەوەندی ئەو سیاسەت و پرۆگرامە جێگیرەدا بوو کە پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد، واتە هێشتنەوەی ناوەندیی توند و پشتگوێ خستنی فرە لایەنی و بەهەند نەزانینی کورد و داوا ڕەواکانی و دواتر بەکارهێنانی هێزی سەربازی لە دژیاندا، بەپشت بەستن بەو بەرنامەو سیاسەتەش، حکوومەت دەستی کرد بەبەرتەسککردنەوەی ڕۆڵی بزووتنەوەی کوردی و سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەو پرۆژەیەشی فەرامۆش کرد کە سەبارەت بەیاسای ئۆتۆنۆمیی لە لایەن سەرکردایەتی شۆڕشی کوردییەوە خرابووە ڕوو، بەڵکو بەتەنیا و بەبێ ڕاوێژ یان ڕێککەوتنی پێشتر یاسای ئۆتۆنۆمیی ژمارە ٣٣ی ساڵی ١٩٧٤ی ڕاگەیاند کە پێشتر ئاماژەمان بەو ناتەواوییە زۆرانە کرد کە تیایدا بەدی دەکرا و پێویست بەدووبارەکردنەوەیان ناکات.

هەر ئەو کەموکورتی و ناتەواوییانەش بوون ئۆتۆنۆمیی ڕاگەیەنراویان کرد بە پەتا و بارێکی قورس بۆ کورد لەجیاتی ئەوەی ببێتە هۆکارێک بۆ هێنانەدیی ویست و ئاواتە ڕەواکانیان، چونکە بووە مایەی دەستپێکردنەوەی شەڕێکی توندتر لە نێوان هەردوو لا و

کوژرانی دەیان هەزار کەس و برینداربوون و پەککەوتنی ژمارەیەکی زۆری لە ڕۆڵەکانی گەلی عێراق بەکورد و عەرەب و کەمینەکانی تری لێ کەوتەوە، ئەمە سەرەڕای پەرتەوازەبوونی سەدان هەزار کەسی دیکە لە شوێنەکانیان و ئەو زەرەرە مادییە گەورەیەی کە لێیان کەوت، هەر لەو ڕووەوە حکوومەت ژمارەیەک هەلپەرست و مشەخۆری لە دامودەزگا ڕەسمییەکانی ئۆتۆنۆمیی دامەزراند، دوای دوژمنایەتیکردنی نوێنەرە ڕاستەقینەکانی کورد، هەروەها سنوورەکانی کوردستانی عێراقیشی گۆڕی و دەستی بەهەڵمەتێکی بەرفراوانی تەعریبکردنی زۆر ناوچەی کوردی وەک کەرکووک و خانەقین و سنجار و هی تر کرد.

ئەو ئۆتۆنۆمییەش کە ئەوکاتە پڕوپاگەندەیەکی زۆری بۆ دەکرا لە ڕاستیدا تەنیا شێوازێک بوو بۆ چاوبەستن چونکە- وەک لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کرد - هیچ سیما و خەسڵەتێکی بنەڕەتی ئۆتۆنۆمیی وەک بوونی دەستووری هەرێمی و دامودەزگای تەشریعی تەنفیزی خاوەن سەربەخۆیی تەواوی پێوە دیارنەبوو، ئەو دامودەزگایانەی کە توانای دەرکردنی بڕیاری پێوەندار بەبوارە سیاسی و تەشریعی و داراییەکانی نەبووە، بەڵکو مەسەلەکە گەیشتە ڕادەی ئەوەی کە دەسەڵاتی ناوەندی بڕیاری دامەزراندنی سەرۆکی ئەنجوومەنی تەشریعی ناوچەی کوردستان بەپلەی وەزیر لە ئەنجوومەنی وەزیرانی ناوەندی دابمەزرێنێ کە خۆی لە خۆیدا تەنیا زنجیرەیەکی زیادی دیکە بوو و لە زنجیرەی سیستمی ئیداریشدا کە لە بنەڕەتدا پشتی بەناوەندی توند دەبەستێ و هیچ سوودێکی وای نەبوو.

# دەرئەنجامەکان

١- دەکرێ بوترێ سیاسەتی ناوەندیی توند و پشتگوێ خستنی فرەلایەنی و پەنابردن بۆ ڕێگەچارەی سەربازی کە هەردەم شێوازێکی ستراتیژی هەموو حکوومەتە عێراقییە یەک لە دوایەکەکان بووە، هەر لە سەرەتای دروستبوونی عێراقی تازەوە لە سەرەتای ئەو سەدەیە تا کاتی ئەمڕۆمان، شکستی هێنا لە هێنانەدیی گونجان لە نێوان نەتەوە و تایفەکانی عێراقدا، لە لایەکی دیکە ئەو حکوومەتانە نەیانتوانی ئەوە دابین بکەن کە بەناسنامەی نەتەوەیی (نیشتمانی) عێراقی ناودەبرێ یاخود دڵسۆزی نیشمانی دەستەبەر بکەن کە لە سەرەوەی هەموو ئینتیما نەتەوەیی و تایفییەکانە و ئەو پەیوەندییە هاوبەشە بالایەشە کە هەموو عێراقییەکان لە دەوری کۆدەبنەوە بەبێ ڕەچاوکردنی ئینتیمای ئەتنیکی و ئایینی و زمانەوانییان.

٢- لەو باوەڕەداین کە فیدراڵی و بونیادنانی سیستمی یەککگرتن لە عێراقی ئایندەدا باشترین ڕێگە چارەیە بۆ فرەلایەنی لە عێراق و بۆ کێشەی کورد بەشێوەیەکی تایبەتی. پێشتر ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە زۆر لەو دەوڵەتانەی فرەلایەنی دەگرنە خۆیان، پەنایان بردۆتە بەر ئەو سیستمە بۆ گەیشتن بەئامانجەکانیان، ئەگەرچیش بانگەشە بۆ تەواویی ئەو سیستمەو نەبوونی هیچ کەم و کوڕی ناکەین تیایدا، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لەبارترین سیستمە لەنێو سیستمە سیاسییەکانی دیکەی جیهاندا و لەگەڵ واقیعی فرەلایەنیشدا دەگونجێ کە لەو ولاتەدا پیادە دەکرێ چونکە، ئەو سیستمە لە لایەک هێنانەدی ویستی نەتەوە یان تایفەکان دەگرێتە خۆی لە سەربەخۆیی خودی و خۆبەڕێوەبردن لە ڕێگەی دەزگا دەستوورییە هەرێمییەکانەوە کە خاوەنی برێکی زۆری سەربەخۆیی هەرێمین، ئەمە وێڕای بەشداربوونی ئەو قەوارە هەرێمییانە یاخود وەک چۆن لە یاسای گشتیدا بەدەوڵەتانی ئەندام لە دامودەزگاکانی یەکێتییەکە ناو دەبرێن، لە پیادەکردنی سەروەریدا، لە لایەکی دیکەشەوە ئەو سیستمە دەبێتە مایەی کەمکردنەوەی ترسەکانی نەتەوەی گەورەتر لە ئەگەری ڕوودانی جیابوونەوەدا، بەو پێیەش فیدراڵی- وەک چۆن ئەزموونە بەراوردکارەکان دەریان خستووە- لە سەر نەبەخشینی مافی جیابوونەوە لە یەککگرتوودا بەولاتانی ئەندام دەڕوات، کاتێک ئەگەر دەستووری فیدراڵی بڕیاری لەسەر نەدابێ. ئەو ئەزموونانەش کە لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا لە سەردەمی شەڕی ناوخۆ لەسالی ١٨٦١تا سالی ١٨٦٥ و ئەوەی لە سالی ١٩٤٣ لە ئوسترالیادا ڕوویان دا-کاتێک ویلایەتی ئوسترالیای

ڕۆژئاوا داواکارییەکی ئاراستەی پەرلەمانی بەریتانی کرد کە یاسایەک دابڕێژێ و ڕێگەی جیابوونەوەی پێ بدات و پەرلەمانیش وەڵامی نەدایەوە- ئەمانە ڕاستگۆترین بەڵگەن بۆ پتەوی ئەو بنەمایە وەکو یەکێک لە سیماکانی سیستمی فیدراڵی، ئەویش نەتوانینی دەوڵەتانی ئەندامــە لە بەتاڵکردنەوەی یاســا فــیــدراڵــیــەکــان Nullification و جیانەبوونەوەیانە لە یەکیەتی Secession بەدەر دەخات.

لە ئەنجامی وانەکانی ڕابردووشدا دەکرێ جەخت لەسەر خاڵێکی گرنگ بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە کە لەکاتی پەنابردن بۆ فیدراڵی، دەبێتە شێوازێکی ستراتیژی لە لایەن هەموو لایەنەکانەوە و بەدڵسۆزیش پیادە بکرێ نەوەک ببێتە تاکتیکێکی قۆناغی و لە نزیکترین کاتدا لێی پاشگەز ببنەوە. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەشەوە پێمان وایە کە فیدراڵی باشترین ڕێگەیە بۆ پێکەوە ژیانی هەردوو نەتەوەی عەرەب و کورد لەگەڵ تەواوی کەمینەکانی تری ئەم وڵاتە و دەستکردن بەبونیادنانی عێراقی یەکگرتوو و پتەوکردنی یەکێتی نیشتمانی و بونیادی ناسنامەی نەتەوەیی عێراق بەجۆرێک کە شوێنی هەموو عێراقییەکانی تیادا ببێتەوە، ئەمەش تەنیا لە ڕێگەی تەنازولی بەرامبەر و گەیشتن بەیەک نەبێ لە نیوەی ڕێگادا ناهێنرێتە دی و دانانان بەمافە ڕەواکانی بەشێک لە گەلی عێراقیش هەزار جار باشترە لە تەنازولکردن بۆ وڵاتانی تر، وەک چۆن لە ڕێککەوتننامەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥دا لەنێوان عێراق و ئێراندا ڕووی دا.

لێرەشەوە جەخت لەسەر خاڵێکی دیکەی گرنگ دەکەینەوە ئەویش ئەوەیە کە قەدەری عەرەب و کورد لە عێراق ئەوەیە پێکەوە بژین، بۆیە با هەموو لایەک کار بۆ ئەوە بکەن کە ئەو قەدەرە گەشاوەبێ لە ڕێگەی دووپاتکردنەوە لەسەر ئیجابیاتەکانی و ڕێگەنەدان بەدەنگ و بانگەشە شۆڤێنییەکانی هەردوو لا کە خراپە بەرامبەر بەپەیوەندی بەهێزی نێوان عەرەب و کورد بکەن کە لە ئەنجامی بوونی یادەوەریی زیندوو نزیک بۆ دڵی ڕۆڵەکانی هەردوو میللەت چەکەرەیان کردووە. چونکە ئەو دەنگ و بانگەشانە چ لە لایەنی عەرەبییەوەبن یاخود لە لایەکی کوردی، دەبنە مایەی تێکدانی پەیوەندی مێژوویی لە نێوان ئەو دوو نەتەوە برایە.

گرنگیشە ڕوونی بکەینەوە کە پیادەکردنی سیستمی فیدراڵی لە عێراق و هەوڵی پڕکردنەوەی درزەکانی نێوان کورد و برا عەرەبەکانیان پێویستی بەلادانی هەموو ئەو ڕێو شوێنانە هەیە کە حکوومەتە عێراقییەکان هەر لەکاتی سەرژمێریی ساڵی ١٩٥٧ەوە تا

ئێستا وەکو هەوڵێک بۆ گۆڕینی مۆرکی دانیشتوان لە ژمارەیەک ناوچەی کوردی وەک کەرکووک و خانەقین و مەندەلی و سنجار و هی تریش گرتوونیەتە بەر.

٣- لەو باوەڕەداین کە پەنابردن بۆ لامەرکەزیی ئیداری هەرێمی شانبەشانی فیدراڵی، ئینجا چ لە هەرێمی عەرەبی یاخود لە هەرێمی کوردستاندا دەبێتە مایەی هێنانەدی خواستەکانی کەمینە نەتەوەیی و ئایینییەکان لە تێرکردنی تایبەتمەندییەکانیان و بوار خۆشکردن بۆ ئەو کەمینانە لەوەی بەمافە زمانەوانی و کلتورییەکانیان بەهرەمەندبن و ڕۆڵی هیچ کامێکیشیان لە کۆمەڵگای عێراقیدا فەرامۆش نەکرێ، چونکە پێمان وایە ئەو نەهێشتن و کپکردنەوەیە ئاسەواری سەلبییانەی بەدواوە دەبێ، ئەمەش لە ئەزموونەکانی ڕابردوودا بەتەواوی خۆی نواندووە.

٤- ناتوانرێ فیدراڵی بەرهەمە چاوەڕوانکراوەکانی لێ بکەوێتەوە و گەلی عێراقیش خۆشی و خۆشگوزەرانی بەخۆیەوە نابینێ تەنیا بەپیادەکردنی دیموکراسی نەبێ کە دەکرێ خۆی لە پیادەکردنی سیستمی فرە حزبی و هەڵبژاردنی گشتی ئازاد و ڕاستەوخۆ و پێکهێنانی سیستمی پەرلەمانی پشت بەستوو بەبەرپرسیارێتی حکوومەت لە بەرامبەر نوێنەرانی گەل (پەرلەمان)دا بنوێنێ، بەپێچەوانەی ئەمەو لە سایەی گرتنەبەری سیاسەتی تاکە حزبی یاخود حزبی سەرکردەدا، مرۆڤ ناکرێ بەرامبەر بەئایندەی عێراق گەشبین بێ، جا چ عێراقێکی یەکگرتوو یان یەکبوو بێ.

٥- پیادەکردنی سیستمی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان:

ئەمە بەیەکێک لە سیما سەرەکییەکانی سیستمەکانی حوکمی خاوەن دابونەریتە دیموکراسییە کۆنەکان دادەنرێ، ئینجا چ سیستمی پەرلەمانی یاخود سیستمی سەرۆکایەتییان هەڵبژاردبێ.

کۆکردنەوەی دەسەڵاتە تەشریعی و تەنفیزییەکانیش لە دەستی یەک دەزگا یاخود یەک کەسدا دەبێتە مایەی خزانی وڵات بۆ کارەسات و مەینەتی زۆر، بەهۆی نەبوونی هیچ ڕێگرێکی یاسایی کە ڕێگە لەو دەستەیە یان ئەو کەسە بگرێ لەوەی کە دەیەوێ جێبەجێی بکات، مۆنتسکیۆش لەسەر حەق بووە کاتێک لە کتێبی (روح القوانین)دا وتوویەتی: کاتێک هەردوو دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی لە دەستی یەک کەسایەتی یان دەستەیەکدا کۆکرانەوە، ئازادی نامێنێ، هەمان شت ئەگەر هەرسێ دەسەڵات بەدەستی یەک لایەن بن تەنانەت ئەگەر خودی میللەتیش بێ، ناوبراو ئەوەش دەڵێ کە پێویستییە دەسەڵاتی

هەرلایەک لە ڕێگەی دەسەڵاتی ترەوە لە شوێنی خۆیەوە بوەستێنرێ بەجۆرێک هیچ کامێکیان توانای ئەوەیان نەبێ دەسەڵات بەنابەجێیی بەکاربهێنن.

دەربارەی سیستمی سیاسی عێراقی تازەش دەکرێ بڵێین بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە سایەی یاسای بنەڕەتیی ساڵی ١٩٢٥ی عێراقدا پیادەکراوە سەرەڕای ئەو دەستێوەردانە گەورانەی کە لە پرۆسەکانی هەڵبژاردنی ئەوکاتەدا دەکرا لە هەوڵێکدا بۆ گەیاندنی نوێنەرانی لایەنگری حکوومەت بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران. بەڵام زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین ئەو بنەمایە بەتەواوەتی فەرامۆش کرا لە سایەی دەستوورە کاتییەکاندا کە لە دوای دروستبوونی سیستمی کۆماریدا دەرکران، هەر لەو دەستوورە کاتییەوە کە لە ٢٧ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨ دەرکرا تا دەستووری ئێستا کە لە ١٦ی تەمموزی ساڵی ١٩٧٠ وە ڕاگەیەنراوە. بەپێی دەستووری ئەم دواییەش ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەسەڵاتی تەشریعی باڵایە لە وڵات سەرەڕای بوونی ئەنجوومەنی نیشتمانی کە ئەندامانی لە لایەن هاووڵاتیانەوە هەڵدەبژێردرێن، و بڕگەی (أ)ی ماددەی (٤٢)ی دەستووری ناوبراو ڕێگە بەئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەدات ئەو یاسا و بڕیارانە دەربکات کە هێزی یاسایان هەیە.

٦- پیادەکردنی بنەمای سەروەریی یاسا لەسەر هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە کارپێکراوەکان لە کۆمەڵگا و دانانی یاسا لە سەرووی هەمووانەوە، ئەمەش لە ڕێگەی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی دادوەریی ئازاد لە هەموو ئەو کۆت و بەربەستانەی دێتە دی کە لەوانەیە لە لایەن دەسەڵاتەکانی ترەوە بەسەریدا بسەپێنرێن،

هەروەها لە ڕێگەی پیادەکردنی ئەو بنەمایە وەدی دەهێنرێ کە دەڵێت: قەزاو دادوەری سەربەخۆیە و تەنیا دەسەڵاتی یاسا نەبێ هیچ دەسەڵاتێکی دیکەی بەسەرەوە نییە.

ئەوەشمان لەیاد نەچێ ئاماژە بەزەروورەتی بوونی دادگای دەستووری بکەین کە دەبێ خاوەنی ئاستێکی پێویست لە سەربەخۆیی و بێ لایەنی بێت بەجۆرێک بتوانێ ئەو مەسەلانە یەکلایی بکاتەوە کە لە بواری چاودێریکردنی دەستووریبوونی یاسا و کێشەکاندا کە سەبارەت بەتایبەتمەندییەکان لە نێوان دامودەزگاکانی یەکیەتی و دەزگاکانی هەرێمە فیدراڵییەکاندا ڕوو دەدەن.

٧- هێنانە دی بنەمای یەکسانیی دەرفەتەکان و یەکسانیکردن لە نێوان هەموو عێراقییەکان و جیاوازی نەکردن لە نێوانیاندا بەهۆی ڕەگەز یان ئایین یان زمان،

بەتایبەتیش لە بواری وەرگرتن لە زانکۆکان و وەرگرتنی وەزیفە گشتییەکان و چوونە ڕیزی سوپا و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆیی و بوارەکانی دیکە.

٨- لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەی باسمان کرد و دوای ئەوەی بەدووروودرێژی لە بەشە جیاجیاکانی ئەو تێزەدا پڕژاینە سەر سیماو بنەماکانی یەکێتی فیدراڵی و گفتوگۆی وردیشمان دەربارەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەو سیستەمە کرد، هەروەها پاش ئەوەی گونجانی ئەو جۆرە ڕێکخستنە سیاسییەشمان بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی فرەلایەنی لە عێراق و چارەسەرکردنی کێشەی کورد ڕوونکردەوە، ئەو کێشەیەی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ تەواوی عێراقییەکانی بەکورد و عەرەبەوە سەرقاڵ کردووە و تا ئەمڕۆش وەکو برینێکی خوێن لێ ڕژاو لە جەستەی عێراقدایە. دوابەدوای ئەو لێکۆڵینەوە تێرەش پێمان وایە کاتی ئەوە هاتووە ئەو پرسیارەی خوارەوە بخەینە ڕوو ئەویش: تا چەند دەتوانرێ فیدراڵی لە عێراق پیادەبکرێ هەروەها دەرفەتەکانی سەرکەوتنی سیستەمی فیدراڵی چین لە کاتێکدا ئەگەر لەو وڵاتەدا پێڕەوبکرێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی بەشی یەکەمی پرسیارەکە دەڵێین ڕەشبینی نییە یاخود پێچەوانەی ڕاستییەکان نییە ئەگەر بڵێین مەرجەکانی پیادەکردنی فیدراڵی و گرتنەبەری لە عێراقدا وەکو پێویست بەهێزنین و بەڵگەی بەهێزیش لە ئارادانین کە ئاخۆ حاڵی حازر لە وڵاتەکەماندا پیادە دەکرێ چونکە وەک ئاشکرایە یەکێتی فیدراڵی ئەو سیستەمی حوکمەیە کە لە لایەن دەوڵەتی یەکیەتی پێڕەودەکرێت و لە لایەن خۆیەوە تەنازول لە بەشێک دەسەڵاتی خۆی دەکات بۆ هەرێم یان ویلایەتەکانی و بناغەی خۆشی لە دەستووری فیدراڵیدا دەبینێتەوە، ئەمەش پێویستی بەوەرچەرخانی شێوازی دەوڵەت هەیە لە دەوڵەتێکی یەکبووی ساکارەوە بۆ دەوڵەتێکی لێکدراوی فیدراڵیدا، بەمەش دەرفەتەکانی ڕوودانی گۆڕانکاری دەستووریی و بنەڕەتی لەو جۆرە لاوازن لە ژێر سایەی سیستەمی دەسەڵات لە بەغدا، ئەمەش لە ژێر ڕۆشنایی پاشکۆی دەستووری حکوومەتی ئێستای عێراق، هەر لە گەیشتنەوە بەدەسەڵات لە تەمموزی ساڵی ١٩٦٨ تا ڕۆژی ئەمڕۆمان، بەوپێیەی ئەو حکوومەتە لەسەر سیستەمێکی ناوەندی توندەوە بونیادکراوە و کار بەبنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکتر ناکات، هەروەها ماوەی سی ساڵیش دەبێ وڵات هێشتا لە قۆناغی ئینتیقالیدا دەژی چونکە ئەو دەستوورە کاتییەی کە ئەو حکوومەتە لە ١٦ی تەمموزی ساڵی ١٩٧٠ دەری کرد، هێشتا کاری پێ دەکرێ و تەنیا ناوی گۆڕاوە بۆ دەستووری هەمیشەیی بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانێک لە دەقەکانیدا بکرێ، ئەگەر چیش ئەو

دەستووره لە مادەی ٤٧ یدا بڕیار لەسەر دامەزراندنی ئەنجوومەنی نیشتمانی دەدات لەسەر ئەساسی هەڵبژاردنی گشتی نهێنی ئازاد و ڕاستەوخۆ لە لایەن دانیشتوانی وڵات، بەڵام دەکرێ بوترێ هەڵبژاردنی ئازاد تا ئێستا لەو وڵاتەدا بوونی نییە و لەو ئەنجوومەنەشدا تەنیا بۆ پاڵێوراوانی حکوومەت نەبێ جێگا بۆ کەسێکی دیکە نییە و ئەنجوومەنی ناوبراو ئەرکەکانی دەسەڵاتی تەشریعی ئاسایی ئەنجام نادات وەکو ئەنجوومەنی وڵاتانی تر، سەرەڕای بوونی ئەو دامودەزگایەش هێشتا ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەدەسەڵاتی تەشریعی دادەنرێ لە وڵاتدا و بەپێی بڕگەی (أ) لە ماددەی (٤٢)ی دەستووری ناوبراودا ئەرکی داڕشتنی ئەو یاسا و بڕیارانەی لە ئەستۆدایە کە هێزی یاسایان هەیە.

لە لایەکی دیکەوە ڕەزامەندیی ئەنجوومەنی نیشتیمانی لەسەر پرۆژەی هەر یاسایەک کیفایەت نییە بۆ داڕشتنی، بەڵکو دەبێ ئەو پرۆژەیە ڕەزامەندی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش وەربگرێ کە مافی ڕەتکردنەوە یان هەموارکردنیشی هەیە. سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، سەرۆکایەتی کۆمار و دەسەڵاتی تەنفیزیش دەگرێتە دەست، بەمەش هەردوو دەسەڵاتی تەشریعی و تەنفیزی بەدەستی لایەنێکەوەن.

کەواتە لە کاتێکدا ئەگەر سیستمی حوکم بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و دابەشکردنیان لە ناوەند نەگرێتە بەر، چۆن چاوەڕان بکرێ دەسەڵاتی سیاسی لە نێوان ناوەند و هەرێمەکاندا دابەش بکات؟

هەروەها سەرنەکەوتنی ئەزموونی ئۆتۆنۆمیی لە کوردستانی عێراقدا- کە لە ڕابردوودا درێژەمان ڕوون کردۆتەوە- بەتاڵکردنی لە ناوەڕۆکە سەرەکیەکەی، ئەگەر چی تەنیا شێوازێکی پێشکەوتووی لامەرکەزی ئیداریش بێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەیەکی دیکەیە بۆ ڕاستیی ئەوەی کە ئێستا باسمان لێوەکرد.

دەربارەی بەشی دووەمی پرسیارەکەش کە سەبارەت بەدەرفەتەکانی سەرکەوتنی یەکێتی فیدراڵییە لە کاتێکدا ئەگەر لە عێراق پیادە بکرێ دەڵێین: ئەوانیش دەرفەتی لاوازن و هیچ دەرفەتێکی پێویست بۆ سەرکەوتنی ئەو سیستمە لە ئارادنییە، لەبەر هۆیەکی ساکار، ئەویش ئەوەیە کە یەکێتی فیدراڵی لە هەموو کات و شوێنێکدا ڕێگە چارەیەکی ئامادەکراو نییە بۆ پیادەکردن و سەرکەوتن، بەڵکو سیستمێکە بۆ حوکمی وڵات و پیادەکردنیشی پێویستی بەگۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە زۆربەی دامودەزگا سیاسییەکاندا

هەیە و کاریگەریشی بۆ سەر لایەنی گەورە لە ژیانی کۆمەڵگادا دەبێ، بەم جۆرە سەرکەوتنی یەکێتی فیدراڵی پێداویستی زۆری مەبەستە لە نێوانیاندا بوونی ژینگەیەکی گونجاو بۆ کاری دامودەزگاکانی ئەو سیستمە، ئینجا چ لەسەر ئاستی یەکیەتی بێ یاخود لەسەر ئاستی هەرێمەکان، یەکێک لە گرنگترین پێداویستییەکانی ئەو سیستمە سیاسییەش بوونی ئاستی شارستانی و ڕۆشنبیری پێویستە، بەو پێیەی فیدراڵی بریتییە لە مومارەسەیەکی دیموکراسی و پێویستی بەئاستێکی شارستانی تەواو هەیە چ لە لایەن فەرمانڕەواکان یاخود لەسەر ئاستی میللەت و کۆمەڵگا.

ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە یەکێک لە پێداویستییە گرینگەکانی سەرکەوتنی فیدراڵی بوونی سیستمی فرە حزبی و کاری سیاسی و هەڵبژاردنی ئازادە، ئاشکراشە حاڵی حازر خاوەنی ئەو جۆرە فرە حزبییە نین و تا ئێستاش دەسەڵات سیستمی حزبی سەرکردە دەگرێتە بەرو ڕێگەش بەبوونی ئۆپۆزسیۆنی بەرپرسیار نادات کە خۆی لە خۆیدا پێچەوانەی بنەمای فیدراڵییە.

لەنێو لاپەڕەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیەشدا بۆمان روون بۆتەوە کە یەکێتی فیدراڵی ئەو کاتە سەردەکەوێ و ڕەگەکانیشی توند دەبن کە سیستمی کارپێکراو لە وڵاتدا دیموکراسی بێ و کار بە فرە حزبی بکات و بەشێوەیەکی ڕەسمیش ڕێگە بەبوونی ئۆپۆزسیۆن بدات، بەپێچەوانەشەوە چارەنووسی ئەو ئەزموونە فیدراڵییانەی کە لەو وڵاتانەدا پیادە کراون کە فرەلایەنی و دیموکراسی پیادە ناکەن، یان سەرنەکەوتن یاخود چەقین و نەمان بووە هەر ئەوەشمان لەو ئەزموونە فیدراڵییانەدا بینی کە لە دەوڵەتە ناوەندییەکانی ئەمریکای باشوور پیادەکران. ئەمەش دەلالەتێکی ئاشکرایە بۆ ئەوەی کە هەرگیز ناکرێ لە یەک کۆمەڵگادا فیدراڵی و سیستمە شمولی و چەوسێنەرەکان پێکەوە هەڵبکەن و بژین، بەڵکو سیستمی فیدراڵی پێویستی بەکۆمەڵگایەک هەیە کە فرە لایەنی لە دامودەزگا سیاسییەکان و فرە حزبی و فرە هزری باڵیان بەسەردا کێشابێ، دواتر پێویستی بەشێوازێکی دیاریکراو لە مامەڵەی شارستانی و گۆڕانێکی بنەڕەتی لە هەڵسوکەوتی ڕۆڵەکانی کۆمەڵگا هەیە، ئینجا چ کار بەدەست بن یاخود میللەت بێت. دەشکرێ بوترێ ئەو شێوازەی باسی لێوەکرا هێشتا بەگشتی لە دەوڵەتانی جیهانی سێدا بوونی نییە، هەر ئەمەش دەتوانێ یەکێک لە هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی ئەو ئەزموونە فیدراڵییەمان بۆ شرۆڤە بکات کە لە نیسانی ساڵی ١٩٦٣دا لە نێوان میسر و عێراق و سوریا پێکهێنرا.

بەم جۆرە زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین هێشتا خولێکی دوورودرێژ و کۆششێکی گەورەمان لەبەر دەمدا ماوە لە عێراق بەر لەوەی وەکو خۆی و بەتەواوی پیادەکردنی فیدراڵی ببینین، بەڵام ئەمە ڕێگر نابێ بۆ ئەوەی بانگەشە بۆ پیادەکردنی بکەین و داوای دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی بۆ بکەین لە سەروویانەوە داننان بەبنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و بوار خۆشکردن بۆ ئازادی کاری سیاسی و فرە حزبی و داننان بەهەڵبژاردنی ئازاد و بوونی ئۆپۆزسیۆنی ڕەسمی، چونکە سیستمی فیدراڵی بەبۆچوونی ئێمە شێوازێکی دەستووریی زۆر گونجاوە بۆ پێکەوە ژیانی هەردوو نەتەوەی عەرەب و کوردی برا و لەوانەشە ئەو ململانێیەی ئێستا لە عێراق هەیە سەبارەت بەکێشەکەی کورد، بیکات بەهۆکارێکی هێز لە دژی دوژمنی هاوبەش، هەروەها دەرفەتی مێژوویش بۆ پێشکەوتن بەعێراقی یەکگرتوو دەبەخشێ، ئەو کارەی کە لەوانەیە ڕۆڵی نەتەوایەتی پێویست بخولقێنێ لەسەر ئاستی گۆڕەپانی عەرەبی و بەشداربوون لە خەباتی ڕەوا بۆ گێڕانەوەی قودسی پیرۆز.

# سەرچاوەکان

یەکەم: سەرچاوە عەرەبییەکان

أ- سەرچاوە یاساییەکان

١- دکتۆر ئیبراهیم عەبدولعەزیز ئەلشیحا- مبادئ الأنظمة السیاسیة- الدول- الحکومات- خانەی الجامعیة بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- بەیروت ١٩٨٢.
٢- دکتۆر ئیبراهیم عەبدولعەزیز ئەلشیحا- الوجیز في النظم السیاسیة والقانون الدستوري- لێکۆڵینەوەیەکی شرۆڤە- کارییە بۆ سیستەمی دەستووریی لوبنانی- خانەی الجامعیة بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- بەیروت.
٣- دکتۆر ئیبراهیم عەبدولعەزیز ئەلشیحا- الوسیط في القانون الأداري- خانەی الجامعیة بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- بەیروت ١٩٩٦.
٤- دکتۆر ئیبراهیم عەبدولکەریم ئەلغازی- الدولة والنظم السیاسیة مع اسس نظام الحکم في الأسلام- خانەی المتنبی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- ١٩٨٩.
٥- دکتۆر ئەدمون رباط- الوسیط في القانون الدستوري العام- بەشی یەکەم- الدولة في الماضي والحاضر- خانەی العلم للملایین- بەیروت ١٩٦٤.
٦- الأحکام السلطانیة- دادوەر ئەبی یەعلی محەمەدین حوسێن ئەلفەراء حەنبەلی- لە ساڵ ٤٥٨ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە- خوالێخۆشبوو محەمەد حامد ئەلفەقێ ڕاستی کردۆتەوە و پێیدا چۆتەوە- کۆمپانیا و کتێبخانە و چاپخانەی مستەفا بابلیی حەلەبی و کوڕەکانی لە میسر- چاپی دووەم- ١٩٦٦.
٧- الأحکام السلطانیة والولایات الدینیة- ئەبی حەسەن عەلی بن محەمەد بن حەبیب ئەلبەسری بەغدادی ماوردی، ساڵی ٤٥٠ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە- دانانی ڕەشید ئەلجومەیلی- لە بڵاوکراوەکانی المکتبة العالمیة- بەغدا- خانەی الحریة بۆ چاپکردن- بەغدا- ١٩٨٩.
٨- دکتۆر ئەحمەد سەرحال- القانون الدستوري والأنظمة السیاسیة- النظریة العامة أهم الأنظمة السیاسیة في العالم- خانەی الحداثة- بەیروت- چاپی یەکەم ١٩٨٠.
٩- دکتۆر ئەحمەد کەمال ئەبولمەجد- الرقابة علی دستوریة القوانین في الولایات المتحدة الأمریکیة والأقلیم المصري- کتێبخانەی النهضة العربیة- قاهیرە ١٩٦٠.
١٠- دکتۆر ئەحمەد عەبدولقادر ئەلجەمال- بحوث ودراسات في القانون الدولي العام- کتێبخانەی النهضة المصریة- قاهیرە.
ئەندرێ هوریو- القانون الدستوري والمؤسسات السیاسیة- بەشی یەکەم- وەرگێڕانی عەلی مقلد و شەفیق حەداد و عەبدولحەسەن سەعد- ئەلئەهلیە بۆ بڵاوکردنەوە- بەیروت ١٩٧٤.

١٢- ئەنوەر ئەلخەتیب- المجموعة الدستورية- بەشی یەکەم- الدولة والنظم السياسية- النظم السياسية- بەیروت- چاپی یەکەم ١٩٧٠.
١٣- دکتۆر ئیسماعیل میرزا- القانون الدستوري- لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارە بۆ دەستووری لیبی و دەستووری دەوڵەتانی عەرەبی دیکە- خانەی صادر- بەیروت ١٩٦٩.
١٤- دکتۆر ئیسماعیل ئەلغەزال- القانون الدستوري والنظم السياسية- دەزگای الجامعية بۆ دیراسات و چاپ و بڵاوکردنەوە- بەیروت چاپی یەکەم ١٩٨٢.
١٥- دکتۆر ئەلشافعی محەمەد بەشیر- نظرية الأتحاد بين الدول وتطبيقاتها بين الدول العربية- بەڕێوەبەرایەتی المعارف لە ئەسکەندەریە- چاپی یەکەم- ١٩٦٣.
١٦- دکتۆر ئەلشافعی محەمەد بەشیر- القانون الدستوري والنظم السياسية السودانية- لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە لەگەڵ سیستم و دەستوورەکانی میسریدا- بەشی یەکەم- المبادئ الدستورية العامة- الدولة وأشكالها- بەڕێوەبەرایەتی المعارف لە ئەسکەندەریە- ١٩٧٠.
١٧- دکتۆر ئەلشافعی محەمەد بەشیر- القانون الدولي العام في السلم والحرب- بەڕێوەبەرایەتی المعارف لە ئەسکەندەریە- ١٩٧١.
١٨- هیشام ئال شاوی- مقدمة في علم السياسة- دەزگای دار الكتب بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە لە زانکۆی مووسڵ.
١٩- دکتۆر زوهێر شوکر- الوسيط في القانون الدستوري- بەشی یەکەم- القانون الدستوري والمؤسسات السياسية- النظرية العامة والدول الكبرى- خانەی مستەفا بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- بەیروت- چاپی سێیەم ١٩٩٤.
٢٠- زوهدی یەکن- القانون الدستوري والنظم السياسية- چاپخانەکانی جۆزیف سەلیم سیقلی- بەیروت- ١٩٥٥- ١٩٥٦.
٢١- دکتۆر حامد سوڵتان- القانون الدولي العام في وقت السلم- خانەی النهضه العربية- قاهیرە- چاپی دووەم ١٩٦٥.
٢٢- دکتۆر حەمید ئەلساعدی- مبادئ القانون الدستوري وتطور النظام السياسي في العراق- چاپخانەکانی دار الحكمة بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- مووسڵ ١٩٩٠.
٢٣- دکتۆر حەسەن چەلەبی- القانون الدولي العام- بەشی یەکەم- أصول القانون الدولي العام- الدولة- چاپخانەی شەفیق- بەغدا ١٩٦٤.
٢٤- حوسێن عەلی ئەلحبیشی- تقرير المصير- خانەی الكاتب العربي ١٩٦٧.
٢٥- حەسەن ئەلحەسەن- القانون الدستوري والدستور في لبنان- بڵاوکراوەکانی خانەی مكتبة الحياة- بەیروت- چاپی دووەم.
٢٦- دکتۆر طعیمە ئەلجرف- نظرية الدول والأسس العامة للتنظيم السياسي- کتێبخانەی قاهیرەی تازە- قاهیرە ١٩٦٤.

٢٧- دكتۆر طعيمه ئەلجرف- القانون الأداري- كتێبخانەی قاهیرەی تازە- قاهیره ١٩٦٣- ١٩٦٤.
٢٨- دكتۆر یەحیا ئەلجەمەل- الأنظمة السیاسیة المعاصرة- خانەی النهضة العربیة بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە- بەیروت- ١٩٦٩.
٢٩- دكتۆر كەمال ئەلغالی- مبادئ القانون الدستوري والأنظمة السیاسیة- چاپخانەی زانكۆی دیمەشق- چاپی دووەم ١٩٦٧- ١٩٦٨.
٣٠- دكتۆر ماهر سالح عەلاوی ئەلجبوری- القانون الأداري- چاپخانەی فێركردنی باڵا- مووسڵ ١٩٨٩.
٣١ دكتۆر محەمەد بەكر حەسەن- النظام الفدرالي بين النظرية والتطبيق- چاپخانەی دارنشر الثقافة ١٩٧٧.
٣٢- دكتۆر محەمەد هەمەوەندی- الحكم الذاتي والنظم اللامركزية الأدارية والسياسية- خانەی المستقبل العربي- قاهیره- چاپی یەكەم ١٩٩٠.
٣٣- دكتۆر محەمەد حافز غانم- مبادئ القانون الدولي العام- چاپخانەی النهضة الجديدة- قاهیره ١٩٦٧.
٣٤- دكتۆر محەمەد تەی- القانون الدستوري والمؤسسات السياسية- چاپی یەكەم ١٩٦٤.
٣٥- دكتۆر محەمەد یەعقوب ئەلسەعیدی- مبادئ القانون الأداری- بەشی یەكەم- چاپخانەی زانكۆ بەغدا.
٣٦- دكتۆر محەمەد كامیل لیله- النظم السیاسیة- الدولة والحكومة- خانەی الفكر العربي- قاهیره ١٩٦٧- ١٩٦٨.
٣٧- دكتۆر محەمەد عەبدولموعیز نەسر- في النظريات والنظم السياسية- خانەی النهضة العربية بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە- بەیروت ١٩٧٥.
٣٨- دكتۆر محەمەد فاروق ئەلنەبهان- نظام الحكم في الأسلام- بڵاوكراوەكانی زانكۆی كوێت ١٩٨٧.
٣٩- دكتۆر محەمەد فەتوح محەمەد عوسمان- رئيس الدولة في النظام الفدرالي- دەستەی گشتی میری بۆ كتێب- ١٩٧٧.
٤٠- دكتۆر مەحموود حلمی- المبادئ الدستورية العامة- خانەی الفكر العربي- قاهیره ١٩٦٤.
٤١- دكتۆر مەحموود محەمەد حافز- موجز القانون الدستوري- المبادئ الدستورية العامة والدستور المصري- خانەی الفكر العربي- قاهیره- لیژنەی البيان العربي ١٩٥٦.
٤٢- دكتۆر مەحموود سامی جنینه- القانون الدولي العام- چاپخانەی الأعتماد- قاهیره.
٤٣- دكتۆر موحسین خەلیل- النظم السیاسیة والدستور- خانەی النهضه بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە- بەیروت ١٩٧٥.
٤٤- دكتۆر موحسین خەلیل- النظم السیاسیة والقانون الدستوري- بەرێوەبەرایەتی المعارف لە ئەسكەندەریە- چاپی دووەم ١٩٧١.

٤٥- دکتۆر فیشال خطار ئەلرەیاشی- إسهام في دراسة النظمية التقليدية للدولة الفدرالية- تێزێکی دکتۆرایە لە ماف- زانکۆی لوبنان- بەیروت ١٩٩٢.

٤٦- دکتۆر مونزیر ئەلشاوی- القانون الدستوري- نظرية الدولة- لە بلاوکراوەکانی ناوەندی لێکۆڵینەوە یاساییەکان- خانەی قادسیە بۆ چاپکردن- بەغدا ١٩٨١.

٤٧- دکتۆر مستەفا کامیل- شرح القانون الدستوري والقانون الاساسي العراقي- چاپخانەی سەلام- بەغدا- چاپی پێنجەم- ١٩٤٧- ١٩٤٨.

٤٨- نورمان د. پالمەر- النظام السياسي في الهند- وەرگێرانی دکتۆر محەمەد فەتحوڵڵا ئەلخەتیب و حەسەن جەلال عروسی- کتێبخانەی ئەنجلۆ میری ١٩٦٥.

٤٩- دکتۆر سلێمان محەمەد ئەلتەماوی- النظم السياسية والقانون الدستوري- دراسة مقارنة- ١٩٨٨.

٥٠- دکتۆر سلێمان محەمەد ئەلتەماوی- السطات الثلاث في الدساتير العربية المعاصرة وفي الفكر السياسي الاسلامي- چاپخانەی عەین شەمس- چاپی پێنجەم ١٩٨٦.

٥١- دکتۆر سلێمان محەمەد ئەلتەماوی- الوجيز في القانون الأداري- لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە- خانەی الفكر العربي- قاهیرە ١٩٧٥.

٥٢- دکتۆر سەعد عصفور- القانون الدستوري- مقدمة القانون الدستوري- بەڕێوەبەرایەتی المعارف لە ئەسکەندەریە- چاپی یەکەم- ١٩٥٤.

٥٣- عارف ئەلحمسانی- محاضرات في النظم السياسية والقانون الدستوري- بەڕێوەبەرایەتی کتێب و بلاوکراوە زانکۆییەکان ١٩٦٣- ١٩٦٤.

٥٤- دکتۆر عەبدولحەمید متوەلی- القانون الدستوري والأنظمة السياسية- بەشی یەکەم- چاپی سێیەم ١٩٦٤.

٥٥- دکتۆر عەبدولحەمید متوەلی- مبادئ نظام الحكم في الأسلام مع المقارنة بالمبادئ الدستورية الحديثة- بەڕێوەبەرایەتی المعارف لە ئەسکەندەریە- چاپی سێیەم ١٩٧٧.

٥٦- دکتۆر عەبدولحەمید متوەلی- الأنظمة السياسية والمبادئ الدستورية العامة في الأنظمة الغربية- الماركسية- قاهیرە- ١٩٥٧.

٥٧- دکتۆر عەبدولمەجید عەباس- القانون الدولي العام- چاپخانەی النجاح- بەغدا ١٩٤٧.

٥٨- دکتۆر عەبدولحوسێن ئەلقتیفی- القانون الدولي العام- بەشی یەکەم- في أصول القانون الدولي العام- چاپخانەی العانی- بەغدا ١٩٧٠.

٥٩- دکتۆر عەبدولعەزیز محەمەد سالمان- رقابة دستورية القوانين- خانەی الفكر العربي- قاهیرە- چاپی یەکەم ١٩٩٥.

٦٠- عەبدولرەحمان بەزاز- الدولة الموحدة والدولة الاتحادية خانەی القلم- چاپی سێیەم ١٩٦٦.

٦١- دكتۆر عەبدولغەنی بەسیونی عەبدوڵلا- النظم السياسية والقانون الدستوري- خانەی الجامعية بۆ چاپ و بلاوكردنەوە- بەیروت ١٩٩٣.
٦٢- دكتۆر عەلی سادق ئەبو هیف- القانون الدولي العام- بەڕێوەبەرایەتی المعارف لە ئەسكەندەرییە- چاپی یازدەهەم.
٦٣- دكتۆر عوسام سلێمان- الفدرالية والمجتمعات التعددية ولبنان- خانەی العلم للملايين- بەیروت- چاپی یەكەم ١٩٩١.
٦٤- دكتۆر عوسمان خەلیل عوسمان- القانون الدستوري- المبادئ الدستورية العامة والنظام الدستوري المصري-خانەی الفكر العربي- قاهیرە- چاپی پێنجەم ١٩٩٥.
٦٥- دكتۆر عوسمان خەلیل عوسمان و دكتۆر سلێمان الطماوی- المبادئ العامة والدستور المصري- خانەی الفكر العربي- قاهیرە- چاپخانەی الأعتماد- چاپی سێیەم ١٩٥١- ١٩٥٢.
٦٦- دكتۆر فائیز عەزیز ئەسعەد- انحراف النظام البرلماني في العراق- چاپخانەی سندباد- بەغداد- چاپی دووەم ١٩٨٤.
٦٧- دكتۆر فوئاد ئەلعەتار- النظم السياسية والقانون الدستوري- خانەی النهضة العربية- بەیروت ١٩٦٥- ١٩٦٦.
٦٨- فەتحی ڕەزوان- الدول والدساتير- دروس في المبادئ الدستورية العامة- خانەی النهضة العربية١٩٦٥- ١٩٦٦.
٦٩- دكتۆر شاب تۆما مەنسور- القانون الاداری- كتێبی یەكەم- چاپخانەی دار العراق بۆ چاپ و بلاوكردنەوە بەغدا- چاپی یەكەم ١٩٧٩- ١٩٨٠.
٧٠- دكتۆر ثەروەت بەدەوی- النظم السياسية- بەشی یەكەم- النظرية العامة للنظم السياسية- خانەی النهضة العربية ١٩٦٤.
٧١- دكتۆر خالید قەبانی- اللامركزية ومسألة تطبيقها في لبنان- بلاوكراوەكانی بحر المتوسط وعويدات- بەیروت- پاریس- چاپی یەكەم ١٩٨١.
٧٢- دكتۆر سەید خەلیل هەیكەل- القانون الدستوري والأنظمة السياسية ١٩٨٣- ١٩٨٤.
٧٣- دكتۆر غەسان بەدرەدین و دكتۆر عەلی عوازە- المؤسسات السياسية والقانون الدستوري- خانەی الحقيقة- بەیروت- چاپی یەكەم ١٩٩٧.

ب- سەرچاوە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان:

٧٤- ئەمیر شەرەفخانی بەدلیسی- شەرەفنامە- لە مێژووی دەوڵەت و میرنشینە کوردییەکاندا- جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٧٥- ئەبو خەلدون ساتع ئەلحوسەری: ماهي القومية؟ چەند لێکۆڵینەوە و دیراسەیەک لەسەر ڕۆشنایی ڕوودا و و تیۆرەکاندا- مرکز دراسات الوحدة العربية- زنجیرەی کلتووری نەتەوەیی- بەرهەمە نەتەوەییەکانی ساتع ئەلحوسەری- بەیروت- چاپی دووەم- ١٩٨٥.

٧٦- ئیبن خەلدون- مقدمة تاريخ ابن خلدون- جلدی یەکەم- خانەی بەیان- بەیروت.

٧٧- ئەدمون غەریب- الحركة القومية الكردية- خانەی النهار بۆ بڵاوکردنەوە- بەیروت ١٩٧٣.

٧٨- ئەحمەد فەوزی- خناجر وجبال- قاسم والأكراد.

٧٩- باسل نیکیتین- الأكراد- خانەی الروائع- بەیروت- ١٩٦٧.

٨٠- جەلال تاڵەبانی- كردستان والحركة القومية الكردية- خانەی الطليعة بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- بەیروت- چاپی دووەم ١٩٧١.

٨١- دکتۆر جەعفەر عەباس حمیدی- التطورات والأتجاهات السياسية الداخلية في العراق ١٩٥٣- ١٩٥٨ تێزێکی دکتۆرایە پێشکەشی زانکۆی بەغدا کراوە- چاپی یەکەم ١٩٨٠.

٨٢- جەزا تۆفیق تالب- سكان اقليم كردستان العراق- دراسة في الجغرافية السياسية- نامەیەکی ماستەرە ئاراستەی کۆلیژی ئاداب لە زانکۆی سەلاحەدین کراوە- ئاداری ساڵی ١٩٩٥.

٨٣- دریە عەونی- عەرەب واکراد- خصام أم وئام- خانەی الهلال.

٨٤- هادی حەسەن علیوی- عبدالكريم قاسم- الحقيقة- خانەی الحرية بۆ چاپکردن ١٩٩٠.

٨٥- دکتۆر وەلید محەمەد سەعید ئەعزەمی- انتفاضة رشيد عالي الكيلاني والحرب العراقية- البريطانية ١٩٤١- خانەی واست بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- بەغدا ١٩٨٧.

٨٦- دکتۆر زێدان عەبدولباقی- القومية العربية والمجتمع العربي- کتێبخانەی النهضة المصرية ١٩٧٤.

٨٧- دکتۆر حامد مەحموود عیسا- المشكلة الكردية في الشرق الأوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١- کتێبخانەی مەدبولی ١٩٩٢.

٨٨- حەنا بەتاتو- الطبقات الاجتماعية والحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام الجمهورية- کتێبی یەکەم عەفیف ڕەزاز وەریگێڕاوە- دەزگای الأبحاث العربية- بەیروت- چاپی یەکەمی عەرەبی ١٩٩٠.

٨٩- حەسەن مستەفا- البارزانيون وحركات بارزان ١٩٣٢- ١٩٤٧ خانەی آفاق عربية بۆ ڕۆژنامەوانی و بڵاوکردنەوە- بەغدا- چاپی دووەم ١٩٨٣.

٩٠- تالیب عەبدولجەبار حەیدەر- المسألة الكردية في الوثائق العراقية- المشكلة- الحل- النتيجة،

نامەیەکی ماستەرە لە زانستە سیاسییەکان، ئاراستەی کۆلیژی یاسا و سیاسەت لە زانکۆی بەغدا کراوە- تەمموز ١٩٨٢.
٩١- دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد- كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى- وەرگێرانی محەمەد مەلا عەبدولکەریم- چاپخانەی المجمع العلمي الكردي- بەغدا ١٩٧٧.
٩٢- دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد- دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية- چاپخانەی الحوادث- بەغدا ١٩٧٨.
٩٣- دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد- صفحات من تاريخ العراق المعاصر- لێکۆڵینەوەیەکی شرۆڤەکارییە- لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی البدليسي- بەغدا ١٩٨٧.
٩٤- لەیس عەبدولحوسێن زوبێدی- شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە عێراق- الحرية بۆ چاپکردن- بەغدا ١٩٧٩.
٩٥- لوقا زودو- المسألة الكردية والقوميات العنصرية في العراق- بەیروت- چاپی یەکەم ١٩٦٩.
٩٦- دکتۆر مەجید خەدوری- العراق الجمهوري- الدار المتحدة بۆ بڵاوکردنەوە- بەیروت- چاپی یەکەم ١٩٧٤.
٩٧- میخائیل گۆرباچۆف- إعادة البناء والفكر الأشتراكي- وەرگێرانی دکتۆر عەباس خەلەف- کۆمپانیای المعرفة بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە- بەغدا ١٩٩٠.
٩٨- دکتۆر محەمەد کامل لیله- المجتمع العربي والقومية العربية- خانەی الفكر العربي ١٩٦٦.
٩٩- مەحموود دوڕە- القضية الكردية- بڵاوکراوەکانی خانەی الطليعة- بەیروت- چاپی دووەم ١٩٦٦.
١٠٠- مقەدەم مونز مووسڵی- عرب واكراد، رؤية عربية للقضية الكردية- خانەی الغصون- بەیروت- چاپی یەکەم ١٩٨٦.
١٠١- مسعود بارزانی- البارزاني والحركة التحررية الكردية- ڕاپەڕینی یەکەمی بارزان ١٩٣١- ١٩٣٢- کوردستانی عێراق- کانوونی دووەمی ١٩٨٦.
١٠٢- مسعود بارزانی- البارزاني والحركة التحررية الكردية- ڕاپەڕینی یەکەمی بارزان ١٩٣١- ١٩٣٢- کوردستانی عێراق- کانونی دووەمی ١٩٨٦.
١٠٣- مسعود بارزانی- البارزاني و الحركة التحررية الكردية- کورد و شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨، ١٤ی ١٩٥٨- ١١ی ئەیلولی ١٩٦١- کوردستانی عێراق ١٩٩٠.
١٠٤- سی. جی. ئەدموندز- کرد وترک وعرب- وەرگێرانی جەرجیس فەتحوڵڵا- چاپخانەی التايمس- بەغدا.
١٠٥- دکتۆر سەعد ناجی جەواد- العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨- ١٩٧٠- خانەی اللام- لەندەن ١٩٩٠.
١٠٦- عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی- تأريخ الوزارات العراقية- ١٠ بەش- چاپخانەکانی دار الشؤون الثقافية العامة- بەغدا- چاپی شەشەم ١٩٨٨.

١٠٧- عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی- تاريخ العراق السياسي الحديث - بەشی یەکەم و دووەم و سێیەم- چاپخانەی دار الکتب- بەیروت - چاپی چوارەم ١٩٨٠.
١٠٨- عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی- العراق قديماً وحديثاً - چاپخانەی العرفان سەیدا (لبنان)- چاپی سێیەم ١٣٧٧ی کۆچی، ١٩٥٨ میلادی.
١٠٩- عەبدولڕەحمان بەزاز- العراق من الأحتلال حتى الأستقلال- چاپخانەی العاني- بەغدا- چاپی سێیەم ١٩٦٧. ١١٠- دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو- کردستان والأكراد- دەزگای اللبنانیة بۆ بلاوکردنەوە- بەیروت.
١١١- دکتۆر فازل حوسێن- مشكلة الوصل- دراسة في الدبلوماسية العراقية- الأنكليزية- التركية وفي الرأي العام، چاپخانەی أشبيليه- بەغدا- چاپی سێیەم ١٩٧٧.
١١٢- ف. ف. مینورسکی- الأكراد ملاحظات وانطباعات- وەرگێڕانی دکتۆر مارف خەزنەدار- بەغدا ١٩٦٨.
١١٣- ر. م. ماکیفر و چارلس بیدج- المجتمع- بەشی دووەم- وەرگێڕانی دکتۆر سەید محەمەد عەزاوی و هەڤالانی کتێبخانەی النهضة المصرية ١٩٧١.
١١٤- دکتۆر شاکر خەسباک- الكرد والمسألة الكردية- چاپخانەی الرابطة- بەغدا ١٩٥٩.
١١٥- دکتۆر شاکر خەسباک- العراق الشمالي- دراسة لنواحيه الطبيعية والبشرية- چاپخانەی شەفیق- بەغدا-چاپی یەکەم ١٩٧٣.
١١٦- دکتۆر تەقی دەباغ- حضارة العراق- دانانی لیژنەیەک لە لێکۆڵەرە عێراقییەکان بەشی یەکەم- دار الحرية بۆ چاپکردن- بەغدا ١٩٨٥.
١١٧- دکتۆر خەلیل ئیسماعیل محەمەد- اقليم كردستان العراق- دراسات في التكوين القومي للسكان- هەولێر- کوردستانی عێراق ١٩٩٨.
١١٨- خالید عەبدولمونعیم ئەلعانی- موسوعة العراق الحديث- الدار العربية للمسوعات- بەغدا- جلدی یەکەم.

ج- لێکۆڵینەوە و بابەتەکان


١١٩- دکتۆر ئەحمەد کەمال ئەبولمەجد- التأريخ الدستوري للولايات المتحدة الأمريكية- لێکۆڵینەوەیەکە لە گۆڤاری القانون الأقتصادی میسری بلاوکراوەتەوە- چاپخانەی زانکۆی قاهیرە- ژمارە (٤)- ساڵی ١٩٦١.

١٢٠- دکتۆر حەسەن چەلەبی- العراق والفدرالية- لێکۆڵینەوەیەکە بەچەند ئەڵقەیەک لە ڕۆژنامەی (الحياة) لە ئەیلولی ١٩٩٥بلاوکراوەتەوە و بەئامێری چاپکردن نووسراوە.

١٢١- حەبیب محەمەد کەریم- ملاحظات عابرة حول ثورة ايلول- لێکۆڵینەوەیەکە لە گۆڤاری کادری زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بلاوکراوەتەوە- چاپخانەی خەبات- ژمارە ٢٩ی ئەیلولی ١٩٩٢.

١٢٢- دکتۆر محەمەد هەمەوەندی- قراءة قانونية لفكرة الحكم الذاتي وتطبيقها في كردستان العراق- لێکۆڵینەوەیەکە لە گۆڤاری (دراسات كردية)دا بلاوکراوەتەوە کە لە لایەن پەیمانگای کوردیی دەردەچێ - پاریس - ساڵی هەشتەم - ژمارە ٣- ٧، ١٩٩٢.

١٢٣- دکتۆر سەعد ئەلعەلوش- لمحات من تجربة الحكم الذاتي في العراق- لێکۆڵینەوەیەکە لە گۆڤاری (الحقوقي العربي) بلاوکراوەتەوە- ساڵی یەکەم- ژمارەی یەکەم- کانونی دووەمی ١٩٧٦.

١٢٤- دکتۆر سەفاء حافز- حول مفهوم الحكم الذاتي وتطبيقاته في العراق- لێکۆڵینەوەیەکە لە ژمارە (١٥)ی تەمووزی ١٩٧٠ی گۆڤاری الثقافة الجديدة بلاوکراوەتەوە.

١٢٥- دکتۆر ریاز زوهێری- کردستان العراق هل تصلح الفدرالية ما أفسده الحكم الذاتي؟.
بابەتێکە لە گۆڤاری الثقافة الجديدة - ساڵ٤٠ - ژمارە ٣ی کانوونی دووەم - شوباتی ١٩٩٣دا بلاوکراوەتەوە.


دووەم سەرچاوە کوردییەکان


١- محەمەد ئەمین زەکی- خلاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان- جلدی یەکەم- بەشی یەکەم- چاپخانەی دار السلام- بەغدا ١٩٣١.

٢- عەلائەدین سجادی- شۆڕشەکانی کورد- کورد و کۆماری عێراق- چاپخانەی مەعارف- بەغدا ١٩٥٩.

٣- فەیسەل دەباغ- کورد و کەمە نەتەوایەتییەکانی تر لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧دا.


گۆڤارە کوردییەکان


١- دکتۆر ئازاد نەقشبەندی- نیشانکردنی سنووری کوردستان- گۆڤاری سیاسەتی دەولی- سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی لە کوردستان دەری دەکات- ژمارە ١٠ی تەمموزی ١٩٩٤.

سێیەم: سەرچاوە بیانییەکان (بەزمانی ئینگلیزی):

ثالثا□: المراجع الأجنبيه (باللغه الإنگليزيه)


(1) Andrews William, G; American national political institution, D. Van Nostrand Company Inc., Princeton, New Jersy, New York 1962.

(2) Alexandrowich Charles Henry, constitutional development in India, Oxford University Press 1956.

(3) Bryce James, The American Commonwealth Abridged edition, The Macmillan Company, New York, Macmillan & Co., Ltd., London 1944.

(4) Beard Charles A., The enduring Federalist, Fredrick Ungar Publishing Co.New York Second Printing 1964.

(5) Bernier Ivan, International Legal Aspects of Federalism, Longman Group Limited, London first published 1973.

(6) Cooding George Arthur, The Fedral Constitution of Switzerland, Houg Miffin Company, Boston, under the editorship of Dayton D. McKean.

(7) Chkhikvadze V. M, The Soviet State and Law, Institute of State and Law Academy of Sciences of U.S.S.R. progress publishers, Moscow first printing 1969.

(8) Dicey A. V, Introduction to the Study of Constitution with an Introducton by E.C. Wade, London, Macmillan & Co. Press, tenth edition 1962.

(9) Densov A., Sovit State Law, Moscow 1960.

(10) Elazar Daniel J., Federal System of the World, a hand book of federal, confederal and autonomy, arrangement, Published by Longman Group U.K Limited wasage House, United Kingdom 1991.

(11) Earle Valerie, Federalism, Infinite Variety in Theory and Practice, F. E. Peacock Publishers Inc., Itasca, Illinois 1968.

(12) Foster Henry H., The Makingof Modern Iraq, Norman, University of Oklahoma Press, first edition, September 15, 1935.

(13) Griffith Ernest S., The American System of Government student edition, New York, Washington, fourth edition 1966.

(14) Glahn Gerhard Von, Law Among Nation, an introduction to public international law, The Macmillan Company Collier, Macmillan Limited, New York, London.

(15) Hamilton Alexandar and James Madison and John Jay, The Federalism, edited by Benjamin Flecher Wright, The University of Taxas, The Belknap Press of Havard University Press Cambridge Massachusetts 1966.

(16) Hughes Christopher, The Parliament of Switzerland, Published for the Hansard Society by Cassell, Cassell & Company Ltd., London, first published 1962.

(17) Hughes Christopher, The Federal Constitution of Switzerland, The Claredon Press, Oxford 1954.

(18) Haskin Fredric J. The American Government, Washington D.C.1923.

(19) Herz John H., The Government of Germany, Harcourt Brace, Jovanovich Inc., U.S.A.,second edition 1972.

(20) Hicks Ursula K., Federalism, Failure and Success, a comparative study published 1978.

(21) Heidenheimer Arnold J., The Government of Germany, University Paperbacks, Methuen, London, first published 1965.

(22) Johnson Nevil, Government in the Federal Republics of Germany executive at work , Pergamon Press, Oxford, New York, Toronto, Sydney Braunschweig 1973.

(23) Street, London 1956.

(24) Kagzi Mangal Chandra Jain, The constitution of India Meroplitan Book Co. Private Ltd., Delhi, second edition 1967.

(25) King Preston, Federalism and Federation, Groom Helm, International Series in Social and Political Thought, London & Canberra 1982.

(26) Leach Richard H., American Federalism, w.w. Norton & Company Inc., New York 1973.

(27) MacMahon Arthur W., Federalism Mature and emergent Doubleday & Company Inc. Garden City, New York 1955.

(28) McWhinney Edward, Comparative Federalism, States, Right and National Power, University of Toronto Press printed in Canada 1962.

(29) McKay Robert B., An American Constitutional Law Reader, Docket Series Volume 12, Oceana Publications, New York City 1958.

(30) Oppenheim L., International Law, Atreatise Vol 1Peace Longman, Green and Co., London ؛New York ؛Toronto eight edition by H. Lauter Pacht 1955.

(31) Peltason Jack , W., Federal Courts in the Political Process, Random House, New York, thirteenth printing 1966.

(32) Prewitt Kenneth and Sidney Verba and Robert H, Salisbury An introduction to American Government, Hrper Collins Publishers, United States, sixth edition 1991.

(33) Roche John P., Courts and Rights, The American Judiciary in Action, Random House, New York, second edition 1966.

(34) Riker William H., Federalism, Origin, Operation, Significance, Little Brown and Company, Boston and Toronto 1964.

(35) Riker William H., handbook of Political Science, Volume 5, Government Institutions and Processes, edited by Fred J, Greesein & Nelson W. Plosby,.

(36) Roy Neresh Chandra, Federalism and Linguistic States, Firma K. L. Mukhophadhaya Calcutta 1962.

(37) Sutton J. S. American Government, Published by George Harrab, London 1974.

(38) Starke J. G., An Introduction to International Law, Butter Wroths, London, fifth edition 1963.

(39) Sayer Wallace S., American Government by Branes & Noble Inc., U.S.A. fifteenth edition 1962.

(40) Schapiro Leoard, The Government and Politics of the Sovit Union, Hutchinson University Library, London, third edition 1968.

(41) Seruton Roger, A Dictionary of Political Thought, Hill and Wang, New York 1984.

(42) Tresolini Rocco J., American Constitutional Law, The Macmillan Company, New York, second printing 1963.

(43) Ulma Adam B., The Russian Political System Foreword by Samuel H. Beer, Random House, New York, third edition 1974.

(44) Westin Alan F., Supreme Court,Views from inside W.W. Norton & Company Inc., New York 1961.

(45) Willard Irland Philip, Iraq, A study in political development, Jonathan Cape, Thirty Bedford Square, London, first published 1937.

(46) Wilson James Q. and John Dilulio, American Government Institutions and Polices D.C. Heat and Company, Lexington Massachusetts Toronto, sixth edition 1995.

(47) Wheare K. C., Ffederal Government, Oxford University Press, London, New York, Toronto, fourth edition 1967.

(48) Woll Peter and Sidney E. Zimmerman, Amerrican government McGraw- Hill Inc., second edition 1992.

(49) White Wilbur W. Company, Cleveland and New York 1948.

(50) Zimmerman Joseph F., State and Local Government, Branes & Noble Inc., New York, second edition.

### چوارەم: دەستوورەکان

١- دەستووری ئەمریکی ساڵی ١٧٨٧.
٢- دەستووری سویسری ساڵی ١٨٧٤.
٣- دەستووری یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستییەکانی سۆڤیەتی ساڵی ١٩٧٧.
٤- یاسای بنەڕەتی کۆماری ئەڵمانیای ئیتیحادی ساڵی ١٩٤٩.
٥- دەستووری کۆمنوێڵسی ئوسترالی ساڵی ١٩٠١.
٦- دەستووری هیندی ساڵی ١٩٥٠.
٧- دەستووری کۆماری یوگسلافیای سۆشیالیستی.
٨- یاسای باکووری ئەمریکای بەریتانی ساڵی ١٨٦٧.
٩- یاسای بنەڕەتی عێراقی ساڵی ١٩٢٥.
١٠- دەستووری کاتیی ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق.
١١- دەستووری کاتیی ساڵی ١٩٦٤ لە عێراق.
١٢- دەستووری کاتیی ساڵی ١٩٧٠ لە عێراق.

### پێنجەم: یاساکان

١- یاسای بەڕێوەبردنی شارەوانییەکانی ژمارە ١٦٥ی ساڵی ١٩٦٤ لە عێراق.
٢- یاسای پارێزگاکانی ژمارە (١٥٩)ی ساڵی ١٩٦٩ لە عێراق.
٣- یاسای ئۆتۆنۆمیی ناوچەی کوردستانی ژمارە (٣٣) ساڵی ١٩٧٤.
٤- یاسای ئەنجوومەنی تەشریعی ناوچەی کوردستانی عێراقی ژمارە ٣٦ی ساڵی ١٩٧٤.
٥- یاسای چاکسازی سیستمی یاسایی ژمارە (٣٥)ی ساڵی ١٩٧٧ لە عێراق.

### شەشەم: بڵاوکراوەکان

١- مسألة الأقليات القومية في الوطن العربي- لە بڕیارەکانی کۆنگرەی نەتەوەیی ١١ی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی- چاپخانەکانی دار الثورة- بەغدا ١٩٧٩.
٢- اصلاح النظام القانوني وحركة التغيير الثوري- بڵاوکراوەکانی شۆڕش- دار الحرية بۆ چاپکردن- بەغدا ١٩٧٧.

# ناوەڕۆک